تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

# عوسمانی کوڕی عەففان

## کەسایەتیی وسەردەمەکەی


نووسینی:

عەلی موحەممەد سەللابی

وەرگێڕانی:

حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا





پرۆژەی تیشک 38

# عوسمانی کوڕی عەففان

## کەسایەتیی و سەردەمەکەی

نووسینی:
عەلی موحەممەد سەللابی

وەرگێڕانی:
حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا

٢٠٠٨زایینی

١٤٢٩کۆچی

**بەناوی خوای میهرەبان و دلۆڤان**

ناوی کتێب: عوسمانی کوڕی عەففان

نووسینی: عەلی موحەممەد سەللابی

وەرگێڕانی: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا

ژمارەی سپاردن: (١٢٧٤) ساڵی (٢٠٠٨)

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، زنجیرە (٣٨)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت : www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە: info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

# بەشی یەکەم:

## عوسمانی کوڕی عەففان ( ذي النورين ) لە ژیانی مەککەوە تا مەدینەی منەووەرە

## باسی یەکەم: ناوو شۆرەتو نەژادو نازناوو ئاکارو خێزانو پلەو پایەی عوسمان لە سەردەمی نەفامیدا

### یەکەم: ناوو شۆرەتو نەژادو نازناوی

١ـ ئەم کەڵەپیاوە، ناوی عوسمانی کوڕی عەففانی کوڕی ئەبی عاسی کوڕی ئومەیەی کوڕی عەبدولمەنافی کوڕی قوسەی کوڕی کیلابە[1]، نەژادی دەگاتەوە بە نەژادی پێغەمبەر ﷺ لە عەبدولمەنافدا، دایکیشی ناوی ئەروای کچی کورەیزی کوڕی رەبیعەی کوڕی حەبیبی عەبدولشەمسی کوری عەبدولمەنافی کوڕی قوسەیە[2].

زوبێری کوڕی بیکار، دەگێڕێتەوە کە دایکی دایکی عوسمان واتە (نەنکی) ناوی ئوموحەکیمی بەیزای کچی عەبدولموتەلیبە، ئەم ژنە خوشکی هەقودای عەبدوڵڵای باوکی پێغەمبەرە ﷺ، هەتا دەڵێن، ئەم ژنەو عەبدوڵڵا بەجمك (دووانە) لە دایك بوون، کەواتە دایکی عوسمان پورزای پێغەمبەرە ﷺو پێغەمبەریش ﷺ خالۆزای ئەوە، ئاشکرایە دایکی عوسمان موسڵمان بووەو لەسەردەمی جێنشینایەتی عوسمانی کوڕیدا، کۆچی دوایی کردووەو عوسمان خۆی هەڵیگرتووەو ناشتویەتی[3]، بەڵام باوکی لەسەردەمی نەفامییەتدا مردووە.

٢ـ شۆرەتو ناوبانگی عوەسمان:

لە سەردەمی نەفامیدا پێیان دەوت باوکی عەمر، پاشان لە ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ کوڕێکی بوو، ناوی نا عەبدوڵڵاو کردی بە کونیەی خۆیو موسڵمانانیش بە (باوکی عەبدوڵڵا) بانگیان دەکرد[4].

٣ـ نازناوی:

عوسمان بە (ذي النورين) دەناسرا، واتە خاوەنی دوو ڕۆشنایی، بەدرەدینی عەینی، لە ڕاڤەی سەحیحی بوخاریدا دەگێڕێتەوە[5]، کە وتوویانە بە (موهەلەبی ئەبی سوفرە)[6]

---

[1] الطبقات لابن سعد (٣/٥٣)، الاصابة (٤/٣٧٧)، رقم (٥٤٦٣).

[2] التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمان، محمد يحى الاندلس، (١٩).

[3] الخلافة الراشدة والدولة الاموية، د. يحى اليحى، (ص٣٨٨).

[4] التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمان، ص(١٩).

[5] شذرات الذهبي (٧/٢٨٦) الضوء اللامع (١٠/١٣١).

[6] وفيات الأعيان (٥/٣٥٠)، سير اعلام النبلاء (٤/٣٨٣).

بۆچی بە عوسمان دەوترێ (ذي النورين)؟ ئەویش وتی: باوەڕ ناکەم هیچ کەسێ بوویێتە مێردی دوو کچی هیچ پێغەمبەرێك ﷺ جگە لە عوسمان[1]، عەبدوڵڵای عومەری ئەبانی جەعەفی دەڵێت: حسەینی جەعەفی خاڵم پێی وتم: ڕۆڵە ئەزانی بۆچی بە عوسمانیان دەوت (ذي النورين)؟ منیش وتم: نا .. نازانم، ئەویش وتی: لەوەتەی خودای گەورە ئادەمی دروست کردووە هەتا قیامەتیش کەسێ نییەو نابێت دوو کچی پێغەمبەرێکی خواستبێت، جگە لە ئیمامی عوسمان، لەبەر ئەوە ناوی (ذي النورين)[2]ە. دەشڵێن عوسمان هەموو شەوێك لە شەونوێژدا قورئانی زۆر خوێندووە، بۆیە پێی دەوترێت "ذي النورين"، چونکە قورئان نورە، شەو هەستانیش نورێکی ترە[3].

٤ـ لە دایکبوونی:

عوسمانی کوڕی عەففان، شەش ساڵ دوای ساڵی فیل، لە مەککە لە دایکبووە[4]. دەشڵێن لە تایف لە دایکبووە، پێنج ساڵ لە پێغەمبەر ﷺ منالترە لە تەمەندا[5].

٥ـ شێوەی ڕوخساری:

پیاوێك بووە نە کورت نە درێژ، پێستی تەنكو ناسكو ریشی پانوپۆڕ بووە، جومگە گەورەو ناوشان پانو قژپڕو ڕیشیشی زەرد دەکرد. زوهری دەڵێت: "عوسمان پیاوێکی چوارشانەو ڕوومەت جوانو ناسك بووە، موی سەر سەری تەنك بووەو پێی بڵاوو[6] لوتی قەڵەمیو قنج بووە، ئەژنۆی قەبەو باڵی هێندە شۆڕ بووە دەگەشتە سەرڕانیو لە دواوە قژی دەبەست، دانەکانی پێشی جوانترین ددان بووە، قژی لە خوار گوێچکەیەوە بووەو

---

[1] عمدة القاري شرح صحيح البخاري (١٦/٢٠١).

[2] سنن البيهقي (٧/٧٣).

[3] عثمان بن عفان ذوالنورين، عباس العقاد، (ص٧٩).

[4] الاصابة (٤/٣٧٧)، رقم (٥٤٦٤).

[5] عثمان بن عفان، صادق عرجون، (ص٤٥).

[6] تاريخ الطبري (٥/٤٤٠).

دەموچاوی پێکەوتوو بووە، بەلای زۆربەی خەڵکەوە ڕەنگی سپی بووە، دەشڵێن ڕەنگی ئەسمەر بووە[1].

### دووەم: خێزان و هاوسەرەکانی

عوسمان هەشت ژنی هێناوە، ئەم ژنانەشی لەدوای موسڵمانبوونیان مارەکردوە، ژنەکانیشی ئەمانەن: (ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ، کە عەبدوڵڵای لێ بووە، پاشان ئومکەلسومی کچی پێغەمبەر ﷺ کە دوای مردنی ڕوقیە خواستی. ئەوانی تری بریتیبوون لەفاختەی کچی غەزوان، خوشکی عوتبەی سەرۆك عەشیرەتی غەزوان بوو، کە عەبدوڵڵای بچووکی لێ بووە، پاشان ئوموعەمری کچی جوندوبی ئەزدی هێناوەو عومەرو خالیدو ئەبانو عەمرو مریەمی لێ بووە، هەروەها فاتیمەی کچی وەلید، کە ئوموسەعیدی لێ بووە، هەروەها ئومو بەنینی کچی عوبەیینەی حیسنی هێناو عەبدولمەلیکی لێ بووە، هەروەها ڕەملەی کچی شەیبەی کوڕی ڕەبیعەی ئەمەوی هێناو عائیشەو ئوموئەبانو ئومو عەمری لێ بووە، دیارە ڕەملە موسوڵمان بووەو بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ داوە، هەروەها نائیلەی کچی فەرافیسەی کەلبی هێناوە، هەرچەند نائیلە لەسەر دینی گاور بووە، بەڵام بەر لەوەی شو بکات بە عوسمان موسڵمان بووەو موسوڵمان بوونەکەشی بەباشی بەڕێوەبردووە[2]. بەپێی ئەم زانیاریانە نۆ کوڕی هەبووە لە پێنج ژنیان، کە ئەمانەن:

١ـ عەبدوڵڵا، کە لە ڕوقیە بووەو دوو ساڵ پێش کۆچکردنیان بۆ مەدینە لەدایکبووە، کاتێك کۆچیان کرد بۆ مەدینە لەگەڵ خۆیاندا بردوویانە. لە سەرەتای ژیانی مەدینەدا کەڵەشێرێك ئەوەندە دنوکی دا لە ڕومەتی عەبدوڵڵا، کە ئەوکات منداڵ بوو، چاوی تەقاند، وردە وردە شوێنی دەنوکی کەڵەشێرەکە بوو بە برینو دایەبەر هەتا دەموچاوی

[1] صفة الصفوة (١/٢٩٥)، صحيح التوثيق في سيرة وحياة ذي النورين، (ص١٥).

[2] تاريخ الطبري (٥/٤٤١)، التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمان (ص١٩)، الامين ذي النورين محمود شاكر ص(٣٦٤)..

هەوی کردو هەڵئاوساو لە ساڵی چوارەمی کۆچیی، کە تەمەنی شەش ساڵان بوو[1]، کۆچی دوایی کرد.

٢ـ عەبدوڵڵای بچوکی هەبوو، لە فاختەی کچی غەزوان.

٣ـ عەمری هەبوو، لە ئومو عەمری کچی جوندوب، عەمر فەرمودەشی لەدەمی باوکیو ئوسامەی کوڕی زەید، ڕیوایەت کردووە. عەلی حسەینو سەعیدی کوڕی موسەیبو ئەبو زنادیش فەرموودەیان لێ وەرگرتووەو فەرموودەکانیش کەمن.

٤ـ خالیدی هەبووە لە ئومو عەمری کچی جوندوب.

٥ـ ئەبانی هەبووە لە ئومو عەمری کچی جوندوب، ئەم ئەبانە پێشەوایەو فەقیهەو کونیەی باوکی سەعیدی هەبووە (أبو سعید). ماوەی حەوت ساڵ بووەتە سەرۆکاری شاری مەدینە لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا، زەیدی کوری سابتیش هەندێ فەرموودەی لێ بیستووە، کە ئەویش لە باوکییەوە واتە لە عوسمان وەری گرتووە، یەکێك لەو فەرموودانە ئەمەیە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەرکەسێ لە سەرەتای هەموو ڕۆژێكو سەرەتای هەموو شەوێکدا، سێ جار بڵێت: "بسم الله الذي لايضر مع اسمه شئ في الأرض ولا في السماء وهو السميع العليم"، ئەو ڕۆژە تا ئێوارەو ئێوارە هەتا بەیانی، ئەو کەسەی کە وتوویەتی هیچ زیانێکی پێ ناگات، ئەو کاتەی ئەبان ئەم فەرموودەیەی دەگێڕایەوە خۆی تووشی بای شەلەل بوو بو وتی: وەڵڵاهی ئەو ڕۆژەی تووشی ئەم نەخۆشییە بووم، پێشتر لە بیرم چوبوو ئەم زیکرە بخوێنم[2]، هەتا تووش بووم. ئەبان لە سەردەمی خۆیدا بە یەکێك لەشەرعزانەکانی مەدینە ئەژمار دەکرا، لە ساڵی سەدو پێنجی کۆچی[3]، کۆچی دوایی کرد.

٦ـ وەلیدی هەبووە لە فاتمەی کچی وەلیدی عەبدولشەمسی موغەیرەی مەخزومی.

٧ـ سەعیدیش هەر لە فاتمەی کچی وەلیدی مەخزومیە لەساڵی پەنجاو شەشی کۆچیو لەسەردەمی موعاویەدا کراوەتە والی خۆراسان.

---

[1] الامين ذي النورين محمود شاكر، ص (٣٦٥)، التمهيد والبيان ففي مقتل الشهعيد عثمان، (١٩).

[2] سنن الترمذي، كتاب الدعوات، رقم () حديث الصحيح.

[3] سير اعلام النبلاء (٢٥٣/٤) تاريخ القضاعي، ص (٣٠٨).

٨ـ عەبدولمەلیکی هەبووە، لە ئومو بەنینی کچی عوبەییینە کە هەر بە منداڵی مردووە.

٩ـ (عەنبەس)[1]ی هەبووە، لە نائیلەی کچی فەرافیسە، هەروەها عوسمان، ساڵی هەشتای کۆچی، ڕەملەی کچی معاویەی ئەبوسوفیانی خواستووە.

کچەکانیشی حەوت بوون لە پێنج ژنیان:

١ـ مەریەمە، لە ئومو عەمری کچی جوندوب.

٢ـ ئومو سەعیدە لە فاتمەی کچی وەلیدی مەخزومی.

٣ـ عائیشە، لە ڕەملەی کچی شەیبە.

٤ـ مەریەمە، لە نائیلەی کچی فەرافیسە.

٥ـ ئوموبەنین، لە ئومولوەلەد[2].

خوشکەکانیشی ئەمانەن:

١ـ ئامینەی کچی عەفان، لەسەردەمی نەفامیدا ئیشی دایەنیو شانەکردنی کردووە، پاشان شووی بە حەکەمی کیسانی کۆیلەی هیشامی موغەیرەی مەخزومی کردووە، لە دەستەی عەبدوڵڵای جەحشدا پارتیزانیی کردووەو لە مەدینە موسڵمان بووەو بە شێوازێکی ڕێکوپێك ئیسلامەتی کردووەو لای پێغەمبەر ﷺ ماوەتەوە هەتا لەسەرتای ساڵی چوارەمی کۆچیو لەڕۆژی بیری مەعونەدا شەهید کرا. بەڵام، ئامینەی کچی عەفان لەسەر بێباوەڕی مایەوە هەتا شاری مەککەیان رزگارکرد، ئەوجا لەگەڵ دایكو خوشکەکانیو بەهاوڕێیەتی هندی کچی عوتبەو ژنی ئەبوسوفیان رۆشتن بۆلای پێغەمبەر وﷺ و لەخزمەتیدا مووسڵمان بوونو بەیعەتیان پێدا، لەسەر ئەوەی کەس نەکەن بە هاوبەشی خوداو دزیو داوێن پیسی نەکەن[3].

عوسمان سێ برای دایك جیازەشی هەیە کە ئەمانەن:

[1] التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمان، (ص٢٠).

[2] الامين ذوالنورين محمود شاكر، (ص٣٤٦).

[3] الامين ذوالنورين محمود شاكر، (ص٣٤٦).

١- وەلیدی کوڕی عوتبەی ئەبی موعیت، کە لە ڕۆژی بەدردا مەردانە باوکی خۆی کوشت، چونکە کافر بوو. لەئاشتەوایی حودەیبیەشدا وەلید لەگەڵ عەماری برایدا دەرچوون بۆ ئەوەی ئوموکەلسومی خوشکیان بگەڕێننەوە کە لەئیسلام هەڵگەڕابووەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیهێشت بیگەڕێننەوەو لەمەککە مایەوە هەتا ڕۆژی ڕزگارکردنی شارەکە هەمدیس موسڵمان بوویەوە.

٢- عەماریش لەدایکەوە برایەتیو کاتێکی درەنگتر موسڵمان بووە.

٣- خالیدی کوڕی عوتبەش.

خوشکە باوک جیازەکانیشی ئەمانەن:

١- ئوموکەلسومی کچی عەقەبەی ئەبی موعیت، کە لە مەککە موسڵمان بووەو هەر لەوێش کۆچی کردووەو پەیمانی داوە بە پێغەمبەر ﷺ.ئەم ژنە، یەکەمین ئافرەتە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە لە دوای سوڵحی حودەیبیە کۆچی کردبێت بەرەو شاری مەدینە.

٢- ئوموحەکیمی کچی عەقەبە.

٣- هندی کچی عەقەبە[1].

**سێیەم: پلەو پایەی عوسمان لە سەردەمی نەفامیدا**

عوسمانی کوڕی عەفان - ڕەزای خوای لێبێت - لە سەردەمی نەفامیدا بەڕێزترین کەسی تیرەکەی خۆی بووە، ناوبانگێکی بڵندی هەبووەو دەوڵەمەندێکی زۆر بە شەرمو شکۆ بووەو هۆزەکەی بەو پەڕی نەوازشەوە ڕێزیان لێگرتووەو خۆشیان ویستووە. لەسەردەمی نەفامیدا هەرگیز کڕنوشی بۆ بتەکان نەبردووەو بە هیچ شێوەیەك نزیکی داوێن پیسی نەکەوتۆتەوەو ئارەقی نەخواردۆتەوەو خۆی دەفەرموێت: "ئارەق عەقڵی مرۆڤ تێکدەدات، عەقڵیش نایابترین خەڵاتی خودایە بۆ مرۆڤ، پێویستە مرۆڤ شانازی بە عەقڵیەوە بکات نەك بەدەستی خۆی کاولی بکات".

هەروەها لە سەردەمی نەفامیدا گۆرانی هەرزەکارانەو کۆڕی گاڵتەوگەپ، سەرنجی ڕانەکێشاوە. خۆی پاراستووە لە تەماشای هەموو ڕوتییەك[1]، ڕەحمەتی خودا بڕژێ

---

[1] الامين ذوالنورين محمود شاكر، (ص٣٥٤).

بەسەر عوسماندا زۆر بە ئاسانی خۆیمان پێ دەناسێنیێ و دەفەرموێت: "گۆرانیم قەت نەوتووە، مێ بازیشم نەکردووە، لەوکاتەوەی پەیمانم بە پێغەمبەر ﷺ داوە بە هیچ شێوەیەك دەستی راستم لە زەکەرم نەداوە، نە لەسەردەمی نەفامیو نە لەسەردەمی ئیسلامەتیدا ئارەقم نەخواردۆتەوەو داوێن پیسیشم نەکردووە"[٢].

عوسمان - ڕەزای خودای لێبێت - ماریفەتێکی باشی هەبووە لە کەلتووری عەرەبدا، بەتایبەت: ڕەچەڵەکناسیو پەندو سەربوردەو ڕازەکان. هەروەها گەشتی زۆری کردووە بەسەر زەویداو چووەتە شامو حەبەشە، لە ناو گەلە ناعەرەبەکانیشدا ژیاوەو سروشتو ڕەفتاری ناسیوون[٣] و زۆربایەخی داوە بە بازرگانی کە بە میرات لە باوکییەوە بۆی بەجێ مابوو. بەهۆی بازرگانیشەوە سامانەکەی تا دەهات پەرەی دەسەندو بوو بەیەکێك لەو پیاوانەی کە دەرکەوتبوون لە هۆزی ئومەیە. لەناو قورەیشیشدا ڕێزو حورمەتی مرۆڤ بە ئەندازەی بڕی سامانەکەی و ژمارەی کوڕوبراو تیرەکەیەوە بەندبووە، لەم ڕوانگەیەشەوە عوسمان گەشتبووە چلەپۆپەی کۆمەڵگاو خۆشەویستییەکی زۆری بەدەست هێنابوو لە ناو هۆزەکەیدا، ناسکترین قسەش لە بارەی خۆشەویستییەکەی عوسمانەوە ئەم دێڕە شیعرەیە، کە هەرچی ماناو چەمکی ئەوین هەیە تێیدا بەرجەستە دەبێتو ئافرەتانی عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا هەرکاتێك منداڵی خۆیان بلاواندایەتەوە، بەدەنگی بەرز ئەم دێڕە شیعرەیان دەوتەوە:

خۆشم دەوێیت بە ڕەحمان          وەك خۆشەویستی قوڕەیش بۆ عوسمان[٤]

---

[١] موسوعة التأريخ الاسلامي، أحمد شلبي (٦١٨/١).

[٢] حلية الاولياء (٦٠/١)، (٦) الخبر الصحيح.

[٣] عبقرية عثمان للعقاد، (٧٢).

[٤] موسوعة التأريخ الاسلامي (٦١٨/١).

## چوارەم: موسڵمانبوونی

عوسمان، تەمەنی سیو چوار ساڵ بوو، کاتێك ئەبوبەکری سدیق بانگی کرد بۆ موسوڵمانبوون، عوسمانیش هیچ سستیو ڕەکیو سەرلێکردنەوەی لەداواکەی ئەبوبەکر نەکردو خێرا وەڵامی دەستبەجێی بانگەکەی دایەوە. بەم بەپیرەوەچوونە خێرایەش، بوو بە پێشینەبەراییەکانی ئیسلامو لەمبارەیەوە ئەبو ئیسحاق دەڵێت: "یەکەم کەسێك کە موسڵمانبوو لە دوای ئەبوبەکرو عەلیو زەیدی کوڕی حاریسە، عوسمان بوو[1]. بە عوسمانەوە پیاوە موسڵمانبووەکان بوون بە چوار کەس"، پێدەچێت پەلەکردنی عوسمان لە موسڵمانبووندا لە ئەنجامی ئەو ڕوداوە بێت کە لە کاتی گەڕانەوەیدا لە شام بینی. ئەویش کاتێك لەگەڵ تەلحەی عوبەیدوڵڵا چونە خزمەت پێغەمبەر ﷺو بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ ئیسلامی بۆ باسکردنو قورئانی بەسەردا خوێندنو مافەکانی ئیسلامی تێگەیاندنو بەڵێنی پاداشتی خودایی پێدان، هەردووکیان بڕوایان هێناو باوەڕیان پێکرد، پاشان عوسمان وتی: "کاتێك ئێمە لە نێوان مەعانو زەرقادا بووین وەکو خەوتوو وابووین، بانگبێژێك بانگی کردینو وتی: ئەی خەوتووەکان، بێدار ببنەوە، دڵنیابن ئەحمەد لەمەککە دەرکەوتووە، ئێمەیش کە گەڕاینەوە یەکسەر ناوی تۆمان بیست"[2].

بێگومان ئەم چیرۆکە لە ناخی بیسەرەکەیدا کاریگەرییەکی باشی بەجێهێشبوو، نەیدەتوانی خۆی لێ گێل بکات، لە کاتێکدا ڕاستییەکە کەروێشکەی دەکرد بە بەرچاوییەوە. کێ بەر لەگەیشتنی بە شارێك، ببیستێت پێغەمبەرێکی تێدا دەرکەوتووەو ئەمیش بۆ ئەو شارە بچێت، کاتێکیش بچێتە شارەکەوە هەموو ڕاستیو گۆڕانەکان بەدەنگەوەرێ هاوار بکەن، ئایا ئیتر چ پێویستی بە ڕاڕاییو دردۆنگی هەیە.

مرۆڤ هەرچەندە مەزن بێت ناتوانێت ملکەچی حەقو ڕاستی نەبێت، هەرچەندە زبریش بێت هەمیشە ویژدانو ناخی واژم واژم دەکاتو گێژاو دەخوات، هەتا باوەڕ دەهێنێت یان دەمرێت ئەوسا قوتار دەبێت لە تانەی ویژدانی. عوسمان، کە بەخێرایی بە پیر ئیسلامەوە چوو، لە ئەنجامی لاوازیو گێلێتی نەبوو، بەڵکو متمانەیەکی پتەوو

---

1 السيرة النبوية لابن هشام (١/٢٨٧ ـ ٢٨٩).

2 الطبقات لابن سعد (٣/٥٥).

بڕوایەکی بێگەردی هەبووە، قەت دوودڵو گوماناوی نەبووە[1]، زۆر بە هێمنی وردبوویەوە لەم بانگەوازە نوێیە کە چارەسەری کێشەکانی دەکردو تێگەیشت ئەم ئیسلامە بۆ سەربەرزیو ڕوسوورییەو ڕسوایی دەتارێنێت .. ئیسلام بریتییە لەخواپەرستیو سڵەمینەوە لە هاوبەش پەیدا کردن بۆ خودا.. ئیسلام بۆ خواپەرستیو بێداربوونەوەیە لە بێ ئاگاییو هەڵکشانە بەرەو ئاکاری بەرزو ناوازەو ترێزکردن لە هەموو ڕەوشتێکی نالەبار. عوسمان، لەدوای خۆی تەماشای هۆزەکەی کرد[2]، هەر هەموویان خەریکی بت پەرستیو گۆشتی مردارەوەبوو خواردن بوون، بەد ئاومالْ بوونو هەرچی حەرامە حەڵاڵیان دەکردووەو بەناحەق خوێنی یەکتریان دەڕشتو چەندەها شتی تری خراپیان دەکرد. لەولاشەوە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەستپاكو ڕاستگۆیەو هەرچی ئاکاری چاکەیە تێیدایەو هەرگیز خراپەی لێوە دەرنەکەوتووەو پەیمان شکێنو گزیکار نەبووەو سەرەڕای ئەمە بانگەوازی پەرستنی خودای تاكو تەنیاو بێ هاوبەش دەکات، ئامۆژگاریی شیرازەی خزمایەتیو ئاومالْ چاکیو نوێژکردنو ڕۆژووگرتنو وازهێنان لە کۆیلایەتی کردن بۆ بتەکان دەکات[3]. لەبەر ئەوە عوسمان لە سەر دەستی ئەبوبەکر موسڵمان بوو. ماوەیەکی زۆریش بەسەر ئیمانەکەیدا تێ نەپەڕیبوو، بوویە بانگەوازێکی بەهێزو خۆگرێکی بە ئارامو کەڵەپیاوێکی ڕوگەشو لە خۆبوردوویەکی بەڕێزو چاکەخوازییەکی نەرمونیانو بەخشندەیەکی سنگ فراوانو خەمخۆرێکی باوڕدارانو هاوکارێکی بێ نەوایان، هەتا ئیسلام گەشتە دوا هەوارگەی خۆی[4]، سەدان ڕەزاو رەحمەتی خودای لێ بێت تا ڕۆژی دوایی.

**پێنجەم: خواستنی ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ**

موسڵمانەکان شادمان بوون بە موسڵمانبوونی ئیمامی عوسمان، لە نێوان خۆیانو ئیمامی عوسماندا پەتی خۆشەویستییان گرێداو بوونە برای ئیمانیو خودای گەورەش

---

[1] جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدين، (ص٣٠٢).

[2] مرويات العهد المكي، عادل عبدالغفور (٨٠٢/٢).

[3] فتنة قتل عثمان، د.، محمد عبدالله الغبان (٣٧/١).

[4] عثمان بن عفان، صادق عرجون، (ص٥٣).

تاجی زێڕینی خستە سەر سەری عوسمان بە خواستنی کچی پێغەمبەرەکەی ﷺ، چیرۆکی ئەم خواستنەش ئاوەهابوو:

پێغەمبەر ﷺ ڕوقیەی کچی دابوو بە عوتبەی ئەبولەهەبو ئومو کەلسومیشی دابوو بە عوتەیبەی برای، هێشتا نەگوازرابوونەوە، کاتێك سورەتی (تبت یدا) هاتەخوارەوە. لەدوای هاتنە خوارەوەی سوورەتەکەش ئەبو لەهەبی باوکیانو ئومو جەمیلی دایکیان کە کچی بەنی ئومەیەیەو پێی دەوترا ـ حمالة الحطب ـ کۆڵ بەکۆڵ، وتیان بە کوڕەکانیان دەبێت هەردووکتان لەدوو کچەکەی موحەممەد ﷺ جیا ببنەوە، ئەوانیش بەر لەوەی هاوسەریان بکەن جیابوونەوەو تەڵاقیان دان، ئەم کارەش بوو بە چاکەیەکی تری خودای میهرەبان بۆ هەردوو کچەکەو بوو بە سەر شۆڕییەکیش بۆ کوڕەکانی ئەبو لەهەب[1]. هەرکە عوسمان ئەم هەواڵەی بیست، خەرکیبوو لەخۆشیدا بفڕێت، خێرا دەستپێشخەری کردو خوازبێنی ڕوقیەی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لێی مارەکردو خەدیجەی دایکی ئیمانداران بەربوکی بۆ کرد. ئەو دەمە عوسمان پێکەوتووترین گەنجی قورەیش بوو، ڕوقیە هەموو بەیانیو ئێوارەیەك لە جوانی عوسمان ئەگەشایەوەو ئەڵێن لەکاتی گواستنەوەدا ڕوقیە، وتوویەتی

جوانترین ژنو مێردێك هاتبێتە بەرچاوی ئینسان
ڕوقیەو مێردەکەیتی، کە پێی دەوترێ عوسمان[2].

عەبدولڕەحمانی قورەیشی دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ چووەتە سەردانی ڕوقیەی کچی، سەیرەدەکات سەری عوسمان دەشۆرێت، دەفەرموێت "کچی خۆم چاك بە بۆ ئەبو عەبدوڵلا یەعنی عوسمان، چونکە لەناو هاوەڵانمدا زۆربەی ڕەوشتەکانی لەڕەوشتی من دەچێت""[3].

ئوموجەمیلی کچی حەربو ئەبولەهەبی مێردی پێیان وابوو، تەڵاقدانی ڕوقیەو ئوم کەلسوم دەبێتە کێشەو تەنگوچەڵەمەو ماڵی پێغەمبەر ﷺ پێی سەرکز دەبن. بەڵام،

---

[1] ذوالنورين عثمان بن عفان، محمد رشيد رضا، (١٢).

[2] انساب الاشراف، (ص٨٩).

[3] رواه الطبراني ورحالة ثقات ماله الهيثمي، الجمع رقم (١٤٥٠٠).

به پێچەوانەوە خودای گەورە لە کوڕانی ئەوان باشتری بۆ هەڵبژاردنو کردی بە نسیبیان، ئەوانیش بە هاڵاوی دڵیان نەگەیشتنە خۆشییەکانیان، خودای گەورە ماڵو خێزانی پێغەمبەری ﷺ لەوان خاوێن کردەوە. هەمیشە فەرمانی خودا، لەجێی خۆیدا جێبەجێ دەبێت[1].

## شەشەم: چەرمەسەریو کۆچکردن بۆ حەبەشە

زۆر تاکو کۆمەڵو گەلو ولاتێك بە قۆناغی چەرمەسەریدا گوزەریانکردووە. نمونەی ئەم قۆناغە دژوارەش بەسەر هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەردا تێپەڕیوەو ناسۆری وایان چەشتووە شاخە سەرکەشەکانیش پێیان هەڵناگیرێت، بەجارێك ماڵو خوێنی خۆیان بەختکردووە لەپێناو خودای گەورەدا. هەرچی خودای گەورە ویستویەتی ئەنجامیانداوەو بۆی کۆشاون، موسڵمانە پلەو پایەدارەکانیش لەم ناڕەحەتیو چەرمەسەریانە بێوەیو بێبەش نەبوون. بۆ نموونە عوسمان کە خاوەن پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بووە، لە لایەن حەکەمی ئەبی عاسمی مامیەوە لەرێگای سەرخستنی رێبازی خودای گەورەدا ئەشکەنجە دراوە. حەکەم، بە گوریس عوسمانی شەتەك دەداو پێی دەوت "واز لە ئاینی باوو باپیرانت ئەهێنی بۆ ئاینێکی دەست هەڵبەست؟! سوێندبێت، بەرت نادەم هەتا ئەو ئاینەی هەڵتگرتووە فڕێی نەدەیت" عوسمانیش، فەرمووی وەڵڵاهی ببڕاو ببڕ فڕەی نادەمو لێی جودا نابمەوە". کە حەکەمی مامی تێگەیشت لەدینداریەکەیدا زۆر توندوتۆڵەو وازی لێ ناهێنێ گوریسەکەی لێکردەوەو ئازادبوو[2]. بە هەمان شێوەی عوسمانو پتریش ئازارو ئەشکەنجەی موسڵمانان ناهەمواربوو. بۆ نموونە یاسرو سومەیەی خێزانی لەرێی ئیسلامەتیدا کوژران. تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ ئازارو ئەشکەنجەی سەختی چەشت بۆیە بیری لەوە کردەوە موسڵمانان چی بکەنو چۆن لەم قۆناغە تاڵە قورتار بن. خودای گەورەش پێغەمبەر ﷺی رێنمایی کرد بەرەو حەبەشە کۆچ بکەن. بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە موسڵمانانی فەرموو "ئەگەر بچونایە بۆ حەبەشە کارێکی باشتان دەکرد، چونکە پادشایەکی سەرڕاستیان هەیەو لای ئەو کەس زوڵمی لێ

---

[1] دماء علی قمیص عصمان، د. ابراهیم الفتاوي، ص (٨٤).

[2] التمهید والبیان في مقتل الشهید عثمان، ص (٢٢).

ناکرێت"[1]. بەم فەرموودەیەش کۆچکردن دەستی پێکرد، وەختێکی زانی دەستەیەکی زۆر لە ئیمانداران بە نهێنی دزەیان کردووە بۆ دەرەوەی شاری مەککە[2]، هەندێکیان لە ڕێگەی دەریاو هەندێکی تر بە سواری وڵاخو ئەویتریش بە پیادە خەریکن دەکەونە ڕێ، پێغەمبەر ﷺ تێڕاما لەم کۆچکردنەو عوسمانی کوڕی مەزعونی کردە چاوساغیانو لەوێ گەیشتنە کەنار دەریاری سوور، خودای گەورە یارمەتی دانو دوو بەلەمیان دەست کەوت[3]، یەکی بە نیو دینار سواری بوون، هاوکات قورەیش بەمەیان زانی خێرا وەدویان کەوتن، بەڵام کاتێك کە قورەیش زانیان ئەوان لە ئاو کردبوویانە ئەوبەرەوە.

یەکێك لەوانەی کۆچی کرد لە جاری یەکەمو دووەمدا عوسمان بوو. ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر، لەساڵی پێنجەمی هاتنی ئیسلام، دووجار لەگەڵ روقیەی خێزانیدا کۆچیکرد. کاتێك لەگەڵ موسوڵمانەکانی تردا گەشتنە حەبەشە لەوێ بە ئارامیو ئازادی خوداپەرستیو دینداری خۆیان دەکرد، تەنانەت قورئان ئاماژەی کردووە بۆ کۆچکردنی موسڵمانە یەکەمینەکان کە چوون بەرەو حەبەشە دەفەرموێت (وَالَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي اللّهِ مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَلَأَجْرُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ) (النحل: ٤١).

قورتوبی لە ڕیوایەتی قەتادەوە نووسیویەتی ئەم ئایەتە مەبەستی هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ، ئەو دەمەی دەچەوسانەوە بە دەستی موشریکەکانەوە ئازاریان دەچەشت، دەستەیەك لە هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو خودای گەورە بۆی کردنە لانەی حەسانەوەو یەکەمین هەوارگەی کۆچکردنو بڕێکی زۆر دۆستی بۆ هاوەڵان ڕامکرد[4]، هەروەك خۆی لەمبارەیەوە فەرمویەتی (قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ

---

[1] الهجرة في القران الكريم، ص (٢٩٠)، السيرة النبوية لابن هشام (٤١٣/١).

[2] دماء على قميص عصمان، ص (١٥) الطبقات (٦٩/٢).

[3] الطبقات (٢٠٤/١)، تاريخ الطبري (٦٩/٢).

[4] الجامع لاحكام القران القرطبي (١٠٧/١٠).

حِسَابٍ) (الزمر: ١٠). تەنانەت ئیبن عەباس دەڵێت "ئەم ئایەتە مەبەستی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبو ئەو هاوەڵانەیە کە کۆچیان کرد لەگەڵیدا بۆ حەبەشە[١]".

بێگومان عوسمانی کوڕی عەففان - ڕەزای خودای لێبێت- کەڵکی زۆری وەرگرت لەم کۆچکردنەو بڕێکی باش پەندو ئامۆژگاری لێوەرگرتو لە میانەی دەسەڵاتی خەلافەتی خۆیدا بە کاری هێناو پیادەی کرد.

گرنگترین ئەو پەندو ئامۆژگاریانەش ئەمانەبوون:

١- چەسپاویو دامەزراوی عەقیدەی ئیمانداران، سەرەڕای ئەو هەموو ئەشکەنجەو خەشمەی کە دائەبارییە سەریان لە لایەن گومڕاو سەرسەرییەکانی مەککەوە، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئیمان دروستیو دڵپاکییان بۆ خودای گەورە پیشان ئەدات، ئاماژەی دەروون بەرزیو گیان پۆڵایی ئەوان بوو، ئەم ئازارو ئەشکەنجەیان بە تەرزێ لێکدەدایەوە کە ویژدانیان ئاسودە بکاتو عەقڵو دەرونیان هێور بکاتەوە، ئەوەندە ئاواتەخوازی ڕەزای خودا بوون گوێیان نەئەدایە ئەو ئازارو ستەمەی کە دەگەیەنرایە جەستەیان، چونکە باوەڕداری ڕاستەقینەو بانگخوازی نیازپاك هەمیشەو هەردەم غەمو پەژارە بۆ لایەنی ڕۆح دەخوات، نەك بۆ لایەنی جەستە. ئەوان ئەوەندە پەرێشانی خواستەکانی ڕۆحو گیانیان بوون بە جۆرێکی وەها خواستەکانی لایەنی جەستەییان کە بریتییە لەپشوودانو سك تێرکردنو لەزەتچەشتن، نەدەخستە بەر ئەندێشەی خۆیان، بەم ئابلۆیە بانگەواز، سەردەکەوێتو تارماییو تاریکی نەفامی ڕادەماڵێت[٢].

٢- عوسمان - ڕەزای خوای لێبێت - لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ فێری سۆزو دڵهاوەری بووە بەرامبەر ئومەتی ئیسلام، ئەم هەستەش کاتێك گزنگیدا کە خەلافەتی پێ بەخشرا، پێشتریش لەسەردەمی مەدینەو سەرەتای پێغەمبەرایەتی هەتا سەردەمی ئەبوبەکرو عومەریش بە چاوی دڵو بەچاوی سەر، سۆزو میهرەبانی ئەوانی دیبوو، کە چەندە بە پەرۆش بوون بۆ دابینکردنی ئاسایشو حەسانەوەی هاوەڵان، هەر دەرەنجامی ئەم دڵسۆزییەشبوو، کە پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاریی کردن بچن بۆ سایەی پادشایەکی

---

[١] الجامع لاحكام للقراف للقرطبي (١٥/ ٢٤٠).

[٢] السيرة النبوية للدكتور مصطفى السباعي، (٥٧).

دادوەر کە لە حەبەشەیەو ستەم لەکەس ناکات کتومت هەرواش دەرچوو، لەویٚ لەرووی ئاینداریییەوە ئازادبوونو لە ڕوی ژیانیشەوە لە باشترین جیٚگەدا میوانداری کران[1]، سا بۆیە پیٚغەمبەر ﷺ بە چاوی ڕیٚزو حورمەتەوە تەماشای حەبەشی دەکردو بە ولاٚتیٚکی ئارامی ناودەبرد، بۆ بانگەوازو کۆمەلٚە هاوەلٚەکەی، وەکو قەلٚغان، سودی لیٚوەرگرت بۆ پاراستنی ئیمانداران. ئەم ڕیٚوڕەسمە پەروەردەیەکی پیٚغەمبەرانەیە بۆ گشت پیٚشەواکانو فەرمانڕەوا موسلٚمانەکان لە گشت سەردەمیٚکدا هەتا بتوانن بەرنامەڕیٚژی دانایانە بکەنو ڕەهەندەکانی پاراستنی بانگەوازو بانگەوازکار لەبەرچاو بگرنو بگەڕیٚن بە شویٚن ناوچەیەکی ئارانو گزردا تا بیکەن بە پایتەختیٚك بۆ بانگەوازو بیکەن بە ناوەندیٚك بۆ بلاٚوکردنەوەی باسو خواستەکان، ئەگەر ناوەندی سەرەکی شکستی هیٚنا یان کەوتە مەترسییەوە یاخود سەربازو شۆڕشگیٚڕەکان دوچاری گرفت بوونەوە، ئەوکاتە ناوەندە دورە دەستەکان کارو فرمانەکان جیٚبەجیٚ بکەن[2].

٣ـ عوسمان لە ڕیٚنماییەکانی پیٚغەمبەر ﷺو کۆ چی حەبەشەدا، فیٚری ئەوەبوو کە ترسو بیم بە سەختی ڕووبەڕووی ئەو کەسانە دەبیٚتەوە کە کەسوکاری نزیکی پیٚشەوان، چونکە ناگونجیٚت کەسە تایبەتەکانی پیٚشەوا، خۆیان ماتە بدەن لەناسۆرییەکانو خەلٚکە ڕەشو ڕوتەکەش بخریٚتە بەرسزاو ئازار. ئەم دیدە دورە، لە ڕیٚبازی پیٚغەمبەر ﷺ[3] لەبەر ئەوە کاتیٚك عوسمان، دەسەلاٚتی خەلافەتی گرتە ئەستۆ خزمە نزیکەکانی خستە پیٚشی سوپاو کردنی بە کەواسوری بەر لەشکر، بۆ نموونە عەبدوللاٚی ئەبی سەرح لە ڕزگارکردنی ئەفەریقاو عەبدوللاٚی عامر، لە ڕزگارکردنی مەشریقدا لە پیٚشی پیٚشەوە دانا، هەروەها مەعاویەی ناچار کرد لەگەلٚ خیٚزانەکەیدا لە پیٚشی سوپابەرزەفڕەکەیەوە، سواری پشتی کەشتی ببیٚت، دریٚژەی ئەم باسەش لە باسی ڕزگارکردنەدا دەبینیت.

---

[1] الهجرة في القران الكريم، ص (٣١٢).

[2] التربية القيادية، مغير الغضبان (١/٣٣٣).

[3] السيرة النبوية للصلابي (١/٣٤٨).

٤ ـ عوسمان، یەکەمین کەسە لەم ئومەتەدا کە بەخاوخێزانەوە کۆچی کردەوە بۆ حەبەشە[١]، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت بۆ کۆچی عوسمانو ڕوقیە "خودای گەورە هامڕایان بێت دوای (لوط ﷺ) عوسمان یەکەمین کەسە کە بە خاوخێزانەوە کۆچی کردبێت بۆ لای خودای گەورە"[٢].

پڕوپاگەندەیەك گەشتە کۆچەرانی حەبەشە، کە گوایە ئەهلی مەککە موسڵمانبوون، ئەوانیش لە خۆشیاندا گەڕانەوە، کاتێك نزیکی مەککە بوونەوە هەواڵیان بۆ هات، ئەو دەنگوباسە درۆو دەلەسەیە، ئەمانیش بەدالّدەی هەندێك پیاوی مەککە هاتنە ناو شارو هەندێکی تریان گەڕانەوەو هەمدیس کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە. عوسمان، یەکێك بوو لەو کەسانەی لەگەڵ ڕوقیەی خێزانی لە مەککە مانەوە[٣] هەتا خودای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی مەدینەی دا، ئەویش کۆچی کرد بۆ مەدینە. عوسمان لەوەتی موسڵمانبووە بە هەموو جۆرێك هۆگری پێغەمبەر ﷺ بووە، قەت لێی جودا نەبۆتەوە، مەگەر بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردبێت یان بۆ ئیشێك ڕۆشتبێت. هیچ کەسێکیش بە ئەندازەی عوسمان، بەهرەمەند نەبووە لە بەهرەی پێغەمبەر ﷺ. عوسمان لە هۆگرییەکەیدا وەکو خەلیفە راشیدینەکان بوو، ئەم خەلیفانەش وەك بڵێیت، یەك لە دوای یەك پالێوراوو تایبەتو دەستنیشانکراو بوون، بۆ جێنشینایەتی[٤]. لەڕاستیدا عوسمان، لە سەر پردێکی مەحکەم بوو بۆ وەرگرتنی ئەم ئایینە پیرۆزە، هیچ هەواڵێکی تایبەتیو گشتی پێغەمبەری ﷺ لە دەست دەرنەچووە، بە هەمان شێوە لە زەمانی هەردوو خەلیفە بەرێزەکەشدا تەنها ساتێك فەرامۆش نەبووە، بە گوزارشتێکی تر، ئەو کردارەی کە ئەمڕۆ پێی دەوترێ ڕێکخستن[٥]، لە وڵاتی ئیسلامدا نەیدەهێشت لە کیسی بچێتو لەدەست دەربچێت، بەڵکە یەك بەیەك هەنگاوی پێشینەکانی خۆی لە ژیانی کردەییدا جێبەجێ دەکرد.

---

[١] الصواعق المرسلة (١/٣١٤).

[٢] المعرفة والتأريخ (٣/٢٦٨) ضعيف الاسناد.

[٣] السيرة النبوية لابن هشام (١/٤٠٢).

[٤] عثمان بن عفان للعقاد، ص (٨٠).

[٥] عثمان بن عفان للعقاد، ص (٧٨).

## باسی دووەم: ژیانی عوسمان ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ لەگەڵ قورئاندا

ئەو ڕێبازە پەروەردەیەی کە عوسمان‌و گشت هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەر گۆشکرا، قورئانی پیرۆز بوو. ئەم قورئانەش لە لایەن پەروەردگاری جیهانەو دادەبەزی‌و پێغەمبەری خۆشەویستمان بەسەر هەموو قسەکاندا قورئانی هەڵبژاردبوو .. زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی کە قورئان تاکە مەرجەع‌و سەرچاوەبێت‌و بکرێتە تاکە ڕێبازی پەروەردەیی بۆ تاك‌و کۆی موسڵمانان. لەم ڕوانگەیەشەوە، عوسمان، ئەو ئایەتە پیرۆزانەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەری گرتبوو، ڕاستەوخۆ کاریگەری بەرچاوی لەداڕشتنی کەسایەتیدا هەبووەو بە جوانی دڵی خاوێن کردبۆوە. قورئان لەگەڵ ڕۆحی عوسماندا کارلێکی کردبوو بە جۆرێکی وەها کە بەتەواوی گۆڕی‌و کردی بە مرۆڤێکی تر بە خۆی‌و ئامانج‌و ڕەفتارو بەهاو ماریفەتییەوە[1]. ئیمامی عوسمان لکابوو بە دەقەکانی قورئانەوە، ئەبو عەبدوڕەحمانی سەلەمی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: "ئەو کەسانەی ئێمەیان فێری قورئان کرد وەکو عوسمانی کوڕی عەفان‌و عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو غەیری ئەمانە، هەر کاتێك (١٠) ئایەتی قورئان فێربووبن، یان وەریانگرتبێت لەپێغەمبەرەوە ﷺ بەسەریدا تێنەپەڕیون هەتا بە چاکی زانیویانە، چ زانست‌و چ کردەوەیەکی تێدایە هەتا کاری پێ بکەن". ئەبوعەبدورەحمان درێژەی پێدەداو دەڵێت: "دەیانوت ئێمە کە فێری قورئان دەبووین لە هەمان کاتدا فێری زانست‌و کردەوەکەشی دەبوین پێکەوە، بۆیە ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی فێربوونی یەك سورەت دەبووین[2]، هەروەك خودای گەورە دەفەرمویت (كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُوا الأَلْبَابِ)". (ص: ٢٩).

لە عوسمانەوە ڕیوایەت کراوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی"خيركم من تعلم القران وعلمه"[3] عوسمان، هەموو قورئانی خوێندۆتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، بەر لەوەی وەفات بکات. دەرکەوتووترین قوتابی عوسمان لەبواری فێرکردنی قورئانیشدا ئەبو

---

[1] السيرة النبوية للصلابي (١/١٤٥).

[2] الفتاوى (١٣/١٧٧).

[3] البخاري، فضائل القران، رقم (٥٠٢٧).

عەبدولڕەحمانی سەلەمیو موغەیرەی ئەبی شەهابو ئەبو ئەسوەدو زوڕەی کوڕی حوبەیشە[1]. هەر لە بارەی ڕێزی قورئانەوە مێژوو، کۆمەڵێك وتەی ئیمامی عوسمانی تۆمارکردووە، بۆ نمونە دەفەرمویێت: "ئەگەر دڵمان خاوێن بێت هەرگیز لە فەرمایشتەکانی خودای گەورە تێر نابین"[2]. هەروەها دەفەرمویێت: "پێم ناخۆشە ڕۆژێك تێپەرێت بەسەرماو چاوم بە قورئان نەکەوێت"[3]. هەروەها دەفەرمویێت "لە دونیا سێ شتم لەلا نازدارە: تێرکردنی برسییەکان .. پۆشتەکردنەوەی ڕەجاڵەکان.. خوێندنەوەی قورئان"[4]. هەروەها دەفەرمویێت: "چوار شت هەیە بە ڕواڵەت فەزڵە، بەڵام لە ڕاستیدا فەرزن ئەوانیش: تێکەڵاوی چاکەکاران فەزڵە، بەڵام شوێنکەوتنیان فەرزە. خوێندنەوەی قورئان فەزڵە، بەڵام ئیشپێکردنی فەرزە. سەردانی گۆڕستان فەزڵە، بەڵام خۆئامادەکردن بۆ مردن فەرزە. سەردانی نەخۆش فەزڵە، بەڵام وەسیەتکردن فەرزە"[5]. هەروەها دەفەرمویێت: "دە بەڵا هەیە شتەکانی تر وێران دەکات، زانایەك پرسیاری لێ نەکرێت، زانستێك کاری پێنەکرێت، بۆچونێك پەسەند نەکرێت، تفەنگێك تەقەی پی نەکرێت، مزگەوتێك نوێژی تێدا نەکرێت، قورئانێ موتاڵا ـ نەکرێت، سەرەوەتێك لێی نەبەخشرێت، وڵاخێك بارنەکرێت، زانستی کەمویستی (زهد) لەسینەی دونیاویستێکدا بێت، تەمەنێکی درێژ تویێشووی سەفەری پێ نەبێت"[6].

عوسمان ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ قورئانەکەی خودای گەورەی لەبەر بوو، هەرگیز ژوورەکەی بێ قورئان نەبوو، تەنانەت لەمبارەیەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا کردووەو فەرموویەتی "ئەو قورئانە پیرۆزەو پیرۆزێکیش هێناویەتی"[7]. عوسمان، کۆچی دوایی نەکرد هەتا قورئانەکەی بەردەستی لە ئەنجامی خوێندنەوەو تێڕامانو ئەمدیودیوکردن،

---

1 تأريخ الاسلام، عهد الخلفاء الراشدين للذهبي، ص(٤٦٧).

2 الفتاوى (١١/١٢٢)، البداية والنهاية (٧/٢٢٥).

3 البداية والنهاية (٧/٢٢٥)، فوائد الكلام، (ص٢٧٥).

4 ارشاد العباد للاستعداد ليوم المعاد، (ص٨٨).

5 المصدر نفسه (ص٩٠)، فرائد الكلام (ص٢٧٨).

6 المصدر نفسه (ص٩١)، فرائد الكلام (ص٢٧٨).

7 البيان والتبعيان في فضل الشهيد عثمان (٣/١٧٧) فرائد الكلام، (ص٢٧٣).

درا[1]. تەنانەت خێزانی عوسمان لە ڕۆژی گەمارۆدانیدا وتی: "یان بیکوژن یان وازی لیّ بهێنن، وەڵلاهی لەیەك ڕكاتی شەونوێژدا هەموو قورئانی خوێندووە"[2].

عوسمان ئەو ئایەتەی تێدا بەرجەستە بووە کە خودای گەورە دەفەرموێت: (أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاء اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الْأَلْبَابِ) (الزمر: ٩). عوسمان، تاسقی شکابوو لەلەزەتی قورئان، چەندین ساڵ قوتابی بەردەستی پێغەمبەر ﷺ بوو، لەدیدی قورئانەوە تێگەیشتبوو کێ خودای ڕاستەقینەیەو دەبێت بپەرسترێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ چەمکی ئایەتە پیرۆزەکانی لە ناخیدا چاندبوو، بە هەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ زۆر بە پەرۆش بوو کە هاوەڵانی لەسەر وێنەیەکی دروست بەرامبەر پەروەردگارو مافەکانی پەروەردە بکات، تا لە ڕێگەی ئەم وێنەیەشەوە بگەن بە کۆگای متمانەو باوەڕ. لەم لایەنەشەوە عوسمان، گەشتە ئەو ڕادەیەی دیدو بۆچوونی خۆی بەرامبەر خودای پەروەردگارو بوونەوەو ژیانو بەهەشتو دۆزەخو قەزاو قەدەرو ناخی مرۆڤو کێشمەکێشمی لەگەڵ شەیتاندا لە قورئانو سونەتەکانی پێغەمبەرەو هەڵبهێنجێتو فەراهەم بێنێت. بۆ نموونە بەرامبەر بە خودای گەورە بەوپەڕی سوپاسەوە ستایشی دەکرد، بەبێ گەردو لەخاوێن خاوێنتر ناوی دەبرد، بە تاكو تەنیاو بێ شەریكو بێ کوڕو هاوسەر لێی دەڕوانی، هەروەها نەخشەی بۆ ڕۆشنایی بەندایەتییەکەی کێشابوو، بە تایبەت خوداپەرستییەکەی لە چوارچێوە دروستدا وێنا کردبوو[3]، بە هەمان شێوە تێڕوانینی بۆ بوونەوەر لە چەمکی قورئانەوەو لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەوە وەرگرتبوو (قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَاداً ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ) (فصلت: ٩). هەروەها بەرامبەر ژیانیش تێڕوانینی وابوو ژیان هەرچەندە درێژبێتەوە حەتمەن هەر کۆتایی دێتو دەبڕێتەوە، خۆشییەکان هەرچەندە زۆرو گەورەبن هەر کەمو

---

[1] البداية والنهاية (٢٢٥/٧).

[2] البداية والنهاية (٢٢٥/٧).

تێبینی: لەو ڕکاتە نوێژەی کە عوسمان هەموو قورئانی تێدا خوێندووە نوێژی تری نەکردووە. الخلافة الراشدة والدولة الاموية، (ص٣٩٧).

[3] منهج الرسول في غرس الروح الجهادية، ص (١٦/١٠).

بێ نرخن، لەچاو ژیانی قیامەتدا. ئەمەشی لەم ئایەتە وەرگرتبوو: (إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاء أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالأَنْعَامُ حَتَّىَ إِذَا أَخَذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا..) (يونس: ٢٤).

هەر بەم دەستورە لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی بەهەشتو دۆزەخدا دەیڕوانییە باسو خواسەکانی بەهەشتو ئاگرو کردبوونی بەبناغەیەك بۆ خۆشیو ناخۆشییەکانی خۆی، بۆ ئەوەی لەبەرنامەکەی خودای گەورە لا نەداتو تووشی گێرمەو کێشمە نەبێت، لەم ئاسۆیەوە بۆمان دەردەکەوێت، عوسمان، بیروبۆچوونو ژیانی هێندە قوڵو بەرینە هەموار ناکرێت. چونکە تێگەیشتنێکی بەرفراوانی هەبووە دەربارەی خودای گەورەو زۆر ترساوە لە سزاو تۆڵەی ئەو، ئەمە جگە لەوەی کە بەباشی لە قەزاوقەدەر تێگەیشتبوو، ماناو مەبەستەکانی لە دڵدا چەقیبوو شارەزای پلەو قۆناغەکان بوو بوو، دڵنیابوو کە زانستی خودای گەورە، دەوری هەموو شتێکی داوە، وەك لەچەندین ئایەتدا ئاماژەی پێ کراوە، لەوانەش: (..وَلاَ تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلاَّ كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُوداً..).

هەرشتێك بێتە بوون لە ئەنجامی نووسینەکەی خودای گەورەوەیە، هەمیشە ئارەزووی باڵای ئەو، جێبەجێ دەبێت، توانایەکی بێ سنووری هەیە بۆ بەدیهێنانی ئەو شتەی کە دەیەوێت ببێت، چونکە سەرەتای هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ دروستکراوی خۆی.

عوسمان لە چەمكو ڕاڤەی ئایەتە قەدەرییەکان بیرو باوەڕی خۆی داچەسپاندبوو، سوودو کەڵکێکی زۆری لێ بەدەستهێنابوو، هەر بە هەمان شێوە ناخی خۆیو نەوەکانی تری هەڵسەنگاندبوو، دەیگوت دروستبوونی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ دوو بنجو بنەما، بنجی یەکەم: کە دروستبوونی مرۆڤە لەگڵ، پاشان خودای گەورە ڕێکیخستو گیانی کرد بە بەریدا. بنجی دووەمیش: دروستبویەتی لە تۆرماو، وەکو خودای گەورە دەفەرموێ: (الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ) (السجدة: ٧).

عوسمان، باش زانیبووی کە مرۆڤ دروستکراوی خودای گەورەیەو بە دیمەنێکی جوانو قەدو باڵایەکی ڕێکوپێك، سفت کراوە. بە ژیریو گوتنو جیای کردۆتەوەو ڕێزی لێگیراوەو هەرچی لە ئاسمانو ڕێسماندایە بۆی ڕامکراوەو پتر لە دروستکراوەکانی تر ڕێزی لێ گیراوە. تەنانەت مرۆڤ بەسەرداری بوونەوەرەکانی تر ناسراوەو بەناردنی

پێغەمبەران لەوانو بۆ ئەوان ڕێزی لێ گیراوە. ناسکترین چوارچێوەیەك کە خودای گەورە کێشاویەتی بۆ ڕێزو نازی مرۆڤ ئەوەیە کە سەرجەم مرۆڤی کردۆتە گرۆیەك بۆ خۆشەویستیو ڕێزلێنانی خۆی، سروشتیشە ئەم ڕێزە بەشوێنکەوتنی پێغەمبەران ﷺ ببێت، کە پیشەیان بانگکردنی خەڵکە بۆ ئیسلامەتی هەتا لە دونیاو قیامەتدا بە ئارامیو سەربەرزی بژینو حەسانەوەی دواڕۆژ وەکو هەڵێ بقۆزنەوە، هەروەك خودای گەورە پەیمانی داوە ژیانو گوزەرانی ئەو کەسانەش پڕ لە خۆشی بکات کە کرداری چاك دەکەنو دەفەرموێت "مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ". (النحل: ٩٧).

عوسمان ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ هەر لە بەرتیشکی ئایەتەکانی قورئان ڕەگی کێشمەکێشمی نێوان مرۆڤ و شەیتانی بەچاکی ناسیبوو، کە شەیتان دوژمنێکی سەرسەختە لە پێشەوەو لە دواوەو لە ڕاستەوەو لەچەپەوە پەلاماری مرۆڤ دەدات، گزمەتە دەکاتو وەسوەسەو سەرپێچی دەخاتە دڵیەوەو کوانوی ئارەزووبازی مرۆڤ هەڵدەگیرسێنێت، بۆیە بە توندی پەنای بە خوادی گەورە بەستبوو، توانیشی لە ژیانیدا سەرکەوێت بەسەریدا، چونکە لە چیرۆکی باوا ئادەمو شەیتان پەندی وەرگرتبوو، کە بناغەی مرۆڤو مرۆڤایەتییە. کەواتە مرۆڤ شایانی ئەوەیە بکەوێتە هەڵەوە بۆیە پێویستە ئیماندار بەقایی پشت بەخودای گەورە ببەستێتو زۆر بایەخ بە تەوبەو گەڕانەوە بداتو هەردەم داوای لێخۆشبوون بکاتو دورەپەرێز بێت لە ئیرەیی و گرنگی بدات بە گفتوگۆی شیرینو قسەی باش لەگەڵ هاودەمەکانو دەوروبەرەکەیدا، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: (وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلإِنْسَانِ عَدُوّاً مُّبِيناً) (الإسراء: ٥٣). خودای گەورە بە ئیسلام ڕێزی نا لە عوسمان، پێی ژیاو بۆی تێکۆشاو لە پێگەیاندنی بنەماو لقەکانیدا بە پێی قورئانو سوننەت هەوڵیداو بوو بەیەکێك لە پێشەوا چاوساغەکانو بوو بە یەکێك لەوانەی نەخشەی ژیانیان بۆ خەڵك دەکێشا، پێویستە خەڵکی وا بەستەی کردارو گوتاری عوسمان بێت، با ئەوەشمان لە بیرمان نەچێت، عوسمان، نوسەری وەحی بووە، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ[1].

---

[1] السياسة المالية لعثمان (ص٢٢)، التبين في انساب القرشين، (ص٩٤).

## باسی سێیەم: ئـالودەیی ئیمـامی عوسمـان بـە پێغەمبـەرەوە ﷺ لـە مەدینەدا

ئەو پاڵپشتە بەهێزەی کاری کردە سەر کەسایەتی عوسمان‌و بەهرەکانی دەرخست‌و وزەی هەڵقولاندو دەروونی پاکژ کردەوە، هاوڕێیەتی‌و ئالودەیی پێغەمبەر بوو ﷺ. عوسمان لەدوای موسڵمان بوونی، هەمیشە وەکو قوتابی لەبەردەست پێغەمبەردابوو، هەر لە مەککە لێی دوور نەکەوتەوە هەتا ژیانی مەدینەشی بەسەر برد، عوسمان دەروونی خۆی وا ڕێکخستبوو هەمیشە پەرۆشی قوتابخانەی پێغەمبەرایەتی بوو بۆ گشت لقە جیاوازەکانی زانست، زۆریش سوربوو لەسەر فێربوونی قورئان‌و سوننەت لەسەر دەستی سەرداری مرۆڤایەتی.

ئەوەتە عوسمان خۆی باسی هۆگریەکەی خۆی دەکات بەپێغەمبەرەوەو دەڵێت "خودای گەورە بە ڕاستی موحەممەدی ﷺ ڕەوانە کردو پەڕاویشی لەگەڵدا نارد، منیش یەکێك بووم لەوانەی کە چووم بە پیری بانگەوازەکەیەوەو باوەڕم پیّ کرد، لە سەرەتای ئیسلامدا دوجار کۆچم کردو خودای گەورە خەڵاتی کردم بەزاوایەتی پێغەمبەرەکەی‌و منیش خستمە سەر چاوانم"[1].

بە ڕاستی عوسمان لەسەر ڕێبازی قورئان پەروەردە کراو مامۆستاکەشی نێردراوی خودای گەورەبوو، یەکەمین هەنگاوی پەروەردەی عوسمان بریتیبوو لەدیدارو گفتوگۆی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، بەم دیدارەش گۆڕانێکی سەیرو شارەزاییەکی کتوپڕ هاتە زیهنی‌و لەبازنەی تاریکی دەرچوو بەرەو بازنەیەکی ڕووناك، ئیمانی وەرگرت‌و کوفری فڕێدا، هێزو گوڕێکی وای هاتە بەر کە بتوانێت هەموو تەنگ‌و چەڵەمەو ناسۆرییەکانی ژیان هەڵبگرێت لە پێناو ئیسلام‌و بیروباوەڕە پیرۆزەکەیدا، سەرەڕای کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ کە کاریگەرییەکی بەهێزی هەبوو لە کێشکردنی دەوروبەرەکەی، خودای گەورە هەڵی خستبوو کردبووی بە تەواوترین وێنەی مرۆڤ لە مێژووی ژیانی سەرزەویدا، ئەوەندە گەورەیی دەنواند ببوە خۆشەویستی خەڵکی‌و بەسەرسوڕمانەوە دەوریان لێدەداو بە تایبەت هەوادارەکانی لە هەر چوارلاوە لێی دەمروشانەوەو خۆیان پێوە دەنوسان‌و ئەو

---

[1] فضائل الصحابة لابي عبدالله أحمد بن حنبل (٥٩٧/١)، اسناده صحيح.

ئەڤینو سەرسامییە ناچاری دەکردن خۆشیان بوێت. هەرچەند پێغەمبەر ﷺ جگە لەم گەورەییە گەورەییەکی تر ببوە خەڵاتی ئەویش هەڵسوکەوتی پێغەمبەرییەتیو فرۆستادەیی بوو کە لە لایەن خودای گەورەو نیگای بەسەردا دەخوێنرایەوەو کرابووە بانگەوازکاری مرۆڤایەتی بۆ سەر ڕاستە شەقامی ئیسلامەتی، ئەم ڕەهەندەش کاریگەرییەکی تایبەتمەندی هەبووە لەسەر باری دەروونی ئیماندارەکانی بەردەستی. وەنەبێت ئیمانداران لەبەر بەرژەوەندی خۆیان خۆشیان ویستبێت وەك چۆن خەڵکی سەرۆکێکیان خۆش دەوێت. بەڵکە لەبەر ئەو دوو گەورەییەبوو، یەکێك گەورەیی پێغەمبەرایەتی، دووەم گەورەیی ڕەفتاری شیرینی، واتە دابەزینی نیگاو ساغو سەلامەتی کەسایەتییەکەی هەردوکیان لێك ئالابوونو مرۆڤێکی مەزنیان دروست کردبوو نێردراوێکی مەزنیان بەرجەستە کردبوو. لەم رووەشەوە عوسمان، ئەوینێکی قوڵو بەرفراوان هەبوو لە دڵیدا بەرامبەر نێردراوی مرۆڤایەتیو مرۆڤێکی نێردراو ئەم دوو چەمکەی ئاوێتەی یەك کردبوو لە هەستی خۆیداو بە توندی گرێی دابوو کردی بە خاڵی وەرچەرخانی دڵو دەروونی بەرەو خۆش ویستنی خودای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ. عوسمان، ئەم خۆشەویستییەی کرد بە داینەمۆی جوڵەو هەستو هۆشی، هەر لە سایەی ئەم خۆشەویستییەشەوە بوو کە نەوەی یەکەمی هاوەڵانی بزوانو ببونە نەمامی پەروەردەی ئیسلامەتیو مەکۆی دەرچوونی ورەی بەرزو هەنگاوی پیرۆز[1]، لە هەمان کاتدا بە هۆی هاودەمی پەروەردەی پێغەمبەرەوە ﷺ چەندین دۆخی تری ئیمانی بەدەست هاتووە، بە تایبەت بۆ عوسمان کە فێرخوازێکی زیتەڵ بووەو فێری قورئانو سوننەتو ئەحکامەکانو دەرون پاکی بووە.

عوسمان، لەماوەی ئالودەبوونی بە پێغەمبەر ﷺ سەرگەرمی قاڵبوونەوە بووە لە سوننەتەکانی ئاشتیو غەزاکردنو بابەتەکانی تر، هەروەها ئەم پێکەوەژیانە بوو بە دەسمایەی عوسمان و خۆی پێ ڕازاندبووەوە بە جوانی وەکو تیشکێکی پرشنگدار بەکاری دەهێنا لە کاروباری غەزاو ناسینی سروشتو غەریزەکاندا.

---

[1] الامين ذوالنورين، محمود شاكر، (ص٤٠).

لەمەودوا هەڵوێستەکانی عوسمان لە گۆڕەپانی تێکۆشانو باری ڕامیاریو کۆمەڵایەتیو ئابووریدا ڕوون دەکەینەوە بەتایبەت لەقۆناغی مەدینەدا کە لەخزمەتی پێغەمبەرەدا ﷺ بووە.

**یەکەم: عوسمان لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ لە گۆڕەپانی تێکۆشاندا**

پاش ئۆقرەگرتن لە شاری مەدینە پێغەمبەر ﷺ دەستورێکی دارِشت بۆ چەسپاندنی ستوونەکانی وڵاتی ئیسلامیو هەستا برایەتی خستە نێوان کۆچەریو یاریدەدەران (أنصار)، هەر کۆچەرێك ئەنسارییەکی دەکردە برای خۆی، لەم برایەتییەشدا عوسمان بەر ئەوسی کوڕی سابیت کەوت، پاشان هەستا بە دروستکردنی مزگەوتێكو پەیماننامەیەکیشی لەگەڵ جولەکەکان بەستو بزووتنەوەی پارتیزانی دامەزراندو زۆر بایەخی بە دروستکردنی کۆشکی ئابووریو پەروەردەکردنو فێرخوازی دەدا لە کۆمەڵگای مەدینەدا. عوسمان یەکێك بوو لە ستونەکانی وڵاتی ئیسلامیو هەرگیز درێغی نەدەکرد لە ماڵو سەروەتدانو جگە لەبەدر لە گشت ڕاوێژو جەنگەکاندا بەشداریی هەبووە[1].

**١ـ عوسمانو جەنگی بەدر**

کاتێك موسڵمانان دەرچوون بۆ غەزای بەدر، ڕوقیەخانی کچی پێغەمبەر ﷺو خێزانی عوسمان نەخۆش بو، نەخۆشی سورێژەی هەبوو، بە تایبەت لەو کاتەی جارِی ڕێگەگرتن لە کاروانەکەی ئەبو سوفیان درا ڕوقیە لە ناو جێگەدا کەوتبوو، عوسمانیش بە گوردەمییەکەوە هات لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵاندا دەربچێت کەچی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ فرمان کرا کە عوسمان لای ڕوقیە بمێنێتەوە، چونکە زۆر نەخۆشە. عوسمانیش بەسنگێکی فراوانەوە فەرمانەکەی وەرگرت، لای ئەم هاوسەرە بەرێزەی بە ئارامی مایەوەو لەئەنجامدا نەخۆشییەکە زۆری بۆ هێناو تارمایی مەرگ خۆی کێشا بە سەریداو زۆر مەخابن ئەو دەمەی کەوتە گیان سپاردن زۆر پەرێشان بوو بۆ دیداری پێغەمبەر ﷺ کە لە بەدر بوو، هەروەها بۆ دیتنی زەینەبی خوشکی کە لە مەککە بوو، عوسمان شینی داناو ئەشکەكو پەژارە پەردەی دڵی دەبشارد[2]، بەم شێوەیە ڕوقیە

---

[1] الخلفاء الراشدون، عبدالوهاب النجار، (ص٢٦٩).

[2] نساء أهل النبي، أحمد خليل جمعة، (ص٤٩١ ـ ٥٠٤).

ماڵئاوایی کرد لەچرکەکانی ژیانو شایەتیدابوو کە تەنها خودا تاكو تەنیا شایانی پەرستنە. موحەممەدی باوکیشی ﷺ فروستادەی خودای گەورەیە. ڕوقیە لە دونیا بڕاو گەشتە چینی باڵاو هەر چەندە باوکی نەبینیو باوکیشی ئامادەی ناشتنی نەبوو، کفن کراو تەرمی پیرۆزی بەشان هەڵگیراو مێردەکەشی بەداماوی بە شوێنیەوە بوو، هەتا گەیاندیانە گۆڕستانی بەقیعو لەوێ نێژرا.

بە راستی فرمێسکی تەعزییەباران لێزمەی دەکردو کچی پێغەمبەر ﷺ نێژرا زۆری نەبرد جەنگاوەرانی بەدر گەڕانەوە، زەیدی کوڕی حاریسە ڕێشمەی وشترەکەی پێغەمبەری ﷺ بەدەستەوەبوو، خۆش خۆش مزگێنی سەرکەوتنی موسڵمانو کوشتارکردنی "قارەمانە" بتپەرستەکانی ڕادەگەیاند، موسڵمانەکانی مەدینە بەم هەواڵە دەموچاویان گەشایەوە، یەکێکیش لەو خۆشحاڵانە عوسمان بوو، بەڵام هەرچی کرد نەیتوانی تازێباری کۆچی ڕوقیە بشارێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کە وەفاتی ڕوقیەی بیست هەستا چوو بۆ گۆڕستانی بەقیعو لەسەر گۆڕەکەی وەستاو لای خودا بۆی پاڕایەوە[1]. عوسمانی کوڕی عەفان، لەو کەسانە نەبوو بە ئەنقەست لەبەر دواکەوتنی یا لەبەر کەمتەرخەمی نەچووبێت بۆبەدر، یان هەڵهاتبێت وەك خەڵکێکی ئارەزووباز لەسەری دەهۆننەوەو تەشەری لێ دەدەن. بەڵکە تەنها ئەو، ویستوویەتی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ بکات، هەتا ئەو فەزڵە بەخشرا بە ئەهلی بەدر بەهۆی گوێڕایەڵی پێغەمبەرەوە ﷺ بە هەمان شێوە عوسمانیش هاتە ژێر ئەو فەزڵە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەڕێگا گەڕاندیەوە بۆ ئەوەی بەدیار کچەکەیەوە بمێنێتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا گوێڕایەڵییە واتە هەمان فەزڵی گوێڕایەڵی هاوەڵانی تری هەیە. هەروەها عوسمان وەکیلی پیغەمبەر ﷺ بووە، بۆ شاری مەدینە، ئەمەش لەلایەك ئاشکرایە عوسمان وەکو ئەوانی تر غەنیمەو پاداشتی بەرکەوتو لە فەزڵو چاکە بەشدارە، چونکە ملکەچو گوێڕایەڵی پێغەمبەری ﷺ کردووە[2].

عوسمانی کوڕی عەبدوڵلای موهەلەب دەڵێت: پیاوێك لە میسرەوە هات بۆ حەج کردن، وتی: ئەی ئیبنو عومەر پرسیارێکت لێ دەکەم بەڕاستی وەڵامم بدەرەوە، ئایا

[1] دماء علی قمیص عثمان بن عفان (ص٢٠).

[2] کتاب الامامة، الرد علی الرافضة، للأصبهاني، (ص٣٠٢).

ڕاستە عوسمان لە بەدر دواکەوتووە؟ ئەهلی بەدر نییە؟ ئەویش وتی بەڵێ لە غەزای بەدردا دیار نەبوو، بەڵام ئەوکاتە ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ، کە خێزانی عوسمان بوون زۆر نەخۆش بوو، بەدیاریەوە مایەوە، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو پاداشتی پیاوێکی هەیە کە جەنگی بەدری کردبێت، پشکێك لە غەنیمەتیشی دەکەوێت[1].

دیسان ئەبی وەهیلەوە لە عوسمانی کوڕی عەفانەوە دەگێڕێتەوە، عوسمان فەرمویەتی ڕۆژی بەدر بەجێمام، بە بۆنەی کچەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ، لە دوایدا پشکێکی غەنیمەیان پێدام، لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: هەرکەسێك پێغەمبەر ﷺ پشکی بداتێ ئەوە ئامادەی بەدر بووە[2]، بە کۆی ڕای زانایانیش عوسمان بەئەهلی بەدر دەژمێردرێت[3].

## ٢ـ عوسمانو جەنگی ئوحد

لە سەرەتای جەنگی ئوحددا خودای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانانو شمشێرەکانیان بڕشتی خۆی بڕیو گەردنی موشریکەکانی لەتو پەت کردو بە عالەمی ئاشکرا هەرەسیانهێناو کوژران، ئەو ژنانەش، کە گۆرانییان دەوتو دەفیان لێ دەدا، کەوتنە چریكو چاكو دەفەکانیان فڕێداو بەزەبری شمشێر هەڵزنان بە شاخەکەداو لاقیان بەدەرەوەبوو، بەڵام تای تەرازووی جەنگەکە لە ناکاو کەوت بەو دیوداو هاوکێشەکە ئاوەژوو بوویەوە، هۆی ئەمەش لەبەر ئەو تیرئەندازانە بوو کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەوی شاخەکەوە سەنگەری بۆ دیاری کردبوونو پێی فەرموون "ئەنجامی شەڕەکە هەر چۆن بوو ئێوە سەنگەر چۆڵ نەکەن"، کەچی ئەوانیش هەڵەیان کردو کەمێکیان نەبێت هەموویان هاتنە گۆڕەپانی شەڕەکە، کاتێکیش بێباوەڕەکان ئاوڕیان دایەوە سەیر دەکەن موسڵمانەکان مەشغوڵی کۆکردنەوەی دەست کەوتن. خالیدی کوڕی وەلیدی سەر لەشکری چەکدارانی قورەیش، لەگەڵ عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهلدا هەلیان قۆستەوەو بیریان کردەوە بە ئەسپ سواری بدەن بەسەریانداو لەئەنجامی ئەمەشدا ئەو بڕە تیربازەی

---

[1] البخاري، رقم (٣٦٩٨).

[2] الامامة والرد على الرافضة، (ص٣٠٤).

[3] عثمان بن عفان، صادق عرجون، (ص٤٧).

که به تکاو رجای ئەمیرەکەیان، عەبدوڵڵای کوڕی جوبێر، مابوونەوە شەهید کران. لە ئەنجامی بێئاگایی موسڵمانان، سەرلەشکری موشریکەکان کە خالید بوو، دای بەسەر ئەوانی تریشداو کوشتاری کردنو تاقمێك لە موسڵمانان کەوتنە هەڵداوانو لە نزیك مەدینە شەهید کران یەکێك لەو کەسانەی کە نەگەڕایەوەو هەڵهات لە گۆڕەپانی شەڕەکە هەتا هەردوو لا، بڵاوەیانکرد، عوسمانی کوڕی عەفان بوو. تاقمێکیش خۆیان کردە قۆچی قوربانی لەبەر بڵاوبوونەوەی دەنگۆی شەهیدبوونی پێغەمبەر ﷺ. ئەو تاقمەی کە شکانو هەڵهاتن عوسمانیشیان لەگەڵدابوو، خودای گەورە بە دەقی ئایەت گوزەشتەی لێکردنو هەتا قیامەت بەخشینی، بەپێی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا اللّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ) (آل عمران: ١٥٥).

تەماشا دەکەین خەڵکانی هەوەسباز جگە لە هەوای دەروونی خۆیان هیچی تر پەسەندناکەنو ناوی یەکێکیتر نابەنو تەنها عوسمان تۆمەتبار دەکەن. ئایا هەر عوسمان هەڵهاتو نەگەڕایەوە؟[1] ئەگەر واشی کردبێت، بەهەڵەداچوونێکی دەروونی خۆی بووە، سەرەڕای ئەوەش خودای گەورە لە ڕاکردووەکان خۆشبووە، ئیتر چی تێدا ماوەتەوە، حوکمەکە ڕۆشنو ئاشکرایەو هیچ ئاڵۆزیو گێژاوێکی تێدا نییە. لە دوای دابەزینی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئیتر هیچ گلەییەك لە عوسمان ناکرێت[2]، ئەو ئایەتە بەسە کە بە دەقی قورئان خواد لێی خۆشبووە، تێکۆشانو غەزاکانی تر شاهیدن کە عوسمان چەندێ ئازاو دلێرو دوور بووە لەو تۆمەتانەی بەناڕەوا بۆی هەڵدەبەسن.

**٣ـ شەڕی غەتەفان (ذي أمرة)**

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چوارسەد هاوەڵیدا هەنگاوی هەڵگرتو عوسمانی کردە بریکاری خۆی بۆ بەڕێوەبردنی شاری مەدینە، پێغەمبەرو هاوەڵانی ڕۆیشتن لە (زیل قیسە) پیاوێکی بەرەی دوژمنیان توش هات پێیان دەوت (جەباری خێڵی سەعلەبە)، گرتیانو هێنایان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش هەواڵو دەنگوباسی هۆزەکەی خۆی

---

[1] الامين ذوالنورين، محمود شاكر، (ص٤٩).

[2] ذوالنورين مع النبي، د. عاطف لماخه، (ص٣٢).

پێدان، وتی: هەرگیز نایەنە ڕێتان مادەم بیستویانە ئێوە هێرشتان بۆ هێناوەو هەڵهاتوون بۆ شاخەکان، من لەگەڵتان دێم، پێغەمبەر (ﷺ ئیسلامی پێ ڕاگەیاند، ئەویش قبوڵی کردو موسڵمان بوو، پێغەمبەریش ﷺ بە جۆرێك دەستی کردە ملی کە پێشتر بۆ هیچ کەسێك وەهای نەکردبوو، پاشان لەگەڵ بیلال دا ناردیو خۆیان بەرەو شاری مەدینە گەڕانەوە بەبێ ئەوەی تووشی هیچ کۆسپو تەگەرەیەك ببن. ئەم ڕووداوەش ماوەی (١١) ڕۆژی خایاند[1].

٤ـ لە جەنگی (ذات الرقاع)

هەواڵ گەشتە پێغەمبەر ﷺ کە کۆمەڵێك لە بەنی سەعلەبەو بەنی ئەنمار لە غەتەفان دەیانەوێت بدەن بەسەر مەدینەدا، پێغەمبەریش ﷺ بەخۆیو چوار سەد هاوەڵەوە دەرچوو بۆیان، کاتێك گەشتنە (سیرار) بەر لەوەی دەربچن عوسمانی کردە چاودێری مەدینە، لەغەتەفان موسڵمانان تووشی حەشاماتێکی زۆر هاتنو نزیکی یەکتری کەوتنەوە، بەڵام جەنگ لە نێوانیاندا ڕووی نەدا. ئەوەندە مەترسییان هەبوو بۆ سەر یەکتر، پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی بۆ کردنو پاشان لەشکرەکەی گەڕاندەوە بە سەلامەتیو ئەم دوورکەوتنەوەیەش لەمەدینە ماوەی ١٥ ڕۆژی خایاند[2].

٥ـ لە پەیمانی ڕیزواندا

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبیە دابەزی بە پێویستی زانی نوێنەرێکی تایبەتی بنێرێت بۆ لای قورەیش بۆ ئەوەی ڕازو نیازی ئاشتیخوازانەی موسوڵمانەکانیان پێ ڕابگەیەنێت، پێغەمبەر ویستی بەقورەیش بڵێت بە تەمای کوشتار نییەو زۆر سوورە لەسەر ڕێزلێنانی شتە پیرۆزەکانو دەیەوێت مەراسیمی عەمرە بەجێبهێنێتو دواتر بگەڕێتەوە بۆ مەدینە. یەکەمجار (خەراشی ئومەیەی خوزاعی) دەستنیشانکرا بکرێتە نوێنەر. خەراش، وشترێکی هەبوو پێیان دەوت (سەعلەب) بە نوێنەر ناردیان بە سواری سەعلەبەکەی کاتێك چووە مەککە قورەیش وشترەکەیان سەربڕیو ویستیان خۆشی بکوژن، بەڵام حەبەشییەکان نەیانهێشت، خەراش هاتەوەو بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە

---

[1] الروض الاونف (١٣٧/٩)، الطبقات لابن سعد (٣٤/٢، ٣٥).

[2] الامین ذوالنورین محمود شاکر، (ص٥٢، ٥٣).

پاشان پێغەمبەر ﷺ ویستی نوێنەرێکی تر بنێرێت، لەسەرەتادا عومەری خەتابی هەڵبژارد[1]، عومەریش داوای لێبوردنی کرد بۆ نەچوونی بۆ ناو قورەیش‌و ئاماژەی کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە عوسمان بنێرێت لەبری ئەو[2]، ڕوسورانە وەڵامەکەی خۆی بە بەڵگەوە خستە ڕوو، وەڵامەکەشی ئەمە بوو "هەرکەسێك نزیکی قورەیشی دوژمن ببێتەوە پێویستە بەرگری‌و داڵدەی هەبێ، ئەمەش بۆ من دەست نادات".

عومەر ئاماژەی کرد بۆ عوسمان، چونکە تیرەکەی دەی پارێزن لە ئەزیەتی موشریکەکان‌و دەتوانێت نامەکەی پێغەمبەر بگەیەنێت[3] و وتی: "من خۆم دەزانم، تۆش چاك دەزانی ئەی پێغەمبەر ﷺ من دوژمنی قورەیشم‌و بەنی عەدیش لەوێ نییە بەرگریم لێ بکەن، ئەگەر پێشت خۆشە ئەچمە لایان". پێغەمبەر ﷺ هیچی نەوت[4]، عومەر هەم وتی: "ئەی پێغەمبەر ﷺ پیاوێکت نیشان ئەدەم لەمەککە لەمن بەڕێزترەو هۆزەکەشی زۆرترەو دەشی پارێزن، ئەویش عوسمانە"، پێغەمبەریش ﷺ عوسمانی بانگکردو پێی فەرموو "بڕۆ بۆ لای قورەیش‌و پێیان بڵێ ئێمە نەهاتووین بۆ شەڕو کوشتاری هیچ لایەك تەنیا بۆ ئەوە هاتووین سەردانی کەعبە بکەین‌و حورمەتی بنرخێنین‌و دیارییمان هێناوەو سەری دەبڕین‌و دەگەڕێینەوە".

عوسمانیش بە نوێنەرایەتی پێغەمبەر ڕۆشت‌و گەشتە (بەلدەح) سەیردەکات قورەیش لەوێن، وتیان بۆ کوێ دەچیت؟ ئەویش وتی: "پێغەمبەر ﷺ ناردومی بۆ لای ئێوە بانگهێشتتان بکەم بۆ ئیسلام‌و خواپەرستی‌و هەمووتان وەرنە نێو دینی خواوە، دڵنیابن خودای گەورە دینی خۆی سەردەخات‌و پێغەمبەرەکەشی سەر بڵند دەکات، ئەمە دواهەمین ئاگاداریتانە، ئەگەر ئێوە زاڵبوون بەسەر پێغەمبەردا ﷺ ئەوا چیتان ویست بیکەن، خۆ ئەگەر ئەو زەفەری بە ئێوە برد ئەوا بە ئارەزووی خۆتانە ئەگەر بێنە ناو ئەو بازنەی کە عالەمی تێهاتووە یان بەشەڕ بێن لەگەڵیا". "ئێوە فرەو مۆڵن، شەڕ، شی‌و شیتاڵی کردوون‌و کەسە دیارەکانی لەناوبردوون".

---

[1] غزوة الحديبية لابي فارس، (ص٨٣).

[2] المعازي محمد عمر الواقدي (٢/٦٠٠).

[3] المصدر السابق.

[4] المصدر السابق.

عوسمان فره ئامۆژگاری کردن، بەڵام مەبەستەکەی ئەویان گەرەك نەبوو، بۆیە وتیان باش گوێمان لێبوو چیت وت، هەرگیز وانابێتو نابێت قەت بێنە ناومان، بە گوندەیی خۆمان دەتنێرینەوە بۆ لای هاوەڵەکەتو پێی بڵێ "نابێت بە هیچ شێوەیەك بێتە ناومان". ئەیانی سەعدی کوڕی عاس هەستا بە دەمی عوسمانەوەو پێشوازی لێ کردو داڵدەی داو وتی: "لەکاری خۆت دەست هەڵمەگرە، پاشان لەسەر وڵاخەکەی دابەزیو عوسمانی خستە سەر زینی ئەسپەکەی خۆیو خۆشی لە پاشکۆوە سوار بوو، بەم شێوەیە عوسمان چووە شاری مەککەو یەکە یەکە پیاوانی شار هاتنە خزمەتیو بەخێرهاتنیان کرد، ئەبو سوفیانو سەفوانو ئەوانی تر، بەڵام بەردەوام پێیان دەوت "نابێ موحەممەد بێتە ناومان"[1]. تەنانەت موشریکەکان خولکی عوسمانیان کرد تەوافی کەعبەش بکات، عوسمانیش نەی کرد[2]، هەستا نامەی پێغەمبەری ﷺ گەیاند بە چەوساوەکانی مەککەو مژدەی دەروی خێری پێدانو نامەیەکی زارەکی لەوان وەرگرت بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئەمەی تیابوو "سەلامی ئێمە بگەیەنە بە پێغەمبەر ﷺ پێی بڵێ ئەو خودایەی ئەوی هێناوەتە حودەیبیە هەر بەو جۆرەش دەتوانێت بیهێنێتە ناوەڕاستی مەککەش"[3]. لە ناکاو پڕوپاگەندەیەك دزەی کردە ناو موسڵمانەکان گوایە عوسمان کوژراوە، پێغەمبەر ﷺ بانگی هاوەڵانی کرد بۆ ئەوەی پەیمانی بدەنێ بۆ کوشتنی موشریکەکانو ڕاماڵینیان، هاوەڵانیش هاتن بە دەنگییەوەو پەیمانی مردنیان پێدا[4]، تەنها جەدی کوڕی قەیس نەبێت چونکە دوڕوبوو[5].

لەڕیوایەتێکی تردا پەیمانەکە لەسەر ئارامگرتن درا بەپێغەمبەر ﷺ[6]، ڕیوایەتێکیتر باس لەوە دەکات پەیمانەکە لەسەر ڕانەکردن بوو[7]، ئەمانەش هەموو

[1] زاد المعاد (٣/٢٩٠)، السيرة النبوية لابن هشام (٣/٣٤٤).

[2] زاد المعاد (٣/٢٩٠).

[3] غزوة الحديبية لابي فارس، (ص٨٣).

[4] البخاري، رقم الحديث (٤١٦٩).

[5] السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية، (ص٤٨٦).

[6] البخاري، رقم الحديث (٤١٦٩).

[7] مسلم، رقم (١٨٥٦).

نزيكو هاومانان. چونكه پەیمانیان لەسەر ئارامگرتنو هەڵنەهاتنو مردن بەستبوو[1]، یەكەم كەس ئەبوسینای عەبدوڵڵای وەهبی ئەسەدی بوو[2]، دوای ئەم هاوەڵان چوون لەسەر پەیمانەكەی ئەم پەیمانیاندا[3]، سەلەمەی ئەكوەع سێ كەڕەت پەیمانیدا لەسەرەتاو ناوەڕاستو كۆتایی[4]، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە دەستی ڕاستی خۆی "ئەمە دەستی عوسمانە خستیە ناو ئەو دەستەكەی تری"[5]. ژمارەی ئەو هاوەڵانەی پەیمانیان لێ وەرگیرا لە ژێر درەختەكەدا هەزارو چوارسەد هاوەڵ بوون[6]، قورئانی پیرۆز باسی هاوەڵانی پەیمانی ژێر درەختی ڕیزوانی كردووەو ڕێزو نەوازشی ئەوانە لە قورئانو سوننەتدا هاتووە، وەك دەفەرموێ (إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً) (الفتح: ١٠).

جابری كوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی حودەیبییە فەرمووی پێمان (ئێوە باشترین خەڵكی سەرزەوین) ئێمەش هەزارو چوارسەد هاوەڵ بووین، ئەگەر چاوم بمایە شوێنی درختەكەم نیشان دەدان"[7]. ئەم فەرموودانە بەڕاشكاوی باسی ڕێزو حورمەتی هاوەڵانی ژێردرەختی ڕیزوان دەكات، ئەمكاتە موسڵمانان گشتیان لەوێ نەبوون، بەڵكو ئەمە كۆمەڵێكیان بوو كۆمەڵێكی تریشیان لە مەدینەو شوێنەكانی تر بوون.

هەندێ لە شیعەكان دەستیان گرتووە بە فەرمودەكانی پێغەمبەرەوە كە لەم پەیمانەدا فەرموویەتی بۆ بەرزكردنەوەی پێگەی عەلی بەسەر عوسماندا، چونكە عەلی لە ناو ئەو خەڵكو هاوەڵانەدا بوو، كە ئەم وتارەیان بەسەردا خوێنرایەوەو یەكێكیش بوو لەوانەی

---

[1] السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية، (ص٤٨٦).

[2] المصدر نفسه.

[3] زاد المعاد (٣/٢٩١).

[4] صحيح السيرة النبوية (ص٤٠٤).

[5] السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية، (ص٤٨٢).

[6] مسلم، رقم (١٤٨٥).

[7] فتح الباري (٧/٤٤٣).

که لەژێر درەختەکەدا پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەر بەست، لەو کاتەدا عوسمان لەوێ نەبوو. ئەم هەڵهێنجانەی شیعە پڕوپوچە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە باتی عوسمان پەیمانی دا، کەواتە عوسمان هاوشانی ئەوانە لەو خەڵاتکردنەدا، مەبەستی ئەم فەرموودەیەش ئەوە نییە ڕێزی هەندێکیان بدات بەسەر ئەوانی تردا[1]. موحیببی تەبەری تایبەتمەندیی عوسمانی لەچەند ڕوویەکەوە باس کردووە، یەکێك لەوانە کە گرنگی ڕێزی عوسمانمان بۆ دەردەخات، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ هەستاوە دەستی پیرۆزی خۆی لە شوێنی دەستی عوسمان داناوە، یەکێکی تر ئەوەیە عوسمان نوێنەری نامەی پێغەمبەر بوو ﷺ بۆ مەککەو موسڵمانە دەست بەسەرەکانی شاری ناوبراو. هەروەها پێغەمبەر ﷺ شایەتی دا بۆ عوسمان، کە بەبێ مۆڵەتی پێغەمبەر تەواف ناکات[2]، لە ئەیاسی کوڕی سەلەمەوە هاتووە ئەویش لە باوکیەوە دەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ دەستێکی خستە ناو ئەو دەستەکەی پەیمانی بەست بۆ عوسمان، خەڵکی وتیان پیرۆزی بێت، بە ئارامیو ئاسایشی تەوافی خۆی کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (عوسمان هەرچەند بمێنێتەوە تا من تەواف نەکەم ئەویش نایکات)[3]، لە ڕاستیدا ستەمە عوسمان تۆمەت باربکرێت لەبەر ئەوەی لە پەیمانی ڕیزواندا پەیمانی بە پێغەمبەر ﷺ نەداوەو لەوێ ئامادەنەبووە. ئەم تۆمەتە لەسەروبەندی هەڵخڕانی ئاژاوەو فیتنەدا نوساوە بە کەسایەتی عوسمانەوە، تەنها بۆ ئەو مەبەستەش وتراوە پایەکانی خەلافەتی ئەو بڕوخێنن[4]. لەمەودوا درێژەی ئەم باسە بە ئیزنی خودا دەبینین، لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێت "کاتێك پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە پەیمانی ڕیزوان، عوسمانی کوڕی عەفانی بە نوێنەری خۆی نارد بۆ لای ئەهلی مەککە، هاوەڵان هەموویان پەیمانیان داو ئەویش فەرمووی (عوسمان وا لەجێبەجێکردنی ئەمری خوداو پێغەمبەرەکەی)". ئەنەس دەستێکی کێشا بەزەویداو وتی "دەستی پێغەمبەر ﷺ بۆ عوسمان لە دەستی هەموو هاوەڵان باشتر بوو کە پەیمانیان پێ بەست"[5].

---

[1] الرياض النضرة في مناقب العشرة، ص (٤٩٠، ٤٩١)

[2] المصدر نفسه (ص ٤٩١)، في سند ضعيف.

[3] ذوالنورين مع النبي، ص(٣٢).

[4] سير السلف الصالحين (١/١٨١)، اسناده ضعيف والحديث صحيح اسنن الترمذي، رقم (٣٧٠٢).

[5] الصارم المسلول على شاتم الرسول، (ص١٠٩).

### ٦ـ تکای عوسمان بۆ عەبدوڵڵای ئەبی سەرح

عەبدوڵڵای ئەبی سەرح، لای عوسمانی کوڕی عەفان خۆی پەنادابوو هێنای هەتا لە بەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وەستاندیو وتی: "ئەی پێغەمبەری خواد ﷺ پەیمان لە عەبدوڵڵا وەرگرە، پێغەمبەریش ﷺ سەری بەرز کردەوە سێ جار تەماشای کرد هەرسێ جارەکە هێمای ڕەتکردنەوەی تێدابوو، پاشان پەیمانی لێ وەرگرتو ڕووی کردە هاوەڵانیو فەرمووی "ئایا پیاوێکی بەغیرەتتان تیا نەبوو هەستێت بۆ ئەو کەسەی کە سێ جار تەماشام کردو دەستم گرتەوە لە پەیمان پێدانی بیکوژێت". ئەوانیش وتیان ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە چوزانین چی لە دڵی تۆدایە ئەی بۆ بە چاو ئیشارەتت بۆ نەکردین؟ فەرمووی "ڕەوا نییە بۆ پێغەمبەر ﷺ بە چاو، گزی بکات"[1]. لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە ڕۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەر ﷺ لێبوردنی دەرکرد بۆ گشت خەڵك، تەنها بۆ چوار کەس نەبێت، فەرمووی "ئەو چوارە بکوژن ئەگەر دەستیان بە دیواری کەعبەشەوە بوو". ئەوانەش: عیکریمەی ئەبوجەهل، عەبدوڵڵای خەتەل، موقەیسی حوبابە، عەبدوڵڵای ئەبی سەرح، بوون[2]. موسوڵمانەکان، عەبدوڵڵای خەتەلیان دۆزییەوە خۆی هەڵواسی بوو بە دیواری کەعبەدا، سەعیدی کوڕی حاریسو عەمماری یاسر بۆی چوونە پێش سەعید کەوتە پێش عەممارو کوشتی.

بەڵام عیکریمە سواری کەشتی بوو لە ناو دەریاو تووشی ڕەشەبایەکی تیژ بوون، کەشتییەوانەکە وتی "ڕوبکەنە خودای تاكو تەنها، لێرەدا بتەکانمان دەسەڵاتیان نییەو سودمان پێ ناگەیەنن، عیکریمە وتی: وەڵڵاهی مادەم لە دەریا تەنها خودای گەورە فریامان دەکەوێت لە وشکانیشدا جگە لەئەو، کەسی تر فریامان ناکەوێت. ئەی خودا، بەڵێن بێت ئەگەر قوتارت کردم لەم ناڕەحەتییە بچم بۆ لای موحەممەد ﷺ و کۆڵ نەدەم هەتا دەستم دەخەمە ناو دەستی، دەزانم لێبوردەو لێخۆشبووە،ئەوجا ئیتر هاتوو موسڵمان بوو.

---

[1] اخوان البيان في تأريخ القران صابر ابو سليمان، (ص٧٩).

[2] المصدر نفسه (ص٧٩).

بەڵام عەبدوڵڵای ئەبی سەرح لای عوسمان خۆی ماتەداو کاتێك پێغەمبەر ﷺ بانگی خەڵکی کرد وەرن بۆ پەیماندان، عوسمان عەبدوڵڵای لەگەڵ خۆی هێناو لەبەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ڕایگرت، پاشان ئەوەی باسمان کرد ڕوویدا[1]. لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە هاتووە دەڵێت: "عەبدوڵڵای ئەبی سەرح، نووسەری وەحی بوو لای پێغەمبەر ﷺ، شەیتان سەری لێشێواندو خۆی لکاند بە کافرانەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺلە فەتحی مەککەدا فرمانی کرد بیکوژن، عوسمانیش پەنای داو پێغەمبەریش پەناکەی قبوڵ کرد"[2]. ئیبنو ئیسحاق باسی ئەم بەسەرهاتەی کردووەو دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ فرمانیدا بیکوژن، چونکە موسڵمانبوو، نووسەری وەحی بوو، کەچی هەڵگەڕایەوەو بوو بەموشریكو گەڕایەوە بۆ ناو قورەیش، لە دواییدا ڕای کرد بۆ لای عوسمان پەنای بدات، چونکە برای شیری عوسمان بوو، ئەویش گلیدایەوەو هەتا خەڵك هێور بوونەوەو ئەهلی مەککە ئاسایشیان گرت هێنای بۆ لای پێغەمبەر ﷺ". ئیبن هیشام دەڵێت: "عومەری کوڕی خەتتاب عەبدوڵڵای کردەوە بە والی هەندێ لە کارەکانی، پاشانیش عوسمان کردوویەتی بە لێپرسراو"[3].

### ٧- جەنگی تەبوك

لەساڵی نۆی کۆچی هیرەقل ڕووی گەلەکۆمەکاری شەڕەنگێزی خۆی چەرخاند بەرەو ناوچەرگەی نیوەدورگەی عەرەبو بە ئاواتێکی پڕ تاسەوە زمانە بلێسەی بوو بۆ دوژمنایەتیکردنی موسوڵمانانو بەدیهێنانی مەرامەکانی.. فەرمانی کرد هێزەکەی ئامادەباش بنو چاوەڕوانی زەنگی ئوردو ئاپۆڕا بن، لەم بارەیەوە هەواڵی جۆراو جۆر، دەگەیەنرا بە پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوە بانگی سەرجەم هاوەڵانی کردو فەرمانی پێکردن خۆیان سازدەن بۆ تێکۆشان، ئەوکاتەش هاوینێکی ئەوەندە گەرم بوو شاخەکانی ڕوتاڵ کردبوو، شارەکانیش بەدەست وشکەساڵییەوە دەیان ناڵاند، لەگەڵ ئەم بارودۆخەشدا موسڵمانان بە بڕوای پۆڵاینەوە هەستان بۆ بەرەنگاریو پێیان چزان بەو

---

[1] المصدر نفسه (ص٨٠).

[2] المصدر نفسه (ص٨٠).

[3] السيرة النبوية لابن هشام (٤/٥٧، ٥٨).

گەرما سەختەداو دەرچوون بۆ غەزا بەسەر بیابانییەکی قریقاو داگیرساودا، کاتێکیش سەیریان کرد چەکو چێوی پێویستو خەرجی تێکۆشانیان نییەو نەشیان دەزانی لە کوێی بێنن؟ پێغەمبەر ﷺ هانیدان بۆ ماڵبەخشینو هەرکەسێك بەگوێرەی کیسەی خۆی خێری هێنا، ئافرەتان دەستو بردیان کردو ئاڵتونو خشڵی خۆیان هێنایە بەر دەستی پێغەمبەر ﷺ، دەرکەوت ئەم بەخشینانە هەمووی لە چاو پێداویستی لەشکرەکە زۆر کەمەو بەش ناکات. پێغەمبەر ﷺ تەماشایەکی ئەو ڕیزە دوورو درێژەی موجاهیدەکانی کرد کە خۆیان سازداوە بۆ تێکۆشانو فەرمووی "هەریەکێك ئەمانە بخاتە ڕێ خودای گەورە لێی خۆش دەبێت". دەست بەجێ عوسمان ئەم زایەڵەی پێغەمبەری ﷺ وەرگرتو قبوڵی کردو خۆی خستە بەر لێخۆشبوونی خودای گەورەو هەستا بە ڕێکخستنو ئامادەکردنی لەشکرەکە بەجۆرێك کە پێویستیان بە ڕەشۆو گوڵەنگێکیش نەما، ئەمەیە تەنگیو سەختی کە عوسمان ماڵی تێدا بەخشی[1].

ئیبنو شەهابی زوهری دەڵێت "عوسمان بۆ لەشکری تەنگانە لە غەزای تەبوکدا نۆسەدو چل وشترو سەشت ئەسپی هێنا کە دەکاتە هەزار سەر وڵاخ، هەروەها دە هەزار دیناری هێناو لەبەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەڵیڕێژا، پێغەمبەریش ﷺ بە دەستی موبارەکی ئەمدیودیوی دەکردو دەیفەرموو "لە مرۆ بەدواوە عوسمان هەر ئیشێك بکات زەرەر ناکات"[2]. بە ڕاستی عوسمان خاوەنی کاسەیەکی لیپان لیپە لەبەخشین[3].

عەبدولڕەحمانی کوڕی حیبان، چیرۆکی ئەو بەخشینەمان بۆ باس دەکاتو دەڵێت "من لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بووم، هانی دەداین بۆ ماڵ بەخشین بۆ لەشکری تەنگانە، عوسمان هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ دوو سەد وشتر بەخۆیانو جلەکانیانەوە بەسكو تورەکەی تێرەوە لە پێناوی خودای گەورەدا دەبەخشم، پاشان پێغەمبەر ﷺ پتر هانیدان بۆ بەخشین، عوسمان هەستا وتی ئەی پێغەمبەر ﷺ سێ سەد وشتر لەسەر من بە خۆیانو جلو ئالیکیانەوە لە ڕێگای خودادا، من پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر

---

[1] فتح الباري (٦/٦٧)، خلفاء الرسول، ص (٢٥٠)ـ العشرة المبشرون بالجنة (ص٥٣).

[2] سنن الترمذي رقم (٣٧٨٥)، صحيح النوثيق، (٢٦).

[3] السيرة النبوية في خوء المصادر الاصلية، (ص٦١٥).

مینبەرەکە دابەزیو فەرمووی دوای ئەم کردارە عوسمان هیچی تری لەسەر نییە، دوای ئەم کردارە کرداری تر لەسەر عوسمان نییە"[1].

لە عەبدولڕەحمانی سەمورەوە هاتووە دەڵێت "وەختی ڕێکخستنو ئامادەکردنی لەشکری تەنگانە، عوسمان هاتە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەزار دیناری لە باخەڵیدا هێنا، پێغەمبەریش ﷺ بە دەستی موبارەکی ئەمدیوو ئەودیوی دەکردو دەیفەرموو: ئیبنو عەفان لەمڕۆ بەدواوە هەچ کارێك بکات زیان ناکات. چەند جارێك ئەمەی وتەوە"[2]. لێرەدا دەردەکەوێت تاکە بەخشندەی ئەم ئوممەتە تازەیە عوسمانە! پێغەمبەر ﷺ لە پێشی لەشکرەکەوە ڕۆیشت هەتا گەشتە شوێنێك پێیاندەوت تەبوك، کە دەکەوێتە ناوەڕاستی ڕێگەی مەدینەو دیمەشقو لەوێدا هەواڵێکی خۆشیان بۆ هات ئەو هێرەقلەی کە ئوردویە سوپای هەڵجەراندبوو بۆ شەڕی مانو نەمان لە دیمەشق درزو کەلێن کەوتووەتە لێبڕانییەوە دیمەشقی بەجێهێڵاوە بە دەستی بەتاڵیو هەوڵەکەی زڕ دەرچووە، دوابەدوایان پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵان بێ پەلاماریان دانو بەساغو سەلامەتی گەڕانەوەو عوسمانیش لە ئەزمون دەرچوو، ئایا عوسمان هیچی لەو ماڵە گەڕاندەوە بۆ خۆی، کاتێك بەدەژی هاتەوە؟ بێگومان نەخێر. حاشا ئەگەر وای کردبێت، عوسمان سایەو سێبەری هەبووە وەکو جاران لە بەخشیندا خێرا بووەو بۆ وەڵامی هەموو بانگەوازێك کە پێغەمبەر ﷺ پەسەندی کردبێت لەپێشی هەمووان بووە، واتە هەمیشە دەمەزەرد بووە بۆ چۆڕهێنانی گیرفانیو زۆر بەسۆز بووە بۆماڵ بەخشین[3].

**دووەم: لە بارەی ژیانی کۆمەلایەتییەوە لە مەدینەدا**

**١ـ خواستنی ئوموکەلسوم لەساڵی سێی کۆچی**

ئوموکەلسوم، کونییەیەو نازانرێت ناوی تەواوی چییە، تەنها (حاکم) باسی کردووە ئەویش لە موسعەبەوەو دەڵێت ناوی (ئومەیە) بووەو لە فاتمەگەورە تر بووە[4]. سەعیدی

---

[1] سنن الترمذي، رقم (٣٧٠٠).

[2] سنن الترمذي، رقم (٣٧٥٢).

[3] خلفاء الرسول ﷺ (ص١٣٨)، العشرة المبشر بالجنة (ص٣١).

[4] اللوحة النبوية الشريفة، فاروق حمادة، (ص٤٥، ٤٦).

کوڕی موسەیەبیش دەڵێت "عوسمان، بێوە پیاو بوو لە ڕوقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ، لەوکاتەشدا حەفسەی کچی ئیمامی عومەریش بێوەژن کەوتبوو، جارێکیان عومەر دای بەلای عوسمانداو پێی وت حەفسەت دەوێت؟ عوسمان پێشتر لە پێغەمبەر ﷺ ی بیستبوو، کە بە تەمایەتی، بۆیە هیچ وەڵامێکی عومەری نەدایەوە، عومەریش دلگران بوو، ئەمەی باسکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش پێی فەرموو "ئایا لە ئەو چاکترت دەوێت؟ من حەفسە دەخوازمو عوسمانیش لەحەفسە باشتر دەخوازێت کە ئومو کەلسومە"[1]. لە ڕیوایەتی بوخاریدا هاتووە، عومەر دەڵێت "حەفسەی کچم بێوەژن کەوتبوو، لە(خونەیسی سەهمی) کە یەکێك بوو لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺو لە مەدینە کۆچی دوایی کردبوو". عومەر دەڵێت "هاتمە لای عوسمانو حەفسەم خستە پێش چاویو وتم: ئەگەر حەز بکەیت حەفسەت لێ مارە دەکەم، ئەویش وتی: با بیرێك لەخۆم بکەمەوە". چەند شەوێك چاوەڕێم کرد، پاشان پێی گەیشتمو وتی "واباشە لەم ڕۆژانە ژن نەهێنم". عومەر دەڵێت "گەشتم بە ئەبوبەکری سدیقو پێم وت "ئەگەر حەز ئەکەیت حەفسەی کچمت لێ مارە دەکەم، ئەبوبەکر ماتبوو دەنگی نەکرد، منیش لە وەڵامەکەی عوسمان زیاتر دلگران بووم، پاش چەند شەوێك پێغەمبەر ﷺ خوازبێنی کردو لێم مارە کرد، لە دواییدا ئەبوبەکر پێی وتم: لەوانەیە دڵت گەردی گرتبێت، کە حەفسەت پێشنیار کردو منیش وەڵامم نەدایتەوە، لەبەر ئەوەبوو زانیبووم کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردووەو خۆناشکرێ من نهێنی ئەو بڵاو کەمەوە، خۆ ئەگەر ئەو نەیویستایە من قبوڵم دەکرد"[2]. دایکی ئیمانداران ڕاستگۆی گچی ڕاستگۆ (عائیشە) ڕوداوی مێردکرنی ئوموکەلسوم بە ئیمامی عوسمان ڕیوات کردووەو دەڵێت "کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئومو کەلسومی دا بەشوو فەرمووی بە ئومو ئەیمەن: ئوموکەلسومی کچم بخەرەڕێو بیکە بە بوك بۆ عوسمانو لە پێشیەوە دەف لێبدەنو یاری پێ بکەن)". ئومو ئەیمەن وای کردو دوای سێ ڕۆژ پێغەمبەر ﷺ هاتە سەردانیو چووە ماڵو پێی فەرموو "کچم مێردەکەت چۆنە بۆت؟ وتی: باشترین مێردە"[3]. لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە،

---

[1] مستدرك الحاكم (٤/٤٩)، الاثار لابي يوسف، رقم (١٩٥٧).

[2] رواه البخاري كتاب النكاح رقم (٥١٢٢).

[3] السيرة النوبية لابي شهبة (٢/٢٣١)، دماء على قميص عثمان، (ص٢٢).

دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەرگای مزگەوتدا ڕاوەستابوو، فەرمووی: ئەی عوسمان ئەوە جوبرەئیلە هەواڵی پێدام کە خودای گەورە ئوموکەلسومی کردۆتە هاوسەرت، بە ئەندازەی مارەییەکەی ڕوقیەو بەهەمان شێوەی ئەو مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت". ئەمەش ساڵی سێی کۆچی روویدا[1].

**٢ـ مردنی عەبدوڵڵای کوڕی عوسمان**

لەمانگی جەمادی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچی، عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانو کوڕی ڕوقیە وەفاتی کرد، ئەوکات عەبدوڵڵا تەمەنی شەش ساڵ بوو، پێغەمبەر ﷺ نوێژی مردووی لەسەر کردو عوسمان دایهێڵایە ناو گۆڕەکەی[2]، ئەمە داخو مەینەتێك بوو هاتە ژیانی عوسمان. ئای نارەحەتی چەند زۆرە لە ژیانی بانگەوازکارانی خودادا.

**٣ـ مردنی ئوموکەلسوم**

ئوموکەلسوم، لای عوسمان مایەوە هەتا لەمانگی شەعبانی ساڵی نۆی کۆچی، کۆچی دوایی کرد، هۆی مردنەکەشی نەخۆشییەك بوو کە پێوەی گیرۆدەبوبوو، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کردو لەسەر گۆڕەکەی دانیشت. ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕیتەوەو دەڵێت "پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر گۆڕی ئوموکەلسوم دانیشتبوو، بینیم هەردوو چاوی فرمێسکی پیا ئەهاتە خوارەوە". فەرمووی "ئایا پیاوێکتان تێدایە ئەمشەو نزیکی خێزانی نەکەوتبێتەوە"، ئەبو تەلحە وتی: من، فەرمووی "بچۆرە ناو گۆڕەکەی"[3]، لەیلای کچی قاتفی سەقەفی دەڵێت: "من یەکێك بووم لەوانەی ئوموکەلسومان شۆرد، یەکەم شتێك کەپێغەمبەر ﷺ پێی داین کفن بوو، پاشان کراسو سەرپۆشو کەواو پاشان ئەمانەی پێچا بە پۆشاکێکی ترەوە، پێغەمبەر ﷺ لە لای دەرگاکە وەستابوو پارچە پارچە کفنەکەی بە نۆرە دایە دەسمان[4]. لای ئیبنو سەعد هاتووە، کە عەلی کوڕی ئەبی تالیبو فەزڵی کوڕی عەباسو ئوسامەی کوڕی زەید، دابەزینە ناو گۆڕەکەی لەگەڵ ئەبی تەلحە، ئەو ئافرەتەی کە شۆردی ئەسمای کچی

---

[1] سنن ابن ماجة رقم (١١٠)، وفيه عثمان بن خالد وهو ضعيف.

[2] الكامل لابن الأثير (٢/١٣٠)، دماء علي قميص عثمان، (ص٢٢).

[3] البخاري كتاب الجنائز رقم (١٣٤٢).

[4] سنن ابي داود رقم (٣١٥٧).

عومەیس‌و حەفسەی کچی عەبدولموتەلیب بوو[١]، بەم کارەساتە عوسمان زۆر تەوسی کردو نیگەرانی ڕووی کردە دڵو دەروونی بۆکۆچی یەکجاری ئوموکەلسوم، پێغەمبەر ﷺ زانی عوسمان دڵشکاوەو ڕوخساری غەمبارە، لێی نزیك بوویەوەو فەرمووی "عوسمان ئەگەر کچی سێهەممان هەبوایە لێم مایەُ دەکردی"[٢]، ئەمە بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بە عوسمان‌و نیشانەی ڕێزگرتنی عوسمانەو ئەستۆ پاکی ئەو دەردەخات بە پێچەوانەی ئەوانەی تفەنگ بەتاریکییەوە دەنێن‌و خویان پێوە گرتووە لە بەرامبەر عوسماندا، ئیتر قەدەری خودای گەورە وا گوزەری کردو فەرمانەکانی جێبەجێ بوو، فەرمانەکانیشی بە هیچ کەسێك بەرپەرچ نادرێتەوە[٣].

## سێیەم: بەخشینە ئابوورییەکانی عوسمان لەبنیاتنانی وڵاتدا

عوسمان، یەکێك بوو لەو دەوڵەمەندانەی کە خودای گەورە دەوڵەمەندی‌و بازرگانی‌و ماڵێکی فراوانی پێ بەخشیبوو، ئەویش لە گوێڕایەڵی‌و ڕەزامەندی خودای گەورەدا خەرجی دەکرد، هەتا وای لێهاتبوو لە بەخشندەییدا پێش پێشانی دەکردو هەرگیز نەدەترسا لە هەژاری، ئەو بەخشینە بێ شومارانەش ئەمانەن:

١ـ کڕینی بیری ڕۆمیە: ئەو دەمەی پێغەمبەر ﷺ چووە مەدینەی منەوەرە، سەیر دەکات ئاوی شیرین‌و سازگار کەمەو نییە، لە مەدینەشدا تەنیا بیری ڕۆمیە ئاوی شیرینی هەیەو بەشی موسڵمانان ناکات، فەرمووی "هەرکەسێك بیری ڕۆمیە بکڕێت، ئەوە پەرداخی خۆی بەچاکترین شێوە دەخاتە پاڵ پەرداخی موسڵمانان لە بەهەشتدا"[٤]. هەروەها فەرمووی "بەهەشت بۆ ئەوکەسەی بیری ڕۆمیە هەڵدەکەنێت"[٥]. بیری ڕۆمیە پێشتر کەس بەبێ پارە ئاوی لێ نەدەخواردەوە، کاتێك کۆچەریەکان گەشتنە شاری مەدینە سکاڵای بێ ئاوییان کرد، پیاوێکی بەنی غیفاری بیرێکی هەبوو پێیان دەوت ڕۆمیە، بە کونە لەئاوەکەی دەفرۆشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی "دەیفرۆشی بە

---

[١] الطبقات لابن سعد (٣٩/٨) الدوحة النبوية (ص٤٨).

[٢] مجمع الزوائد للهيثمي (٨٣/٩)، اسناده حسن لماله من شواهد.

[٣] الخلفاء الراشدون اعمال و أحداث د. أمين القضاة (ص٧٣).

[٤] صحيح النسائي للألباني (٧٦٦/٢).

[٥] اخرجه البخاري رقم (٢٧٧٨) معلقا وهو صحيح لشواهده.

کانییەکی بەهەشت؟"، ئەویش وتی "خۆموماڵو منداڵم هیچمان نییە ئەمە نەبێت"، دەنگوباس گەیەنرا بە عوسمان، ئەویش هەستا لێی کڕی بە سێ سەدو پەنجا هەزار درهەم، پاشان هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی "ئایا ئەو مژدەیەی فەرموتە بۆ خاوەن بیرەکە بە نسیبی منیش دەبێت"، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی "بەڵێ". وتی: ئەوا بەخشیم بە موسڵمانان[1]. دەشڵێن ڕۆمیە بیری جوویەك بوو، ئاوەکەی دەفرۆشت بە موسڵمانان، عوسمانیش لەجووەکەی کڕی بە بیست هەزار درهەمو دای بە هەژارو دەوڵەمەندو ڕێبواران[2].

## ٢ـ فراوانکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مزگەوتێکی دروستکرد لەمەدینە. وردە وردە موسڵمانان زۆر بوونو لە مزگەوت گردبوونەوە بۆ نوێژە فەرزەکان، بۆ وتارەکانی پێغەمبەر ﷺو فێربوونی کاروباری ئیسلامەتی، هەرلە مزگەوتەوە دەردەچوون بۆ غەزاو دواتریش دەگەڕانەوە بۆ ئەوێ، مزگەوت بەتەنگو بچوك دەردەکەوت، پێغەمبەر ﷺ ئارەزووی کڕینی ئەوپارچە زەوییەی کرد کە بە تەنیشت مزگەوتەوەبوو، بۆ ئەوەی مزگەوتی پێ گەورە بکات، فەرمووی "هەرکەسێك پارچە زەوی خێڵی فلان کەس بکڕێو مزگەوتی پێ گەورە بکات بە چاکی، ئەوە بە وێنەی مزگەوتەکەی پێ دەبەخشن لە بەهەشتدا". عوسمان لەماڵی نەختی خۆی[3] و بە بیستو پێنج هەزار درهەم، زەوییەکەی کڕی یان بە بیست هەزار درهەم، پاشان خستیە سەر مزگەوتەکە[4] و جێگەی موسڵمانانی فراوان کرد، ئەوانیش لێی ڕازی بوون[5].

## ٣ـ لەشکری تەنگانەو بەخشندەیی عوسمان

وەختێك پێغەمبەر ﷺ ویستی بڕوات بۆ غەزای تەبوك هانی هاوەڵە دەوڵەمەندو سەرمایەدارەکانی دا، کە ئەوپەڕی وزەی خۆیان بخەنە گەڕ بۆ سازدانی لەشکری تەنگانە

---

[1] تحفة الاحوذي بشرح سنن الترمذي (١/١٩٦).

[2] فتح الباري (٥/٤٠٨)، الحكمة في الدعوة الى الله، ص (٢٣١).

[3] صحيح السنن الترمذي للألباني (٣/٢٠٩)، رقم (٢٩٢١).

[4] صحيح السنن النسائي (٢/٧٦٦).

[5] اعلام المسلمين لخالد البيطار (٣/٤١).

که خۆی ڕێکیخستبوو بۆ غەزای ڕۆمەکان، هاوەڵانیش بە گوێرەی توانا ماڵیان بەخشی، بەڵام عوسمان بەخشینێکی وای بەخشی کەس وێنەی ئەوی نەبەخشی[1] - بە جوانی ئەمەمان باسکرد لە جەنگی تەبوکدا -

---

[1] الحكمة في الدعوة الى الله، (ص٢٣١).

## باسی چوارەم: فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی عوسمانی کوڕی عەففان

### یەکەم: ئەو فەرمودانەی دەربارەی فەزڵی عوسمان هاتوون:

١ـ دەرگای بۆبکەرەوەو مژدەی بەهەشتی پیّ بدە لەسەر بەڵایەك کە تووشی دێت.

لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە ڕیوایەت کراوەو دەڵێت "لەگەڵ پێغەمبەردا بووم ﷺ لە ناو باخێك لە باخەکانی شاری مەدینە، پیاوێك هات دای لەدەرگای باخەکە پێغەمبەر ﷺ فەرموی دەرگاکەی بۆ بکەرەوەو مژدەی بەهەشی پیّ بدە، منیش بۆم کردەوەو سەیردەکەم ئەبوبەکرە، منیش مژدەکەم پێداو ئەویش سوپاسی خودای میهرەبانی کرد، پاشان پیاوێکی تر هات دای لە دەرگاکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆی بکەرەوەو مژدەی بەهەشتی پیّ بدە، کردمەوە سەیر دەکەم عومەرە، مژدەکەم پێداو ئەویش سوپاسی خوای گەورەی کرد، پاش کەمێك پیاوێکی تر هات دای لە دەرگاکە، فەرمووی: بۆی بکەرەوەو مژدەی بەهەشتی پیّ بدە لەسەر تەنگوچەڵەمەو بەڵایەك کە تووشی دێت، سەیردەکەم عوسمانە، هەواڵەکەم پێداو سوپاسی خودای گەورەی کردو پاشان وتی "خودای گەورە یارمەتیمان بدات""[1]. ئەم فەرمودەیە فەزڵی هەرسێکیان دەردەخات، ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان، ئەمانە ئەهلی بەهەشتن وەك لە ڕیوایەتەکەی ئەبا موسادا دەرکەوتووە. هەروەها ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەشی تێدایە کە دروستە ڕووبەڕوو وەسفی مرۆڤی چاك بکەیت، بەمەرجێك دڵنیابیت لەوەی کە تووشی لە خۆبایی‌و فیزکردن نابێت، هەروەها ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ موعجیزاتی پێغەمبەر ﷺ کە هەواڵی ڕودانی بەڵای عوسمانی باس کردووە، ئەوەش دەگەیەنێت کە ئەم سیانە لەسەر ئیمان‌و ئیسلام بەردەوام دەبن[2].

---

[1] البخاري رقم (٣٦٩٥).

[2] شرح النووي على صحيح مسلم (١٥/١٧٠، ١٧١).

٢- ئوحود هێور بەرەوە جگە لە پێغەمبەرو ﷺ ڕاستگۆیەك‌و شەهید هیچی ترت لەسەر نییە.

ئەنەس دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ چووە سەر شاخی ئوحود، ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانی لەگەڵدا بوو و ئوحود هاتە لەرزین. پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو ئوحود دامەزرێ وابزانم پێی موبارەکی پیاکێشا، بێجگە لە پێغەمبەر ﷺو ڕاستگۆو شەهید هیچی ترت لەسەر نییە"[1].

٣- هێمن بەرەو جگە لە پێغەمبەرو ﷺ ڕاستگۆو شەهید کەسی ترت لەسەر نییە

ئەبو هورەیرە دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ لە سەر ئەشکەوتی حەڕا بوو، ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی‌و تەڵحەو زوبێری لەگەڵدا بوو، بەردەکە جولا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی "هێمن بە، جگە لەپێغەمبەر ﷺو ڕاستگۆو شەهید کەسی ترت لەسەر نییە"[2].

٤- شەرمی عوسمان

لە یەحیای کوڕی سەعیدی عاسەوە هاتووە، ئەویش لە سەعیدی باوکییەوە، ئەویش لە عائیشەو عوسمانەوە وەری گرتووە، جارێکیان ئەوبەکری سدیق، مۆڵەتی خواست بچێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لەسەر جێگەکەی ڕاکشابوو پەردەیەکی خوری دابوو بە خۆیدا، عائیشە مۆڵەتی بۆ وەرگرت‌و ئەبوبەکری سدیقیش هات‌و ئاتاجی خۆی جێبەجێ کردو گەڕایەوە، پاشان عومەر داوای مۆڵەتی کرد، مۆڵەتی پێدراو پێغەمبەر ﷺ خۆی تێکنەدابوو هەر لەسەر حاڵی پێشووی ڕاکشابوو، ئەویش ئاتاجی خۆی جێبەجێ کردو گەڕایەوە، عوسمان دەڵێت: پاشان من مۆڵەتم وەرگرت کە چوومە ژوورەوە پێغەمبەر ﷺ هەستا دانیشت‌و فەرمووی بە عائیشە "خۆت داپۆشەو جلەکانت بدە بە خۆتدا". عوسمان دەڵێت: منیش ئاتاجم تەواو کردو گەڕامەوە، عائیشە وتی: ئەی نێردراوی خودای گەورە، تۆ ئەو داچڵەکان‌و خۆکۆکردنەوەی بۆ عوسمانت کرد، نەتکرد بۆ ئەبوبەکرو عومەر. پێغەمبەریش فەرمووی

---

[1] البخاري رقم (٣٦٩٧).

[2] البخاري رقم (٢٤١٧).

"بەڕاستی عوسمان پیاوێکی شەرمنە، دڵەخورتێی ئەوەم کرد بەم حاڵەوە مۆڵەتی بدەمو ڕووی نەبێت ئاتاجی خۆییم بۆ باس بکات"[1].

٥ـ شەرمی فریشتەکان لە عوسمان

لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە هاتووە لە عائیشەوە دەڵێت: "جارێك پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی مندا ڕاکشابوو، ڕانی یان ساقی دەرکەوتبوو، ئەبوبەکر مۆڵەتی خواست، مۆڵەتی داو حاڵەتی خۆی تێك نەداو گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، پاشان عومەر مۆڵەتی خواستو مۆڵەتی داو بە هەمان شێوەبوو گفتوگۆی لەگەڵ ئەویش کرد، پاشان عوسمان مۆڵەتی خواست، پێغەمبەر ﷺ ڕاست بوویەو دانیشتو خۆی داپۆشیو جلەکانی ڕێککرد، عوسمان هاتە ژوورەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەویش کرد، (ڕاوی دەڵێت: نازانم ئەم کردارە هەمووی لە ڕۆژێکدا بوو یان چەند ڕۆژێك بوو)، دەڵێت: کاتێك عوسمان گەڕایەوە وتم: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکرو عومەر هاتن تۆ نەشڵەژایو خۆت کۆنەکردەوە، کەچی عوسمان هات هەستای دانیشتیتو جلەکانت ڕێکوپێك کرد ئەویش فەرمووی "من چۆن شەرم نەکەم لە پیاوێك فریشتەکان شەرمی لێدەکەن"[2].

مەناوی دەڵێت پلەو پایەی عوسمان، لەپلەی شەرمەکەیدایە، شەرمیش لقێکە لە شکۆدارییەوە سەرچاوە دەگرێت، هەرکەسێك شەرمی هەبێتو بە جوانی ئەدای بکاتو بینرخێنێت، لەگەڵ ئەمەشدا دەروونی خۆی بەکەم بزانێت (خاکەساربێت) ئەوە وەك ئەوە وەهایە گەورەو گرانی خودای میهرەبان زاڵ بووبێت بەسەریداو دەروونی خۆی بەکەمتەرخەم بزانێت بەرامبەر خەڵكو خودا، ئەم دوانەش گرانترین ئاکاری بەندە نزیکەکانن. هەر ئەم شەرمو خاکەسارییەش بوو عوسمانی بەرز کردەوەو سەرجەم دروستکراوەکانی خودای میهرەبان شەرمیان لێدەکرد، هەتا فریشتەو پێغەمبەرانیش ﷺ ئەمەش بەرهەمی خۆشەویستیو ترسانە لە خودای گەورە، هەرکەسێك خودای گەورەی خۆش بوێت هەموو دروستکراوەکان خۆشیان دەوێت، هەرکەسیش لەخوا بترسێت هەموو شتێك لێی دەترسێت[3].

---

[1] مسلم رقم (٢٤٠٢).

[2] مسلم رقم (٢٤٠١).

[3] فيض القدير للمناوى (٤/٣٠٢).

٦ـ ڕاساڵترین کەس لە شەرمو شکۆدا عوسمانە

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە بەزەییترین کەسی ئوممەتم ئەبوبەکرە، گورجو گۆڵترین کەسی ئوممەتم لە دینی خودادا عومەرە، ڕاساڵترین کەسی ئوممەتم عوسمانە، زاناترینیان بە حەڵاڵو حەرام موعازی کوڕی جەبەلە، خوێنەوارترینیان بۆ قورئان ئوبەی کەعبە، شارەزاترینیان بە میرات زەیدی کوڕی سابیتە، هەموو ئوممەتێك دەستپاکی هەیە، دەستپاکی ئوممەتی منیش ئەبوعویەیدەی جەڕاحە"[1].

**دووەم: هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ئەو ئاژاوەیەی کە عوسمانی بەناحەق تیا دەکوژرێ**

١ـ هەرکەسێك لەسێ شت دەرباز ببێت ئەوە ڕزگاری بووە.

عەبدوڵڵای حەواڵە دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەرکەسێك لەسێ شت دەرباز ببێت ئەوە بە ڕاستی ڕزگاری بووە ـ سێ جار ئەمەی فەرموو ـ یەکەم مردنی من، دووەم دەجال، سێیەم کوشتنی خەلیفەی راست پەروەرو بەخشندە)[2]، ئاشکرایە ئەو خەلیفەیەش کە بە خۆگری‌و لەسەر حەق ڕۆشتن کوژرا، ئیمامی عوسمان بوو. فەرموودەکە ئاماژە بۆ ڕووداوی عوسمان دەکات، پێغەمبەری خوداش باش دەیزانی کە ئاژاوەیەکی گەورە بەڕێوەیە، بۆیە گرنگی خۆپار استن ڕادەگەیەنێت، وریامان دەکاتەوە بەجەستەیان بەهەست یان بەهەڵوێست، نەکەوینە جوملەی شۆفارەکانەوە، بەشداری جەستەیی لەم ئاژاوەیەدا بریتییە لە هەڵنان، هوتەرەکردن‌و خەڵك لێ هەڵگەڕاندنەوەو کوشتن. لایەنی هەڵوێستیش خوێندنەوەو تەماشاکردنی ناڕەواو ناحەقە بۆ ڕەهەندەکانی ئاژاوەکەو هەڵشێواندنیەتی، لەگەڵ هەڵوێستی ناشیرین نواندن‌و قسەی ناشایستەیە ـ کەواتە ئەم فەرموودەی کە دەفەرموێت هەرکەسێك لەسێ شت دەرباز بێت، ئەوە

---

[1] مسند الامام أحمد باب مسند انس بن مالك (١٢٤٩٣).

[2] المسند (٤/٤١٩)، (٥/٣٤٦) تحقيق أحمد شاكر.

ڕزگاری بووە. مردنی منو دەجالو کوشتنی خەلیفەی ڕاست ڕۆشتوو، بە ناحەق. هەموومان دەگرێتەوەو مەبەستی ئومەتەو تایبەت نییە بەو چەند کەسەی کە هەستاون بەئاژاوەکە، واتە هەریەکمان بەخراپی بەشداری بکەین ئەوە دەستمان هەیە تێیدا[1].

٢ـ لەڕۆژەدا، ئەو سەرداپێچراوە دەکوژرێت

ئیبن عومەر دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ باسی هەڵگیرسانی فیتنەو ئاژاوەی دەکرد، لەپڕ پیاوێك ڕابورد فەرمووی "لەو ڕۆژەدا ئەو سەر داپێچراوە بە ستەم لێکراوی دەکوژرێت". دەڵێت: تەماشامان کرد، کە سەرداپێچراوەکە عوسمانی کوڕی عەفانە[2].

٣ـ لەو ڕۆژەدا ئەوە، لەسەر هیدایەتە

لە کەعبی کوڕی حوجرەوە دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ باسی هەڵگیرسانی فیتنەو ئاژاوەی دەکرد، باسەکەی نزیك کردەوەو لە ناکاو پیاوێك سەری داپێچابوو تێپەڕی، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەو پیاوە لەو ڕۆژەدا لەسەر ئیسلامو هیدایەتە، منیش دەرپەڕیمو پەلی عوسمانم گرتو هێنام بۆ لای پێغەمبەر ﷺو وتم ئەمە دەفەرمویت؟ فەمووری "ئەمە دەڵێم"[3].

٤ـ ئاژاوە وەکو گڕکان گڵپە دەکات ئەمەو ئەو کەسەش کە لەگەڵێدان لەسەر حەقن

لەمورەی بوهزییەوە دەڵێت "من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووم، فەرمووی: ئاژاوەو فیتنە وەکو گڕکان گڵپە دەکات، ئەمەو ئەو کەسانەش کە لەگەڵێدان لەسەر حەقن، دەڵێت ڕۆشتم نەویم لەجلو بەرگی زەلامەکە (کە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کرد) سەیردەکەم عوسمانی کوڕی عەفانە"[4].

٥ـ ئەمەو هاوڕێکانی لەسەر حەقو هیدایەتن

ئەبی ئەشعەس دەڵێت "وتاربێژەکان لە خەلافەتی موعاویەدا هەستانو گفتوگۆیان دەکردو وتووێژیان دەکرد، دواهەمین وتاربێژیان کە قسەی کرد مورەی کوڕی کەعب

---

[1] فتنة مقتل عثمان، د. محمد عبدالله الغبان (٤٤/١).

[2] فضائل الصحابة (٥٥١/١)، اسناده حسن.

[3] صحيح سنن ابن ماجة (٢٤/١).

[4] المسند (٣٣/٥)، له طرق تقوية.

بوو، وتی: ئەگەر ئەو فەرموودەیەم نەبیستایە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵنەئەسام - بیستومە لە پێغەمبەرەوە ﷺ باسی ئاژاوەو نارەحەتی دەکردو دۆخەکەی نزیك کردەوە، لەو کاتەدا پیاوێکی سەرداپێچراو تێپەڕیو ئەویش فەرمووی: لەو ڕۆژەدا ئەمەو هاوڕێکانی لەسەر حەقو هیدایەتن، منیش عوسمانم ڕووبەڕووی هێناو وتم: ئەمە ئەی پێغەمبەر ﷺ؟ فەرمووی "ئەمە"[1].

٦ـ دەست بگرن بە دەسو دڵ پاكو هاوڕێکانییەوە

لە ئەبو حەبیبەوە هاتووە، دەڵێت "من چوومە ئەو خانووەی کە ئیمامی عوسمانی تێدا گەمارۆ درابوو، ئاگادارم ئەبو هورەیرە مۆڵەتی خواست لە عوسمان، کە قسە بکات. ئیمامی عوسمان مۆڵەتی دا، ئەویش هەستاو سوپاسو ستایشی خودای گەورەی کردو پاشان وتی: من بیستومە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: ئێوە دوای من تووشی ئاژاوەو دووبەرەکی دەبن، یەکێك لەناو خەڵکەکە وتی: ئەی ئێمەچی بکەین ئەی پێغەمبەر ﷺ؟ ئەویش فەرمووی: دەست بگرن بە دەستو دڵپاكو هاوڕێکانیەوە، لەم کاتەشدا ئاماژەی کرد بۆ عوسمان[2].

٧ـ ئەگەر دوڕووەکان ویستیان کراسەکەت داکەنن دایمەکەنە

عەبدوڵڵای نوعمانی بەشیر ئەویش لە عائیشەوە دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن عوسماندا، پێغەمبەر ﷺ بە جۆرێك ڕوی کردە عوسمان پێشتر نەماندیبوو بەو شێوەیە ڕوو بکاتە کەسی تر، لەدوا قسەیدا کە کردی کێشای بە ناوشانی عوسمانداو فەرموی: ئەی عوسمان لەوانەیە خودای گەورە کراسێك بکاتە بەرت، ئەگەر مونافیقەکان ویستیان لەبەرت داکەنن، تۆ دای مەکەنە هەتا دەگەیتە من. سێ جار ئەم قسەیەی فەرموو - منیش وتم ئەی دایکی ئیمانداران ئەم فەرمودەیە تا ئێستا لە کوێ بووە؟ عائیشە وتی: وەڵڵاهی لەبیرم چووبوو نەکەوتەوە یادم، - دەڵێت: هەواڵمدا بە موعاویە باوەڕی نەکرد هەتا نوسراوێکی ڕەسمی بۆ دایکی ئیمانداران ناردو وتی: ئەو فەرمودەیەم بۆ بنوسە ئەویش بە نوسراوێك بۆی نووسیو بۆی نارد[3].

---

[1] مسند أحمد رقم (١٧٦٠٢).

[2] فضائل الصحابة (١/٥٥٢)، اسناده صحيح.

[3] مسند احمد باقي مسندا لانصارى (٢٤٠٤٥).

٨ـ پێغەمبەر ﷺ گفتێکی لێ وەرگرتووم دەبێ خۆم بگرمو ئارام بگرم لەسەری

لە ئەبو سەهلەوە ئەویش لە عائیشەوە دەڵێت: پیغەمبەر ﷺ فەرموویەتی "هەندێ لە هاوەڵانم بۆ بانگ بکە، وتم: ئەبوبەکر فەرموی: نەخێر، وتم: عوسمان؟ فەرمووی: بەڵێ. کاتێك بانگمان کرد فەرمووی بە عائیشە "برۆ ئەولاوە)، لەگەڵ عوسماندا کەوتە چرپەو کورمەو برمە، عوسمان ڕەنگی گۆڕا، وەختێك کەوتینە ڕۆژی گەمارۆدانی خانوەکەی عوسمان، وتمان ئەی ئەمیری ئیماندران ئایا شەڕ نەکەین لەگەڵیان؟ وتی: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ پەیمانێکی لێوەرگرتووم کە خۆم بگرم لەسەری[1]. لەم فەرمودەیەی کە پێغەمبەر ﷺ چرپاندی بە گوێی عوسماندا، سەرتاسەر واتای خۆشەویستییە بۆ عوسمانو پەرۆشی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەرژەوەندیی ئومەتەکەی لەدوای خۆی، پێغەمبەر، پێشتر هەواڵی هەندێ ڕووداوی وتووە کە پەیوەندیی بەدووبەرەکیو ئاژاوەوە هەبووەو سەرەنجامی ئەمانەش بە کوشتنی ئیمامی عوسمان کۆتایی دێت. پێغەمبەر مەبەستی بووە نیشانە گەورەکانی ئەم ئاژاوەیە، سڕو پەنهان بێت، تەنانەت ئیمامی عوسمان ئاشکرای نەکردو کەس هیچی لێنەدەزانی. کاتێك پێیان وت: بۆچی شەڕ نەکەین؟ وتی: نابێت، بەڵێنم داوە بە پێغەمبەر ﷺ خۆڕاگرم لەسەر ئەم بەڵایە[2]، لەم قسەیەدا دەردەکەوێت پێغەمبەر ﷺ عوسمانی ڕێنمایی کردووە بۆ هەڵوێستێکی لەبارو گونجاو لە داکەوتنی ئاژاوەکەدا، لەبەر ئەوەی کپ بکرێتەوە نەك پەرەی پێبدرێتو کڵپە بکات، لە هەندێ ڕیوایەتیشدا لەو وتەیە زیاتر هاتووەو چمکەکانی ئەم فەرتەنەیەی تیا ئاشکرا کراوە، وەك پێغەمبەر ﷺ بە عوسمانی فەرمووە "ئەگەر مونافیقەکان داوایان لێکردی ئەو کراسەی خودای گەورە کردویەتییە بەرت دایبکەنیت، دای مەکەنە"[3].

کاکڵەی ئەم وەعدو پەیمانە کە عوسمان باسی کردووە پەیوەستە بە ئاژاوەکەوە، وەسیەتی پێ کراوە خۆی بگرێتو کراسەکەی دانەکەنێت، لە فەرموودەکانو کۆمەڵێك نیشانەی ترەوە ئەوە دەردەکەوێت کە عوسمان ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبێتە خەلیفە. تەنها عوسمان، خۆی

---

[1] فضائل الصحابة (٦٠٥/١)، اسناده صحيح.

[2] المصدر السابق.

[3] فضائل الصحابة (٦١٣/١)، اسناده صحيح، الطبقات (٦٦/٣، ٦٧).

ئەم ڕاستیانەی دەزانی وەکو نهێنییەکی پێغەمبەر ﷺ لای خۆی پاراستبووی‌و نەیدەدرکاند. وەك دەریشکەوتووە کە فەرمووی بە عائیشە بچۆرە ئەولاوە، واتای ئەوەیە گەرەکی بووە بە نهێنیی‌و دووقۆڵی قسەی بۆ بکات‌و کەسی تر لە ژوورەکەدا نەبێت، عوسمان ڕەنگی گۆڕا ئەوەش بەڵگەیە لەسەر سەختی‌و ناهەمواری ئاژاوەکە، عائیشە نهێنییەکان دەبەستێتەوە بە ئاژاوەکەوە، بۆیە عوسمان هەموو لاڵەو پاڵەکان بۆ شەڕکردن، لەچواردەوری خۆی ڕەتدەکاتەوەو کار دەگاتە ئەوەی بە ناحەق ئیمامی عوسمان شەهید بکەن، هەروەها ئەم نهێنیانە چەندین ئاماژەی تر لەناواخندایە بۆ ئیمامی عوسمان، لەمەڕ داکەندنی کراسەکەی بەری هەڵوێستی گونجاوو دروستی هەبێت‌و حەتمەن ئاژاوەیەك دەکەوێتە تەمەن‌و سەردەمی عوسمانەوەو لە کۆمەڵێك فەرمودەشدا بە ڕاشکاوی هاتوو بەڵام بەنهێنیی هێشتنەوەی وردەکارییەکەی بۆ شاردنەوەی چەندین شتی تری پەیوەندار بووە، کە چەند حیکمەتێك لەپاراستنی ئەم نهێنیانەدا هەیە. کاتێك عوسمان ڕەفزی کوشتار دەکات لە کاتی گەمارۆدانەکەیدا لە خۆیەوە نەیکردووە، وەختێکیش موونافیقەکان، پێشنیاریان کرد کە عوسمان واز لە خەلافەت بهێنێت، ئەو ڕاڤەی حاڵی خۆی دەکات‌و ڕاڤەی وازنەهێنانی لە خەلافەتەکەشمان بۆ دەکات. ئەم دوو هەڵوێستە مێژوونووسان‌و لێکۆڵەرەوان پرسیار دەکەن هۆی چی بوو عوسمان وای کردو ئاڵۆزی دروست کرد؟[1] لەڕاستیدا ئاژاوەی کوشتنی نارەوای ئیمامی عوسمان لەکۆی ئەو ڕووداوانەدایە کە پێغەمبەر ﷺ لە ژیانی خۆیدا باسی کردووەو هەواڵی داوە کە دێتە کایەوە، ئەویش وەکو زانستێکی غەیب خودا نیشانیداوەو فرمانیشی پێ کرد بۆ خەڵکی‌و بەتایبەت بۆ عوسمانی ڕۆشن بکاتەوەو بەم شێوەیەش چارەسەری بکات‌و بە هێمنی‌و گفتوگۆ مامەڵەبکات‌و کوشتار نەکات‌و شەڕ هەڵگیرسێنێت[2]. کەواتە نێوەڕۆکی ئەم هەراو مەرافەیە بۆ عوسمان‌و بۆ خەڵکی ئاشکرا نەکراوەو هەتا ڕۆژی خۆی پارێزراوە، عوسمانیش بە پێی ئەو پەیمانەی دابووی جوولایەوە.

---

[1] فتنة مقتل عثمان، محمد عبدالله الغبان (٤٨/١).

[2] المصدر نفسه.

## باسی پێنجەم: عوسمان، لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق‌و عومەری فاروقدا

### یەکەم: لەسەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا

١ـ لە خەلافەتی ئەبوبەکردا، عوسمانی کوڕی عەفان، یەکێك بووە لەئەندامانی ڕاوێژکاری لە بابەتە هەنوکەییەکانی وڵاتدا. عوسمان، یەکێك بووە لەهاوەڵ‌و ڕاوێژپێکراوەکانی ئەبوبەکرو ڕاوبۆچوونەکانی لەکێشە هەرە گرنگەکاندا وەرگیراوە. هەروەها دووەمین کەس بووە لە باوەڕپێکراوەکانی لای ئەبوبەکری سدیق. عومەری خەتاب بۆ یەکلاکردنەوەی پرسەکان‌و تاوڕکردنی تەنگانەکان عوسمانی هەبووە بۆ لەسەر خۆیی‌و نەرمونیانیی. عومەر، وەزیری خەلافەتی سدیق بوو، عوسمانیش ئەمینداریی گشتیی دەوڵەتەکەی بوو بوو، لە هەمانکاتدا نووسەری گەورەو شەرەفی مەزنی خەلافەت بووە[1]. بۆ چوونەکانی عوسمان، لای ئەبوبەکری سدیق سەنگین بوو، دوای ئەوەی ئەبوبەکر سەرکەوت بەسەر بزووتنەوەی هەڵگەڕاوەکاندا ویستی ڕۆم قەڵاچۆ بکات‌و لەشکرێکی تێکۆشەری دەرکرد بۆ چواردەوری وڵات‌و گەڕا بەناو خەڵکداو ڕاوێژی پێ کردن هەرچیان بە باشزانی وتیان، ئەبوبەکر هەر کۆڵی نەدا، فەرمووی چیتر دەزانن؟ عوسمان وتی: من وادەزانم تۆ خەمخۆری ئەهلی ئەم دینەیت‌و زۆریش دڵسۆزی بۆیان، من بۆچونێکم هەیە بۆ بەرژەوەندی گشتیی، تۆ پێداگربە لەسەر ڕیشەکێشکردنیان، تۆ کەسێکی ڕاڕا نیت[2]. تەلحەو زوبێرو سەعدو ئەبوعوبەیدەو سەعیدی زەیدو ئەوانەی ئامادەی کۆبونەوەکە بوون لە کۆچەری‌و ئەنسارییەکان، وتیان: عوسمان ڕاست دەکات، ئەویش بە گوێی کردو هەڵی پاچین[3]. جارێکی تر ئەبوبەکری سدیق ویستی والییەك بنێرێت بۆ بەحرەین‌و لەمبارەیەوە ڕاوێژی کرد بە هاوەڵان، عوسمان وتی: پیاوێك بنێرە، کە پێغەمبەر ﷺ ناردبێتی بۆلایان‌و ئیسلامەتی‌و گوێڕایەڵییان پێشکەش کردبێت‌و بیناسن‌و بیانناسیت، هەروەها بزانن خەڵکی کوێیە

---

[1] عثمان بن عفان صادق عرجون (ص٥٨).

[2] تأريخ دمشق لابن عساكر (٦٣/٢، ٦٤)، أبوبكر الصديق للصلابي (ص٣٦٤).

[3] أبوبكر الصديق للصلابي (ص٣٦٤).

یەعنی (عەلای کوڕی خەزرەمی)، ئەبوبەکریش بەقسەی عوسمانی کردو عەلای هەنارد بۆ بەحرەین[1].

هەروەها کاتێك نەخۆشی زۆری بۆ ئەبوبەکر هێنا، کەوتە ڕاوێژکردن بە خەڵك، تا بزانێت کێیان پێ خۆشە لەدوای ئەو فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست، ئەبوبەکر لە دوای خۆی ئاماژەی کرد بۆ عومەر، ڕای عوسمانیش بۆ عومەر ئەمەبوو (ئەی خودای گەورە بەپێی ئەو زانیارییەی من هەمە عومەر نهێنییەکانی لە ئاشکراکانی چاکترە، لە ناو ئێمەشدا لە عومەر چاکترمان نییە)[2]، ئەبوبەکریش وتی: ڕەحمەتی خودای لێبێت وەڵڵاهی ئەگەر بیکەمە فەرمانڕەواتان نەیاریتان ناکاتو دژتان ناوەستێتەوە[3].

**قەیرانێکی ئابووری لەسەردەمی ئەبوبەکری سدیقدا**

ئیبنو عەباس دەڵێت "کەوتینە بێ بارانی لەسەردەمی سدیقدا، خەڵك کۆبوونەوەو چوونە لای ئەبوبەکر وتیان: ئاسمان باران نابارێنێتو زەویش هیچ سەوز ناکات، خەڵکیش لە تەنگانەو ناڕەحەتیو ناسۆردان، ئەبوبەکریش فەرمووی بچنەوەو خۆتان بگرن هیچتان چنگ ناکەوێت، بەڵکە خودای گەورە بە هۆی بەخشندەییەکی گوشادەوە دەوورتان لێ بکاتەوە، ئیبن عەباس دەڵێت زۆری پێ نەچوو کاروانیی، بارەخواردنی ئیمامی عوسمان هاتەوە، چی هات باری سەد وشتر گەنم بوو یان خواردن، خەڵك هوتەرەیان کردە بەر دەرگای عوسمانو ڕژان بەسەریدا. عوسمان هاتە ناو حەشاماتە سەرمایەدارەکانو وتی چیتان دەوێت؟ وتیان وشکە ساڵییەو ئاسمان باران نابارێنێتو زەوی سمچقە سەوز ناکاتو خەڵکی لە سەختی ژیاندایە، بیستومانە تۆ باراشێکی بێ شومارت لایە پێمان بفرۆشە تا ئێمەش بڵاوی کەینەوە بە ناو موسڵمانانداو بەشی هەژاران بدەین. ئەویش فەرمووی بەسەرچاو فەرموون بیکڕن، سەرمایەدارەکان چونە ژوورەوەو بارەکان لە ماڵی عوسمان دانرابوون، ئادەی بازرگانەکان چەند قازانجم پێ دەدەن بەرامبەر ئەو بارانەی کە

---

[1] کنز العمال (٥/٦٢٠)، رقم (١٤٠٩٣)، القیود الواردة علی سلطة الدولة عبدالله الکیلاني (ص١٦٩)، تاریخ الطبري (٤/١٢٢).

[2] الکامل لابن الاثیر (٢/٧٩)، الخلفاء الراشدون محمود شاکر (ص١٠١).

[3] الکامل لابن الاثیر (٢/٧٩).

لەشامەوە هێناومن؟ وتیان: دە بە پانزە قازانج، وتی: فرۆشتوومە، وتیان: بازرگانی تری تیا نییە کێ لەئێمە زیاتری داوەپێت؟ فەرمووی خودای گەورە زیاتری داوە پێم، بۆ هەر درهەمێك دە درهەمی داوە پێم، ئایا ئێوە زیاتر دەدەن؟ وتیان نەخێر نەوەڵلا، فەرمووی خودایە تۆ شاهیدبە من ئەم بارە خواردنانە دەکەم بە خێرو سەدەقە بۆ موسڵمانە هەژارەکان[1]، ئیبنو عەباس دەڵێت: لە شەوێدا پێغەمبەر ﷺ لە خەودا بینی لە سەر وڵاخێکی ئەبڵەق بوو، کەوایەکی نورینی لەسەرشانبوو دوو نەعلی نورینی لەپێدابوو قامچییەکی نورینی بەدەستەوە بوو زۆر بەپەلە بوو، وتم: ئەی پێغەمبەر ﷺ زۆر تامەزرۆتم زۆر بە تاسم بۆ فەرمایشتەکانت بۆ کوێ خۆت تاو دەدەی؟ فەرموی "ئەی ئیبنو عەباس بە ڕاستی عوسمان ئەوماڵەی کردی بە خێر خودا لێی قبوڵ کردووەو بوکێکیان لە بەهەشتدا بۆ ڕێکخستووە دەنگیان کردووین بۆ زەماوەندەکەی"[2].

هەتا کەی سەرمایە پەرستەکانو ئەوانەی بژێوی مرۆڤەکان قۆرخ دەکەن بۆ تەماعکارییو چاوچنۆکی گوێیان ناکەنەوە بۆ ئەم زایەڵە مەزنە عوسمانییە، بۆ ئەوەی بخرێتە دڵیانو ڕابچڵەکێن، ڕاچڵەکانێکی وابێت سۆزو میهرەبانیو زەنگی بەزەییو چاکەخوازی بەرامبەر بە هەژارانو بێ نەوایانو هەتیوانو بێوەژنانو داماوەکان بکرێتەوە، ئەو هەژارانەی کە کۆسپەکانی ژیان خوێنی گوشیون، بۆ شەرابی دڵڕەقە مڕهەڵاتووەکان! ئای موسڵمانانی ئەم سەردەمە، چەند ئاتاجتان بە عوسمانێکی ترە، بۆ بەخشینی ماڵو دارایی بەسەر هەژارو موحتاجەکاندا، سۆزو دۆستایەتیو چاکەخوازی پەخش بکاتەوە لە نێوانیاندا[3]، ئەمە هەڵوێستێکە لە هەڵوێستە خێرۆمەندییەکانی عوسمان، چونکە بە بەزەیترین کەس حسێب دەکرێت، بەرامبەر موسڵمانان. بەڵام زۆرێك لەسەرمایەدارو بازرگانەکانی تر لەخۆباین، وەك خودای گەورە دەفەرموێ: (كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى* أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى) (العلق: ٦ - ٧).

---

[1] الرقة والبكاء لابن قدامة (ص١٩٠)، الخلفاء الراشدون حسن أيوب (ص١٩١)، مشهيد الدار أحمد الخروف (ص٢١).

[2] الرقة والبكاء (ص١٩٠).

[3] عثمان بن عفان صادق عرجون (ص٥٢).

نیشانەیەکی تری عوسمان ئەوەیە دوورترین کەس بووە لە دوڕوویی‌و لە دووڕووەکانیش[١].

**دووەم: لەسەردەمی عومەری فاروقدا**

عوسمان، پلەو پایەیەکی بەرزی هەبووە لای ئیمامی عومەر، ئەگەر خەڵکی بیان ویستایە پرسیاری شتێك لە عومەر بکەن، دەیناردن بۆ لای عوسمان‌و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف، بەعوسمانیشیان دەوت، پاشکۆ (پاشکۆ: لەزمانی عەرەبیدا ئەو کەسەیە لە پشتی کەسێکی ترەوە سواری وڵاخێکی بوویێت، بەڵام لە ڕووی دەسەڵاتەوە، ئەم ناوە بە کەسێك دوترێت کە حەزبکەن جێگەی سەرۆك بگرێتەوە)، عومەر لەگەڵ عوسماندا دەستیان نەشکایە بەسەر کارێکدا، دەچوونە لای عەباس‌و لەگەڵیدا دەبوون بە سیان[٢]، جارێکیان وارووویدا عومەر چووە سەردانی ڕەعیەت‌و دەیکردن بەسەرباز، کە پێیان دەوترا (سەربازی ئازادی)، عوسمان هات‌و پرسیاری لێکردو وتی: چیت بیستووە؟ چیت دەوێت؟ عومەر جاڕیدا وەرن بۆ نوێژ، (الصلاة جامعة)، پاشان ڕایگەیاند کە ئەمە کارێکی گرنگە بۆ غەزای عێراق[٣].

جارێکی تر ئەبوعوبەیدە، جوابی نارد بۆ عومەر بۆ ئەوەی هەنگاوبنێت، بۆ ڕزگارکردنی قودس، عومەر ڕاوێژی کرد بە خەڵکی‌و عوسمان ئاماژەی بۆ ئەوەکرد با خۆمان قایم‌و قۆڵ نەکەین‌و ئەسپ تاونەدەین، با بە هاکەزایی بچین بۆ ئەوەی ببێتە ڕسوایی‌و سەرشۆڕی بۆیان، وتی بە عومەر ئەگەر سەرقاڵی خۆئامادەکردن بیت‌و نەچیتە سەریان ئەوا واتێدەگەن تۆ لە بازویان دەترسیت‌و خۆت بۆ شەڕی ئەوان پێکەوە دەنێیت، هیچ شتێك بەکەڵك نایەت، جگە لەدەرچوون، بۆئەوەی داباریننە سەریان‌و بە سوکی بیانگرین‌و سەرانەیان لێ بسێنین[٤]، عومەریش هێرشبردنی پەسەند کردو وای پێخۆش

---

[١] شهيد الدار (ص٢٢، ٢٣).

[٢] تاريخ الطبري (٨٣/٤)، المرتضى للندوي، ص (١٣١)..

[٣] عثمان بن عفان الخليفة الشاكر الجابر (ص٦٣).

[٤] عثمان بن عفان محمد حسين هيكل (ص٤٧)، نقلا عن السياسة المالية لعثمان بن عفان (ص٢٤).

بوو بە هەرزان بشکێتەوە بەسەر موسڵماناندا، ئایا گەمارۆیان بدەین یان بەسەریاندا بدەین[1].

پێشتریش لەسەرەتای وەرگرتنی خەلافەتدا، ئیمامی عومەر ڕاوێژی کرد بە هاوەڵە دیارەکان بۆ دەرماڵەی خۆی لە بەیتولمالی موسڵمانان، عوسمان پێی وت: لێی بخۆو بەشی خەڵکیشی لێ بدە، بە ڕاستی پلەو پایەی عوسمان لە خەلافەتی ئیمامی عومەردا وەکو پلەوپایەی وەزیری دەستەڕاست وابوو، دەتوانین بڵێین پلەو پایەی عومەری هەبووە، لە خەلافەتی صدیقدا کە بۆ غەیری ئەو دەستی نەدابوو ـ ئەبوبەکر بەبەزەیترین کەسبووە بەرامبەر بە خەڵك، عومەر توندترین کەس بووە بۆ حەق سەندنو ئاینی خودا، خودای گەورە بڕشتی عومەرو بەزەیی ئەبوبەکری ئاوێتە یەك کردبوو بە هەردووکیان خەلافەتێکی ڕاستەقینەو سیاسەتێکی دادوەرانەو پشتێنێکی ئەستوریان دروستکردبوو. عوسمان، لە سۆزو بەزەییدا، زۆر لە صدیق دەچوو. عومەریش لەسەر ڕێبازی خۆی بوو لە توندوتۆڵیدا، کاتێك کاری گرتە دەست خودای گەورە عوسمانی کردە وەزیری یەکەمی خەلافەتەکەی بۆ قەرەبووی بەزەیو سۆزی ئەبوبەکری صدیق، دیسانەوە بە هەردوکیانەوە نموونەیەکی زیندوویان بەرپا کرد، لە ڕوی ڕێکخستنی دەسەڵاتو بەڕێوەبردنی ئومەتەوە کە وردترین سیاسەتو دادوەری بوو. خەڵك چاك، ئەم پلەو پایەی عوسمانە دەزانن لە خەلافەتی عومەردا، هەر عوسمان بوو ئاماژەی کرد بۆ عومەر دیوان دروست بکاتو مێژوو بەروار بنوسێت، وەکو ڕیوایەت کراوە.

١ـ دانانی دیوان

وەختێك ڕزگارکردن پەرەی سەندو سەروەتو سامان بێ شوماربوو، عومەر دەستەیەك لەهاوەڵاتی کۆکردەوە بۆ ئەوەی سەبارەت بەم داراییە، ڕاوێژیان پێ بکات، عوسمان وتی: داراییەکی زۆرمان هەیە، خەڵکیش پرشو بڵاوە، ئەگەر ئامارێك نەنووسین بۆ ئەوەی بزانین کێ وەری دەگرێتو کێ وەری ناگرێت، دەکەوینە هەڵەو مەترسییەوەو کاروبارەکانمان گەندەڵ دەبێت. عومەریش لەسەر بۆچوونەکەی عوسمان تەساڵەی دا دیوان دابنێنو لیست دروست بکەن بۆ تۆمارکردنی ناوی خەڵك[2].

---

[1] عثمان بن عفان الخليفة الشاكر (ص٦٣).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٠٣)، عثمان بن عفان، صادق عرجون (ص٦٠).

**٢- مێژوو**

لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتووە ئەوكەسەی كە ئاماژەی كرد بۆ ئیمامی عومەر مێژووی ساڵی كۆچی دابنێت‌و مانگی موحەڕەم بكاتە سەرەتای ساڵ، ئیمامی عوسمان بوو. ئەمەش پاش ڕێككەوتن بوو لەسەر ئەوەی كە سەرەتای مێژووی ئیسلامی، لەكۆچی پێغەمبەرەوە دەست پێ بكەن ﷺ. چونكە لەو ڕۆژەوە حەق لە ناحەق جیا كرایەوەو هەڵاوێرا، چەندین بۆچوون هاتە ئاراوە كام مانگ بكەنە سەرەتای ساڵ؟ عوسمان وتی: وام پێ خۆشە موحەڕەم سەرەتای ساڵ بێت، چونكە مانگی موحەڕەم یەكەم مانگیشە لە ژماردندا، لەو مانگەدا خەڵك لە حەج دەگەڕێنەوە، عومەرو هاوەڵە ئامادەبووەكان ڕازی بوون بە بۆچوونەكەی عوسمان‌و بڕیاریان لەسەر داو كرا بە پەیڕەوی بەرواری مێژووی ئیسلام[١].

**٣- زەوییەكانی باج‌و دەرامەت**

عوسمان یەكێك بوو لەوانەی پشتگیری عومەری دەكرد كە زەوییە ڕزگاركراوەكان، دابەش نەكرێت بەسەر سەربازەكاندا، بەڵكە وەك دەسمایەیەك بهێڵرێتەوە بۆ موسڵمانەكان‌و نەوەكانی دوای خۆیان.

**٤- حەج كردنی عوسمان لەگەڵ دایكی ئیماندارانداا[٢]**

عومەری كوڕی خەتاب لە ساڵی سیانزە كرایە خەلیفە، هەر لەو ساڵەدا عەبدولڕەحمانی كوڕی عوفی كردە سەرقافڵەی حاجیان، دیسانەوە عومەر ساڵی بیست‌و سێ حەجی كردەوە، هەر لەو ساڵەدا ڕوخسەتی دا بەخێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ بچن بۆ حەج‌و لە كەژاوەدا هەڵیان گرتن‌و عوسمان‌و عەبدولڕەحمانی لەگەڵیان نارد، عوسمان لەسەر وڵاخەكەی دەڕۆیشت لە پشتیانەوە، نەیدەهێشت كەس نزیكیان بكەوێتەوەو لە هەر مەنزڵێك عومەر لایبدایە، ئەویش لایدەدان. عوسمان‌و عەبدولڕەحمان، لە شیوێكدا دایانبەزاندن‌و خۆیان كەوتنە خواری شیوەكەوە بۆ ئەوەی كەس تێ نەپەڕێت بەسەریاندا[٣].

---

١ عثمان بن عفان، صادق عرجون (ص٦٠).

٢ السياسة المالية لعثمان (ص٢٥).

٣ طبقات ابن سعد (١٣٤/٣)، انساب الاشراف البلاذري (٤٦٥/١، ٤٦٦) مجلة البحوث الاسلامية العدد العاشر (ص٢٦٣).

# بەشی دووەم:

## جێنشینکردنی عوسمان و ڕێبازی حوکمکردنی و گرنگترین ئاکارە کەسییەکانی

## باسی یەکەم: جێنشینکردنی عوسمان

### یەکەم: پەیڕەوکردنی تێگەیشتنی عومەریانە لەخەلافەتدا

عومەری کوڕی خەتاب بەردەوام بایەخی دەدا بە یەکڕیزی گەڵو ئایندەیان، هەتا دواهەمین ساتەکانی ژیانی، هەرچەندە ئازاری برینە ناسۆرەکانی ببوە کۆسپ بۆی، بەڵام هەڵوێستەکانی سەرەمەرگی دەرمانێکی هەمیشە زیندون، چونکە لە باوەڕی قوڵو دڵسۆزیو لەخۆبووردووییەوە سەرچاوەی گرتبوو[1]. عومەری فاروق لەو ساتە وەختە سەختەدا توانی ڕێچکەیەکی نوێ دابڕێژێت بۆ دەستنیشانکردنی خلافەت، کە پێشوتر نەبوو. ئەمەش دیارە بەڵگەیەکی بەرچاوو داناییەکی ڕۆشنە لەسەر سیاسەتی حوکمڕانی وڵاتی ئیسلام. لەودەمەی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، بە ڕاشکاوی جێگرەوەی دوای خۆی دیاری نەکرد، هەروەها ئەبوبەکر کۆچی دوایی کرد بە ڕاوێژکردن لە نێوان گەورە هاوەڵاندا عومەر کرا بە جێنشین. کاتێك عومەری فاروقیش لەسەر بەڕەی مەرگ بوو داوای لێکرا جێنشین دابنێت، ماوەیەك بیری لێکردەوەو بڕیاریدا ڕێچکەیەکی تر بێنێتە ئاراوە کە لەگەڵ ئەو شوێنو سەردەمەدا بگونجێت، خەڵك بەگشتی یەکدەنگو کۆك بوون لەسەر ڕێزو فەزڵی ئەبوبەکر، دوای پێغەمبەر ﷺ. هیچ ئەگەرێکی ناکۆکیو دووبەرەکی لەم بوارەدا نەبوو، بە تایبەت پێغەمبەر ﷺ بەکردارو گوفتار ئومەتی ڕێنمایی کردبوو کە ئەبوبەکر شیاوی ئەم کارەیە لە دوای خۆی. بە هەمان شێوە ئەبوبەکری سدیقیش کاتێك عومەری کردە خەلیفە باش دەیزانی کە تێکڕای باوەڕداران قەناعەتیان وایە عومەر، لەهەمووان بەڕێزترو بەهێزترە بۆ هەڵگرتنی لێپرساوێتی پاش ئەبوبەکر، بۆیە لە پاش ڕاوێژی کەڵەباوەڕداران کردیانە خەلیفەو هیچ کەسو لایەك نەیار نەبوو ئیجماع کرا لەسەر پەیمان پێدانی[2]، بەڵام ڕێچکەی هەڵبژاردنی خەلیفەی نوێ خرایە ئەستۆی ژمارەیەکی دیاری کراو لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ واتە خرایە دەستی (ئەنجومەنی ڕاوێژکاران)، ئەم دەستەیەش لەشەش هاوەڵدا قەتیس کرابوو، هەمووشیان شیاوی ئەو کارو هەرمانە بوون کە هەڵی سوڕێنن. هەرچەندە ئەم شەش

---

[1] الخليفة الفارووق عمر بن الخطاب، (ص١٦١).

[2] أوليات الفاروق، د. غالب عبدالكافي القرشي، (ص١٢٢).

هاوەڵە هەموویان لەیەك ئاستدا نەبوون، عومەری فاروق، شێوازی هەڵبژاردنو ماوەکەی بۆ دیاری کردن، هەروەها ژمارەی دەنگە بڕیاردەرو یەکلاکەرەوەکەی بۆ دیاری کردن، هەروەها حوکمی کۆبوونەوەکەی دەستنیشانکردو چارەسەری ئەگەرەکانیشی بۆ روونکردنەوە، گەر دەنگەکان بەرامبەر بوون چون چارەی بکەن، فەرمانی دەرکرد کە کۆمەڵێك سەربازی خودایی، چاوداشتی ڕەوتی هەڵبژاردنەکە بکەنو سزای ئەو کەسە بدەن کە پێچەوانەی ڕای گشتی دەجولێتەوە ڕێگریش بکەن لە گەڕەلاوژەو نەهێڵن هیچ کەسێك بچێتە ژوورەکەیانو گوێیان لێ بگرێتو قسەکانی ئەنجومەنو مەجلیسی (ئەهلی حەلو عەقد)[1] دزەی پێ نەکرێت.

لێرەدا پەندەکانی پلانو بەرنامەکەی عومەر لێکدەدەینەوە:

١ـ عومەر، ژمارەو ناوی ئەو هاوەڵانەی دەستنیشان کرد کە ئەنجومەنی ڕاوێژکاری پێکدەهێنن، ژمارەیان شەش هاوەڵ بوو: (عەلی کوڕی ئەبو تالیب، عوسمانی کوڕی عەفان، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، زوبێری کوڕی عەوامو تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا) بوون، بەڵام سەعیدی کوڕی زەیدیان تیا نەبوو کە لە دە کەسە مژدە پێدراوەکانی بەهەشتە، پێدەچێت، هەڵاواردنی ئەو لەبەر ئەوەبوویێت کە لەهۆزی بەنی عەدییە[2]، عومەریش سوربوو لەسەر دوورخستنەوەی خزمانی لە فەرمانڕەوایەتی، هەر خۆی لەبەر ئەمەش سەعیدی جیاکردەوە لە لیستی پاڵێوراوانو ڕاوێژکاران، چونکە خزمی نزیکی خۆی بوو[3].

٢ـ لەشێوازی هەڵبژاردنی جێنشین (خەلیفە) دا، عومەر فەرمانی پێکردن لەماڵی یەکێکیاندا کۆ ببنەوەو ڕاوێژ بکەن، عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەریشیان لەگەڵ بوو، تەنها وەك ڕاوێژپێکراوو هیچی تر، هیچ کارێکیان بە عەبدوڵلا نەسپاردبوو. سوهەیبی ڕۆمیشیان لە ماوەی ڕاویژکردنەکەدا کردبووە پێشنوێژو ئیمامی خەڵك. ئیمامی عومەر پێی فەرموو: ئەی صوهەیب، لەم سێ ڕۆژەدا ئیمامی بەرنوێژی کردن بە، بۆ

---

[1] أولیات الفاروق، د. غالب عبدالكافي القرشي، (ص١٢٢).

[2] البدایة والنهایة (١٤٢/٤).

[3] الخلفاء الراشدین الخالدي، (ص٩٨).

ئەوەی یەکێك لەم شەش هاوەڵە نەبێتە ئیمامو پێشنوێژو چانسی لەپالاوتنەکەدا بەرزبکاتەوە بۆ خەلافەت[1]. هەروەها عومەر فرمانی کرد بە میقدادی کوڕی ئەسوەدو ئەبو تەلحەی ئەنساری کە پارێزگاریو چاودێری ڕەوتی هەڵبژاردنەکە بکەن[2].

٣ـ ماوەی هەڵبژاردن یان راوێژکردن: عومەری فاروق، سێ ڕۆژی دیاری کردو بە ماوەیەکی گونجاوی زانی بۆ دیاریکردنی خەلیفە لەدوای خۆی، گەر لەمە زیاتر بێت مانای وایە درزی دووبەرەکی بەرفراوانتر دەبێت، بۆیە پێی وتن "با خۆری ڕۆژی چوارەم هەڵنەیەت، ئێوە یەکێکتان نەکردبێت بە ئەمیر"[3].

٤ـ ژمارەی ئەو دەنگانەی کە بەسە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە: ئیبنو سەعد بە سەنەدێك کە پیاوەکانی ساغن، هێناویەتی، ئیمامی عومەر فەرموویەتی بە سوهەیب سێ ڕۆژ بەرنوێژی بکە بۆ خەڵك، ئەم کۆمەڵەش (شەش هاوەڵەکە) بڕ بدە لە ماڵێکدا ئەگەر یەکدەنگ بوون لەسەر پیاوێکیانو یەکێکیان لاساری دەکرد، ئەوە بدە لەگەردنی[4]. عومەر، فەرمانی دا ئەو کەسەی دەیەوێت پێچەوانەی ئەم دەستەیە بجولێتەوەو داری دەستی موسڵمانان بشکێنێتو دووبەرەکی بخاتە نێوانیانەوەبیکوژن، لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا ﷺ "ئەگەر ئێوە لەسەر یەکێك کۆكو تەبابوون کەسێکی تر هاتو ویستی داری دەستان بشکێنێت یان دووبەرەکی بخاتە نێوانتانەوە ئەوا بیکوژن"[5].

ئەوەی لە پەڕاوە مێژووییەکاندا هاتووە، گوایە ئیمامی عومەر فەرمانی کردووە، بەکۆبوونەوەو ڕاوێژ کردنو وتویەتی ئەگەر پێنجیان کۆك بوون لەسەر یەکێکیانو دانەیەکان لاری کرد بە شمشێر بدەن لە گەردنی، ئەگەر چواریان کۆك بنو پیاوێکیان هەڵبژارد، بەڵام دوانیان لاری هەبوو بدەن لە گەردنی هەردووکیان[6]، ئەمە ڕیوایەتێکی نادروستەو سەنەدی تەواو نییە. بەڵکو لەو ڕیوایەتە ناقۆڵانەیە کە (ئەبو میخنەفی

---

[1] الخلافة والخلفاء الراشدون للبهنساوي (ص٢١٣).

[2] أشهر مشاهير الاسلام في الحزب والسياسة (ص٦٤٨).

[3] الطبقات لابن سعد (٣/٣٦٤).

[4] الطبقات لابن سعد (٣/٣٤٢).

[5] مسلم (٣/١٤٨٠).

[6] تاريخ الطبري (٥/٢٢٦).

ڕافزی شیعە هەڵی بەستووەو پێچەوانەی بەڵگە ڕاستەقینەکانەو زۆر دوورە لە هەڵسوکەوتی جوانو هەڵوێستی پەسەند، هەروەها لەمەش زیاتر، ئەبو میخنەفی شیعە خۆی هەڵی بەستووەو لکاندوویەتی بە وتەکانی ئیمامی عومەرەوە، گوایە گوتوویەتی بە سوهەیب بەسەر ئەهلی شوراوە (شەش هاوەڵەکە) ڕاوەستە یەکێکیان یان دوایانیان لاموجیمیان کرد بدە لەگەردنیان[1]، ئەمە قسەیەکی بێمانایە! ئیمامی عومەر چۆن شتی وا دەڵێت کە خۆی چاك دەزانێت ئەم شەشە هاوەڵە لە هاوەڵە دیارو هەڵکەوتووەکانی پێغەمبەرن ﷺ و خۆی هەڵی بژاردوون بۆ ئەم کارە. هەروەها چاك دەیزانی ئەمانە چەند بەڕێزو بە حورمەتن[2]. ئیبنو سەعد هێناویەتی کە ئیمامی عومەر فەرمویەتی بە ئەهلی ئەنسار[3]، ماوەی سێ ڕۆژ بیانکەنە ژوورێکەوە، ئەگەر پێکهاتن باشە، ئەگینا بدەن بەسەریانداو بدەن لە گەردنیان، ئەم ڕیوایەتە پچڕ پچڕی هەیە لەسەنەدەکەیدا (سەماکی کوڕی حەربی) تێدایە کە لاوازەو بە ڕیوایەتی تریش گۆڕاوە[4].

٥ـ چۆنییەتی حوکمردن لەکاتی تێپەڕین بەدۆخی ناکۆکیو ناڕێکی. ئیمامی عومەر، وەسیەتی کرد بە عەبدوڵڵای کوڕی ئامادەی ئەو دانیشتنە بێتو هیچ کاروبارێکی بەدەست نەبێت، بەڵام پێی وتن (ئەگەر سیانیان ڕازی بوون بە سیانەکەی ترتان ئەوکاتە عەبدوڵڵا، حوکم بدات بەلایەکتان. عەبدوڵڵا هەرلایەکی پەسەند کرد (لەسێ کەسەکە) ئێوەش پیاوێکیان هەڵبژێرن، خۆ ئەگەر ڕازی نەبوون بە حوکمی عەبدوڵڵا، ئەوە بچنە سەر ئەو لایەی کە عەبدولڕەحمانی عەوفی تێدایە. ئیمامی عومەر، عەبدولڕەحمانی بە خاوەن بڕیارو پیاوێکی عاقڵ وەسف کردو فەرموی: باشترین خاوەن بڕیار عەبدولڕەحمانی عەوفەو عاقڵانە ڕێگە لە گرفتەکان دەگرێتو کەسێکی دانایەو خوای گەورە پارێزەرییەتی، جا گوێی بۆ بگرن)[5].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٢٦).

[2] مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري، د. يحى اليحى (ص١٧٥).

[3] الطبقات لابن سعد (٣/٣٤٢).

[4] مرويات أبي مخنف في تاريخ الطبري (١٧٦).

[5] تاريخ الطبري (٥/٣٢٥).

٦ـ بەرەیەك سەربازی کردە چاودێری هەڵبژاردنەکە، تا ڕێگری لەئاژاوەو گەڕەلاوژە بکەن.

ئیمامی عومەر داوای لە ئەبو تەلحەی ئەنصاری کردو پێی فەرموو ئەی ئەبو تەلحە خودای گەورە ئێوەی بە هۆی ئیسلامەوە بەرزکردەوە، پەنجا پیاوی ئەنساری هەڵبژێرە با سەرپەرشتی ئەم دەستەیە بکەنو پاسەوانیان بێت هەتا پیاوێك لە خۆیان هەڵدەبژێرن[1].

هەروەها فەرمووی بە میقدادی کوڕی ئەسوەد "هەرکاتێك منتان خستە گۆڕەکەم، پاشان ئەم دەستەیە کۆبکەنەوە لە ماڵێکدا هەتا یەکێك لەخۆیان هەڵدەبژێرن بەخەلیفە"[2].

٧ـ ڕێگەدان بە فەرمانڕەوایی کەسێك کە کەسی لەو بەڕێزتریش هەبێت.

یەکێك لەبەروبوومەکانی ڕووداوی ڕاوێژکردن، ڕێگەدانە بە گرتنە دەستی بەرپرسیارێتی لەلایەن کەسێکەوە کە لەهەمان کاتیشدا لەو پایەدارتر هەبووە، هەروەك ئیمامی عومەر دەستەی ڕاویژکاری کرد بە شەش کەسو چاکیش دەیزانی هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەرێزترن، ئەم جۆرە نەخشانە لەژیانی ئیمامی عومەردا هەیە تەنانەت لەو کاربەدەستانەی کە کردوونی بە سەرپەرشتیاری شارەکان بە چەندەها شێوە هەڵی سەنگاندوون تەنیا فەزڵی دینداری نەدەکردە پێوەر، بەڵکو زیاتر دەگەڕایەوە سەر فەرهەنگو باکگراوەندی سیاسیی کەسەکان، لەگەل ئەوەشدا خۆی دەپاراست لەسەرپێچی شەرع، بۆ نموونە موعاوییەو موغەیرەی شوعبەو عەمری کوڕی عاسی کردە کاربەدەست، هەرچەندە لە ڕووی دینداریو زانیارییەوە لەوان بەڕێزتر هەبوو، هەروەها ئەبو دەردای کردە والی شامو ئیبن مەسعودیشی کردە والی کوفە[3].

٨ـ عومەر، لە نێوان دیاریکردنو دیاری نەکردنی جێگرەوەی خۆیدا تیل نیشانێکی کرد، ئیمامی عومەر، دیاریکردنو دیاری نەکردنی لە یەککاتدا کۆکردەوە، واتە وەکو ئیمامی ئەبوبەکر پاڵێوراوی دەستنیشان کرد، بەڵام بە ڕاشکاوی ئاماژەی بۆ نەکرد

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٥٥).

[2] المصدر السابق.

[3] المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدي (٢/٩٧).

بەهەمان شێوەی پێغەمبەر ﷺ، ئیمامی عومەریش شەش هاوەڵی دیاری کردو داوای لێکردن لەنێو خۆیاندا ڕاوێژ بکەن[1].

٩- ڕاوێژکردن، تەنها لەدەنگدانی شەش هاوەڵەکەدا کورت هەڵنەهاتووەو قەتیس بوو بێت. ئیمامی عومەر، دەیزانی ڕاوێژکردنەکە بە دەنگدانی ئەم شەش هاوەڵە کۆتایی نایەت، بەڵکە دەبێت ڕای گشتی خەڵکی مەدینە وەربگرن. دانانی سێ ڕۆژیش بۆ راوێژ خۆی لەخۆیدا مۆڵەتێك بۆ ڕاوێژکردنو وەرگرتنی ڕای خەڵك، تا بزانن کێ ببێتە خەلیفەو کێیان پێ باشە بکرێتە فەرمانڕەوا، ئەمەش بە پێی زۆرینەی دەنگی ئامادەبوانی شاری مەدینە کە شاری کۆچەریانو هاوەڵە مەزنەکانە. ڕای ئەو کەسە مەدینەییانەش وەربگرن کە لەشارو شوێنی تر نیشتەجێ بوبون، بۆ ئەوەی لە ڕێککەوتنەکەدا تەواوکەری ئەوانی تر بن. مەدینە هەتا ساڵی (٢٣)ی کۆچی ئۆردوگای هاوەڵان بووەو کەڵە باوەڕوانی تێدا مابو، چونکە ئیمامی عومەر لە تەنیشت خۆی هێشتبوونییەوەو گیری دابوونو مۆڵەتی پێ نەدەدان کۆچ بکەن بۆ هەرێمە ئازادکراوەکان[2].

١٠- ئەنجومەنی ڕاوێژکاری هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەرزترین دەسەڵاتی سیاسی بوو، بەڕاستی ئیمامی عومەر شارەزای کەسایەتی ئەندامانی ڕاوێژکاری بوو، بۆ ئەوەش بڕی دابوون کە لە نێوان خۆیاندا خەلیفەیەك هەڵبژێرن. ئەوەی گرنگەو دەبێت ئاماژەی پێ بکرێت ئەوەیە هیچ کەسێك دەربارەی بڕیارەکەی ئیمامی عومەر نەیار نەبووە، چ لە دیاریکردنی ئەندامانی ڕاوێژکارو چ لە وەسیەتەکانی، بە پێی ئەو بەڵگانەی کە لەبەردەستماندانو بەپێی بەڵگە بیستراوەکانیش یەکێك نەبوو پەڵپو بیانووی هەبێت لەهەنگاوەکەی عومەرو تەنانەت پێشنیارێکی جیاوازتریش لەو کاتو ساتەدا لەئارادا نەبووە، هەروەها هیچ کەسێکی یاخوو کوتلەباز نەبووەو تا دواهەمین ساتەکانی ژیانی عومەرو لەدوای وەفات کردنیشی هیچ ئاڵۆزییەك بەدی نەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەر هەموو خەڵك ڕازی بوون بەم تەگبیرەو پێیان وابوو ئەمە بەرژەوەندی کۆمەڵی

---

[1] المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدي (٢/٩٧).

[2] المصدر السابق.

موسڵمانانی تێدایە. دەتوانین بڵێین عومەر، هەیکەلێکی باڵای سیاسیی داهێنا کە پەیامیان هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵاتو دانانی خەلیفەبوو، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕێکخستنی دەستورێکی تازەیەو بلیمەتی ئیمامی عومەر پیشان دەدات. ئەم تەگبیرەش هیچ ناڕێکییەکی نییە لەگەڵ بنەما ڕەسەنەکانی ئیسلامدا بە تایبەت ئەو بەندانەی پەیوەستە بە ڕاوێژکردنەوەو دواتر وردە وردە حیکمەتی ڕاوێژکردنەکە دەرکەوتو هەرهەموو ئەهلی شار لەمزگەوتی گەورە پەیمانیاندا. هەرلەم میانەیەشدا جێگای ئەو پرسیارە نابێتەوە کە بە مێشکی هەندێ کەسدا هاتووە "کێ ئەم مافەی داوە بە ئیمامی عومەر وابکات؟" یان عومەر بەڵگەی چی بووە بۆ ئەم تەگبیرە؟ ئەوەندە بەسە بزانین کە گرۆی موسڵمانانو هاوەڵان، پێی ڕازی بوونو لێی بێدەنگو پێخۆشحاڵبوون پێی، بە هیچ کلۆجێکیش دەنگی ناڕەزایی نەبیستراوە، شتێکی زانراوو ئاساییشەوە ئەم تەگبیرە رای گشتیی لەگەڵدا بووەو کۆڕا (الإجماع) یەکێکە لەسەرچاوەکانی شەرع[1]. با ئەوەشمان لەبیر نەچێت، ئیمامی عومەر خۆیشی خەلیفەیەکی گوێ بۆ گیراوو مەرجەع بووە، ئێمە دەبێت جەخت بکەینەوە لەو بنەمایانەی کە ئەندامانی ڕاوێژکاری کە بەرزترین هەیکەلی سیاسین لە ڕژێمی حکومەتی ئیسلامدا، لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا تەساڵە یان لەسەرداوە، ئەم هەیکەلەی ئیمامی عومەر ناوی لێنان ئەوەندە کەڵکی لەم دەستە هاوەڵە وەرگرت لە هیچ دەستەیەکی تری وەرنەگرت، بنەمای ڕاوێژکردنەش لەوەوە هاتووە کە خودای گەورە مۆڵەتی بە ڕاوێژکردن داوەو پێغەمبەریش ﷺ ڕایگەیاندووە. لەناو ئیماندارانیشدا هیچ کەسێك نەبووە شان بدات لە شانی ئەم دە هاوەڵە لە تەقواو سپاردەپارێزیدا[2].

بەم شێوەیە ژیانی ئیمامی عومەر کۆتایی هاتو نەزری مردنو ئازاری برینەکەی سەرقاڵی نەکرد لە تەگبیرو نەخشەکێشان بۆ کاروباری موسڵمانان، پتەوترین ڕژێمی ڕاوێژکردنی دامەزراند کە هیچ کەسێك پێشی ئەم نەیکردبوو، بێگومان بناغەی ڕاوێژکردن، قورئانو فەرمودەو کرداو گوفتار داڕشتووەو پێغەمبەر ﷺ ئیشی لەسەر

---

[1] نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الاسلامي، ظافر القاسمي (١/٢٢٧، ٢٢٦).

[2] المصدر نفسه.

کردووەو ئەبوبەکریش وەکو بنەمایەکی دینی کاری پێکردووە، کەواتە ئیمامی عومەر شتی تازەی دانەهێناوەو کارەکەشی دەستنیشانکردنی ڕێچکەی هەڵبژاردنی خەلیفە بوو، بۆ ئەم کارەش ژمارەیەکی دیاری کراوی پێوە تایبەت کرد، ئەم شێوە بنیاتنانە نە پێغەمبەر ﷺ و نە ئەبوبەکر نەیان کردبوو، بەڵکە یەکەمین کەس و یەکەمین جار عومەر کردی و زۆر باشیشی کرد، چونکە باشترین ڕێگەی گونجاو بوو بۆ بارودۆخی هاوەڵان لەوکاتەدا[1].

## دووەم: وەسیێتی ئیمامی عومەر بۆ خەلیفەکەی پاش خۆی

ئیمامی عومەر، (ڕەزای خوای لێبێت) چەند وەسیێتێکی گرنگی کرد بۆ ئەو جێنشینەی کە دوای خۆی دەبێتە فەرمانڕەواو پێشەوای ئەم ئوممەتە. ناوەڕۆکی وەسیەتەکانیشی بەم شێوەیە بوو "وەسیێتت پێ دەکەم هەمیشە لە خودای تەنهاو بێ هاوبەش بترسە، وەسیێتت پێ دەکەم، بەرامبەر کۆچەرییە یەکەمەکان چاك بەو پێشینەیان لەبەر چاو بگرە، بە هەمان شێوە بەرامبەر ئەنسارەکان چاکبەو کرداری باشیان قبوڵ بکەو چاوپۆشی لە خراپەیان بکە، هەروەها وەسیەتت پێ دەکەم بۆ ئەهلی شارەکان باش بە، چونکە ئەوان قەڵغانی دوژمن و کانگای دەسکەوتن، بە خۆشی خۆیان نەبێت هیچ کارێکی گران مەدە بەسەریاندا، وەسیەتت پێ دەکەم بەرامبەر ئەهلی دەشتەکی باشبە، چونکە ئەوانە عەرەبی ڕەسەنن و کەرەسەی خاوی ئیسلامن، لەقەراغی ماڵ و داراییان وەربگرەو بیدە بە هەژارەکانیان، وەسیەتت بۆ دەکەم بەرامبەر ئەهلی زیمە (گاورو جولەکە) باش بە لەدواوە مەیان کوژە، زیاتر لەوزەی خۆیان ئەرك مەخەرە سەریان، ئەگەر سەرانەی خۆیان بە خۆشی خۆیاندا باشە، ئەگینا بەسوکی و سەرکزی لێیان وەرگرە. وەسیەتت پێ دەکەم لەخودا بترسەو کۆسپە بکە لەبەر خاتری ئەو، لەخەشمی بترسەو نەکەی گوناهت لێ بوەشێتەوە. ئامۆژگاریت دەکەم لە خودای گەورە بترسەو بۆ وەرگرتنەوەی مافی خودای گەورە لەخەڵك مەترسە. وەسیەتت پێ دەکەم، دادوەر بە بۆ ئوممەت و گەلەکەت، یەکلابەرەوە بۆ پێویستی و تەنگاویان، ڕێزی دەوڵەمەندەکان مەدە بەسەر هەژارەکاندا، ئەگەر بە یارمەتی خودای گەورە بەم شێوەیە

[1] اولیات الفاروق، د. غالب عبد الكافي القرشي (ص١٢٧).

بویت بێگومان دڵت سەلامەت دەبێت‌و گوناهەکانت هەڵدەوەرێت‌و کردارەکانت بە چاکە کۆتایی دێت، لای ئەو خودایەی کە لەپەنهانەکان دەزانێت‌و لە وردو کردی دڵت ئاگادارەو لێ خۆشبووە. فەرمانت پێ دەکەم هەرگیز لە فەرمانەکانی خودای گەورە دەرنەچیت‌و سنوورشکێنی نەکەیت، توندوتۆڵ بە لەبەرامبەر سەرپێچی کردن بۆ نزیکترین کەس یان دوورترین کەس. دەربارەی هیچ تاوانبارێك سۆز مەنوێنە هەتا بە ئەندازەی تاوانەکەی میرازی دەگریت، با خەڵکی لات یەکسان بن، باکت نەبێت حەق دەکەوێتە سەرکێ، بۆ ڕەزای خودای گەورە سەرزەنشتی خەڵکی فەرامۆش کە، دەخیلت بم خۆشەویستی‌و چاوبرسییەتی ئەو داراییەی کە خودای گەورە پێت دەبەخشێت وات لێ نەکات بەش‌و مافی ئیماندارانی لێ نەدەیت‌و ئەغز لە خەڵکی بکەیت‌و ستەمکاربیت لەگەڵیاندا، نەفسی خۆت ڕابگرە بە ئەندازەی ئەو فراوانییەی کە خودا پێی بەخشیویت، بەڕاستی دەچیتە هەوارگەیەك، هەوارگەی دونیاو قیامەتە. ئەگەر ڕۆیچیت بەدونیادا بەبێ گەردی‌و دادپەروەری بە ئەندازەی ئەو گوشادیەی خودا بۆتی فەراهەم دێنێ ئەوە وابزانە بەناو ئیمان‌و ڕەزامەندی خودادا ڕۆشتوویت، خۆ ئەگەر ئارەزووبازی زاڵ بێت بەسەرتدا ئەو بەناو خەشم‌و غەزەبی خودادا ڕۆچوویت. وەسیەتت پێ دەکەم بوار نەدەیت بە خۆت‌و کەسی تریش زوڵم لە ئەهلی زیمە بکەن، من وەسیەتت بۆ دەکەم‌و ئامۆژگاری تایبەتت دەکەم تۆش بەم قسانە ڕەزامەندی خودای گەورەو ڕووسووری ڕۆژی قیامەت بەدەست بێنە، من ئەو ئامۆژگاری‌و ڕێنماییانەت بۆ هەڵدەبژێرم کە خۆم‌و کوڕەکەم لەسەری دەڕۆین‌و کەڵکمان لێ وەرگرتووە، ئەگەر ئیش بکەی بە ئامۆژگارییەکانم‌و وازبێنیت لەو کارانەی قەدەغەت لێدەکەم، ئەوە چاك بزانە دەستت گرتووە بە داهاتێکی فراوان‌و پشکێکی تێرو تەسەلەوە، خۆ ئەگەر پیادەی نەکەیت‌و پشتگوێی بخەیت‌و دوور نەکەویتەوە لەو کارە ناهەموارانەی کە خودای گەورە پێی ڕازی نییە، ئەوە پەرتەوازەو لەکەدار دەبیت‌و بەرپەرچی بۆچوون‌و فەرمانەکانت دەدرێتەوە، چونکە هەر هەموو خەڵکی لە ئارەزوو هەوەسدا بەشیان هەیەو شەریکن، باش بزانە کاپۆڵی تاوان ئیبلیسەو سەبەبکاری هەموو تیاچونێکە، ئیبلیس میللەتانی پێش تۆی سەر لێ شێواند هەتا بردینیە ناو ئاگرو خراپترین شوێن، قێزەونترین سامانی کەسێك ئەوەیە دوژمنی خودای

خۆش بوێتو پێشەوای گوناهباری بێتو سواری بۆتەقەی حەق بێتو قەلاچۆکردنو مەرگەساتی لەلا ئاسان بێت. هەمیشە وتاریێژی دەرونت بە، سوێندت دەدەم بە خودا، بەزەییت بێتەوە بە کۆمەڵی موسڵماناناداو ڕێزی گەورەیان بگرەو سۆزت هەبێ بۆ بچوکیانو نتم بە بۆ زانایانیان، لە موسڵمانان مەدە با زەلیل نەبنو نارەحەتیان مەکە با تورە نەبن، بەشوباری خۆیان لێ حەرام مەکە با هەژار نەکەون، بە تۆپزی مەیان نێرە بەملاولادا با دوا بڕاو نەبن، مەهێڵە دارایی ببێتە گۆی دەست دەوڵەمەندەکان، دەرگایان بەڕودا دامەخە، نەوەك بەهێزەکان لاوازەکان بخۆن. ئەمە وەسێتی منە بۆ تۆ، خودا دەکەم بە شایەت بەسەرتەوەو ڕێزو سلاوم هەیە بۆت"[1].

ئەم وەسیەتە بە شێوەیەکی ئاسانو ڕەوان بەڵگەیە لەسەر دووربینی ئیمامی عومەر لە بارەی حوکمڕانیو بەڕێوەبردنەوە، چونکە باسی ڕێبازو ڕژێمی حوکمکردنو بەڕێوەبوردنی تۆکمە دەکات. لەناوەڕۆکی ئەم وەسێتەدا کۆمەڵێك بنەمای فرە بایەخداری تێدایە حەق وایە بکرێتە گەلالەیەکی تەخت، لەبەر خاتری ئەو هەمووە ڕێساو پرۆگرامو بنچینە بەنرخانەی کە تێیدایەو حوکمەتێکی تۆکمەی لێ دروست دەکرێت لە ڕووی ئایینیو سەربازیو ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە، لە پێشەکی وەسیەتەکەدا ئەمانە هاتووە:

١ـ پێداگری کردن بۆ تەقواو ترسان لە خودای گەورە.

أ ـ وەسیەتی دەکرد بۆ زیاتر تەقواو ترسان لە خودای گەورە لە ئاشکراو پەنهاندا چ بە گوفتار یان بە کردار بێت، چونکە هەر کەسێك تەقوای هەبێت خودای گەورەش دەیپارێزێت، هەرکەسێك ترسو بیمی خودای لەدڵدا بێت خودای گەورەش سایەناتی دەکاتو پەرژینی بە چواردەوردا دەکات (وەسێتت پێ دەکەم، بترسە لەخودای تاكو تەنیاو بێ شەریك)، (وەسێتت پێ دەکەم لەخودای گەورە بترسەو کۆسپەی لێ بکە.. وەسێت بێت تەقییە لەخودای گەورە بکە).

ب ـ تۆڵەی خودایی بسێنە لە خزمو بێگانە "گوێ مەدەو باکت نەبێ حەق دەکەوێتە سەرکێ"، "لەمافەکانی خودای گەورەدا لۆمەی لۆمەکاران فەرامۆش بکە"، چونکە

---

[1] الطبقات لابن سعد (٣٣٩/٩) البيان، والتبين للجاحظ (٤٦/٢)، الكامل في التأريخ (٢١٠/٢)، الخليفة الفاروق عمر بن خطاب للعاني، ص (١٧١، ١٧٢).

سنووره‌كانی خودای گه‌وره به‌ڵگه‌ی شه‌رعی له‌سه‌ره، كه كرۆكی دینه. ده‌بێت شه‌رع پێوه‌ربێت بۆ خه‌ڵك ده‌رباره‌ی گوفتارو كرداریان، بێ ئاگایی له شه‌رع، له‌به‌ریه‌ك هه‌ڵوه‌شانی دین‌و كۆمه‌ڵگه‌ی لێ ده‌كه‌وێته‌وه.

ج ـ ده‌بێ مرۆڤ دامه‌زراو بێت "چۆن فه‌رمانت پێ كراوه به‌و شێوه‌یه ده‌ق بگره"، جا ده‌ق گرتن زه‌روره‌تێكی دینی‌و دونیاییه‌و پێویسته به‌رپرس‌و فه‌رمان ڕه‌واكان یه‌كه‌مجار خۆیانی پێ برازێننه‌وه، پاشان گه‌له‌كه‌ی خۆیانی پێ بڕۆچێنن، وه‌ك ده‌فه‌رموێت " به‌رده‌وام ئامۆژگاریی ده‌روونی خۆت بكه "، یان ده‌ڵێت "ڕه‌زامه‌ندی خوداو ڕۆژی دوایی به‌ده‌ست بێنه".

٢ـ له گۆشه‌ی سیاسه‌ت‌و چه‌مكه‌كه‌یه‌وه

أ ـ خوگرتن‌و په‌یوه‌ست بوون به دادپه‌روه‌رییه‌وه، چونكه بنه‌مای حوكمڕانییه. ئه‌گه‌ر دادگه‌ری له‌ناو گه‌لدا پیاده بكرێت، چاوگه‌ی ده‌سه‌ڵات‌و حوكم به‌هێزو به‌سام ده‌بێت، دادگای سیاسی‌و كۆمه‌ڵایه‌تی بۆ ده‌سته‌به‌ر ده‌بێت‌و ده‌وڵه‌ت سام‌و شكۆی زیاتر ده‌بێت‌و ڕێزی كاربه‌ده‌سته‌كان له ناخی خه‌ڵكیدا پتر ده‌بێت وه‌ك ده‌فه‌رموێت "وه‌سێت بێت داده‌په‌روه‌ر به" یان "به چاوێكی یه‌كسان سه‌یری خه‌ڵك بكه".

ب ـ بایه‌خ به موسڵمانه یه‌كه‌مینه‌كانی كۆچه‌ی‌و ئه‌نسار بده، چونكه ئه‌وان پێشینانی ئیسلامن‌و عه‌قیده‌و ده‌سه‌ڵاتی سیاسیی له‌سه‌ر شانی ئه‌وان ڕاستكرایه‌وه‌و داكوترا، هه‌ر ئه‌وانه هه‌ڵگرو قه‌ڵغانی ئیسلام بوون، وه‌ك ده‌فه‌رموێت "وه‌سێت بێت بۆ كۆچه‌رییه یه‌كه‌مه‌كان چاك به‌و پێشینه‌ییان له‌به‌رچاو بگره، وه‌سێت بێت بۆ ئه‌نساره‌كان چاك به‌و كرده‌وه‌ی چاكیان قبول بكه‌و چاو له كه‌موكوڕییان بپۆشه".

٣ـ له گۆشه‌ی سه‌ربازی‌و ناوه‌ڕۆكه‌كه‌یه‌وه.

أ ـ گرنگی بده به سوپاو ئاماده‌سازییان، به شێوه‌یه‌كی گونجاو، به مه‌رجێك گه‌وره‌ترین به‌رپرسیارییه‌تی بخه‌یته ئه‌ستۆی خۆت، بۆ ده‌سته‌به‌ركردنی ئاسایشی وڵات سه‌لامه‌تییه‌كانی، گرنگی بده به بنه‌بڕكردنی ئاتاجی سه‌ربازه موجاهیده‌كان، وه‌ك ده‌فه‌رموێت "یه‌كلابه‌ره‌و بۆ ئاتاج‌و ته‌نگی موجاهیده‌كان".

ب ـ گیرنه‌دانی جه‌نگاوه‌ران بۆ ماوه‌یه‌كی دووورودرێژ، نه‌وه‌ك دابڕێن له خاوخێزانیان‌و وێڵ بن لێیان، چونكه سه‌ره‌نجامه‌كه‌ی ده‌بێته هۆی شه‌كه‌تی‌و ڕاڕایی‌و

هەرەسی مەعنەوییان، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە مۆڵەتی دیاری کراویان بدرێتیٚ لە کاتێکی دیاریکراودا،لەڕوویەکەوە بۆ ئەوەی پشوویەکی تیا بدەن‌و چالاکی خۆیان تازە بکەنەوە، لەڕوویەکی تریشەوە بگەڕێنەوە ناو خێزان‌و منداڵی خۆیان بۆ ئەوەی نەوەیان نەبڕێتەوە وەك دەفەرموێت "لە تەنگی‌و ناڕەحەتیدا قەتیسیان مەکە با دوابڕاوو زنجیرە پچڕاو نەبن"، "وەسێت بێت بۆ ئەهلی شارەکان چاك بە ئەوانە قەڵغانی ئیسلامن".

ج - پێدانی موچەو بەخشیش بە جەنگاوەرو سەربازەکان بە گوێرەی پلەو پایەیان، ئەمەش دالّدەو سەچاوەی بژێوی چەسپاویان بۆ دیاری دەکات‌و ڕێگەیان بۆ خۆش دەکات زیاتر تێکۆشان بکەن‌و بیرو هۆشیان گرفتاری پارەو سەرمایە کۆکردنەوە نەبێت، هەروەها لەکەمدەرامەتی‌و نەداریش دەرباز بن. وەك دەفەرموێت "ناڕەحەتیان مەکەو موچەی مانگانەیان پیٚ بدە با زویر نەبن‌و لەکاتی خۆیدا هەرگیز بەخششیان لیٚ مەبڕە با هەژارو قەرزار نەکەون".

٤- لە گۆشەی ئابووری‌و دارایی‌و ڕەهەندەکانیانە.

أ - گرنگیدان بە کەلوپەل بە خشینەوە لە نێو خەڵکدا، بە شێوەیەکی دادپەروەرانەو پێوانەیەکی ڕاسالاٚنە. زۆر وریابە لەوەی شمەك‌و کەرەسەکان ببنە بەش‌و سەرمایەی چاوچنۆکەکان‌و چینەکانی تری لیٚ بێبەری ببێت وەك دەفەرموێت "سەرمایەو داهات مەکە بە گۆی دەستی دەوڵەمەندەکان".

ب - لە وزەی خۆیان زیاتر ئەرك‌و زەحمەت مەخە سەر شانی ئەهلی زیمە، بە تایبەتی ئەگەر رسوماتی باج‌و سەرانەیان تەسلیم کرد وەك دەفەرموێت "پتر لە توانای خۆیان ئەرك مەخەرە سەر شانیان ئەگەر سەرانەی خۆیاندا".

ج - مافی بژێوی بۆ گشت لایەك تەرخان بکرێت‌و زیادە ڕۆیی تێدا نەکرێت‌و نەپشیٚ‌و نە نەڕژیٚ‌و دەست هەڵ بگیرێت لەو کارانەی لە توانا بەدەرن وەك دەفەرموێت "هیچ کارێك مەدە بەسەریاندا بە ئەندازەی تواناو خۆشی خۆیان نەبێت"، یان "لە قەراغی ماڵ‌و داراییان وەربگرەو بیدە بە هەژارەکانیان"[1].

---

[1] الخليفة الفاروق عمر بن خطاب للعاني، (١٧٤، ١٧٥).

٥ـ لە گۆشەی کۆمەڵایەتیو مەبەستەکانییەوە.

أ ـ گرنگیدان بە گەلو سۆراغکردنی کاروباریانو پڕکردنەوەی ئاتاجیانو موچەو ماف پێدانیان لەبەخشینەکان، وەك دەفەرموێت "بەخشینو موچەکانیان لێ مەگرەوە لەکاتو جێگای خۆیدا".

ب ـ خۆپاراستن لە ئاوێتەبوونو خۆش ویستنی دونیاو شوێنکەوتنی ئارەزووبازی، چونکە چەندەها قەیرانو کێشەی تێدایە فەرمانڕەواو شوانەکانە بەرەو هەڵدێرو کاولکاری دەباتو سەردەکێشێت بۆ گەندەڵی کۆمەڵگاو بێ متمانەییو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان دەشوێنێت، وەك دەفەرموێت "دەخیلت بم نەبیتە کۆیلەو دۆستی ئەو داراییەی کە خودای گەورە دەیخاتە بەردەستت"، "ڕیزی دەوڵەمەندەکان نەدەی بەسەر هەژارەکاندا".

ج ـ ڕێزی میللەت بگرەو نتم بە بەرامبەریانو خاکەساربە بۆ گەورەو بچوکیان، چونکە ڕێزگرتن بەرزترین پەیوەندی کۆمەڵایەتییەو هەنگاو دەنێت بۆ ئاوێتەبوونو ئاوێزانی گەلو سەرکردەو لای یەکتر خۆشەویستیان دەکات. وەك دەفەرموێت "سوێندت دەدەم بە خودا، بەزەییت بێتەوە بە کۆمەڵی موسڵمانداو مەزنی بدە بە پیرەکانو میهرەبانی بدە بە منداڵەکانو نتم بە بۆ زاناکان".

د ـ دەبێت بەڕوی گەلو میللەتدا سنگت کراوەبێت ئەمەش بەگوێ گرتن لە سکاڵاکانیانو تۆڵەسەندن لەهەندێکیان بۆ هەندێکی تریان دەبێت، گەر وا نەکرێت پەیوەندی نێوان گەلو سەرۆك دەشێوێتو ڕێکخستنی کۆمەڵگاش وێران دەبێت، وەك دەفەرموێت "دەرگایان لێ دامەخە نەوەك بەهێزەکان لاوازەکان بخۆن".

هـ ـ بەدوای حەقدا ڕۆشتنو سوربوون لەسەر پیادەکردنی لەناو کۆمەڵگادا لە گشت بارودۆخێکدا، چونکە پێداویستییەکی کۆمەڵایەتییەو هەر دەبێ بەرپا بکرێت، وەك دەفەرموێت "دەست بگرە بەحەقو ڕاستییەوەو خۆت لادە لەگێژاو". "بەچاوێکی یەکسان تەماشای خەڵکی بکەو مەپرسە حەق دەکەوێتە سەرکێ"،. واتە: تۆڵە بسێنە لەوەی تۆڵە دەکەوێتە سەری.

و ـ دوورکەوتنەوە لە ستەم بەهەموو شێوەو کلۆجییەك بە تایبەت لەگەل ئەهلی زیمەدا، چونکە دادپەروەری خواستراوە دەبێ پیادە بکرێت لە نێوەندی گشت میللەتە

جیاوازەکانی ولاتی ئیسلامدا بۆ ئەوەی هەموان لەسایەی ئیسلامدا بحەسێنەوە، وەك دەفەرموێت "وەسێت بێت دەرفەت نەدەی نە بە خۆت و نە بەکەسی تریش زولم لە ئەهلی زیمە بکرێت"، واتە: گاورو جولەکە.

ز ـ بایەخدان بە خەلکی دەشتەکیو گرنگی پێدانیان، "وەسیەت بێت بۆ خەلکی دەشتەکی چاکبە ئەوان عەرەبی ڕەسەنن و کەرەسەی خاوی ئیسلامن"[1].

ح ـ لە ناوەڕۆکی وەسیەتەکەی ئیمامی عومەردا هاتووە کە وەعدی نەداوە هیچ کرێکارێکی بیانی لە یەك ساڵ زیاتر لە ناو مەدینەدا بمێنێتەوە، بەلام بۆ کرێکارەکەی ئەبو موسای ئەشعەری وەعدی پێدا چوار ساڵ بمێنێتەوە لەکۆتاییدا بەدەستی ئەو کرێکارە کە (ئەبو لوئلوئی فەیروزی) بوو شەهید کرا[2].

**سێیەم: دەستوری عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەڕێوەبردنی شورادا**

١ـ لیژنەی ڕاوێژکردنی کۆکردەوە

تازە بەتازە خەلك لە ناشتنی ئیمامی عومەر تەواو بووبوون، بە خێرایی دەستەی ڕاوێژکارو ئەندامانی بالای هەلبژاردەی ولات لە مالی عائیشەی دایکی ئیمانداران کۆبوونەوە، دەشلێن لە مالی فاتیمەی کچی قەیسی فەهریدا کۆبوونەوەکە گرێدراوە بۆ چارەسەرکردنی گەورەترین کێشە کە ڕووبەڕوی ژیانی موسلمانان بۆتەوە لەدوای کۆچی دوایی ئیمامی عومەر. ئەنجومەنەکە وتویژیان کردو ڕای خۆیان دەربڕی بە یارمەتی خودای گەورە گەشتنە دیرێکی ڕێکو پێك کە خۆیان بە تایبەتیو موسلمانان بە گشتی پێی ڕازی بوون[3].

٢ـ کاتێك کەدەستەی ڕاوێژکاران کۆبوونەوە، عەبدولڕەحمان تەنازول (دەست لێ هەلگرتن)ی خۆی ڕاگەیاندو پێی وتن فەرمانەکە بسپێرن بە سێ کەستان زوبێر وتی: من بەشی خۆم یان کاری خۆم دەبەخشم بە عەلی[4]، تەلحەش وتی: منیش دەنگی خۆم دەبەخشم بە عوسمان، سەعدیش وتی: منیش دەنگی خۆم دەدەم بە عەبدولڕەحمان،

---

[1] الخليفة الفاروق للعاني، (ص١٧٣).

[2] عصر الخلافة الراشدة (ص١٠٢).

[3] عثمان بن عفان صادق عرجون (ص٦٢، ٦٣).

[4] البخاري، كتاب فضائل أصحاب النبي، رقم (٣٧٠٠).

ئالێرەدا پاڵێوراوەکان بوون بە سیان کە بریتی بوون لەعەلیو عوسمانو عەبدولڕەحمان، عەبدولڕەحمانیش وتی: کامتان لە حوکمڕانی هەڵدێنو لێی بێزارن منیش ئەیدەم بە ئەوەتان، وەڵڵاهی خەمی ئیسلامو خودای گەورەی دەکەوێتە سەر، عەبدولڕەحمان، وا تێگەیشت کە ئەوان ئەم، بە لەپێشترو شیاوتر دەزانن بۆیە هەردووکیان بێدەنگ بوون. عەبدولڕەحمان وتی: ئەیدەن بە من وەڵڵاهی من لە ئێوە شیاوتر نیم[1].

٣ـ عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کەوتە ڕاپرسی بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی دەستەی ڕاوێژکاریی.

عەبدولڕەحمان، دوابەداوی کۆبوونەوەی شەش پاڵێوراوەکە کە لە بەیانی ڕۆژی یەکشەممە دەستیان پێکردبوو، زۆر بە دەستوبرد کەوتە پەیوەندیکردنو ڕاوێژکردنو لەم هەنگاوەی بەردەوام بوو سێ ڕۆژی تەواو، هەتا بەرە بەیانی ڕۆژی چوارەمی مانگی چوارەمی موحەڕەم، کە دوا ڕۆژی ئەو مۆڵەتە بوو کە ئیمامی عومەر دیاری کردبوو. پاشان عەبدولڕەحمان بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەستی پێکردو پێی وت: ئەگەر پەیمان بێت تۆ هەڵنەبژێرین تۆ کێ هەڵدەبژێرێت بۆ خەلافەت؟ عەلی وتی: عوسمانی کوڕی عەفان هەڵدەبژێرم، پاشان چو بۆلای عوسمانو پێی وت ئەگەر تۆ هەڵنەبژێرینو پەیمانت نەدەینێ تۆ کێ هەڵدەبژێری وتی: عەلی کوڕی ئەبی تالیب. دوای ئەمە چوو بۆلای یارەکانی ترو ڕاوێژی پێکردن، عەبدولڕەحمان، بە هەر باوەڕدارییەکی تر دەگەشت لە شاری مەدینەدا ڕای وەردەگرتو پرسی پێ دەکرد، هەروەها پرسی بە ئەمیری سەربازو لەشکرەکان کردو ئەو کەسانەش کە هاتوونەتە شاری مەدینە، ڕاوێژکردنی عەبدوارەحمان پەرەی سەندو تەنانەت ڕاوێژی کرد بەو ئافرەتانەی کە لە پەچەی خۆیاندابوونو ڕای وەرگرتنو ڕای منداڵو کۆیلەکانی مەدینەشی وەرگرت، سەرەنجام گەشتە ئەو ڕایەی کە زۆرینەی موسڵمانان ئاماژە بۆ ئیمامی عوسمان دەکەنو بڕێکیش هەبوون ئاماژەیان بۆ عەلی دەکرد. لەنیوەشەوی، شەوی چوارشەممە عەبدولڕەحمان، چو بۆ ماڵی میسوەری مەخرەمەی خوشکەزایو دای لە دەرگا، ئەوکاتە میسوەر خەوتبوو[2] ئەوەندە دەی کردە

---

[1] المصدر السابق.

[2] الخلفاء الراشدون للخالدی (ص١٠٦).

دەرگا هەتا خەبەری بوویەوە پێی وت ئەوە چییە ئەلێی خەوتوویت؟ وەڵڵاهی ئەمشەو خەو نەچۆتە چاوم، هەستە بڕۆ زوبێرو سەعدم بۆ بانگ بکە، ئەویش بانگی کردنو عەبدولڕەحمان وتوێژی لەگەڵدا کردنو ڕاوێژی پێکردن، پاشان وتی: بڕۆ عەلیم بۆ بانگ بکە، بانگم کردو گفتوگۆیان کرد هەتا شەو زرنگایەوە، پاشان عەلی گەڕایەوە، پاشان وتی: عوسمانم بۆ بانگ بکە، بانگم کردو گفتوگۆیان کرد هەتا بانگی بەیانی[1].

٤- ڕێککەوتن لەسەر بەیعەتدان بە ئیمامی عوسمان

دوای نوێژی بەیانی کردیان بە ڕۆژی بەیعەتدان، کە دواهەمین ڕۆژی مۆڵەتەکەبوو، لە مانگی حاجیان ٢٣/کۆچی/٦٤٤ زاینی، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لای مینبەرەکە مێزەرەکەی پێغەمبەری ﷺ پێچابوو بەسەریەوەو، پیاوانی دەستەی ڕاوێژکاری کۆکردەوەو سوهەیبی ڕۆمی نارد بۆ لای ئەو کۆچەریو ئەنساریانەی کە لەماڵەوبوونو ناردی بە شوێن سەرلەشکرەکاندا کە لەنێویاندا موعاوییە لە شامو عومەیری کوڕی سەعد لەحیمسو عەمری کوڕی عاس لە میسر، هەبوون. بەپێی ریوایەتی بوخاری ئەمانیش هاوڕابوون لەگەڵ نەخشەکەی عومەرو بەدەم بانگهێشتەکەوە هاتبوون بۆ مەدینە[2]. کاتێك کۆبوونەوە دەستی پێکرد، عەبدولڕەحمان، شایەتومانی هێناو دەستی کرد بە وتاردان، پاشان فەرمووی: ئەی عەلی من لە ڕاوبۆچوونی خەڵك تێڕاماومو سەرنجم داوە کە کەس بەهاوشانو هاوسەنگی عوسمان نازانن، تۆ دڵت گەرد نەگرێت. پاشان فەرمووی بە عوسمان: بەیعەتت دەدەمێ لەسەر سوننەتی خودای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺو هەردوو خەلیفەکەی دوای خۆی، بەم شێوەیە عەبدولڕەحمان، پەیمانی داو هەموو کۆچەریو ئەنسارەکانو ئەمیرەکانو سەرجەم موسڵمانان[3] بەدوایدا پەیمانیاندا بە ئیمامی عوسمان. لەڕیوایەتی خاوەنی (تمهید البیان)دا هاتووە کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب یەکەم کەس بووە کە گفتو پەیمانی داوە بە ئیمامی عوسمان پاشان عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفو باقی هاوەڵان[4].

---

[1] البخاري كتاب الاحكام، رقم (٧٢٠٧).

[2] شهيد الدار عثمان بن عفان، أحمد الخروف، (ص٣٧).

[3] البخاري كتاب الاحكام، رقم (٧٢٠٧).

[4] التمهيد والبيان (ص٢٦).

٥ـ دانایی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لە جێبەجێکردنی نەخشەی ڕاوێژکردنەکەدا.

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف، ژیرانەو میرانەو بەئاقاری بەرژەوەندیی گشتیدا نەخشەی ڕاوێژکردنەکەی جێبەجێکردو نەیبرد بە ئاقاری بەرژەوەندی تایبەتیو سوودی تاکەکەسیدا، دەستی لە هەلپەرستیو تەماعکاری بەرداو ڕازی بوو بە خۆلادان لە بەرزترین پلەوپایەی دنیایی کە مرۆڤەکان هەڵپەی بۆ دەکەن، لەبەر ئەوەی هەڵوێستو دەنگی موسڵمانان کۆكو تەبابێت. یەکەمین ئیش لە ئیشەکانی ڕێکخراوی دەستەی ڕاوێژکاری بە هەڵبژاردنی کەسێك بۆ تەختی خەلافەت دەستی پێکردو کاروباری موسڵمانان کەوتە سەر سکەی دەستاودەست کردن. بەراستی عەبدولڕەحمان، ئەم ئیشەی بە نەرمیو ئارامو تەگبیری جوان سازاندو بریکارێك بوو کە سەرکەوتنی لە جێبەجێکردنی ڕاسپاردەیەکی مەزندا بەدەست هێنا.

ئەو هەنگاوانەی عەبدولڕەحمان نای ئەمانەی خوارەوە بوو:

١ـ لەیەکەم دانیشتنی ئەنجومەنی ڕاوێژکاریدا بەرنامەیەکی ئاسانی داڕشت لەچوارچێوەی ئەو مۆڵەتەی ئیمامی عومەر دیاری کردبوو، بەم بەرنامەیەش توانی ڕای هەموو ئەندامانی دەستەی ڕاوێژکاری وەربگرێتو بیانخاتە بەر تیشکو لێکۆڵینەوەو ڕاو بۆچوونی یەکە بەیەکەیانی زانیو ئەوانیش بەچاوڕۆشنی لەسەر پلانەکەی ڕۆشتن.

٢ـ نەفسی خۆی کوشتو لەمافی خۆی بۆ خەلافەت تەنازولی کرد، لەپێناو ئەوەی هەرچی گومانە لەسەری بڕەوێتەوەو بەقایمی دەستی گرت بەگوریسی ئەستوری متمانەو دڵنیاییەوە.

٣ـ هاتە سەر دواهەمین زانیارییەك کە لەلایەن هاوەڵانەوە پێی گەیشتبوو، واتە گەشتە ئەنجامی ڕاپرسییەکە. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام ڕاوبۆچوونەکانی تاوتوێ دەکرد لەگەڵیان، هەتا لە کۆتاییدا سوکە هەڵبژاردنێکی پچڕپچڕیی کرد. ئیمامی عوسمان لەسەر رای سەعدی ئەبی وەقاسو زوبەیری کوڕی عەوام هەڵبژاێردراو زۆرینەی ئەندامە دەنگدەرەکانی تریشیان لەگەڵ بوو، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کەسایەتی هەردوو پێشەوا عوسمانو عەلی بەلاوە گرنگ بوو. لەناو ئەو دەستەیەش، کە ئیمامی عومەر پالاوتنی، ئەم دوانە لە هاوەڵێتی پێغەمبەرو لەکێشدا هاوسەنگی یەکتر بوون،

ئەوەشیان تیا دەرکەوتبوو کە هیچ کامیان لاری لەوی تریان نییە، با پۆستەکەشی لەکیس بچوایە.

٤ـ لەودیوی دەستەی ڕاوێژکارەوە عەبدولڕەحمان گەڕایەوە بۆ سەر رای کەسە ماقوڵو خاوەن بۆچوونەکان، پاشان پرسیاری لەعامەی خەڵكو كۆیلەکانیش کردووە، بۆی دەرکەوتووە زۆربەی زۆری خەڵك کەس بە هاوشانو هاوتای عوسمان نازانن، بۆیە پەیمانی پێداو خەڵکیش بە گشتیی پەیمانیان پێدا[1].

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بە عاقڵانەو دەستپاکیو دامەزراویو خۆ فەرامۆش کردنو خۆ تەراکردن لە هەڵپەی خەلافەتو دەست هەڵگرتن لە بەرزترین پلەو پایەی دنیایی توانی ئەو تەنگو چەڵەمەیە ڕابماڵێتو سەرپەرشتی کاروانی دەستەی ڕاوێژکاران بە لێهاتوویيو بوێریو ڕاستی بکات، عەبدولڕەحمان، شایانی گەورەترین ڕێزو پێزانینە[2]، ئیمامی زەهەبی دەڵێت "نایابترین کردەوەی عەبدولڕەحمان، ئەوەیە نەفسی خۆی گرتو خۆی بەرکەنار کرد لە کارەکە لەکاتی ڕاوێژکردنەکەداو ئومەتی سەرپشك کرد خۆیان ئەو کەسە هەڵبژێرن کە ئەهلی (حەلو عەقد) ئاماژەی پێ دەکات، لەم بوارەدا خەڵکی ڕابوونو کردیانە دەنگدانێکی سەرتاسەری بۆ ئیمامی عوسمان، ئەگەر عەبدولڕەحمان مەرامی بە خەلافەت هەبوایە بۆ بەرژەوەندی خۆی خەریك دەبوو، یان بۆ ئامۆزاکەی کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسە کە نزیکترین کەسبوو لێیەوە[3]، بەم شێوەیە کارێك لەکارەکانی دەستەی باڵای ڕاوێژکاری لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکاندا پیادەکرا، ئەوەبوو کە خەلیفە لەڕێگەی دەستەی باڵای ڕاوێژکارییەوە دیاری کراو کەسێك کرا بە فەرمانڕەوا لەدوای ڕاپرسی گشتیو پاشان پەیمانی گشتیی درا"[4].

---

1 عثمان بن عفان، صادق عرجون (ص٧٠، ٧١).

2 مجلة البحوث الالامية العدد (١٠) ص(٢٥٥).

3 سير اعلام النبلاء شمس الدين الذهبي (٨٦/١).

4 دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (ص٢٧٨).

## چوارەم: پڕۆخڵەواتی ڕافزی چیرۆکی ڕاوێژکردنەکەی بۆگەن کردووە

لەمێژووی ئیسلامدا پڕۆخڵەواتی شیعەو درۆو دەلەسەی ڕافزی تەپیوەتە سەر یەك، یەکێك لەو پڕۆخڵەواتانە چیرۆکی ڕاوێژکردنەکەیەو بەخەلیفەکردنی ئیمامی عوسمانە بۆ خەلافەت. ڕۆژهەلاتناسەکانیش ئەم کەلێنەیان قۆزتۆتەوەو .پەرەیان پێداوەو زۆربەی مێژوونووسانو بیرمەندە تازەکانیش پێی کاریگەر بوون، بەبێ ئەوەی سۆراغی ڕیوایەتەکان بکەنو لەسەنەدو دەقەکان بکۆڵنەوە، لەنێو موسڵماناندا بلاویان پێکردووە. مێژووناسە شیعەو ڕافزیەکان زۆر گرنگیان داوە بەباسو خواستی ڕاوێژکردنەکەو گرتنە دەستی پایەی خەلافەت لەلایەن ئیمامی عوسمانەوە. ئەوان ئەم بەسەرهاتەیان ئاخنیوە لەپڕۆخڵەواتو درۆی شاخدارو تەنانەت کۆمەڵێکیان لەمبارەیەوە پەرتوکیان نوسیوە. بۆ نمونە (ئەبو میخنەق) پەرتوکی شورای نووسیوە، هەروەها ئیبنو عوقدەو ئیبن بابویە[1] وە ئیبنو سەعد، نۆ ڕیوایەتی هێناوە لە ڕێگەی واقیدییەوە دەربارەی دەنگوباسی ڕاوێژکردنەکەو بەیعەتدان بە ئیمامی عوسمانو بەرواری دەست بەکاربوونی خەلافەتەکە[2] و ڕیوایەتی تری نقلّ کردووە لە ڕێگەی عوبەیدوڵلای کوڕی موساوە، هەر لەشەهیدکردنی ئیمامی عومرو تایبەتکردنی دەستەی ڕاوێژکاری لە شەش کەسدا، تا دەگاتە وەسێتکردنی بۆ عەلیو عوسمان، لەم ڕیوایەتانەدا هاتووە کە ئەگەر هەرکام لەعلیو عوسمان، کاروباری خەلافەتیان گرتە دەست چی بکەنو چی نەکەن؟ هەر لەم ریواتانەشدا وەسێت کراوە بۆ سوهەیبی ڕۆمی کە بەوکارە هەستێت کەپێی سپێردراوە[3].

هەروەها بەلازری، دەنگوباسی ڕاوێژکردنەکەی دەستەی ڕاوێژکارو بەیعەتدانی بە ئیمامی عوسمان لە ئەبی میخنەقەوە نقلّ کردووە[4]، هیشامی کەلبی، یەکێکی ترە لەوانەی کە راوێژکردنەکەی لە ئەبی میخنەقەوە نقلّ کردووەو تەنها پشتی بە ئەم

---

[1] الذريعة الى تصانيف الشيعة (١٤/٢٤٦).

[2] الطبقات الكبرى لابن سعد (٣/٦٣).

[3] المصدر الصابق (٣/٣٤٠).

[4] اناب الاشراف البلاذري (٥/١٨).

بەستووە[1]و لەواقیدی[2] و عەبدوڵڵای کوڕی موساشەوە[3] شتی نقلّ کردووە، تەبەریش لەم بەسەرهاتەدا پشتی بەستووە بە چەند ڕیوایەتێك، کە یەکێك لەو ڕیوایەتانە ڕیوایەتی ئەبی میخنەفە[4]، ئیبنو ئەبی حەدیدیش هەندێك ڕووداوی چیرۆکی ڕاوێژکردنەکەی گواستۆتەوە لەڕێگەی (ئەحمەدی عەبدول عەزیزی)یەوە[5] ئەویش لە نقلّەکەیدا ئاماژە بۆ کتێبی شورای واقیدی دەکات[6].

سەیردەکەین گێڕانەوەی شیعەکان چەندەها قسەو باسی نابەجیّو هەڵیتو پەڵیتی تێدایەو ڕیوایەتەکان سەروبنیان نییەو بیّ بەڵگە ماونەتەوە، بۆ نمونە یەکێك لەو قسەو باسە پڕوپوچانە ئەمەیە:

١ـ هاوەڵان بە خزم خزمێنە لەکەدار دەکەن لە کاروباری موسڵمانانداو، ڕیوایەتەکانی شیعە هاوەڵان بەخزمچێتی لەکەدار دەکەن لەکاروباری موسڵمانانداو تۆمەتی ئەوە دروست دەکەن کە عەلی ڕازی نەبووە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف کاری دیاریکردنو پاڵاوتنی خەلیفە ڕاپەڕێنێت. ئەبومیخنەفو هیشامی کەلبی ئەمیش لە باوکیەوە، ئەحمەدی جەوهەری ـ هێناویانە دەڵێن کاتێ ئیمامی عومەر، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفی کردە حەکەمو بڕیاردەر ئەگەر هەردوتای تەرازووەکە هاوسەنگ بوو، ئالێرەدا ئیمامی عەلی زانی خەلافەتی لەکیس چووەو بەری ئەم ناکەوێت، چونکە عەبدولڕەحمان لەبەر زاواو خەزووری نێوان خۆیو ئیمامی عوسمان، بێگومان عوسمان پێشدەخات[7].

ئیبن تەیمییە وەڵامی ئەم قسەیە دەداتەوە، خزمایەتی نێوان عوسمانو عەبدولڕەحمان بەدرۆ دەخاتەوەو دەڵێت: "عەبدولڕەحمان نە برای عوسمانەو نە ئامۆزایەتی، تەنانەت لە هۆزەکەیشی نییەو بە هیچ شێوەیەك کەسی یەکتر نین، بەڵکە عەبدولڕەحمان تیرەی زوهرییەو عوسمان تیرەی بەنی ئومەیەیە، تیرەی بەنی زوهرەش زیاتر هاوسێی بەنی

---

[1] المصدر الصابق.

[2] المصدر الصابق.

[3] المصدر الصابق.

[4] أثر التشيع على الروايات التأريخية، د. عبدالعزيز نور، ص (٣٢١)، وهو العمدة في هذه الفقر.

[5] شرح نهج البلاغة (٤٩/٩).

[6] المصدر الصابق (١٥/٩).

[7] أثر التشيع على الروايات التأريخية، (ص٣٢٢).

هاشمن نەك بەنی ئومەیە، چونکە بەنی زوهرە خاڵوانی پێغەمبەرن ﷺو دەفەرموێت بەسەعدی ئەبی وەقاص (ئەمە خاڵۆمە منداڵیش دەچێتەوە سەر خاڵوانی)[1]، هەروەها پێغەمبەر ﷺ برایەتی نەخستە نێوان کۆچەرێكو کۆچەرییەکی تر یان ئەنسارێكو ئەنسارییەکی تر، بەڵکو برایەتی خستبووە نێوان کۆچەریو ئەنساری، عەبدولڕەحمانی عەوفی کۆچەریو سەعدی کوڕی ڕەبیعەی ئەنساری کردە برای یەکتری"[2]. ئەم وەڵامەی ئیبنو تەیمییە مەشهورەو سەلمێنراوە لە کتێبە نوسراوەکانداو هەموو ئەهلی زانستو ڕاستپەروەر دەیزانن[3].

ڕیوایەتەکانی شیعە لەسەر خزمایەتی عەبدولڕەحمانو عوسمان هەڵبەستراوە، گوایە عەبدولڕەحمان زاواو خەزووری ڕاستیو حەقی لە بیر بردۆتەوە. بێگومان لەڕوویەکەوە سۆزو عاتیفەی پشتو باوکی ئەستورترە، تا سۆزی زاواو خەزووری. لە ڕوویەکی تریشەوە پەیوەندیی دنیاییو سروشتی لەنێوان نەوەی یەکەمی ئیمانداراندا، واتە (هاوەڵان) پەراوێزخرابوو هەرگیز وابەستەی خزمایەتیو پشتو باوانی نەبوون، بەڵکە پشتگوێیان خستووە، چیرۆکی زاواو خەزووریەکەشیان ئەوەبووە کە عەبدولڕەحمان ئومو کەلسومی کچی عەقەبەی ئەبی موعیتی خوشکی وەلیدی خواستووە[4].

٢ـ دەنگۆی دروستبوونی حزبی ئەمەویو حزبی هاشمی بڵاو دەکەنەوە.

ڕیوایەتی ئەبی میخنەق ئاماژە بۆ ڕوودانی کێشەو ئاژاوە دەکات لە نێوان بەنی هاشمو بەنی ئومەیەدا لە کاتی پەیمانو بەیعەتداندا بەعوسمان. ئەمەش زۆر نارێكو نادروستەو ڕاست نییە، چونکە لەمبارەیەوەهیچ ڕیوایەتێکی دروستو لاوازیش نەهاتووە[5]، تەنها ئەوە هەیە مێژووناسەکان تەشکیان گرتووە بە ڕیوایەتەکانی شیعەی ڕافزییەوە، دەستیان گرتووە بە کلکی پاڵانتەکانی شیعەوەو لێکدانەوەی هەڵەیان لەسەر ڕیوایەتی شیعەکان هەڵچنیوە، واتە وەها بینش دەکەن، ڕاوێژی هاوەڵانی پێغەمبەر

---

[1] صحيح سنن الترمزي (٢٢٠/٣)، رقم (٤٠١٨).

[2] البخاري كتاب المناقي الانصار، رقم (٣٧٨٠).

[3] منهاج السنة النبوية لابن تيمية (٢٧١/٦).

[4] الطبقات الكبرى (١٢٧/٣).

[5] الخلفاء الراشدون امين القضاة، (ص٧٨، ٧٩).

ﷺ له دیاریکردنی خەلیفەی تازەدا بە شێوەی گێرمەو کێشمەی عەشایەری بووەو خەڵكو هاوەڵان بونەتە دوو بەرەوەو دروستبوونی حیزبی ئومەوی‌و حزبی هاشمیی لێ کەوتووەتەوە. ئەمە بۆچونێکی ئەندێشەیی‌و تەلیسماوییەو ئەنجامێکی قەڵبەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، هەرگیز شتی وا لەو بارودۆخەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺی تیا ژیاوە سەری هەڵنەداوە لە کاتێکدا ئەوان واتە (کۆچەری‌و ئەنسارەکان) ڕووبەڕووی باوك‌و براو ئامۆزاو کوڕی عەشیرەتی خۆیان وەستاونەتەوە لەسەر دین، ناشگونجێ بیر لەبەرپابوونی ئاکاری وەها بکەین لەو بەڕێزانە، چونکە ئەوان هەموو شتێکی دنیاییان کردبووە قوربانی سەلامەتی دینەکەیان. قسەی ناحەزان، بەرامبەر ئەم هاوەڵە هەڵکەوتووانەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، پشتڕاست نابێتەوە. ڕووداوو بەسەرهات زۆرە لەلایەن هاوەڵانەوە کە دەیسەلمێنێت هاوەڵان زۆر لەوە گەورەتربوون، کە خۆیان بخەنە سوچێکی تەنگەبەری ئاوەهاوە بۆ چارەسەرکردنی کاروبارەکانیان، چونکە ئەم کێشەیە کێشەی نوێنەری بنەماڵەو عەشیرەت نەبووە، هەروەها ئەنجومەنی ڕاوێژکاری شایستەی ڕاوێژکردن بوون، لەئیسلامدا پایەدار بوون.

٣ـ ئەو قسانەی دەدرێنە پاڵ ئیمامی عەلی درۆو بوهتانە

ئیبن‌و کەسیر دەڵێت "ئەو باسەی کە زۆربەی مێژوونووسان‌و کەسانیتر ئاماژەیان پێکردووە وەکو ئیبن‌و جەبرو غەیری ئەویش لە پێشینانی خۆیانەوە نەیان بیستووە، کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتبێتی بە عەبدولڕەحمانی کوڕ عەوف "فێڵت لێکردم‌و فریوت دام، عوسمانت کردە خەلیفە لەبەر دەستوپەیوەندی زاواو خەزووری‌و هەموو ڕۆژێ کەین‌و بەینتان دەبەست بۆ بەرژەوەندی خۆتان".

تەنانەت عوسمان ئەوەندە تەڵەکەی کرد بە عەبدولڕحمانی کوڕی عەوف بۆ ئەوەی هەڵی بژێرێت بۆ خەلیفەیەتی، تا عەبدولڕەحمان وتی: "إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً". (الفتح: ١٠)، کە ئەمە درۆیەکی شاخدارە.

٤ـ لەکەدارکردنی عەمری کوڕی عاس‌و موغەیرەی کوڕی شوعبە

ئەبو میخنەق لە ڕیوایەتی ڕووداوی ڕاوێژکردنەکەدا باسی عەمری کوڕی عاس‌و موغەیرەی کوڕی شوعبە دەکات، گوایە ئەم دوانە لەبەردەمی دەرگای ڕاوێژکردنەکەدا

دانیشتوون‌و سه‌عد چووه به‌گژیاندا. ئه‌م کرده‌وه‌یه له خه‌ڵکی ڕه‌شۆکی‌و عه‌وام ناوه‌شێته‌وه چ جایه له‌هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌کان! باشه چۆن سه‌عد پێیان ده‌ڵێت ده‌تانه‌وێت بڵێن ئێمه‌ش گوێ ده‌گرین‌و ئه‌هلی ڕاوێژکردنین. خه‌ڵك زانیبوویان‌و لایان ڕۆشن بوو کێ ئه‌هلی ڕاوێژه. ئه‌گه‌ر که‌سێك دیقه‌تی بدات روون ده‌بێته‌وه که ڕیوایه‌ته‌که‌ی ئه‌بو میخنه‌ق هه‌ندێکی ڕه‌خنه‌و پلاره له‌هه‌نده‌که‌ی تری‌و به‌ڕاشکاوی بۆی ده‌رده‌که‌وێت که له‌گه‌ڵ بنه‌ما دروسته‌کاندا پێچه‌وانه‌یه. شته دزێوه‌کانی ئه‌بی میخنه‌ق له دیس ده‌رچووه، هه‌روه‌ك (يحي اليحى) ئاماژه‌ی به هه‌ندێك نموونه‌و نه‌زیله کردووه ئه‌وانه به‌سه بۆ ڕمان‌و هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی ڕیوایه‌ته‌کانی ئه‌بو میخنه‌ق‌و ناوه‌ڕۆکه‌کانی[1].

ئه‌م خاڵانه ئاماژه‌یه‌کی سه‌رپێیی بوو که ڕژاوه‌ته کولتووری مێژووی ئیسلامه‌وه‌و پرش‌و بڵاو بۆته‌وه له‌ئه‌ده‌بیات‌و که‌ڵچه‌ری ئیسلامداو کاریگه‌رییه‌کی دیاری کردووه‌ته سه‌ر پیاوانی هزرو خامه‌و مێژوو.

٥ـ عوسمانی کوڕی عه‌فان شایسته‌ی خه‌لیفه‌یه‌تی بوو.

هیچ ئیماندارێك گومانی له ڕه‌وایه‌تی خلافه‌تی عوسمان‌و دروستی ئه‌م خه‌لافه‌ته نییه‌و که‌س ناتوانێت تانه‌و ته‌شه‌ری لێ بدات، جگه له‌و که‌سانه‌ی که دڵیان تووشی ده‌خه‌ز بووه‌و گه‌نیوه. له‌ئه‌نجامی ئه‌و کینه‌یه‌ی که دڵی ته‌نیوه هه‌ڵه‌شه‌یی ده‌کات به‌رامبه‌ر هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌مه‌ش له هیچ که‌سێکه‌وه داناکه‌وێت له‌شیعه ڕافزییه‌کانه‌وه نه‌بێت. که سه‌رمایه‌ی ژیانی دونیایان بۆته جنێودان به‌هاوه‌ڵان‌و رق لێ بوونیان، گوێ نه‌دان به‌و توانج‌و ته‌شه‌رانه‌ی ده‌یگرنه هه‌رسێ جێ نشینه‌که، چونکه به پوچ‌و به‌تاڵیان ده‌زانن‌و خه‌لافه‌ته‌که‌یان به‌سه‌قه‌ت‌و ناته‌واو ده‌زانن. چه‌ندین به‌ڵگه‌ی دروست‌و بڕاوه‌و ئاساری دێرین‌و ئاماژه‌نما هاتووه له باره‌ی شایسته‌یی‌و ڕه‌وایه‌تی خه‌لافه‌تی ئیمامی عوسمانه‌وه له‌وانه‌ش[2]:

١ـ ئایه‌تی (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ

[1] مرويات أبي مخنف (١٧٩).

[2] عقيدة أهل السنة في الصحابة ص(٦٥٦/٢).

خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (النور: ٥٥). ئەم ئایەتە بە دیویکدا بەڵگەیە لەسەر شایستەیی خەلافەتی ئیمامی عوسمان، چونکە ئەو لەو کەسانەیە کە خودای گەورە کردوویەتی بە جێنشین لە زەویداو جێگە پێی بتەوکردووە لەرِۆژانی خەلافەتیدا. عوسمان، ژیانێکی باشی بەسەر بردووە، لەناو خەڵکیدا بە شێوەیەکی دادپەروەرانە حوکمی کردووەو نوێژەکانی بەچاکی ئەنجام داوەو زەکاتی ماڵی خۆی دەرکردووەو فەرمانی کردووە بە چاکەو ڕێگریی کردووە لە خراپە. ئەم ئایەتەش خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بۆ دروستیو شایستەیی خەلافەتی ئیمامی عوسمان[1].

٢ـ (قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْراً حَسَناً وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً) (الفتح: ١٦). ئەم ئایەتەش بە ڕوویەکدا بەڵگەیە لەسەر شیاوی خەلافەتی ئیمامی عوسمان، چونکە ناوبراو بانگخوازی ئەعرابەکان بوو، کە لە دوای پێغەمبەر ﷺ دەعوەی خەڵکیان دەکرد وەکو ئەبوبەکری سدیقو ئیمامی عومەرو ئیمامی عوسمان، ئەبوبەکر بانگی کردن بۆ جیهادی فارسو ڕۆمو تورك، کەواتە ئەگەر گوێڕایەڵی ئەم سیانە بە گوێرەی دەقی قورئان واجب بێت، ئەوا خەلافەتیشیان ساغو سەلامەتەو خەڵکیش لێیان ڕازیە[2].

٣ـ ئەبی موسا دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ جارێکیان چووە ناو باخێكو فەرمانی کرد بە من دەرگاوانی باخەکە بم، پیاوێك هاتو داوای مۆڵەتی کردو فەرمووی: ڕێگەی بدەو مژدەی بەهەشتی بدەرێ. سەیرەکەم عومەرە، پاشان یەکێکی تر هاتو داوای مۆڵەتی کردو فەرموی: ڕێگەی بدەو مژدەی بەهەشتی بدرەێ لەسەر بەڵایەك کە تووشی دەبێت، سەیرەکەم عوسمانە[3]. ئەم فەرمودەیە ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە هەرسێ خەلافەتەکە تەرتیب کراوەو ڕێکخراوەو هەواڵی ئەو بەڵایەش کە تووشی ئیمامی عوسمان دێت،

---

[1] عقيدة أهل السنة في الصحابة ص(٢/٦٥٦).

[2] الفصل في الملل والاهواء والنحل (٤/١٠٩ ـ ١١٠).

[3] البخاري رقم (٣٦٩٥).

بەواقیعی هاتە ڕێگای، ئەوەبوو لەخانووەکەی خۆی گەمارۆدرا هەتا ئەوکاتەی بەستەملێکراوی شەهیدیان کرد[1].

ئەم فەرموودەیە نیشانەیەکە لەنیشانەکانی پێغەمبەرایەتیو ئاماژەیەکیشە بۆ شەهیدبوونی عوسمانو لێ ڕازی بوونی لەلایەن پێغەمبەرەوە. ئەبوداود بەسەنەدێکی تەواو لەجابری کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتی کردووە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "پیاوێکی چاك ئەم شەو خەوێکی بینیوە، ئەبوبەکر بەپێغەمبەرﷺ کێشراوە، عومەریش بە ئەبوبەکر کێشراوە، عوسمانیش بە عومەر کێشراوە". جابر دەڵێت: "کاتێك هەستاین لەلای پێغەمبەر ﷺ وتمان ئەو پیاوە چاکە پێغەمبەر ﷺ خۆیەتیو ئەو سیانەش کە هەندێکیان بە هەندێکیان کێشراون ئەوانە دەبنە سەرکارو سەرپەرشتیاری ئەم ئاینەی کە خودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ"[2].

٥ـ ئەبو عەبدوڵلای حاکم، بە سەنەدی ئەبی هورەیرە ڕیوایەتی کردووە ئەبی هورەیرە دەڵێت "بیستومە لەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی بەمزوانە ئاژاوەو دووبەرەکی دائەکەوێت، دەڵێت ئێمەش وتمان ئەی پێغەمبەر ﷺ چارمان چییە؟ فەرمووی: بدەنە پاڵ ئەمیرو هاوەڵەکانی، ئاماژەی کرد بۆ عوسمان"[3]. ئەم فەرموودەیە موعجیزەیەکی ئاشکرای پێغەمبەرە ﷺ، کە پێغەمبەرایەتییەکەی دەسەلمێنێت، کتومت ئەو هەواڵانەی ئاماژەی پێکردبوو لەسەردەمی خەلافەتی ئیمامی عوسماندا بەرپا بوو، ئاژاوەکان بەدیهاتن، لەهەمان کاتدا ئەم فەرموودەیە نیشانێکی تێدایە بۆ ڕەوایەتیو دروستی خەلافەتی ئیمامی عوسمان، چونکە پێغەمبەر ﷺ خەڵکی ڕێنومایی کردبوو کە پەیوەست بن بە عوسمانەوە، هەواڵی ئەوەشی دابوو لە کاتی هەڵقوڵینی ئاژاوەو ناکۆکییەکاندا لەگەڵ ئەمیری ئیمانداران‌و پێشەواکەیان بن، فەرمانی کرد بەعوسمان ئاوڕ نەداتەوە بەملاولاداو هەموولایەك پەیوەندی پێوە بکەن، چونکە لەسەر حەقەو ئەوانەی کە دەرچوون لە ژێر فەرمانیو گەلەکۆمەیان لێکرد لەسەر بەتاڵ بوونو زیاتر

---

[1] عقيدة أهل السنة في الصحابة ص(٦٥٧/٢).

[2] سنن أبي داود (٥١٣/٢).

[3] المستدك (٩٩/٣).

خەڵکی هیچ‌و پوچ‌و هەوەسبازبوون. بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ شایەتی دابوو کە عوسمان هەمیشەو بەردەوام لەسەر حەق‌و هیدایەتەو لێی جودا نابێتەوە[1].

٦ـ ئەبو عیسای تورمزی لە ڕێگەی عائیشەوە ڕیوایەتی کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی "ئەی عوسمان زۆر نزیکەو پێ دەچێت خودای گەورە کراسێك بکاتە بەرت ئەگەر ویستیان لەبەرت دایکەنن، نەکەی دایکەنیت"[2]. ئا لەم فەرموودەدا ئاماژە کراوە بۆ خەلافەتی ئیمامی عوسمان بە خواستنی وشەی کراس واتە کراس خوازەیە، هەروەها وشەی لەبەرکردن، واتە هەڵبژاردن‌و پاڵاوتن، واتە خودای گەورە دەتکاتە جێنشین، ئەگەر خەڵکی ویستیان لاتبەرن‌و دات ڕنن لەخەلافەت، تۆ خۆتی لێ دامەڕنەو کۆڵی لێ مەدە بۆ خاتری ئەوان، چونکە تۆ لەسەر حەقی‌و ئەوان لەسەر ناحەقن[3].

٧ـ تورموزی بە سەنەدی ئەبی سەهلە ریوایەتی کردووە، ئەبی سەهلە دەڵێت "عوسمان لە ڕۆژی گەمارۆدانی ماڵەکەی پێی وتم: پێغەمبەر ﷺ پەیمانێکی لێوەرگرتم، من خۆم دەگرم لەسەر ئەو پەیمانەو نایشکێنم"[4]. ئەم قسەیە کە دەڵێت پەیمانی لێوەرگرتم یەعنی (وەسیەتی پێ کردم کراسەکەم دانەکەنم)، هەروەك پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە "ئەگەر ویستیان کراسەکەت لەبەر داکەنن داینەکەنی". بۆیە ئیمامی عوسمان دەڵێت: ئارامی لەسەر دەگرم‌و پەیمانەکە ناشکێنم[5].

٨ـ ئەبو عەبدوڵڵای حاکم بە سەنەدی ئەبی سەهلە ڕیوایەتی کردووە لەعەبدوڵڵای عوسمانەوە ئەویش لە عائیشەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی "یەکێکم بۆ بانگ بکەن". یان فەرموویەتی "ئەوە یەکێك لەهاوەڵەکانم دیار نییە؟ عائیشە دەڵێ: وتم ئەبوبەکرت دەوێت، فەرمووی نەخێر. وتم: عومەرت دەوێ؟ فەرمووی نەخێر. وتم عەلی ئامۆزات دەوێ؟ فەرمووی: نەخێر. وتم: کەوابو عوسمانت دەوێ؟ فەرمووی بەڵێ. پاشان

---

[1] عقيدة أهل السنتوالجماعة في الصحابة (٢/٦٦٠).

[2] فضائل الصحابة (١/٦١٣).

[3] الدين الخالص، محمد صديق حسن القنوجي البخاري (٣/٤٤٦).

[4] فضائل الصحابة (١/٦٠٥)، الترمذي (٥/٢٩٥).

[5] تحفة الاحوذي، محمد عبدالرحمن المباركفوري، (ص١٠/٢٠٩).

عوسمان هات‌و پێغەمبەر ﷺ چرپاندی بە گوێی عوسماندا و عوسمان ڕەنگی گۆڕا، دەڵێت ڕۆژی گەمارۆدانی ماڵەکەی پێمان وت شەڕ بکەین لەگەڵیان؟ وتی: نەخێر شەڕ مەکەن، پێغەمبەر ﷺ پەیمانێکی لێ وەرگرتووم، ئارام دەگرم لەسەری‌و ئەو پەیمانە ناشکێنم[1].

ئەم فەرموودەیەو ئەوەی پێشووش دوو بەڵگەی ئاشکران لەسەر خەلافەتی ئیمامی عوسمان‌و هەر کەسێك نکولی لەخەلافەتەکەی بکات‌و بە ئەهلی بەهەشت‌و بە شەهیدی نەزانێت، بەزمان یان بە جووڵە بێ ئەدەبی بکات بەرانبەری، ئەوە لە بازنەی ئیمان‌و ئیسلام دەرچووە[2].

٩ـ بەڵگەیەکی تر هاتووە لەسەر شایستەیی ئیمامەت‌و خەلافەتی عوسمان. ئیمامی بوخاری بەسەنەدی ئیبن‌و عومەر ڕیوایەتی کردووە دەڵێت "ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هیچ کەسێکمان بە هاوشانی ئەبوبەکر نەدەزانی، پاشان عومەر پاشان عوسمان، ئیتر وازمان هێنابوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کەسیمان نەئەدا بەسەر کەسی تریاندا، واتە هەموویمان بە هاوشانی یەکتری دەزانی[3]، ئەمە خۆی لە خۆیدا ئاماژەیەکە کە خودای گەورە بە سروش‌و خورپە تێیگەیاندبوون‌و ناخی ڕێکخستبوون کە چ بارودۆخێك دەسازێنێ بۆ سەرۆکایەتی خەلافەت لەپاش پێغەمبەرەکەی ﷺ[4].

ئیبن تەیمییە دەفەرموێت "هەواڵ‌و دەنگوباسی ئەوە هاتووە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هاوەڵان ڕێکو کۆك بوون لەسەر فەزڵی ئەبوبەکر، پاشان لەسەر فەزڵی عومەر، پاشان لەسەر فەزڵی عوسمان. هەروەها ڕیوایەتیش کراوە ئەم هەواڵە گەشتووە بە پێغەمبەر ﷺ نارەحەت نەبووەو نکولی لێ نەکردووە، کەواتە دەردەکەوێت ئەم فەزڵ‌و ڕێزە بە حەق چەسپاوە، یاخود بە ڕای کۆچەری‌و ئەنسارەکان چەسپاوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و هیچ کەسێك پێچەوانەی ئەو پەیمان‌و بەڵێنەی کە دراوە بە عوسمان نەجوڵاوەتەوە. هەروەها هەموویان لەدوای کۆچی ئیمامی عومەر، پەیمانیاندا

---

[1] فضائل الصحابة (١/٦٠٥)، المستدرك (٣/٩٩).

[2] الدين الخالص (٣/٤٤٦).

[3] البخاري كتاب فضال اصحاب النبي رقم (٣٦٩٨).

[4] عقيدة أهل السنة (٢/٦٦٢).

بەئیمامی عوسمان بەبێ فریودانو ترساندن. هیچ کەسو لایەك دژایەتی ئەم سەرۆکایەتییەی نەکردووەو بەرهەڵستیی نەبووە[1]. دەقی ئەم بەندانەی کە باسمان کرد لەمەوبەر هەموویان بەڵگەی بەهێزنو ئاماژەن بۆ لایقیو دروستی ئیمامی عوسمانو خەلافەتەکەیو هیچ دوو دڵییەکی تێدا نییەو لای ئەوانەی کە دەستیان بە قورئانو سوننەتەوە گرتووە هیچ گیروگرفتێکیان نییە. هەر ئەمانەش بەختەوەرترین کەسن، چونکە کار بە قورئانو سوننەت دەکەنو هەر ئەوانەش ئەهلی سوننەتو جەماعەتن. واجبیشە لەسەر هەموو موسڵمانێك بیروبڕوای وەهابێت کە ئیمامی عوسمان شایستەو ڕەوای خەلافەت بووەو بە تەواوەتی تەسلیمی ئەو بەڵگانە بێت کە لەم بارەیەوە هاتووە[2].

### شەشەم: گرێدانی کۆڕا (الأجماع) لەسەر خەلافەتی عوسمان

هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺو ئەوانەش کە دوای ئەوان هاتوونو ڕێچکەی ئەوانیان گرتووەتە بەر، لەئەهلی سوننەتو جەماعەت یەکدەنگنو کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئیمامی عوسمان، شیاوترین کەسبووە بۆ جێنشینایەتی پێغەمبەر ﷺ لە دوای ئیمامی عومەر. لەم بوارەشدا هیچ کەس نەیارو دژ نەبووە، بەڵکو هەر هەموویان ملکەچو ڕازی بوون، لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی ڕەها ئیمامی عوسمان بەڕێزترین دروستکراوی خودایە لە دوای هەردوو شێخەکە (ئەبوبەکرو عومەر). دەستەیەك لە ئەهلی زانستو فەرمودە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە لەدوای ئیمامی عومەر، ئیمامی عوسمان شایەنی خەلافەتە. جگە لەمانەش هەندێك لەو ڕاو بۆچوونە نەقڵ کراوانە ئەمانەن[3]:

١ـ ئیبنو ئەبی شەیبە بە سەندی حارسی کوڕی موحریب، ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: "لەسەر دەمی ئیمامی عومەردا حەجم کردووە، هیچ لایەك گومانی لەوەدا نەبووە کە خەلافەت دوای ئیمامی عومەر ئیمامی عوسمانە"[4].

---

[1] منهاج السنة النبوية لابن تمية (٣/١٦٥).

[2] عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام، د. ناصر بن على (٢/٦٦٤).

[3] المصدر نفسه (٢/٦٦٤).

[4] المصنف (١٤/٥٨٨).

٢ـ ئەبو نەعیمی ئەسفەهانی بە سەنەدی حوزەیفە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: "من وەستابووم لەگەڵ ئیمامی عومەردا ئەژنۆم لکابوو بە ئەژنۆیەوە، فەرمووی: قەومەکەت کێ بە خەلیفەی خۆیان دەزانن لە دوای من، منیش وتم: بە ڕاستی خەڵکی کاروباری خۆیان دەخەنە ژێر دەستی عوسمانی کوڕی عەفان"[١].

٣ـ حافزی زەهەبی لە شەریکی کوڕی عەبدوڵلای قازییەوە نقڵی کردووەو دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردو موسڵمانان ئەبوبەکریان کردە خەلیفە، خۆ ئەگەر زانیبێتیان یەکێکی تر هەیە لەو بەڕێزتر مەعنای وایە غەشیان کردووە، پاشان عومەریان کردە جێگرەوەی ئەو، عومەریش هەرچی پێ کرا لە دادگەریو ڕاستی پێی هەستا، هەتا وەفاتی کرد، پاشان کارەکە بوو بەڕاوێژکردن لە نێوان شەش هاوەڵی بەڕێزدا ئەوانیش لەسەر ئیمامی عوسمان ڕێککەوتن، ئەگەر زانیبێتیان کەسێك هەیە لە عوسمان ئەویەرترە، مەعنای وایە فێڵو غەشیان کردووە، حاشا ئەوانەش پیاوی غەش کردن نین"[٢].

ئەم نووسراوانە ڕوونکردنەوەیەکی ئاشکرای تێدایە کە لەناو هاوەڵەکانی پێغەمبەردا ﷺ بڵاوەو زراوە لەناوخۆیاندا کە ئیمامی عوسمان بەڕێزترو ئەویەرترە بۆ خەلافەت. هێشتا ئیمامی عومەر مابوو زیندوبوو کە دەمێك بوو هاوەڵان دەیانزانی بە گوێرەی هەندێك دەقی تیل نیشانو پڕ لەناواخن چۆن کاروباری خەلافەت ڕێك بخەنو خەلافەتی پێغەمبەر ﷺ لە دوای ئیمامی عومەر چۆن دەبێتو کێ دەبێتە خەلیفە. چاك دەیانزانی بە شێوەیەکی ڕەها ئیمامی عوسمان بەڕێزترین کەسیانە لەدوای ئەبوبەکرو عومەر[٣].

٤ـ ئیبنو سەعد بە سەنەدی (نیزالی سەبرە) ڕیوایەتی کردووە دەڵێت "عەبدوڵلای کوڕی مەسعود فەرمویەتی کاتێك عوسمان هەڵبژێردرا بۆ خەلافەت، باشترین زیندوومان بوو، ئێمە کردمانە جێ نشینو کەمتەرخەمیشمان نەکردووە واتە درێغیمان نەکردووە

---

[١] كتاب الامامة والرد على الرافضة (٣٠٦).

[٢] ميزان الاعتداتل في نقد الرجال محمد بن عثمان الذهبي (٢/٢٧٣).

[٣] عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام، د. ناصر بن علي عايض (٢/٦٦٦).

لەکەسی باشترو لەپێشتر". لەڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: "باشترین زیندوومان کردە سەردارو درێغیشمان نەکردووە"[1].

٥ـ حەسەنی کوڕی موحەممەدی زەعفەرانی دەڵێت: "بیستومە لەئیمامی شافیعی دەیوت: گشت خەڵك کۆك‌و تەبابوون لەسەر خەلافەتی ئەبوبەکرو ئەبوبەکریش عومەری کردە خەلیفەو پاشان خەلافەت کرا بە ڕاوێژکردن‌و درایە دەست شەش کەس کە یەکێك لە خۆیان بکەنە سەردار، ئەوانیش عوسمانیان کردە جێنشین ـ ڕەزای خوا لە هەموویان[2] ـ هەروەها (ئەبو حارسی کوڕی موحەممەدی مەقدیسی) وتەیەکی نقلّ کردووەو ئیمامی شافیعیش پەسەندی کردووە دەڵێت: "چاك بزانن پێشەوای ڕاستەقینە، دوای ئیمامی عومەر بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری‌و دیاریکردنی عەبدولڕحمانی کوڕی عەوف ئیمامی عوسمانە. عومەر عەبدولڕەحمانی کردە ئیمام‌و ئەویش عوسمانی کوڕی عەفانی پاڵاوت‌و هەڵیبژارد. ئیجماعی هاوەڵانیشی هاتە سەرو گشت هاوەڵان ڕازی بوون‌و پەیمانیاندا، بیروبۆچوونی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بۆ دامەزراندن‌و چەسپاندنی خەلافەتی ئیسلامی بوو، کاریشی بۆ ئەوە کردو ئیمامی عوسمانیش هەتا شەهید کرا لە جێبەجێ کردنی حەق‌و ڕاستی‌و لەبیناکردنی دادپەروەری نەوەستا[3].

٦ـ ئیبن تەیمیە لەئیمامی ئەحمەدەوە ڕیوایەتی کردووە فەرمویەتی "ئەو یەکدەنگی‌و کۆڕایەی کە هاوەڵان کردیان بۆ پەیماندان بە ئیمامی عوسمان هەرگیز بۆ پەیماندانی هیچ کەسێکی تر نەیان کردووەو بۆ کەسی تر ئەوەندە یەکدەنگ نەبوون"[4].

٧ـ ئەبو حەسەنی ئەشعەری دەڵێت "ئیمامەتی عوسمان‌و خەلافەتی عوسمان، جێگیرو بڕاوەبووە، لەدوای ئیمامی عومەرو بە دانیشتن‌و ڕاوێژکردن لەلایەن هاوەڵان‌و ئەنجومەنی ڕاوێژکارییەوە دانراوە. ئەوانیش ئیمامی عومەر دەست نیشانی کردبوون‌و هەموو یەکدەنگ‌و یەکڕەنگ بوون لەسەر فەزڵ‌و دادپەروەرییەکەی"[5].

---

[1] الطبقات الكبرى، (٦٣/٣).

[2] مناقن الشامعي للبيهقي، (٤٣٤/١).

[3] الرد على الرافضة، (ص٣١٩).

[4] منهاج السنة (٦٦/٣)، السنة للخلال، (ص٣٢٠).

[5] الابانة عن اصول الديانة، (ص٦٨).

٨ـ عوسمان سابونی دەڵێت: "بیرورای پێشینو ئەهلی فەرموده ڕۆشنه لەسەر تەرتیبو ڕێکخستنی خەلافەت، هەموویان وتویانه یەکەمین خەلیفه ئەبوبەکرە، پاشان عومەرەو پاشان عوسمان خەلیفەیه بەئیجماعی ئەنجومەنی ڕاوێژکاریو ئیجماعی هەموو هاوەڵانو گشت لایەك پێی ڕازی بوونو کردوویانەته خەلیفەی خۆیان"[1].

٩ـ شەیخولئیسلام ئیبن تەیمیه، ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت: "هەموو موسڵمانانو هاوەڵان پەیمانیان داوه به ئیمامی عوسمانو کەس له پەیماندانەکەی دوا نەکەوتووەو هاوەڵه خاوەن شکۆو دیارو بەتواناکان پێش هەموان پەیمانیان پێداوه. ئەوسا بوو به پێشەواو خەلیفه، گریمان وادابنێین عەبدولڕەحمانو عەلیو هاوەڵه دیارو هەڵکەوتووەکان پەیمانیان نەداوەتێ، گەر وابووایه نەدەبوو به ئیمام، بەڵام که ئیمامی عومەر ڕاوێژی دایه دەستی شەش کەسەکە (عوسمانو عەلیو تەلحەو زوبێرو سەعدو عەبدولڕەحمان)، تەلحەو زوبێرو سەعد به کەیفی خۆیان دەرچوونو دەستیان لێ هەڵگرت، عوسمانو عەلی عەبدولڕەحمان مانەوە، عەبدولڕەحمانیش خلیفایەتی نەکردو عوسمانو عەلی مانەوەو یەکێك لەم دوو پیاوه هەڵبژێردرا. بەم شێوەیه عەبدولڕەحمان سوێندی خوارد سێ ڕۆژ، زۆر نەخەوێتو چاو لەیەك نەنێت، دەستی کرد به ڕاوێژکردن به پێشینه یەکەمینەکانو شوێنکەوتووه چاکەخوازەکانو ڕاوێژی کرد به سەر لەشکری تێکۆشەران. هەر لەو ساڵەشدا سەرجەم موسڵمانان لەگەڵ ئیمامی عومەردا حەجیان دەکرد به کۆی دەنگ ئاماژەیان کرد بۆ خەلیفەیەتی عوسمان، ئاشکرایه هەموویان عوسمانیان پێشخستو پەیمانیان پێداو هیچ بەرژەوەندیو تەماحێك نەبوو له ئاراداو هیچ ترسو تۆقێکیش لەگۆڕێدا نەبوو. بۆیه کۆمەڵێك لەپێشەوایانو پێشینەکانی وەکو ئەبو ئەیوبی سەختیانیو ئەحمەدی حەنبەلو دارەقوتنیو غەیری ئەمانه دەڵێن "هەر کەسێك ئیمامی عەلی بخاته پێش ئیمامی عوسمان، ئەوە، موهاجیرینو ئەنسار بەگێلو گەمژەو گزیکار دەزانێت. ئەمه به هێزترین بەڵگەیه که ئیمامی عوسمان ئەوبەرترو ئەفزەڵترە، چونکه هاوەڵانو پێشەوایان به ڕاوێژو هەڵبژاردن پێشیان خستووه.

١٠ـ ئیبنو کەسیری حافز ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ باسی ئیجماعی هاوەڵان دەگێڕێتەوە لەسەر خەلافەتی ئیمامی عوسمانو دەڵێت "ڕیوایەت کراوه که ئەهلی ڕاوێژ

---

[1] عقيدة السلف واصحاب الحديث ضمن الرسالة المنبرية (١/١٣٩).

سەرپەرشتی کارەکەیان داوەتە دەست عەبدولڕەحمان، بۆ ئەوەی هەوڵ بدات‌و تێ بکۆشێ بۆ خاتری موسڵمانان بەڕێزترین کەس بکاتە خەلیفەیان. عەبدولڕەحمانیش ڕاپرسی کردووەو پرسیاری کردووە کە کێ شیاوەو بەڕێزترە لەناو دەستەی ڕاوێژکارانداو لە خەڵکی تریشی پرسیوە. هەر هەموویان ئیمامی عوسمانیان دەستنیشان کردووە، هەتا عەبدولڕەحمان وتویەتی بە ئیمامی عەلی ئەگەر بزانیت تۆ هەڵنابژێرین تۆ کێ هەڵدەبژێری؟ وتویەتی عوسمان. هەروەها وتویەتی بە ئیمامی عوسمان ئەگەر بزانیت تۆ هەڵنابژێرین تۆ کێ هەڵدەبژێریت؟ ئەویش وتوویەتی عەلی. دەرکەوتووە ئەم پرسیارە پێش هەڵاواردنی سێ کەسەکە بووە. پاشان عەبدولڕەحمانیش کشایەوەو لەگەڵ سێ کەسەکەی ترداو بەجێیان هێشت بۆ دوو خاوەن فەزڵەکە (ئیمامی عوسمان‌و ئیمامی عەلی)، چونکە ترسی خوداو حەقی ئیسلام کەوتبووە بەریان. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە عەبدولڕەحمان، زۆر تێکۆشا کە بەڕێزتریان بکاتە خەلیفە بۆ ئەم کارە. ئەو، ڕاپەڕی‌و ڕاپرسی کرد بە خەڵك دەربارەی هەردووکیان‌و ڕای موسڵمانانی تاوتوێ کرد، لەگەڵ ڕای سەرکردەو قیادەکانداو بە تێکڕا، عەبدولڕەحمان بەپەنهانی‌و بە ئاشکرا دانیشتنی کرد لەگەڵیان، هەتا خۆی گەیاندە ئەو ئافرەتانەی کە لەپەرچەمی خۆیاندابوون‌و پرسیاری کرد لەمنداڵان لەمەدرەسەی خۆیانداو پرسیاری کرد لەو سوارو دەشتەکییانەی کە دەهاتنە مەدینە. ئەم هاوەڵەی ئەندامی ئەنجومەنی راوێژکاری، لەماوەی سێ ڕۆژو سێ شەودا هەر سەرقاڵی نوێژو پاڕانەوەو نوێژی ئیستیخارە بووە، پرساری لە پیاوماقوڵان کرد، بەڵام کەسی بەرچاو نەکەوت بگاتە ئاست ئیمامی عوسمان‌و هاوشانی بێت. کاتێك گەشتە ئەو شەوەی کە بەیانییەکەی دەبووە ڕۆژی چوارەم، واتە (چوارەم ڕۆژی کۆچی ئیمامی عومەر)، بەر لە هەموو شت هات بۆ ماڵی میسوەری کوڕی مەخرەمەی خوشکەزای‌و پێی وت "بانگی عوسمان‌و عەلیم بۆ بکە". ئەویش بانگی کردن‌و ئەوانیش هاتنە لای عەبدولڕەحمان، هەواڵی پێدان کە پرسیاری کردووە لەسەرجەم خەڵك، کەس لە ئێوە بە باشتر نازانن. پاشان بەڵێنی لێ وەرگرتن دوبارە، ئەگەر هەرکامیان بوو بە خەلیفە دادپەروەر بێت‌و هەر کامیشیان فەرمان بەسەر مندا بکەن، گوێڕایەڵ‌و ملکەچ دەبم. پاشان ڕۆشت بۆ مزگەوت‌و مێزەرەکەی پێغەمبەری ﷺ پێچابوو بەسەریەوەو شمشێرەکەی کرد بە لاقەدیاو ناردی بە شوێن پیاوە دیارەکانی کۆچەری‌و ئەنسارەکانداو بە دەنگی بەرز هاواری کرد "کۆببنەوە بۆ نوێژ"، مزگەوت پڕبوو لە خەڵك‌و دەگەڕان بە

شوێن ئەوانی تردا. هەموویان ریزیان بەستو ڕێکخران بەجۆرێك كە ئیمامی عوسمان جێگەی بۆ نەمایەوەو لەخواری خەڵكەوە دانیشت. چونكە پیاوێكی شەرمن بوو، پاشان عەبدولڕەحمان چووە سەر مینبەرەكەی پێغەمبەر ﷺ زۆر وەستاو پاڕانەوەیەكی زۆری كرد، پێشتر پاڕانەوەی وایان نەبیستبوو، پاشان قسەی كردو وتی: ئەی خەڵكینە بە نهێنیی‌و ئاشكرا پرسیارم لە هەمووتان كردووە نەمبیستووە لە هیچ كەسێكتان لەم دووپیاوە بە بەڕێزتر بزانن (ئیمامی عەلی‌و ئیمامی عوسمان). عەبدولڕەحمان وتی: عەلی هەستە وەرە لام، عەلیش هەستاو چوو لەبەردەمی مینبەرەكە وەستا. عەبدولڕەحمان دەستی گرت‌و پێی وت: پەیمانم پێ دەدەیت لەسەر قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ‌و كردەوەی ئەبوبەكرو عومەر بڕۆیت؟ عەلیش وتی: نەوەڵلا، خودایە شایەت بە نەخێر. بەڵام بەپێی تواناو وزەی خۆم. عەبدولڕەحمان دەستی بەرداو پاشان وتی: ئەی عوسمان هەستە وەرە لام. عوسمان هەستاو چووە بەردەمی عەبدولڕەحمان دەستی گرت‌و پێی وت: ئایا پەیمانم پێ دەدەیت لەسەر قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ كردەوەی ئەبوبەكرو عومەرن بچیت؟ وتی: بەڵێ. عەبدولڕەحمان سەری بەرزكردەوە رووەو سەقفی مزگەوتەكەو دەستی لەناو دەستی عوسماندا بوو، وتی: ئەی خودایە گوێ ڕادێرەو شایەت بە، ئەی خودایە گوێڕادێرەو شایەت بە، ئەی خودایە گوێ ڕادێرەو شایەت بە، ئەی خودایە ئەو كارەی كە لەگەردنی مندا بوو خستمە گەردنی عوسمان. دەڵێت: خەڵكی هوتەرەیان كردو كەڵەكە بوون‌و پەیمانیاندا بە ئیمامەتی عوسمان، بەجۆرێك كە لەبەردەمی مینبەرەكەدا دایان پۆشی. دەڵێت: عەبدولڕەحمان لە شوێنەكەی پێغەمبەر ﷺ دانیشت‌و عوسمانیش لە پلەی دووەم دانیشت لە خوارەوە، خەڵك هاتن پۆل پۆل پەیمانیان پێدا، یەكەم كەسیش عەلی كوڕی ئەبی تالیب پەیمانی پێدا، ئەشڵێن دووەم كەس بووە.

ئەم نووسراوانەی كە لەمەوپێش باسمان كرد، ئیجماعی ئەو ئیمامانە بوون كە ناویان برا، هەر هەموو ڕایەكان ئەو چەمكە دەگەیەنن‌و ئەو ناكۆكییە یەكلایی دەكەنەوە كە پەیماندان بە خیلافەتی ئیمامی عوسمان بە تێرو تەسەلی دراوە، بە پاك‌و پوختی بووە بە

خەلیفە. بەئیجماعی هاوەڵان هیچ کەسێکیان نەیار نەبووەو دژایەتی نەکردووەو کەس لەم پەیمانە دوا نەکەوتووە[1].

حەوتەم: پێشخستنی عەلی بەسەر عوسماندا حوکمی چییە؟

ئەوەی کە ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەری کۆکن، ئەوەیە "هەرکەس فەزڵی عەلی بدات بەسەر عوسماندا، ئەوە هەڵەی کردووەو بە گومڕاو بیدعەچی ناوی دەبەن"[2]، هەرچەندە هەندێك لەئەهلی عیلم زۆر بەتوندی ئەدوێنو دەڵێن هەرکەس فەزڵی عەلی بدات بەسەر عوسمانداو عەلی پێش بخات ئەوە گومانی هەیە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە لەم ئاییننە خیانەتیان کردووەو عوسمانیان هەڵبژاردووە بەسەر عەلیدا - ڕەزای خودا لە هەردووکیان -[3].

ئیبن تەیمییە دەڵێت بۆچوونی ئەهلی سوننەو جەماعەت دامەزراوە لەسەر فەزڵو پێشخستنی ئیمامی عوسمان بەسەر عەلیدا، هەرچەندە لای جمهوری ئەهلی سوننەو جەماعەت مەسەلەی عوسمانو عەلی بنەمایەك نییە لە بنەماکانی دین، تا هەرکەس پێچەوانەی بێت بە گومڕاو بیدعەچی بزانرێت. بەڵام ئەو بابەتەی کە خەڵکی پێ گومڕا دەبێت مەسەلەی خودی خەلافەتەکەیە، ئەهلی سوننە بیروبڕوایان وایە دوای پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکر خەلیفەیەو پاشان عومەر، پاشان عوسمانو پاشان عەلی، هەرکەس توانج بگرێتە خەلافەتی هەریەك لەم چوار خەلیفەیە لەگوێرێژەکەی دەرماڵی خۆیان سەر لێ شێواوترە[4]، پاشان باسی ڕای زانیان دەکات لە بارەی فەزڵی ئیمامی عوسمان بەسەر ئیمامی عەلیدا، لەم ڕووەشەوە دوو ڕیوایەت هەیە:

یەکەم: هەرکەس فەزڵی عەلی بدات بەسەر عوسماندا ئەوە لە سوننەت دەرچووە بەرەو بیدعە، چونکە پێچەوانەی ئیجماعی هاوەڵانە لەبەر ئەوە دەڵێن هەرکەس عەلی بخاتە پێش عوسمان ئەو سوکایەتی بە کوچەریانو ئەنسار کردووە. ئەم ڕیوایەتە لەزیاتر

---

[1] عقيدة أهل النة والجماعة في الصحابة الكرام، د. ناصر بن علي عايض (٢/٦٧١).

[2] مجموعة الفتاوى (٣/١٠١، ١٠٢).

[3] حقبة من التأريخ، عثمان الخميس (ص٦٥).

[4] مجموعة الفتاوى (٣/١٠١، ١٠٢).

لەکەسێکەوە باس کراوە، وەك ئەبو ئەیوبی سەختیانیو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو دارە قوتنی.

دووەم: هەرکەس عەلی بخاتە پێش عوسمان، واتە فەزڵی عەلی بدات بەسەر عوسماندا بیدعە چییە[1]، چونکە عەلیو عوسمان هاوشانی یەکنو چون یەکن.

[1] المصدر نفسه (٤/٢٦٧).

## باسی دووەم: دەستووری عوسمانی کوڕی عەففان لە حوکمڕانیدا

کاتێك بەیعەتی خەلافەت درا بە عوسمان، ڕاستەوخۆ هەستا لەناو خەڵکدا وتارێکی خوێندەوەو تێیدا سیاسەتی خۆی ڕاگەیاندو ئەوەی روونکردەوە کە پابەندی قورئانو سوننەتو ڕەفتاری هەردوو شێخەکە دەبێت، (ئەبوبەکرو عومەر). هەروەها لەوتارەکەیدا ئاماژەی کردووە بەوەی بەدانایی‌و هێمنی سەرۆکاری خەڵك دەکات، بەمەرجێك سنووری شەرعی تێدا پارێزراوبێت. پاشان وریای کردنەوە لەپشت بەستن بە دنیاو تێشکێنەرەکانی، نەوەك بکەونە پێشبڕکێ‌و ڕقەبەرایەتی‌و ئیرەیی بردن لەناوخۆیانداو سەرەنجام ئومەت بەرەو ناکۆکی‌و دووبەرەکی بچێت. ئەمەش ئاماژەمای ئەوەی تێدایە کە ئیمامی عوسمان بۆ ئەو دیوی پەردە دەڕوانێت بە بەرچاوڕوونی باسی ئەو شتانەی دەکرد کە لەم ئومەتەدا بە هۆی ئارەزووبازی‌و نەهامەتی خەڵکەوە دائەکەوێت. پاش ئەوەی بەیعەتیشی پێدرا[1]، فەرمووی "پاش سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە، من راسپێردرام‌و قبوڵم کرد، باش بزانن من شوێنکەوتەم نەك داهێنەر، باش بزانن لەدوای قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ شتی سێیەم شوێن ئەو کردارانە دەکەوم کە پێش خەلافەتی من کۆك‌و تەبابوون لەسەری‌و دەقیان پێوە گرتووە، چونکە لە زاناگەورەکان وەریان گرتووە. دەست هەڵدەگرم لەو شتانەی کە تاوانبار نابم لەسەری. چاك بزانن دونیا شینابییەکی ئاڵو جوانەو خەملیوەو زۆر کەسێکیش ئەڵهای دەکات، بەڵام ئێوە ئامێزی بۆ مەکەنەوەو متمانەی پێ مەکەن، چونکە سیقەی لەسەر نییەو هەتا وازی لێ نەهێنن وازتان لێ ناهێنێت"[2]. ئەو قسەیەی کە دەڵێت ئیمامی عوسمان لە وتاری یەکەمدا لەرزیوەو شڵەژاوەو نەیزانی چی بڵێت‌و وتویەتی "خەڵکینە یەکەم سەرکەوتن‌و سواربوون گرانە، ئەگەر مام وتارێکی چاکتان بۆ دەدەم" - ئەم قسەیە خاوەنی کتێبی (العقد)[3] باسی کردووە جگە لەمیش کتێبی (گرافه الفوائد) باسی دەکات بەڵام سەنەدەکانی ڕاست‌و دروست نییەو ناتەواوە[4].

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٩٢).

[2] تاريخ الطبري (٥/٤٤٣).

[3] المراد ابن عبد ربه الأندليس صاحب كتاب العقد الفريد وهو كتاب في طرق الأخبار والحكايات والنوادر ولا يهم بسند الخبر أو صحته.

[4] خلافة عثمان بن عفان د. السلمي، ص (٣٤ - ٣٥)، والخبر من طريق الوافدي وهو متروك.

یەکەم: ئیمامی عوسمان نامەی نووسی بۆ کرێکارو سەرۆکارو ئەمیری سەربازەکانو خەڵکی بەگشتی، ئیمامی عوسمان دانی نا بە کارمەندەکانی ئیمامی عومەرداو تا ماوەی یەکساڵ کەسیانی لانەبردو ئاڵوگۆڕی پێ نەکردن ئەمەشی لەسەر وەسێتی ئیمامی عومەر کرد. ئەگەر تەماشای ئەو نامانەش بکەیت کە دەینارد بۆ والیو کرێکارەکانی بەیتول مالو ئەمیری سەربازەکان هەمووی لەسەر پێرەوی ئەور ژێمە دەچوو کە گەرەکی بوو ژیانی ئوممەتی لەسەر ڕێکبخات[1].

١ـ یەکەمین نامەی نووسی بۆ گشت والییەکان (ئەمیرەکان) دوای سوپاس: خودای گەورە فەرمانی کردووە بە پێشەواکان وەکو شوانو سەپان بن ڕێگەی نەداوە ملهوڕبن، بناغەی ئەم ئوممەتە والییە ڕاساڵەکان دروستیان کرد ملهوڕەکان دروستیان نەکرد. هیوای ئەوە هەیە والییەکان شوان ئاسا بن ملهوڕ ئاسا نەبن، خۆ ئەگەر سنورتان بەزاندوو واتان کرد ئەو کاتە شەرمو ئەمەك هەڵدەگیرێت باش بزانن دادپەروەرترین ژیان ئەوەیە کە ئاوڕبدەینەوە لە کاروباری موسڵمانانو بزانین کێشەیان چییە هەرچییان دەکەوێ پێیان ببەخشینو شتێکیش کەوتە سەریان بە چاکی لێیان وەرگرنەوە، پاشان چاوداشتی ئەهلی زیمە بکەن، ئەوەی کە هی ئەوانە بیاندەنێ، ئەوەش دەکەوێتە سەریان لێیان بسێنن لەگەڵ ئەو دوژمنانەی پەشیمان دەبنەوە بە ئارام بن[2].

تێبینی دەکرێت ئیمامی عوسمان، لەنامە ئاراستەکراوەکاندا جەختی کردۆتەوە لە والی شارەکان کە ئەرکیان چییە بەرامبەر جەماوەرەکەیانو ئاشنای کردون کە کاری فرە گرنگی ئەوان سامان کۆکردنەوە نییە، بەڵکو خەمخۆریو چاودێری کردنو نوێنەرایەتی کردنی بەرژەوەندیی خەڵکە. لەم پێناوەشدا ئەو سیاسەتەی ڕۆشن کردەوە، کە سەرپەرشتی ئوممەتی پێ دەکرێت ئەویش پیادەکردنی ئەرکەکانی سەرشانیانەو مافدانە بە ژێردەستەکانیان ئەوسا ئوممەت ڕێکو ڕاست دەبێت، خۆ ئەگەر والییەکان هەڵشاخانو بوونە ملهوڕو هەموو خەمو پەژارەییەکیان بووە ماڵو دارایی کۆکردنەوە ئەوکاتە شەرمو سپاردەو وەفا باوی نامێنێتو ون دەبێت. نامەکانی ئیمامی عوسمان جەختکردن بوو

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة ـ د. محمد أمحزون (١/٣٩٣).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٤٤).

لەسەر جێبەجێکردنی دادپەروەری لەسیاسەت‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی لەمیانەی حەقدان بەخاوەن حەقەکان‌و سەندنەوەی حەق لە حەقخۆران. هەروەها بەرز ڕاگرتنی پەیامی سیاسەتی شوان ئاسا، نەك فرە سامانی‌و چەوسانەوەی خەڵك[1]، هەروەها ئاگاداری کردوون کە والییەکان لەخۆیان نەگۆڕێن‌و نەبنە گوندەو ستەمکار، چونکە ڕەوشتە بەرزەکانی وەکو ئەمەك‌و متمانەو شەرم لەناودەچێت. ئەم ڕەوشتانەش گوریسێکی قایمە لەنێوان والی‌و گەلدا هەتا چەسپاوو دامەزراو بێت، سەرۆك‌و جەماوەر نێوانیان باشەو بە پێچەوانەوە بێگومان بە دەستهێنانی ئەم ئامانجەش بە هەوڵدانی گشت لایەك بەدی دێت کە مەبەستیان بێت ڕەزامەندی خودای گەورەو دادپەروەری پیادە بکرێت.

ئەگەر والییەکان بۆ ڕەزامەندی خودای گەورەو بەرپاکردنی عەدالەت تێکۆشان، ئەوە گوێڕایەڵی‌و دۆستایەتی‌و شەرم‌و وەفاو ئەمانەتپارێزی پێشکەشی والی دەکرێت‌و هەموان دەچنە سێبەری ئەم ئاکارە بە پێزانەو دوردەکەونەوە لەو ڕەفتارە نابوت‌و خراپانەی کە هەست‌و عەقڵ بریندار دەکات‌و دەمی جەماوەر پڕ دەکات لە گلەیی، پاشان ئیمامی عوسمان وەسێت دەکات کە دادوەربن بەسەر گەلەکەیانەوە بەتۆڵە سەندن لەخراپەکارانیان‌و خەڵات کردنیان لە سەرچاکەکردنیان. ئیمامی عوسمان، ئاماژە دەکات بۆ خاڵێکی گرنگ ئەویش ئەوەیە بەرانبەر ئەو پەیمان‌و بەڵێنانەی پێیان دراوە وەفاداربن ئەوە گرنگترین هۆکاری سەرکەوتنە بەسەر دوژمندا، هەروەك مێژوونووسان شوێنەواری ئەم ڕەوشتە بەرزەی موسڵمانانیان ڕۆشن کردەوە لە بەڕێوەبردن‌و جەنگ‌و غەزاکاندا[2].

٢ـ نامەکان بۆ سەرلەشکری جەنگاوەران

یەکەمین نامەیەك کە عوسمان، نووسی بۆ سەرلەشکرەکان لەهەرێمەکانی وڵات ئەمەبوو[3] "پاش سوپاسی خودای گەورە ئەی سەرلەشکرو فەرماندەکان، ئێوە قەڵغان‌و پەرژینی موسڵمانان‌و ئەو کۆڵ‌و بارەی ئیمامی عومەر پێیداون لە ئێمە شاراوە نییە،

---

[1] الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء ـ حمدي شاهين (ص٢٤٦).

[2] التأريخ الاسلامي مواقف وعبر ـ د. عبدالعزيز الحميدي (٣٦٩/١٢).

[3] هەرێمە دوورە دەستەکان.

بەڵکو بە ڕای کۆمەڵێك لەئێمە پێی داون، با لەخۆدەرچوونو سەرتان لێ شێوانی هیچ کامێکتانم پێ نەگات، چونکە خودای گەورە سەری لێ دەشێوێنێتو ئێوە لادەباتو کەسی تر دەهێنێتە جێگەتان، دیقەت بدەن پێشتر چۆن بوون هەروا بمێننەوە، منیش هەڵدەستم بەو کارانەی کە خودای گەوورە پێی سپاردوومو بەجێی دێنمو لەبەرچاوی دەگرم"[1].

لەم نامەدا ئاوڕ دەداتەوە لەو کارو فەرمانانەی کە بە گۆڕانی خەلیفە گۆڕانی بەسەردا نایەت، چونکە خەلیفەو والییەکانی تر لەسەر یەك هێڵ دەچن ئەویش هەستانە بەجێبەجێکردنی پەیامی ئیسلام لە واقیعی ژیاندا، ئەو قسەیەی کە دەڵێت: "ئەو کۆڵو بارەی ئیمامی عومەر پێی داون لە ئێمە شاراوە نییە، بەڵکو بە ئاگاداریی پیاوە سالارەکانی ئێمە پێی داون". ئاماژەیە بۆ پەنابردنی خەلیفەکان بۆ ڕاویژکردنو هەڵسوکەوتی خۆنەویستانەیان، ئەو ڕاستییەشیان لا دەردەخات کە کێشەو گیروگرفتەکان بە دووردودرێژی لای ئەهلی (حەلو عەقد) ئاشکرا بووە، هەرکات خەلیفەیەك لا چوبێتو یەکێکی تر هاتبێتە شوێنی، لەسەر هەمان پەیام چووە. لەبەر ئەوە لای هەموان ئامانجەکە ڕوون بووە. ئەو قسەیەشی کە دەڵێت "لەخۆتان مەگۆڕێن خودا لێتان دەگۆڕێ"، تێگەیشتنە لە سوننەتی خودای گەورە لە بوونەوەردا، خودای گەورە یارمەتیو هاوکاری دۆستەکانی دەکاتو دەیانپارێزێتو سەریان دەخات بە مەرجێك پەیوەست بن بە شەریعەتەوە، بە سۆزبن بۆ مرۆڤەکانو ملکەچی فەرمانەکانی خودای گەورەبن. خۆ ئەگەر لەم حاڵە دەرچوونو لەخۆیان گۆڕان ئەوا خودای گەورە لێیان دەگۆڕێتو ئەمانە لادەباتو خەڵکی سامدارو پێگەدارتر لەجێگایان دەهێنێت[2]. هەروەك دەفەرموێ (..إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ وَإِذَا أَرَادَ اللّهُ بِقَوْمٍ سُوءاً فَلاَ مَرَدَّ لَهُ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَالٍ) (الرعد: ١١).

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٤٤).

[2] تاريخ الطبري (١٢/٣٧٠).

ئیمامی عوسمان، ئەوە دەخاتەوە بیریان کە باش بزانن ئەرکەکانیان چییەو دەبێت لەسەر چی بڕۆن بۆ ئەوەی دڵسۆز بن‌و کاری شوانی بە باشی بگرنە ئەستۆ، وەکو چۆن ئیش دەکەن بۆ نەفسی خۆیان[1].

٣ـ نووسینی نامە بۆ باجگرەکان

عوسمان، یەکەم نامەیەك کە نووسی بۆ باجگرەکان دوای سوپاسی خودای گەورە تێیدا هاتووە "خودا خەڵکی بە ڕاستی‌و دروستی بە دیهێناوەو هەرچییەکیش حەق نەبێت قبوڵی ناکات. ئەوەی حەق‌و ڕاستە وەری گرن، هەرچییەکیش مافەو شیاوە بیدەنەوە بەخاوەنەکەی. ئەمانەت بە ئەمانەت بزانن‌و بیپارێزن، ئەو دەستمایەیەی لەمنەوە پێتان دەگات، تایبەت نییە بەئێوە، بەڵکە هاوبەشی ئەوانەی دەوروبەرتانن. وەفاداربن‌و ستەم لەهەتیوو پەیمان پێدراوەکان مەکەن، چونکە خودای گەورە دەچێت بەگژ ئەو کەسەی زوڵمیان لێدەکات[2]. لەم نامەیەدا ئەو کەسانەی کرابوونە سەرپەرشتیاری دارایی لەناو تاکەکانی ئومەتداو بوبونە گیرفانی دەوڵەت ئامۆژگاری کرابوون کە لەبەرژەوەندی گشتیدا خەرجی بکەن، ئەوەشی بۆ ڕۆشنکردبوونەوە کە خودای گەورە هەرچی ڕاست‌و ڕەوا نەبێت وەری ناگرێت‌و حەقیش لەسەر وەفاو ئەمانەتپارێزی وەستاوە. پاشان دوو تاقم لە ناو گەلدا جیادەکاتەوە هەر دوکیان چەوساوەن، ئەوانیش هەتیوو پەیمان لێ وەرگیراو، وریایان دەکاتەوە دوورەپەرێز بن لە زوڵم لێکردنیان، چونکە خودای گەورە پاراستنی ئەوانەی گرتووەتە ئەستۆ[3]، هەروەها دەیخاتە بیریان ئەگەر زوڵم بکەن، خودای گەورە دەبێتە دژیان‌و ئاوڕی داوەتەوە لە گۆشەیەك لەگۆشە مەزنەکانی ئیسلام‌و بانگیان دەکات بۆ سەرخستنی چەوساوەکان گەرچی لە کافرو پەیمان لێوەرگیراوەکانیش بێت[4].

---

[1] عثمان بن عفان ـ صادق عرجون (ص١٩٩).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٤٤).

[3] عثمان بن عفان ـ صادق مرجون (ص١٩٨).

[4] التاريخ الاسلام (٢٠/٣٧١).

٤ـ نامەیەك بۆ هەمووان (بۆ گشت لایەك)

پاش سوپاسی خودای گەورە لەڕاستیدا ئێوە پێتان ڕاگەیەنراوە وابەستەو شوێنکەوتەی قورئانو سوننەت بنو دنیا لە خشتەتان نەبات. چونکە پەیامی ئەم ئوممەتە زیادەی دەخرێتە سەرو شتی تری پێوە دەلکێت، بە تایبەتی کاتێك سێ شت هاتە ئاراوە[1]:

١ـ نازو نیعمەتی زۆرو زەبەن.

٢ـ بالغ بوونو پێگەشتنی مندالی کەنیزەکەکان.

٣ـ خوێندنەوەی قورئان لە لایەن عەرەبی لاوەکیو عەجەمەوە.

هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی "بێ باوەڕی لەحالی نەبوونەوە (لە تێنەگەشتنەوە) سەر هەلدەدات، ئەگەر لە بەندو ئایەتەکانی دین شتێکیان لێ ئالۆز بوو زۆر لە خۆیان دەکەنو بیدعە دروست دەکەن".

لەم لێدوانەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە ئیمامی عوسمان ئوممەتی بە گشتی هانداوە شوێنکەوتەی قورئانو فەرمودە بنو زۆر لەخۆیان نەکەنو شتی تازە نەخەنە ناو دینەوە، ئاگاداریان دەکات ئەگەر سێ نەهامەتی ڕووی تێکردن ئەوە حالیان خراپ دەبێتو لە چاکەوە دەگۆڕێت (نازونیعمەتی زۆر کە نەفسی ئینسان بایەلان دەکاتو بەرەو کەشخەبازی پالی پێوە دەنێو دەبێتە کۆسپی سەر ڕێگەی تێکۆشانو جیهادو دەیچەرخێنی بەرەو بەتالیو تەمەلی، تەنانەت وای لێدەکات چالاکیی هەلدەوەشێنێتو هەلمەتی دەپوکێنێتەوە، هەروەها پێگەشتنی مندالی کەنیزەکەکان بە درێژایی مێژوو ئەم ئوممەتەیان گەستووە. برینی ئەمانە لە ناو کۆمەلگای ئیسلامدا لەرووی سیاسیو ئایینیو کۆمەلایەتییەوە دیارە، هەروەها قورئان خوێندن لەلایەن عەرەبی دەشتەکیو عەجەمەوە، لەم وتەیەدا ئیمامی عوسمان مەبەستی سروشتی دەرونی عەرەبی دەشتەکییەکانە کە دەرون وشکنو دل ڕەقنو ڕێنمایی قورئان ناگاتە شوێنێکی باش لە دلیاندا، مەبەستی لەعەجەمەکانیش ئەوەیە ئەمانە دابو نەریتیان بە میرات بۆ جێماوەو ڕەوشتی کۆنیان پێوە نووساوە، ئەمانە دوری دەخاتە نێوان ئەوانو قورئانو

---

[1] تاريخ الطبري (١٢/٢٤٥).

سوننەت. لەڕاستیدا هەرواش بوو شوێنەواری خراپی عەرەبە دەشتەکییەکانو خەواریجەکان دەرکەوتن کە زۆر دەرون وشكو دڵڕەق بوونو لە هەمان کاتدا خوێنەوارترین کەسیشبوون بۆ قورئان بەڵام دووربوون لە تێگەیشتنی، پاشان شوێنەواری خراپی عەجەمەکانیش دەرکەوت کە چەند دژایەتی ئیسلامیان کرد بەوەی مەزهەبگەرییان هێنایە ناوەو ڕاوبۆچوونی زۆریان هەڵبەستو بوو بە موسیبەتی موسڵمانان، زۆربەی سەرلێشێواوەکان لەمانە بوونو لەمێژووی ئیسلامدا ترسناکترین ڕۆڵیان هەبوو[1].

**دووەم: سەرچاوەی باڵای وڵات**

ئیمامی عوسمان، ڕایگەیاند کە سەرچاوەی هەرە باڵای وڵات پەرتوکی خوداو سوننەتی پێغەمبەر ﷺو شوێن پێ هەڵگرتنی هەردوو شێخەکەیە (ئیمامی ئەبوبەکرو عومەر) پاشان فەرمووی "من شوێنکەوتەم نەك بیدعەچی، چاك بزانن بۆتان هەیە سێ شت لەسەر من حسێب بکەن، قورئانو سوننەتو شوێنکەوتنی پێشینانی خۆم، بەتایبەت لەو کاروبارانەی کەئێوە ڕێکوپێك بوون لەسەریو کردەوەتان پێ کردووە[2].

١ـ سەرچاوەی یەکەمم پەرتوکەکەی خودای گەورەیە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيماً) (النساء: ١٠٥).

پەرتوکەکەی خوادی گەورە داباریوە بەسەر ئەو ئەحکامە شەرعییانەی کە پەیوەستن بە کاروباری ژیانەوەو بنەماو حوکمە بڕاوەکانی لەخۆگرتووە، بۆ بەڕێوەبردنی گشت شێوازەکانی ژیانو هەموو ئەو شتانەشی بۆ موسڵمانان ڕوون کردۆتەوە کە پێی ئاتاجن لە بنچینەکانی حوکمڕانی بۆ ئەوەی بە پاکی لەسەری بڕۆنو بژین.

٢ـ سوننەتی ڕاستەقینەی پێغەمبەر ﷺ، ئەو سوننەتە خاوێنانەی کە بنەماکانی ئیسلام لە ئەستۆ دەگرێتو هەر لەڕوانگەی فەرموودەوە دەکرێت شێوەی جێبەجێکردنو پیادەکردنی ئەحکامەکانی قورئان دەربێنین[3].

---

[1] عثمان بن عفان ـ صادق عرجون (ص١٩٩).

[2] تاريخ الطبري (٥/٤٤٣).

[3] فقه التمكين في القران الكريم ـ الصلابي (ص٤٣٢).

٣ـ شوێنكەوتنی هەردوو شەیخەكە (ئیمامی ئەبوبەكرو عومەر)[١]، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت "وابەستەبن بەو دوانەی كە لەدوای منەوە دێن: ئەبوبەكرو عومەر"، دەوڵەتی عوسمان، ملكەچو پابەندی شەریعەتی شكۆداری ئیسلام بووەو لەسەروی هەموو بۆچوونو ڕایەكەوە دایناوە، دەوڵەتی ئیسلامی بە دەوڵەتی شەریعەت ناسراوەو وێنەیەكی پرشنگداری دروست كردووەو نموونەیەكی زیندووی بەرچاوی هەبووەو هەموو دەزگاكانی وڵات ملكەچی ئەحكامەكانی شەریعەتی ئیسلام بووە، بە تایبەتی عەدالەت ڕێكی شەریعەت بووە نە پێشكەوت، وە نە لێی دواكەوتووە، چونكە كۆمەڵگە كۆمەڵگای هاوەڵان بووە، حاكمو مەحكوم وەك یەك گوێڕایەڵیان كردووە یەكەمجار بۆ خودای گەورەو پێغەمبەر ﷺ پاشان بۆ خەلیفە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون "هەمیشە گوێڕایەڵ بن بۆ چاكەو یاخی بن لەخراپە"[٢] باڵی شەریعەت بەسەر دەوڵەتی خەلیفەكاندا سەنگین بووەو تایبەتمەندیی حوكمەتەكانیان بووە.

حوكمڕانی خەلیفە ڕاشیدەكان بە چەند تایبەتییەك جیا دەكرێتەوە لە حكومەكانی تر وەك:

١ـ تایبەتمەندیی دیاری وڵاتی خەلیفەكان، تێهەڵكێشكردنی نێوان كاروباری دینو دنیابووە، واتە دینو دونیایان بە شێوەیەكی حەكیمانە ئاوێتە كردبوو.

٢ـ وڵاتی خەلیفەكان خۆی خستووەتە ژێر ڕكێفی ئەحكامەكانی شەرع.

٣ـ خەلافەتیان بەرەو یەكێتییو یەكگرتنی جیهانی ئیسلامیی بەڕێوەدەبرد[٣].

**سێیەم: مافی گەل لەدادگایی كردنی خەلیفەدا**

گەل بۆی هەبووە لێ پرسینەوە بكات لە كاروبارەكانی خەلیفەدا، چونكە دەسەڵاتی خەلیفە دەسەڵاتێكی ڕەها نییە، بەڵكو بەستراوە بە دوو بەندەوە.

١ـ خەلیفە نابێت سەرپێچی دەقێكی ڕاشكاو بكات، (دەقی قورئانو سوننەت)، ئەوكارەی خەلیفە دەیكات، بە ڕێككەوتن بێتو لەگەڵ ناوەڕۆكو چەمكی ئیسلامدا بگونجێت.

---

[١] صحيح سنمن الترمزي (٣/٢٠٠).

[٢] بخاري رقم (٧١٤٥).

[٣] فقه الخلافة ـ للسنهوري.

٢ـ نابێت پێچەوانەی ئەو شتانەبێت، کە ئوممەتی ئیسلام لەسەری ڕێککەوتوونو نابێت بە مەیلی خۆی زیادەڕەوی بکات. بە پێی ئەم دوو بەندە خەلیفەی ولاّتی ئیسلام بریکارو جێگری ئومەتە، لەبڕیاری گەلەوە دەسەلاّتی بەرقەرار دەبێتو ماوەی حوکمڕانی دیاری دەکرێتو ئوممەت دەتوانێت ئەم دەسەلاّتە پەرە پێبداتو فراوانی بکات، بە هەمان شێوە دەتوانێت بەرتەسکیشی بکات یان مەرجو بەندی بۆ دابنێت هەرکات بەرژەوەندییەکانی تێدا بەدیکرد یان پەنایەکی چاکتری دۆزییەوە بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانەکانی خودای گەورەو سودی ئومەت[1]، بێگومان ئەم کارانەش بەدەستەی ڕاوێژو کەسی لێزان دەکرێت. ئیمامی عوسمان جەختی لەوە دەکردەوە کە ئومەت مافی لێپرسنەوەو لێپێچینەوەی خەلیفەیان هەیە، هەروەك خۆی دەفەرموێت "ئەگەر لەپەرتوکەکەی خودای گەورەدا دۆزیتانەوە کە هەردوپێم بخەمە ناو کۆتو زنجیرەوە، ئێوە هەردو پێم بخەنە کۆتو زنجیرەوە"، کۆمەڵێك خۆپیشاندانیان کرد بۆ لێپێچینەوە لەسەر هەندێك کردار کە ڕەخنەیان هەبوو لێی، ئیمامی عوسمان ملکەچی کردو خواستەکانی قبوڵ کردنو نکولی نەکرد لەم حەقەداو زۆر بەڕێزەوە ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ چاککردنی ئەو شتەی کە پێ دەچێ هەڵەی تێدا کردبێتو تێیدا لەسەر هیدایەت نەڕۆشتبێت[2].

**چوارەم: ڕاوێژکردن**

یەکێکی تر لەبنچینە مسۆگەرەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ڕاوێژکردنی والیو سەرلەشکرو کاربەدەستانی ولاّتە لەگەل گەلو موسڵمانانادا هیچ دەستورێك نەدەن بەبێ ڕاوێژکردن، خودای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت **"فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ)** (آل عمران: ١٥٩)، هەروەها دەفەرموێت **"وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ"** (الشورى: ٣٨).

---

[1] الدولة السيادة ـ فتحي عبدالكريم (ص٢٦٨).

[2] الدولة السيادة (ص٣٧٩).

ئیمامی عوسمان، له دەوڵەتەکەیدا لیژنەیەکی بۆ ڕاوێژکردن دروست کردبوو له هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەم لیژنەیەش لەکۆچەریانو ئەنسار[1] پێکهاتبوو بە ڕاشکاوی داوای دەکرد لەسەر لەشکرو پۆلیسەکانو دەیوت: "لەسەر کارەکانتان بەردەوام بنو بە کۆچکردنی ئیمامی عومەر واز مەهێننو مەیگۆڕن. لەهەرشتێکدا تەڵخیو ئالۆزی هاتە ڕێتان ڕەوانەی لای ئێمەی بکەن هەتا کۆبوونەوەو ڕاوێژی لەسەر بکەینو وەڵامتان بدەینەوە"[2]. سەرلەشکرەکان دەستیان گرتبوو بەم یاداشتەوەو هەرکات بیان ویستایە هەنگاو بنێن بۆ ڕزگارکردنی شوێنێك ئیزنیان وەردەگرتو ڕاوێژیان دەکرد، ئەویش هەڵدەستا بە ڕۆڵی خۆیو هاوەڵانی کۆدەکردەوە پرسی پێدەکرنو دەنگی ئەژمار دەکردن دەنگی لێ وەردەگرتنو نەخشەیەکی گونجاوی لێوەردەگرتن، پاشان مۆڵەتی هەستانی دەدان جارێك لەجاران (عەبدوڵڵای ئەبی سەرح) نووسراوێکی نووسی بۆ ئیمامی عوسمانو داوای لێ کردبوو مۆڵی بدات دەورەبەری ئەفریقا ڕزگار بکات[3]، لەبەر ئەوەی نزیکی دوورگەی ڕۆمەکانە. ئیمامی عوسمان دوای راوێژکردن، وەڵامی دایەوەو خەڵکێکی زۆری بۆ ناردن[4]، هەروەها موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان کاتێك ویستی دورگەی قوبروس رزگار بکات، نوسراوێکی نووسی بۆ ڕابەری باڵای گشت ئوممەت، واتە خەلیفە، داوای ڕێگەپێدانی کرد و وەڵامی بۆ نەهاتەوە تا دوای دانیشتنو ڕاوێژکردنو باسی بابەتەکە، پاشان ڕێگەی بۆ کردەوە[5]، هەروەك ئیمامی عوسمان لەگەڵ هاوەڵە مەزنەکاندا دەیکرد، بۆ نموونە بۆ کۆکردنەوەی قورئان ڕاوێژی پێکردن، بۆ کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر لە حەقی هورمزاندا، بەمشێوەیە هەوڵی داوە بۆ بنەبڕکردنی ئاژاوەو کێشە قەزاییەکان. جگە لەمانەش لە کۆمەڵێك هەڵوێستو ڕووداودا کە بەڕۆشنی باسی دەکەین.

---

[1] الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (ص٣٧٩).

[2] المصدر نفسه (ص٢٧٧).

[3] فتوح مصر (ص٨٣).

[4] المصدر نفسه (ص١٨٣).

[5] المصدر نفسه.

**پێنجەم: دادپەروەری و یەکسانی**

یەکێك لەئامانجەکانی حکومەتی ئیسلام بە تەنگەوەبوونی دامەزراندنی بنەماکانی ڕژێمی ئیسلامە کە ڕێگە خۆشدەکات بۆ پێکەوەنانی کۆمەڵگای موسڵمانانو گرنگترین بنەماش دادپەوەری و یەکسانییە. عوسمان نامەی نووسی بۆ خەڵکی شارەکانو فەرمووی "فەرمان بە چاکە بکەنو ڕێگری لە خراپە بکەن، با هیچ موسڵمانێك خۆی زەبوون نەکات من لەگەڵ لاوازو چەوساوەدام گەر زوڵمی لیّ کرابێت دژی هەموو بەهێزێکم"[1].

بەڕاستی سیاسەتی ئیمامی عوسمان لەسەر دادپەروەری دەڕۆشت، بۆ نمونە داری حەدی دا لە (وەلیدی کوڕی عەقەبەی والی کوفە)، کە برای دایکی خۆی بوو لەسەر شایەتی ئەو شایەتانەی وتیان مەی خواردۆتەوە، پاشان لەوالییەتی لایبرد، ئەم چیرۆکە بە درێژی دەبینین لەمەولاو ئەبی موسای ئەشعەری خستە جێگەکەی. دەگێڕنەوە جارێکیان ئیمامی عوسمان توڕەبووە لەخزمەتکارەکەیو گوێی باداوەو ئازاری پێگەیاندووە، ئەو شەوە ئیمامی عوسمان نەیتوانیوە بخەوێ بەوحاڵەوە هەتا بانگی خزمەتکارەکەی دەکات بۆ ژوورەکەی خۆیو فەرمانی پێدەکات تۆڵەی خۆی بکاتەوەو گوێی با بدات، لە سەرەتادا خزمەتکارەکە قەبوڵی نەکردووەو حاشای کردووە، ئیمامی عوسمان پێداگری دەکات، خزمەتکارەکەش بە قسەی دەکاتو گوێی خەلیفە با دەدات[2].

**شەشەم: ئازادییەکان**

پەیامی ئازادی یەکێکە لە دەستپێکە بایەخدارەکانی حوکمڕانی لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکاندا.ئاینی ئیسلام دەستەبەری ئازادییەکانی خەڵکی بە گشتیی کردووە لە چوارچێوەی سنووری شەرعی ئیسلامدا. خۆی ڕاستت دەویّ بانگەوازی ئیسلام بۆ ئازادکردنی خەڵکەو بەگشتیی ئایینێکی ئازادیخوزای وەکو ئیسلام دەگمەنە نموونەی هەبێت لە مێژوودا.

---

[1] تاريخ الطبري (٤/٤١٤).

[2] نظام الحكم في عهد خلفاء الراشدين ـ حمد محمد الصمد (١٤٩).

لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکاندا ئازادییەکان گشتی بووە، وەکو ئازادیی بیروڕای ئایینی (عەقیدە)و ئازادی گوێزانەوەو مافی ئارامیو ئاسایشکردنو پاراستنی خانووبەرەو ئازادی سامان[1]، دارایی تاکەکەسو ئازادیی ڕاوبۆچوون.

**حەوتەم: ڕێگریو قەدەغەکردن**

ئەمیری ئیمانداران ئیمامی عوسمان گرنگیدا بە قەدەغەکردنو ڕێگریکردن لەهەندێك هەڵسوکەوتو کردەوەی خراپ، ئەو کارانەش، کە قەدەغەی کردبوو وەك:

١ـ لاری هەبووە لە پۆشینی جلوبەرگی زەرد کراو یەکێك لە ڕێگرییەکانی ئەوەبوو نکولی کرد لە (موحەممەدی کوڕی جەعفەری ئەبی تالیب) کە جلوبەرگی زەرد کراو بکاتە بەری. لەئەبوهورەیرەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێت "ئیمامی عوسمان چوو بۆ حەج کردن بۆ مەککە، خێزانەکەی (موحەممەدی کوڕی جەعفەر) چوو لەگەڵ مێردەکەیدا تابەیانی مایەوە، بەیانی کە موحەممەد دەرچوو بۆنی عەتری لێدەهاتو، خاولییەکی (زەردکراو)و سوری تۆخی پێچابوو بە خۆیەوە، خەڵکی گەشتنە (مەلەل) شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینە ـ پێش ئەوەی ئێوارە بڕۆن ئیمامی عوسمان موحەممەدی بینی قەڵس بوو، داخێکی هەڵکێشاو فەرمویی ئایا (جلی زەرد کراو) دەکەیتە بەر لەکاتێکدا پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردووە؟[2]

٢ـ نکولی لەو ئافرەتانە کردووە کە لە سوڕی مانگانەدا بوونو ویستویانە بچن بۆ حەج یان عەمرە، تەنانەت ئەو ژنانەی کە بەو حاڵەبوونو دەچوون بۆ حەج یان عەمرە، دەیگەڕاندنەوە، عەبدولڕەزاق لەموجاهیدەوە ریوایەتی کردووە دەڵێت: "ئیمامی عومەرو عوسمان ئەو جۆرە ئافرەتانەیان لەناوچەی جوحفەو زیلحولەیفە دەگەڕاندەوە.

٣ـ فەرمانی دەکرد هەرچی کۆترە سەر ببڕێت. خەڵکی مەنع کرد لە خەریکبوون بە کۆتربازیو کایەی کۆترانەوە بە تایبەتی کاتێك بوو بە دیاردەیەکی بەرچاوو گوزەرانی خەڵك خۆش بوو، فەرمانی دەکرد کە سەریان ببڕن. ئیمامی بوخاری لەحەسەنەوە

---

[1] المصدر نفسه (١٥٧ ـ ١٥٨).

[2] المسند رقم (٥١٧).

ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: "بیستم لە ئیمامی عوسمان لە وتارەکەیدا ئەمری دەکرد سەگەکان بکوژنو کۆترەکان سەربڕن"[1].

٤ـ یاری تاوڵەی قەدەغە کردووە. ئیمامی عوسمان یاری تاوڵەی قەدەغە کردو فەرمانی کرد لە ماڵی هەرکەسێکدا هەبوو بیسوتێنن. ئیمامی بەیهەقی لە زوبەید حەلتەوە ڕیوایەتی کردووە، ئیمامی عوسمان لەسەر مینبەر وتویەتی "ئەی خەڵکینە دەخیلتان بم قومار مەکەن، (مەبەستی تاوڵە بوو) پێم گەیشتووە کۆمەڵێك خەڵك قوماری هەیە، هەرکەس لەماڵیایەتی با بیشکێنێ یان بیسوتێنێ". جارێکی تر ئیمامی عوسمان فەرمووی خەڵکینە من لە بارەی تاوڵە قسەم بۆ کردن بەڵام وابزانم فرێتان نەداوە وابڕیارمدەکەمەوە فەرمان بکەم باوەشێك پوشم بۆ بێنن ماڵی ئەو کەسانە بسوتێنم کە تاوڵەی تێدایە[2].

٥ـ شاربەدەرکردنی ئەوانەی گرفتیان لێ داکەوتووە یان چەکیان ڕاساندووەتەوەو خۆیان نواندووە لە شاری مەدینەدا. ڕێگرییەکی تری ئەوەبوو دژایەتی ئەو کەسانەی دەکردو شاربەدەری دەکردن، کە ئاژاوەو موشکیلەیان دروست کردووە یان تفەنگیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتووە لە ناو شاردا. لە سالمی کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەت کراوە دەڵێت "ئیمامی عوسمان هیچ کەسێکی لەوانە قبوڵ نەدەکرد کە سەر بە گۆبەندو موشکیلاوینو ئەوانەش کە چەکیان دەکردە شانو خۆیان دەردەخست. عوسمان، جگە لە گۆچان هیچی تری قبوڵ نەدەکرد"[3].

٦ـ لێدانی ئەوانەی کە مامی پێغەمبەر ﷺ بەکەم دەزانن و سوکی دەکەنو لێی دەخوێنن. لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا لێدانی کابرایەکی کرد کە لە دەمەقاڵەیەکدا سوکایەتی بە عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ کردبوو، پێیان وت "بۆ ئەم لێدانە بیانوت هەیە؟ فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ مامی بە گەورەو بەڕێز بزانێت، ئێمەش مۆڵەت بدەین

[1] باب ذبح الحمام (الادب المفرد) رقم (١٣٠٧).

[2] السنن الكبرى ـ كتاب الشهادات (٢١٥/١٠).

[3] تاريخ الطبري (٤١٤/٦).

خەڵکی سوکایەتی پێ بکاتو لێی بخوێنێ، هەرکەسێ وابکاتو پێی ڕازیبێت ئەوە پێچەوانەی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ"[1].

٧ـ ئارەقی یاساغ کردووە، چونکە باوکی پیسەکانە. ئیمامی نەسائیو بەیهەقی لەسوننەتەکانیاندا ڕیواتیانکردووە، ئیمامی عوسمانی کوڕی عەفان فەرمویەتی "دوورکەونەوە لەمەی، چونکە باوکی پیسییەکانە. پیاوێك لەسەردەمی پێش ئێوە خواپەرستی کردووە، ئافرەتێك لێی ئالاوەو ڕەوتی لێ شێواندووە، ڕۆژی کەنیزەکەکەی خۆی دەنێرێ بە شوێن پیاوەکەدا پێی دەڵێت خانمەکەم بانگت دەکات، بۆ شایەتیدان، پیاوەکەش لەگەڵ کەنیزەکەکە چووە هەتا ڕۆشتە ژووری ئافرەتەکە. لەدەرگای یەکەم چۆتە ژوورەوە، دووەم هاتە ڕێگەی، هەروەها ڕۆیشت هەتا گەشتە ئافرەتێکی جوانو جەوەنەیەك ئارەقی لەلابو، خانمەکە وتی: وەڵلاهی بۆشایەتیدان بانگم نەکردویت بۆ ئەوە بانگم کردویت کە کاری سێکسیم لەگەڵدا بکەیت، یان پێکێك ئارەق بخۆیت، یان ئەم منداڵە بکوژیت، پیاوەکە وتی: باشە جامێك لەئارەقەکە دەخۆم، جامێکی خوارد، وتی: زیاترم بۆ تێکە وازی نەهێنا هەتا مەستبوو، لەگەڵ ژنەکە زینای کردو منداڵەکەشی کوشت، دوور کەونەوە لە ئارەق وەڵلاهی مەی خواردنەوەو ئیمانداری هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوەو هەمیشە یەکێکیان ئەوی تریان تاردەنێت"[2].

٨ـ وتارەکانی ئیمامی عوسمانو هەندێك لەحیکمەتەکانی لەناو خەڵکدا

أ ـ وتارێك دەربارەی ڕۆژی دواییو خۆسازدان بۆی.

حەسەنی بەسری دەڵێت: "ئیمامی عوسمان وتارێکی دا پاش سوپاسو ستایشی خودای گەورە فەرمووی: ئەی خەڵکینە لە خودا بترسن، چونکە لەخودا ترسان سەرمایەیە، ئاقڵترین کەس ئەوەیە سەرزەنشتی دەرونی خۆی بکاتو بۆ دوای مەرگ کار بکاتو لە نوری خودای گەورە بەدەست بێنێت بۆ ڕۆشنایی ناو گۆڕەکەی، با هەموومان بترسین لەوەی خودای گەورە بە کوێری حەشرمان بکاتو لە دونیاشدا چاوساغ بووبین، فەرمودە تێرو تەسەلەکانی پێغەمبەر ﷺ بەسە بۆ کەسی ئاقڵ ئەو کەسانەی

---

[1] المصدر نفسه (٥/٤١٧).

[2] سنن النسائي ـ كتاب الأشربة (ص٥٣).

لەدونیادا یاخی بوون لەقیامەتدا لەشوێنێکی دوورەوە بانگ دەکرێن". هەورەها فەرموویەتی "چاك بزانن هەرکەسێك خودای لەگەڵدا بێت لە هیچ شتێك باکی نییەو هەرکەسێکیش خوای گەورە شکستی بکات ئیتر هانا بۆ کوێ دەبات؟ چ پەنایەکی دەست دەکەوێ؟"[1]. لەئیمامی عوسمانەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی "لە ڕۆژی پەسڵاندا تۆڵەی ئاژەڵی کۆڵ دەسەنرێت لەئاژەڵی شاخدار"[2].

ب ـ وەبیرهێنانەوەی ڕەوشتە بەنرخەکان

ئیمامی عوسمان دەفەرموێت: "وەڵاهی ئێمە هاوڕێیەتی پێغەمبەرمان کردووە ﷺ لە ماڵو لەدەرەوە. ئەو، لەگەڵمان سەردانی نەخۆشانی کردووەو مردووی ناشتووە، لەگەڵمان غەزای کردووەو بۆ نارەحەتی زۆرو کەم، سەرخۆشی لێکردووینو دڵی داوینەتەوە، کەچی خەڵکانێك هەن من فێری ڕەوشتەکانی ئەو دەکەن بەڵام پێدەچێت هەرگیز پێغەمبەریان ﷺ نەدی بێت"[3].

ج ـ ئەو حیکمەتانەی کە لەناو خەڵکدا باوە.

ئیمامی عوسمان دەڵێت: "ئەگەر دڵمان پاكو خاوێن بێت هەرگیز لە فەرمایشتەکانی خودای گەورە تێر نابینو تاسقیمان ناشکێ"[4]، هەروەها دەڵێت: "هیچ گوناهێکی پەنهانی ناشاردرێتەوە ئیللا خودای گەورە لەسەر شاشەی دەموچاو یان بەهەڵەو سوتانەوەی زمانی خاوەنەکەی، ئاشکرای دەکات"[5].

هەروەها دەڵێت: "هەڵپو ماش بۆ دونیا تاریکی دڵە بەڵام غەمو پەژارە بۆ قیامەت ڕۆشنایی دڵە"[6]. هەروەها دەڵێت: "لەڕۆژانی ئاژاوەو ئاشوبدا لە خودای گەورە

---

[1] صحيح التوثيق في سيرة وحياة ذي النورين (ص١٠٧).

[2] المووعة الحديثيو رقم (٥٢٠).

[3] صحيح التوثيق في سيرة وحياة ذي النورين (ص١٠٧).

[4] جامع العلوم والحكم (ص٣٦٢).

[5] فوائد الكلام للخلفاء الكرام (ص٢٨٩).

[6] الأستعداد ليوم المعاد (ص٩).

دەپارێمەوە ئەگەر زوڵمم کردبێت لێم خۆش بێت، خۆ ئەگەر زوڵمیشم لێکرابێت لەهەموو کەس دەبوورمو دەیبەخشم"[1].

هەروەها دەڵێت: "هەمووشت بەڵایەکی هەیەو هەموو بەهرەیەك دوژمنێکی هەیە، بەڵای ئەم دینەو دوژمنی ئەم بەهرەی ئیسلامە (توانجگرو داخ لەدڵەکانیەتی)، چونکە کاتێك دەتان بینن خۆشییان لێتان نایەتو هەرگرفتێك بێتە ڕێتان پێیان خۆشە. ناحەزەکان وەکو نەعامەکان وان".

کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر لە ڕزگارکردنی ئەفریقا گەڕایەوە ئیمامی عوسمان فەرمانی پێکرد وتارێك بدات، پاشان کە عەبدوڵڵا لە وتارەکەی بویەوە ئیمامی عوسمان فەرمووی "بە گۆرەی کەسایەتی باوكو براکان، ژن بخوازن"، لە نەوەکانی ئەبوبەکردا هیچ کوڕێکم نەدیوە ئەوەندەی عەبدوڵڵا لێی بچێت، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر کوری ئەسمای کچی ئیمامی ئەبوبەکرە، مەبەستی ئەوەبوو، کە عەبدوڵڵا لە باپیرەی چووە لە زیرەکیو بوێریو لەزمان پاراویدا[2].

هەروەها دەڵێت: "هیچ کەسێك نییە کارێك بکاتە پیشەی خۆی ئیللا خودای گەورە بەرگی ئەو ئیشو هەرمانە دەکاتە بەری"[3]. هەروەها دەڵێت: "ئیماندار لەتوێی پێنج ترسدایە، یەکەمیان ترسی خودای گەورە کە ئیمانەکەی لێ نەسێنێتەوە، دووەم ترسان لە فریشتە پاکەکان، کە گوناهەکانی لەسەر دەنووسنو ڕۆژی قیامەت پێی ڕسوا دەبێت، سێهەم ترسان لە شەیتان کە کردەوەکانی لێ هەڵنەوەشێنێـەوە. چوارەم ترسان لە فریشتەی گیان کێشان کە لەناکاو گیانی نەکێشێتو ئەم لەبێ ئاگاییدا بێت، پێنجەم ترسان لە دونیا کە فریوی نەداتو مەشغوڵی نەکات"[4].

هەروەها دەڵێت "تامو چێژی عیبادەتم لە چوارشتدا بەدی کردووە، یەکەم لەجێبەجێکردنی فەرزەکانی خودای گەوەردا، دووەم دوورکەوتنەوە لەحەرامەکان،

---

[1] مجمع الأمثال (٢٠/٤٥٣).

[2] فوائد الكلام (ص٢٧١).

[3] الراهد للأمام الأحمد (١٥٨).

[4] فوائد الكلام الخلفاء الكرام (ص٢٧٨).

سێیەم فەرمانکردن بە چاکەو چاوەڕوانی پاداشتەکەی، چوارەم نەهی کردن لە خراپەو خۆپاراستن لە خەشمی خودای گەورە"، هەروەها دەڵێت: "ئەوەندە بەسە بۆ تۆ حەسودەکانت پیشدەخۆنو تۆش دڵشادی"[1].

٦ـ ئیمامی عوسمان لەگەڵ شیعرو شاعیراندا

هەرچەندە تەمەنی خەلافەتی عوسمان، ماوەیەکی دوورودرێژی خایاندووە، کەچی هیچ سەرچاوەو کتێبێك نییە باسی پەیوەندی نێوان ئیمامی عوسمانو شیعرو شاعیری کردبێت، جگە لە کتێبی (النزار القليل). لەم کتێبەدا هاتووە کە ئیمامی عوسمان هۆگری ڕێگەو شوێنی ئەو پەیامە بووە، کە پێغەمبەر ﷺ چەمکەکانی ڕۆشن کردۆتەوەو پێشینانی وەکو ئیمامی ئەبوبەکرو عومەر لەسەری ڕۆشتوون. بێگومان هەریەك لەمانە توانایەکی زۆریان هەبووە، بۆ نموونە ئیمامی ئەبوبەکر ناسراوە بە شارەزای ڕەچەڵەكو شارەزاییەکی باشیشی هەبووە دەربارەی شیعرو خۆی شیعر دارشتووە، ئیمامی عومەریش ناسراوە بەهاندەری شیعرو شاعیرانو هەرکات ڕووبەڕووی هەر کێشەو گرفتێك بووبێتەوە بەدووددێڕە شیعر وەڵامی داوەتەوەو حەلی کردووە، گەر لەمە زیاتر لەسەری بڕۆین دەر ئەکەوێت کە شاعیربووە. ئەگەر خەلیفەی سێیەم ئیمامی عوسمان بایەخی بە شیعر نەدابێتو شاعیرانی لەخۆی نزیك نەکردبێتەوە، ئەوا شەهیدکردنەکەی لە لایەن ناحەزە بێ ئاستەکانییەوە دەرگای شیعری کردەوە لەشاعیرانو لەوکاتەدا شیعری سیاسیی هاتە ئاراوە. بە تایبەت بۆ شەهادەتی عوسمان گریانێکی زۆری شاعیران بە شیعر قەتارەی بەستووە.

بەڵام ئیمامی عوسمان پەیوەندیی لەگەل شاعیراندا نەبووە، کاریگەر نەبوو پێیان لەسەردەمی ئەمدا شاعیرەکان وازیان هێناو لەشارو کۆشکی خەلافەتی دەرچوون بەرەو دەشت، هەرچەند هەندێ بەیتی لێوە ڕیوایەت کراوە وەك

چاك بزانە هیچ سیفەتێ وەك سیفەتی خودا نییە

سیفەتی خودای گەورە ئاشکرایە بابێ باوەڕیش مل نەدا.

ئەوەی گشت حەرامەکانی چەشت تامەکەیی ڕۆیی

---

[1] المصدر نفسه.

گوناهو سەرشۆری ماوەتەوە لەگەڵ ڕەنجەڕۆیی

سەرەنجامی خراپەکاری هاویشتنە بەربارە

بێ خێرە ئەو لەزەتەی کۆتاییەکەی ئارە[1]

ئەو ڕۆژەی کە هەرچی‌و پەرچییەکان هەڵیان کوتایە سەری کە بیکوژن فەرمووی:

مەرگ دەبینم پیاوە بەڕێزەکان هەڵدەگرێ

بەڵام سەرکەشەکانیش پەنایەکیان دەست ناکەوێ لە شارو لەدێ[2].

کاتی ئابڵوقەیاندا لە خانووەکەی خۆیدا فەرمووی:

خاوەن ماڵ لەماڵەو دەرگاشی لێ داخراوە

کێوێك هاتووە مەرگ لەسەر لوتکەکەی دانراوە[3].

دڵی گوشاد دەرون والا دەکات تا تێر ئەبێ

ئەوەندە هۆگری دەبێ هەژاری هەبێ

هیچ تەنگوچەڵەمەیەك نییە کە تووشت بێ

ئیللا شادومانی بەدوادا دێ گەر سەبرت هەبێ

ئیمامی عوسمان سزای خستووە سەر شیعری جنێودان‌و داشۆڕین. هەروەها ئەو شیعرانەشی کەپێچەوانەی ئەحکامی شەریعەت بووە، وە پێخۆشحاڵبوو گوێبیستی شیعری چاك‌و مرۆڤ دۆستانەو ئاین پەروەرانە بێت[4].

---

[1] شعراء الخلفاء ـ نیال تیسیر الحماش (ص٢٧).

[2] البدایة والنهایة (١٠٢/٧).

[3] المصدر نفسه.

[4] ادب صدر لأسلام ـ واضح الصمد (ص١٠٢).

## باسی سێیەم: گرنگترین ئاکارەکانی (سیفاتی)

عوسمان، بە کەسایەتییەکی ڕابەرو پێشەوا لەقەڵەم دەدرێتو بە سیفەتی ڕابەرێکی خوداناسیش ستایش دەکرێت، ئێمە کەسایەتی ئەم پێشەوایە بەچەند ڕەوشتێك کورت دەکەینەوەو هەندێکیشی بەدووروو درێژی باس دەکەین.

گرنگترین سیفەتی ئیمامی عوسمان باوەڕبوون بە خودای گەورەبووەو بڕوایەکی قایمی بە ڕۆژی دوایی هەبووە. هەروەها شارەزاییەکی باشیشی لەشەریعەتدا هەبووەو متمانەیەکی سەنگینی بە خودای گەورە هەبووە. عوسمان، لەکارکردووەیدا ڕاستگۆ بووەو لیاقەتی هەموو کارێکی هەبوو لەهەڵوێست دەبڕینیشدا بوێرو مەرد بووە، لەژیانی دونیادا کەم ویست بووەو لە تێکۆشاندا عەودالّی قوربانیدان بووە، لە بەرامبەر خەڵکدا خاکەساربووەو ئامۆژگاریی خەڵکی وەرگرتووە، خۆگرو هیمەتی بەرز بووەو ئیرادەی بەهێز بووەو توانای بڕیاردانی هەبووە. لەکێشەو گرفتەکاندا دادپەروەر بووەو توانای فێرکردنو سازدانی کادیری هەبووە جگە لەمانەش سیفەتی جوامێری هەبووە هەر بە هۆی ئەم سیفەتە قیادییانەشەوە توانیویەتی پارێزگاری لەوڵات بکاتو خروقاتەکان قەلاچۆ بکات. عوسمان، بەفەزڵو کۆمەکی خودای گەورە ئوممەتی سەرخست بەرەو ئامانجە نەخشە بۆکێشراوەکان بە چەند قۆناغێکی پتەو گرنگترین ئەو سیفەتانەی کە هەوڵماندا تیشك بخەینە سەری ئەمانەن:

### یەکەم: لێزانیو لێهاتوویی لە ڕێنمایی کردنو ڕاهێناندا

ئیمامی عوسمان بەیەك لەزانا گەورەکان دەناسرێت لەزانینی قورئانو سوننەتدا، لەمەولا باسی چالاکییە فیقهییەکانی دەکەین لە بواری دادگاو داراییو جیهاددا، ئیمامی عوسمان زۆر پەرۆش بووە بۆ شوێنکەوتنی ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکرو عومەر.

عەبدوڵڵای کوڕی عەدی ڕیوایەتی کردووە بۆ عروەی کوڕی زوبێر کە میسوەری کوڕی مەخزەمەو عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەسوەد پێیان وتووەوە ئەوە ناتوانێت بە خاڵت بڵێ قسە لەگەڵ ئیمامی عوسماندا بکات لە بارەی وەلیدی کوڕی عەقەبەوە کە زۆربەی خەڵکی گلەیی لە کردەوەکانی دەکەن، عەبدوڵڵا دەڵێت: کاتێ ئیمامی عوسمان دەرچوو

بۆ نوێژ ڕێگەم پێگرت‌و پێم گوت ئیشێکم پێتە. فەرموی کابرا پەنادەگرم بە خودا لەتۆ دەڵێت: گەڕامەوە کاتێك نوێژ بەربوو لای میسوەرو ئیبن‌و عەبدی یەغوت دانیشتم‌و قسەکەم بۆ گێڕانەوەو وتیان چی وت؟ بە ڕاستی تۆ ڕاسپاردەی خۆتت گەیاندووە، من هەر دانیشتبووم پەیامنێری ئیمامی عوسمان هات بانگی کردم وتیان خۆتت گیرۆدە کرد، منیش ڕۆشتم گەشتمە خزمەتی فەرموی ئیشەکەت چییە؟ دەڵێت شایەتومانم هێناو پاشان وتم: خودای گەورە پێغەمبەری ﷺ بە ڕاستی ناردو کتێبی ڕۆشنیشی بۆ دابەزاند، من یەکێك بووم لەوانەی کە چووم بە دەمیەوەو وەڵامی خوداو پێغەمبەرم ﷺ دایەوەو ڕێنماییەکانم خستە سەر سەرم، ڕاستی زۆرینەی خەڵك زەمی وەلید دەکەن، هەقە تۆش داری حەدی بەسەردا بسەپێنی، دەڵێت عوسمان، پێی فەرمووم، خوشکەزاکەم تۆ پێغەمبەرت ﷺ دیوە، وتم: نەخێر، بەڵام پوختەی زانستەکەیم پێ گەشتووە، لەگەڵ بیروباوەڕەکەیدا. وەکو چۆن بە منداڵێکی تازەپێگەیشتوو گەشتبێت، دەڵێت ئیمامی عوسمان شایەتومانی هێناو پاشان فەرمووی: دوای سوپاسی خودای گەورە، کاتێك خودای گەورە پێغەمبەری ﷺ ناردبە ڕاست‌و دروستی من یەکێك بووم لەوانەی کە چووم بە پیری خوداو پێغەمبەرەوە ﷺ، بڕوام هێنا بەو پەیامەی کە بۆی دەهات، پاشان دوجار کۆچم کردو ئەو شەرەفەشم پێ بەخشرابوو بووم بە زاوای پێغەمبەر ﷺ، پەیمانیشم پێدا، وەڵڵاهی قەت سەرپێچیم نەکردووەو گزیم لێ نەکردووەو هەتا کۆچی کرد، پاشان ئەبوبەکر کرا بە جێنشین پەیمانم پێداوەو سەرپێچی ئەویشم نەکردووە، غەشم لێ نەکردووە. پاشان عومەر کرایە جێنشین، وەڵڵاهی سەرپێچی‌و گزیم لەویش نەکردووە، هەتا کۆچیان کرد. پاشان خودای گەورە خۆمی کردە جێنشین ئایا ئێوە ئەو هاوکاری‌و وەفاداریەم نادەنەوە کە من دەمدا بە ئەوان؟ واتە ئەو ڕۆڵەی من دەمگێڕا بۆ ئەوان دەبێت ئێوەش بیگێڕن بۆ من، دەڵێت: منیش وتم وایە ڕاستدەکەیت، فەرمووی ئەم قسانە چییە کە لە ئێوەوە پێم دەگات، ئەوەش کە باست کرد لە بارەی وەلیدەوە بە ئیزنی خودا سزای دەدەم بە هەقیانەت، دەڵێت چل قامچی دا لەوەلیدو ئەمری کرد بە عەلی جەڵدەکەی لێبدات ئەویش دارکاری کرد[1].

[1] فضائل الصحابة (١/٥٩٧).

عوسمان، هۆگری پێغەمبەر ﷺ بوو ڕێنمایی وزانستەکەی کردبووە زانایەکی گەورە بۆ قازانجی دینو دونیا، ئیمامی عوسمان لێزانو بەتوانابوو لە بەڕێوەبەردنی گەلەکەیدا بە شێوەیەکی بەرهەمدار ئاراستەی دەکردنو ئەرکەکانی پێ نیشان دەدانو بۆچوونە کاملّ بووەکانی لە زانستو ئەزموونو بەرخودانداا پێشکەش دەکردن هەتا لەبواری بانگخوازیو پەروەردەکردنو تێکۆشاندا سازی دەدان بۆ دیداری پەروەردگاریان.

یەکێکی تر لەتەوجیهاتی ئیمامی عوسمان، ئەو باسەیە کە لە وتاری بەخەلیفە بووندا فەرمووی "خەڵکینە ئێوە لە کۆشكو تەلاردانو هەوارگەتان ئاوەدانە بابە چاکیو پاکی بمرن هەروەك زانیتان لەبەری بەیاندا یان لەپڕی ئێوارەدا گیانکێش هاتە سەرتان، چاك بزانن دونیا تێهەڵکێش کراوە لەگەڵ فیزو لەخۆباییبوندا، ژیانی دونیا فریوتان نەداتو سەرسەرییەکان بەلێبوردەییو خودا فریوتان نەدەنو پەند وەرگرن لەو شتانەی بەسەرتانا تێپەڕیوەو قوڵ هەڵمانو لەمسو بێئاگا مەبن. کوا ڕۆڵەکانی دونیاو براکانی خۆهەر سەرقاڵی دونیا بوونو ئەمدیوو ئەودیوتان پێ دەکردو ئاوەدانیان دەکردەوەو ڕایان دەبوارد. ئایا دەتوانن بێنە فەرمان کەواتە دونیا بە شێوەیەکی چاك بەڕێ بکەن[1]، خودای گەورە دەفەرموێ "وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيماً تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِراً * الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَاباً وَخَيْرٌ أَمَلاً) (الكهف: ٤٥ ـ ٤٦).

لەم وتارەدا خەلیفەی سێهەم مەبەستی ئەوەبوو خەڵکی ئاراستە بکاتو هانی بدات بۆ هەنگاوهەڵگرتن بەرەو خودای گەورە بەشێوەیەك کە زۆر پاپای دونیا نەبن، هەر ئەمەش گونجاوبوو کە لەو وتارەدا بوترێ، چونکە لەو کاتەدا ئیسلام لە پشودانداا بووەو کەوتبووە ناو جەرگەی هەرێمە پڕ لە تەلارو کۆشکەکانو شارە گەورەکان ڕزگار کرابوو دونیا بە بەهرەو نیعمەتەکانییەوە ئامێزی کردبووەو خەڵکی کەوتبوونە کێبەرکێو کەرتی تایبەت هاتبووە ئاراوە، جگە لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتارەکە بۆ ئەوانی تر زۆر شیاوو گونجاوبوو. لەئیمامی عوسمانەوە چەندین فەرموودە ڕیوایەت کراوە کە ئوممەت

---

[1] البداية والنهاية (ص١٥٣/٧).

کەڵکی لیّ وەردەگریّت، وەکو ئەبو عەبدولڕەحمانی سەلەمی بۆمان باس دەکات، لەو فەرمودەیەش کە لە ئیمامی عوسمانی بیستووەو کاری پیّکردووە سەعدی عوبەیدیش لە عەبدولڕەحمانی وەگرتووە، کە پیّغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "باشترین کەستان ئەو کەسەیە قورئان زانبیّتو خەڵکی فیّر بکات"[1]، دەڵیّت: "ئەبوعەبدولڕەحمان لە حوجرەی ئیمامی عوسماندا فیّری قورئان بووە، هەتا حەجاج دەڵیّت: "ئیمامی عوسمان ئەو کەسەبوو منی گەیاندە ئەم پلەو پایەی ئیّستا"[2] لەڕیوایەتی شوعبەدا هاتووە ئەبوعەبدولڕەحمان دەڵیّت: "ئیمامی عوسمان منی گەیاندە ئەم پلەو پایە، چونکە بە چاکی فیّری قورئانی کردبوو، ئیمامی عوسمان گەلیّك فەرموودەی پیّغەمبەری ﷺ ڕیوایەت کردووە، فەرمودەکانیش ئەمانەن:

١ـ بایەخدان بە دەستنویّژ

ئیمامی عوسمان لەسەر سەکۆیەك دەستنیوژی شتو فەرموی فەرمودەیەکتان بۆ دەگیّڕمەوە کە لە پیّغەمبەرم ﷺ بیستووە، ئەگەر لە ترسی ئەو ئایەتەی قورئان نەبوایە بۆم باس نەدەکردن، بیستومە کە پیّغەمبەر ﷺ دەیفەرموو "هەرکەس دەستنویّژیّکی باش بگریّتو پاشان بچیّت بۆ مزگەوت نویّژ بکات بەجەماعەت لەم نویّژەوە تا نویّژیّکی تر کە دەیکات خودای گەورە لەگوناهەکانی نیّوانیان دەبوریّت"[3].

٢ـ لاسایی کردنەوەی پیّغەمبەر ﷺ لەدەستنویّژگرتندا

لە حیمرانی کوڕی ئەبانی عوسمانەوە دەڵیّت جاریّکیان ئیمامی عوسمان داوای ئاوی کردو دەستی کرد بە دەستنویّژگرتن، دەستی شۆردو ئاوی ڕادا لە دەمو لوتیو مشی کردو پاشان سیّ جار دەموچاوی شۆردو هەردوو باڵیشی سیّ جار شۆردو دەستی هیّنا بەسەریدا، پاشان پیّی شتو لەکۆتاییدا پیّکەنیو فەرموی پیّغەمبەرﷺم دیوە لەم پارچە زەمینەدا داوای ئاوی کردو وەکو چۆن من دەستنویّژم شت لەبەرچاوتان، ئاوەها ئەویش دەستنویّژی گرت، پاشان پیّکەنیو فەرموی ئەوە بۆچی ناپرسن چی منی

---

[1] بخاري رقم (٥٠٤٨).

[2] الكفاءة الادارية في السياسة الشرعية للقادري (ص٩٣).

[3] مسند أحمد رقم (٤٠٠).

خستۆتە پێکەنین؟ وتیان بەچی پێ ئەکەنی ئەی پێغەمبەر ﷺ؟ فەرمووی هەر بەندەیەك دەستنوێژی گرت، کە دەموچاوی شت هەرتاوانێکی بە ڕوخسار کردبێت دەسڕێتەوە، هەرکات باڵەکانی شت، گوناهی باڵەکانی دەسڕێتەوە، کاتێك مەسحی سەری کردو پێیەکانی شت بەهەمان شێوە[1].

### ٣ـ دەستنیوێژ یەکێکە لە تاوان شۆرەکان

لە ئیمامی عوسمانەوە دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: هەرکەس دەسنوێژێکی تێرو تەسەل بگرێت بەوشێوەیەی کە خودای گەورە فەرمانی کردووەو نوێژە فەرزەکانی بکات، دەبێتە هۆی هەڵوەرینی گوناهی ئەم نوێژ تا ئەونوێژەی تری"[2].

### ٤ـ دەستنوێژێك و دوو ڕکات نوێژ، تاوانەکان دەسڕێتەوە

ئیمامی عوسمان، لەسەر کورسییەك بوو، بانگی ئاوی کرد ، ئاوەکەی کرد بەسەر دەستی ڕاستیداو شۆردی، پاشان دەستی خستە ناو دەفرەکەو سێجار دەستی شت و سێ جاری تر ڕومەتی شت، دوای ئەوەی ئاوی ڕادا لە دەم و لوتی و پاشان باڵی هەتا ئەنیشکی سێجار شت و پاشان دەستی هێنا بەسەریداو هەتا قولەپێی، سێ جار پێکانی شت. پاشان فەرموی: "بیستومە لەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەرکەس دەستنیوێژێك وەکو ئەم دەستنوێژەی من بگرێت و پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات و دالغەو وردو کرد نەکات تێیدا، ئەوا خودای گەورە لە گوناهی ڕابردوو داهاتووی خۆش دەبێت"[3].

### ٥ـ وشەی نیەتپاکی و وشەی تەقوا (خوداپەرستی) (خۆپارێزی)

ئیمامی عوسمان دەڵێت بیستومە لەپێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی "من وشەیەك دەزانم، هەر بەندەیەك لەدڵەوە بە ڕاستی بیلێ خودای گەورە هەرگیز نایخاتە ناو ئاگرەوە، عومەری کوڕی خەتتاب وتی: من پێت بڵێم چییە؟، ئەو وشەیە نییەت پاکییە، کە

---

[1] مسند أحمد رقم (٤١٥).

[2] مسند أحمد رقم (٤٠٦).

[3] مسند أحمد رقم (٤١٨).

خودای گەورە، پێغەمبەرو هاوەڵانی پێوە پەیوەست کردووەو وشەکەش وشەی - تەقوا - یە کە پێغەمبەر ﷺ زۆر هەوڵیدا مامەکەی لەسەرەمەرگا بیڵێت"[1].

**٦- چاك ناسینی خودای گەورە مرۆڤ دەخاتە بەهەشتەوە**

لەئیمامی عوسمانەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی "هەرکەس بمرێتو بەچاکی زانیبێتی جگە لە خودا، خودایەکی تر نییە، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە"[2].

**٧- حەسەناتو باقیات**

لە حارسی خزمەتکاری ئیمامی عوسمانەوە هاتووە، دەڵێت ڕۆژێك ئیمامی عوسمان دانیشتو ئێمەش دانیشتین لە دەوریو بانگبێژەکە هات، ئیمام داوای ئاوی کرد لە قاپێکدا، کە یەك دو مشتی تێدابوو، دەستنوێژی گرت. پاشان فەرموی پێغەمبەر ﷺ دیوە دەستنوێژی گرتووە وەکو چۆن من گرتم لەبەرچاوتان، پاشان فەرمویەتی "هەرکەس دەستنوێژێکی وەکو ئەم دەستنوێژە بگرێتونوێژەکەی بکات، نوێژی نیوەڕۆ هەرچی تاوانی کردووە لەبەیانی تا نیوەڕۆ دەسڕێتەوە، کە نیوژی عەسری کرد تاوانی نیوەڕۆی تا عەسری دەسڕێتەوە کە مەغریبی کرد عەسر تا مەغریبی دەسڕێتەوە، کە نوێژی عیشای کرد مەغریب تا عیشای دەسڕێتەوە خۆ ئەگەر شەو مایەوە بۆ گاڵتەو گەپ، هەستا دەستنوێژی گرتو نوێژی بەیانی کرد گوناهی عیشا تا بەیانی دەسڕێتەوە، ئەمانە حەسەناتنو خراپەکانی مرۆڤ دەسڕنەوە". وتیان ئەمانە حەسەناتە ئەی باقیاتی چییە؟ فەرموی: باقیاتیشی ئەمانەیە **(لااله الا الله، الحمدلله، الله أكبر، لاحول ولا قوة الا بالله)**[3].

**٨- ترسناکی درۆکردن بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ**

لەئیمامی عوسمانەوە دەڵێت "پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:هەرکەس بە ئەنقەست درۆ بەدەم منەوە بکات، با ماڵێك لە ناو ئاگر بۆ خۆی دانێتو دیاری بکات"[4].

---

[1] مسند أحمد رقم (٤٤٧).

[2] مسند أحمد رقم (٤٦٤).

[3] مسند أحمد رقم (٥١٣).

[4] مسند أحمد رقم (٥٠٧).

ئەمانە هەندێ لەو فەرموودانەبوون کە ئیمامی عوسمان لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتووەو بەڵگەشە لەسەر زانایی‌و پەرۆشی ئیمامی عوسمان بۆ پەرەپێدانی ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ.

**دووەم: لەسەرخۆیی و هێمنی**

لەسەرخۆیی بنەمایەکە لە بنەماکانی حیکمەت‌و خودای گەورە لەچەندین شوێنی قورئانی پیرۆزدا زاتی پیرۆزی خۆی بە(حلیم) واتە لەسەرخۆیی تاریف دەکات، وەك دەفەرموێت (أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ)، هەروەها پێغەمبەریش ﷺ لەهێمنی‌و لەسەرخۆیدا گەشتبووە پایەکی نموونەیی‌و ئەندێشەیی بە هەمان شێوە جێنشینی پێشەنگیش عوسمانی کوڕی عەففان بە توندوتۆڵی چاوی لەپێغەمبەر ﷺ کردوبوو لەکردارو گوفتارو بارودۆخەکانداو هەڵوێستی زۆریشی هەیە لەسەر هێمنی‌و لەسەرخۆیی‌و دەروون پاکی، ڕۆشنترین هەڵوێست کە بەڵگەیە بۆ هێمنی‌و شێنەییەکەی چیرۆکی گەمارۆدانەکەیەتی لە لایەن ناحەزەکانییەوە، لەوکاتە ناسکەدا فەرمانیکرد بە کۆچەری‌و ئەنسارییەکانی چواردەوری بچنەوە بۆ ماڵی خۆیان‌و جێی بهێڵن بەمەرجێك دەیانتوانی بەئاسانی بەرگری لێ بکەن، بەڵام لەسەرخۆو هێمنییەکەی دەری خست کە موشتاقی دیداری پەروەردگاریەتی‌و نایەوێ خوێنی موسڵمان بڕژێت، تەنانەت با خوێنی خۆی بەناهەق بڕژێت[1].

**سێیەم: سنگفراوانی و دڵگوشادی**

لەعەتای کوڕی فروخی خزمەتکاری قورەیشییەکان هاتووەو دەڵێت "ئیمامی عوسمان پارچەیەك زەوی کڕی لە کابرایەك، کابرا ساردی‌و تەمەڵی کرد لە وەرگرتنی پارەکەی، ئیمامی عوسمان پێی گەشت‌و فەرموی بۆچی نەهاتی پارەکەت وەرگریت؟ وتی: تۆ من خەڵەتاندووە. بەهەرکەس دەگەم سەرزەنشتم دەکات، فەرمووی لەبەر ئەوە نایەیت؟ وتی: بەڵێ، فەرموی خۆت سەرپشك بە لەنێوان زەوی‌و پارەکەدا، پاشان فەرموی پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی "خودای گەورە ئەو پیاوانە دەخاتە بەهەشت کە ئاسان‌و ئاسایی بن لەکڕین‌و فرۆشتن‌و لە بڕیارداندا""[2]. ئەمە نموونەیەکی بەرزە

---

[1] الكفاءة الأدارية في السياسة الشرعية (ص٦٥).

[2] مسند أحمد رقم (٤١٠).

لەدلفراوانی ئیمامی عوسمان لەکڕین‌و فرۆشتنندا، ئەوەش دەگەیەنێت کە بەخشندەو لێبوردەبووەو دەستی لەدونیا شتووەو دونیا ڕێگرنەبووە لەپیادەکردنی ڕەوشتە بەرزەکانیدا، هەروەها عوسمان، هەرگیز خۆویستی نەکردوەو بەدوای بەرژەوەندییەکانیدا وێڵ نەبووە.

**چوارەم: نەرم‌و نیانی**

خودای گەورە منەت دەکات بەسەر پێغەمبەردا ﷺ کە ڕۆزی پێداوەو سیفەتی نەرمونیانیی پێ بەخشیوە، نەرم‌و نیانی بەزەیی خودایە بۆ پێغەمبەرو مرۆڤەکانی تریش‌و دەفەرموێت "فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ.."[1].

لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت سیفەتی نەرم‌و نیانی ڕەحمی خودای گەورەیەو دەیکاتە ڕزق‌و ڕۆزی بۆ ئەو بەندانەی کە خۆی ئارەزووی لێیان هەیە، پێغەمبەر ﷺ لە سیفەتدا بەشی زۆری هەبووە، ڕەحمەتێك بووە لەخودای گەورەوە بۆ ئەو بەندانەی کە پێغەمبەریان ﷺ بۆ ڕەوانە کراوە.

لە سۆنگەی ئەم ئایەتەوە ئەو چەمکە فام دەکرێت کە هەرکەس بەنەرم‌و نیان بناسرێت خەڵکی خۆشیان دەوێت‌و لە دەوری کۆ دەبنەوەو گوێی بۆ دەگرن‌و ئەمرو نەهییەکانی قبوڵ دەکەن، نەرمونیانی یەکێکە لەوئاکارە بەرزانەی کە ئیمامی عوسمان پێ پێناسە دەکرێت، کە بەرامبەر گەلەکەی نەرم‌و دڵهاوەر بووە لەوە ترساوە کەسێك نارەحەت‌و بێتاقەت بێت‌و ئەم پێی نەزانیبێت یان بە گوێرەی پێویست وەڵامی ئاتاجی خەڵکی نەدابێتەوە، بۆیە زوو زوو هەواڵی خەڵکی دەپرسی‌و چەوساوەکانی سەردەخست‌و حەق‌و تۆڵەی لە دەسەڵاتدارەکان دەسەندەوە.

**پێنجەم: لێبوردن‌و چاوپۆشی**

لەعیمرانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی تەلحەوە دەڵێت "ئیمامی عوسمان جارێك چوو بۆ نوێژی بەیانی لەو دەرگایەی کە گوزەری بوو چویە ژوورەوەو سەیر دەکات بەردەرگاکە قەرەباڵغەو فەرمووی: تەماشاکەن، هەموویان تەماشایان کرد پیاوێك بوخەنجەرێکی

---

[1] الكفاءة الادارية (ص٨٩).

هەڵگرتبوو، پێی فەرموو ئەوە چییە؟ کابرا وتی: دەمەوێت بتکوژم، فەرمووی: سوبحانەڵلا، قوڕ بەسەرت لەبەرچی دەمکوژیت؟ وتی: کرێکارەکانت (پۆلیس) زوڵمیان لێ کردووم لەیەمەن، فەرمووی: ئایا تۆ زوڵمەکەت گەیاندووەتە منو منیش بێویژدانیم کردبێت یان نادادیم کردبێت بەرامبەرتو پشتی ئەوم گرتتبێت تا تۆ هەقی ئەوم لێ بکەیتەوە؟ فەرمووی بە ئەوانەی چواردەوری ئێوە ئەڵێن چی؟ وتیان ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەمە دوژمنێکەو خودا تۆی پاراست لێی. فەرمووی ئەمە بەندەیەکەو ویستی گوناهێك بکات، خوای گەورە لایدا لێم، بڕۆ یەکێك بێنە کەفالەتت بکات جارێکی تر نەیەتەوە شاری مەدینە هەتا من خەلیفەی موسڵمانان بم، ئەویش پیاوێکی هۆزەکەی خۆی هێناو بوویەکەفیلیو ئیمامی عوسمانیش ڕێگەی بۆ چۆڵ کردو ئازادی کرد[1].

ئەم چاوپۆشییە مەزنە هەر لەئەمیری ئیمانداران، عوسمانی کوڕی عەفان، دەوەشێتەوە. ئەو کەسەی ویستی بیکوژێت ئەم عەفوی کرد وەك دەزانین لێبوردن لە دەسەلاتدا ڕەوشتێکی زۆر بەنرخە لەڕەوشتی مەردان. ئەم ئاکارە بەڵگەیە لەسەر خۆدارِنین لەخودویستیو سەرسام نەبوون بەخودی خۆیو گوێنەدانە بە دونیاو ئامێزکردنەوەیە بۆ قیامەت. ئەو ڕەوشتە یەکێکە لە کردارە هەرەچاکەکانو پلەو پایەی خاوەنەکەی لەئاخیرەتدا دەڕازێنێتەوەو سیاسەتێکی حەکیمانەشە لەدونیادا. وەختێك ئەو کابرایە ویستی دەستدرێژی بکات ئەگەر بکوژرایە یان سزایەکی سەختی بەسەردا بدرایە پێدەچێت ئاژاوەیەکی دژواری لێ بکەوتایەتەوەو هۆزەکەی بکەوتایەتە خۆو هەر کات بۆیان بڕەخسایە تۆڵەیان بکردایەتەوە. بەڵام لێبوردنەکە وای لەئەندامانی هۆزەکەیو خەڵکی بە گشتیی کرد، کە خراپچوون بە گژیداو ڕەزیلیان کرد. بەم شێوەیە ئاژاوە بەر لەهەڵگیرسانی دامرکایەوەو خاوەن عەفویش دڵی هەمووانی بۆ لای خۆی کەمەن کێش کردو بوو بە خاوەن ڕێزو خۆشەویستی[2].

---

[1] التأريخ الاسلام (١٧\١٨\٢٢).

[2] التأريخ الأسلام (١٧/١٨/٢٢).

**شەشەم: خاکەساری (تەوازوع)**

خودای گەورە دەفەرمویت "وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً"(الفرقان: ٦٣)، خودای گەورە سیفەتی خاکەساری کردووە بەدیارترین سیفەتی بەندە ئیماندارەکان، بە ڕاستی خەلیفەی پێشەنگ، ئیمامی عوسمان لەم مەیدانەدا ناسراوبووەو سەرچاوەی ئەم سیفەتە لە نیازپاکییەوە هەڵقولاوە، لەعەبدوڵلای ڕۆمییەوە هاتووە دەڵێت "ئیمامی عوسمان هەرکات شەو هەڵسایە بۆ شەونیوژ خۆی ئاوی دەستنوێژەکەی هەڵدەگرت پێیان دەوت بۆچی خزمەتکارەکانت هەڵناسێنی؟ فەرموی: "نەخێر شەو بۆ پشودانی ئەوانە"[1]، ئەمە نموونەیەکە، کە پر لەبەزەیی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنی گەورە بووەو پلەی کۆمەڵایەتیشی بەرز بووە، هەرچەندە خزمەتکار ڕامکراوی گەورەکەیەتی، لەشەودا خۆی خزمەتی خۆی کردووەو بەردەستەکانی خەبەر نەکردۆتەوە. لێرەدا پێویستە گشت لایەك ئەوە بزانن ئەو کەسەی کە خودای گەورە کەوی کردووە خزمەت بکات، با بزانین ئەویش مرۆڤەوو وزەیەکی دیاری کراوی هەیە بۆ ئیشکردنو وەکو ئێمە هەستو سۆزی هەیە دەبێ مشوری بخۆیتو ئاسانکاری بۆ بکەیت، پشووی تەواو وەرگرێت لە خەوتنو ئیشکردندا.

ئیمامی عوسمان ئەوەندەی بێ فیزو خاکەسار بووە بەرامبەر عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺدا هەرکات بەسواری بیدایە بەلایدا دادەبەزی، هەتا عەباس ون دەبوو لەچاو وەکو ڕێزو شکۆیەك بۆ ئەوەی کە مامی پێغەمبەرە ﷺ[2].

**حەوتەم: شەرمو داوێنپاکی**

شەرمکردن بەناوبانگترین ئاکاری ئیمامی عوسمانە، لە هەمووی نازارتریش ئەو سیفەتە قەشەنگە بوو، کە خودای گەورە پێی جوان کردبوو، ببووە سەرچاوەیەکی بەپیتو چاوگەیەکی پڕسۆزو بەزەیی. ئیمامی عوسمان لەهەموو کەس بەشەرم تربوو[3]، حەسەنی بەسری باسی سەردەمی ئیمامی عوسمان دەکات، کە چەند بە شەرم بووەو

---

[1] فضائل الصحابة رقم (٧٤٢).

[2] البنين في اناب القرشيش (١٥٣).

[3] عثمان بن عفان ـ صادق عرجون، (ص٤٨ ـ ٤٩).

دەڵێت "جاری وا هەبووە لەماڵی خۆیان بووە دەرگا داخرابوو جلەکانی دانەکەندووە تا بە تەواوەتی ئاو بکات بە خۆیدا، ئەو شەرمە وای لێکردبوو پشتی ڕاست نەکاتەوە قەد قنج نەڕوات بەڕێوە، یەکێك لەهەڵوێستە شەرمنەکانی کە (بونانە) ڕیوایەتی کردووە، کە خێزانی ئیمامی عوسمان کەنیزەی هەبووە دەڵێت: ئیمامی عوسمان کاتێك خۆی بشتایە جلەکانمان بۆ دەبردو پێی دەوتین تەماشام مەکەن، چونکە دروست نییە.

بە ڕاستی چەندین فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەت کراوە لەبارەی شەرمی ئیمامی عوسمانەوە، هەروەها لە بارەی داوێن پاکیشیەوە. عوسمان، زۆر دوور بووە لەڕەوشتە خراپەکان، لەم بوارەدا بە کەیفی خۆت ستایشی بکەو پەسەندی بدەرەوە مەترسە، چونکە هەرگیز ڕێگەی داوێن پیسی نەناسیوە نە لەسەردەمی نەفامیداو نەلە سەردەمی ئیسلامدا، خۆی دەفەرموێت "قەت گۆرانیم نەوتووەو درۆو دەلەسەم نەکردوو، لەوەتی پەیمانداوە بە پێغەمبەر ﷺ بە دەستی ڕاستم زەکەرم نەگرتووە، نە لەنەفامیو نە لەئیسلامدا ئارەقم نەخواردووە نە لە نەفامی نەلە ئیسلامدا زینام نەکردووە"[1].

## هەشتەم: سەخاوەتو دەستکراوەیی

ئیمامی عوسمان دەستکراوەترینو سەخاوەتمەندترین کەسی ئەم ئوممەتەیە، چەندین هەڵوێستو شوێنەواری لەمبارەیەوە هەیەو بەردەوام دەگەشێتەوە بەنێو چاوانی مێژووی ئیسلامەوە، باسمان کردوە عوسمان چی کرد لەجەنگی تەبوکدا، هەروەها چۆن بیری ڕۆمیەی سەندو مزگەوتی پێغەمبەری ﷺ فراوان کردو لە سەردەمی ئەبوبەکردا کاروانەکەی بەکۆڵو بارەکەی کردە خێرو هەموو هەینییەك کۆیلەیەکی ئازاد دەکرد لەبەر خاتری خودای گەورە. سەرجەم ئەو کۆیلانەی کە ئازادی کردبوون نزیکەی دوو هەزارو چوارسەد کۆیلە بوون[2]، ڕیوایەت کراوە کە پەنجا هەزاری بەلای تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵاوە بووە، تەلحە پێی وت: پارەکەم بۆ پەیدا کردویت، فەرمووو لێم بگرە، ئیمامی عوسمان پێی فەرموو بیبە بۆ خۆت با بێتە دیاریو خەڵاتت.

---

[1] صحيح التوثيق (ص٤٤).

[2] الصواعقد المحرقة ـ لابن حجر الهيثمي (١/٣٢٧).

سیفەتی سەخاوەتو ماڵداری نیشانەیەك بوو لەکەسایەتی کردەیی ئیمامی عوسمان، هەموو ماڵو سامانەکەی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی دینی خوداو هەرگیز چروکی نەکردووە لەڕێکخستنی وڵاتی ئیسلام، جیهادو خزمەتی کۆمەڵگا تاکە مەبەستی ئەوبووە.

**نۆیەم: دلێریو بوێری**

ئیمامی عوسمان بە دلێرو بوێر دەژمێردرێت بەڵگەش لەسەر ئەمە:

**١ـ دەرچوونەکانی بۆ جیهادە لە پێناوی خودای گەورە**

ئامادەی هەموو دیمەنەکانی جیهاد بووە، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر لەکەداری کەن بەدواکەوتنی لە شەڕی بەدر پێشتر ڕوونمان کردەوە کە بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دواکەوت، لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺیش بە یەکێك لە هاوەڵانی بەدر حسێبی بۆ کراو پشکی پێدراو لەپاداشتی غزاکەش بەشدار بوو، لەپاش قسەی پێغەمبەر ﷺ قسەی تر زیادەیەو ناخوات.

**٢ـ نوێنەری پێغەمبەر ﷺ بوو لە ئاشتەوایی حودەیبییەدا**

ئیمامی عوسمان نیوێنەری داخوازییەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، ڕۆشت بۆ ناو هۆزی قورەیش باش باش دەیزانی چی بەسەردێت، بەڵام قارەمانیو جوامێرییەکەی هەڵی پێچاو کردی بە گوێڕایەڵو نوێنەری پێغەمبەر ﷺ، هەرکەس لەوبارودۆخەدا نوێنەرایەتی قبوڵ بکات کەواتە دلێرییەکەو قارەمانییەکی دەگمەنە، ڕاستە فەرمانی لە پێغەمبەرەوەیە ﷺ بەڵام بوێرو جوامێریشی پێوە دیارە، چونکە پیاوی ترسنۆكو عادی پێی نەدەکرا[1].

**٣ـ خۆکردنە قوربانی (نەفسی خۆی کردە پەرژینی نەفسی خەڵکی)**

کاتێك ئیمامی عوسمان لەماڵەکەی خۆیدا گەمارۆ درا، لە دین دەرچووەکان داوایان لێکرد لەخەلافەت واز بێنێتو چارەیەکی تری نییە ئەگەرنا دەیکوژن، یان خۆی بداتە کەنارێكو فەرمان ڕەوایەکەی تەسلیمی ئەم دەستەیە بکات، ئیمامی عوسمانیش لەسەر هەڵوێستی خۆی بەردەوام بوو، خۆی کردە قوربانیو فیدا بە مەرجێك خەلافەتەکە

---

[1] الأمين ذوالنورين (ص١٩٤ ـ ١٩٦).

نەکەوێتە دەست ئەم جۆرە خەڵکانە کە بە ئارەزووی خۆیان خەڵکی هەڵبژێرنو کەسانی تر لاببەن یان خەلافەت لەبەری ئەو کەسەدا دابکەنن کە ئوممەت هەڵی بژاردووەو ئەم کردارە ببێتە دابو نەریتو رسوم[1]. بۆیە لەسەر هەڵوێستی خۆی بەردەوام بوو هەرچەند مەرگی خۆی لە شمشێری گەمارۆچییەکاندا دەبینی، ئەو کەسانەی ئەم هەڵوێستانە دەنوێنن لە ڕاستیدا ئازاو بوێرنو خاوەن حەقن، چونکە کەسی ترسنۆكو دونیاویست هەرگیز هەڵوێستی لەم شێوە نانوێنێت، چونکە ژیان لای خەڵکی ترسنۆك لەپلەوپایە بەرێزترە، بەڵکو لە هەموو دنیاش گەورەترە ئەم پێداگریيو جەسورییەی ئیمامی عوسمان نواندنی بەرهەمی ئیمانی بەهێزبوو، بەخودای گەورە ڕۆژی دوایی، هەر ئەمەش وای لێ کردبوو گاڵتەی بە هەموو شتەکانیان دەهاتو تەنانەت گاڵتەی بە خودی ژیان دەهات[2].

## ٤ـ تێکۆشان بەماڵو سامان

تێکۆشان بە گیان خراوەتە پاڵ تێکۆشانی ماڵو سامان لە هەندێ شوێنیشدا پێشخراوە، خودای گەورە دەفەرموێ: (لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُـلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْراً عَظِيماً) (النساء: ٩٥). چەندین ئایەتمان هەیە کە بەراوردی سامان دەکاتو نزیکی دەخاتەوە لەگیان بەخشین، ئەو کەسانەی ماڵو سامان دەبەخشن لەبەر خاتری خودای گەورەو سەخاوەت دەکەن ئەوانە موجاهیدن.

ئیمامی عوسمان ئەوەندە ماڵی بەخشیبوو هەتا پێغەمبەر ﷺ دوجار فەرمووی "ئیتر لەمڕۆ بەدواوە عوسمان هەرکارێك بکات زەرەر ناکات"[3]. لەگەڵ ئەم سەخاوەتەشدا دلێرو بوێر بووەو لەمردن نەترساوەو ڕووبەڕووی باتڵ بۆتەوەو لە ململانێیەکاندا بە جەنگو لەسەرخۆ بووە تەنانەت گەوجەکانیش بەمە دەزانن[4].

---

[1] الأمين ذي النورين (ص١٩٧).

[2] جولة تأريخية في عصر خلفاء الراشدين ـ محمد وكيل (ص٣٠٤).

[3] سنن الترمذي (٣٧٨٥).

[4] جولة تأريخية في عصر خلفاء الراشدين ـ محمد وكيل (ص٣٠٤).

**دەیەم: بڕیاردەرو یەکلاکەرەوە بووە**

سیفەتی بڕیاردانو تەساڵەدان لە کەسایەتی عوسماندا ڕەسەنو دیار بووە، بۆ نموونە کاتێك ئیمامی ئەبوبەکر ئیسلامی بۆ باس کرد، فەرمووی عوسمان قوربەسەرت تۆ پیاوێکی بڕیاردەریو پیاوێکی یەکگەریت، لەبەر خاتری پڕو پوچ حەق لە تۆ شاراوە نییە، ئەم بتانە چین هۆزەکەی منو تۆ دەیان پەرستن[1].

هەروەها لە ساڵی (٢٦)ی کۆچیدا ئیمامی عوسمان رووبەری مزگەوتی کەعبەی زیاد کردو فراوانی کردو زەوی هەندێك خەڵکی کڕی، بەڵام هەندێکی تر لاسارییان کرد، ئیمامی عوسمان خانووەکانی ڕووخاندنو نرخەکەی خستە بەیتولمال، ئەوانیش گازەرەیان لێ کێشا، ئیمامی عوسمان فەرمانی کرد زیندانیان بکەنو فەرمووی "ئەزانن بۆچی بەرانبەر من ئەوەندە ڕوودارنو قارەمانن، ئەوە لەسەر خۆییو هێمنی منە بۆیە بە من دەوێرن، خۆ ئیمامی عومەر پێشووتر ئەم کارەی کردووەو نەتان توانیوە فزە بکەن[2]، پاشان عەبدوڵلای کوڕی خالیدی ئەید، یەکێك بوو لەوانەی کە قسەی لەگەڵ کردو لەسەر قسەی ئەو، ئازادی کردن.

یەکێکی تر لەو هەڵوێستانەی کە بەڵگەیە لەسەر بڕیاردەری ئیمامی عوسمان، پاراستنی ڕێکخراوی خەلافەتی بوو کە نەیدەهێشت کەرت ببێتو وەڵامی یاخیبووەکانی نەدایەوەو بەرگی خەلافەتی دانەکەندو دەستی لەکار نەکێشایەوە. بەم کردارەش درێژەی بە ڕێکخستنی خەلافەتو پێگەی دەوڵەتی ئیسلامیی داوەو دامودەزگای وڵاتی نەشێواندووە، خۆ ئەگەر بە قسەی یاخی بووەکانی بکردایە خۆی بەرکەنار بکردایەو چارەنووسی موسڵمانانی بدایەتە دەستی ئەوانە ئەو کاتە پلەو پایەی خەلافەتو خەلیفە دەبووە گەمەی دەستی وێڵو گەوجەکانو گەندەڵیو پشێویی دەکەوتە نێو موسڵمانانو وڵات وێران دەبوو، دەسەڵاتی سەر سەرییەکان زاڵ دەبوو بەسەر دەسەڵاتی فەرمانڕەواو دادپەروەرەکاندا، بە ڕاستی ئیمامی عوسمان زۆر وردبوو ئەگەر بە قسەی ئەوانی بکردایەو داواکاریی ئەوانی جێبەجێ بکردایە ئەمە دەبووە

---

[1] عثمان بن عفان ـ صادق عرجون (ص٤٧).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٥٠).

سوننەت‌و ڕسووم‌و هەرکات گەلێك بیان ویستایە پێشەواکەی خۆیان لادەبرد. نەگبەتی دەکەوتە نێوان ئوممەت لە باتی خەریکبوون بە دوژمنەوە سەرقاڵ دەبوون بە خۆیانەوە، ئەمەش نزیکترین هۆکاری لاوازبوون‌و هەرەس هێنانە، لەبەر ئەوە ئیمامی عوسمان جگە لە گیانی خۆی هیچی تری دەست نەکەوت بیکاتە قوربانی ئوممەتەکەی‌و بە ڕۆحی خۆی نەبێت نەیزانی چۆن ئوممەت بپارێزێت، بۆیە گیانی خۆی خستە لاوەو خۆی فیداکردو دەستوری خەلافەتی هەڵنەوەشاندەوە، چونکە دەبوو خەلافەت دەستاودەست بڕوات‌و نەشێوێنرێ‌و نەبێتە گاڵتەجاڕی، بێگومان ئەم کردەوەیەی ئیمامی عوسمان زۆر گەورەو بەهێزەو هیچ پیاوێکی تر ناتوانێت کاری وا بکات بە مەرجێك هەموو گەل‌و جەماوەرەکەی ئیختیاریان دابووە دەستی خۆی‌و ئازادبوو چی بکات، ئیمامی عوسمان زیانی کەم‌و شەڕی ئەهوەنی هەڵبژارد، یەکەمین کەسە کە بە گیانی خۆی داکۆکی دەسەڵاتی خەلافەتی کردووە[1]، دواتر ڕونتر باسی دەکەین.

**یازدەیەم: ئارامگرتن‌و خۆگرییەکەی**

ئیمامی عوسمان، بە سیفەتی ئارامگرتن دەناسرێت‌و کەسێکی خۆگربووە بەڵگەشمان بۆ ئەم تاریفە ئەوەیە کاتێك ئاژاوەو گەڕەلاوژەکە هەڵوێستێکی دانسقەی نواند بۆ بنەبڕکردنی ئەو ڕووداوانەی کە خۆی‌و موسڵمانان گیرۆدەی بوون، هەستا نموونەیەکی هەمیشەزیندووی نواند خۆی کردە فیدای سەلامەتی‌و هێشتنەوەی قەوارەی کۆمەڵێك‌و حورمەتی ئومەتێکی پاراست لەشەڕی خۆکوژی‌و خوێن ڕشتنی موسڵمانان بە ناحەق، ئەگەر خۆویست بوایەو گوێی لە جەماوەر نەبوایە دەیتوانی خۆی دەرباز بکات‌و گەلەکەی خۆی بهێڵێتەوە، بێگومان مەسڵەحەتچی‌و خۆویست بوایە ئەوەندە لەخۆ بوردوو نەدەبوو، دەیتوانی خەلافەتیان بداتێ‌و دەست بنێت بە دەسەڵاتەکەیەوەو بیخاتە گەردنی یاخیبووەکان، بەڵام ویستی کاروباری ئوممەت‌و ژیانی گەل نەکەوێتە نەهامەتی‌و فەسادەوە، بۆیە خۆی کردە بەرخی قوربانی‌و جەماوەری نەشڵەقاند، ڕایگەیاند کە بەسەبرو ئارامی ڕووبەڕووی ئەم یاخییە سەرکەشانە دەبێتەوەو تەمیسلی ئەو ئایەتەی خوای گەورە دەکات[2]، "الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ

---

[1] تحقيق موافق الصحابة من الفتنة (١\٤٧٤).

[2] المصدر نفسه (١\٤٧٢).

إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ". (آل عمران: ١٧٣). ئیمامی عوسمان ئیمان پتەوو دەروون گەورەبوو بەرچاو ڕۆشنێکی کارامەبوو خۆگرییەکی هەڵکەوتەبوو بە شێوەیەك بوو دەستی لەگیانو نەفسی خۆی هەڵگرت بۆ سەلامەتی خوێنو ژیانی ئوممەتەکەی، پێویستە گەورەترین ڕێزو قەدری بۆ بنرخێنرێت لەلایەن موسڵمانانەوە.

ئیبن تەیمیە دەڵێت "ئاشکرایە بە چەندین ڕێگای ڕیوایەت هاتووە کە ئیمامی عوسمان سەلامەتترین کەس بووە دەربارەی خوێن ڕشتنو ئارامگرترین کەسیش بووە بەرامبەر ئەو کەسەی کە بێئەدەبی دەکات لە کەرامەتیدا، بەرامبەر ئەو کەسەش کە هەوڵ دەدات بۆ خوێن ڕشتن". کاتێك گەمارۆیان دابوو هەڵپو ماشیان دەکرد بۆ شەهید کردنی لێشی ڕوون بوو کە دەیکوژن موسڵمانان هاتن یارمەتی بدەنو بیپارێزن، فەرمانی کرد بە خەڵکەو بە هاوەڵان واز لەکوشتارو شەڕکردن بێننو کەسیان لێ نەکوژن، وتیان قوربان بڕۆ بۆ شاری مەککەو دوور کەوەرە فەرمووی "نابە کەسێك لەوانەی ئاژاوە دەخەنە حەرەمەوە". وتیان پێی دە بڕۆ بۆ شام، فەرمووی "شاری کۆچکردنم بەجێ ناهێڵم"، وتیان پێی دەبا شەڕیان لەگەڵ بکەین؟ فەرمووی "خۆم ناکەمە یەکەمین کەس شمشێر هەڵکێشم لە ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ براکوژی بکەم". ئارامی گرت هەتا بەناحەق شەهید کراو بوو بە بەرێزترین کەس لای هەمووان[1].

**دوازدەیەم: دادپەروەرییەکەی**

سیفەتێکی تری عوسمان، ئاکاری دادپەروەرییە. لەعوبەیدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی خیارەوە هاتووە کە چووەتە ژوورەکەی ئیمامی عوسمان لەکاتی گەمارۆکەدا پێی وتووە تۆ پێشەوایەکی دادپەروەریتو ئەم نەهامەتییە داباریوە بەسەرتا لایەقی ئیمامێکی گەندەڵە. عەبدولڕەحمانی کوڕی عودەیس بەرنوێژمان دەکات من ئەچم لەگەڵ ئەودا نوێژ دەکەم، ئیمامی عوسمان پێی فەرموو نوێژ چاکترین ئیشێکە کە مرۆڤ بیکات، ئەگەر خەڵکی باشبوو بۆت تۆش لەگەڵیان باش بە ئەگەر خراپ بوو دوورکەوەرەوە لە خراپەیان[2].

---

[1] منهاج السنة (٣\٢٠٢، ٢٠٣).

[2] بخاري، رقم (٨٨٥).

له ئیبنو شەیبەوە بەسەنەد ڕیوایەت کراوە دەڵێت "ئیمامی عوسمان جارێکیان چووە لای خزمەتکارەکەی ئالیکی دەدا بە حوشترەکان، شتێکی لە ئالیکەکەدا بینی پێی ناخۆش بوو، بۆیە گوێی خزمەتکارەکەی بادا لە دواییدا پەشیمان بوویەوەو فەرمووی بە خزمەتکارەکەی تۆڵەی لێ بکاتەوە، خزمەتکارەکە نەیکرد، وازی لێ نەهێنا هەتا گوێی ئیمامی عوسمانی گرتو بایدا، فەرمووی دەستت توندکە تا ئەندازەی ئازارەکەی خۆت، پاشان ئیمامی عوسمان فەرموی: ئۆخەی تۆڵەیەکم لێ سەنرایەوە پێش ئەوەی لە قیامەت تۆڵەم لێ بکرێتەوە[1].

**سیانزەیەم: عیبادەتەکەی ـ خواپەرستییەکەی**

ئیمامی عوسمان یەکێك بوو لەوانەی، کە زۆر ئەکۆشا لە عیبادەت، لەچەند ڕێگەیەکەوە ریوایەت کراوە کە لەڕۆژانی حەجدا لای بەردە ڕەشەکە هەموو قورئانی خوێندۆتوە لەیەك ڕکات نوێژدا، ئەمەش نەریتی بووە[2]، لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەت کراوە دەفەرموێت: (أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاء اللَّيْلِ سَاجِداً وَقَائِماً يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ..)، دەڵێت: "ئەو کەسەی کە ئەم ئایەتەی باس کردووە ئیمامی عوسمانە، ئیبنو عەباس دەڵێت: (وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لاَ يَقْدِرُ عَلَىَ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَى مَوْلاهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لاَ يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَهُوَ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (النحل: ٧٦). دەڵێت "مەبەستی ئیمامی عوسمانە[3]، ئیمامی عوسمان شەوی هەینی دەستی دەکرد بە قورئان خوێندن، شەوی پێنج شەممە تەواوی دەکرد[4]، بەدرێژایی ساڵ بە ڕۆژوو بووە، دوای سەر خەوی سەرەتای شەو، هەموو شەوێك هەڵدەستا بۆ شەونوێژ"[5].

[1] أخبار المدينة ـ لأبن شيبة (٣\٢٣٦).

[2] صبقات الكبرى (٣\٧٦).

[3] تفسير ابن كثير (٤/٤٧).

[4] تفسير ابن كثير (٢/٥٧٩).

[5] علو الرحمة (٣/٩٣).

## چواردەیەم: لەخوا ترسان و گریان سەرکۆنەکردنی دەروونی خۆی

لە یەکێك لەوتارەکانی عوسماندا هاتووە فەرمویەتی "ئەی خەڵکینە لە خودا بترسن، چونکە لە خوداترسان سەرمایەو دەستکەوتە، ئاقڵترین کەس ئەو کەسەیە سەرکۆنەی دەروونی خۆی بکات، ئیش بۆ دوای مردنی بکات، لە نوری خودای گەورە بەشی خۆی بپچڕێت بۆ ڕۆشنایی گۆڕەکەی، بشترسن لەوەی خودای گەورە بە کوێری حەشرتان بکات، کەچی چاویشتان ساغ بووە"[1]. ڕیوایەت کراوە لەئیمامی عوسمانەوە فەرموویەتی: "ئەگەر لە نێوان بەهەشتو دۆزەخدا بم نازانم بەرەوکامیان فەرمانم پێ دەکرێت، خۆزگە خۆڵەمێش بوومایە پێش ئەوەی بزانم بۆ کامیان ڕەوانە دەکرێم، هەرکات باسی دواڕۆژی بکردایە ڕۆحی ڕادەچڵەکی‌و پێڵووەکانی چاوی جۆگەی فرمێسکی دەبەست‌و دەکەوتە خەیاڵ‌و ئەندێشەی ڕاستبوونەوەی نێو گۆڕو ملی دەنا بەرەو حساب‌و کیتاب[2].

لە هانیئی خزمەتکاری ئیمامی عوسمانەوە هاتووە، دەڵێت: ئیمامی عوسمان هەرکات لەسەر گۆڕێك بوەستایە دەگریا هەتا ڕیشی موبارەکەی تەڕ دەبوو، پێیان دەوت یادی بەهەشت‌و دۆزەخ دەکەیت وا لەم شوێنەدا دەگریێت؟ لە وەڵامدا دەیوت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی "گۆڕ یەکەمین مەنزڵی پەسلانە، هەرکەس ڕزگاری ببێت لێی ئەوە ڕزگاری بووە، هەرچی بەدوای گۆڕدا بێت ئاسانترە، خۆ ئەگەر ڕزگاری نەبێ لێی ئەوە هەرچی بە دوای گۆڕدا بێت سەخت‌و گرانترە". دەڵێت وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: "وەڵلاهی هیچ ڕوداوێك نییە لە گۆڕ سامناکترو دژوارتر بێت". هەروەها وتی "پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی "داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ براکەتان‌و لە خودا بپاڕێنەوە زمانی هەڵبێنێت، چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکەن""[3]، ئەم چەمکەی ئیمامی عوسمان بەرامبەر خودای گەورە نوچی پێدادابوو، بەم تێگەیشتنەوە دەژیا ئێمەش پێویستمان بەم چەمکە هەیە بۆ ئەوەی زیندوو ببینەوەو وزەکانی پێ بتەقینەو.

---

[1] صحيح والتوفيق في سيرة وحياة ذي النورين ـ مجدي متحي سيد (ص١٠٧).

[2] نظام الحكم في عهد الخلفاء ـ حمد محمد الصمد (٢٠٥).

[3] فضائل الصحابة رقم ٧٧٣.

**پازدەیەم: کەمویستییەکەی ـ زوهد**

ئیمامی عوسمان کەسێکی دەوڵەمەندو سەرمایەدار بووە کەچی چەندین هەواڵی لێ دەگێڕنەوە کە هەموویان بەڵگەن لەسەر زوهدو دونیانەویستی ئەو، لەحەمیدی کوڕی نەعیمەوە هاتووە، دەڵێت "ئیمامی عومەرو عوسمان جارێکیان دەعوەت کران بۆ سەر خوانێك کاتێ پێکەوە چوون، ئیمامی عوسمان وتی بە ئیمامی عومەر ئامادەی خوانێك بووین خۆزگە نەهاتینایە، وتی: بۆ؟ وتی: دەترسم کەش‌و فشمان تیا دروست بێت"[1].

لە بواری سەخاوەت‌و ماڵداریدا بۆچوونی وابوو سەخاوەت بە شانازی کردن‌و خۆهەڵکێشان‌و زۆرخۆری‌و باشخۆری نیە، بەڵکو بریتییە لە خەرجکردنی بێ زیادەڕۆی‌و سوپاسی خاوەن نیعمەت بکەیت‌و دەستکراوە بیت بەرامبەر خەڵك، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر زوهدی ئیمامی عوسمان، یەکێکی تر لەنموونەکانی ئەمەیە کە ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لەڕێگەی مەیمونی کوڕی مەهرانەوە دەڵێت "هەمەدانی پێی ڕاگەیاندم کە ئیمامی عوسمانی دیوە سواری هێسترێك بووەو خزمەتکارەکەی لە پاشکۆیەوە بووە بەمەرجێك ئەو دەمە خەلیفە بووە"[2]، هەروەها لە ڕیوایەتی هەمەدانی هێناویەتی دەڵێت "ئیمامی عوسمانی دیوە لە مزگەوت خەوتووە بە عاباکەی خۆیەوەو هیچ کەسێکی بەدەورەوە نەبووە لە هەمان کاتدا خەلیفەی موسڵمانانیش بووە". هەروەها لەڕیوایەتی شەرحبیلی کوڕی موسلیمەوە هێناویەتی کە ئیمامی عوسمان چێشت‌و خۆراکی داوە بە خەڵکی لە خۆراکی بەیتولمال‌و چووەتەوە بۆ ماڵی خۆیان سرکەو زەیتی خواردووە"[3].

ئەمانە چەند نموونەیەکی درەوشاوەن لە زوهدو قەناعەتی عوسمان، زوهدەکەی نەیدەهێڵا ئاوڕ بداتەوە بۆ تەماع‌و زۆرکردن‌و سەرسامی هیچ شتێك نەبووە، هەرکات دەوڵەمەندبوایە زوهدەکەی ڕایدەچڵەکاندو هۆشمەندانە کاری دەکرد، خۆی دەبوێرا لەو داراییە زۆرەی کە مرۆڤ فریو دەدات‌و سەرنجی بۆ لای تام‌و چێژەکان ڕادەکێشێت،

---

[1] تاریخ الأسدي (١٧، ٤٨/١٨).

[2] الزهد (ص١٢٧).

[3] المصدر نفسه (ص١٢٧).

ئیمامی عوسمان حەق بوو سەرمایەدارێکی زاهید بێت، چونکە بە تێرو تەسەلی تێگەیشتبوو لە ناسینی خودای گەورەو زاڵبووبوو بەسەر دەروونیداو ڕۆژی دوایی لە زیهنیدا زۆر شکۆداربوو، هەروەها دونیاشی لا کەمو بچووك بوو، هەروەها گەورەترین کەڵەپیاو بوو لەئیسلامدا کە هێزی ئیمان زاڵ بێت بەسەر شەهوەتو ئارەزوویدا. عوسمان، ببوە نموونەیەك بۆ گشت دەوڵەمەندەکان لەیەك کاتدا توانی دەوڵەمەند بێتو زاهیدیش بێت.

**شازدەیەم: هەواڵی خەڵکی دەپرسی**

ئیمامی عوسمان کەسێکی دڵسۆزو میهرەبان بووەو زۆر پرسیاری حاڵی موسڵمانانی کردووە، گرفتەکانیانی زانیوەو لە نادیارەکان شارەزا بووەو سەرەخۆشی لە لێقەومان کردووەو ئەحواڵی نەخۆشەکانی زانیوە.

ئیمامی ئەحمەد لە موسای کوڕی تەلحەوە ڕیوایەتی کردووە، دەڵێت: "ئیمامی عوسمانم دیوە لەسەر مینبەر هەواڵی خەڵکی پرسیوەو پرسیاری وەزعو نرخی لێ دەکردن"[1]، ئیبنو سەعد لە تەبەقاتدا ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: "ئیمامی عوسمانم دیوە ڕۆژی هەینی لە ماڵ دەرچووەو پۆشاکی زەردی لەبەردا بووە، چووەتە سەر مینبەرو دانیشتووەو بانگبێژ بانگی داوە ئەمیش وتاری داوەو پرسیاری دەربارەی خەڵکی دەکرد، کێ سەفەری کردووە کێ لەسەفەر گەڕاوەتەوە کێ نەخۆشە؟"[2]، کەواتە ئیمامی عوسمان زۆر گوێی داوەتە کاروباری گەلەکەیو هەر کەسێکیش ئاتاج بوایە، پێداویستی دەردەکردو بەخشیشی بڕی بووە بۆ تێکۆشەرەکان، لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە ڕیوایەت کراوە دەڵێت "من لەسەردەمی عوسماندا بووم، هیچ موسڵمانێك نەبووە لەبەیتولمال بەشی نەبێت"[3].

---

[1] فضائل الصحابة، رقم (٨١٢).

[2] الطبقات (٣/٥٩).

[3] المنصف في الحديث لابن شيبة (٣/١٠٢٣).

### هەژدەیەم: دیاریکردنی پسپۆڕو لێزانەکان

مەبەست لەدیاری کردنی پسپۆڕی دابەشکردنی کارەکانە بەسەر کرێکارەکاندا،بە شێوەیەك ئەو ئەرکەی بخرێتە ئەستۆ شارەزا بێت تێیدا بەبێ کەمتەرخەمیو سەرەڕۆیی کردن بۆ کارێکی تر. دابەشکردنی ئەركو وەزیفە سوننەتی گەردونی خودای گەورەیە، دەستووری پێغەمبەر ﷺو جێنشینەکانە، لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا هەرمانەکان دابەشکرابوون بەسەر موسڵمانەکاندا بە گوێرەی لێهاتوویيو لێزانییان لە بواری دارایی، سوپا، دادوەری کردن، سەرپەرشتی ویلایەتەکان، زۆ بەوردی پسپۆڕەکانی دیاری کردبوو بەم کارە سیفەتی رابەری ئیمامو سەرکەوتنی ولآتی خولەفا ئەسەلمێنرا، ئەمەش بە گونجانی سوننەتی گەردوونیو سوننەتی شەرعی بوو[1]

### نۆزدەیەم: سودوەرگرتن لە سەلیقەدارەکان

سودمەندبوون لە بەهرەداران‌و ڕێنمایی کردنی ئوممەت بۆ ڕێزگرتن لە سەلیقەی خۆیان‌و دانانیان لە شوێنی خۆیانداو پشتگوێ نەخستنیان‌و سودوەرگرتن لە تواناو پسپۆڕییان بوو بەهەوێنی سەربلندی خەلافەت‌و پەهاویشتن‌و ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی‌و هەڵخستنی پێشتینی ئەم ئوممەتە لە گشت ڕویەکی چاك‌و پاکەوە[2].

بۆ نمونە ئیمامی عوسمان سوودی وەرگرتووە لەشارەزایی زەیدی کوڕی سابیت‌و ئەو لیژنەیەی لەگەڵیدابوو بۆ کۆکردنەوەی قورئان لەسەر یەك پیت.

ئەمانە کۆمەڵێك سیفەت‌و ئاکاربوون کە باسمان کرد لە کەسایەتی ئیمامی عوسمان ئەوە دەسەلمێنین کە جێگەی خۆیەتی ڕابەرو پێشەنگ‌و پیشەوای موسڵمانان بێت‌و چرایەکە ڕێگاو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺو جێنشینەکانی ڕۆشن دەکاتەوە لەسەرانسەری ژیاندا.

ناسینی ئاکارەکانی خولەفای راشیدین‌و هەوڵدان بۆ شوێنکەوتنیان هەنگاوێکی پیرۆزە، چونکە ئەوانە رابەرێکی خودا ناسبوون ئەوانەبوون کە توانیان گەل بەرەو ئامانجە بنەڕەتییەکان ببەن‌و چمکەکانی ئەم ئایینە قایم‌و قوڵ بکەن، کارکردن بۆ دروستکردنی

---

[1] الكفاءة الأدارية (ص١١٧

[2] الكفاءة الأدارية (ص١٥٧

رابەری خوداناس‌و ئیماندار خێرو بەرەکەت‌و برژێنێ بەسەر گەل‌و وڵاتدا. ڕابەری ڕاستەقینەش ئەوەیە توندوتۆل بێت بۆ حوکم کردن بەشەرعی خوداو گەل ئاراستە بکات بۆ بەکارهێنانی تواناو وزەکانیان‌و ئیسلام بکاتە پەرژینی دڵ‌و جەستەی‌و بە ڕوخسارو ناوەڕۆك بە عەقیدەو شەریعەت بە دین‌و دەوڵەت ئیسلام جێبەجێ بکات‌و خەمی ئێوارەو بەیانی عەقیدەی گەلەکەی بێت‌و هەوڵی چارەسەری کێشەکانیان بدات‌و لەمپەرەکان بنەبڕ بکات.

# بەشی سێیەم:

## دامودەزگای دارایی و قەزایی لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا

## باسی یەکەم: دەزگای دارایی

کاتێك ئیمامی عوسمان خەلافەتی گرتەدەست، هەرچەند ڕێگەی دا بە موسڵمانان سامان پێکەوە بنێن‌و کۆشك‌و تەلار دروست بکەن‌و دەشتی پان پۆڕ تاپۆ بکەن، کەچی سیاسەتەکانی ئیمامی عومەری لەڕووی داراییەوە نەگۆڕی. توندوتۆڵی ئیمامی عومەر بەسەر چوو، خەڵك ترس‌و تۆقیان نەما، چونکە لەسەردەمی ئیمامی عومەردا هەموو کەس زیاد لەبەشی خۆی ئەوەی هەیبوایە لێی دەسەندرا، بە ڕاستی سەردەمی ئیمامی عوسمان سەردەمی نەرمی‌و فراوانی بوو لەسەر موسڵمانان[1].

یەکەم: ئەو سیاسەتە داراییەی ئیمامی عوسمان بانگەشەی بۆ دەکرد ئەوەبوو، نوسراوێکی ناڕاستەی والییەکان‌و پۆلیسەکانی باج کردو بەسەر هەمواندا گشتاندی. لەم نووسراوەدا بنەماکانی سیاسەتی دارایی گشتیی لەسەر ئەم ڕەگەزانە بنەڕەت کرابوو:

١ـ جێبەجێکردنی سیاسەتی گشتیی دارایی ئیسلامی.

٢ـ کاری پۆلیسەکانی گومرگ نەکرێتە کاری چاودێریی، ئەرکی والییەکان تێکەڵ بە پۆلیسەکان نەکرێت.

٣ـ ئەو باجەی دەکەوێتە سەر موسڵمانان بۆ بەیتولمال بێت.

٤ـ پێدانی دەرماڵە بە موسڵمانان لەبەیتولمال.

٥ـ وەرگرتنی ئەو سەرانەیەی دەکەوێتە سەر ئەهلی زیمە.

٦ـ پۆلیسەکانی گومرگ ئەمین‌و بەئەمەك‌و دەست پاك بن.

٧ـ هەر سەرپێچییەکی دارایی ڕوویدا، ئەوە هەموو نیعمەتەکانی خەڵك هەڵدەشێنێتەوە.

ئەم بنەمایانە بە دوورو درێژی باس دەکەین[2]

---

[1] میادئ الأقتصاد الاسلام ـ سعاد ابراهیم (ص٢١٧

[2] السیاسة المالیة لعثمان ـ قطب ابراهیم (ص٦١).

### ١- مەبەستی ئیمامی عوسمان لەجێبەجێکردنی سیاسەتی گشتیی دارایی:

بێگومان خەلیفەی سێیەم زۆر پەرۆش بوو لەسەر جێبەجێکردنی دەستوورو حوکمی خودای گەورەو پێغەمبەر ﷺو سیاسەتی هەردوو خەلیفەکەی پێشوو ئەبوبەکرو عومەر، هەرچی لە قورئانو سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ بوو پیادەی دەکرد بە تایبەتی ئەو بەندانەی کە پەیوەندی بە سیاسەتی دارایی‌و حوکمەکانییەوە هەیە، ئیمامی عومەریش هەستا بە پەرەپێدانی دەزگاکانی دارایی‌و بنەماو ڕێساکانی بۆ داکوتاو سەرچاوە ئابورییەکانی زیاد کردو خەرجی تری بۆ پێکەوەنا، ئیمامی عوەسمانیش ڕێگەکانی گرتە بەرو لەهەندێ کاریشدا ئیجتیهادی تازەی کرد بە تایبەتی ئەو گۆڕانانەی کە ئیجتیهاد هەڵدەگرن.

عوسمان، لەبواری دارایی‌و هەموبوارەکانی تردا حوکمی خودای گەورەی پیادە دەکرد لەزەویدا. ئەو، بەجوانی سەرپەرشتی زەکاتی دەکرد بۆ بەیتولمالو دابەشی دەکرد بەسەر موستەحەقەکاندا، سەرانەی لەئەهلی کیتاب وەردەگرت بۆ بەیتولمال، بەمکارەش ئەهلی کیتاب مافو بەرژەوەندییان دەکەوتە ئەستۆی دەوڵەتی ئیسلامو دەپارێزرانو ئاسایشیان بۆ دەستەبەردەکراو خزمەتگوزاری پێویستیان بۆ دابین دەکرا، هەروەها موجاهیدەکان دەستکەوتی جەنگیان دەبردو پێنج یەکیان دەنارد بۆ بەیتولمال، ئەویش دابەشی دەکرد بەسەر هەتیوو هەژارو ڕێبوارو داماواندا، جگە لەمەش دەسکەوتەکان لە پێناوی خێرو چاکەدا خەرج دەکرا. (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ..) (الأنفال: ٤١).

سیاسەتی گشتیی دارایی سەردەمی خولفای ڕاشیدین‌و عوسمان تایبەت بوو، چونکە پابەندی ئیسلامو جێبەجێکردنی بنەما ئابورییەکانی ئەم ئاینەبوون. دەستوری خەرجکردنیش بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامو بەیداخی خۆشی موسڵمانان بوو خەرجکردنەکەشی خرابووە ژێر رکێفی ئیسلام، لەبەر ئەوەی نەکەونە ئیسرافکردن، خودای گەورەش خەڵکی موسریفی خۆش ناوێت، خەرجکردنی گێڵو گەواڵەکان قەدەغە دەکاتو ڕێگە ناداتماڵو سامان بکەوێتە ژێر چنگیان، دارایی گشتیی سەرچاوە

ئابورییەکان پێشکەشی چینە لاوازەکانی دەکردو بەیتولمالیش داراییەکی چاك‌و خاوێنی دوور لەگزی کۆکردبۆوەو سەرچاوەی داهاتەکانی لەحەرام پاراستبوو، بۆیە خودای گەورە پیت‌و بەرەکەتی تێ خستبوو.

**٢ـ ئەرکی والییەکان ئاوێتەی پۆلیسەکانی گومرگ نەکرێت:**

ئیمامی عوسمان، لەنامەی والییەکاندا ئاگاداری کردبوون کە کاری پۆلیسەکانی گومرگی بەیتولمال تێکەڵاوی ئەرکی والییەکان نەکرێت، چونکە ئەرکی والییەکان چاوداشتی گەلەو ئەرکی پۆلیسەکانی گومرگ کۆکردنەوەی باج‌و خەراجی موسڵمانانە، نابێت هیچ لایەکیان سنووری خۆیان ببەزێنن بە تایبەت والییەکان سنووری دەسەڵاتی خۆیان بزانن‌و سەلاحییەتیان هەبێت. بۆ دیاریکردنی سنووری دەسەڵاتی والییەکان[1]، شەرعزانەکان لەفەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ‌و سەردەمی راشیدین ئەرکەکانی والیان هەڵهێنجاوەو سنووری دەسەڵاتیان بۆ دیاریکردوون کە ئەمانەن لەم دە بەندەدا کورت کراونەتەوە.

١ـ پاراستنی دین لەسەر ئەو بنەما بتەوانەی کە مەحکەم کراوەو پێشینانی ئوممەت لەسەری رۆشتوون.

٢ـ جێبەجێکردنی حوکمەکانی دین لەنێوان ناکۆکەکانداو یەکلاکردنەوەی کێشەو قەیرانی مەرافەچییەکان بە شێوەیەك زوڵمی زاڵم بگەرێتەوەو مافی مەزڵوم بسەنرێتەوەو ویژدان ئاسوودە ببێت.

٣ـ پارێزگاری تەنانەت هێلکەیەك‌و مووروویەك بکرێت‌و نەهێڵرێت بدزرێت‌و زایە ببێت، تا خەڵکی بتوانن بلاّو ببنەوەو دڵنیابن لەسەرو ماڵیان.

٤ـ سزا وەرگرتن بۆ قەدەغەکراوەکانی خودای گەورەو خۆپاراستن لە ئەتککردن‌و لەناوبردن‌و فەوتاندن.

٥ـ قایمکردنی کەلەبەرەکان بە قەڵغانێکی بتەو هێزێکی بەزەبر هەتا دوژمنان تروسکاییەك بەدی نەکەن، حەرامێك پێشێل بکەن یان خوێنی موسڵمانێك یان زیمییەك بە ناحەق برژێنن.

---

[1] السياسة المالية لعثمان (ص٦٢).

٦ـ لەناوبردنی ئەو کەسانەی دژایەتی ئیسلام دەکەن دوای دەعوەتکردن یان ئیسلامی خۆی ڕاگەیەنێت یان بچێتە بەرەی ئەهلی زیمی.

٧ـ پۆلیسەکانی گومرگ خێرو زەکاتو سەرانە بەگوێرەی دەقی ئیسلام وەربگرنو دوور بکەونەوە لەترساندنو ستەمکردن.

٨ـ دەست پێوەگرتنی ئەو بەخششو دەستمایەی دەدرێتە بەیتولمال نە زیادەڕەویو نە ڕەزیلی تێدا نەکرێتو لەکاتو شوێنی خۆیدا خەرج بکرێت.

٩ـ خەلیفە خۆی سەرپەرشتی کاروبارەکان بکاتو بارودۆخەکان هەڵبسەنگێنێتو بە سیاسەتی گشتیی ڕابگاتو نەیداتە دەست کەسی تر[١].

١٠ـ ئامۆژگاریی ئەمیندارەکانو وتاربێژەکان بکاتو ئەو کارانە بداتە دەستیان کە تێیدا کارامەو شارەزانو داراییش بداتە دەست ئەوانەی دەستپاکنو بە گوێرەی لێزانی کەسەکان کارەکان دابەش بکات.

بە کورتی ئەرکی سەرشانی خەلیفە لە مەرجی بەیعەتدا سەرچاوە دەگرێو بەیعەتیش دوو جۆگەی لێ دەبێتەوە کە پارێزگاری دینو پارێزگاریی دونیایە[٢]، ئەم دوانە خەمو ئاواتی پێغەمبەر ﷺو جێنشینەکانی بووە، ئیمامی ماوەردیو فەرائی هاوچەرخی یەکڕابوون لە دەستنیشانکردنی ئەرکەکانی خەلیفە[٣]، ئەم ئیجتیهادە بۆ سەردەمی ئەوان تەواوو گونجاوە، بەڵام ناکرێت بەرژەوەندی گەل لەخاڵو ژمارەکانی ئەواندا قەتیس بکەین یاخود تێڕوانینی زانایەکی هاوچەرخ بێنینو بیکەینە پێوەرەو بەرنامەیەکی هەمیشەیی، بەڵکە پێویستە ئەرکەکانی ئیمام دیاری بکەینو لەسەر دوو ڕەگەزی گشتیی دایبمەزرێنین کە پارێزگاری دینو سیاسەتی دونیا بێت. پێویستە لیژنەیەك لەزانایانی سەردەم کارەکان دیاری بکەنو پەرە بەڕای شەرعزانەکان بدەنو هەر شتێك گونجاوی ئەم سەردەمەیە هەڵیبژێرنو بە مەرجێك بەندەکانیان پێچەوانەی دەقی قورئانو سوننەت نەبێتو ئەحکامەکانی ئیسلام پێشێل نەکات[٤].

---

١ الأحكام السلطانية والولايات الدينية ـ ابو حسن المارودي (ص١٦ ـ ١٧).

٢ مقدمة ابن خلدون، (ص١٩١).

٣ الخلافة بين التنظير والتطبيق ـ محمد المرداوي (ص٦٦).

٤ السياسة المالية لعثمان (ص٦٣).

**٣ـ وەرگرتنی ئەو باجو خێراتەی دەکەوێتە سەر موسڵمانان بۆ بەیتولمال، بە شێوەیەکی دروست:**

پۆلیسەکانی خێراتو باج نوێنەری وڵات بوونو لەنێو بێنەو بردەی بەیتولمالدا بوون، ئەو بەندانەی دەکەوتە سەر موسڵمانان بەشێوەیەکی ڕەوا وەریان دەگرتو ئەو مافانەش دەکەوتە سەریان بە شێوەیەکی جوان پێیان دەدان، هەرکاتیش زیادە گیرییان بکردایە لە باجی بەیتولمالدا بەستەم دەشکایەوە بەسەر جەماوەرداو باری ناتاقەت دەکەوتە سەرشانیان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری کردبوون کە زیادەڕەویو زیادەگیری نەکەن لەئەرکەکانی بەیتولمالدا زۆر بەتوندی نەهی کردووە لەباجگرو کرێکارەکانی زەکات زیادەگیری بکەن، دەبو ئاسانکاری بکەن لەزەکاتی بەروبومداو سەختگیر نەبن[١].

**٤ـ دەرماڵەو موچەدان بە موسڵمانان لە بەیتولمال:**

موچەی بەیتولمال بۆ موسڵمانان راستەوخۆ دەبێت، بۆ نمونە بەخشینەوەی زەکات بۆ موستەحەقەکان بوو ئەو داهاتە بێ شومارەی کە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی لیژنەی موچەپێدان، دابەشی دەکات بەسەر گشت موسڵماناندا.

ڕێگەی دووەم بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ دەبێت، وەکو بەخشینە گشتییەکان کە بۆ خزمەتگوزاری گشتیی بەکار دێتو لەئاتاجییە گشتییەکاندا خەرج دەکرێت. لەهەردوو جۆرە خەرجکردنەکەدا پێویستە بە شێوەیەکی ڕێکو پێك خەرج بکرێت، دروست نییە بەخشینی ڕاستەوخۆ پێچەوانەی بنەماکانی ئیسلام سەرف بکرێتو لەبەر خۆشەویستییو نزیکیو بەرژەوەندی بدرێت بە هەندێ کەسو لە هەندێکی تر بشاردرێتەوە یان لێی کەمبکرێتەوە، دروست نییە ئەو بەخشینە لەکاتی دیاریکراوی خۆی دوا بخرێت یان زۆر گیر بدرێتو وەك گێردانی زاڵمەکان کە موچە دوا دەخەنو لێی دەبڕنو نایگەیەنن بەخەڵك. دروست نییە بەخشینی ناڕاستەوخۆش بۆ قازانجی تاکەکەس خەرج بکرێت، بەڵکو دەبێت بۆ سەرجەم جەماوەر بێتو گەل لێی بەهرمەندبێت[٢].

---

[١] المصدر نفسه (ص٦٤).

[٢] المصدر نفسه (ص٦٥).

٥- وەرگرتنی ئەو سەرانەیەی کە دەکەوێتە ئەستۆی ئەهلی زیمە، دروست نییە ئەهلی زیمە بچەوسێنرێتەوە لەکاتی وەرگرتنی سەرانەدا، چونکە ئەوانە ئەهلی کیتابن‌و لە وڵاتی ئیسلامدا نیشتەجێ دەکرێن‌و چاودێری دەکرێن‌و مافەکانیان دەکەوێتە ئەستۆی ئیسلام تا ئەوکاتی بەردەوام بن لەسەرانەدان، پێغەمبەر ﷺ لە بارەیانەوە وەسێتی کردووە، عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی کردۆتە سەرپەرشتیاریان‌و فەرمویەتی "هەرکەس ببێتە سەرپەرشتیاری ئەهلی زیمەو دڵو دەرونی پاك نەبێت لەگەڵیان، لەرۆژی قیامەتدا من دەبمە مکولی"[1]. بۆ زیاتر دڵنیابوون لەچاودێری‌و خزمەتی ئەهلی زیمە ئیمامی عومەری خەتاب لەسەرەمەرگیدا وەسێتی کردووەو لەبارەیانەوە فەرمویەتی "وەسێت دەکەم بۆ خەلیفەی دوای خۆم کە چاکتر بێت بەرامبەر ئەهلی زیمەو پەیمانیان نەشکێنن‌و لەبێخەبەری نەیان کوژێت‌و زیاد لەتوانای خۆیان ئەرك نەخاتە سەرشانیان"[2].

ئەگەر پۆلیسەکانی سەرانە، ئازاری زیمییەکان بدەن یان ئەرکی زیاد لەحەددی خۆیان بخەنە سەرشانیان، یان سزایان بدەن یاخود سەرانە لە پیرو پەککەوتەکان وەربگرن یان ئەو کەسانەی توانای کاریان نییە، یان سەرانە بسێنن لەو زیمییانەی کە موسڵمان بوون، ئەمانە جۆرێکن لەجۆرەکانی ستەم. هەروەك خەلیفەی سێیەم ئیمامی عوسمان لەنامەو نوسراوەکاندا پۆلیسەکانی باج‌و سەرانەی ئاگادار کردبوو کە ستەم نەکەن، ئەمەشی لەڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ وەرگرتبوو[3]. لەسەرانە، زیاتریش باجی ئەو زەویانەیە کە ئەهلی زیمە دەیان هێناو زەوییەکانیان دەکێڵاو موڵکانەیان دەدا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا سەرچاوەیەك بوو بۆ بەیتولمال، پێویستە موڵك سێنەکان تێبینی‌و ڕەچاوی حەق بکەن‌و نرخێکی شیاوی بۆ دابنێن بە گوێرەی دەرامەتی زەوییەکە، هەروەها ڕەچاوی ئەو بنەمایانە بکەن، کە لەپێوانەکردندا بەکاردێت، چونکە خۆگێل کردن لەهەمووی یان لەهەندێکی زوڵمە لەکشتیارەکانی ئەهلی زیمە، کەرەسەکانی پێوانەکردنیش ئەم چوارەیە واتە دەبێت کەرەسەکان دابین کرابێت بۆ جوتیارەکان ئەوجا بپێورێت.

---

[1] المنتخب من السنة (ص٢٦١).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص٦٤).

[3] المصدر نفسه.

١ـ ئامێرەكانی گەشەكردنو پاراستنی دەغلو دانیان پێ بدرێو كەرەسەكانی زەوی خۆشكردنیان بۆ دەستەبەر بكرێت.

٢ـ ئەو شتانەش كە پەیوەندیی بە خودی كشتوكاڵەوە هەیە وەكو جۆری دانەوێڵەو بەروبوومو فیات گرانو فیات هەرزان لێك جیا بكرێتەوە.

٣ـ ئەو شتانەش كە پەیوەندی بە ئاودێرییەوە هەیە، دەبێت كشتوكاڵی ئاوپرژێنو ئاودێران جیا بكرێتەوە لە كشتوكاڵی بارانو باراناو.

٤ـ نابێت لەموڵكانە وەرگرتندا پەرگیری بكرێتو هیچی تێدا نەهێڵرێتەوە، دەبێت بە گۆرەی زەوی ناسەكان لێیان وەربگریت لە جوتیارەكان نەك لە نیوەكارو رەشورووتەكان[1].

ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی پەیمانێك یان گرێبەستێكی سوڵحی كرد لەگەڵ ئەهلی كیتابدا پێویستە پۆلیسەكانی موڵكانەو باج پەیوەست بن بەو مەرجانەوە كە لە گرێبەستەكەدا هاتووەو نرخی سەرانەو موڵكانەكەی تیا دیاری كراوە. دەبێت موسڵمانان پێكۆڵی پەیمانیان بنو بە ئەمەك بن.

٦ـ زوڵم لە هەتیو نەكەن

هەتیوەكان مافیان هەیە لەدارایی گشتیی، بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز یەكێكن لە موستەحەقەكانی زەكات، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (التوبة: ٦٠).

بە هەمان شێوە پێنج یەكی دەسكەوتەكانی شەڕی دەدرێتێ، هەروەك خودای گەورە لەقورئاندا ئاماژەی پێكردووە، هەروەها پشكی هەیە لە بەیتولمالدا، منداڵان بە گشتیو منداڵە هەتیوەكان بە تایبەتی بەشیان هەیە، خۆ ئەگەر منداڵە هەتیوەكە دەوڵەمەند بوو زەكاتی فەرز دەخرێتە سەر سامانەكەی، پێویستە پۆلیسەكانی زەكات بە شێوەیەكی دادوەریو بەرێزانە زەكاتەكە وەرگرنو نەكەونە پەرێزی زوڵمو گزیكردنو ناحەقی تێدا نەكەن[2].

---

[1] المصدر نفسه (ص٦٧).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص٦٨).

**٧ـ پۆلیسەکانی گومرگ وخێرات، دەستپاکو وەفادار بن**

خودای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِه..)، خودای گەورە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ) (المؤمنون: ٨).

خەلیفەی راشیدین ئیمامی عوسمان، داوای کرد لە پۆلیسەکانی خێراتو باج کە خۆیان بڕازێننەوە بە دەستپاکیو وەفاداری، ئەمەشی بە ئاکارێکی گرنگی هەموو ئەو کەسانە دەزانی کە سەرقاڵ بوون بە دارایی گشتییەوە، خۆ ئەگەر ئەم ڕەوشتانەیان تێدا بەدی نەکرێت، بێگومان ستەم لەخەڵكو لەبەیتولمالیش دەکەنو موچەخۆرەکانیش تووشی ئەو ستەمە دەبن، ئەوکاتە پەیوەندیی نێوان مرۆڤو بەیتولمال تێکو پێك دەشکێت، لەبارەی ئەم ڕەوشتانەوە قورئانی پیرۆزو فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئاگاهیداوە بە هەڵسوڕێنەرانی دارایی دەستپاکو ئەمانەتپارێزو بەوەفا بن، هەر بەم جۆرە ئیمامی عوسمانیش داوای کردووە لەپۆلیسەکانی خێراتو باجو کە سەنگینو وەفاداربن، هەروەك لەنووسراوەکانیدا هاتووە کە چاکبن بەرامبەر گەلو جەماوەرو مافەکانی بەیتولمالیش بە تێروتەسەلی بپارێزن، بەرامبەر موچەخۆرەکانیش زیادەڕەویو کەموکوڕی نەنوێنن، بەرامبەر ئەهلی زیمەش نەرمو نیان بنو هەڵسوکەوتی باش بکەنو ئەو بەندانە جێبەجێ بکەن کە لەروونکردنەوەی سەرانەدا هاتووە[١].

**٨ـ شوێنەواری بەهرە بێشومارەکان لەسەر ڕەوتی ئوممەت:**

نییەو نەهاتووە کە ئیمامی عوسمان خەڵکی گشتیی فەرامۆش کردبێتو چاوڕۆشنی نەکردبن، بەڵکو ئاگاداری کردون کە دونیا سەرنجیان نەباتو شەیدای لەزەتو ڕابواردنەکانی نەبن، ترسی هەبووە ئەم خۆشگوزەرانییە سەر بکێشێت بۆ بیدعەگەری هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکردبوو کە سێ شت هاتە ئاراوە مەترسی دروست دەبێت، یەکەم کامەرانیو خۆشگوزەرانی، دووەم باڵغبوونی منداڵی کەنیزەکەکان، سێیەم قورئانخوێنە ناعەرەبەکان[٢].

---

[١] السياسة المالية لعثمان (ص٦٩).

[٢] تاريخ الطبري (٥/٢٤٥).

ئیمامی عوسمان دەرکی کردبوو خۆشگوزەرانیو ئاوەدانی بۆ هەندێ کەس دەبێتە هۆی لادانو لاسارکردنی، چونکە سەروەتو سامانی هەڵڕژاو تاکەکانی کۆمەڵ تەمەڵو گەندەڵ دەکاتو ماڵەکەی لەڕابواردنو تەوەنسدا خەرج دەکات[1]، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ: (وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً) (الإسراء: ١٦).

**٩ـ بەراوردێك لە نێوان سیاسەتی عومەریو سیاسەتی عوسمانی:**

ئەو سیاسەتە داراییەی ئیمامی عوسمان ڕایگەیاندبوو، زۆر لەو سیاسەتە داراییە دەچوو کە ئیمامی عومەر جێبەجێی دەکرد، ئیمامی عوسمان لەسەرەتای گرتنەدەستی دەسەڵاتی خەلافەتدا فەرموی "دەبێت دارایی گشتیی لەژێر سێبەری سێ مەرجدا بێت، یەکەم حەق وەربگرێت بە حەقیانەتیش خەرجی بکات، دووەم لەشوێنی خۆیدا سەرفی بکات، سێیەم بۆ شتی حەرامو قەدەغەکراو خەرج نەکرێت"[2]. کەواتە سیاسەیتی عومەرو سیاسەتی عوسمان هەردوکیان لە یەك بلورەوە درەوشابونەوە، ئەویش بلوری ئیسلامو بنەماو ڕەگەزەکانی بوو[3].

**دووەم: ئامۆژگارییەکانی لەبارەی دەستوری زەکاتدانو ڕوونکردنەوەی**

لە مانگی ڕەمەزاندا ئیمامی عوسمان فەرموی: "ئەم مانگە مانگی زەکاتدانە، هەرکەس قەرزی بەلاوەیە، با بیداتەوە بە خاوەنەکەی هەتا زەکاتی ماڵو سامانەکەیان بدەنو ئێوەش زەکاتی خۆتان دەربکەن، هەرکەس پارەی لەدەستدا نییە داوای هیچی لێ ناکرێ، مەگەر خۆی حەز لە خێر بکات، هەرکەسێ ئێستا لێی وەربگیرێ هەتا مانگێکی تر وەختان وەخت ئیتر لێی وەرناگرین".

ئیبراهیمی کوڕی سەعد دەڵێت "ئەو مانگە مانگی ڕەمەزان بوو"[4]. ئەبوعوبەیدە دەڵێت: "لە هەندێ ئەسەردا هاتووە ئەو مانگەی ئیمامی عوسمان خەڵکی لێ ئاگادار

---

[1] السياسة المالية لعثمان (ص٧٠).

[2] السياسة المالية لعمر بن الخطاب ـ قطب ابراهيم (ص٢٣).

[3] السياسة المالية لعثمان (ص٧٦).

[4] الأموال لأبي عبيد (ص٢٣٤).

کردەوە مانگی موحەررەم بوو"[1]. ئەم ئاگادارییەی ئیمامی عوسمان جەخت لەم بەرنامانە دەکاتەوە:

١ـ دانانی دەستوری زەکاتی سالآنە بۆ بەڕێوەبردنی فەرزی زەکات، جگە لەزەکاتی کشتوکاڵ، چونکە ئەم زەکاتە بەپێی حاسلآتە. ئەم دەستورەش لەو وتەیەدایە کە خۆی کە فەرموویەتی "هەرکەس زەکاتی سامانەکەی ئەم مانگە وەرگیرا، تا ساڵێکی تری هەمان مانگ لێی وەرناگیرێتەوە".

٢ـ ئەگەر لەسەر قسەی ئەبوعوبەیدە بچین دەبێت مانگی موحەڕەم بکەین بە مانگی زەکات دان، چونکە ئیمامی عوسمان ویستویەتی ساڵی کۆکردنەوەی داهاتی ئیسلام ڕێك هاوتای ساڵی کۆچی بکات، پێویستە لەسەر موسڵمانان دوای گوزەرکردنی ساڵێکی کۆچی ئەگەر مەرجەکانی زەکات بەدی هاتبوو، زەکاتی ماڵو سامانەکەیان دەربکەن.

٣ـ ئیمامی عوسمان، جاڕی خەڵکیدا کە قاسەی زەکاتیان حسێب بکەنو داوای لێکردن ئەو قەرزانەی بەسەریانەوەیە بیبڕێرنو لەزیادەکەی زەکات دەربکەن[2]، لەوانەیە ویستبێتی خەڵك هانبدات قەرزەکانیان ببڕێرنو وەفایان هەبێت بەرامبەر خاوەن قەرزەکان بۆ ئەوەی قەرزەکان بنەبڕ بکرێتو قەرزکردن نەکرێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیو ماڵەکانیان ملکەچی زەکات بکەنو حسابی داهاتو سامانی خۆیان بکەن[3].

٤ـ ئیمامی عوسمان دەفەرموێت "هەرکەس پارەی نەبێت داوای هیچی لێ ناکرێت، مەگەر خۆی حەز لەخێر بکات، بەم وتەیە دەرگای لەخێرو بەخشین کردۆتەوە، وادیاربوو هەندێ لەموسڵمانان زەکات ناکەوێتە سەریان بەڵکو ماڵەکەیان بە خێرو تەبەڕوع دەردەکرێتو دەدرێتە بەیتولمال، ئەویش لێیان وەردەگرێتو دەیخاتە تویێی سەرچاوەکانی زەکات، دەوڵەت لە هەمان ئەو خەرجییانەدا خەرجی دەکات کە زەکاتی تێدا خەرج دەکرێت. هەروەها ئەو وتەیەش: کە دەڵێت: "هەرکەس لێمان وەرگرت جارێکی تر لێی

---

[1] المصدر نفسه (ص٥٣٥).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص٧٦).

[3] السياسة المالية لعثمان (ص٧٧).

وەرناگرین، مەگەر خۆی حەز لەخێری زیادە بکات"، مەبەست ئەوەبوو بەیتولمال تۆبزی ناخاتە سەر کەس. بۆ زەکاتی ئاڵتونو زیویش دەبوو خاوەن ماڵ خۆی بیهێنێتو بەینی خۆیو خودای خۆی زەکاتەکەی دەربکات، بەڵام ئەو زەکاتەی خاوەنەکەی ناچار دەکرێ بیهێنێت زەکاتی مەڕوومالاٌتو کێڵگەو باخو ئەو جۆرانەیە، ئیمامی عوسمان ماڵو سامانی شاراوەو دەرنەکەوتووی بەجێ دەهێلا بۆ خاوەن ماڵ تا خۆی وەکیل بێتو لێشی وەرنەدەگرتن بە دڵێکی پاكو بێ خەوش نەبوایە ئەوشتانەش بریتیبوون لە ئاڵتونو زیوو کەرەسەی بازرگانیو هەندێ شتی تری بەنرخ[1].

ئەبو عوبەیدە لەم بارەیەوە دەڵێت "ئایا ئێوە نازانن پێغەمبەر ﷺ زەکات سێنی دەنارد بۆ زەکاتی ئاژەڵ بە تۆبزی یان بە ڕەزامەندیی خۆیان، هەروەها ئیمامەکانی دوای ئەویش هەر وایانکرد، هەتا ئەو کەسانەی زەکاتی ئاژەڵیان مەنع کردو نەیاندا ئیمامی ئەبوبەکر شەڕی لەگەڵدا کردن"، نە لەپێغەمبەر ﷺو نە لەخولەفای ڕاشیدینەوە نەهاتووەو نەبیستراوە کە خەڵکیان ناچار کردبێت بە زۆرو فشار، زەکاتی شمەکە بێ گیانو نەجولاٌوەکانیان وەرگرتبێت، مەگەر خاوەن ماڵەکە بەخۆشیو ڕەزامەندی خۆی هێنابێتی، بەڵێ زەکاتی ئەکەوێ بەڵام خاوەن ماڵ خۆی وەکیلە، واتە: ئەمانەتی لای خاوەن ماڵەو پێویستە لەسەریان خۆیان حسابی بکەنو زەکاتی دەربکەن، چونکە ئەو موڵكو سامانەی لە سێبەری ئارامشو ئاسایشی ولاٌتدا دەست کەوتووەو لەئەنجامی بەیعەتەکەیەوە ژیانی بۆ دابین کراوەو بێ ترس ڕۆشتووەو بێخەم خەوتووە، بەڵام زەکاتی ئاژەڵ حوکمی خۆی هەیەو حوکمەکەشی بەپێی ژمارەو دێتنە[2].

**بەرنامەی ئیمامی عوسمان لە بارەی داراییەوە**

**١ـ رای ئیمامی عوسمان دەربارەی ئەو قەرزانەی زەکاتیان دەکەوێت**

لەسائیبی کوڕی زەیدەوە هاتووە ئیمامی عوسمان وتویەتی "زەکاتی ئەو قەرزەی کە لە بەر دەوڵەمەندیو شەرم کردن وەرگرتنەوەیت دواخستووەو هەر کات ئارەزووت هەبوو وەری دەگریتەوە خۆت پشتگوێت خستووە ئەوە زەکاتی دەکەوێت، هەروەها ئەو پارەیەی لەکاسبیو پیشەیەکدایە ئەوە زەکاتی دەکەوێت".

---

[1] الأموال لأبي عبيد (ص٥٣٧).

[2] الأموال لأبي عبيد (ص٥٣٧).

لە ئیمامی عوسمانەوە هاتووە دەفەرموێت "زەکاتی ئەو قەرزە بدەن، کە لەبەر تێری‌و بێ ئاتاجی، لە قەرزاری ناسێننەوەو پێویستتان پێی نییە"[1]. لەم وتەی ئیمامی عوسمانەوە دەردەکەوێت، زەکات واجبە لەسەر ئەو قەرزەی خاوەن قەرزەکە لە بەر تێری‌و شەرم‌و بێ ئاتاجی وەری ناگرێتەوە. بەڵام لەبەر رەهەندی تر داوای ناکاتەوە، یاخود داویەتی بە قەرز بۆ مەبەستی کاسپی‌و شەراکەت، یان پیشەیەکی پێ ئەنجامدەدات‌و لەقازانجەکەی شەریکەو خاوەن قەرز لەبەر قازانجەکەی گوێی لە پارەکەی نییەو وەری ناگرێتەوە[2].

٢ـ ئیمامی عوسمان، خەرجی زەکاتی جێگۆڕکێ پێ دەکردو بۆ بەرژەوەندی گشتیی خەرجی دەکرد، بۆ نموونە: داهاتی زەکاتی خەرج دەکرد بۆ غەزاو جەنگ‌و هەروەها پێویستیی تر، بۆ ئەوەی ئاتاجی جەنگ‌و خەڵك مەیسەر بێت، ئیمامی گەلیش مافی ئەوەی هەیە زەکات لەخەرجییەکەوە بۆ خەرجییەکی تر بگوازێتەوە لە شوێنێکی پێویستی تردا سەرفی بکات[3].

ئەم گۆڕانە، نە پێچەوانەی پەیامی ئیسلامەو نەگۆڕینی سوننەتە، چونکە ئیمامەکە کە کردوویەتی پێشەنگ‌و ڕەنگرێژە. ئەسڵی زەکات پڕکردنەوەی کەلێنی موسڵمانانە هەتا هەندێ ڕاوبۆچوون هەیە باس لەوەدەکات، زەکات سەرف دەکرێت لەپێناوی خوداو دەدرێت بە موجاهیدانی ڕێگەی ئیسلام، چونکە ئەوانە خۆیان تەرخان دەکەن بۆ تێکۆشان‌و دەست هەڵدەگرن لە کارو کەسابەت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت خەڵك هانبدات بۆ تەمەڵی‌و بێ ئیشی لەبەر ئەوە ئەم گرۆیە بەرژەوەندیی ئیسلامیان داوە بەسەر بەرژەوەندیی دەروونی خۆیانداو وازیان لە کاری شەخسی هێناوەو لە بوارێکی گرنگترو فراوانتردا کار دەکەن، ئەویش بەرزڕاگرتنی وشەی (لااله الا الله)و بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامە لە شارو شوێنەکاندا، هەندێ لەزانایان پێیان وایە دروستە زەکات سەرف بکرێت لەم گروپانەو لەسوودە گشتییەکاندا[4].

---

[1] المنتخب من السنة (ص٣٠٦).

[2] السياسة المالية لعثمان (٧٩).

[3] السياسة المالية لعثمان (٧٩).

[4] السياسة المالية لعثمان (ص٨١).

٣ـ دروستکردنی چێشتو نان لەخێراتی زەکات بۆ هەژارانو میوانەکانو ڕێبوارەکان.

ئیمامی عوسمان سونەتێکی تازەی داهێنا هەستا خواردنو خواردنەوەی لەڕەمەزاندا لەمزگەوت دادەناو دەیفەرموو بەو کەسە خوداپەرستانەی کە لە مزگەوت دەمانەوە، بەو هەژارو میوانانەی خۆیان دەگرتو بە شەرم بوون، نان بخۆن[١].

ئیمامی عوسمان خەلیفەی موسڵمانان بەم شێوە لە بەیتولمال ڕێزی لەموسڵمانان دەناو چاوی لەپێغەمبەر ﷺ دەکرد، کە بەخشندەترین کەسبووە بە تایبەتی لەرەمەزاندا لەهەمووکات سەخی تر بووە، ئەم سوننەتە وای کرد لە موسڵمانان لە مزگەوت بمێننەوەو ئیعتیکاف بکەنو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زیندو بکەنەوە لە مانەوەدا، چونکە خواردنەکەیان مسۆگەر کرابوو[٢].

٤ـ دروستکردنی میوانخانە لە پارەی زەکات بۆ میوانداری

هەواڵ گەشت بە ئیمامی عوسمان کە ئەباسەماکی ئەسەدیو چەند کەسێکی ئەهلی کوفە بانگی جارچی خۆیانیان کردووە پێیان وتوون هەرکاتێ وەختی نانخواردن هات جاڕ بدەنو بڵێن " هەرکەس لەهۆزو تیرەکان کە هاتوونەتە شاری کوفەو خزمو مەنزڵی تێیدا نییە با بێت میوانی ئەباسەماك بێتو هەر لای ئەویش بمێنێتەوە"، ئیمامی عوسمانیش هەستا کۆمەڵێك میوانخانەی دروست کردو خەڵکی غەوارەو بێ ئەرجو دەهاتنە ناویو لەوێ دەمانەوە، یەك لەو تەلارانە شوقەکەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بوو لە هوزەیل، کاتێ پێشتریش کە میوانەکان لەمزگەوت جێیان تەنگ بوایە دەچوونەماڵەکەی ئیبن مەسعود لە هوزەیل[٣].

٥ـ لە پارەی بەیتولمال موچەی بەگشت کۆیلەکان دەدا.

لەسەر دەستی ئیمامی عوسمان ئازادکردنی کۆیلەکانی شاری کوفە بەرپابوو. عوسمان، لە هەر مانگێکدا (٣٠) کۆیلەی ڕزگار دەکردو ئازادی دەکردن بەبێ ئەوەی

---

[١] تاريخ الطبري (٥/٢٤٥).

[٢] السياسة المالية لعثمان (ص٨٢ ـ ٨٣).

[٣] تاريخ الطبري (٥/٢٧٣).

هیچ لەموچەو بژێوییان کەم بکاتەوە[1]، بەزۆری ئەو پارەیەی کە دابەشی دەکرد بەسەر کۆیلەکاندا لە زیادەی خێری زەکات بوو، بە ئیعتیباری ئەوەی کە پشکیان هەیە لە زەکاتدا، چونکە کۆیلە دەکەوێتە جوملەی هەشت تاقمەی ئایەتی زەکات خودای گەورە دەفەرموێت (وفي الرقاب)، هەر ئەم دەقەش بوو بەقاسەی رزگارکردنیان[2].

**سێیەم: پێنجیەکی دەستکەوتی غەزا**

جیهاد لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ دەستی پێکردووەو هەر بەردەوام بوو تا سەردەمی خەلیفەی سێیەم ئیمامی عوسمان، مەبەستو نیازەکەشی بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامو پەرەسەندنی خاکی وڵاتی ئیسلام بووە، بەتایبەت فتوحاتی سەردەمی ئیمامی عوسمان دەسکەوتی زۆرترو بێشومار بۆ بەیتولمال هەڵدراوەتەوە، پێنج یەکی دەسکەوتی غەزاکانیش دەدرێتە بەیتولمال، هەروەك سەرانەی ئەهلی کیتاب کە لە بارمتەی مانەوە لەسەر دینی خۆیانو پاراستنیان لە شەڕو قەیران دەیاندایە بەیتولمال. لێرەدا پەیوەندییەك لەنێوان فتوحاتی ئیسلامیو بەیتولمالدا هەست پێ دەکەین، بەیتولمال لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا هەڵدەستا بە پارە خەرجکردن بۆ فتوحاتو موچەی دەدا بە لەشکرەکان بە گوێرەی پلەی سەربازییانو چەکو چۆڵی بۆ دەسەندن، ئەوانیش سەروماڵو گیانیان دەکردە قوربانی، هەرکات سەرکەوتن بهاتایەتە ئاراوە پێویست بوو لەسەری ئەو ئەهلی کیتابانەی موسڵمان نابن سەرانە بدەنو موڵکانەی زەویو زاریان بدەن، ئەوانەش کە موسڵمان دەبوون زەکات دەیگرتنەوە گەر سامانەکەیان بگەشتایە حەددی زەکاتو مەرجەکانی تیا بەدی بکرایە. ئاشکرایە ئیسلامەتی هیچ کەس دانابەسترێ هەتا زەکات نەدات گەر کەوتە بەر زەکاتدان، ئەم داهاتانەش هەمووی کەرەستەن بۆ خواستەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، خودای گەورەش دەستکەوتی غەزای حەڵاڵ کردووە بۆ موسڵمانان دابەشی پێنجی بکەن چواری بۆ جەنگاوەرانو یەکێکی بۆ بەیتولمال[3].

---

[1] المصدر نفسه (٢٧٥/٥).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص٨٤).

[3] السياسة المالية لعثمان (ص٨٥ ـ ٨٧).

هەندێ لەو بابەتانەی کە ئیمامی عوسمان هێنایە سیاسەتی جێبەجێ کردنی دارایی گشتییەوە لە بارەی پێنجیەکی غەنیمەوە.

١ـ لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا، منداڵان پشکیان نەبوو لە دەستکەوتی جیهاددا. لەتەمیمی کوڕی مەهرییەوە هاتوو دەڵێ "لەڕزگارکردنی دووەم جاری ئەسکەندەرییەدا بەشداریم کرد، بەڵام پشکیان نەدامێ هەتا خەریکبوو لە نێوان هۆزی منو قورەیشدا دەمەقاڵە ڕوویدات، هەندێ لە خەڵکەکە وتیان جواب بنێرن بۆ بوئەبوزەڕی غیفاریو عوقبەی کوڕی عامری جوهەنی هەردوکیان هاوەڵی پێغەمبەرن ﷺ، پرسیاریان لێ بکەن، ئایا منداڵ پشکی دەکەوێ یان نا؟ لە وەڵامدا وتیان: ئەگەر دەموچاویان موی لێدەرهاتبوو، واتە خەتیان دابوو ئەوا پشکیان بدەنێ، ئەوانیش دیقەتیان دام خەتم دابوو پشکیان پێدام[1]، کەواتە پشکی دەستکەوت (غەنیمە) نادرێت بە منداڵو ئافرەت بەڵکو شتێکی کەمیان دەدرێتێ بە بۆنەی هاوکاریو دەستوریان لە غەزادا هەر ئەم خاڵەش پیادە کراوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ[2].

٢ـ لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا وەکو سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کەرەستەی کوژراوو دەدرایە بکوژەکە، واتە دەی ماشییەوە. ماشینەوە یەعنی هەر موسڵمانێك کافرێکی بکوشتایە لەغەزادا هەموو کەلوپەلو وڵاخو کەرەسەکانی کوژراوەکەی دەدرایە بکوژەکەی، کاتی خۆیشی پێغەمبەر ﷺ ماشینەوەی بریارداوە بۆ بکوژەکەی، وەك ئەبی قەتادە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەتی کردووە، کە رۆژی حونەین فەرمویەتی "هەرکەس کافرێك بکوژێو بەڵگەی ئاشکرای هەبێ، ئەوە باکەلوپەلی کوژراوەکە بماشێتەوە"[3]، کەڵکی ئەم فەرمودەیە ئەوەیە کە ناکرێ بکوژ هیچ بماشێتەوە، هەتا بەڵگەی دروستی نەبێت کە ئەم کوشتویەتی[4]، تەنانەت ئەگەر دووکەس بۆ بە کێشەیانو هەردولا دەیان وت من کوشتومە، بۆ ئەوکەسەیە کە کوشتویەتی، لەدوای

---

[1] فتوحات المصر وأخبارها (ص١٢١).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص٩٣).

[3] بخاري ـ كتاب المغازي رقم ٤٣٢٢.

[4] السياسة المالية لعثمان (ص٩٢).

راپەڕینی شاری ئەسکەندەریە ئەم حاڵەتە ڕوویدا، کاتێ ڕۆمەکان هاتن بەسەر لەشکری (مەنویلی حەصا) چونە ناو ئەسکەندەریەوە، عەمر ڕێگەی بۆ چۆڵ کردن هەتا گەشتنە نزیکی، بەجارێك ئەهلی شار لێیان هاتنە دەستو خودای گەورەش خۆیانیدا بە گژ خۆیانداو لەئەسکەندەرییە دەرچوونو کەلوپەکی شارو شوێنەکانی تریان پێ بوو تاریان نان هەتا گەشتنە گوندێكو لایاندا دەستیان کرد بە ئارەق خواردنەوەو نانیان خواردو تالانی خۆیان کرد، عەمر ڕووبەڕویان نەبویەوە هەتا گەشتنە (نفیوس) لەوشکانیو لەدەریا جەنگا لەگەڵیدا، پاشان لە دەریا پەڕینەوە، ئەمانو ئەوان لەوبەری دەریا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوەو درێژەیان بەشەڕدا یەکێکیان ناوی بەتریق بوو لەسەر ئەسپێك بوو، تفەنێگی بەئالتون رووپۆشکراوی پێ بوو سنکی دەرپەڕاندو لەزەوی ڕۆمدابوو هاواری دەکرد کێ دێتە بەر بەرکانێ، پیاوێکی خەڵکی زوبید ناوی (حومل) بوو کونیەی (ئەبا مەزجەحی) هەبوو، هاتە مەیدانی کێبەرکێکەوەو ماوەیەکی زۆر شەڕیان کرد، پاشان بەتریق رمەکەی فڕەداو شمشێرێکی هەڵگرت حوملیش رمەکەی فڕێ داو شمشێری هەڵگرت، عەمر هاواری کرد ئەبا مەزجەح جوابی دایەوە، بەڵێ قوربان، خەڵکەکەش لەسەر کەناری نیل بوونو ریزیان بەستبوو ماوەیەك کێشەکێشیان کرد بە شمشێر، پاشان بەتریق هەڵمەتەی دایەو خۆی لادا پاشان (حومل) خەنجەرێك لە بندەستیدابوو دەریهێناو دای لەگەردن دوژمنەکەیو شادەماری ملی بڕیو خستیو کەوتە سەری، پاشان هەرچی کەلوپەلی هەبوو ماشییەوە بۆ خۆی پاشان حومل دوای چەند رۆژێك کۆچی دوایی کرد، ئینجا موسڵمانان زۆریان بۆ هێنان لە ئەسکەندەریە دەریان کردنو جارێکی تر خودای گەورە بۆی ڕزگارکردنەوە لە کۆتایشدا (مەنویلی حەصایش) کوژرا[1].

٣- بڕی دەستکەوتو پشکی بەیتولمال لە یەکێك لەفتوحاتەکانی عوسماندا

لە ریوایەتەکەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەسلەمەوە لە غەیری ئەویشەوە هاتووە دەڵێن "کاتێ لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی سەعددا ئەفریقامان رزگار کردو پێنجیەکی دەستکەوتەکەمان دانا بۆ بەیتولمالو لە نێوان خۆشماندا پشکی سوارەکان گەشتە سێ هەزار دینار، دوو هەزاری بۆ وڵاخەکەو هەزاریشی بۆ سوارەکە پیادەکانیش هەریەکەیان

---

[1] فتوحات المصر وأخبارها (ص١١٩ ـ ١٢٠).

هەزار دینار[1]، پاش کەمێك سەربازێکمان مرد ناوی (زاتولحەمام) بوو، وەکو میراتی هەزار دینارەکەیان بەخشی بە کەسوکارەکەی".

هەروەها لەریوایەتی عوسمانی کوڕی سالحدا هاتووە دەڵێت "سوپای عەبدوڵلای کوڕی سەعد ژمارەیان بیست هەزار جەنگاوەر بووە، وەك ئاشکرایە پێنج یەکی ڕەوانەی بەیتولمال کراوە، بە گوێرەی ئایەتی (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ..)، بە هەمان شێوە لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکردو عومەریشدا پێنج یەکی دەبەخشی بە ئالوبەیت‌و چوار پشکەکەی تری دەدا بە جەنگاوەران، هەر موجاهیدێك سێ هەزاری پێ دەدرا ئەگەر سواربوایە پیادەکانیش هەزار دینار ئەگەر بە گشتی پێنج یەك‌و چواربەشەکە بەسەریەکەوە حساب بکەین وەك لەدو ریوایەتەکەدا هاتووە بڕی دەستکەوتی ئەو ڕزگارکردنە دەگاتە (١٦) ملیۆن دینار بۆ سوارەکان، (٨) ملیۆن دینار بۆ پیاوەکان، کەواتە بڕی دەستکەوتەکە یەکسانە بە (٢٤) ملیۆن دینار ئەم ژمارەیە چوار بەشەکەیە لەگەڵ پێنج یەکەکەی بەیتولمالدا دەگاتە (٢٤) ملیۆن دینار[2].

٤ـ سەرفکردنی پێنجیەکی دەستکەوت بۆ بەرژەوەندیی گشتیی

پێنجیەکی دەستکەوتی غەزا بە گوێرەی دەقی ئایەت سەرف دەکرێت بۆ پێغەمبەر ﷺ و خزمە نزیکەکانی‌و هەتیوو داماوو ڕێبوارن. لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ پشکی پێغەمبەر ﷺ و خزمە نزیکەکانی ڕەوانەی بەیتولمال دەکرا بۆ ئەوەی سەرف بکرێت بۆ چەك‌و تەقەمەنی، ئیمامی عوسمان ئەم ڕایەی جێبەجێ دەکرد، پشکی پێغەمبەر ﷺ و خزمە نزیکەکانی سەرف دەکرد بۆ تفاق‌و کەسەرەی فتوحات، کە جیهاد لە سەردەمی ئەودا گەشتبووە لوتکە[3].

٥ـ سەرکەوتنی سیاسەتی دارایی لە هەرەوەزیکردنی فتوحاتدا

لە ناواخنی ئەو ململانێیەی ئیمامی عوسمان ڕووبەڕووی بوویەوە، هەندێ وڵاتی ڕزگارکراوی شکستیان خواردوو هەڵگەرابوونەوە، ئیمامی عوسمان بە چاکی توانی ئەو

---

[1] المصدر نفسه (ص١٢٥).

[2] السیاسة المالیة لعثمان (ص٩٥).

[3] السیاسة المالیة لعثمان (ص٩٧).

ولاّتانەی پەیمانیان شکاندووەو کۆتی بەڵێنەکانیان پساندووە، ناچاریان بکات بێنە هێڵ و مل بدەن بۆ حوکمەکەی، لە ژێر کاریگەری ئەم فتوحاتانەدا کە موسڵمانان بە دەستیان هێنا دەکرێت بڵێین پێکەوەنانی سیاسەتی گشتیی دارایی کە پابەندی رزگارکردنەکان بوو کارێکی گونجاوو پێویست بوو، چونکە غەزاکان پێویستیان بە هاوکاریو هەرەوەزی بوو تا بتوانێت ئامانجەکانی بەدی بێنێت، لەبەرامبەریشدا فتوحاتەکانیش قاسەی بەیتولمالیان دەبوژاندەوە بەسەرانەو موڵکانەو زەکاتو دەستکەوتی جەنگ.. هتد. دەبووە سەرچاوەی داهاتی بەیتومال[1].

**چوارەم: داهاتی گشتیی سەرانە لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا**

١- جێگیرکردنی رێورەسمی سەرانە لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا.

جێگیربوونی حوکمەکانی سەرانەو رێساو دەستوورەکەی لە سەردەمی ئیمامی عومەردا دەستی پێکراو لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا بە تەواوەتی کۆدەکرایەوەو خۆی سەرپەرشتی دەکردو لەسەر برەکەی رێکدەکەوت لەگەڵ ئەهلی کیتابدا، ولاّتیش بێدەنگ دەبوو لەو پەیمانو سوڵحەی کە پێشتر بەسترابووەوە دانیشی دەنا بە سوڵحە تازەکاندا لە بەرامبەریشدا دەوڵەت دەچووە بارمتەی ژیانو مافی ئەو کەسانەی سەرانە دەدەن هەتا ملکەچی سەرانە بن[2].

٢- چەند نموونەیەك لە داهاتی ئەو سەرانەیەی رەوانەی بەیتولمال دەکرا.

أ - وەلیدی کوری عەقەبە کاتێ والی کوفە بوو هەستا غەزای ئازەربایجانی کردو رزگاریی کردن، لەسەردەمی ئیمامی عوسمانداو لەگەڵ خەڵکەکەیدا لەسەر هەشت هەزار درهەم سوڵحی لەگەڵ کردن، کە لەدوای وەفاتی ئیمامی عومەر سەرانەکەیان گیردابوو بۆیە وەلیدیش بە لەشکرەوە چووە سەریانو ملکەچی کردنەوەو سەرانەیان دا[3].

ب - کاتێك ئیمامی عوسمان عەبدوڵلای کوری سەعدی ئاراستەی ئەفریقا کرد ئەوانیش سوڵحیان کرد لەگەڵ جەرجیر، هەزار هەزار دیناریان قەراردا یان پێنج سەد

---

[1] المصدر نفسه (ص٩٩).

[2] المصدر نفسه (ص١٠٣).

[3] تاريخ الطبري (٢٤٦/٥).

هەزار یان بیست هەزار، عەبدوڵڵای کوڕی سەعدیش لەسەر سێ سەد قینتار ئاڵتون سوڵحی لەگەل کردن، (لەوانەیە ئەم بڕە ئەوەندەی مەبلەغی یەکەم بێت)[1].

ج - سوڵحی قوبروسیش هەر بە سەرانە کرا کە حەوت ~~هەزار~~ سەد هەزار دینار بوو تەسلیمی دەستی موسڵمانان کرا[2].

د - سەعدی کوڕی سالح سوڵحی لەگەڵ ئەهلی نەجران، کرد هەندێ جار سەد هەزاریان دەدا دەیان وت بە ئەوەندە سوڵح دەکەین هەندێ جاری تر بە دووسەد هەزار، جاری واش هەبوو بە سێ سەد هەزار، هەر بەم جۆرە عەبدوڵڵای کوڕی عامر زاڵ بوو بەسەر نەیساربورداو لەوێشەوە چوو بۆ (سەرخەس بۆ ناو خەڵکی مرو) ناوبژیوانێکیان نارده لایان کە ئیبنو حاتەمی باهیلی بوو لەگەڵ مەرزەبانی مرو، لەسەر هەزار هەزار درهەم سوڵحیان کرد، رایەکی تر دەڵێت لەسەر شەست هەزار درهەم سوڵحیان کرد[3].

و - ئەحنەفی کوڕی قەیسیش چو بۆ (بەڵخ)و ئابلوقەی دان، خەڵکەکە هاتنو سوڵحیان کرد لەسەر چوارسەد هەزارو ئازادیان کردن، ئامۆزاکەی کە ئوسەیدی کوڕی موتەشەمیس بوو کردی بەسەروکاریان هەتا پارەی سوڵحەکەیان لێ بسێنێت[4].

٣- ئیمامی عوسمان نوسراوەکەی پێغەمبەری ﷺ بۆ خەڵکی نەجران جێبەجێ کرد. پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو لەسەر کۆمەڵێك مەرج کە دانران بۆ ئەهلی نەجرانو ئەوانیش مەرجیان دانا، ئەویش نووسراوێکی بۆ نووسینو مەرجەکانی تیا ڕۆشن کردبووەوە، سەرانەکەشی بۆ دیاری کردبوون، هەروەك ئیمامی ئەبوبەکر بە هەمان مەرجەکانی پێشووتر، نووسراوێکی بۆ نووسینو پاشانیش ئیمامی عومەریش سەرانەی لێوەرگرتنو لە نەجرانی یەمەن باری پێکردنو لە نەجرانی عێراق نیشتەجێی کردن، چونکە مەترسییان هەبوو بۆ سەر موسڵمانان[5].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٥٥).

[2] المصدر نفسه (٥/٢٦١).

[3] تاريخ الطبري (٥/٣١٨).

[4] تاريخ الطبري (٥/٣٠٧).

[5] الخراج لأبي يوسف (ص٧٤).

لەپاش سپاردنی ئیمامی عومەر، ئیمامی عوسمان نامەیەکی نووسی بۆ وەلیدی کوڕی عەقبە، کە وەکیلی بوو لە نەجران (بەناوی خودای دەهندەو دلۆڤان: لە بەندەی خوداوە ئیمامی عوسمان ئەمیری ئیمانداران بۆ وەلیدی کوڕی عەقبە، سەلام و عەلیکم، من ستایشی ئەو خودایە دەکەم کە جگە لەخۆی زیاتر خودایەکی تر نییە لە ئەرزو ئاسماندا، لەپاشان ئوسقوفو ئاقیبو سوراتی ئەهلی نەجران لەعێراق هاتوونەتە لام و سکالاًیان کردووەو مەرجەکانی ئیمامی عومەریان نیشان داوم، وادەزانم تەنگیان پێ هەڵچنراوە لە لایەن موسڵمانانەوە، من سی حوڵلە لەسەرانەکەیان دەشکێنم و لادەبەم لەبەر خاتری خودای گەورە، وەفادار دەبم بۆیان بەرامبەر ئەو زەویانەی کە ئیمامی عومەر پێیداون، لەباتی زەوییەکانی خۆیان لەیەمەن، تۆش چاوی خێرت لێیان بێت، ئەوانە ئەهلی زیمەن لەنێوان ئێمەو ئەواندا ئاشنایەتی هەیە، بڕوانە پەڕەی ئەو کیتابانەی کە ئیمامی عومەر بۆی نووسیون، چی تێدایە جێبەجێ بکەو حەقی خۆیان پێ بدە، وەسەلام)، ئەمە لە نیوەی کوڵە مانگی ساڵی بیستو حەوتی کۆچیدابوو[1].

لە نوسراوەکەی ئیمامی عوسماندا چەند کارێك فەرمانی پێ کرا.

أ ـ ئیمامی عوسمان بەرامبەر ئەو پەیمانەی کەدابووی بە پێغەمبەر ﷺ و هەردوو هاوەڵەکەی وەفای هەبوو، ئەمەش لە بەرنامەی ئیسلامەوە هەڵقوڵاوە، کە هەرکەس پەیمانێکی دا یان گفت دا دەبێت وەفای هەبێت بەرامبەری.

ب ـ ئیمامی عوسمان، سەرانەی لەسەر سووك کردن و ئەرزەکانی خۆیانی پێدانەوەو داوای کرد لەوەلیدی کوڕی عەقبە وەفای هەبێ بەرانبەر ئەو خاڵانەی کە لەنووسراوەکەی ئیمامی عومەردا هاتووەو چاوی خێرت لێیان بێت، چونکە ئەوانە ئەهلی زیمەن[2].

٤ـ تا ئەهلی کیتاب سەرانە بدەن لەئەستۆی موسڵماناندان.

دوای سەرکەوتنی عەمری کوڕی عاس لە ئەسکەندەرییە، خەڵکی شارەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بزانێت لەمیانەی شەڕدا تووشی چی هاتوون، خەڵکی

---

[1] السياسة المالية لعثمان (ص١٠٥).

[2] المصدر نفسه.

شارەکان هاتن بە تایبەت ئەوانەی کە لەسەر پەیمانی خۆیان مابوون، وتیان ئێمە لەسەر سولحی خۆمان ماوین، بەڵام ئەم حەرەسناکانەی (رۆم) داویانە بەسەرمانداو ئاژەڵو کەلوپەلیان فەرهود کردوین، وا ئێستاش واین لەژێر دەستی تۆدا بەخۆمانو سامانمانەوە، عەمری کوڕی عاس هەموو ئەو کەلوپەلو شمەکانەی بۆ گەڕاندنەوە کە دەیان بەڵگەیان لەسەری هەبوو ، هەندێکیشیان وتیان بە عەمری کوڕی عاس ڕەوا نییە بۆ تۆ ئەوەی بەسەرماندا هاتووە تۆش پێمان بکەیت، دەبێ ئێوەش شەڕمان لەسەر بکەن، چونکە ئێمە لە زیمەی ئێوەداینو پەیمانمان نەشکاندووە. تەماشا بکە دەستووری سەرانە چۆن مافیان تەرتیب دەکات کە موسڵمانان ناچار دەکات پەیوەست بنو لەبری سەرانەکەیان پارێزگاری ژیانیان بکەن، هەرچەند ئەهلی زیمە بەشداریی ئەرکی وڵاتی موسڵمانان ناکەن، واتە بۆ مافەکانی خۆیان سەرانە دەدەن، یەکێك لەمافەکانیان پارێزگاری کردنیانەو مافی چاودێری کردنیانە، بۆیە عەمری کوڕی عاس لەسەر ئەمانە بێدەنگ بوو ماڵو کەلوپەکەی بۆ گەڕاندنەوە[1].

٥- بەشداریی ئەهلی زیمە لە تەنگوچەڵەمە گشتییەکاندا لە سەردەمی ئیمامی عوسمان.

ئەوەی باسدەکرێ لەبارەی رزگارکردنی دووەم جاری ئەسکەندەرییەوە لەخەلافەتی ئیمامی عوسماندا لە بارەی سەرانەوە، ئەوەیە کە (صاحێب ئەخنا) کە ناوی (گالەمایە) هاتە لای عەمری کوڕی عاس وتی: پێم بڵێ هەر کەسێکمان چەندی سەرانەی دەکەوێتە سەر بۆ ئەوەی بیدات؟ عەمر وتی: ئێوە دەخیلەی ئێمەن، ئەگەر زۆرمان بۆهات زۆرتان بۆ دێنین، ئەگەر کارمان لەبەر بڕوات لەسەرتان سووك دەکەین (صاحێب ئەخنا) توڕە بوو چوو بۆ لای رۆمەکانو هێنانی بۆ سەر موسڵمانان، خودای گەورە شکاندنیو هەرەسی پێ هێنان، (صاحێب ئەخنا) ئەسیر کراو هێنایان بۆ لای عەمری کوڕی عاس، خەڵك وتیان بیکوژە، وتی: نەخێر نایکوژم، دەڵێن کاتێ هێنایان بۆ لای عەمر بە ڕووی خۆشو کراوەوە ڕوی تێکردو کەوایەکی ئەرخەوانی کردە بەریو پێی وت: ئەوەندەی خەڵکی سەرانەمان بۆ بێنەو بڕۆ، پاشان پێی وت ئەگەر ببرایەیت بۆ لای پادشای رۆم چی

---

[1] السياسة المالية لعثمان (ص١٠٦).

لیّ دەکردی؟ وتی: ئەگەر ببرایەم بۆ لای ئەو دەیکوشتم، پاشان وتی: هاوەڵەکانی منت کوشتووە کەچی من لێت دەبوورم[1]، ئەگەر قسەکانی عەمری کوڕی عاس شی بکەینەوە کە دەڵێت "ئێوە دەخیلەی ئێمەن، ئەگەر زۆرمان بۆ بێت زۆرتان بۆ دێنین، ئەگەر بارمان سوك بێت، بارتان سووك دەکەین"، کۆمەڵێك بەرنامەی سیاسییانەی دارایی هەڵدەهێنجین بە نیسبەت خەڵکی ناموسڵمانەوە لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا لەوانە:

أ ـ ئەهلی زیمە بەشی خۆیان هەیە لەبەیتولمالی موسڵمانان، بەرامبەر ئەو سەرانەیەی کە واسڵی دەکەن، ئەوانیش دەخیلەی بەیتولمالن.

ب ـ بەشی ئەهلی زیمە بە گوێرەی ئەو تەنگوچەڵەمەیە دەپێورێ کە تووشی وڵاتی ئیسلام دەبێت، ئەگەر ناڕەحەتییەکە گەورەبوو بڕی سەرانەکەش بەرز دەبێتەوە ئەگەر ناڕەحەتییەکان کەم بوو، بڕی سەرانەکەش کەم دەکات.

ج ـ گۆڕانکاری سەرانەدان لەگەڵ هەڵکشانو داشکانی سەختو دژواری حوکمدا، گرێدرابوو بە بەرنامەی بەشداریکردنی داراییەوە لەلایەن هاووڵاتیانی وڵاتەکەوە بەگوێرەی سەختیو دژوارییەکە، بە شێوەیەك هەرکەسێ بە ئەندازەی توانای خۆی بەشداری دەکردو بەپێی جۆری سەختیو دژوارییەکەش باجو سەرانە دادەنرا بە شێوەیەکی دادپەروەرانەو لەژێر سێبەری ئەو وەسیەتانەی کە پێغەمبەر ﷺ کردبووی دەربارەی ئەهلی زیمە کە هەڵسوکەوتان باش بێت لەگەڵیان[2].

**پێنجەم: داهاتی گشتیو موڵکانەی دەیەك لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا**

**١ـ موڵکانە**

لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا فتوحاتی ئیسلامی زۆرو فراوان بوو، لەئەنجامدا زەوییە کشتوکاڵییەکانی شارە ڕزگارکراوەکان کەوتنە ئامێزی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، ئیمامی عومەر بەدەست کەوتی (فەیئی) موسڵمانان حسابی دەکرد، ئەو ئەهلی کیتابانەی کە سوربوون لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە زەوییەکەی خۆی پێ دەدانەوەو دەیان کرد بە کشتوکاڵو ئیمامی عوسمانیش موڵکانەو زەکاتی لێ دەسەندنو دەیکردە

---

[1] فتوحالمصر ةأخبارها (ص١٠٢).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص١٠٧).

نێو بەیتولمالی موسڵمانانەوە، موڵکانەی زەوی ببوە سەرچاوەی داهاتی بەیتولمال بەهۆی درێژبوونەوەی فتوحاتی ئیسلامییەوە لەو سەردەمەدا[1].

**٢ـ دەیەکی بازرگانی**

دەستوری دەیەك لەسەردەمی فاروقدا دامەزراوەو لەسەردەمی عوسماندا ڕێساو بنەماکانی جێگیرکراوە. لەسەردەمی عوسماندا لە ئەنجامی گەورەبوونی ڕووبەری دەوڵەتی ئیسلامی بە هۆی فتوحاتەوە، دەیەك، داهاتی بەیتولمالی پێ زیاد کراو بە هۆی زۆربوونی سامانو دارایی لای زۆرینەی خەڵك بووە هۆی بەهێزبوونی هێزی کڕینو فرۆشتن بە تایبەت لەسالآنی سەرەتادا کە پێی دەوترێ سالآنی ئاسایشو ئارامی، زیادبوونی هێزی کڕینو فرۆشتن خواستی لەسەر شمەکەکان دروست کردو خواستەکانیش ڕێگەیان خۆش کرد بۆ چالاکبوونی هاتنە ناوەوەی شمەکەکان هەتا وای لێهات بکەوێتە ژێر بڕیاری دەیەکی بازرگانی، چونکە مەرجەکانی دەیەکی بازرگانی هاتە کایەوە، یەکێکی تر لەهۆکارەکانی بڕیاری دەیەکی بازرگانی بەرزبوونەوەی نرخ بوو، چونکە بەرزبوونەوەی نرخ سەردەکێشێت بۆ زیادکردنی قازانجو دەسهات، لەوکاتەشدا شمەکەکان بە پێی نرخەکانیان دیاری دەکرێن نەك بەپێی جۆرەکانیان[2].

**شەشەم: سیاسەتی ئیمامی عوسمان لە تاپۆکردنی زەویدا**

ئیمامی ئەبوبەکر، لەسەر سیاسەتی پێغەمبەر ﷺ دەچوو لە جێبەجێ کردنی تاپۆکردنی زەیدا، بە مەبەستی پاککردنەوەی زەویو دەرهێنانی، زوبێری کوڕی عەوام لەنێوان جۆرفو قەناتدا پارچەیەك زەوی مردوی بچڕیو پاکی کردەوە[3]، مەجاعی کوڕی مەرارەی حەنەفی زەوی خەزرەمەی پچڕیو چاکی کرد بۆ خۆیو ویستی زەویەکانیش پاککاتەوە، بەڵام خۆی لێ لادا، لەبەر نەیاریو نارەزایەتی ئیمامی عومەر هەروەها عوبەییینەی کوڕی حسنی فەزاریو ئەقرەعی کوڕی حابیس تەمیمی ویستیان پارچە زەویەك کرکو بێ کەڵك پاککەنەوەو دەری بهێنن، بەڵام وازیان لێ هێنا لەبەر

---

[1] المصدر نفسه (ص١١٣).

[2] المصدر نفسه (١٢٣).

[3] الطبقات الكبرى لابن سعد (٣/١٠٤).

بۆچوونەکەی ئیمامی عومەر، کە پێی وابوو ئەم جۆرە کەسانە تازە موسڵمان نین هەتا بەم زەویانە دڵنەوایی بکرێن، ئیمامی عومەر فەموی پێغەمبەر ﷺ دڵنەوایی خەڵکی دەکرد لەڕۆژێکدا ئیسلام لاواز بوو ئێستا خودای گەورە ئیسلامی سەربەرز کردەوە برۆن هەوڵی خۆتان بخەنە گەڕو کاری خۆتان بکەن، ئاشکرایە ناڕازییەکەی ئیمامی عومەر لەسەر تاپۆکردنی زەوی نەبوو، بەڵکو مەبەستی ڕێگری کردن لەوکەسانە بوو کە پێویستیان بە دڵنەوایی نییە، چونکە موسڵمانی پێشینن بە پێچەوانەوە بە مەبەستی چاککردنو دەرهێنانی پەرەی بە تاپۆ کردنو دابڕینی زەوی دەدا، چونکە لەسەر ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ دەچوون، تەنانەت پێغەمبەر بەئاشکرا ڕایگەیاند وتی "ئەی خەڵکینە هەر کەس زەوییەکی مردو زیندوو بکاتەوە دەردێت بە خۆی"[1]، هەرچەند چەندین قسەو قسەلۆك هەیە گوایە ئیمامی عومەر موڵکداریو تاپۆی زەوی تایبەتییەتی زەوی لابردەوەو نەیهێشتووە[2]، ڕیوایەتێکی لاوازیش هەیە لەمبارەیەوە کە ماوەی بۆ تاپۆکردنو موڵکداری داناوە ماوەکەشی سێ ساڵ بووە، بەڵام ئەوە سەلماوە کە ئیمامی عومەر زەوییەکی مردوی تاپۆ کردووە لەسەر خەوانی کوڕی جوبێرو هەموو زەوەییەکانی عەقیقی تاپۆ کردووە لەسەر زوبێری کوڕی عەوام، زەوی بەنبەعیشی داوە بە ئیمامی عەلی کە ئاوێکی فرەی لەبەر دەڕۆشت، ئیمامی عەلیش کردی بەوەقف بۆ هەژاران[3].

کاتێك ئیمامی عوسمان خەلافەتی گرتە دەست تاپۆ کردنو موڵکداری زەوی فراوان کرد بە تایبەت لە ناوچە ڕزگارکراوەکاندا، هەرچەندە زۆربەی موڵکدارەکان زەوییەکانی خۆیان بەجێ هێڵاو هەڵهاتن، دەوڵەتیش هەستا بە بەرهەمهێنانی زەوییە بورەکان، بڕێکیشی تاپۆکرد لەخەڵك بۆ ئەوەی بە بایەری نەمێنێتەوە[4]، ئیمامی ئەحمەد وای بۆ دەچێت زەوییە ڕەشەکانی تاپۆی کردبێت لەسەرخەڵك، بێگومان زەویە بورەکان زۆربەیان دەکەونە نێو زەویە ڕەشەکانەوە (نەکێڵراوەکان)،ساڵانە لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا

---

[1] عصر الخلافة الراشدة للعمری (ص٢٢٠).

[2] المصدر نفسه (٢٢٠).

[3] المصدر نفسه (٢٢٢).

[4] المصدر نفسه (٢٢٣).

ورده ورده موڵکانەی بایەرەکان بەرز بوویەوە لەنۆ ملیۆن درهەمەوە بۆ پەنجا ملیۆن درهەم، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتنی سیاسەتی ئیمامی عوسمان، سەرچاوەکان باسی لیستی ئەو ناوانە دەکەن کە ئیمامی عوسمان زەوی بۆ تاپۆ کردون، زۆربەیان قورەیشی نین،لەمەشەوە دەردەکەوێت کە تاپۆکردنی بەرفراوان کردووە ئەو کەسانەش سوودمەندبوونو زەویان وەرگرتووە. لەوانەش:

١- عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (زەوییەك لە نێوان روباری نیلو سەدادا).

٢- عەمماری کوڕی یاسر لە ئەسیتینیا.

٣- خەبابی کوڕی ئەرەتی تەمیمی لە سەعنەبی، گوندێکە لە سەواد.

٤- عەدی کوڕی خاتەمی تائی، لە (رەوحا) گوندێکە لە گوندەکانی بەغدا لای رووباری عەبەس.

٥- سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی زوهری قورەیشی لە گوندی (هورمز).

٦- زوبێری کوڕی عەوام لای بیری فارس.

٧- ئوسامەی کوڕی زەیدی کەلبی.

٨- سەعیدی کوڕی زەیدی عەدی قورەیش.

٩- جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی لای کەناری فورات.

١٠- ئیبنو هەبار.

١١- تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵای تەمیمی قورەیش لە (نەشاستیح).

١٢- وائیلی کوڕی حیجری خەزرەمی (زەوییەکانی تەوالی گوندی زەرارە لە کوفە).

١٣- خالیدی کوڕی عوتوفەی قەتاعی پارچە زەوییەك بوو لە حەمام ئەعیون لە کوفە.

١٤- ئەشعەسی کوڕی قەیسی کیندی زەوی (گیز ناباز) شوێنێکە لە نێوان کوفەو قادسیە.

١٥- ئەبومیربەدی حەنەفی (زەوییەك بوو لە هواز لەسەر روباری تیری).

١٦- نافیعی کوڕی حارسی کیندی سەقەفی (لە بەسرە).

١٧- ئەبو موسای ئەشعەری (لە حەمامی عەمرە).

١٨- عوسمانی کوڕی ئەبی عاصی سەقەفی (لە بەصرە).

دیاره ئاوارەبوونی خاوەن ئەم زەویانەو ڕەوکردنیان وەهای کردووە کە زەوییەکانیان حوکمی زەوی مردوی هەبێت، بۆیە ئیمامی عوسمانیش داویەتی بەو کەسانەو تاپۆی کردووە لەسەریان بۆ ئەوەی زیندووی بکەنەوەو مشوری بخۆن، مەعاویەی کوڕی سوفیانیش چەند پارچە زەوییەکی لەقەراغی شاری شام دابڕی‌و جیای کردەوە بۆ ئەوەی بیکاتە ئاوەدانی‌و سەنگەر بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی رۆم، هەروەها چەند پارچەیەکیشی دابڕی لە ئەنتاکیە بە ڕوخستەی ئیمامی عوسمان، هەندێکی تریش لە قەلیقلە، بەڵام تاپۆکردنی فەدەك بۆ مەروانی کوڕی حەکەم بە ڕێگەیەکی راستو دروست ریوایەت نەکراوە، دەشڵێن ئەو کەسەی فەدەکی تاپۆ کرد بۆ مەروان مەعاویەی ئەبوسوفیان بوو[1].

سیاسەتی ئیمامی عوسمان لە تاپۆکردنی زەویدا، دابینکردنی داهاتێك بوو بۆ بەیتولمال، موسڵمانانیش لەگەڵ موڵکانەکەشدا زەکاتیان دەدا بە بەیتولمال، گەر مەرجەکانی زەکاتی تیا بەدی بهاتایە ئیمامی عوسمان سەرکەوتوو بوو لەسیاسەتی تاپۆ کردنی زەویداو سەرچاوەی داهاتی دەوڵەتی لەجاران زیاترکرد، بە تایبەت لە موڵکەکانی عێراقداو دارایی ئەو زەویانە گەشتە پەنجا هەزار درهەم پاش ئەوەی لەسەردەمی عومەری فاروقدا (٩٠٠) هەزار بوو[2].

**حەوتەم: سیاسەتی ئیمامی عوسمان لە پاوەنکردنی زەویدا**

کۆمەڵێك زەوی هەبوون، عوسمان تایبەتی کردبوون بۆ لەوەڕاندنی ئەو وڵاخو وشترانەی کە لەژێر شوانکارەیی دەوڵەتدا بوون، هەر لەم میانەیەشدا هەمیشە بیری بەلای پاراستنی دۆڵی نەقیعەوە بوو، کە ئیمامی ئەبوبەکرو عومەر لە خەلافەتی خۆیاندا پاوەنیان کردبوو، هەروەك پێغەمبەر ﷺ پێشوتر قۆرخی کردبوو بۆ هێسترەکانی بەیتولمال[3]، ئەو دۆڵە درێژییەکەی هەشتا کلیۆمەتر بوو دەکەوێتە باکوری شاری مەدینە، لەبەر زۆربوونی ئەو وشترو وڵاخانەی کە لەجیهاددا کەوتبووە ژێر دەستی دەوڵەت، ناوچە پاوەنکراوەکانیش لەسەردەمی ئیمامی عومەردا زۆر زۆر بوون.

---

[1] عصر الخلافة الراشدة (ص٢٢٥).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص١١٨).

[3] سنن أبي داود ـ الألباني (٢/٥٩٥).

هەر بەم دەستووره زەوی ڕەبزەیان پاوەن کرد بۆ ئاژەڵەکانی زەکاتو (هەنا)ی خزمەتکاریان کردە سەرپەرشتیاریان، ئیمامی عوسمان وەسێتی پێکرد کە بۆ هەژاران دڵی فراوان بێتو بیانکاتە شوانو سەپانی ئەم ئاژەڵانە، هەروەها زەویەکی تری لە بەنی سەعلەب پاوەن کرد، هەرچەند زۆر پێویستیان پێی هەبوو، فەرموی ئەم زەویە زەوی خودای گەورەیە پاوەنیش دەکرێ بۆ ئاژەڵەکانی بەیتولمال کە هی خودای گەورەیە[1].

بە هۆی پەرسەندنی قەڵەمڕەویو خەلافەتو زیادبوونی فتوحاتەوە، ئیمامی عوسمان ڕێبازی پێشینانی خۆی پیادەکرد لە پاوەن کردنی زەویدا. زەویە پاوەنەکانیشی خستبووە خزمەتی خێرو خۆشی موسڵمانانەوە هەتا گەلو ڕەعیەتی زیاد دەبوو پاوەنیشی فراوان دەکرد، وەك وتراوە شتێك لەئەسڵدا بۆ ئاتاج حەڵاڵ بێت هەتا ئاتاجو پێویستیت زیاتر بێێت ئەو شتە زیاد بکەیت دروستە، کاتی خۆی ئیمامی ئەبوبەکرو عومەر پاوەنیان دەکرد کەس نکولی نەدەکرن، ئیمامی عوسمانیش پاوەنەکانی زۆر دەکرد لەبەر زۆری وشترو مەڕوو ماڵاتی زەکاتو هیچ کەس ڕەخنەی لێ نەدەگرتو بیانووی نەبوو، هەرچەندە لە لایەن شوانەکانەوە هەندێ گرفت هات ئاراوە، کەواتە ئەو پاوەن کردنەی ئیمامی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان کردویانە نکولی نەکرد بەرامبەریانو لەدژیان، خۆی لە خۆیدا ئیجماعی هاوەڵان دەگەیەنێت[2]، ئیبنو قودامەش لەمبارەیەوە باسی ئیجماعی کردووە.

**هەشتەم: جۆرەکانی خەرجی گشتی لە سەردەمی عوسماندا**

١ـ ئیمامی عوسمان لەبەیتولمالی موسڵمانان هیچ شتێکی وەرنەگرت، چونکە لە ناو هۆزی قورەیشدا ماڵو سامانی لە گشتیان زۆتر بووە، لە هەموویان گورجو گۆڵتر بوو لەبازرگانیداو خێرو سەدەقەی دەدا بە دەوروبەرەکەی لە ماڵی تایبەتی خۆی.

٢ـ موچەدان بە والییەکان بەپێی پلەکانیان لە بەیتولمال:

لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا خەلافەتی ئیسلامی دابەش کرابوو بۆ چەند ویلایەتێك، هەر ویلایەتێکیش والییەکی بۆ دانرابوو، بە گوێرەی پلەی خۆی موچەی پێ

---

[1] نظام الخلافة في الفكر الاسلامي، د. مصطفى حلمي (ص٧٨).

[2] نظام الأراض في صدر الدولة الاسلامية (ص١٦٩).

دەدراو کاروباری ویلایەتەکەش دەقاو دەق لەچوارچێوەی ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلامدا قەتیس کرابوو، ئەگەر خەلیفە نوێنەری نەناردایە بۆ داهاتی ویلایەتەکان، دەبو ئەهلی باجو دەرامەت چاودێری سەرچاوەکانی ویلایەت بکات، داهاتەکانیش سەرانەو موڵکانەو زەکاتو دەیەکی بازرگانیو.. هتد، بوو کە لە ئەنجامدا خەرج دەکرا بۆ کاروباری ویلایەتەکانو زیادەکەشی بۆ بەیتولمالی موسڵمانان لەمەدینە، ڕەوانە دەکرا تەنها زەکات نەبێت کە لەدەوڵەمەندەکان وەردەگیراو دەدرا بە هەژارەکانی ویلایەتەکە[1].

٣ـ موچەی سەربازەکان بە گوێرەی پلەوپایەیان.

بەیتولمال موچەی سەربازە موجاهیدەکانی بەپێی پلەکانیان دەداو لەدەستکەوتی جیهادیش پشکی دیاریکراوی دەدانیو بە هەمان شێوە سەربازی ویلایەتەکانیش موچەیان بۆ بڕابووەوە، بۆ نموونە ئیمامی عوسمان، نوسراوێکی نارد بۆ سەربازە موجاهیدەکانی میسرو بۆ عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی والی میسر نوسراوەکەشی ئەمەبوو "چاك دەزانم سەربازەکانی ئەسکەندەریە چۆنن ڕۆمەکان تا ئێستا دوچار پەیمانیان شکاندووە بەڕوویاندا، وریای ئەسکەندەریە بن زۆر بەتوندوتۆڵی ئاگاداری بن موچەو بژێوییان بە دڵی خۆیان بدەرێو ئیسراحەتیان پێ بدە، با واجبەکانیان لەشەش مانگ تێنەپەڕێ"[2].

٤ـ خەرجی گشتیی بۆ حەجکردن لەبەیتولمال

خەرجی گشتیی لەسەردەمی عوسماندا بۆ حاجیانو کڕینی پۆشاکی کەعبە لە قوماشو (قیبـاطي) قوماشێکە لە کەتان، چنراوی میسرە[3].

٥ـ بوجەی نۆژەنکردنەوەی بینای مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، ئیمامی عوسمان گفتوگۆی کرد لەگەڵ خەڵکدا لە سەرەتای خەلافەتیدا بۆ نۆژەنکردنو فراوانکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ کە تەنگو ترش بووبوو، بە تایبەتی لە نوێژی هەینیدا بە بۆنەی فتوحاتو زۆربوونی خەلافەتەوە جێگەی نەمابوو، شاری مەدینەش گەورەو

---

[1] السياسة المالية لعثمان (ص١٣٠).

[2] المصدر نفسه (١٤٠).

[3] المصدر نفسه (ص١٤٠ ـ ١٤١).

کەڵەکە بووە، یەکەمجار لەسەر روخانی مزگەوتو بەرین کردنی ئیمامی عوسمان نوێژی نیوەڕۆی کرد بۆ خەڵکی، پاشان چووە سەر مینبەرەکەو سوپاسو ستایشی خودای کردو پاشان فەرموی: "ئەی خەڵکینە من دەمەوێ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بروخێنمو گەورەی بکەم، شایەتم بیستومە لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو "هەرکەسێ مزگەوتێ دروست بکات خودای گەورە لە بەهەشتداماڵێکی بۆ دروست دەکات" پێش منیش پێشەواکانی تر لەم جۆرە کارەدا دەستپێشخەرییان کردووە، ئەم مزگەوتەیان زیادو فراوان کردووە، کە ئیمامی عومەرە، راوێژم بە ئەهلی رەئیش کردووە هەر هەموویان یەکدەنگو کۆکن لەسەر رووخاندنو نۆژەنکردنەوەو فراوانکردنی ئەم مزگەوتە"، خەڵکەکەش بە جارێ دەستخۆشییان لێ کردو دوعای خێریان بۆ کرد کە رۆژ بویەوە کرێکارەکانی بانگ کردو دەستی پێکردو خودی خۆشی لەگەڵیاندا بوو[١].

٦ـ لە بەیتولمال برێك پارەی تەرخان کرد بۆ فراوانکردنی مزگەوتی کەعبە.

مزگەوتی کەعبە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دروستکرابوو بەڵام بێ دەرفەت بوو پەنایەکی بەرتەسکی هەبوو خەڵکی نوێژیان تیا دەکرد، لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکردا مزگەوت هەروا مایەوە، لە سەردەمی ئیمامی عومەریشدا هەستا مزگەوتەکەی فراوان کردو برێك زەوی کڕی لەدەورەبەری کەعبەو پاکی کردەوەو خستیە سەری و کوڵە دیوارێکی کرد بە هەرچوارلایداو گڵۆپێکی رۆشنی تێ خست بۆ شەوانی نوێژخوێنەکان، بەڵام مزگەوتەکە لەچاو حاجییەکاندا تەسكو بەرتەنگ بوو بە تایبەت دوای فتوحاتی ئیسلامیو فراوانبوونی قەڵەمڕەوی خەلافەت، خەڵکی موسڵمان پۆل پۆل دەهاتنە کەعبە بۆ بەجێهینانی فەرزی حەج، دووبارە مزگەوت بەرتەسك بویەوە لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا، ئەویش هەستا بەخشتەکەی ئیمامی عومەر بڕکەیەك زەوی خستە سەریو کەعبەی بەرین کردو بە کوڵە دیوارێك چواردەوری گرت بە ئەندازەی بەرزی باڵای پیاوێك[٢]، هەر بەم شێوەیە والییەکان مزگەوتیان لەویلایەتەکانی خۆیاندا

---

١ البداية والنهاية (٧/٨٠).

٢ تاريخ الطبري (٥/٢٥٠).

فراوان دەکردو لەبەیتولمال مەسروفیان دەکێشا، بۆ نمونە مزگەوتی (ئەڕڕەحمە)یان دروستکردو مزگەوتی (ئیستەخر)یان دروست کرد لە فتوحاتی مەشریقدا[1].

٧- پارەدان بۆ دروستکردنی یەکەم پاپۆڕی دەریایی.

بەیتولمال پشکێکی تەرخان کرد بۆ دروستکردنی یەکەمین پاپۆڕی دەریایی لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا، لەمەولا باسی ئەو پاپۆڕە دەکەین چ رۆڵێکی هەبووە لە فتوحاتی ئیسلامیدا[2].

٨- پارەدان بۆ گۆڕینی کەنارێ لە شوعەیبەوە بۆ جددە

لە ساڵی (٢٦)ی کۆچی ئەهلی مەککە قسەیان کرد لەگەڵ ئیمامی عوسمان لە بارەی گۆڕینی دەشتو کەناری شوعەیبەوە کەنارێکی کۆنی مەککەیە لەسەردەمی نەفامییەوە بۆ کەناری جددە کە ئێستا هەیە، ئیمامی عوسمان چو بۆ جددەو شوێنەکەی بینیو فەرمانی کرد کەنارەکە بگۆڕن، هەتا چووە ناو دەریاکەو خۆی لێ شۆردو فەرموی ئەم ئاوە پیرۆزە هەمووتان بچنە ناویو مەلەی تیا بکەن، بەڵام با دەرپێ کورتتان لە پێدا بێت، پاشان بەرێگەی عەسەفاندا لە جددەوە دەرچو بەرەو مەدینە، خەڵکی لەو سەردەمەدا وازیان لە کەناری شوعەیبە هێنا، بەڵام کەناری جددە هەتا ئێستا بەردەوامەو بووەتە بەندەرێك بۆ مەککەی پیرۆز.

٩- پارەدان بۆ هەڵکەندنی بیر بۆ موسڵمانان لەبەیتولمال[3]

یەکێکی تر لەو ئیشانەی کە بەیتولمال پارەی بۆ سەرف دەکرد، لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا هەڵکەندنی بیر بوو بۆ موسڵمانان، لەمەدینە بیری ئەریسیانی هەڵکەند ساڵی (٣٠)ی کۆچی، کاتێك ئیمامی عوسمان لەسەر قەراغی بیرەکە دانیشتبوو، مستیلەکەی پێغەمبەر ﷺ لە پەنجەیدا بوو، داخرا لە پەنجەیو کەوتە ناو بیرەکەوە، هەرچی ئاوی تێدا بوو هەڵی گۆزی بەڵام نەیدۆزییەوە، پارەیەکی زۆری دانا بۆ هەرکەسێ بۆی بدۆزێتەوە، خەمو پەژایەکی زۆری بۆ هەڵکێشا، بەڵام نائومێد بوو مستیلەیەکی تری

---

[1] السياسة المالية لعثمان (ص١٤٧ ـ ١٤٨).

[2] المصدر نفسه (١٤٨).

[3] ذوالنورين عثمان بن عفان، محمد رشيد (ص٢٦).

بەوێنەی ئەو دروست کرد لە زیوو (محمد رسول الله)ی لێ هەڵکۆڵیو کردیە دەستی، هەتا شەهید کرا، هەر لە دەستیا بوو داینەکەند دواتر نازانرێت کێ بردی[1].

١٠ـ پارەسەرفکردن بۆ ئامانجە بەرزەکانی ئیسلام

لەوردەکاری خەرجییە گشتییەکانی بەیتولمال بەشێکی باش پارەی تەرخان کردووە، بۆ ئامانجە هەرە بەرزەکانی وڵاتی ئیسلام. سەرەڕای ئەو مەسروفاتەی بۆ بەڕێوەبردنی خەلافەتو بەرژەوەندیی گەل خەرج دەکرا، لە هەمان کاتدا پارە سەرف کراوە بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلام بۆ بەرزراگرتنی ناوی خودا، دوبارە پارە سەرف کراوە بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلام بۆ بەرزڕاگراتنی ناوی خوداوە پارە سەرف دەکرا بۆ دروستکردنی پاپۆڕو نۆژەنکردنەوەی فراوان کردنی کەعبەو ئاوەدانکردنەوەی کۆمەڵێ مزگەوتی تازەو موچەدان بە بانگۆێژەکانو والییەکانو دادوەرەکان و سەربازو پۆلیسەکانی خەلافەت، هەروەها بۆ قافڵەو کاروانی حاجیانو پۆشتەکردنەوەی مزگەوتی کەعبە، کە روگەی ئیسلامەو پارەی دەدا بۆ کەندنی بیرو بۆ نیشتەجێ بوانو ڕێبواران هەتا لێی بەهرەمەند بن، ئەم مەسروفاتە گشتییانەش لەداهاتی زەکاتو پێنج یەکی دەستکەوتی جەنگ دەردەهات، هەربەم دەستورە موچەی بڕیبووەو بۆ چینە لاوازەکانی کۆمەڵگا وەکو (هەژاران، بێنەوایان، هەتیوان، غەریبو ڕێبواران، کۆیلەکان)[2].

**نۆیەم: بەردەوامبوون لەسەر بەرنامەی بەخشیشو بەخشین**

درێژەدان بە نیزامی بەخشینو لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا بەردەوامبوو وەکو سەردەمی ئیمامی عومەر، زۆر بایەخی دەدا بەو کەسانەی کە دەستپێشخەرییان کردبوو لە موسڵمانبووونداو کردبووی بە بناغەیەك بۆ موچەو بەخشیشیان لەمبارەیەوە نووسی بۆ والییەکەی کوفەو فەرموی "دوای سوپاسی خودای گەورەو سەڵەوات لەسەر گیانی پێغەمبەر ﷺ، ئەو خەڵکەی کە زوتر موسڵمان بووەو دەست پێشخەرییان کردووەو بونەتە پێشینانی ئەم دینەو شارو شوێنەکانیان پێ رزگار کراوە ڕێزی تایبەتییان هەیە، وریایان بە ئەوانەی ئێستا بە هۆی ئەوانەوە هاتنە بەرهەمو

---

[1] البداية والنهاية (١٦١/٧).

[2] السياسة المالية لعثمان (ص١٥٠).

شوێنکەوتەی ئەوانن جگە لەو کەسانەی کە کەمتەرخەمییان کردووەو ئەرکی ئیسلامیان جێبەجێ نەکردووە، هەر یەکیان لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا دابنیێو بژێوی خۆیان بدەرێ بە گوێرەی نیسبی خۆیان، باش بزانە زانیاریت لە بارەی خەڵکەوە دەتگەیەنێتە دادپەروەری"[1].

کاتێ فتوحاتی ئیسلام بەرفراوان بوو سەرچاوەی دارایی خەلافەت زۆرو زەوەندبوو، ئەمە وای کرد ئیمامی عوسمان خەزێنەو گیرفانی بۆ دروست کردو بووە هۆی زیادکردنی موچەو بژێوی موجاهیدەکانو بۆ هەر یەکێکیان سەد درهەمی دەدایە، ئیمامی عوسمان یەکەمین خەلیفەیە بەخششو موچەی خەڵکی زیاد کردو بووە سوننەتێك بۆ خەلیفەکانی پاش خۆی[2].

حەسەن دەڵێ "شایەتی ئەوەم جارچەرێکی ئیمامی عوسمان جاڕی ئەدا ئەیوت: ئەی خەڵکینە وەرن جلو پۆشاکی خۆتان بەرن، خەڵکیش چون بەرگو پۆشاکیان هێنا، پاشان جاڕیداو وتی: خۆراکێکی بێشومار هەڵڕژابوو خێراتێکی فرەی کەڵەکە بوو هەڵدرابووەوە، هیچ موسڵمانێ لەو خەلافەتەدا نەئەترسا لە موسڵمانێکی تر، چونکە ئیمامی عوسمان داڵدەدەرو سەرخەری خەڵك بوو، زۆر گرنگی دەدا بە پاسەوانیو چاودێری فەرمانی دەکرد بەسەر لەشکرەکان، موچەو خۆراكو ڕێزلێنان بدەن بە موجاهیدە ئێشکگرو پاسەوانەکان"[3].

**دەیەم: شوێنەراوی خەرمانی دارایی لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابووری**

لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا باجو دەرامەت زۆربوو، لەهەموو لایەکەوە ماڵو سامان دەهاتە بەردەستیان، ئەویش هەستا گەنجینەی بۆ دروست کرد، ئەم خەزێنەیە کاریگەری هەبوو لەسەر ڕەوتی کۆمەڵایەتیو ئابووری، لەئەبی ئیسحاقەوە هاتووە کە باوای داویەتی بە لای ئیمامی عوسماندا پێی فەرمووە یا شێخ چەند سەر خێزانی؟ ئەویش وتویەتی ئەوەندە کەسین، فەرمویەتی ئێمە بۆ تۆ پانزەمان داناوە یەعنی هەزارو پێنج سەد درهەم، بۆ منداڵەکانیش یەکی سەد درهەم.

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٨٠).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٤٥).

[3] فتوح مصر (ص١٩٢).

له موحه‌مه‌دی کوڕی هیلالی مه‌دینییه‌وه هاتووه ده‌ڵێ "باوکم بۆی باسکردم ئه‌ویش له‌نه‌نکمه‌وه وه‌ری گرتبوو که نه‌نکم هاتۆچۆی ماڵی ئیمامی عوسمانی ده‌کرد، ماوه‌یه‌ك نه‌نکم نه‌چوو بۆ ماڵی ئیمامی عوسمان، وتبووی به خێزانه‌که‌ی، ئه‌رێ فلان که‌س دیار نییه، خێزانه‌که‌شی وتبووی ئه‌مشه‌و کوڕێکی بووه، نه‌نکم ده‌ڵێ په‌نجا درهه‌م‌و شه‌قیقه‌یه‌کی بۆ ناردم (جل‌و به‌رگی منداڵانه)، فه‌رمووی ئه‌مه به‌خششی منداڵه‌که‌ته‌و ئه‌وه‌ش جل‌و به‌رگیه‌تی، که ساڵی تێپه‌ڕاند به شه‌که‌ی ده‌که‌ین به‌سه‌د درهه‌م[1]، وه‌کو ئه‌و ژن‌و منداڵانه‌ی له مه‌دینه‌دا موچه‌و پۆشاکمان بۆ دابین کردوون"[2].

کاتێ موگینی کوڕی عه‌مری هیلالی که سه‌ر له‌شکربوو هه‌ستا به موچه‌دان بۆ ئه‌و سوپایه‌ی که هاوده‌ستی‌و هاوڕێ بوون ژماره‌شیان چوار هه‌زار سه‌رباز بوو، بۆ هه‌ریه‌که‌یان چوار هه‌زار درهه‌می پێدان وه‌کو هاندان‌و ده‌ستخۆشی کردنیان، عه‌بدوڵڵای کوڕی عامر که والی به‌صره بوو، ئه‌م بڕه پاره‌یه‌ی به زۆر زانی بۆیه هه‌واڵی گه‌یانده ئیمامی عوسمان، ئه‌ویش ڕێگه‌ی داو پێی خۆشبوو، وتی: "هه‌ر کۆمه‌کێ له پێناوی خوای گه‌وره‌دا بێت دروسته‌و باشه"[3].

ئیمامی عوسمان هه‌ستا موچه‌ی موجاهیده شه‌هیده‌کانی کرده میراتی شه‌هیدانه، بۆ کچ‌و خێزانه‌کانیان، زوبێری کوڕی عه‌وام وتی به ئیمامی عوسمان عه‌بدوڵڵای کوڕی مه‌سعود شه‌هید بووه، موچه‌که‌یم بده‌رێ بۆ منداڵه‌کانی، ئه‌وان پێویستیان به به‌یتولماله‌و ئاتاجن پێی ئه‌ویش پانزه هه‌زاری پێدا، له‌گه‌ل ئه‌م کاره‌شدا بزووتنه‌وه‌ی کشتوکاڵی‌و پیشه‌سازی له‌م سه‌رده‌مه‌داچوست‌و چالاك بوو به هۆی ئه‌و نازو نیعمه‌ته زۆره‌ی که خودای گه‌وره ڕشتبووی به‌سه‌ر موسڵماناندا له‌ئه‌نجامی فتوحاتی وڵاتانی تر، موسڵمانان به گشتی‌و شاری مه‌دینه به تایبه‌تی خۆشگوزه‌رانی‌و ئاوه‌دانییان تێکه‌وتبوو باج‌و ده‌رامه‌تێکی نه‌ختینه‌ی شاره‌کانی به‌رکه‌وتبوو که نیوه‌دوورگه‌ی عه‌ره‌بی پێشتر به خۆیه‌وه نه‌یدیبوو، له‌مه‌ش زیاتر موسڵمانان ده‌رکیان به ژیارو

---

[1] الادارة العكرية (٢/٧٦٨).

[2] الطبقات (٣/٢٩٨).

[3] الاوائل للعكرية (٢/٢٦، ٢٧).

شارستانییەتی گەلانی تر کردووە، ئەندازەیەکی باشیان لێ قۆستەوە بە تایبەت لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا بە شێوەیەکی تێرو تەسەل وەریان گرت، تەنانەت هەندێ لە هاوەڵان کۆشكو هەوارگەی گەورەیان دروست کرد، ئەو کەسانەش کە ماندوبوون لەبنیاتنانی ژیانی کۆمەڵایەتیو ئابووری وڵاتی ئیسلامدا پشکیان هەبوو لە داهاتی بوجەی ئیسلامدا[1].

## یازدەیەم: ئیمامی عوسمانو بەخششی بەیتولمال و کەسوکارەکەی

لەلایەن بێ سەرو بەرەکانەوە بە تایبەت خەواریجەکان، ئیمامی عوسمان بەوە تۆمەتبار دەکرا کە لە بەیتولمال زیادەڕوی دەکاتو زۆربەی هەرە زۆری بە خزمەکانی دەدات، ئەم تۆمەتە بوو بە هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەو بەسەرۆکایەتی سەبەئیو شیعە رافزیەکان کە دوژمنی ئیمامی عوسمان بوون پشتگیری لێ کراو بە شێنەیی ئەم تۆمەتە دزەی کردە ناو مێژووی ئیسلامو هەرچەند قسەیەکی بێ سەروبەرو درۆیە هەندێ لە مێژوونووسانو بیرمەندان بە ڕاست وەریان گرتووە. چونکە شەڕی واتە وات بوو دژی ئیمامی عوەسمان ئەوەی کە چەسپاوە دەربارەی موچەو بەخششی عوسمان بۆ خزمەکانی ئەم کارانەیە کە بە (پیاوچاکی دەژمێرێ نەك بەگزی کاری).

١ـ ئیمامی عوسمان سەرمایەو سامانێکی بێ شوماری هەبوو کردبوویە ئامرازی شیرازەی خزمایەتیو کەسوکارەکەی پێ دەحەساندەوەو خەڵاتی جۆراو جۆری دەدانێ، بەڵام خراپەکێڵەکان رقیان لێ هەڵدەگرتو بوهتانیان بۆ دەکردو دەیان وت: گشت پارەی بەیتولمال تەخشانو پەخشان پێدەکات، ئیمامی عوسمانیش لە هەڵوێستێکدا وەڵامی دانەوەو وتی "من کەسوکاری خۆمم خۆش دەوێتو خەڵاتیان دەکەم، خۆشەویستی من بۆ خزمانم هەرگیز وام لێناکات، هاوسۆزیان بم لە زوڵمداو دەمارگیریم بۆیان بەڵکو من ئەو مافانەیان دەگرمە ئەستۆ کە دەکەوێتە سەرم.. بەخششو موچەکەیشم لەماڵی حەڵاڵی خۆم دەردەکەم ئەیاندەمیو ماڵو سامانی هیچ موسڵمانێ بۆ خۆمو کەسوکارم بە حەڵاڵ نازانم، هەروەکو جاران خەڵاتو بەخششی عەنتیکە لە سەروەتی ئارەقی نێوچاوانم دەبەخشم بە خزمانم وەك لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەکرو عومەردا

---

[1] الحظارة العربية الأسلامية، د. وضاح الحمد (ص١١٤).

کردومە، من ئەمڕۆ لەچاو جاراندا رەزیلو بەرچاوتەنگم، ئەتانەویٚ بەسەر تەمەنیاندا تێپەڕمو تەمەنم بەسەر بچیٚو ماڵو دارایی خۆم بەجیٚ بێڵمو بەشی خزمانی لیٚ نەدەم؟)[1].

لارو لاسارەکان هەرچی بزانن لەتۆمەتو بوهتان وتیانو کردیان، بە ڕاستی ئیمامی عوسمان زەویو سامانی خۆی دابەشدەکرد بەسەر بەنی ئومیەو سەرەتا لە نەوەکانی ئەبی عاصەوە دەستی پیٚ دەکردو یەکی دە هەزاری پیٚدان، پاشان دەیدا بە پیاوەکانی خێڵی حەکەم ئەمانە سەد هەزاریان بەرکەوت، پاشان دەیدا بە نەوەکانی خۆیو بەشی بەنی عاصو بەنی عەیصو بەنی حەربی دیاری کردبوو[2]، ئەم دەقانەو غەیری ئەمانەش لەو قسانەی کە ڕاستو دروستن لە باسی فەزڵی تێروپڕی ئیمامی عوسماندا بەڵگەن، بەرپەرچدانەوەی ئەو واتە واتەی هەڵدەبەسترا، گوایە لەبەیتولمال ئیسرافی کردووەو زۆری بۆ خۆیو خزمەکانی خەرج کردووەو کۆشکی پیٚ دروست کردووە ئەمانە هەموویان حیکایەتی بیٚ رەشمەو لەقاون ئەو کەسەی بۆی هەڵبەستووە زۆریشی بۆ هەڵڕشتووە، ئاشکرایە ئیمامی عوسمان بەریو خاوێنە لەو تۆمەتانەی دەیدەنە پاڵی، ئیبنو تەیمیە دەفەمویٚ "بەشی خزمدان لای هەندیٚ لەشەرعزانەکان کارێکی پەسەندەو بە باشی دەزانن، چونکە کەسوکاری ئیمامن وەك حەسەنو ئەبوسەور وتویانە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ بەشی خزمەکانی خۆی دەدا بە حوکمی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ حاکمی وڵاتەو خزمەکانی خاوەن ڕێزو حورمەت بوون، لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺو لە دوای وەفات کردنیشی هەر بە ڕێزبوون، لای خەلیفەکانی پاش خۆی، چونکە سەرخستنی خەلیفەو خۆکردنە قوربانی دەسەڵاتی زیاترو زیاتر کەسوکارەکەی دەیکات هەتا خەڵکی تر".

ئیبن تەیمیە دەڵیٚ "تێکڕای ئەوانەی فەرمانڕەوییان کردووە دوای ئیمامی عومەر هەندیٚ لەخزمانی خۆیان خەڵات کردووە یان بە پلەو پایە یان بە ماڵو سامان". دەڵیٚ "ئەوەی کە ئیمامی عوسمان دەیبەخشی لە ماڵو دارایی لە ڕوانگەی سیٚ هۆکارەوە بوو، یەکەم خۆی کرێکاری بەیتولمال بوو، کرێکاریش هەرچەند دەوڵەمەند بێت بەشی خۆی

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٥٦).

[2] المصدر نفسه (٥/٣٥٦).

هەر دەكەویٚ، دووەم خزمی نزیكی ئیمامی خەلافەت بوون، سێیەم خزمانی ئیمامی عوسمان زۆرو فرەبوون، وەكو هۆزی ئەبوبەكرو عومەر كەم نەبوون بۆیە دەبوو موچەو دەسەلاٚتیان بداتیٚ لەوان زیاتر، ئەگەر ئیمامی عوسمان كاری واشی كردبێت بەلٚگەی دروستی خۆی هەیە"[1].

٢- لە مێژووی تەبەریدا هاتووە، كە ئیمامی عوسمان فەرمانیداوە عەبدوللاٚی كوڕی سەعدی كوڕی ئەبی سەرح لە میسر بگەڕێتەوەو بچیٚ بۆ رزگاركردنی تونس، پێیٚ فەرموو ئەگەر خودای گەورە لە سەر دەستی تۆ ئەفریقای رزگار كرد هەرچی دەستكەوتتان هەبوو یەك لە پێنجی دیاری بێت بۆ تۆ، ئەویش بە خۆیو سوپاكەیەوە دەرچوو تا خاكی میسریان بڕیو دزەیان كردە خاكی ئەفریقاو رزگاریان كرد بە دەشتو چیاوە، دەستكەوتەكەیان دابەش كرد بەسەر موجاهیدەكانداو یەك لەپێنجیان دا بە عەبدوللاٚو چوار لە پێنجی نارد بۆ ئیمامی عوسمان بە (ئیبنو وەتیمە نەزریدا)، كەسێكی تری لەگەلٚدا بوو كە گەیشتنە لای ئیمام شكاتی كرد لە عەبدوللاٚ كە ئەوەندەو ئەوەندەی بردووە بۆ خۆی ئەویش پێی وتن "من خۆم پێمداوە ئەگەر پێتان ناخۆشە دەیگەڕێنمەوە، وتیان پێمان ناخۆشە ئیمامی عوسمان فەرمانی كرد بە عەبدوللا بیگەڕێنێتەوە بۆیان ئەویش گەڕاندیەوە"[2]، لە سونەتدا هاتووە دیاریو خەلاٚت بۆ ئەو كەسانەی كە ماندوو شەكەت دەبنو ناسۆری دەچێژن لە تێكۆشاندا دروستە[3].

٣- هەندیٚ لە پێنج یەكو مەڕو مالاٚت مایەوە لە رزگاركردنی ئەفریقادا، ئەو كەلوپەلانە بە نارەحەت دەگوازرایەوە بۆ شاری مەدینە بۆیە مەروان بەسەد هەزار درهەم كڕی بە پارەی كاش، بەلاٚم هەندیٚ هەر مایەوە، مەروان بەر لەگشتی ڕۆشت مژدەی رزگاركردنی دا بە ئیمامی عوسمانو ئەوكات موسلٚمانان لەكاتێكی زۆر ناسكو ترسو دلٚەڕاوێدا بوون، ئاخۆ غەزای ئەفریقا چۆن دەبیٚ، ئیمامی عوسمان ئەو بەشە كەلوپەلانەی كە مابوو بەمژدانە بەخشی بە مەروان، كەواتە ئیمام بۆی هەیە مژدانەی مژدەهێن بدات

---

[1] منهاج السنة (٣/١٨٧، ١٨٨).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٥٣).

[3] فصل الخطاب في مواقف الأصحاب (ص٨٤).

بە ئەندازەی ماندووبوونو جۆری مژدەکە، تەنیا ئەم جۆرە بەخششانە راستە لەسیرەی ئیمامی عوسماندا بە تایبەت بۆ مەروان ئەوەی کە دەڵێن پێنجیەکی ئەفریقای داوە بە مەروان درۆیە[1]، بەڵێ ئیمامی عوسمان سۆزو بەزەیی زۆر بووە بۆ کەسوکاری، بەڵام وای لێ نەکردووە گزی بکاتو حەرام خۆریو گەندەڵی بکات، هەر لەبارەی داراییەوە جگە لەم قسەیەش چەندەها درۆی شاخدارو پڕوپوچیان خزاندووەتە پەرتوکە مێژووییەکانەوە هەمووشی دەست هەڵبەستی سەبەئیو شیعە رافزییەکانی لەپشتەوە بووە.

ژیاننامەی ئیمامی عوسمان سەبارەت بە خزمەکانی میهرەبان بووە، ئەو فەرموودەیەی خودای گەورەی جێبەجێ کردووە کە دەفەرموێت "..قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُ فِيهَا حُسْناً إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ) (الشورى: ٢٣). وەك دەفەرموێت (وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ)، هەروەها لاسایی پێغەمبەر ﷺ کردووەتەوەو سیرەی ئەو جێبەجێ کردووە هیچ کەسێکی تر ئەوەندەی عوسمان شارەزای ئاکارو گوفتاری پێغەمبەر ﷺ نەبووە، بۆیە زۆر تەمسیلی ئەوەی کردووە، هیچ کەسێ لە خەڵکی زەمانی خۆی بە ئەندازەی ئەو شارەزای فیقهو شەرع نەبووە، کە خزمان مافی چییان هەیە، ئیمامی عوسمان دیویەتی کەپێغەمبەر ﷺ بە شێکی وای دا بە عەباسی مامی بە هیچ کەسێکی تری نەدا، ئیمامی عەلی کە ئامۆزای بوو، کردی بە کاربەدەست، کەواتە دەبێ دەرس لە پێغەمبەر ﷺ وەربگرین، چونکە باشترین پێشەنگە بۆ سەرجەم موسڵمانان[2].

ئیبنو کەسیر دەڵێ "ئیمامی عوسمان پیاوێکی ئاکار بەرزو خاوەن شەرمێکی زۆر بووەو سەخییەکی بە لێشاوبوو لەبەر خاتری خودای گەورە سۆزی خزمایەتی زۆر بووەو هەمووجارێ بەشی داون بۆ ئەوەی بەلەزەتی ئەم دونیا ڕەوتە نییە دڵیان راگیر بکاتو مەیلیان بجۆشێ بۆ ژیانی قیامەتو ئەوەندە را نەکەن بە دوای دونیادا". هەروەك پێغەمبەر ﷺ بەشی خەڵکانێکی دەداو وازی لە کەسانێکی تر دەهێنا بە بۆنەی ئەو ئیمانە پتەوەی کە لەدڵنیاندا جێگیر بووە، بە هۆی ئەم ڕەوشتانەوە خەڵکانێك

---

[1] المصدر نفسه.

[2] البداية والنهاية (٧ /٢٠١).

ڕەخنەوگازندەیان دەگرتە ئیمامی عوسمان وەکو خەواریجەکان ڕەخنەیان گرت لە پێغەمبەر ﷺ[1].

لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە هاتووە دەڵێ "جارێکیان پێغەمبەر ﷺ لە جوعرازیە دەستکەوتی دابەش دەکرد، لە پڕێکدا پیاوێك پێی وت دادوەربە لەخودا بترسە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: قور بەسەرت گەر من دادوەر نەبم"[2]، لەسۆنگەی ئەم بەڵگانەوە ئیمامی عوسمان پاساوی خزمو دۆستەکەی خۆی دەهێنایەوەو ئەم وتەیەشی درکاند لای دەستەی راوێژکاران، وتی "هەواڵی خۆمو دەسەڵاتەکەمتان دەدەمێ هەردوو خەلیفەکەی پێش من لەخۆیانو کەسوکاریان دەبچڕی بۆ ڕەزامەندی خودای گەورەو، پێغەمبەریش ﷺ بەشی خزمەکانی دەدا، من خۆم لە ناو هۆزی عەیلەدا بووم بژێویتان نەبوو هەژار بوون دەستم لێ دڕیونەتەوەو شتێکی پێویستم داوە پێیان ئەگەر ئەزانن هەڵەم کردووە بێگەڕێننەوە"[3]، ئیبنو تەیمییە ڕەدی ئەوانە دەداتەوە کە ئیمامی عوسمان تۆمەتبار دەکەن، کە زیادەو بەخششی داوە بە کەسوکاری لەبەیتولمال، دەڵێ "وتویانە لەبەیتولمال سامانێکی زۆری بەخشیوە بە خزمانی تەنانەت چوارسەد هەزار دیناری داوە بە چوارکەسی قورەیش کە زاوای بوون، دە هەزار هەزاردیناری داوە بە مەروان، ئادەی بەڵگەیەکی ڕاستو دروست بێننو ڕاستییەکمان نیشان بدەن".

بەڵێ ئیمامی عوسمان بەخشندە بووە بۆ خزمو بیگانەو سەرجەم موسڵمانان، چاکەخواز بووە، بەڵام ئەم ژمارانە پێویستیان بە دەقێکی چەسپاو هەیە، پاشان دووبارە دەڵێ "ئەمانە درۆی ئاشکران، نە عوسمانو نە هیچ خەلیفەیەکی راشیدین ئەوەندە پارەیان نەداوە بە هیچ کەس"[4].

---

[1] المصدر نفسه.

[2] البخاري ـ كتاب فرض الخمس.

[3] الطبقات الكبرى (٣/٦٤).

[4] منهاج السنة (٣/١٩٠).

## باسی دووەم: دەزگای داوەری و هەندێ هەڵهێنجانی فیقهی

سەردەمی زێڕین نورەین بە درێژەپێدانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەژمێردرێ کە جێ نشینێکی هیممەت بەرزو درەوشاوە بووەو زۆر پابەندی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بووە، سەردەمی راشیدین سەردەمێکی گشتگیر بوو، بەڵام دامودەزگای دادوەری تایبەت بووە بە داوەرییانەی کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کراوە، لەگەڵ هەموو بەندو بڕگەکانیداو گشت رەهەندەکانی جێبەجێ کراوەو دەق و چەمکەکانی پیادە کراوە، گرنگی سەردەمی راشیدین لەرووی داوەرییەوە لەکارە بنەڕەتییەکاندا دەرکەوتوو بوو، وەکو:

١- پارێزگاری کردن لەو بەندو بڕگانەی کە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەرووی داوەرییەوە کاری پێ کراوەو شوێن پێ هەڵگریان بوو، پەیوەست بوو پێیانەوە.

٢- دانانی لیژنەیەکی داوەری بۆ پتەوکردنی پایەکانی خەلافەت کە وڵات فراوان بووەو رووبەڕی تازەگەری و نوێکاری جۆراو جۆر بۆتەوە[1].

ئیمامی عومەر بە یارمەتی خودای گەورەو بلیمەتی لەبن نەهاتوویی، توانی دەزگا دادوەرییەکانی خەلافەت گەشە پێ بدات و زیادی کات و رێساو بنەمای بۆ دابنێت، ئیمامی عوسمانیش سودی زۆری لێ وەرگرت لەدامەزراندنی دادوەرو دیاری کردنی موچەو پسپۆڕیان لەبوارە قەزاییەکانداو دەستنیشانکردنی دادوەرو ئەرکەکانی و ناوبردنی ئەو سەرچاوانەی قازی حوکمی پێدەکات بە پێی بەڵگەکان، وەکو چۆن پێشتر دەزگا دادوەرییەکانی سەردەمی ئەبوبەکرو عومەر هەڵسوکەوتیان دەکرد بۆ ئەم سەردەمە عوسمانییەش کەڵکی لێ وەردەگیرا، ئەو دەمەی ئیمامی عوسمان بو بە خەلیفەدادوەرەکانی مەدینە عەلی کوڕی ئەبی تالیب و زەیدی کوری سابت و سائیبی کوڕی زەیدە، هەندێ لە لێکۆڵەوەران دەڵێن ئیمامی عوسمان هیچ کێشەیەکی قەزایی فەرامۆش نەکردووەو نەیهێشتووە سەربەخۆ بێت بۆ هیچ قازییەك وەك سەردەمی ئیمامی عومەر وابوو بەڵکو بەتایبەت دەیڕوانییە کێشەکان و راوێژی تیا دەکرد لەگەڵ قازی و هاوەڵەکاندا ئەگەر هاوڕابونایە ئیمزای دەکرد، خۆ ئەگەر هاوڕا نەبوونایە بۆ

---

[1] تأريخ القضاء في الاسلام للزحيلي (ص٨٣ - ٨٤).

چوونەکەیانی موتاڵا دەکرد، پاشان فەرمانی دەرکرد بۆ کارەکە، وە هەر سێ قازییەکەی مەدینەی هێشتەوەو کردنی بەراوێژکاری یاسایی، هەر قەیرانێك بهاتایەتە پێش راوێژی بە خەڵکانی تریش دەکرد، هەندێك وا دەبینن دەقێکی راشکاو نییە کە ئیمامی عوسمان قازییەکانی مەدینەی ئازادکردبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە کردونی بە هاوکاری خۆیو دانیشی ناوە بە بڕیارە یاساییەکانی ئیمامی عومەردا، تەنیا چاوی خشاندووە بە کۆمەڵێ پرۆژە بڕیاردا بەراوێژی ئەوانی تر. ئیمامی بەیهەقی لە سووننەکەیدا هیناویەتی کە وەکیع لە بارەی قازییەکاندا لەعەبدولڕەحمانی کوڕی سەعدەوە وەری گرتووە دەڵێت "باپیرم بۆی باس کردم وتی: ئیمامی عوسمانم دیوە لەمزگەوتدا دوو ناکۆك هاتنە لای، فەرمووی بەیەکیان هەستە برۆ عەلیم بۆ بانگ بکە، بەوی تری وت هەستە برۆ بانگی تەلحەو زوبێرو عەبدروڕەحمانم بۆ بکە، هەموویان هاتنو فەرموی ئادەی سکاڵای خۆتان بکەن، پاشان گوێی لێ گرتن وتوێژی کرد لەگەل هاوەڵان، فەرموی راوێژ بکەن بە عەلی گەر حوکمەکە هاوسەنگی حوکمی عەلی بوایە خۆشی واژۆی دەکرد، گەر پێچەوانە بوایە تێڕامانی تیا دەکردو بە بێوەیی کۆتاییان پێ دەهێنا، نەبیستراوە کە عوسمان کرابێتە قازی مەدینە هەتا ئەو رۆژەی شەهید کراوە".

لەمێژووی تەبەریدا هاتووە لەباسی پۆلیسەکانی خەلافەتدا، کە زەیدی کوری سابیت قازییەك بووە لە قازییەکان، کەواتە زەیدی بە قازیەتی هێلاوەتەوە، مۆڵەتی یاسایی پێداوە کە داوەری کێشەکان بکات، بەپێی ئەم دەقەو دەقەکەی پێشوو دەتوانین پارسەنگی هەردووکیان بدەینەوە بەوەی ئیمامی عوسمان قازییەکانی مەدینەی لا نەبردوو بەرکەناری نەکردوون، هەندێ کێشەی هەرەمەزنی تایبەت کردبوو بە خۆیو ئەوانی تری کردبووە راوێژی ئەوان، وێڕای راوێژکردن بە هاوەڵانو خاوەن راکان[1]، هەر بەمشێوەیە داوەری دامەزراند بۆ هەرێمەکانی تریش بۆ نمونە کەعبی کوڕی سورەی کردە قازی بەصرە، هەندێ جاریش داوەری دەدایە دەستی والییەکان، کاتێك کەعبی لەسەر کار لابرد بە هەمان شێوە یەعلای کوڕی ئومەیەی کردە والیو قازی سەنعان. دەرکەوتووە هەندێ لە والییەکان خۆیان قازییان هەڵبژاردووە بۆ شارەکان، هەتا

[1] النضم الاسلامية (٣٧٨/١).

جەماوەریان پتر بووبێ قازیش زیادی کردووە، لە نووسینەکانی ئیمامی عوسماندا هاتووە نووسیویەتی بۆ والی شارەکانو ئەمیری موجاهیدان کە ئاتاجو کەلەبەری موسڵمانان پڕ بکەنەوە، لەمەوە بۆمان دەسەلمێ کە دانانی قازی مافێکی تایبەتی والییەکانەو بەکردەوەیش ئەنجامیان داوەو ئەو کەسانەیان دیاری کردووە کە سەلیقەی داوەری هەبوبێت، ئەو سەردەمە نامەگۆڕینەوە هەبووە لەنێوان قازییەکاندا بۆ چارەسەری کێشەکان، هەموویان لەگەڵ ئیمامی عوسماندا نامەگۆڕینەوەیان هەبووە وەکو خەلیفەی خەلافەت[1].

- ئیبنو عومەر دەستی لە داوەری هەڵدەگرێت کاتێ ئیمامی عوسمان پێی وت ببە قازی لە نێوان خەڵکدا، ئەویش لە وەڵامدا وتی: هەرگیز داوەری نێوان هیچ دوو کەسێ ناکەمو ئیمامەتی دوو پیاویش ناکەم، ئەی نەتبیستووە پێغەمبەر ﷺ چی فەرمووە، ئیمامی عوسمانیش چاوپۆشی لێکردو وتی: ئەم هەواڵە بەکەس نەدەیت[2].

- دروستکردنی خانەی داد بۆ داوەری کردن، هەندێ پەرتوکی مێژوویی باسی ئەوە دەکەن یەکێك لەشوێنەوارەکانی ئیمامی عوسمان دروستکردنی دادگایەك بوو بۆ داوەری کردن، لەو ریوایەتەدا دەرکەوتووە کە ئیبنو عەساکیر ریوایەتی کردووە لەئەبی صالحی خزمەتکاری عەباسەوە، دەڵێ: (عەباس ناردمی بۆ لای ئیمامی عوسمان بانگی بکەم کە چووم، لەخانەی دادگا بوەو خەریکی داوەری بوو)، بەپێی ئەم ریوایەتە ئیمامی عوسمان یەکەمین کەس بووە کە دادگای بۆ داوەری دروست کردووە، چونکە دوو خەلیفەکەی پێشوو لە مزگەوت دادەنیشتن بۆ داوەری کردن[3].

### ناودارترین قازییەکانی خیلافەتی ئیمامی عوسمان

١- زەیدی کوڕی سابیت لە شاری مەدینە.

٢- ئەبو دەردا لە دیمەشق.

٣- شورەیح لە کوفە.

---

[1] الولایة علی البلدان (٢/٩٢).

[2] مسند امام أحمد رقم (٤٧٥).

[3] أشهر شاهید الاسلام (٤/٧٤٠).

٤ـ ئەبو موسای ئەشعەری لە بەسرە لە پاڵ والییەتییەکەیدا.

٥ـ کەعبی کوڕی سورە لە بەسرە.

٦ـ ثومامە لە سەنعا.

٧ـ یەعلای کوڕی ئومەیە لە یەمەن.

٨ـ عوسمانی کوڕی قەیس لە میسر[١].

وێڕای ئەمانە خەلیفە عوسمان کۆمەڵێ حوکمی فیقهی لە بواری سزادا بەجێ هێشتووە، هەروەها لە بابەت تۆڵەکردنەوەو کەتندانو تەمیٚ کردنو کۆمەڵێ عیبادەتو مامەڵەی ڕۆژانە ڕای (فیقهی) خۆی بەجێهێشتووە، ئەمانە شوێنەوارێکی رونن لە فێرگە فقیهییەکاندا، ئەمانەش هەندێ لەو بڕیارو فەتوایانەیە لە بواری شەرعدا، کە ئیمامی عوسمان لەبارەیانەوە فەرمایشتی داوە:

**١ـ یەکەمین کێشەیەك هاتە ڕێگەی ئیمامی عوسمان کێشەی کوشتن بوو (قەتڵ)**

یەکەم کێشەیەك رووبەڕووی ئیمامی عوسمان بوویەوە مەسەلەی کوشتنی عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەر بوو، کە هێرشی کردبووە سەر کچەکەی ئەبی لوئلوئی بکوژی ئیمامی عومەرو ئەو کچەی کوشتبو، کابرای گاوریشی کوشتبو کە ناوی جوفەینەبووەو لەگەڵ هورمزان، واتە ئەم سیانەی کوشتووە، کە هەر سیانیان هاودەستو هاوڕای ئەبو لوئلوئی بکوژی ئیمامی عومەر بوون -خودا باشتردەزانێ- [٢].

ئیمامی عومەر فەرمانی کرد، عوبەیدوڵلا زیندانی بکەن هەتا خەلیفەی دوای خۆی دێت با ئەو حوکم بدات بەسەریا،لەدواییدا ئیمامی عوسمان کرا بە خەلیفە، یەکەم حوکمێ هاتە بەردەستی لە بارەی کوشتارەکەی عوبەیدوڵلاوە بوو (ئیمامی عەلی) وتی: ئەمە دادپەروەری نییە واز لە عوبەیدوڵلا بهێنرێت فەرمانی کرد بیکوژن، هەندێ لە موهاجیرین وتیان دوێنێ باوکی کوژراوە ئەمڕۆش کورەکەی بکوژن کارێکی دژوارە، عەمری کوڕی عاص وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران خودای گەورە تۆی لەم رووداوە پاراستووە لەسەردەمی تۆدا ڕوینەداوە تۆش خۆتی لێ دوورخەرەوە، ئیمامی عوسمان

---

[١] عصر الخلافة الراشدة (ص ١٥٩ ـ ١٦٠).

[٢] البداية والنهاية (٧/١٥٤).

هەستا لە ماڵو سامانی خۆی خوێنی کوژراوەکانی بژاردو کێشەکەی چارەسەر کرد، کوژراوەکانیش وارسیان نەبوو، بۆیە خوێنەکە درایە بەیتولمالو عوبەیدوڵڵای ئازاد کرد[1]، ڕیوایەتێك لەتەبەریدا هاتووە کە قومازبانی کوڕی هورمزان لە عوبەیدوڵڵا خۆش بووە، لە ئەبی مەنصورەوە هاتووە دەڵێ بیستم لە قوماز بان باسی کوشتنی باوکی دەکرد دەیوت کاتێ عەجەمەکان هاتنە شاری مەدینە هەندێکیان چونە پەنای عەرەبەکانو مانەوە لە مەدینە، جارێك ئەبا لوئلوئی فەیروزی دای بەلای باوکمدا خنجەرێکی دووسەرەی پێ بوو ڕاساندیەوە لە باوکم، باوکم وتی: لەم شارە ئارامەدا ئەم خنجەرەت بۆچییە؟ ئەویش وتی: خوم پێوە گرتووە لەو کاتەدا پیاوێکیش ئەم دیمەنەی بینی، پاشان کاتێ درا لە ئیمامی عومەر، پیاوەکە وتی: ئەم خنجەرەم بە هورمزانەوە دیوە، ئەو داویەتی بە فەیروزی، عوبەیدوڵڵاش ملی ناو چو هورمزانی باوکمی کوشت، کاتێ ئیمامی عوسمان خەلافەتی گرتە دەست بانگی کردمو لای خۆی داینام، پاشان وتی: کوڕی خۆم ئەمە باوکی تۆی کوشتووەو تۆش لەئێمە نزیکتری بۆ باوکت هەستە برۆ بیکوژە، من هەستامو هەموو خەڵکیش هاوڕای من بوون کەس نکولی نەدەکرد، تەنیا تکایان لێ دەکردمو داوای عەفویان لێ دەکردم، وتم: ئایا بۆ من نییە بیکوژم، وتیان: بەڵێ، هەموویان لۆمەی عوبەیدوڵلایان دەکرد، وتم: ئایا ڕێم لێدەگرن بیکوژم؟ وتیان: نەخێر، هەر سەرزەنشتیان دەکرد، پاشان عەفوم کردو وازم لێ هێنا، هەموویان بەجارێ هەڵیان گرتمو بەرزیان کردمەوە، بە کۆڵی هاوەڵەکان گەشتمەوە ماڵ[2]، هیچ دژایەتییەك نییە لە نێوان ئەم دوو ڕیوایەتەدا، واتە لە لایەن واریسەوە عەفو کراوەیان ئیمامی عوسمان خوێنەکەی داوە بە میراتگرەکانی خۆی قومازبات مافی تۆڵەسەندنی هەبوو، بەڵام هاوەڵەکان تکایان لێ کردو ئەویش قبوڵی کردو ئیمامی عوسمانیش خوێنەکەی بژارد، سەرەڕای ئەمەش خەلیفە، کە دەسەڵاتی یاسایی بەدەستە، عوبەیدوڵڵای عەفو کرد، بێگومان حوکمی خەلیفە دەخرێتە پێش حوکمی وارسەکان هەرچەند عوبەیدوڵڵا سەرپێچی خەلیفەی کردبوو، بەڵام خەلیفە عەفوی کردو

---

[1] المصدر نفسه (٧/١٥٤).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٤٣).

خوێنەکەی بۆ بژارد، ئەم کارە هەڵەی کە عوبەیدوڵڵا کردی بوو بە مایەی دروستکردنی کارێکی دژوار بۆ سەرشانی خەلافەت، دەبوو ئەو تۆڕە بدۆزرێتەوە، کە پەیوەندییان هەیە بە کوشتنی ئیمامی عومەرەوە لەودیو پەردەوە دەستیان هەیە لەم کارە دزێوەدا، واتە (شەهیدکردنی ئیمامی عومەر)، پاشان هاتنە سەر چارەسەرکردنی کوشتنی جوفەینەو کچەکەی ئەبا لوئلوئی مەجوسی قاتڵ، هیچکامیان وارسیان نەبوو بۆیە حوکم درایە دەستی خەلیفە، ئەویش لێبوردنی هەڵبژارد.

به گوێرەی ڕیوایەتو سەرچاوەمێژووییەکان ئەو خنجەرەی ئیمامی عومەری پێ شەهید کرا بە دەستی هورمزانو جوفەینەوە بینراوە، دوو هاوەڵ شایەتییان لەسەر ئەم حاڵەتە داوە (عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفو عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر) بوون ریوایەتەکەی عەبدولڕەحمانی ئەبوبەکر ئەوە دەگەیەنێ کە ئەبا لوئلوئی فەیروزی لەگەڵ ئەم دوو کەسەدا هەر چرپەچرپیان کردووەو دەڵێ "کاتێ من دام بەلایاندا ئەم خنجەرە لەبەینیاندا کەوتە خوارەوە لەدوای شەهیدکردنی ئیمامی عومەر سەیرەکەم هەر ئەو خنجەرەیە، کە من بینیم کەوتە خوارەوە، کەواتە هورمزانو جوفەینە شایانی کوشتن بوون، بەڵام کچەکەی ئەبالوئلوئە، بە هەڵە کوژرا عوبەیدوڵڵا وای دەزانی ئەم کچە دەستی لەم کارەدا هەیەو چەکی بۆ باوکی شاردووەتەوە، بێگومان کەس بە قەتڵی هەڵە ناکوژرێتەوە[1].

### ٢ـ کوشتنی دزو سەرسەرییەکان

هەندێ گەنجی خەڵکی کوفە لەویلایەتی وەلیدی کوڕی عەقبە نوکە رمیان دەدا لەئیبنو حوسەیمانی خوزاعیو زاماریان کردبوو کۆڵەواریان کردبوو، ئەویش بە شمشێرەکەی هەستاوەتەوە بۆیان کاتێ زانی زۆرن دەستی کردبوو بە هاتو هاوار ئەوانیش وتبوویان: بێدەنگبە بۆ ئەوە سیخوڕمەت لێ دەدەین، ترسی شەو لە گیانت دەربچێ، ئەبی سورەیحی خوزاعی هاتبوو بەسەر ئەم دۆخەداو سەیرەکا حوسەیمان هاوای دەکرد ئەوانیش لەداخا کوشتیان خەڵکی بەمەیان زانیو دەوریان دانو گرتنیان، سەیرکەن (زوهەیری کوڕی جوندوبی ئەزدیو موڕەعی ئەسەدیو شوبەیلی کوڕی ئەبی

---

[1] طبقات الکبری (٣/ ٣٥٠، ٣٥٥).

ئەزدیو کەسانێکی ترن ئەبی شورەیحو کوڕەکەی بونە شایەت بەسەریانەوە، بۆ چار ەسەری ئەم خوێنە وەلید نوسراوێکی نارد بۆ ئیمامی عوسمان ئەویش وتی: بیانکوژە، وەلیدیش لەبەر دەرگای کۆشکدا لەرەحەبە کوشتنی.

**٣ـ پیاوێك، بازرگانێکی کوشت بۆ ئەوەی ماڵەکەی ببات**

ئەمە لە خەلافەتی ئیمامی عوسماندا ڕویدا و تۆڵەکەیشی کوشتنەوەی بکوژەکە بوو لە بریدا[1].

**٤ـ سزای جادوگەر**

لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا کەنیزەکێکی حەفصەی دایکی موسڵمانان جادوی کردبوو لە حەفصەو دانی نا بە جادووەکەیدا، حەفصە فەرمانی کرد بە عەبدولڕەحمان کوڕی زەید بیکوژێ، ئەویش هەستا کوشتی، ئیمامی عوسمان نکولی کرد لەم کارە، ئیبنو عومەر وتی: بۆچی پێت ناخۆشەو لۆمەی دایکی ئیماندارن دەکەیت لەبەر خاتری ژنێکی جادو گەر، کە خۆشی ئیعترافی کردووە، پاشان ئیمامی عوسمان بێدەنگ بوو چیتر نکولی لە کارەکە نەکرد، بەڵام نکولی لەوە کرد، کە حەفسە مافی خەلیفەی پێشێل کردووە بە کەیفی خۆی سزای تاوانباری داوە، لەکاتێکدا سزادان تایبەتە بە ئیمامەوە، وتەکەی ئیبنو عومەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیمامی عوسمان نکولی نەکردووە، لە کارەکە، بەڵام نکولی لە بڕیارەکە کردووە، واتە حوکمەکە ڕاستەو گومانو تەڵخی تیا نییە[2].

**٥ـ تاوانی کوێر**

کوێر لەگەڵ چاوساغدا وەکو ئامێرێك وایە بە دەستی چاوساغەکەوە، چونکە بە قسەی ئەو دەجولێتەوەو بێئاگایە لە دەوروبەری خۆی، ئەگەر لە هەڵسوکەوتیدا زیانێکیدا، ناکرێ ئەو زیانەی پێ ببژێردرێ، چونکە نابینایە، کەواتە ئەگەر بکەوێت بەسەرکەسێکدا یان شتێکدا بەبێ مەبەستو ئاگاداری خۆی ئەوا تاوانەکەی قەرەبووی نییە، ئیمامی عوسمان دەفەرموێت: (هەرکەسێ لەگەڵ کوێرێکدا دابنیشێ یان نزیکی

---

[1] عصر الخلافة الراشدين (ص١٥٣).

[2] موسوعة فقه عثمان بن عفان، (ص١٦٩ ـ ١٧٠).

ببێتەوەو زیانێکی لێ بکەوێت لە لایەن کوێرەکەوە ئەوە قەرەبووی نییە)، خۆ ئەگەر دەستکێشە چاوساغەکە ئەو تاوانەی پێ ئەنجام بدات ئەوە دەستکێشەکە تاوانبارە[1].

### ٦ـ سزای دوو شەڕکەری یەکترکوژ

شەڕو مەرافەی نێوان چەند کەسێکی شەڕەنگێز کە پەلاماری یەکتر دەدەن هەر زیانێکی لێ کەوتەوە واجبە تۆڵەیان لێ بسێنرێ، چونکە تاوانی دەستئەنقەستەو هەر یەکەیان سوورە لەسەر لێدانو کوشتنی ئەوی تر، ئیمامی عوسمان دەڵێ: (ئەگەر دوو شەڕکەر بەگژ یەکدا هاتن هەر زامو زیانێك کەوتە نێوانیان تۆڵەی خۆی هەیەو دەبێ سزا وەربگرن)[2].

### ٧ـ ستەمکردن لە ئاژەڵان

ئەگەر ستەمکرا لە ئاژەڵێك پێویستە نرخی ئەو ئاژەڵە وەکو قەرەبوو بدرێ بە خاوەنەکەی، لە عوقبەی کوڕی عامرەوە هاتووە کە لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا کابرایەك سەگێکی راوەکی زۆر دڕی کوشت، هەشت سەد درهەمیان لێ سەند، ئیمامی عوسمان ناچاری کرد ئەو پارە بژاردنە بدات، پیاوێکی تر سەگێکی کوشتبوو بیست وشتریان لێ سەند لە باتییا[3].

### ٨ـ بەرپەرچدانەوەی چەتەو شەوکوت

ئەگەر کەسێ دەستدرێژی بکاتە سەرماڵو ناموسی کەسێك یان زیان بگەیەنێت بە ژیانو گیانی کەسێك، زوڵم لێکراویش لە گەرمەی تاوانەکەدا دەست بکاتەوەو بیکوژێ، ئەوە خوێنی ناکەوێتە سەرو خوێنی کوژراوەکە بە فیڕۆ دەچێت، لە پەرتوکی (موحەلای ئیبنو حەزمد)دا هاتووە: (پیاوێك کابرایەکی بینی لەگەڵ خێزانەکەیدا بە خراپی، دەستبەجێ کوشتی، سکاڵایان گەیاندە ئیمامی عوسمان ئەویش خوێنەکەی بەفیڕۆدا).

---

[1] المصدر نفسه (ص٩٩).

[2] المصدر نفسه (ص١٠٠).

[3] المصدر نفسه (١٠٢).

**٩ـ داری حەددان لەو هەڵگەڕاوانەی، کە پەشیمان دەبنەوە**[1]

داری حەدد نادرێ لە هەڵگەڕاوە هەتا سێ جار پەشیمان نەبێتەوە، خۆ ئەگەر هەر سووربوو لەسەر هەڵگەرانەوەکەی ئەوە دەکوژرێ، وەکو روویداوە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لە کوفە کۆمەڵێ پیاوی گرت کە لە ئیسلام هەڵگەرابوونەوەو قسەو باسەکانی موسەیلەمەی درۆزنیان دەڕازاندەوەو دەنرخاند، هەستا نوسراوێکی نارد بۆ ئەمیری ئیمانداران ئیمامی عوسمان، ئەویش فەرموی ئاینی ئیسلامو شایەتومانیان عەرز بکە، ئەگەر وەریان گرتو دووریان گرت لە موسەیلەمە مەیان کوژە، بە پێچەوانەوە بیان بیانکوژە، هەندێکیان ئیسلامیان قبوڵ کردو ئەوانی تر رەتیانکردەوەو موسەیلەمەیان سەردەخت، ئەویش کوشتنی.

**١٠ـ خەڵکم زۆر کوشتووە ئایا بۆم هەیە پەشیمان ببمەوە؟**

پیاوێك وتی: بە ئیمامی عوسمان ئەی ئەمیری ئیمانداران من خەڵکم کوشتووە ئایا بۆم هەیە پاشگەز ببمەوەو تەوبە بکەم؟ ئەویش سەرەتا ئەم سورەتەی خوێندەوە بەسەریا: (حم* تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ* غَافِرِ الذَّنبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ) (غافر: ١ ـ ٣).

پاشان پێی وت: عیبادەت بکەو نائومێد مەبە، شایانی باسە تەوبەکردن تاوانەکان لای خودا دەسڕێتەوە، بەڵام مافی کەسەکان هەر دەبێ بدرێتەوە بە خاوەنەکانیان یان گوزشتەی لێ بکەن[2].

**١١ـ داری حەدد لە مەیخۆرەکان**

وەك دەزانین پێغەمبەر ﷺ داری حەدی داوە لەو کەسەی، کە ئازادەو مەی دەخواتەوە، حەددەکەشی چل جەڵدە، لێدانەکەش بە نەعلو چمکی جلوبەگ دەبێت، بۆ سوکایەتی پێکردنی، ئەبوبەکریش هەروای کردووە، عومەریش لە سەرەتای خەلافەتدا هەر بەمشێوەیە بووە، پاشان زۆری پێنەچوو بە ڕاوێژی هاوەڵان ئیمامی عومەر کردی بە هەشتا جەڵد، چلی بۆ زیاد کرد، چونکە خەڵکی گاڵتەیان بە چل جەڵد دەهاتو لێی

---

[1] المصدر نفسه (ص١٣٠).

[2] المصدر نفسه (ص٩٣).

نەدەترسان، ئیمامی عوسمانیش هەندێ جار چل جەڵدی لێداون هەندێ جاریش هەشتا جەڵدی لێداون، ئەمەشی بە هەوانتە نەکردووە، بەڵکو لەرِقی ئارەقخۆرەکان کردوویەتی، بۆنموونە داری حەددی نەداوە لەو کەسانەی کە تێکەوتوونو هەڵەیان کردووە، بەڵام داری داوە لەو کەسانەی کە خوویان پێوە گرتووە، ئەوانەی هەڵەیان کردووە، چل جەڵدد بووە، بەڵام خوپێوەگرتووەکان هەشتا جەڵدد بووە، چلی یەکەم داری حەدد بووە، چلی دووەم تەمێکردن بووە[1].

**١٢- پیادەکردنی داری حەدد لەسەر برای دایکی خۆی (وەلیدی کوڕی عەقەبە)**

لە حوصەینی کوڕی مونزیرەوە هاتووە دەڵێ: لای عوسمان دانیشتبووم وەلیدیان هێنا دوو پیاو شایەتییان دا لەسەری، کە ئارەقی خواردووە، یەکیان (حمران) بوو، وتی: وەلید ئارەقی خواردووە، ئەوی تریان بینیبووی ڕشاوەتەوە، ئیمامی عوسمان فەرمووی: (کەسی ساغ نارِشێتەوە هەتا نەخواتەوە)،ئەی عەلی هەستە جەڵدی لێبدە، عەلی وتی: بە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر هەستە جەڵدی لێبدە، ئەویش جەڵدی لێداو ئیمامی عەلی دەیژمارد، هەتا گەشتە چل جەڵد، وتی: ڕایگرن، پێغەمبەر ﷺ چل جەڵدی داوە لە ئارەقخۆر، ئەبوبەکریش هەر چل جەڵدی بەکار هێناوە، بەڵام ئیمامی عومەر هەشتای بەکارهێناوە، هەمووشیان سوننەتە لای منیش ئەمەی خۆم پێ باشترە کەچل دارە[2].

لەم باسەدا ئەوە تێدەگەین داری حەدد لەسەر ئارەقخۆر بۆ تەمێ کردنو وازهێنانە بۆ ئەوەی کۆڵی لێبداتو خەڵکی تریش ترسیان وەبەر بێت، ئەوەش دەرکەوتووە کە ئیمامی عوسمان لە جێبەجێ کردنی تۆڵەو مافدا بەهێز بووەو گوێی نەداوەتە لۆمەی لۆمەکاران، وەلید برای دایکی خۆی بووە حوکمی شەرعی بەسەردا سەپاند ئەمەش باشترین کردەوەی کاربەدەستانە[3].

**١٣- دزی کردنی منداڵ**

سزای دەستبڕین لەسەر منداڵی دز، پیادە ناکرێ ئەگەر منداڵەکە باڵغو ژیرو ئازادو شارەزابە حەرامو حەلاڵ نەبووبێ، منداڵێکیان هێنا بۆ لای ئیمامی عوسمان دزی

---

[1] المصدر نفسه.

[2] شرح نوويي علما صحيح المسلم ـ كتاب الحدود (٢١٦/١١).

[3] ولاية الشرطة في الألام ـ د. نمر الحيداتي (ص١٠٥).

کردبوو، فەرمووی سەیری موی بەری بکەن ئەگەر موی لێ نەهاتبوو وازی لێ بێنن، لە ئەنجامدا بەریان داو دەستیان نەبڕی، چونکە مووی لێ نەهاتبوو[1].

### ١٤ـ زیندانی کردن بۆ تەمێخوازی

سەنابی کوڕی حارسی بورجەمی لەسەردەمی وەلیدی کوڕی عەقەبەدا لە تیرەی ئەنصاری سەگێکی بە ئەمانەت هێنابوو، پێیان دەوت (قەرحان)و ڕاوی بزنمژەی پێ دەکرد، لای خۆی قەتیسی کردوو نەیگەڕاندەوە بۆیان ئەنصارییەکان هۆتەرەیان کردە سەری‌و کردیانە گاڵەو لە دەستیان هەڵپڕوکاندو بردیانەوە، کابراش جنێوی پێدان‌و دایشۆرین، کاتی ئیمامی عوسمان بەمەی زانی ناردی بە شوێن صەنابداو بەلێدان تەمێی کردو زیندانی کرد، ئەم کابرایە وازی لە جنێودان نەهێنا بۆیە کردیانە زیندان‌و هەر لە زیندانیشدا مرد[2].

### ١٥ـ ئازاردانی ئەوکەسانەی ڕووبەڕوو جنێو دەدەن‌و سوکایەتی دەکەن

ئیمامی عوسمان جنێوی ئاشکراو ڕووبەڕوی تەمێکردووەو حەددی لێ داوە، پیاوێك وتبووی بە یەکێکی تر (ئەی ئیبن‌و شامە دایکتدا وا پێ بکەم) واتە (زینا بکەم) یان (زینای دایکتم کردووە) کاتی ئیمامی عوسمان لەم مەسەلەیەی کۆڵییەوە، کابراکە وتی: زۆر ناڕەحەتی کردوم‌و ئاگام لە خۆم نەبووە، ئیمامی عوسمان ئەمری کرد داری حەددی لێبدەن‌و گوێی نەدا بە بیانووەکەی[3].

### ١٦ـ سزای زیناکەر

ئەگەر سەلمێنرا پیاوێ یان ژنێ زینای کردووە، لە هەمان کاتدا ئازادەو هاوسەری خۆشی هەیە، سزاکەی بەردبارانە هەتا دەمرێ، ئافرەتێکی شودار لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا زینای کردبوو، ئیمامی عوسمان بڕیاریدا بەردبارانیکەن تەنانەت خۆی ئامادەی بەردبارانەکە بوو[4].

---

[1] صحيح التوثيق (ص٧٧).

[2] تاريخ الطبري (٥/٤٢٠).

[3] موسوعة فقه عثمان (ص٢٤٧).

[4] المصدر نفسه (ص١٨٤).

### ١٧ـ تەمێکردن بە تەراکردنو دەرکردن

هەواڵ گەیشت بە ئیمامی عوسمان، کە ئیبنو حوبکەی هندی خەریکی نەیرنجە، نەیرنج وەکو جادوو وایە، جادوش نییە، ئیمامی عوسمان نامەی نارد بۆ لای وەلیدی کوڕی عەقەبە پرسیاری نەیرنج بکات لە حوبکە، ئەگەر دانی پیانا، کە کردویەتی ئەوا ئازاری بداتو تەمێی بکات، وەلید پرسیاری لێ کرد، چونکە وتی: بۆخۆشیو بێتاقەتی کردومە، ئیمامی عوسمان فەرمانی کرد لێدانی بکەنو هەواڵیش بدەن بە خەڵکی، وەلید نامەکەی ئیمامی عوسمانی خوێندەوە، کە فەرموبووی: (هەرکەسێ جددی بوو بەرامبەرتان ئێوەش جددی بن بەرانبەری، ئامانتان بم گاڵتەجاڕ مەبنو وریای گاڵتەجاڕیش بن، چونکە خەڵکی تر دەچنە سەر ڕەفتارەکانی ئەو گاڵتەجاڕانە). خەڵکی سەریان سوڕما لەم ئامۆژگارییە بۆیە وەلید توڕە بوو هەستا لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەچوون بەرەو شام، کەعبی زی حوبکەو مالیکی کوڕی عەبدوڵلای نارد لەگەڵیان نامەیەکیشی نووسی بۆ ئیمامی عوسمان، چونکە ئەم دوانە لەسەریەك بیروباوەڕ بوون[1].

### ١٨ـ دوورخستنەوەی خەڵکی لە تەرمەکەی عەباس

لە عەبدولڕەحمانی کوڕی یەزیدەوە هاتووە، دەڵێ: کاتی تەرمی عەباسی مامی پێغەمبەریان ﷺ هێنا بۆ مردوشۆر، خەڵکی کەڵەکەبوونە سەر یەکو بردیان بۆ گۆڕستانی بەقیعو نوێژیان لەسەر کرد، حەشاماتێکی زۆر هاتبوو قەرەباڵغی وامان نەدیبوون کەس نەیدەتوانی لە دارمەیتەکەی نزیك بێتەوە، چونکە بەنی هاشم ڕێگەیان هەڵچنی بوو دەرفەتیان نەیهێشتبووەوە بۆ کەسی تر کاتێ هەڵیان گرت بۆ ناو گۆڕەکەی جەنجاڵییان کردە سەری، ئیمامی عوسمان ئەمەی بینی پۆلیسی نارد خەڵکیان دوور خستنەوەو پاڵیان پێوە نانو بەنی هاشم ناشتیانو ئەلحەدیان بۆ دانا[2]، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پیاوانی پۆلیس زۆربوون، لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا لای هەندێ لە مێژوونووسان[3] وایە ئیمامی عوسمان یەکەمین خەلیفە بووە پۆلیسی داناوەو ئەرکی

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٤١٩).

[2] الطبقات (٤/٣٢).

[3] المصدر نفسه (ص١٠٦).

سەرپەرشتی ئەم کارەشی بە (ئیبنو قونفوزی کوڕی عومەیری قورەیشی) سپارد[1]، کە هاوەڵێکی کۆچەرییە، لە کوفەش عەبدولڕەحمانی ئەسەدی کردبووە سەرپەرشتیاری پۆلیسەکان، هەروەها سەرۆکایەتی پۆلیسی شامی دابوو بە نوصەیری کوڕی عەبدولڕەحمان ئەوکاتەی معاویەی ئەبی سوفیان والی بوو لە شامدا[2].

ئاشکرایە لە دوای ئیمامی ئەبوبەکرو عومەر هیچ جێنشینێك وەکو ئیمامی عوسمان یاسای ئیسلامیی پیادە نەکردووە بە یەکسانی، ئیتر تاوانبارەکە خزم بێت یان بێگانە، هەژار بێت یان دەوڵەمەند، ماقوڵ بێت یان گەدا، وێڕای ئەوەی هەر مافو چاکەکارییەك کەوتبێتە ئەستۆی بێ گرێو گۆڵ جێبەجێی کردووە، ئەو شانازییە بەسە بۆ ئیمامی عوسمان، کە حوکمڕانییەکەی بە خەلافەتی راشیدین ئەژماردەکرێت[3].

## دووەم: عیبادەتو هەڵسوکەوتی

### ١ـ ئیمامی عوسمان لە موناو عەرەفە چوار رکاتی تەواو نوێژی کرد

لە حەجکردنی ساڵی (٢٩)ی کۆچی، ئیمامی عوسمان چوار رکات نوێژی کرد بۆ خەڵکی، یەکێ هات بۆ لای عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف، وتی: ئایا زانیوتە براکەت چی کردووە؟ واتە ئیمامی عوسمان چوار ڕکات نوێژی بۆ خەڵك کردووە، عەبدولڕەحمان خۆی دوو رکات نوێژی بۆ خەڵك کردبوو، هەستا چوو بۆ لای عوسمانو پێی وت: ئایا تۆ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەم شوێنەدا دوو ڕکات نوێژت نەکرد؟ وتی: بەڵێ، پاشان وتی: ئایا تۆ لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەردا لەم شوێنەدا دوو ڕکات نوێژت نەکرد؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئایا تۆ لەسەرەتای خەلافەتەکەدا دوو ڕکاتت نەکرد؟ وتی: بەڵێ، پاشان وتی: ئەی عەبدولڕەحمان گوێم لێ بگرە، پێم گەیشتووە هەندێ حاجی ئەهلی یەمەنو خەڵکی نەزان، ساڵی رابردوو وتویانە نوێژی خەڵکی ئەم شارە دەبێت دوو رکات بێتو ئیمامی عوسمان نوێژیان بۆ بکات، بەڵام بۆ خەڵکی ئەملاولا دەبێ چوار رکات بکەن، منیش کەسوکارم لێرەیە لەمەککەو خەڵکی ئێرەم، وتم وا باشە چوار رکات بکەم، بۆ ئەوەی ئەو

---

[1] تأريخ خليفة بن خياط (ص١٧٩).

[2] ولاية الشرطه في الاسلام (ص١٠٥).

[3] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٤٠٩).

رایەی کەوتووەتە مێشکی خەڵکی جێگیر نەبێ، من کۆچەری نیم لێرەدا، چونکە ژنێکم لەگەڵ خۆم هێناوە، ماڵێکیشم لە تایف هەیە، دەتوانم زۆر بە ئاسانی بگەڕێمەوە ناوی، عەبدولڕەحمان وتی: ئەمانەی وتت هیچی بەهانە نەبوون تۆ دەڵێی کەسوکارم لێرەیە، بەڵام ماڵو منداڵت لە مەدینەیەو خەڵکی ئەو شارەی کە تێیدا نیشتەجێی، هەروەها دەڵێی ماڵێکم هەیە لە تایف خۆ لە مەککە بۆ تایف سێ شەو ڕێگەیەو تۆش تایفی نیت، دەڵێی هەندێ حاجی ئاوایان وتووە، لە کاتی پێغەمبەردا ﷺ سروش دادەبەزیو موسڵمانانیش جیلی یەکەمبوون، هەر دوو ڕکاتیان کردووە، لەسەردەمی ئەبوبەکرو عەمەریشدا کە ئیسلام ترۆقی کردبوو هەر دوو ڕکات نوێژ کراوە، ئیمامی عوسمان وتی: ئەمە رایەکەو وای بۆ دەچم، عەبدولڕەحمان هەستاو چو، گەشت بە ئیبنو مەسعود، ئیبنو مەسعودیش وتی: ئەبو موحەممەد واتە (عەبدولڕەحمان) جگە لەوەی دەزانم هیچیتر هەیە؟ وتی: نەخێر، بەڵام من چی بکەم، وتی: ئەو کارە بکە جاران کردوتە، عەبدولڕەحمان وتی: دووبەرەکی دەکەوێتەوە، من بیستومە عوسمان چوار رکاتی کردووە، بەڵام من دوو رکاتم کردووە بۆ خەڵکی، دەڵێم با ئیتر چوار رکات بکرێت، ئیبنو مەسعودیش وتی: من کە بیستم عوسمان چوار رکاتی کردووە منیش چوار رکاتم بۆ کردن[1].

ئیمامی عوسمان مەبەستەکەی خۆی پیادە کردو چوار رکات نوێژی بۆ کردن، چونکە دڵهاوەری موسڵمانان بوو بۆ ئەوەی تووشی قڕەو ناکۆکی نەبن لە دینداریدا یەکگرتووبن، پاساوی گونجاوی هێنایەوە بۆ کارەکەی کە پاڵ پێوەرنەرەکانی چی بوون، کاتێ ئیمامی عوسمان ڕای خۆی خستە ڕوو عەبدولڕەحمانیش چووە سەر رایەکەیو چوار رکاتی کرد بۆ هاوەڵەکانی بەهەمان شێوە ئیبنو مەسعودیش کردی، سەرجەم هاوەڵانیش شوێنی کەوتنو نکولییان لێ نەکرد، چونکە ئیمامی عوسمان پێشەنگێکی فەقیهەو دەبێ شوێن پێی هەڵبگرین لە سنووری شەرعدا، خۆ ئەگەر ئەو کارەی کە کردی پێچەوانەی شەرعبوایە هەرگیز نەدەکرا، نەدەگونجا هاوەڵان شوێنی بکەون[2]، ئەو بۆچوونانەی

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٢٦٨).

[2] عثمان بن عفان، صادق عرجون (ص١٩٢).

ئیمامی عوسمان هێنایەوە بۆ عەبدولڕەحمان بەڵگەبوون لەسەر دروستی ئامانجەکەی، ئەگەر بەوردی تەماشای ئەم کارە بکەین‌و بە نهێنییەکانی ئەم دینە بی پێوین، بۆمان دەردەکەوێت چوار رکاتەکەی ئیمامی عوسمان لە کورت کردنەوەکەی زەرووترتر بووە، چونکە ڕاوبۆچونێکی وا هاتە ئاراوە کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ‌و ئەبوبەکرو عومەردا نەبوو، لەوە ترسا موسڵمانەکان تووشی دووبەرەکی‌و ناکۆکی ببن، لە نوێژدا، بە تایبەت عەرەبە وشك هەڵاتووەکان کە سەرقاڵی پێوانەکردنی گوندەکانی خۆیان بوون، کە چەندێ دوورە لە مەککەوەو یەکەم هەنگاوی خۆیان دەژمارد، ئیمامی عوسمان ویستی ئەم بارە دژوارە یەکلا بکاتەوەو موسڵمانە لاوازەکان تێ نەکەون، بە قەناعەتەوە گرژی‌و ئاڵۆزی دەروونی خۆی ڕەواندەوە وتی: کەسوکارم لە مەککەیە ماڵیشم لە تایفە، چاوەڕوان دەکرا لە دوای حەج لە تایف لابداو بمێنێتەوە، بۆیە چوار رکاتەکەی بەباش زانی، ئەم دەرەنجامە وردکاری بوو لە دین‌و شارەزایی بوو لە حیکمەتەکانی[1]، هەروەها دەستەیەك لە هاوەڵان رایان وایە نوێژ دەبێ چوار رکات بێت، لە سەفەردا وەکو (عائیشە، ئیمامی عوسمان، سەلمان‌و چواردە هاوەڵی تر)[2]، ئیمامی عوسمان کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا بە واجب نازانێ، هەر وەك فوقەهای مەدینەش رایان وایە نوێژ کورتکردنەوە واجب نییە، ئیمامی مالیك‌و شافیعیش بە هەمان شێوە، ئەم مەسەلە مەسەلەیەکی ئیجتیهادی‌و رای زانایانە لەبەر ئەوە جیاوازی لەنێوانیاندا هەیە لەناو ئەمانەشدا ئیمامی عوسمان، لەمبارەیەوە رای ئاوایە دەڵێ: ناکرێ لەسەر ئەم راو کۆششە کەس کافر کەین یان فاسقی کەین[3].

ئیبن‌و مەسعودیش[4] دەڵێ: دووبەرەکی‌و شەڕ خراپ‌و دژوارە، یان دەڵێ من دووبەرەکیم پێ سەختە[5]، سوننەت‌و چاوڕۆشنی ئەوەیە لە بابەتی ئیجتیهادی رایەکاندا

---

[1] المصدر نفسه (ص١٩٤).

[2] کتاب الامامة والرد على الرافظة للأصفهاني، (ص٣١٢).

[3] الرياض النضرة (ص٥٦٦).

[4] تأريخ الطبري (٢/٢٦٨).

[5] القواعد الفقهيه للندوى (ص٣٣٦).

خۆمان دەرباز بکەین لە دووبەرەکیو ناکۆکی، وە دەستخۆشی بکەین لەو کەسەی دەیبریتەوەو یەکلایی دەکاتەوە[1]، بە تایبەت ئەم بارودۆخەی، کە داسەپاوە بەسەرماندا کاتە زێڕینەکانی بە فیڕۆ نەدەین بەڵکو تێکۆشین بەرەنگاری ململانێ دژوارەکان ببینەوە[2]، ئیبنو مەسعودو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف چەندەها جار لە دوای ئیمامی عوسمانەوە نوێژیان کردووە ئەم کارە خۆی لە خۆیدا پەروەشی هاوەڵان دەردەخات، کە کۆدەنگیو یەکگرتوویی ڕەوشتێك بووە لە ڕەوشتە بەرزەکانی نەوەی یەکەم، واتە: (هاوەڵە بەڕێزەکان).

## ٢ـ لە ڕۆژی هەینیدا ئیمامی عوسمان بانگی دووەمی زیاد کرد

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (دەست بگرن بە سوننەتی منو سوننەتی جێنشینەکانمەوە[3]، کە لەدوای من دێن)، دەستگرتن بە سوننەتی خەلیفەکانەوە بەندێکەو فەرمانی پێکراوە، بێگومان ئیمامی عوسمانیش یەکێکە لە جێنشینەکانو بەرژەوەندی موسوڵمانانی لەوەدا بەدی دەکرد کە بانگی دووەمی نوێژی هەیینی زیاد بکات بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگادار بکاتەوە لە نزویکبوونەوەی کاتی نوێژی هەیینی، ئەمە لە ئەنجامی گەورەبوونی شاری مەدینەو پەرەسەندنی بوو، سەرجەم هاوەڵانیش بێدەنگ بوونو ڕەزامەندییان نیشانداو هیچ کەسیش سەرپێچی تیا نەکرد، هەر لە سەردەمی ئیمامی عەلییەوە هەتاکو ئەمڕۆ کەس نکولی نەکردووە، کەواتە ئیجماعی موسڵمانانی لەسەرە[4]، لە شەرعیشدا جێگەی دەبێتەوە، وەکو بانگی بەیانیان وایەو هەر بەو پێوانەیەش ئیمامی عوسمان پێوای[5]، ئیمامی عوسمان ئەم سوننەتەی لە سونەتەکانی پێغەمبەر ﷺ هەڵهێنجاوە، وەکو بانگی بەیانیان وایە، کە دەدرێت بۆ ئەوەی خەوتووەکان بێدار ببنەوەو هەستاوەکانیش ئامادەبنو ڕۆژوگرەکانیش پارشێو بکەن، واتە ئەم سوننەتە لەبەر گیراوی سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ.

---

[1] فقه الأولويات، محمد الوكيلي (١٦٩).

[2] الفكر الأسلامي بين المثالية والتطبيق، كامل شريف (ص٢٩).

[3] سنن أبي داود، كتاب السنة رقم (٤٦٠٧).

[4] حقبة من التأريخ عثمان الخميش، (ص٨٨).

[5] المصدر نفسه.

زانایان جیاوازییان هەیە لە کاتی وتنی ئەم بانگە ئایا بخرێتە پێش هاتنی کاتی نیوەڕۆ وەکو بانگی یەکەمی بەیانی، کە پێش وەختی بەیانی دەدرێت یان بخرێتە دوای نیوەڕۆ؟ حافزی ئیبنو حەجەر دەڵێ: دەبێ بکەوێتە ناو کاتەکە، چونکە بۆ ڕاگەیاندنی کاتە، لە ئەسڵدا بۆ ئاگادارکردنەوەی کاتی نوێژ داهێنراوە، واتە وەکو نوێژەکانی تر دەبێت پێ بخەینە کاتەکەی، واتە دوای نیوەڕۆ، ئەوسا بانگەکە بدرێت، وە کاتی هاتنی نوێژی هەینیش ببەسترێ بەم بانگەوە)، تاکو ئێستا ئەم بانگە کاری پێ دەکرێو لەبەردەم وتارخوێنەکاندا دەوترێتەوەو بیانوویەك نییە هەڵی وەشێنێتەوە، تێبینی، هەندێ ویردو سڵاواتو پاڕانەوە دەکرێ لە ناوچەکاندا پێشهاتنی وەختی هەینی، کەچی لە شوێنانی تر نییە کەواتە لەم دو حاڵەتەدا، واتە بانگەکە دوای نیوەڕۆبێت یان پێش نیوەڕۆ، شوێنکەوتنی هاوەڵانو پێشینەکان ڕاستو دروستە[1].

ڕای دووەم، ئەوانەی دەڵێن پێش هاتنی کاتەکە بانگە بدرێت، چونکە پێیان وایە ئەم بانگە وەکو بانگی بەیانی وایە، بۆ ڕاگەیاندنو ئاگادارکردنەوەیە، خۆ ئەگەر لە دوای هاتنی کاتەکە بێت ئەوە مەبەستەکەی خۆی نەپێکاوەو هەندێ لە کاتی هەینیش دەبات، ئەمەش پێچەوانەی سوننەتە، وەکو ئیبنو حەجەر دەڵێ: شوێنکەوتنی هاوەڵانو پێشینەکان ڕاستو دروستە[2].

**٣ـ ئیمامی عوسمان لەوەتی موسڵمان بووە هەموو ڕۆژێ خۆی شۆردووە**

ئیمامی عوسمان لەو ڕۆژەوەی کە موسڵمان بووە هەموو ڕۆژێ خۆی شۆردووە، جارێکیان بەرنوێژی بەیانی کردو نەیزانی لەشی گران بووە، کاتێ ڕۆژی لێ بوویەوە سەیرەکا جلەکانی تەڕە، وتی: خەڵکینە بەرنیوژی بەیانیم بۆ کردوونو نەمزانیوە لەشم گران بووە، هەستن با نوێژەکە دووبارە بکەینەوە[3]، ئەوانەی نوێژی بەیانییان لە پشت سەریەوە کردبوو، نوێژەکەیان بە جەماعەت گەڕاندەوە[4].

---

[1] فتح الباري (٣٤٥/٤).

[2] السنة والبلاغة ـ عبدالله باعلوى الحضرمي (١٣٢ ـ ١٣٣).

[3] موسوعة فقه عثمان بن عفان ص (١٩٠).

[4] المصدر نفسه، (ص١٩٢)

### ٤ـ كڕنوشی قورئان خوێندن

ئیمامی عوسمان پێی وابوو كڕنووشی قورئان خوێندن واجبە لەسەر ئەو كەسەی كە پێگەیوەو باڵغ بووە، قورئان دەخوێنێ، یان دانیشتووەو گوێی لێ ئەگرێ، بەڵام ئەو كەسەی بە نیازی گوێگرتن دانەنیشتبێت كڕنوشی لەسەر نییە، جارێكیان ئیمامی عوسمان دای بەلای قورئان خوێنێكدا، خوێنەوارەكە سورەتی سەجدەی خوێند، بۆ ئەوەی ئیمامی عوسمان كڕنوش ببات لەگەڵیا، ئیمامی عوسمان وتی: (كڕنووش بۆ یەكێكە گوێ ڕادێرێو مەبەستی گوێگرتن بێت)[1]، پاشان ڕۆیشت، ریوایەت كراوە كە ئیمامی عوسمان فەرمویەتی: ئەگەر ئافرەتی حەیزدار گوێی گرت بۆ قورئانو كڕنوشی هاتە بەرگوێ، با سەرە لەقەیەك بكاتو لە كیسی نەچێ، بەڵام با كڕنوشەكەی وەكو كڕنوشی نوێژ نەبێت[2].

### ٥ـ كردنی نوێژی هەینی لە كەنارەكاندا

لەیسی كوڕی سەعد دەڵێ: بێگومان هەموو شارێك یان لادێیەك كۆمەڵێ خەڵكی تێدایەو واجبیشە نوێژی هەینی بكەن، لە سەردەمی ئیمامی عومەردا خەڵكی میسرو كەنارەكانی لە شوێنێكدا كۆدەبوونەوەو نوێژی هەینییان دەكرد، بەڵام لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا مۆڵەت دران هەر كۆمەڵێكیان لە شوێنی خۆیاندا جەماعەت بكەن ئەو خەڵكانە هاوەڵیشیان تێدابوو[3].

### ٦ـ پشودانی ئیمامی عوسمان لە وتارخوێندندا

لە قەتادەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان لە ڕۆژی هەینیدا وتاریان بەپێوە خوێندووە، لە دواییدا بە پێوە وەستان بۆ ئیمامی عوسمان ناڕەحەت بوو، سەرەتای وتارەكە بە پێوە دەوەستاو ئینجا، پشووی دەداو پاشان هەڵدەستایەوە، لە سەردەمی مەعاویەدا وتاری یەكەمی بە دانیشتنەوە دەخوێندو دووهەم بە پێوە[4].

---

[1] المصدر نفسه، (ص١٦٨)

[2] المصدر نفسه.

[3] فتح الباري (٢/٤٤١).

[4] الخلافة الراشدين، يحي اليحى (ص٤٤٤).

**٧ـ ئیمامی عوسمان قنوتی خستە پێش ڕکوع**

ئەنەس دەڵێ: یەکەمین کەسێ قنوتی خستە پێش ڕکوعو هەمیشە وای دەکرد ئیمامی عوسمان بوو، بۆ ئەوەی خەڵکی فریای ڕکاتی یەکەم بکەون[1].

**٨ـ شارەزاترین کەسبووە لە ئەحکامەکانی حەجدا**

موحەممەدی سیرین دەڵێ: (خەڵکی لەوە دڵنیابوون کە شارەزاترین کەس لە بواری حەجدا ئیمامی عوسمانە، پاشان عەبدوڵلای کوڕی عومەر)[2].

**٩ـ قەدەغەکردنی ئیحرامبەستن پێش وەختی خۆی**

کاتێ عەبدوڵلای کوڕی عامر خۆراسانی رزگار کرد، وتی: ئەم سەرکەوتنە لە خوداوەیەو دەبێت سوپاسێکی کردەیی بکەم، سوپاسەکەشم ئەوەیە لە خۆراسانەوە ئیحرام دەبەستم بۆ عەمرە کردن، ئەحنەفی کوڕی قەیسی کردە جێگری خۆی بۆ خۆراسان کاتێ عەمرەکەی تەواو کرد هات بۆ لای ئیمامی عوسمان ئەوساڵەش بوو کە عوسمانی تیا شەهید کرا، بۆی باس کرد، ئیمامیش وتی: خۆتت بە عەمرە کردن فریوداوە، چونکە لە خۆراسانەوە ئیحرامت بەستووە بەرەو مەککە، واتە (کارەکەت دروست نییە)[3].

**١٠ـ سەفەرەی عیدەدار بۆ حەجو عەمرە**

ئەوەی ئاشکرایە عیددەدار نابێ لە هیچ کوێ بمێنێتەوە، جگە لەماڵەکەی خۆی، هەتا عیددەکەی تەواو دەبێت، وە نابێت سەفەر بکات، چونکە لەوانەیە مانەوەی بەسەردا بێت لە ماڵی غەیری خۆی بمێنێتەوە، بێگومان حەجیش بەبێ سەفەر نابێو ناکرێ، لەبەر ئەوە ئیمامی عوسمان پێی وابوو عیددەدار پێویست ناکات حەج بکات هەتا لە عیددەدا بێت، ئیمامی عوسمان حاجی و عامری عیددەداری لە جوحفەو زیل حولەیفە دەگەڕاندەوە[4].

---

[1] المصدر نفسه (ص٤٤٤).

[2] موسوعة فقه عثمان بن عفان ص (١١٢).

[3] سنن البيهقي (٣١/٥).

[4] موسوعة فقه عثمان بن عفان ص (١١٢).

### ١١ـ (حەجو عەمرە پێکەوە)، پێی باش نەبوو حەجو عەمرە پێکەوە بکرێت

ئیمامی عوسمان حەجو عەمرەی پێکەوە قەدەغە دەکردو وای پێ باشبوو لەیەککاتدا یەکێکیان بکرێت، ئەمە باشترە، خۆ ئەگەر لەیەککاتیشدا هەردوکیان پێکەوە بکرێت باتڵ نییە، ئاشکرایە هەرکەسێ ویستی حەجو عەمرە پێکەوە بکات خۆی سەرپشکە، بەڵام ئیمامی عوسمان پێی وابوو تاك بێت باشترە تا دووان، لە مەروانی کوڕی حەکەمەوە هاتووە دەڵێ: لەگەڵ عوسمانو عەلیدا بووم، ئیمامی عوسمان نەهی دەکرد لە حەجو عەمرە پێکەوە، عەلی ئەم وتەیەی بیست لە بەیکی کرد، بۆ حەجو عەمرە بەجارێ، وتی: سوننەتی پێغەمبەر ﷺ فەرامۆش ناکەم، بۆ هیچ کەسێ، عوسمانیش لاری نەبوو بەرامبەر کارەکەی عەلی، چونکە عەلی ترسی ئەوەی هەبوو نەهیو قەدەغەکەی عوسمان بگاتە حەرامکردنو قبوڵ نەبوون لای خەڵکیو چیتر حەجو عەمرە پێکەوە نەکرێ، کاتی وتی: واز لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ناهێنم[1]، بۆ کەس، بۆ ئەوەی ئاشکرای کات حەجو عەمرە پێکەوە دروستەو سوننەتێکی کارپێکراوە، کەواتە عوسمانو عەلی هەردوولایان ئیجتیهادیان کردووەو پاداشتی خۆیان هەیە[2]، وتوێژەکەیان سوودی زۆری هەبوو، وەکو ئاخافتنی زانایان وابو لەگەڵ خەلیفەی وڵاتدا ئیجتیهادی زانایان بە تایبەت لەو بابەتانەی ڕاوبۆچوون هەڵدەگرێ، هیچ موجتەهیدێك ناتوانێ موجتەهیدێکی تر ناچار بکات بۆ وەرگرتنی بۆچوونەکانی، چونکە ئیمامی عوسمان بێدەنگ بوو لە ئاستی ئیمامی عەلی، ئەوەشی تێدایە زانست دەکەوێتە پێش قسەو کردەوە[3].

### ١٢ـ خواردنی گۆشتی نێچیر لە کاتی ئیحرامدا

دروست نییە بۆ ئیحرام بەستوو گۆشتی ئەو نێچیرە بخوات کە ڕاوکراوەو حەڵاڵ گۆشتیشە، لە عەبدولڕەحمانی کوڕی حاتەبەوە هاتووە، کە عەبدولڕەحمان لەگەڵ عوسماندا عەمرەی کردووە کاتێ گەشتنە (ڕەوجا) گۆشتی باڵندەیەکیان بۆ هێنا،

---

[1] بخاري كتاب الحج، رقم (١٢٦٣).

[2] شهيد الدار عثمان بن عفان (ص٨٦).

[3] المصدر نفسه.

ئیمامی عوسمان فەرمووی بەوان بیخۆن خۆی بەباشی نەزانی بیخوات، عەمری کوڕی عاص وتی: ئایا ئێمە شتێ بخۆین کە تۆ نایخۆی؟ فەرمووی: من وەکو ئێوە نیم، ئەو بەبۆنەی منەوە راوی کردووە لەبەرخاتری من بووە[1].

جارێکی تر ئەم رووداوە ڕوویدا، عەبدوڵڵای کوڕی عامری رەبیعە دەڵێ: ئیمامی عوسمانم دیوە لە عەرەج ئیحرامی بەستووەو دەموچاوی بە پارچە قوماشێکی ئەرخەوانی داپۆشیوە، گۆشتی نێچیرێکیان بۆ هێنا فەرمووی بەهاوەڵەکانی لێی بخۆن، وتیان ئەی تۆ ناخۆیت؟ فەرمووی من وەکو ئێوە نیم، چونکە ئەم نێچیرە لەبەر خاتری من راوکراوە[2].

### ١٣ـ قەڵسبوون بە خواستنی دوو خزم لەیەك هاوسەریدا

(خەلال) لەڕێگەی ئیسحاقەوە هێناویەتی ئەویش لە باوکییەوە، کە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان نیگەران‌و بێتاقەت بوون بە خواستنی دوو ئافرەتی خزمی یەکتر لەیەك کاتدا، واتە: دوو ئافرەتی خزم لای پیاوێك لە یەككاتدا)، نەوەك ببێتە مایەی دوژمنایەتی‌و دەردەدڵی باوانیان[3].

### ١٤ـ لە بارەی شیرپێدانەوە

عەبدولڕەزاق لە ئیبن‌و جورەیجەوە ئەویش لە ئیبن‌و شەهابەوە ریوایەتی کردووە، دەڵێ: (ئیمامی عوسمان چەندین ژن‌و مێردی لەیەك جیا کردووەتەوە کە هاوسەری یەکتر بوون بە شاهیدی قسەی ئافرەتێکی ڕەش پێست کە شیری دابوو پێیان، واتە پیاوو ژنەکە خوشك‌و برای شیریی یەکتر بوون)[4].

### ١٥ـ لە بارەی خولعەوە (حاشاکردن)

لە ڕوبەیعی کچی موعەددەزەوە هاتووە، دەڵێ: (من‌و کوڕەکەی مامم هاوسەربووین، دەمەقاڵێیەك کەوتە نێوانمان، وتم پێی هەموو شتێ بۆ تۆ بەس لێم جیا بەرەوەو ڕێگەم بدە بڕۆم، وتی: زۆر باشە، دەیکەم، هەموو شتەکانی لێ سەندم، تەنانەت

---

[1] موسوعة فقه عثمان بن عفان.

[2] سنن البيهقي (٥/١٩١).

[3] الخلافة الراشدين، د. يحي الحيى (٤٤٩).

[4] الفتح (٥/١٨).

پێخەفەکەیشم، هاتم بۆ لای ئیمامی عوسمان سەیرەکەم گەمارۆ دراوە، سکالآم کرد، فەرمووی ئەو مەرجە حسێبە داتناوە هەموو شتێکت لێ دەسێنێ هەتا تەوقەکەی سەریشت)، لە ریوایەتێکی تردا دەڵێ: حاشام کرد لە مێردەکەم، تەنانەت تەوقەکەی سەریشم بۆ گەڕاندەوە، ئیمامی عوسمان رازی بوو[1].

## ١٦ـ عازیەتی گرتن لەسەر ئافرەتی شوو مردوو واجبە

عازیەتی ئەوەیە واز بهێنێت لە خۆ جوانکردن لەو خانووەی مێردەکەی تیا مردووە دەرنەچێ‌و بچێ لە شوێنێکی تر بمێنێتەوە مەگەر زەرورەتێك پێشهاتبێ، دەکرێ بەڕۆژ بۆ ئاتاجەکانی لەماڵ دەربچێت، بەڵام شەو لە هیچ کوێ نەباتە سەر[2]، لە فورەیعەی کچی مالیکی خوشکی ئەبی سەعیدی خودرییەوە هاتووە دەڵێ: ئەو ژنەی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ سکالآی کرد، وتی: (مێردەکەم لە ماڵ دەرچووە بە دوای بەڵێنێکدا بەڵام بە تەوشێ کوشتویانە، پیاوەکەم هیچ خەرجی‌و شوێنێکی حەسانەوەی بۆ من بەجێ نەهێشتووە، ئایا بگەڕێمەوە ناو باوانم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ)، ئافرەتەکە دەڵێ: چوومە دەرەوە بانگی کردم فەرمووی: (چۆنت وت؟) منیش بۆم گێڕایەوە، فەرمووی: (لە ماڵەکەتدا بمێنەرەوە هەتا وەعدەکەت تەواو دەبێت)، دەڵێ: چوارمانگ‌و دە ڕۆژ مامەوە، پاشان کە ئیمامی عوسمان بوو بە جێنشین ناردی بەدوامداو ئەم باسەی لێ پرسم منیش بۆم گێڕایەو ئەویش ئەم سوننەتەی وەرگرت‌و حوکمی پێکرد، لەبەر ئەوە ئیمامی عوسمان زۆر توندوتۆڵ بوو لەسەر مانەوەی ئافرەتی شوومردوو لە ماڵەکەی خۆیدا جارێکیان ئافرەتێك پیاوەکەی مردو عازیەتی بۆ گرت، لەم ماوەیەدا سەردانی کەسوکاری خۆی کرد، تیرێکی وێڵ لێید هەواڵیان هێنا بۆ ئیمامی عوسمان کاتێ تێگەشت کە شوومردووە، وتی: بیبەنەوە بۆ ماڵەکەی خۆی‌و ئافرەتەکەش پێکرابوو[3].

---

[1] الخلافة الراشدين، د. يحي الحيى (٤٤٩).

[2] موسوعة فتنه عثمان بن عفان (ص٢٤٤).

[3] المصدر نفسه (ص٢٢٤).

**١٧ـ مەیخوازە بە مەبەستی ژن‌و مێردایەتی نەبێ**

پیاوێك هاتە لای ئیمامی عوسمان، ئیمامی عوسمان سواری وڵاخێك بوو، وتی: ئەی خەلیفە ئیشێکم هەیە بە تۆ، فەرموی: ئێستا پەلەمە ئەگەر زەروری لە پاشکۆمەوە سواربە هەتا کارەکەت بۆ جێبەجێ بکەم، کابرا سوار بوو لە پاشکۆیەوە وتی: دراوسێیەکم تورە بووە ژنەکەی خۆی تەڵاقداوەو ئێستا تووشی نارەحەتی‌و نیگەرانی بووە، منیش دەمەوێ بە پارەی خۆم ژنەکەی مارە بکەم‌و دوای جوت بوون تەڵاقی بدەم، واتە: (مارە بەجاشیکەم) بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لای مێردەکەی، ئیمامی عوسمان پێی فەرمو: (نەیخوازی بەمارە بڕینی ژن‌و مێردایەتی نەبێ‌و مەبەستی هاوسەریت نەبێ)، واتە: (بۆ حەڵاڵکردن نەیخوازی)[1].

**١٨ـ تەڵاقی سەرخۆش**

ئیمامی عوسمان پێی وابوو هەرچی قسەو گوتەی سەرخۆشە هەمووی بەفیڕۆ دەچێ‌و پەیمانی پێ نابەسترێ‌و کرێبەستی پێ هەڵناوەشتێتەوەو بڕیاری پێوەرناگیرێ‌و تەڵاقیشی ناکەوێ هەتا دێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی، چونکە نازانی چی دەڵێ‌و گەرەکیشی نییە وابڵێ، هیچ تەکلیفێکی ناکەوێتە سەر کە ئاگای لە خۆی نەبێ. ئیمامی عوسمان دەڵێ: (شێت‌و سەرخۆش تەڵاقیان ناکەوێت)[2].

**١٩ـ هیبەی باوك بۆ منداڵەکەی (بەخششی باوك بۆ منداڵ)**

ئەگەر باوك لە ماڵی خۆی بڕێکی ببەخشێ بە منداڵێکی، دەبێ شایەتی بگرێ، ئەگەر بە شاهیدی شایەت ماڵەکەی پێ ببەخشێ ئەوە دەبێتە ماڵی منداڵەکەو دەیکەوێت، دروستیشە، ئەو بەخشیشە لای باوکی بمێنێتەوە بە ماڵی منداڵەکەش بناسرێ، ئیمامی عوسمان فەرموویەتی: هەرکەسێ مێش هەنگێ ببەخشێ بە منداڵێکی و منداڵەکە باڵغ نەبوویێت، پێی ناشێت هەتا شایەت نەگرێ بۆ بەخشینەکەی، خۆ ئەگەر شایەت نەگرێ‌و تەسلیمی منداڵەکەی نەکات، ئەو بەخشنێکی نەگونجاوە، واتە نایکەوێت.

---

[1] المصدر نفسه، (ص٨١).

[2] الفتاوی (٦٦/٣٣).

ئیمامی عوسمان دەفەرموێ: (هەندێ کەس خەڵات دەبەخشێ بە منداڵی ئەگەر منداڵەکە مرد، ئەڵێماڵی خۆمە، ئەگە خۆی بمرێ بە بەخششی منداڵەکەی دەزانێ، بەخشیش‌و خەڵات نادرێ بە منداڵ هەتا خەڵاتەکە جیا نەکرێتەوە لە ماڵی باوکی)[1].

**٢٠ـ قاتی خستنە سەر گێل‌و گەوال (سەفیهە)**

ئیمامی عوسمان پێی وابوو قاتی بخرێتە سەر گێل‌و گەوال، عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر زەوییەکی کڕی بە بڕی شەست هەزار دینار کاتێ عەلی ئەبی تالیب بیستی وتی: ئەو زەویە ئەو پارە ناژێ، عەبدوڵڵا خۆیداوە لە گێلی‌و خەڵەتاوەو پارەی بەزایە داوە، عەلی خۆی گەیاندە لای ئیمامی عوسمان داوای لێ کرد قاتی بخاتە سەر عەبدوڵڵای جەعفەر، لەبەر خراپ بەکارهێنانی سامانەکەی، عەبدوڵڵاش خێرا چوو بۆ لای زوبێر کە بازرگانێکی لێزان بوو پێی وت: زەویەکم کڕیوە بە شەست هەزار دینار، مامەعەلیم چووە بۆ لای ئیمامی عوسمان بۆ ئەوەی قاتی بخاتە سەرم، زوبێریش وتی: من دەبمە شەریکت، ئیمامی عەلی گەشتە ئیمامی عوسمان‌و وتی: برازاکەم زەوییەکی کڕیوە بەشەست هەزار دینار، من بەنەعلەکانی خۆم نایکڕم، دەبێ قاتی بخەیتە سەری، زوبێریش چوو بۆ لای ئیمامی عوسمان وتی: من شەریکی عەبدوڵڵام، ئیمامی عوسمان وتی بە ئیمامی عەلی من چۆن قاتی بخەمە سەر کەسێك کە زوبێر شەریکی بێت[2]، واتە ناتوانین حوکم بەسەر عەبدوڵڵادا بدەین کە خۆی داوە لە گێلی‌و خەڵەفاوە، چونکە زوبێر شەریکییەتی زوبێریش بازرگانێکی سەردەرچووە لە سەوداو مامەڵەدا پیاوێکی لێزانە.

**٢١ـ قاتی خستنە سەر موفلیس (باخەڵ خاڵی)**

ئیمامی عوسمان پێی وابوو قاتی بخرێتە سەر موفلیس وە لەگەڵ قاتی خستنە سەریدا خاوەن قەرزەکان دەتوانن سامان‌و داراییەکەی بە گوێرەی قەرزەکەیان دابەش بکەن، ئەگەر شمەکە سنیارییەکەی لامابوو خاوەن شمەکەکە دەتوانێ شمەکەی بباتەوەو مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە[3]، چونکە بەخاوەنەکەی ڕەوایە نەك بەکڕێکارە موفلیسەکە[4].

---

[1] الفتاوی (٣١/١٥٤).
[2] سنن البیهقي (٦/٦٦١).
[3] سنن البیهقي (٦/٤٦).
[4] مووعة فقه عثمان بن عفان (ص١١٩).

## ٢٢ـ حەرامكردنی قۆرغ كردن (ئیحتكار)

ئیمامی عوسمان قۆرغكردنی قەدەغە كردووە[1]، هەروەها قۆرغكردنی مەوادی خواردەمەنیو ناخواردەمەنی بەیەك چاو سەیر كردووە، پێوابووە قۆرغكردن بە فراوانی باسكراوە ناوگیری تیا نەكراوە، چونكە لە فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەكی رەها قۆرغكردن باسكراوە، هەمووشتێ دەگرێتەوە، هەرچەندە لای كۆی زانایان سنوردار كراوە، حوكمی جیاوازی بۆ دەربڕاوە، بەڵام هەردەقێ ڕەهابێ لەسەر ڕەهایی خۆی دەمێنێتەوە[2].

## ٢٣ـ وشتری وێڵ بوو (ونبوو)

مالیك ریوایەتی كردووە لە ئیبنو شەهابەوە كە وشتری وێڵبوو لە سەردەمی ئیمامی عومەردا سوودی لێ وەرگیراوەو ئازادبووەو كەسێ نەیبردووە بۆ خۆی، بەڵكو كەڵكی گشتی لێ وەرگیراوە هەتا سەردەمی ئیمامی عوسمان، ئیمامی عوسمان فەرمانی كرد جاڕ بدەن بۆ ئەو وشترانەی كە ونبوو وێڵن، گەر خاوەنیان نەبوو بیان فرۆشن هەر كاتی خاوەنی هاتە ڕوو، قیاتەكەی دەدەینەوە[3]، كردەوەكەی ئیمامی عومەر جێبەجێ كردنی فەرمودەی دروست بوون لە زەیدی كوڕی خالیدی جوهەینییەوە هاتووە، دەڵێ: دەشتەكییەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری شتی دۆزراوەی لێكرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (جاڕی بۆ بدەو ناوی دەفرەكە ببەو ناوی دەمەوانەكەی ببەو پاشان ساڵێ لەسەر یەك جاڕی بۆ بدە، گەر خاوەنی بۆ پەیدابوو بیدەرەوە، ئەگینا بیبە بۆ خۆت). وتی: ئەی مەڕی گمبوو؟ فەرمووی: (ئەوە بۆ تۆیە یان بۆ براكەتە یان بۆ گورگە). وتی: ئەی وشتری گمبوو؟ فەرموی: (چیتە بەسەریەوە ئاوی خۆیو پێڵاوی خۆی پێیە، دەچێ گەڵا دار دەخوات‌و ئاو دەخوات هەتا خاوەنی خۆی دەدۆزێتەوە)[4].

---

[1] موطأ مالك (٢/٦٥١).

[2] موسوعة فتنة عثمان بن عفان، (ص١٥).

[3] موطأ مالك (ص٦٤٨).

[4] بخاري كتاب اللقطه رقم (٢٤٢٧).

حەجوی زانا پێیوایە ئەو ئیجتیهادەی ئیمامی عوسمان لەسەر بەرژەوەندی گشتیی بنیات نراوە، لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا خەڵکی تەماحیان کردبووە وشترەکانو کنەیان لێ دەکرد بۆیە فرۆشتنی[1].

عەبدولسەلام سلێمان بەرپەرچی ئەم پاساوە دەداتەوە دەڵێت: (کارێکی دژوارە خۆمان بدەین بەدەست پاساوەکەی حەجوی زاناوە، چونکە ڕستەی بەرژەوەندیی گشتیی شەرع دای نەناوەو ئاماژەی پێ نەکردووە، نە دانی پیا ناوە نە هەڵیشی دەوەشێنێتەوە جگە لەو بەرژەوەندییانەی کە پێغەمبەر ﷺ ڕەزامەندی لەسەر هەبوە، ناکری فرۆشتنی وشترە ونبووەکان بە بەرژەوەندیی گشتیی دابنێین، مادەم ڕووبەڕووی دەق دەبێتەوە).

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت ئیجتیهادی ئیمامی عوسمان کتومت بەستراوە بە بەرژەوەندیی گشتییەوەو ئەم کێشەیە لەو بابەتانەیە کە ئیجتیهاد هەڵدەگرێو حوکمەکەی گۆڕانی بەسەردا دێت، بە گۆڕانی کاتو بارودۆخو شوێن وێڕای بەرژەوەندی خاوەن وشترە گمبووەکان هەرکاتێ هاتنە ڕوو وشترەکەیان دەدەنەوە یان فیاتەکەیان دەدەنەوە، واتە: وشترەکەیان نرخەکەی وەکو ئەمانەتێك وایە کەی پەیدابوون دەیبەنەوە، بێگومان ئیمامی عوسمان ئامانجی ئەوەبوو بەرژەوەندی گشتیی ڕەچاو بکات، خۆ ئەگەر وشترەکان وەکو جاران بمایەتەوە تووشی لەناوچوونو فەوتان دەبوون، چونکە خەڵکی بەجۆرێ ڕەفتاریان گۆڕابوو وایان لێهاتبوو دەستدرێژییان دەکردە سەر وشترە ونبووەکان بۆیە ئیمامی عوسمان بەم کردەوەیە ڕێگەی لێ بڕینو باڵبەستی کردن[2].

### ٢٤ـ ئافرەتی تەڵاقدراوی نەخۆشی سەرەمەرگ میراتبەرە

عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف ژنەکەی تەڵاقدا، لەو کاتەدا کە لە نەخۆشی سەرەمەرگدا بوو، هەر بەو نەخۆشینەش مرد، ئیمامی عوسمان ژنە تەڵاقدراوەکەی کردە میراتبەری عەبدولڕەحمان هەرچەندە ماوەی عیددەکەشی تەواو بوو بوو، ریوایەت کراوە شورەیح نوسراوێکی نووسی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب لە بارەی پیاوێکەوە کە سێ

[1] الفكر السامي (١/٢٤٥).

[2] الاجتهاد في الفقه الاسلامي، (ص١٤٣).

بەسێ ژنەکەی تەڵاق دابێت، لە کاتی تەڵاقدانەکەدا پیاوەکە نەخۆش بووبێت، واتە: (نەخۆشی سەرەمەرگ) ئیمامی عومەر وەڵامی دایەوە فەرموی: (ئەو ئافرەتە تەڵاق دراوە میراتی دەکەوێ مادەم عیددەی تەڵاقدانەکەی تەواو نەبووبێت گەر عیددەکەی تەواو کردبێت نایکەوێت)، کۆی هاوەڵان یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی تەڵاقدانی نەخۆشی سەرەمەرگ گرێی هاوسەریەتی نارزێنێو لاینابات.

ئیمامی عومەر ماوەی عیددەکەی بۆ دیاری کرد، بەڵام ئیمامی عوسمان ماوەی بۆ دیاری نەکرد، وتی: ژنی تەڵاقدراوی نەخۆشی سەرەمەرگ عیددەی تەواو کردبێ یان تەواوی نەکردبێ میراتی دەکەوێت. هەرچەندە دەقێك نییە بگەڕێینەوە سەری، لەمبارەیەوە هۆکاری ئەم حوکمەش هەڵسوکەوتی مێردەکەو ناوەڕۆکی مەبەستەکە دیاری دەکات، چونکە پیاو لە نەخۆشی سەرەمەرگدا بێتو ژنەکەی تەڵاق بدات دیارە ئەمە بۆ بێبەری کردنو بێبەشکردنی ژنەکە ئیعتیبار دەکرێتو بۆ دەست وەدەرکردنە[1].

### ٢٥ـ ئافرەتی تەڵاقدراو مادەم عیددەی تەواو نەبێ میراتی دەکەوێ

ئیمامی عوسمان دەفەرموێت: (ئەو ژنو مێردەی لە یەك جیا بوونەتەوە، بەڵام یەکیان بەر لە تەواوبوونی ماوەی عیددە تەڵاقدان دەمرێت، ئەوە میراتی یەکتر دەبەن)، واتە: هەتا عیددەکە تەواو نەبێ هەر وارسی یەکترن، بێگومان عیددەی تەڵاقیش بە حەیزو پاکبوونەوە حساب دەکرێت، خۆ ئەگەر ماوەی عیددەکە درێژەی کێشاو درەنگ کەوتە حەیز وارسیەکە هەر بەردەوامە هەتا بە تەواوی پاك دەبێتەوە، حەبانی کوڕی موونقیز ژنەکەی خۆی تەڵاق دا، لەوکاتەشدا ژنەکە مناڵ بە بەربوو شیری دەدایە، لە پاکیشدا بوو، حەڤدە مانگ عیددەی ژمارد نەکەوتە حەیز، چونکە شیرپێدانەکە ڕێگەی حەیزی نەدان لەو ماوەیەدا حەبان نەخۆش کەوت، لە دوای ئەو حەڤدە مانگە کە تێپەڕی بوو بەسەر تەڵاقدانەکەدا وتیان گەر بمرین ژنەکەت میراتت دەبات، وتی: بمبەن بۆ لای ئیمامی عوسمان، بردیانو سکاڵای خۆی کرد (کە ژنەکەی تەڵاقداوەو، حەڤدە مانگە نەکەوتووەتە حەیزو عیددەکەی تەواو نەبووە منیش نەخۆشم گەر بمرم میراتی دەکەوێ؟)

---

[1] تأريخ التشريع الاسلامي للحضري، (ص١١٦)

ئەو کاتە عەلی کوڕی ئەبوتالیبو زەیدی کوڕی سابیت لە لای ئیمامی عوسمان بوون پێی فەرمووە ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: پێمانوایە ئەم پیاوە بمرێ ژنەکە میراتی دەبات، گەر ژنەکە بمرێ پیاوەکە میراتی دەبات، چونکە ئەو ژنە پیر نییە هەتا لە حەیز بەسرابێت، لەو کچانەش نییە نەکەوێتە حەیز ئەو ژنە بە حەیز عیددە دەژمێرێ هەتا حەیزەکەی درێژ ببێتەوە وارسیەکەشی درێژدەبێتەوە، حەبان گەڕایەوە ناو کەسوکاریو منداڵەکەی لە ژنەکە وەرگرتەوە کاتێ ژنەکە لە شیردان کەوت، کەوتە حەیزو حەیزی تریشی تەواو کرد، بەڵام پێش ئەوەی بکەوێتە حەیزی سێیەم حەبان مرد ژنە میراتی بەرکەوت و حەبان بە مێردی ئەو حساب کراو ئەمجارە عیددەی شومردوی دەژمارد[1].

## ٢٦- منداڵی هێنراو میراتی دەکەوێت

ئەگەر ئافرەتێك لە دەستی بێ باوەڕان هەڵهاتو منداڵێکی لەگەڵ خۆی هێناو سووریش بوو لەسەر ئەوەی کە منداڵی خۆیەتی باوەڕ بە قسەکەی ناکرێتو نابێتە میراتبەری هەتا شاهیدو بەڵگە نەهێنێت کە منداڵی خۆیەتی، لە مبارەیەوە ئیمامی عوسمان راوێژی کرد بە هاوەڵان هەر هاوەڵێ بۆچوونی خۆی وت، ئیمامی عوسمان فەرموی: کەواتە ئەمماڵو سامانەی خودای گەورە پێیداوین هیچ کەسێ بۆی نییە بەبێ بەڵگەو شاهید بیبات، منداڵی هێنراویش بەبێ بەڵگەو شاهید میراتی ناکەوێت[2].

ئەم خاڵانەی باسمان کردن هەندێك بوون لە ئیجتیهاداتی زین نورەین کە کاریگەری هەبوو لەسەر دامودەزگا قەزاییەکان لە بواری تۆڵەسەندنو سزاو داری حەددو تەمێکردندا، هەروەها شوێنەواری هەبوو لەسەر فێرگە فیقهییەکان، ئەم ئیجتیهاداتەی ئیمامی عوسمان بەڵگەن لەسەر فراوانی ئاسۆی زانستو چەمکی وردی فیقهی ئیسلامو فامکردنی بنەماکانی شەرعی پرشنگداری ئیسلام، ئیمامی عوسمان جێنشینێکی تێگەیشتووبوو کردەوەکانی مەشخەڵی ئوممەت بوو، سەرخەری ئاینی ئیسلام بوو، سەری ئیسلامی بەرز کردەوە.

---

[1] سنن البيهقي، (٤١٩/٧).

[2] مووعه فقه عثمان بن عفان، (٢٨).

هەواڵی شەهیدبوونی ئیمامی عومەر دوژمنەکانی ئیسلامی خێزەدا بە تایبەت ئەو گەلانەی کە هەڵپەیان بوو بۆ گەڕاندنەوەی موڵكو دەسەڵاتیان وەکو (فارسو رۆم) بەر لە گشتیی یەزوگوردی پاشای فارسەکان لە پایتەختی شاری فەرغەنەوە دەستی کرد بە پیلان دانانو نەخشەسازی، هەربەم دەستووره ملهوڕەکانی ڕۆمیش کە وازیان لە وڵاتی شام پیهێنرابوو لە قوستەنتینیەی پایتەختی بێزەنتینییەکان تەنگیان پێ هەڵچنرابوو دەستیان کرد بە گەڕەخستنی ئەو ئامرازانەی کە یاردەیان دەدات بۆ گەڕانەوەی موڵكو سامانەکەیان، بۆ ئەم مەرامە گلاوانە پاشماوەی سوپای ڕۆم لە شاری ئەسکەندەرییەی وڵاتی میسر خۆیان قایم کردبوون بە تەمای هەلێکبوون، هەرچەند لە سەردەمی ئیمامی عومەردا عەمری کوڕی عاص داوای کرد لە ئیمامی عومەر مۆڵەتی بدات میسر پاکسازی بکاتەوە لە ڕۆمەکانو ئەو مەنجەنیقو تەقەمەنیانە بشکێنێ کە لەسەر قەڵاکانیان دایانبەستووە[1]، بەڵام نەکرا، لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا ڕۆمەکان بەسەرۆکایەتی هیرەقل عەزمیان جەزم کرد کە شەڕێکی خوێناوی بکەنو یەك سەربازی ڕۆمی دوانەکەوێتو هیزی دەریایی وەرگرنو سێ سەد کەشتی لە چەکو سەرباز باربکەنو خودی هیرەقل بەشداریی شەڕ بکاتو هەموو هێزو توانای ئابووری سەربازی و بخەنە کار ئەمەشیان بە واقیعی کرد، بەڵام ئیمامی عوسمان بە جەسوریو جەربەزیو یەکالایی روبەڕوویان بوویەوەو سیاسەتێکی ناوازەی بەکارهێنا لەم خاڵانەدا بەرجەستە دەبێ:

١ـ ملکەچپێکردنی فارسو ڕۆمە یاخیبووەکانو گێڕانەوەی دەسەڵاتی ئیسلامی بۆ شارەکانیان.

٢ـ بنەماکانی یەکڕیزی وڵاتی پیادە کردو موسڵمانانی کردە پاسەوانی خەلافەت.

٣ـ درێژەدان بە رزگارکردنو تێکۆشانی شارەکانی دەوروبەریان بۆ ئەوەی دەستیان ببڕێ لە دراوسێکانیان.

٤ـ دروستکردنی هێزی سەربازی دەریایی بۆ کۆمەکی سوپای ئیسلام، لەوکاتەشدا هەوارگەی سەربازیو مەکۆی چەكو تفاقی سوپای ئیسلام لەسەردەمی عوسماندا

---

[1] الخلافة والخلفاء الراشدين، ص (٢٢٢).

دەکەوتە شارە هەرە گەورەکان، وەکو سەربازگەی عێراق لە کوفەو بەصرە، سەربازگەی شام لە دیمەشق، پاش ئەوەی هەموو شام کەوتە ژێر رکێفی مەعاویە، سەربازگەی میسر لە (فیسطاط) بوو، ئەم سەربازگانە هەڵدەستان بە پاراستنی خەلافەتی ئیسلامو گەیاندنی فتوحاتو بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلام بە هەموو جیهاندا[1].

---

[1] عثمان بن عفان، صادق عرجون ص (۱۹۹ ـ ۲۰۰).

## باسی یەکەم: فتوحاتەکانی ئیمامی عوسمان لە رووی خۆرهەڵاتەوە

### یەکەم: رزگارکردنی ئازەربایجان لە لایەن ئەهلی کوفەوە ساڵی ٢٤ی کۆچی

موجاهیدانی ئەهلی کوفە رزگارکردنی (رەیی‌و ئازربایجان)یان پێ سپێردرابوو، دە هەزار موجاهیدی تر پەیوەندی پێوە کردن شەش هەزاریان لە ئازەربیجانەوە هات و چوار هەزارەکەشی لە شاری رەییەوە هات، سوپای کوفە خۆی چل هەزار موجاهید بوو، هەموو ساڵی دە هەزاریان دەخستە جیهادەوە، واتە هەر موجاهیدێك چوار ساڵ جارێ غەزای بەردەکەوت، لەوکاتەشدا کوفە کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی وەلیدی کوڕی عەقەبە، خەڵکی ئارەبیجان راپەڕینیان کردو سوڵحەکەی نێوان خۆیان‌و حوزەیفەی یەمانییان هەڵوەشاندەوە، لە سەردەمی ئیمامی عومەریشدا کودەتایان کردبوو دژی عوقبەی کوڕی فەرقەدی والییان، بۆیە ئیمامی عوسمان فەرمانی کرد بە وەلید جیهادیان بکات، ئەویش لەشکرێکی بۆ ئامادەکردن، پێشەکی دەستەیەك موجاهیدی بە سەرۆکایەتی سەلمانی کوڕی رەبیعە ناردو پاشان خۆی بە کۆمەڵێکی زۆر موجاهیدەوە هێرشی بۆ بردن، خەڵکی ئازربیجان بە هەڵداوان هاتن‌و وتیان لەسەر رێککەوتنەکەی خۆمان کە بەستومانە لەگەڵ حوزەیفە ماوین‌و پەیمانشکێنی ناکەین، وەلیدیش چوو بەدەمیانەوەو گوێڕایەڵییەکانی وەرگرت‌و لەسەر پەیمانەکەی پێشوو رێککەوتن‌و سوپاکەیان بڵاوە پێ کرد، لە پاشان هەندێ پارتیزانی دەستپێ کرد، وەلید عەبدوڵڵای شوبەیلی ئەحمەسی بە چوار هەزار سەربازەوە نارد بۆ سەر ئەرمەنییەکان ملکەچی کردن‌و بە دەستی پڕ لە لەدەستکەوتەوە گەرایەوە، پاشان وەلید بە سوپاکەیەوە گەرایەوە کوفە، بەڵام ئەهلی ئازربیجان لە پەسا یاخی دەبوون، ئەشعەسی کوڕی قەیس، کە والی ئازەربیجان بوو نوسراوێکی نارد بۆ وەلیدی کوری عەقەبە، ئەویش لەشکرێکی سوپای کوفەی بۆ ڕەوانە کرد، ئەشعەس کەوتە وێزەی هەڵهاتووە یاخیبووەکان، تێکوپێکی شکاندن‌و داوای سوڵحەکەی یەکەمجاریان کردەوە، ئەویش سوڵحی لەگەڵ کردن، ئەشعەس ترسا لەوەی جارێکی تر یاخی ببنەوە، هەستا کۆمەڵێ یەدەکی عەرەبی بۆ دانان‌و موچەی بۆ دیاری کردن‌و ناوی لە دیوان تۆمار کردن‌و فەرمانی پێکردن دەعوە بکەن، کاتێ سەعیدی کوری عاص کرا بە والی دیسانەوە ئەهلی ئازربیجان هەڵگەرانەوەو یاخیبوون، ئەویش جەریری عەبدوڵڵای بەجلی بە لەشکرێکەوە ناردە سەریان‌و تێکی شکاندن‌و

سەردەستەکەی کوشتن، پاشان بارودۆخ ئاسایی بووەوە زۆرینەی خەڵکی ناوچەکە فێری قورئانو ئیسلام بوون، بەڵام شاری رەیی یاخیبوونو هەڵگەرانەوە، ئیمامی عوسمان فەرمانی کرد بە ئەبو موسای ئەشعەری کە والی کوفە بوو ئەوکاتە، تەمێیان بکات، ئەویش هەستا کورەیزەی کوڕی کەعبی ئەنصاری نارده سەریانو فەتحی کردن[1].

**دووەم: پوچەڵکردنەوەی بزافی رۆمەکان لە لایەن سوپاکەی کوفەوە**

کاتێ وەلیدی کوڕی عەقەبە کارە گرنگەکانی خۆی تەواو کرد، لە ئازربیجان گەڕایەوە بەرەو موسڵ، ئیمامی عوسمان فەرمانی پێ کردو وتی: (پاش سوپاسی خودای گەورەو سڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ مەعاویە هەواڵی داومەتێ کە ڕۆمەکان خۆیان گورج کردۆتەوەو ئاپۆڕەیان بەستووە بۆ کوشتاری موسڵمانان، هەر ئەم نوسراوەت پێ گەیشت پیاوێکی دلێرو بوێرو ناوخاس لەگەڵ هەشت هەزار موجاهیددا یان نۆ هەزار یان دە هەزار دابنێرە بۆیان لەو شوێنو ڕێگایەوە کە نامەبەرەکەی منی پیا هاتووە، لە کۆتاییدا بێوەی بن)[2].

وەلید هەستایە سەرپێو سوپاسی خوای گەورەی کرد، پاشان وتی: (ئەی موجاهیدان خودای گەورە موسڵمانانی تاقیکردەوە بە گەڕانەوەی ئەو شارانەی کە یاخیبوونو خۆیان بێباوەڕ کردبووە هەندێ شاری تریشی بەدەمەوە ڕزگار کرد بۆمان، کە پێشتر لە ژێر رکێفی موسڵماناندا نەبوون، وە دەستکەوتو سەلامەتی کردە پاداشتیان، سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهان ئێستاش ئەمیری ئیمانداران فەرمانی پێکردووم هەشت تا دە هەزار موجاهیدتان بدەمەلاو بچنە یارمەتیو دەستواری براکانتان لە شام، چونکە ڕۆمەکان هەڵیان کوتاوەتە سەریان، ئێوەش لەم پاداشتە گەورەیە خۆتان بێبەش مەکەن، لەگەڵ سەلمانی کوڕی رەبیعەی باهیلیدا بچن)، یەکسەر موجاهیدان بڕبوونو هەشت هەزار موجاهید خۆی خستە لاوەو ڕۆیشتن، لەگەڵ سوپای شامدا بەرەو ڕۆمەکان ملیان نا، هەتا گەیشتنە خاکی ڕۆم، سەرلەشکری سوپای شام حەبیبی کوری مەسلەمەی کوڕی خالیدی فەهری بوو. دەستیان کرد بە پەلاماردانی ڕۆمەکان، لە کۆتاییدا تورەکەیان

---

[1] الخلافة والخلفاء الراشدين، ص (٢٢٤).

[2] تأريخ الطبري (٥/٢٤٧).

پڕبوو لە دەستکەوتو بە کەیفی خۆیان کەنیزەکیان هێناوەو چەندین قەڵای قایمیان رزگار کرد[1].

لە جیهادو تێکۆشانەکانی وەلیددا هەندێك گێڕەرەوە دەڵێن شەعبیمان دیوە لەلای موحەممەدی کوڕی عومەری کوڕی وەلیدی عەقەبە دانیشتبوو، موحەممەد باسی جیهادەکانی مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیکی دەکرد، شەعبیش فەرموی: ئێوە باسی چیدەکەن، گەر جیهادو ویلایەتەکەی وەلیدتان بدیایە باسی کەسی ترتان نەدەکرد ئەوەندە لێهاتووبووە هەر کاتێ بڕۆشتایە کەمتەرخەمی نەدەکرد، هیچ کەسێ گەمەی پێ نەکردووە هەتا لە کار دورخرایەوە[2].

**سێیەم: ئازادکردنی تەبەرستان لە لایەن سەعیدی کوڕی عاصەوە، ساڵی (٣٠)ی کۆچی**

سەعیدی کوڕی عاص بە مەبەستی رزگارکردنی خۆراسان هەنگاوی ناو حوزەیفەی یەمانیو کۆمەڵێ یاوەری وەکو حەسەنو حوسەینو عەبدوڵڵای عەباسو عەبدوڵڵای عومەرو عەبدوڵڵای عەمرو عەبدوڵڵای زوبێری لەگەڵدا بوو، لە هەمانکاتدا عەبدوڵڵای عامریش لە بەسرەو هەنگاوی ناو دەرچوو بۆ ڕزگارکردنی خۆراسان، عەبدوڵڵا زوتر گەیشتە ئەبرشەهرو لەوێ دابەزی، کاتی سەعید ئەم هەواڵەی بیست چوو لە قومیس دابەزیو حوزەیفە سوڵحی لەگەڵ کردن، پاشان چون بۆ جورجانو سوڵحی لەگەڵ ئەوانیش کرد بە دووسەد هەزار، پاشان چوون بۆ (طه هیس)، ئەم سێ شارە دەکەونە سنوری تەبرستان، پاشان رۆشتن بەرەو شاری جورجان کە دەکەوێتە سەر کەناری سەخوم، لەگەڵ ئەهلەکەیدا بە شەرهاتنو کەوتنە نا ڕەحەتییەوەو نوێژی ترسیان کردو سەعید نوێژی ترسی بۆ کردنو ئەوانیش شەڕیان دەکردن لەو ڕۆژەدا سەعید موشریکێکی گرتو بەگوریس بەستییەوە، لەپڕ شمشێرێکی لەبن باڵی دەرهێناو گرتیان پاشان موسڵمانان زۆریان بۆ هێنان گەمارۆیان دان ئەوانیش داوای ئاشتییان کرد بەمەرجێ کەسیان لێ نەکوژن، ئەمانیش سوڵحیان قبوڵ کردو قەڵاکانیان رزگار کردو هەرچی تیابوو

---

[1] المصدر نفسه.

[2] عثمان بن عفان، صادق عرجون، ص (٢٠١).

بەدەستکەوت بردیان، پیاوێکی بەنی فەهد سندوقێکی دۆزییەوە کلیل درابوو، وایدەزانی گەوهەری تێدایە، هەواڵیان دا بە سەعید بانگی کابرای کردو سندوقەکەی هێناو قوفڵەکەیان شکاند سەیردەکەن سندوقێکی تری تێدایە، خەرقەیەکی زەردی ئێرانی تێدایە واتە (کمیل ورد)[1].

### چوارەم: هەڵهاتنی یەزگوردی پاشای فارسەکان بەرەو خۆراسان

عەبدوڵلای کوڕی عامر لە بەسرەوە دەرچوو بۆ رزگارکردنی ولاتی فارسەکانو لە ئەنجامدا یەزگورد هەڵهاتو رای کرد، ئیبنو عامریش مەجاشعی کوڕی مەسعودی سولەمی نارد بە شوێنیداو هەتا کرمان چوو بەدوایدا، پاشان چووە یەرجانو یەزگورد رای کرد بۆ خۆراسان[2].

### پێنجەم: کوشتنی یەزگورد پاشای فارس، ساڵی (٣١)ی کۆچی

گێرانەوەی جیاواز هەیە لە باسی کوشتنی یەزگورددا، ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: (یەزگورد لە کرمان رای کرد لەگەل دەستەودایەرەکەیدا، بۆ شاری مرو لەوێ داوای کرد لە خەڵکی مرو، بەڵام جێگەیان نەکردەوە لەترسی خۆیان، هەستا جوابی نارد بۆ تورکەکان، کە هاوکاری بکەنو پەنای بدەن، ئەوانیش گاڵتەیان پێ کردو هێرشیان کردە سەریو دەستەکەیان لێ کوشتو شپرزەیان کردن، یەزگورد بەتەنیا خۆی کرد بە ماڵی ئاشەوانێکدا خۆی شاردەوە لە ماڵێکی شاری مرو لەسەر کەناری دەریاری مەرغاب شەوێ لەوێ مایەوەو خەوی لێکەوتو ئاشەوانەکە کوشتی).

لای تەبەری لە ریوایەتێکدا هاتووە کە یەزگورد بەرلەوەی عەرەبەکان بگەنە ئەو ناوە، لە کرمان دەرچووەو ملی ڕێگەی گرتووە بەرەو تەبەرسێنو قوهمیستان، لەوێشەوە هەتا شاری مرو چوو بە چوار هەزار چەکدارەوە بۆ ئەوەی لە ئەهلی خۆراسان ئاپۆرایەك کۆبکاتەوەو راپێچی شەڕی عەرەبیان بکاتو بیان کوژێت، لەوێ هەڵدەتەقێ بەدوو فەرماندەی رق ئەستوورو ئیرەخوازدا، هەردوکیان تینوی خوێنی یەکترن، یەکیان ناوی بەرازە ئەو تریان ناوی سنجانە، هیچکامیان ملیان بۆ نەدا، یەزگورد هەڵدەسێ بەراز

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٢٧٠).

[2] المصدر نفسه (٥/٢٨٨).

دەکاتە خۆیو دەیلاوێنێ سنجاریش ئیرەییان پێدەبات، بەراز وا لێدەکات شالاوی سنجار بداتو یەزگورد خۆیشی کنەی لێ دەکرد، سنجانیش هەولی دەدا یەزگورد بکوژێ، ئەم هەوڵە کەوتەبەر گوێی یەکێ لە ژنەکانی یەزگورد، یەزگوردیش هەستا کۆمەڵێ ژنی نارد بۆلای بەراز، کە من ئامادەباشم بۆ کوشتنی سنجان، ئەم قسەیە بلاوبوویەوە، سنجان بیستی حەزەری خۆی وەرگرتو لەشکرێکی کۆکردەوە، وەکو لەشکرەکەی بەرازو یەزگورد رووی کردە ئەو کۆشکەی یەزگوردی تێدا میوانە، کاتێ بەراز ئەمەی زانی گەڕایەوە دواوە لەبەر زۆری لەشکرەکەی سینجان، یەزگوردیش زۆر ترساو تۆقی لەم لەشکرە، هەستا بە جلوبەرگی نەناسراوییەوە وەکو هەژارێ یان ئافرەتێ لە کۆشکەکە دەرچوو بەتاقی تەنیا هاتە دەرەوە، بۆئەوەی خۆی رزگار بکات، ئەندازەی دوو فەرسەخ رۆیشت هەتا گەیشتە ئاشێو چووە هۆدەی ئاشەکەو بە شەکەتیو ماندوویەتی دانیشت، کاتێ ئاشەوانەکە بینی روخسارێکی شاهانەو جموجوڵێکی ماقولانەی هەیە جێگەیەکی بۆ داخستو نانو خۆراکی بۆ هێناو یەزدگورد نانی خواردو شەوو رۆژێك لەوی مایەوە ئاشەوانەکە داوای لێکرد فەرمانێکی بەسەردا بدا، هەستا تاجەکەی خۆی پێ بەخشی کە بە گەوهەر دەوری گیرابوو، ئاشەوانەکە دەستی بۆ نەبردو قبولی نەکرد، وتی: من چوار درهەمم بەسە لەم شارەدا بۆ ئەوەی خواردنو خواردنەوەی پی بکرم، ئەمەم بۆچییە؟ یەزگورد وتی: پارەم پێ نییە، ئاشەوانەکە خزمەتی کرد هەتا بێئاگابوو، هەستا تەورێکی دا بەنەخشی تەوێڵیداو کوشتیو سەری هەلا هەلا کرد، هەرچی جلوبەرگو تاجو شتی پێبوو لێی کردەوەو لاکەکەی فرێدایە ئەو جۆگەلەی کە ئاوی ئاشەکەی دەدێرا، لەوێ ئاوساو بەستی بەدارێکەوە کە لە چەمەکە روابوو، بۆ ئەوەی خەڵکی جەستەکەی ببینن و نەنیشێ.

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە، کە تورکەکان هاتوونو دۆزیویانەتەوەو سەیرەکەن کوژراوە، شمەکەکانیان بردووە، هەستاون ئاشەوانەکەو خاوخێزانیان کوشتووە، یەزگوردیان خستووەتە نێو تابوتو بردوویانەتەوە بۆ ئەستەخر[1]، تەبەری دوو ریوایەتی دووردرێژی هێناوە، یەکەمیان لە دووەم درێژترەو پڕ لە دڵەراوکێو شێوان شێوو

---

[1] تاريخ الطبري (٢٩٧/٥).

تەگەرە، کە هاتووەتە ڕێگەی یەزگورد هەتا هیوابڕاو بوو[1]، یەزگورد وتی: بەو کەسەی کە دەویست بیکوژێ وەکو لە هەندێ ریوایەتدا هاتووە، قوڕبەسەرتان لە پەڕاوی ئێمەدا هاتووە هەرکەسێ هەوڵی کوشتنی پادشایان بدات خودای گەورە هەر لە دونیادا دەیسوتێنێو لە قیامەتیشدا دەیسوتێنێ، مەمکوژن ببەن بۆ دیهقان یان رەوانەی ناو عەرەبم بکەن، چونکە ئەوان شەرم لە پادشا دەکەن[2]، پادشایەتی یەزگورد بیست ساڵ بوو چوار ساڵیان بە ئارامی بەڕێکرد، ئەویتری شارو شار رای دەکرد، لە ترسی ئیسلامو گەلەکەی، یەزگورد دواهەمین پادشای فارس بوو لە دونیادا بە شێوەیەکی رەها[3]، پاکو بێگەردی بۆ خودای خاوەن مەزنیو موڵکی دونیا، پادشا راستەقینە هەر ئەوە، کە هەمیشە زیندووەو قەت نامرێو هیچ خودایەك نییە جگە لە ئەو، هەموو شتێ لەناو دەچێ، جگە لە روخساری ئەو حوکم حوکمی ئەوە بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی لە بارەی پادشای فارسو رۆمەکانەوە: "ئەگەر قەیسەر تیاچوو قەیسەرێکی تر نایەت لە دوای، ئەگەر کیسرا تیاچوو، کیسرایەکی تر نایەت لەدوای، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە خەزێنەی ئەوانە دەدرێت لە ڕێگەی خودادا"[4].

### شەشەم: گاورەکان پرسەیان راگەیاند بۆ یەزگورد لە دوای کوشتنی

هەواڵی کوشتنی یەزگورد گەیشت بە پیاوێکی مەتران کە ئەهوازی بوو، بەڵام لە شاری مرو دادەنیشتو پێیان دەوت (ئیلیا) هەستا هەرچی گاوری ئەو چواردەورە هەیە کۆی کردەوەو هەواڵی کوشتنی یەزگوردی پاشای فارسی کوڕی شەهریاری کوڕی کیسرای پێدانو وتی: خۆتان دەزانن شەهریایش کوڕی ئەو شیرینە ئیماندارەیە کە چاکەو مەردایەتی هەبووە بۆمانو تا ئێستا نموونەی نییە لە چاکیدا، وە باپیرانیشی واتە کیسرا، زۆر چاك بووە بەرامبەر گاورو لە سەردەمی ئەودا گاورەکان گەشتنە ئەوپەڕی

---

[1] الأكتفاء الكلاعي (٤/٤١٧).

[2] المصدر نفسه (٤/٤١٨).

[3] خلافة عثمان: د. محمد السلمي، ص (٥٧).

[4] مسلم في الفتن (٢٩١٨، ٢٩١٩).

ڕێزو حورمەت کە پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی پادشاکانی تردا دەستیان نەدەکەوت، تەنانەت هەندێ کەنیسەیشی بۆ دروست کردون، بۆیە پێویستە پرسەی خۆمان بگرین، چونکە خۆیو باوو باپیرانی چاکەی زۆریان هەیە بەسەرمانەوە، بەتایبەتی شیرینی نەنکی زۆرچاکبووە بۆ گاورەکان، پێم باشە سندوقێکی بەردین هەڵکۆڵینو تەرمەکەی تیا بپارێزینو بە مەراسیم بینێژین، گاورەکان وتیان ڕامان لەگەڵ ڕای تۆدایە، مەتران فەرمانی کرد لە ناوەراستی باخێکدا لە شاری مرو بەردێکیان بۆ هەڵکۆڵیو تەرمەکەیان لە روبارەکە دەرهێناو کفنیان کردو خستیانە تابوتو بەشان هێنایانو خستنیانە سندوقە بەردەکەو ناشتیان[1].

**حەوتەم: فتوحاتی عەبدوڵلای کوڕی عامر، ساڵی (٣١)ی کۆچی**

لە ساڵی ٣١ کۆچی عەبدوڵلای کوڕ عامریان دەستنیشان کرد بۆ رزگاکردنی خۆراسان، ئەویش ڕۆیشتو (ئەبرشەهرو تورسو بیوردو نەسای رزگارکردو لەوێشەوە هەتا سەرخەس چوو خەڵکی (مرو)ش سولحیان لەگەڵ کرد، لە ریوایەتی (سەکەنی کوڕی قەتادەی عوربەنیدا) هاتووە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی عامر وڵاتی فارسی رزگارکردو گەڕایەوە بۆ بەسرەو (شەریکی کوڕی حارسی) کردە سەرۆکی ئەستەخڕ شەریکیش مزگەوتێکی دروست کرد، پیاوێکی خێڵی بەنی تەمیمی بەناوی (ئەحنەفی کوڕی قەیس) چووە لای عەبدوڵلای کوڕی عامرو وتی: دوەژمنەکانت لە ترسو سامی تۆ رادەکەن، فشارەکانیش لەبەردەمتا زۆرنو وادیارە خودای گەورەش هەمیشە سەرت دەخاتو دینەکەی خۆی بە تۆ پڕشکۆ دەکات، باشوایە هەنگاو بنێیتو بڕۆی، عەبدوڵلاش خۆی کۆکردەوەو لەشکری سازداو(زیاد)ی کردە سەرۆکی بەسرەو خۆیو لەشکر بەرەو کرمان بەرێ کەوتن، پاشان بۆ خۆراسان هەندێ ئەڵێن بە ڕیگەی ئەسیفەکاندا چووە بەرەو خۆراسانو (مەجاشعی کوڕی مەسعودی سولەمی) کردووە بە سەرۆکی کرمان، عەبدوڵلا ڕووبەرێکی پانی گرتو نزیکەی هەشتا فەرسەخ دەبوو، پاشان ڕۆشتووە بۆ تەبەسین بە نیازی ئەبرشەهر، کە شارێکی نەیسابورە ئەحنەفی کوڕی قەیس لە پێش هەموو لەشکرەکانەوە بووە، پاشان عەبدوڵلا چووە بۆ قوهمیستانو لەوێشەوە بۆ

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٣٠٤).

ئەبرشەهر لەوێ تووشی (هەباتیلەکان) بوو کە هەرات بوون (ئەحنەفی کوڕی قەیس) شکاندنی[1]، عەبدوەڵڵا چووە بۆ نەیسابور لە ریوایەتێکدا هاتووە (کە عەبدوڵڵا چووەتە ئەبرشەهر ئەوکاتە شارەکە کرابووە دوو بەشەوە نیوەی بەدەستی (عەتوە)وە بووە نیوەکەی تری بە دەستی (کەنارا) بووە، لەگەڵ نەساو تووس، عەبدوڵڵاش نەبتوانیوە بە ئاسانی بپەڕێتەوە بۆ شاری مرو بۆیە سوڵحی لەگەڵ (کەنارا)دا کردووە، (کەنار)یش ئەبا سەڵتی کوڕی خۆیو سەلیمی برازای وەکو بارمەتە لەگەڵ ناردووە، عەبدوڵڵاش ئیبنو خازمی نارد بەرەو هەراتەکانو حاتەمی کوڕی نوعمانی نارد بەرەو مرو خۆشی دوو کوڕەکەی کەنارای بردو چووە لای نوعمانی ئەسقوفی گاورو لەوێ هەردوکیانی بەردا[2]، عەبدوڵڵا شارەکانی چواردوری ئەبرشەهری رزگارکرد، وەکو (توس و بیوردو نەساو حومران) هەتا دەگاتە سەرخەس، عەبدوڵڵا ئەسوەدی کەلسومی ناردووە بۆ بەیهەق کە شانگزە فەرسەخ دورە لە ئەبرشەهر بەڵام ئەسود شەهید کرا، پیاوێکی دیندار بوو هاوڕێی گیانی عەبدوڵڵا بوو، عەبدوڵڵا توانی زاڵ بێت بەسەر نەیسابوریشداو لەوێشەوە چوو بەرەو سەرخەس خەڵکی مرو بەسەرپەرشتی حاتەمی کوڕی نوعمان سوڵحیان کرد، ئەوکاتە (مەرزەبان) سەرۆکیان بوو.

### هەشتەم: ڕزگارکردنی باب و بلەبخەر، لە ساڵی ٣٢ی کۆچی[3]

ئیمامی عوسمان نامەی نووسی بۆ سەعدی کوڕی عاص، کە شاری باب رزگار بکات، نامەی نووسی بۆ عەبدولڕەحمانی کوڕی رەبیعە کە سەرکەوتوو بوو بەسەر بابدا نووسیبووی: (خەڵکی باب لە خۆیان دەرچوونو پێویستە گەمارۆ بخەیتە سەریان بەڵام نابوتیان مەکە، چونکە لەوانەیە گیرۆدە بن، عەبدولڕەحمانیش لە سنورێکی گونجاودا گەمارۆی خستە سەریان، لە ساڵی نوێدا باب رزگار کرا هەتا بلەنجەرو مەنجەنیقو تۆپیان لەسەر بانەکانی دابەست[4]، هەرکەسێ نزیك بکەوتایەتەوە گرمۆڵەیان دەکردو زۆر بەپل

---

[1] المصدر نفسه.

[2] المصدر نفسه.

[3] المصدر نفسه.

[4] مەنجەنیق: ئەو ئامێرەیە کە بەرد هەڵدەدات.

بون)[1]، پاشان تورکەکان خۆیان خستە لاوە بۆ شەڕی موسڵمانانەکانو بلەنجەریش هەڵگەڕایەوەو هاتە پاڵیان لەم شەڕەدا عەبدولڕەحمان کە نازناوی (ذوالنور)ە پێکرا، موسڵمانان پەرتەوازە بوون، سەلمانی برای عەبدولڕەحمان پاشەکشەی پێ کردنو لە شاری باب دەری کردنو لە ڕێگەی خەزەرەوە لە گەیلانو جورجانەوە دەرچوون، ئەم لەشکرە ئەبی هورەیرەو سەلمانی فارسیشی تێدابوو، تەرمی عەبدولڕەحمانیش لە بەردەستی خەڵکەکە مایەوەو بە مەراسیمێکی باش ناشتیانو تا ئێستاش خەڵکی لێی دەپاڕێنەوەو نوێژەبارانەی پێ دەکەن[2].

۱ـ کوشتنی یەزیدی کوڕی مەعاویە

سوپای ئەهلی کوفە غەزای بلەنجەریان کرد، چەند ساڵی دوای بە خەلیفەبوونی ئیمامی عوسمان، وە لەو شەڕەدا هیچ منداڵێکیان هەتیو نەخستو هیچ ژنێکیان بێوەژن نەخست، دوو ڕۆژ پێش چوونەناو شاری بلەنجەر یەزیدی کوڕی مەعاویە خەونێکی بینی لە خەویا ئاسکێکی بینی هاتە ژێر باڵی زۆرجوان بوو، خۆی پێچابوو بە عاباکەیەوە، پاشان یەزیدی هێنابو بۆ سەر قەبری چوارکەس، کە قەبرەکانیان زۆر ڕێکوپێك بوو، کە ڕۆژ بوویەوە شەڕ دەستی پێکرد خەڵکی بلەنجەر بەژێر کەپنەکی لەگەڵ تورکەکان هێرشیان هێناو بەردێکیان ماڵی بەسەری یەزیدی کوڕی مەعاویەدا سەری قڵیشاو ئەوەندە خوێنی لێهات، جلەکانی بەخوێن ڕەنگکراو سوور بوو، لە کۆتاییدا ڕۆحی سپارد هەواڵ گەیشت بە ئیمامی عوسمان وتی: (انا لله وانا الیه راجعون) سەرەنجامی شەڕەکەش سوپای ئەهلی کوفە شپرزە بوون، خودای گەورە غەزایان لێ قبوڵ بکاتو لێیان خۆش بێت[3].

۲ـ خوێنی سوور چەند جوانە بە(تەختی سپی) یەوە

عەمری کوڕی عوتبە دەیوت بە کەوا سپییەکەی چەند جوانە خوێنی سور بە تەختی سپاییتەوە، کاتێ لەگەڵ دوژمندا تێك ڕژان عەمر بریندار بوو، کەواکەی خۆی بینی بەو خوێنە سوورەوە، کە حەزی دەکرد ڕەنگی پێوە بگرێو شەهید بێت[4].

---

[1] تأريخ الطبري (٣٠٨/٥).

[2] تأريخ الطبري (٣٠٩/٥).

[3] تأريخ الطبري (٣١١/٥).

[4] المصدر نفسه (٣١٠/٥).

### ٣ـ وریچەی پەڵەخوێن زۆر جوانە بە جلو بەرگەوە

قەرەشەع هەموو جارێ دەیوت و وریچەی پەڵەخوێن زۆر جوانەبە جلوبەرگەوە، کاتێ ڕۆژی تێ ڕژان هاتە پێشەوە قەرەشەع ئەوەندە شەڕی کرد هەتا بە حەربە هەڵدڕاو خوێناوی بوو، جلەکانی وا دەردەکەوت کە تەختەکەی سپییەو بە ڕەنگی سوو گوڵدار کراوە، خەڵکەکەی کە بەغیرەتی قەرەشەع شەڕیان دەکرد هەتا شەهید بوو ئەوانیش شکان[1].

### ٤ـ ئەمانەش وەکو خۆمان دەمرن

تورکەکان لەم شەڕەدا بەشدارییان کردو خۆیان لە باخە چڕو پڕەکاندا شاردبووەوە، دەترسان و بڕوایان وابوو موسڵمانەکان گوللە نایانبڕێ، کابرایەکی تورك لە زەمەنێکدا خۆی حەشاردابوو، تیرێکی تەقاند موسڵمانێکی کوشت، بە دەنگی بەرز هاواری کرد ئەمانەش وەکو خۆمان دەمرد، ئیتر بۆچی لێیان دەترسن، تورکەکان بە جارێ شالاویان هێناو لەگەهەد دەرچوونو شەڕ تاوی سەند، بەڵام عەبدولڕەحمان نەچڵەکا هەتا شەهید کرا[2].

### ٥ـ ئەی بنەماڵەی سەلمان خۆتان بگرن

لە ریوایەتێکدا هاتووە، کاتێ عەبدولڕەحمان شەهید کرا سەلمانی برای ئاڵاکەی هەڵگرتو شەڕی کرد، یەکێ هاواری دەکرد (ئەی بنەماڵەی سەلمان خۆتان بگرن) سەلمانیش وتی: دۆڕانمان تیا بەدی ناکرێ، پاشان سەلمان لەگەڵ ئەبی هورەیرەدا لەناوچەی گەیلانەوە بەرەو جورجان[3] گەرایەوە، دوای ئەوەی عەبدولڕەحمانی برای ناشت لەداوێنی شاری بلەنجەر[4]، بەم پاشەکشەیە سەلمان پاشماوەی سوپای براکەی قوتار کرد[5].

مەحمود شین خەتاب دەڵێ: ئەو پاشەکشەیەی سەلمان وەکو شەڕکردن وابوو لەو ڕۆژەدا، چونکە لە دۆخی فشاری دوژمنو تەنگیدابوونو نەکسەیان لێکەوتبوو، گیانیان

[1] المصدر نفسه.

[2] قادة فتح الاسلامية في أرمنية، محمود شيت خطاب، ص (١٥١).

[3] جورجان: شارێکە لە نێوان طبرستانء خۆراسان.

[4] معجم البلدان (٢/٢٧٨).

[5] قادة فتح الاسلام في أرمنية ص (١٥١).

بەربارد بوو بوو، پاشەکشەکە بۆ هانابردن بو بۆئەوەی بتوانن جارێکی تر هەڵکوتنەوە سەریان، لە ڕاستیدا سەلمانی کوڕی ڕەبیعە بە فەرمانی خەلیفە عوسمان هاتبوو بۆ هاوکاری عەبدولڕەحمانی برای مەعقول نەبوو، لەم شەڕەدا بمێنێتەوەو لەشکرو چەکو چۆڵەکانیشی لە شاری (باب) بێت، نەیشدەکرا لە سەرەتاوە عەبدولڕەحمانی برای بە جێ بێلێ لەو شەڕە نەگریسەدا، کە پێویستیان بە تاکە سەربازێکیش هەبوو چ جای فەرماندەیەکی ئاوەها، ئیتر چۆن دەبێت لەو کاتە ناسکەدا بەجێیان بێلێت، مێژوونووسە دێرینەکان ئەو حاڵەیان بە هەرەس کردن لێکداوەتەوە جیاوازی نێوان (هەرەس)و (داڵدەدان) ناکەن، چونکە شلە شارین، (هەرەس) واتە بەجێهێشتنی گۆڕەپانی شەڕ، بەبێ نەخشەو بەبێ قاید، ئەم جۆرە کارەساتە، بەڵام (داڵدەدان) بەجێهێشتنی گۆڕەپانی شەڕە بەپێی پلانێکی داڕێژراو بە فەرمانی فەرماندە، ئەم جۆرە داڵدەدانە تابلۆیەکە لە تابلۆکانی شەڕکردنو ئامانجەکەیشی پشوودانو بەهێزکردنەوەی توانایەو زۆرکردنی سەربازو چەكو کەرەسەی شەڕکردنە، هیوادارم مێژوونووسان نەکەونە هەڵەی ڕاڤەکردنەوە جیاوزای نێوان هەرەسو داڵدەدان بکەن، چونکە ئەم دوو وشەیە واتایان زۆر دوورە لە یەکترەوە[1].

**نۆیەم: یەکەمینجار گێچەڵ گەوتە نێوان ئەهلی کوفەو ئەهلی شام لە ساڵی ٣٢ی کۆچی**

دوای شەهیدبوونی عەبدورڕەحمان ئیمامی عوسمانیش کۆمەکی نارد بۆ موجاهیدان بەسەرۆکایەتی حەبیبی کوڕی مەسلەمە کاتێ سەلمانو حەبیب بەیەگ گەیشتن لەسەر فەرماندەیی بوو بە مشتومڕییان، ئەهلی شام وتیان ئەدەین لە گەردنی سەلمان، خەڵکانێکی تر وتیان: ئێمەش ئەدەین لە گەردنی حەبیبو دەستان لێ ناگەڕێنینەوە، پیاوێکی ئەهلی کوفە کە ناوی (ئەوسن موغەرا) بوو، وتی: (ئەگەر دەست بەرن بۆ سەلمان ئێمەش دەدەین لە گەردنی حەبیب، ئەگەر بچنە لای ئیمامی عوسمان ئێمەش دەچینە لایو دوای بڕیاری سەلمانی فەرماندەی خۆمان دەکەوین، چونکە ئەمیری گشت لەشکرەکانەو قسەی قبوڵەو ئێمەش سەربازی بڕیارەکانی ئەوین، چەندین شەوو ڕۆژە پێ

---

[1] المصدر نفسه، ص (١٥٢ ـ ١٥٣).

کۆڵی ئەوین، بەرهەحاڵ موسڵمانان توانییان تاقمە یاخیبووەکان تەمێ بکەن، بە یارمەتی خودای گەورە، پاشان کەڵەپیاوی وەکو حوزەیفەی یەمانی کە سەرتەڵی غەزاکانی سوپای کوفە بوو لەسێ غەزای گەورەدا بەشداریی کردووەو سێیەمین غەزای هاوکاتی شەهادەتی ئیمامی عوسمان بوو[1].

**دەیەم: فتوحاتی عەبدوڵڵای کوڕی عامر، ساڵی ٣٢ی کۆچی**

فتوحاتەکانی بریتیبوون لە رزگارکردنی شاری مرو، تالقان، فاریابە، جورجان، توخارستان، عەبدوڵڵای ئەحنەفی کوڕی قەیسی هەنارد بۆ سەر شاری مرو ئەویش گەمارۆی دان ئەوانیش هەڵمەتیان هێنا، بەڵام بە دەستی موسڵمانان شکانو تەنگیان پێ هەڵچنراو خزاندنیانە ناو قەڵاکانیانن لە پڕ دەنگێ هاواری کرد (ئەی گەلی عەرەب ئەوە دەرنەچوون کە ئێمە دەماننناسین، گەر بمانزانیبا ئەمەی ئێستان ئێمە شتێکی ترمان دەکردن بەڵام مۆڵەتمان بدەن هەتا ئێوارەو بگەڕێنەوە بارەگاکانتان، ئەحنەف گەڕایەوە دواوە، کە ڕۆژ بوویەوە دای بەسەریاندا، پیاوێکی عەجەم هاتو نوسراوێکی هێناو، وتی: "من نێردراوم پەنام بدەن، ئەوانیش پەنایاندان سەیردەکەن فورستادەی مەرزەبانی پاشای شاری مروەو برازایەتیو وەرگێڕیەتی (مترجم)و لە لایەن مەرزەبانەوە هاتووە بۆ لای ئەحنەف، مەرزەبان نوسیبووی (بۆ فەرماندەی سوپا، ئێمە سوپاسی ئەو خودایە دەکەین کە هەموو شارو گوندەکانی بەدەستە، بەڵکو هەموو موڵکی دنیای بەدەستە، ئارەزووی لە هەرکەسێ بێت با سەرشۆڕیش بیێت سەر بڵندی دەکاتەوە، گەر ئارەزوویشی لەهەرکەسێك هەبێت باسەر بەرزیش بێت، سەرشۆڕی دەکاتەوە، ئەو خودایە بانگمان دەکات بۆ سوڵحو برایەتیو باپیری من دیندار بووەو پێغەمبەرەکەی ئێوەش مرۆڤێکی بەڕێزو بەقوربە، من بەخێرهاتنتان دەکەمو مژدەی سوڵحو ئاشتیتان دەدەمێ، ئامادەم شەست هەزار درهەم سەرانەشتان بدەمێ، ئێوەش رازی بن، ئەو جوتە موڵکەی، کە باوکی باوکمی لەسەر جەزرەبە دراوە لە لایەن کیسراوە، بیخەنە ژێر رکێفم موڵکەکانیش دوو پارچە زەوی ئاوەدانو پڕ لەپیاوە کاتی خۆی بە زوڵم برابوو لە تۆڵەی نیازەکەی باپیرمدا کە دەیویست سەری ئەو مارە سەرخۆرە پان بکاتەوە، کە ڕێگەی لە

---

[1] التأريخ الطبري (٥/٣١١).

عالەم بڕی بوو، وە هیچ سەرانەیەك لە کەسوکاری من مەسێنن‌و سەرۆکایەتیش لە بنەماڵەی من دەرمەکەن، گەر ئێوە ئەم خاڵانەم بۆ جێبەجێ بکەن منیش سەرانەی ساڵانە دەدەم، ئەو نێردراوەش (ماهی) برازامە ناردوومە بۆ لات، بۆ ئەوەی متمانەم پێ بکەیت).

ئەحنەفیش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوەو نووسی: (بەناوی خودای گەورەو دلۆڤان، لە ئەحنەفی کوڕی قەیسی قایدی سوپاوە، بۆ (بازانی مەرزەبان) لە شاری مرو، وە بۆ گەورەپیاوانی هاوشانی، سلاو لەو کەسەی شوێن ڕێنماییەکانی ئیسلام دەکەوێت، وە لە خودا دەترسێ، ماهەکی برازات گەشتە لامان‌و مەرجەکانتم پیشانی موسڵمانان دا، چونکە من‌و ئەوان لەم بڕیارە وەڵامەدا یەکسانین، ئەوانیش بەمشێوەیە وەڵامت دەدەنەوە، ئەو پێشنیارانەی کردوتە بۆ مەبەستەکانی خۆت‌و زەوییە کشتوکاڵییەکان‌و ئەو زوڵمەی کە کیسرا کردویەتی لە باپیرت لە تۆڵەی ئەوەی بەرپەرچی گەندەڵی‌و نالەبارییەکانی داوەتەوە پێش هەموو شتێ زەوییەکان هی خوداو پێغەمبەرە ﷺ‌و خودای گەورە دەیبەخشی بەو کەسانەی کە مەیلی هەیە بۆی، تۆش دەبێ موسڵمانان سەرخەیت‌و دوژمنەکانیان بڕوخێنی بە خۆت‌و زهێزەکانی چواردەورتەوە، دەبێ موسڵمانان سەرخەیت‌و پێویستیان هەبوو دەبێ پشتیوانییان لێ بکەیت، وە ئەگەر گەلەکەت ویستیان لە پەنای تۆدا زیان بگەیەنن بە موسڵمانان دەبێ قبوڵی نەکەیت، ئەگەر ئەم خواستانە بەجێ بێنیت یاداشتێکی وات بۆ دەنووسم دوای خۆیشم کەس سەرانە نەسێنێ لە تۆو هیچ خزمێکی نزیکت، ئەگەر موسڵمان بیت‌و شوێن ڕێنماییەکانی پێغەمەر ﷺ بکەویت، ئەوا وەکو هەموو موسڵمانێ مافی بژێوی‌و پلەوپایەت هەیەو دەبیتە هاوشان‌و برای ئێمەو لەمرۆ بەدواوە تۆ دەکەویتە ئەستۆی من‌و باوکم‌و سەرجەم موسڵمانان، بە شاهیدی جوزی کوڕی مەعاویەو حەمزەی کوڕی هەرماش‌و حومەیدی کوڕی خەیاری مازنیان‌و عەیازی کوڕی وەرقای ئەسەوی، نووسەرەکەشمان، کە کەیسانی خزمەتکاری خێڵی سەعلەبە، ڕۆژی یەکشەممە مانگی موحەڕڕەم)، لە دوایدا ئەحنەفی کوڕی قەیسی بەرپرسی سوپا بە مستیلەکەی مۆری کرد، کە وشەی (نعبد الله)ی لێ هەڵکۆڵیبوو واتە (بەس خودا دەپەرستم)[1].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣١٦).

## یازدەیەم: شەڕی ئەحنەف لەگەڵ توخارستان و جورجان و تالەقان و فاریاب

عەبدوڵڵای کوڕی عامر لەگەڵ خەڵکی مرو سوڵحی کردو ئەحنەفی بە چوار هەزار سەربازەوە نارد بۆ توخارستان و ئەویش هەتا کۆشکەکانی خۆی چوو، لەولاوە ئەهلی توخارستان و جوزجان و تالقان و فاریاب بە هەزار چەکدارەوە سەنگەریان گرتبوو بۆ بەرەنگاری، هەواڵ گەیشت بە ئەحنەف، ئەوان، کە لە کۆمەکاری دەکەن، ئەحنەفیش ڕاوێژی کرد بە سەربازەکانی، یەکێ وتی: با بگەڕێینەوە، یەکێکی تر وتی: با لەنگەر بگرین و خۆمان مەڵاس دەین، یەکێکی تر وتی: با بچین بەگژیاندا، دەمەو ئێوارە ئەحنەف سوڕێکی خوارد بە ناو لەشکرداو گوێ قوڵاخی بۆچوونەکانیان بوو، بەلای خەڵکی (خەباو)دا تێپەڕی پیاوێکیان پەپکە چەورەی دەبرژاندو باسی دوژمنانی دەکرد هەندێکیان دەیان وت: ئەو بۆچوونە باشە بەیانی هێرشیان بۆ بکەین و ڕووبەڕوویان ببینەوە، کابرای نانچی وتی: ئەگەر پەلاماریان بدەین زۆر سەهوین، ئایا دەگونجێ دەستەو یەخەی دوژمن ببینەوە لە شوێنی قایمکراوی خۆیاندا بە ژمارەیەکی کەمەو ئەوانیش ئۆردویەکن ئەگەر شتی وا بکەین لە ڕیشاڵ دەرمان دەهێنن، بەڵام باشترین پلان ئەوەیە، بچینە نێوان دەریای میرغاب و کەژی میرغاب، دولای خۆمان زامن کەین ئیتر دوژمن هەرچەند زۆربن زیانمان پێ ناگەیەنن، ئەحنەف ئەم قسەیەی پەسەند کردو خۆی و سەربازەکانی پیچایەوە بڕۆن، بەڵام خەڵکی مرو بەڵێنیان پێدان کە یارمەتییان دەدەن و شانبەشانی ئەوان شەڕ دەکەن، ئەحنەف وتی: پێم ناخۆشە یارمەتی لە موشریك وەرگرم، بەس بە کرێی یارمەتیمان بدەن، ئەگەر ئێمە سەرکەوتین بەڵێن و کرێی خۆمان جێبەجێ دەکەین بۆتان، ئەگەر ئەوان سەرکەوتن ئێوە بەرگریی لەخۆتان بکەن، نوێژی عەسر هاتە پێشەوە بە پەلەپەلی موشریکەکان دەستیان کرد بە تێکرژان، هەردوولا خۆیان گرت هەتا بەیانی، ئەحنەفیش هەر ئەم دوویرەی لەبەر خۆیەوە دەوتەوە:

ئەوەی گەنجەو لاوەو منداڵی نییە

هەقی خۆیەتی ترسی لەمردن نییە.

لە ریوایەتێکدا هاتووە: هەتا شەوداهاتووە هەر شەڕیان کردووە، پاشان خودای گەورە هەرەسی پێهێنان و موسڵمانان دوایان کەوتن، هەتا (رسکن) دوانزە فەرسەخ لە قەڵاکانی ئەحنەفەوە دووربوو، هەر لەم کاتەشدا مەرزەبان پاشای شاری مرو چاوەڕوانی

بارودۆخی موسڵمانانی دەکرد بۆ ڕێکخستنی بەندەکانی سوڵحەکەیان، کاتی ئەحنەف سەرکەوتنی بەدەستهێنا دوو پیاوی نارد بۆ لای مەرزەبان وتی: پێیان قسەی لەگەڵ مەکەن هەتا قۆڵبەستی دەکەن، کە چوون وایان کرد مەرزەبان تێگەیشت ئەمانە سەرکەوتوون بۆیە وا دەکەن، بەڵێنی پێدان هەرچی بەندی ڕێککەوتننامەکەیە جێبەجێی بکات، ئەوانیش وازیان لێ هێنا پاشان ئەحنەف ئەقرەعی حابسی لەگەڵ دەستە گەنجە زوگوردەکاندا ڕەوانە کرد بۆ حورجان و شەڕیان لەگەڵ کردن‌و دایان ماڵێن‌و جەربەزەکانیان کوشت، خودای گەورە موسڵمانانی سەرخست‌و دوژمنانی شکاند[1].

کوسەیری ئەهسەلی دەڵێت: هەورە ئاودارەکان کردیانە ڕەهێڵە، لاوان لە گۆڕەپانی جورجان کردیانە قەرەهێڵە بەرەو دوو کۆشك هاتن لە رستاق‌و خوت، فەرماندەکەیان دوو ئەقرەع بوو بە جوت، پاش سەرکەوتن ئەحنەف لە مرو دەرچوو بەرەو بەلخ‌و ئابلوقەی دان خەڵکەکەش سوڵحیان هەڵبژارد لەسەر چوارەد هەزار، ئەویش قبوڵی کردو ئوسەیدی کوڕی موتەشەمیسی ئامۆزای کردە ناوبژیوانی ئەم سوڵحە، پاشان ڕۆیشت بۆ خاریزم هەتا زستان لەوێ مایەوە، پاشان وتی: بە هاوەڵەکانی بەرنامەتان چییە؟ عومەری کوڕی مەعدییە وتی: کارێ پێت ناکرێ وازی لێ بێنە، بچۆ بۆ ئەوکارەی لەبەرت دەڕوات.

ئەحنەف فەرمانی کرد کۆچ بکەن، ئەوانیش گەڕانەوە بۆ بەلخ سەیرەکا ئامۆزاکەی پارەی سوڵحەکەی وەرگرتووە میهرەجانی شاری بەلخی بەسەردا هاتووەو خەڵکەکە دیارییان بۆ هێناوە دیارییەکانیش قاپی ئاڵتون‌و زیوو پارەی زیادەو کەلوپەل‌و پۆشاك بووە، ئەویش وتوویەتی ئێمە لەسەر ئەم شتانە سوڵحمان نەکردووە وتویانە ئەم شتانە خۆمان لەم ڕۆژانەدا دروستی دەکەین‌و ڕێکی دەخەین‌و دەیکەنە دیاری‌و خەڵات بۆ ئەو کەسانەی کە پایەدارو بەڕێزن، چونکە میهرەجانە، ئەویش وتبووی من تێناگەم لەم کارەو پێشم ناخۆشە دیارییەکانتان بگەڕێنمەوە لەوانەیە وەرگرتنیشی کارێکی ئاسایی بێت، بەڵام گلی دەدەمەوەو هەتا پرسیار دەکەم لەسەروی خۆم، ئەحنەفیش ئەم هەواڵەی بیست پرسیاری کرد لە خەلکی بەلخ ئەوانیش هەمان وەڵامیان دایەوە، وتی: ئەم

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣١٧).

کەرەسانە ببەن بۆ لای ئەمیری گشتیی عەبدوڵڵای کوڕی عامر کاتێ بردیانو باسەکەیان بۆ گێڕایەوە وتی: (ئەی ئەبو بەحر (واتە ئەحنەف) ئەمانە هەمووی بۆ تۆیە، بیبە بۆ خۆت، وتی: پێویستم پێی نییە، وتی: ئەی میسمار تۆ باوەشی پیاکە باوەشی پیا کردو بردی[1].

**سیازدەیەم: هەر لێرەوە ئیحرامی عەمرە دەبەستم بۆ شوکرانەبژێری خودای گەورە واتە لە (نەیسابورەوە)**

کاتێ ئەحنەف گەڕایەوە بۆ لای عەبدوڵڵای عامر خەڵکی دەیان وت بە عەبدوڵڵا ئەوەندە فتوحات بۆ تۆ دەستیداوە بۆ هیچ کەسێکی تر دەستی نەداوە، وڵاتی فارسو کرمانو سجستانو خوراسانت رزگار کردووە، وتی: راست دەکەن منیش هەر لەم شوێنەوە ئیحرامی عەمرە دەبەستم بۆ سوپاسگوزاریی خودای گەورە، واتە (لە نەیسابوورەوە) دوای عەمرەکە گەیشت بە ئیمامی عوسمان، ئیمامی عوسمانیش سەرکۆنەی کرد لەسەر ئیحرام بەستنەکەی، فەرموی: بریا عەمرەکەت بەرێکی بکردایەو لەشوێنو کاتی خۆی ئیحرامت ببەستایەو لە شوێنی تایبەتی خۆی ئیحرامت بپۆشایە[2].

**چواردەیەم: هەرەسی قارن لە خۆراسان**

کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی عامر لە غەزای خۆراسان گەڕایەوە قەیسی کوڕی هەیسەمی کردە سەرۆکی خۆراسانو قارن بە چل هەزار تورکەوە هێرشی بۆ هێنان، عەبدوڵڵای حازمی سولەمی-یش بە چوار هەزار سەربازەوە بەرەنگاریان بوویەوە، لە پێشدا شەش سەد سەربازی نارد بۆیانو فەرمانی پێ کردن نوکی ڕەمەکانیان وەکو مەشخەڵ ئاگرین بکەنو لە نیوە شەودا پەلاماریان بدەن، شەوێ پەلاماریان دانو ژڵەژاندنیانو مەشغوڵیان کردن، عەبدوڵڵای کوڕی حازمیش لە ملاو لەولاوە حاتەی موشریکەکانی دا ئەوانیش زەندەقیان چوو رایان کرد، موسڵمانان دوایان کەوتنو کوشتاریان کردن، تەنانەت قارنیش کوژراو کەنیزەكو سامانێکی بیشوماریان دەست کەوت، پاشان

---

[1] تأريخ الطبري (٣١٩/٥).

[2] البداية والنهاية (١٦٧/٧).

عەبدوڵڵای حازم مژدەی گەیاند بە عەبدوڵڵای عامر ئەویش دەستخۆشی لێ کردو کردی بە سەرۆکی خۆراسان[1].

ئابەم شێوەیە ئیمامی عوسمان ڕووبەڕووی یاخی بووەکانی خۆرهەڵات بوویەوەو فتوحاتی پەرە پێداو هێرشی دوژمنان زیانی نەگەیاند بە باهوی موسڵمانانو هیممەتی خەلیفەی نەڕوشاند، چونکە کەڵە پیاوی ئەم گۆڕەپانە بوو، لیبڕاوو بە هەڵوێست بوو بە خێرایی کارەکانی تاووتوێ دەکردو بە سانایی فریای دەکەوتو بە گوێرەی لێهاتوویی کارەکانی دابەش دەکرد، وەکو لە رووداوە ریزکراوەکانی مێژووی تەبەریو ئیبنو کەسیرو یەعلادا دەرکەوتووە، بێگومان بە هەڵبژاردنی قایدی شیاو بەرنامەی سفت ئەم سەرکەوتنانە بەدی هاتوون، سەختیو ناسۆری جیهاد لە ئاڕاستەکردنەکەیدایە، کە چۆن پلانی گونجاوی بۆ دابنرێتو رێگە لە ئاشوبە هەمەجۆرەکان بگیرێت، سەیرەکەین چارەسەری زۆربەزۆری کۆسپو تەگەرەکان کەوتە زەمانی ئیمامی عوسمان، ئەویش بە زانیاری وردو هیممەتی لێزانیو خێراییو هێزی کەسایەتیو بەرچاوڕونی ڕووبەڕویان بوویەوە، پاش خودای گەورە ئیمامی عوسمان گەورەترین فەزڵی هەیە لە ڕێکخستنی بنەماکانی خەلافەتدا سەرەڕای ئەو هەموو نارەحەتیو ژاوەژاوەی دوای شەهیدبوونی ئیمامی عومەر هاتە ئاراوە، بەروبوومی هەڵوێستە جوانەکانی ئیمامی عوسمان ئەمانە بوون:

١ـ هێنانە هێڵی یاخیبووەکانو گێڕانەوەی دەسەلاتی خەلافەت بۆ ناویان.

٢ـ زیادکردنی فتوحاتی ئیسلام لە شارەکانی پاشکۆی یاخیبووەکان بۆ ئەوەی دیوارێك دروست بکەن لە چواردەوریانو جارێکی تر سیخورەکان ئاژاوە نەنێنەوە.

٣ـ دروستکردنی چەقی دادگا هەتا موسڵمانان وەکو پەرژین خەلافەتی ئیسلامی بتەننەوە.

ئایا دەکرێت ئەم هەموو فتوحاتە پانو بەرینەو ئەم سیاسەتە پڕدانایییە کە لە هەرێمەکاندا بەرپای کردووە بە لاوازیو بێ توانایيو ڕاڕایی ئەنجام درابێت[2]، وەکو ئەو

---

[1] المصدر نفسه (١٦٧/٧).

[2] تحقيق موافق الصحابة (٤٠٨/١، ٤٠٩).

کەسانەی کە تۆمەتو پڕوپاگەندە دەدەنە پاڵ ئیمامی عوسمانو دەستیان گرتووە بە کلکی ڕیوایەتەکانی ڕافزیو شیعەو ڕۆژهەڵاتناسەکانەوەو ڕێبازە چەوتەکەی ئەوانەیان گرتووە بەر.

## پازدەیەم: کێ ڕابەرایەتی فتوحاتەکانی خۆرهەڵاتی کردووە؟

لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا (ئەحنەفی کوڕی قەیس) ڕابەری هەرە مەزنی فتوحاتی خۆرهەلات بوو، وام بەباشزانی تیشك بخەمە سەر ژیانی هەندێ لە ڕابەرانی سەردەمی ئیمامی عوسمان، چونکە ئێمە باسی ڕزگارکردن دەکەین، دەبێ باسی ڕزگارکەرەکانیش بکەین، لەو فەرماندانەش ئەحنەفی قەیسمان هەڵبژارد.

### ١ـ ڕەچەڵەكو کەسوکاری

ناوی (ئەحنەفی کوڕی قەیسی کوڕی مەعاویەی کوڕی حوصەینی کوڕی حەفصی کوڕی عوبادەی تەمیمیم)یە، دەشڵێن ناوی (صەخرە)[1] دایکی ناوی حەبیبەی کچی عەمری کوڕی قورتبی باهیلییە[2]، دایکی خوشکی ئەختەمی شەجعانە، ئەحنەف زۆر جارێ شانازی بەم خاڵەیەوە دەکرد، دەیوت (کێ خاڵۆی وەکو خاڵۆی منی هەیە؟)[3].

### ٢ـ ژیانی

ئەحنەف یەکێکە لە تابیعییە مەزنەکانو یەکێکە لە شکۆدارەکانو پیاوێکی قسەڕۆشتوو ماقوڵی هۆزەکەی بووە[4]و سەرداری خەڵکی بەسرە بووە[5]، لای سەرجەم جەماوەر جێگەی متمانە بووەو یەکێك بووە لە ژیرو هەڵکەوتووەکانو خاوەن دینو ئاوەزابووە زانایەکی زمان پاراو بووە[6]، کەڵەپیاوێکی لەسەر خۆو لێزان بووە بە نەرمو نیان ناسراوە، بەڵکو نموونەی شیعری شاعیران بووە پێیان هەڵداوەو وتوویانە:

---

[1] جهرة انساب العرب ص(٢١٧).

[2] قادة فتح السند وأفغانستان، محمود خطاب، ص(٢٥٨).

[3] جهرة انساب العرب ص(٢١٢).

[4] قادة فتح المسند وأفغانستان ص(٢٥٨).

[5] الأصابة (١٠٣/١).

[6] قادة فتح المسند وأفغانستان ص(٣٠٤).

چاوەکان کە ئیبن و قەیس دەبینن
لەشەرما دەترسن و سەردادەنەوێنن
خالیدی کوری صەفوان لە بارەی ئەحنەفەوە دەڵێ: "ئەحنەف لە پیاوماقوڵی رای دەکرد، کەچی پیاوماقوڵی بەشوێن ئەودا رای دەکرد"[1].
هەندێك لە ئاکارو رەفتارە بەپێزەکانی دەخەینە ڕوو:

١ـ هێمن و لەسەخۆییەکەی

پیاوێکی لەسەر خۆو هێمن و بووەو نموونەی ئارامگری بووە، پرسیاریان لێ کرد لەسەر خۆیی چییە؟ وتی: قبوڵ کردنی زەلیلییە لەگەڵ سەبردا هەرکاتێك خەڵکی سەرسام ببایە لە هێمنییەکەی دەیوت: ئەوەی لە ناخی ئێوەدایە لە ناخی مندا نییە، بەس ئارام گرتن دەزانم، ئەوەندە لە قەیسی کوڕی مینقەرییەوە[2] فێری لەسەرخۆیی بووم لە هیچ کەسێکی ترەوە فێر نەبووم، برازاکەی بکوژی کوڕەکەی هێنایە بەردەمی ئەحنەفی قەیس بە کەلەپچەکراوی بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکاتەوە، قەیس وتی: بۆ ئەم گەنجەتان بەستووەتەوە، پاشان رووی کردە گەنجەکەو وتی: کارێکی زۆر خراپت کردووەو ژمارەی خزمەکانت کەمکردوەو هێزی خۆت لاواز کردووەو دڵی دوژمنت خۆش کردووە، نالەباریت بەرانبەر هۆزەکەت کردووە، پاشان وتی "رێگەی بۆ چۆڵکەن با بڕوات بۆ لای دایکی کوژراوەکەو خوێنی کوڕەکەمی لێ بسێنن، ئەمە زۆر داماوە)، پاشان بکوژەکە بەرەڵلا کردو رۆیشت، قەیس خۆی تەنگەتاو نەکردو لۆچ نەکەوتە ناوچاوی[3].

پیاوێك وتی: بە ئەحنەف (فێری هێمنیم بکە)، وتی: (هێمنی بریتییە لە زەلیلی، ئایا خۆت دەگری لەسەر زەلیلی؟ من خۆم هێمن نیم، بەڵام خۆم کپ دەکەمەوە)[4]، هەر لە بارەی هێمنییەوە پیاوێك جنێوی دەدا بە ئەحنەف ئەویش بێدەنگی راگرت، پیاوەکە دووبارەی کردەوە هەتا سێجار ئەم هەر بێدەنگ بوو، پیاوەکە وتی: چەند گەمژەیە

---

[1] المصدر نفسه (٣٠٤).

[2] الاستعاب (٣/١٢٩٤).

[3] زفيات الأعيان (٢/١٨٨).

[4] قادة فتح السند وأفغانستان ص(٣٠٦).

تەشەرەکانی منی تیا مەوجودە بۆیە ناتوانی وەڵامم بداتەوە، ئەحنەف وتویەتی هەرکەسێ لەسەر تانەیەك ئارام نەگرێ با چاك بزانێت چەندین تانەی تری بەرگوێ دەکەوێ، قینێك پەنگ بدەیتەوە زۆر لەوە باشترە بکەویتە لەوە خەسترە، وە هێمنیو لەسەرخۆییەکەی سەرباری تواناو هێزبووە نەك لاوازییو بێ دەسەڵاتی بێت، لە هەندێ جاردا شەڕی گڕاوی کردووە، جارێکیان پیاوێك پێی وت: ئەی ئەحنەف لەسەر خۆییەکەت کوا؟ وتی: لەلای خودای گەورەیە[1].

**٢ـ ئاوەزوو ژیرییەکەی**

ئەحنەف پیاوێکی ژیرو سەنگین بووە، وتویەتی: (هەرکەسێ چوار رەوشتی هەبێ ئەو کەڵەپیاوی تیرەکەی خۆیەتی، ١ـ گەر دیندار بێتو دینەکەی رێگری خراپەی لێ بکات، ٢ـ رەچەڵەکی هەبێو پارێزگاریی لێ بکات، بە ئاکاری جوان، ٣ـ ئاوەزایەکی هەبێ سەرپەرشتی بکات، ٤ـ شەرمی هەبێو بیگەڕێنێتەوە)[2]، دیسان دەڵێ: (عەقڵ باشترین هاودەمە، ئەدەب باشترین کەلەپوورە هاوکاری باشترین نەرمو نیاییە)[3]، دەڵێ: (هەرگیز باسی هیچ کەسێکم بە خراپی نەکردووە لە پاشملە)، کاتێ ناوی کەسێکیان ببردایە لەلای دەیوت: (وازی لێ بێنن رزقی خۆی دەخواتو ئاکامی خۆی تەواو دەکات)[4].

برازایەکی هەبوو ددانی دەئێشتاو هاواری دەکرد، ئەحنەف وتی: (ماوەی سی ساڵە چاوم ئازاری هەیەو باش نابینێ لای کەس باسم نەکردووەو هاوارم نەکردووە)[5]، دەڵێ: (هەرکەسێ سەرەگڵەی کردبێت لەگەڵما بەشێوازی خۆم وەڵامم داوەتەوە، ئەگەر لەسەرو خۆمەوە بێت رێزم لێ گرتووە ئەگەر لەخوار خۆمەوە بێت، سۆزم بۆی جولاوەو بە بەزەیی

---

[1] المصدر نفسه ص(٣٠٦).

[2] المصدر نفسه ص(٣٠٦).

[3] تهذیب ابن عساکر (١٩/٧).

[4] المصدر نفسه (٢١/٧).

[5] المصدر نفسه (١٦/٧).

بووم، لەگەڵیا ئەگەر هاوشانی خۆم بووبێت بە هێمنیو لەسەرخۆیی فەزڵی خۆمم داوە بەسەریا)[1].

### ٣ـ زانستەکەی

زانایەکی متمانەدارو بێخەوشو کەم نوتق بووەو لە ئیمامی عومەرو عوسمانو عەلیو ئەبو زەڕ[2] فەرمودەی ریوایەت کردووە، حەسەنی بەسریو عوروەی کوڕی زوبێریش فەرمودەیان لێ ریوایەت کردووە، لەسەردەمی مەعاویەدا یەکێك بووە لە شەرعزانەکان.

### ٤ـ داناییەکەی

پیاوێکی داناو پڕ حیکمەت بووەو ئامۆژگاریی بەپێزی خەڵکی کردووە، پرسیاریان لێ کرد (جوامێری چییە؟) وتی: "لەخودا ترسانو خۆگرییە"، ماوەیەك بێدەنگ بوو پاشان وتی: "گەر کەسێ ڕوخساری جوان بێ، بەڵام لێبوردنی نەبێت جوانییەکەی پەرێشانە، باشترین رەوشت بۆ گەنج ئەوەیە، کە لە خودا ترس و لێبوردە بێت"[3].

هەروەها دەڵێ: "چڵەپۆپەی ڕەوشتبەرزی لە شێوزای ئاخاوتندا دەردەکەوێت، گوتن هیچ خێرێکی تیا نییە هەتا کردەوەی بەدوادا نەیەت، رووخساری جوان بەبێ مەعریفەت هیچی تیا بەسەر نییە، هیچ سامانێ بەبێ بەخشندەیی کەڵکی نییە، هاوڕێیەتی بەبێ وەفا سوودی نییە، شەرعزانی بەبێ تەقوا پاداشتی نییە، خێرو سەدەقە بەبێ نیەتپاکی قبوڵ نییە"[4]

دەڵێ: "هەر چاکەیەکم بۆ لوابێت لەشوێنو کاتی خۆیدا پێشوازیم لێ کردووە"[5]، دەڵێ: "پێکەنینی زۆر سامو شکۆیی خاوەنەکەی دەبات، سوعبەتی زۆر جوامێری خاوەنەکەی کاڵ دەکاتەوە، هەرکەسێ تەشك بە هەرکارێکەوە بگرێ، ئەوکارە دەبێتە

---

[1] قادة فتح السند وأفغانستان ص(٣٠٧).

[2] طبقات ابن سعد (٩٣/٧).

[3] المصدر نفسه.

[4] تهذيب ابن عساكر (١٩/٧، ٢٠)

[5] البداية النهاية (٣٣١/٧).

ناونیشیانی"[1]، دەڵێ: "ئافرەتو چێشت دوورخەنەوە لە کۆڕو کۆمەڵمان، چونکە من ڕقمە لەو کەسەی کە بەژنانیو ورگن ناسراوە، لای من جوامێرییە پیاو بتوانێ خۆی بگرێ لە حەنای خواردنو چێشت بەتایبەتی ئەوکاتانەی کە حەزی لێیەتیو برسییەتی"[2]، دەڵێ: "گەورەیی مرۆڤ لەوەدایە هاونشینی ڕەشوروتەکان بێت، هەرکەسێ لەسەر زمانی عامەی خەڵك نەبێتە گەورە، بە زمانی کەسانێ یان تاقمێ نابێتە گەورە"[3].

**٥- زمان پاروییەکەی**

مرۆڤێکی خۆشخوانو شیرین کەلام بووە[4] جارێکیان وتاری دەداو گوتی: "پاش سوپاسو ستایشی خودای گەورە، ئەی کۆمەڵی تیرەی ئەزدیو ربیعە ئێوە برای دینی ئێمەنو لە باواندا هاوبەشمانو برای ڕاستیمانن لەرەچەڵەكو داهاتو موڵکدا دراوسێمانو بۆ دوژمنان پشتیوانمانن، وەڵڵاهی ئەزدی بەسرە لە تەمیمی کوفە بەرێز ترە لەلام، ئەزدی کوفە لە تەمیمی شام بەڕێزترە لەلام ئەگەر لیزگی حەسوودی لە سنگتان هەڵبێت بێگومانبن سامانو دارایی ئێمە فراوانە بۆ هەردولامان"[5].

لە ڕاستیدا ئەحنەف قسە قوتو بەڵگە ڕۆشن و مەنتیق زان بووە، جارێکیات هات بۆ سوڵحی کێشەی خوێن، دانیشتوان دەستیان کرد بە گفتوگۆ وتیان دوو خوێنی لێ دەسێنین، ئەحنەفیش وتی: ئەم حوکمە تەنیا بۆخۆتانەو نابێتە بڕیارێکی گشتیی، پاشان بێدەنگ وتی: "ئەو تۆڵەیەی دەتانەوێ من دەتان دەمێ بەس شتێکتان پێ دەڵێم، خودای گەورە بڕیاریداوە خوێنی لەباتی خوێنێك، پێغەمبەریش ﷺ بە هەمان شێوە یەك خوێنی داناوە، کەچی ئێوە دوو خوێن داوا دەکەن ئەی ناترسن یەکێ لە ئێوە

---

[1] وفيات الأعيان لابن خلكان ص(١٨٧/٢).
[2] وفيات الأعيان (١٨٨/٢).
[3] قادة فتح السند وأفغانستان ص(٣٠٩).
[4] المصدر نفسه.
[5] المصدر نفسه.

خوێنێك بڕژێنیو تۆڵەتان لێ بسەنرێ ئەوکاتە خەڵکی لێتان خۆش نابێت هەتا ئەم دەستوورەی خۆتان جێبەجێ نەکەن بەسەرتاندا؟ وتیان با بەیەك خوێن واز بێنن"[1].

جارێکیان ئەحنەف گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت نایەبە خەیاڵمدا وەسفم کەن یان لۆمەم بکەن، ئەحنەف وتی: "بەڕاستی تۆ ئەرخەیانی لەو گرێیەی کە ماقوڵانی شەکەت کردووە"[2].

### ٦- خۆنەویستیو نتمییەکەی

ئەحنەف هەرچی بۆخۆی پێی خۆشبوایە بۆ خەڵکیش پێی خۆشبوو، تەنانەت ئەرکی خەڵکی دەخستە سەرشانی خۆیو لە چاکەو پیاوەتیدا دەروونی خۆی پاکژ کردبووەوە، بە پاکی هەرەوەزی کەسانی تری دەکرد، کاتێ ئەحنەف هات بۆ لای ئیمامی عومەر لە شاری مەدینە ئیمامی عومەر خەلاتێکی پێشکەش کرد وتی: (ئەی ئەمیری ئیمانداران وەڵڵاهی ئێمە بیابانو هەردمان نەبڕیوە شەوو ڕۆژمان نەچڕیوە بۆ خەلاتو دیاری، من ئاتاجم پێی نییە)، بەم هەڵوێستە چاکیو پاکی ئەحنەف پتر بوو[3].

### ٧- بەسپاردەییەکەی

ئەحنەف بە سپاردەبووە، نموونەی سپاردەپارێزبوو، وەکو زووتر باسمان کرد کاتێ برازاکەی لەئاشتەوایی ئەهلی بەڵخدا بڕێکی زۆر قاپی ئاڵتونو زیوو پارەو کەلوپەلو پۆشاکی هێنایە بەردەستی، ئەحنەفیش پرسیاری ئەم شمەکانەی کرد، برازاکەی گفتوگۆکەی بۆ گێڕایەوە (کە بەڵخییەکان لە جەژنانەی میهرەجانی خۆیاندا[4] بە دیاری هێناویانە بۆیانو ئەمیش بەترسو لەرزەوە گلی داوەتەوە ئاخۆ حەڵاڵە یان حەرام) ئەحنەفیش پرسیاری لێکردن هەمان وەڵامیان دایەوە، وتی: (بیبەن بۆ خزمەتی ڕابەری گشتی لەشکرەکان، عەبدوڵڵای کوڕی عامر بە جوانی بۆی باس بکەن)، عەبدوڵڵا وتی: (ئەی ئەحنەف ئەمانە وەرگرە هی تۆیە)، ئەویش وتی: (من پێویستم پێی نییە)،

---

[1] وفات الأعيان (٢/١٨١).

[2] المصدر نفسه.

[3] تهذيب ابن عساكر (٧/١٢).

[4] جەژنێکی فارسەکانە.

ئەحنەف زۆر قەڵس بوو بە خەڵاتو دیاری تەنیا پشکی غەنیمەی وەردەگرتو چاوبرسی نەبوو[1].

**٨ـ هێواشیو ئەسپاییەکەی**

ئەحنەف زۆر هێواشو بەئەسپایی بوو، دەستی نەئەبردە هیچ کارێ هەتا هەزار لێکدانەوەی بۆ نەکردایە، وتیان ئەی ئەبو بەحر تۆ خاوو هێواشی، وتی: (من دەروونی خۆم لەسەر سێ شت راهێناوە، کە پەلەپروزەیان بۆ بکەم، ١ـ نوێژکردن کە هاتەپێش دوای نەخەم، ٢ـ ناشتنی جەنازە لە کاتی خۆی ئەسپەردەی بکەم، ٣ـ بەشودانی کچ ئەگەر کەسێکی هاوتای خۆی هاتە خوازبێنی لێی مارە بکەم)[2].

**٩ـ لەخواترسانو خۆپارێزییەکەی**

ئەحنەف ئیماندارێکی لەخواترسو خۆپارێز بوو بە گورجی هاتە ئامێزی ئایینی ئیسلامو هۆزەکەیشی بە رێنماییەکانی موسڵمانان بوون[3] ئەحنەف ببووە بانگخوازەکانی بەرایی بە ئەوپەڕی هێزو بزێوییەوە، لەسەر بیروباوەڕی خۆی چەسپاوەوبوو بەتایبەتی لەوکاتەی کە زۆربەی عەرەبەکان لەدوای کۆچی پێغەمبەر ﷺ هەڵگەڕانەوە، لە ژیانیدا بەچاکی تێکۆشاوە بۆ بەرگریو بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامو لەم پێناوەدا سەختترین ناسۆری چەشتووە، حەسەنی بەسری دەڵێ: (هیچ کەسێکم نەدیوە ئەوەندەی ئەحنەف هێژاو بەڕێز بێت)[4]، ئەحنەف دەڵێ: (عومەری خەتاب ماوەی ساڵێ لای خۆی گلی دامەوە لە شاری مەدینەو هەموو شەوو ڕۆژێك سەردانی دەکرد، هیچ کارو گوتارێکی خراپی تیا بەدی نەکردم)[5].

زۆر بە وردی تاقیکرایەوەو لە پاڵاوتنی ئیمامی عومەر سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئیمامی عومەر نوسراوێکی پیادا نارد بۆ ئەمیری بەسرە[6] و نووسیبووی (ئەحنەف

---

[1] قادة فتح المسند وأفغانستان ص(٣١٣).

[2] طبقات ابن سعد (٩٦/٧).

[3] شذرات الذهب في أخبار من ذهب ـ أبو فلاح عبدالحي (٧٨/١).

[4] البداية والنهاية (٣٣١/٧).

[5] قادة فتح المسند وأفغانستان ص(٣١٤).

[6] المصدر نفسه (٣١٤).

بەڕێزو پیاوماقوڵی ئەهلی بەسرەیەو ئەبو موسای ئەشعەری ئاگادار کردبوو کە راوێژ لەگەڵ ئەحنەفدا بکات بۆ کارەکانی‌و گوێ بۆ قسەی بگرێت)، ئیمامی عومەر دوای سەرکەوتنەکەی رووبەڕوو پێی وت: (تۆم تاقیکردەوەو هەڵم سەنگاندیت، جگە لە چاکەکاری هیچی ترم تیا بەدی نەکردی، بۆم دەرکەوت ئاشکراکانت چاکە، تکا دەکەم پەنهانییەکانیشت وەکو ئاشکراکانت بێت)[1].

بەڕاستی ئەحنەف پیاوێکی ڕاساڵ بوو، شەوانە شەونوێژی دەکردو هەتا بەری بەیانی دەگریا، پەنجەی دەخستە سەر چراکەی‌و دەیوت بە نەفسی خۆی: (گەر تۆ لەسەر ئاگری ئەم چرایە خۆت پێ نەگیرێ ئیدی چۆن لەسەر ئاگری پڕکڵپەی دۆزەخ خۆت رادەگریت؟!)[2]. وتیان پێی تۆ زۆر رۆژوو دەگریت گەدەت تەنك دەبێت‌و بریندار دەبێت، وتی: من سازی دەدەم بۆ سەفەرێکی پڕ برسییەتی‌و دووردرێژ[3]، ئەحنەف کرا بە سەرۆکی خۆراسان لەکاتی شەڕی فارسەکاندا، شەوێکی کڕێوە تووشی لەشگرانی بوو هەموو سەربازو پاسەوانەکانی خەتبوون هەستا گەرا بەدوای ئاودا پێی چوو بە چڵێکدا خوێن لە قاچی هات، هەرکوڵی نەدا هەندێ بەفری دەستکەوت وردی کردو خۆوی پێ شۆرد[4]، هەرکاتێ لای چۆڵ بوایە داوای قورئانی دەکرد، وەکو پێشی نانی خۆی، لە نزاکانیدا دەیوت: (ئەی خودایە ئەگەر لێم خۆش ببیت ئەوە خۆت باشی لێدەزانی، ئەگەر سزاشم بدەیت هەر خۆت باشی لێدەزانی)، نزایەکی تری ئەمەبوو: (ئەی خودایە دڵنیاییەکی وەهام پێ ببەخشە زەحمەتەکانی دونیام لەلا ئاسان بکات)، جارێك جەنازەیەك درا بەلایدا، وتی: (رەحمەتی خودا لەو کەسەی نەفسی خۆی ئامادە دەکات بۆ رۆژکی ئاوەها)[5]، وتویەتی (سەرم سوڕدەمێنێ لەو مرۆڤەی کە دووجار بە بۆری میزدا هاتووە کەچی لە خۆی بایی‌ییەو فیز دەکات)[6].

---

[1] طبقات ابن سعيد (٧/٩٤).

[2] البداية والنهاية (٧/٣٣١).

[3] طبقات ابن سعيد (٧/٩٤).

[4] المصدر نفسه (٧/٩٤).

[5] تهذيب ابن عساكر (٧/١٦).

[6] البداية والنهاية (٧/٣٣١).

ئەم خاڵانە هەندێك بوو لە ڕەوشتە دانسقەکانی ئەحنەف، کە هەموو خەڵکی خۆشیان دەویستو متمانەیان پێی هەبوو بە چاوی ڕێزەوە تەماشایان دەکرد، بێگومان ئەم ڕەوشتانە لە هەرکەسێکدا بخەملێ دەبێتە خاوەن کەسایەتییەکی بەهێزو ناوی لە هەموو کاتو شوێنێکدا دەگەشێتەوە، زۆر بە دەگمەن زەمان دەبێتە خاوەنی کەسایەتی وەکو ئەحنەف[1]، لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا ڕابەری فتوحات بوو لە کاری فەرماندەییدا سەرتەڵ بوو ڕزگارکەری وڵاتانی خۆرهەڵات بوو، لە نەخشەکێشان و دەرکردنی بڕیاری خێرادا سەرکەوتوو بوو لە پێشی پێشەوەی لەشکردا بووە، بەم هیممەتە بەرزانە پلانو بڕیارە سەربازییەکانی دەردەکرد لە بواری کردەییدا شوێنەوارێکی کاریگەری بەجێ هێشتووە، چونکە لە کاتی بڕیاردا ئەوپەڕی توانای خۆی خستووەتە کارو ڕاوێژی کردووە بە دونیادییەکان، بەڵکو شەوانە بە نهێنی گەشتی کردووە بەناو سەربازەکانداو گوێی گرتووە لە ڕاوبۆچوونیان ئەگەر بۆچونێکی شیاوی بەرگوێ بکەوتایە دەستبەجێ کاری پێدەکرد، گرنگ نەبوو بەلایەوە حیکمەت لە چ دەفرێکدایە، ئەم فەرماندەیە لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا بە ئاوەزوو بە شمشێرەکەی پێکەوە دوژمنی دەشکاند، سەکۆیەکی مەزنی گرتبوو لە دلێریو بوێری، چەندین جار خۆی ئێشکی دەگرت بۆ ئەوەی سەربازەکانی بە ئاسوودەیی بخەون زۆر بەهرەدار بوو لە خۆشاردنەوەدا، خۆیو لەشکرەکەی لە زۆر ناسۆریو ناڕەحەتییەك لاداوە[2].

ئەحنەف پیاوێکی مەزن بوو لە پیاوەکانی ئوممەتی ئیسلام، ئوممەتێك بوو لەناو پیاوانداو سەرۆكو ڕابەری ئەهلی خۆرهەڵات بوو، وەکو ئیمامی عومەر پێی دەوت تۆ گەورەو سەرۆکی[3].

باسی ئەحنەف درێژەی پێدرا، بەڵام شایانیەتی، چونکە جوان مەردێکە لەفەرماندەکانی فتوحاتی سەردەمی ئیمامی عوسمانو یەکێك بوو لە ڕێکخەرانی ژیانی سەردەمی خەلیفەی سێیەم، قوڕبەسەری ئەوانەی تیرەلارو وێرەکانیان دەگرنە خەلافەتی ئیمامی عوسمانو فەرماندە شۆڕشگێڕەکانی، بۆ نموونە ئەحنەف.

---

[1] قادة فتح السند وأفغانستان، ص(٣١٦).

[2] المصدر نفسه (٣٢٠).

[3] المصدر نفسه (٣٢٢).

## باسی دووەم: فتوحاتەکانی شام

### یەکەم: فتوحاتی حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فەهری

وەکو پێشتر باسمان کرد لە سەرەتای دەستبەکاربوونی ئیمامی عوسماندا ڕۆمەکان مرخیان لە موسوڵمانان خۆش کردبوو بە ئاپۆڕایەکی زۆرەوە، بۆیە ئیمامی عوسمان نامەی نووسی بۆ وەلیدی کوڕی عەقبە کە یارمەتی برایانی شام بدات، ئەویش بە هەشت هەزار سەرباز یارمەتی دا بە قیادەیی سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی باهیلی، توانییان زەفەر بە ڕۆمەکان بەرنو دەریانکەن لە خاکی خۆیان هەندێکیان دەستبەسەر کردو دەستکەوتیان لێ گرتن، جارێکی تر ڕۆمەکان لەگەڵ تورکەکان گەلەکۆمەیان کرد بۆ لێدانی موسوڵمانان لە تۆڵەی ئەرمینیەدا کە موسوڵمانان فەتحیان کردبوو، حەبیبی مەسلەمەش پلانی بۆ داوەکەی دوژمنان داڕشتو شەو چووە سەر (مرویانی) سەرکردەیان کاتێ خێزانەکەی حەبیب ئەم نەخشەیەی بیست وتی: بەڵێنی چیت داوە؟ حەبیب وتی: یا سورادیقەی مرۆیانی یان بەهەشت.. کە شەو داهات چووە سەر مۆریانی سەرکردە هێنایە دەر، پاشان ژنەکەی خەبەری بوویەوە سەیرکا مێردەکەی لەماڵ نەماوە، حەبیب تێکۆشانەکانی بەرێکوپێکی ئەنجامداوەو سەرکەوتنی لە ناوچەکانی ئەرمینییەو ئازربایجان بە سوڵح و بە کوشتار بەدەستی هێناوە[1]، حەبیب یەکێکە لە فەرماندە دیارەکانی شەڕی ئەرمینییەو بیزەنتینییەکانو لە خەباتیدا سوپایەکی زەبەلاحی دوژمنی تێکۆپێك شکاندووەو بڕی قەلاو شاری گەورەی ڕزگار کردووە، هەروەها غەزای شەڕەنگێزەکانی عێراقی کردووە، وە لە دەڤەریی ڕۆمدا کۆمەڵێ قەڵای ڕزگار کردووە[2]، وەکو شمشانو مەلاتیە.. هتد.

لە ساڵی (٢٥) کۆچی مەعاویەش غەزای ڕۆمەکانی کرد هەتا (عەموریە)ی گرت واتە ئەو قەڵایەی کە دەکەوێتە نێوان ئەنتاکییەو تەرتوسەوە، لەوێدا کۆمەڵێك لە خەڵکی شامو جەزیرەی ئەسیر کرد، لە هاوینی داهاتووشدا قەیسی کوڕی حوری

---

[1] الدولة الأسلامية في عصر الخلفاء الراشدين ـ حمد شاهين، ص(٢٥٢).

[2] حروب الاسلام في الشام في عهود الخلفاء الراشدين ـ محمد أحمد باشميل ص(٥٧٧).

عەبەسی غەزاکانی تری رۆمییەکانی کردو دوای شەڕ هەندێ قەڵای نزیکی ئەنتاکییەی رووخاند، بۆ ئەوەی بە کەڵکی رۆمەکان نەیەت[1].

**دووەم: یەکەمین کەسێ کە مۆڵەتی شەڕی دەریاییدا ئیمامی عوسمان بوو**

کاتێ مەعاویەی ئەبی سوفیان ئەمیری شام بوو، ڕووی نا لە ئیمامی عومەرو پێداگری کرد. کە شەڕی دەریایی بکات. لەگەل رۆمەکان، چونکە زۆر نزیکن لە شاری حیمصەوە تەنانەت گوندەکانی حیمص گوێیان لە وەڕەی سەگو قوقەی کەڵەشێر رۆمەکانە، دەیویست ئیمامی عومەر رازی بکات، ئەویش نوسراوێکی نووسی بۆ عەمری کوڕی عاص داوای لێ کرد باسی بارودۆخی دەریاو دەریاوانی بۆ بنووسێت، ئیمامی عومەر نووسیبووی لە بارەی دەریاوە من دەرونم کینگڵ دەخوات، عەمریش بۆی نوسی (من ئەوەندەی دەزانم دروستکراوێکی بچووك، کە مرۆڤە سواری دروستکراوێکی گەورە دەبێت، هەرکە چووە ناوی دڵی پەل پەل دەبێت، وەختێ ئەزنەکیدا بچێ عەقڵی لادەچێ، لە دەریادا متمانەکەم دەبێتەوەو گومان زۆر دەبێت ئەو مرۆڤە وەکو کرمێ بە پیرەدارێکەوە بێ ئاوەهایە ئەگەر ئەملاولا بکات نغرۆ دەبێت، ئەگەر پەڕییەوە ئەبڵەق دەبێت).

ئەم وەڵامە وای کرد لە ئیمامی عومەر شەڕی دەریا قەدەغە بکاتو نووسی بۆ مەعاویە (نەخێر سوێند بەو کەسەی موحەممەدی بەراستی ناردووە هیچ موسڵمانێ ناخەمە ناو دەریا، وەڵاهی تاکە موسڵمانێکم لە هەموو کولورو گەنجێنەی رۆم لەلا بەرێزترە، وریابە پێشنیاری کاری وام لا مەکە، خۆت باشدەزانی چەندین جار داوای ئەم کارەم لێ کراوە بەڵام رێگەم نەداوە)[2]، ئەم خواستە لە ناخی مەعاویەدا هەر دەرنەچووبوو سەرەڕای تالاوی رۆمەکان کە دەهات بە روویداو زۆر مەبەستی بوو شارەکانیان فەتح بکات، بۆیە لە خەلافەتی ئیمامی عوسماندا مەعاویە پێشنیارەکەی جارێکی تر خستە بەرباسو لێکۆڵینەوە لای ئیمامی عوسمان، ئەویش وتی: (خۆت شاهیدی ئیمامی عومەر چۆن وەڵامی دایتەوە لە بارەی شەڕی دەریاوە)، جارێکی تر

---

[1] الدولة الأسلامية في عصر الخلفاء الراشدين، ص(٢٥٣).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٥٨).

نوسراوێکی نووسی بۆ ئیمامی عوسمان‌و باسی ئاسان پەڕینەوەی دەریای بۆ کرد بۆ قوبروص، ئەویش نووسی (ئەگەر خاوخێزانەکەی خۆت دەخەیتە دەریاوە ئەوا مۆڵەتت دەدەم شەڕی دەریایی بکەیت ئەگینا نابێ بچیتە ناوی‌و بپەڕیتەوە)[1].

هەروەها ئەم مەرجەشی بۆ معاویە دانا (هیچ سەربازێك نەبات بە خۆشی خۆی نەبێت‌و ئازادی رایان بداتێ، پاشان ئەوانەی کە حەزدەکەن تیروپشکیان بۆ بکات، یەك سەرباز هەڵنەبژێری بە کەیفی سەربازەکە نەبێ)، کاتێ معاویە وەڵامەکەی بەدەست گەیشت دەستی کرد بە پەڕینەوە بەرەو قوبروص[2] و خەڵکی قەراغ دەریای ئاگادارکردەوە کە بەلەمەکان ئامادەباش بکەن‌و نزیکی رۆخی دەریای بکەنەوە بەتایبەتی بۆ قەراغی قەڵای عەکا، بۆ ئەوەی ببێتە هەوارگەی مانەوەی سەربازەکان، بەم چەشنە مەعاویە کەسی بەتۆبزی نەبردو سوپایەکی گەورەی کردە ئەو بەرەوە بۆ شەڕ کردن[3]، ئەم کرداری پەڕینەوە بەڵگەو نموونەیە کە موسڵمانان دوونیاو لەزەتەکانی دونیا لەلایان بێبایەخ بووە، هەرگیز بۆی نەکۆشاون، هەرچەندە دەرگاکانی دونیایان بە تەواو لێ کرابووەوەو نازو نیعمەتەکانی رژابوو بەسەریاندا، چونکە وا گۆشکرابوون، کە نازو لە زەتەکانی خودای گەورە باشترو بەردەوامترە تا هی دونیا، ئەم شاندە بۆ سەرخستنی ئیسلام‌و بەرپاکردنی دادوەری‌و بڵاوکردنەوەی پەیامی چاکسازیی دروست کرابوون‌و هەڵبژێردرابوون‌و بە ڕاشکاوی دینیان جێبەجێ دەکرد بۆ ئەوەی دوژمنان کوێرایی بەسەر چاویاندا بێت، بیروڕوایان وابوو ناوەڕۆکی ئەم پەیامە راست‌و دروستە بریتییە لە تێکۆشان لە پێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودای گەورەدا، خۆ ئەگەر کەمتەرخەمییەکیان کردبایە لە گەیاندنی ئیسلامدا تەمەڵییان کردبایە بەبێ هۆ، خودای گەورە سەربەرزی دونیای لێ دەسەندنەوەو لە رۆژی پەسڵانیشدا لە پاداشت بێبەشی دەکردن، بۆیە لەم ئەرکە پیرۆزەدا کێبڕکێیان دەکردو لە پێشی معاویەوەبوون.

پێدەچێ فەرمودەکەی ئومو حەرام لە دڵی معاویەدا گەشەی کردبێ و لە ئەندێشەیاندا ڕەنگی دابێتەوەو پاڵی پێوە نابێت بۆچوونە ناو دەریاو غەزاکردن‌و بە

---

[1] الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٥٣٨).

[2] المصدر نفسه (٢/٥٣٨).

[3] جولة تاريخية في عصر خلفاء الراشدين، ص (٣٥٨).

موعجیزەی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەم غەزایەش کەوتە کۆتایی زستانی ساڵی بیستو هەشتی کۆچی بەرامبەر (٦٤٩) زاینی[١]، بەم چەشنە موسڵمانان لە شامەوە بەرەو قوبروص چوونو لە مینای عەکا دابەزینو ئومو حەرام کەوتە خواروو ملی شکاو مرد[٢] لە دورگەکە ناشتیان، مردنەکەی بوو بە ناونیشانی ئەو فیداکارییەی کە موسڵمانان بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام بەخشییان، تا ئێستاش گۆڕەکەی دیارەو پێی دەوترێ (گۆڕی ئافرەتە راساڵەکە)[٣].

پێشی ئەم غەزایە مەعاویە کۆبوونەوەی کرد بە هاوەڵانو راوێژی کرد بەم کەڵەپیاوانە (ئەبو ئەیوبی خالیدی زەیدی ئەنصاری، ئەبودەردا، ئەبوزەڕی غیفاری، عوبادەی کوڕی صامت، وائسیلەی ئوسقوف، عەبدوڵڵای کوڕی بوشری مازنیو شەدادی کوڕی ئەوسو میقدادی ئەسوەدو کەعبی حیبرو جوبەیری کوڕی نەفیر)[٤]، هەنگاوی یەکەم نامەیان نارد بۆ خەڵکی قوربوسو بۆیان رۆشنکردنەوە کە ئێمە بۆ دەستبەسەراگرتنی دورگەی قوبروس غەزاتان لەگەڵ ناکەین[٥]، بەڵکو دەمانەوێ بانگهێشتتان بکەین بۆ ئایینی خوداو پاراستنی سنووری وڵاتی ئیسلام لە شامدا، هەروەها بیزەنتییەکان بنکەیان لە ناوچەی ئێوەدا داناوەو لە کاتی لەشکرکێشیدا لای ئێوە پشوو دەدەنو خەڵکی ئێوەش لەگەڵ خۆیان راپێچی شەڕ دەکەن، بەم چەشنە ئێوە هەڕەشەن بۆ وڵاتانی شامو مەترسیتان لێ دەکرێ، کەواتە ئەگەر موسڵمانان لە بێوەیی دوورگەکەتان دڵ ئارام نەبنو نەتان خەنە ژێر رکێفی خۆیان ئەوا دەبنە خنجەرێکی ژەهراوی لە پشتیانەوە[٦].

لە وەڵامدا دانیشتوانی دورگەکە تەسلیمی ئیرادەی شۆڕشگێڕەکانی ئیسلام نەبوونو وڵاتی خۆیان خامۆش نەکرد، بەڵکو خۆیان لە قەلاکانیان قایم کردو رووبەڕوو بوونەوەیان

---

[١] المصدر نفسه.

[٢] البداية والنهاية (١٥٩/٧).

[٣] جولة تأريخية في عصر خلفاء الراشدين، ص (٣٥٩).

[٤] المصدر نفسه.

[٥] المصدر نفسه.

[٦] المصدر نفسه.

هەڵبژارد، چونکە چاوەڕوانی ڕۆمەکان بوون بەرگرییان لێ بکەنو پشتیوانییان لێ بکەن[1].

**سێیەم: خۆبەدەستەوەدانو سوڵح کردن**

موسڵمانان بەرەو پایتەختی قوبروس کە (قوستەنتینیە)یە ملیان ناو لە چەند کاژێرێکی کەمدا ئابلوقەیاندا، بەڵام خەڵکەکەی داوای سوڵحیان کرد ئەوانیش ڕازی بوونو چەند مەرجێکیان بۆ دانان لە بەرامبەر مەرجەکانی ئەواندا مەرجی قوبروسییەکانیش ئەوەبوو کە موسڵمانان داوایان لێ نەکەن بەرانبەر ڕۆمەکان شەڕ بکەن، چونکە چاریان ناکەنو لە گۆڕیان نایەن، بەڵام مەرجی موسڵمانەکان ئەمانە بوو:

١ـ ئەگەر خەڵکی دورگەی قوبروس هێرشیان بردە سەر دوژمن موسڵمانان لەسەریان ناکەنەوە.

٢ـ موسڵمانان ئاگادار بکەنەوە لە جموجوڵی ڕۆمەکان.

٣ـ ساڵانە حەوت هەزارو دووسەد دینار بدەن.

٤ـ موسڵمانان لە ریگەی دوورگەی قوبروسەوە پەلاماری دوژمنانی خۆی بدات.

٥ـ یارمەتی ڕۆمەکان نەدەنو نهێنییان بۆ ئاشکرا نەکەن، گەر مەرامیان هەبوو لە دوای ئەم سوڵحە موسڵمانان گەرانەوە بۆ وڵاتی شام[2].

ئەم هەڵمەتە سەلماندی کە موسڵمانان لە شەڕی دەریاییدا بەتواناو لێهاتوون، هەروەها هەلێکی باشی رەخساند بۆ ئەزماندی موجاهیدان کە لەمەودوا بچنە نێو شەڕی دەریاررەوە لەگەڵ وڵاتەکانی چواردەوری شامدا یان وڵاتانی[3].

**چوارەم: عەبدوڵڵای کوڕی قەیس فەرماندەی کەشتییە ئیسلامییەکان بوو لە شامدا**

معاویە عەبدوڵڵای کوڕی قەیسی هاوپەیمانی تیرەی فەزارەی کردە سەردەستەی شەڕی دەریایی، ئەویش پەنجا غەزای دەریایی کرد، لە نێوان شاتییۆەو شافییەداو هیچ سەربازێکی نغرۆ نەکرد، تەنانەت نەکەوتە ئاوەکەشو هەمیشە لە خودا دەپاڕایەوە سەلامەتی و ئاسودەیی بکاتە بەشی سەربازەکانیو بە ترسو بیمی دەریا تاقییان نەکاتەوە، خودای گەورەش بەدڵی ئەوی کرد.

---

[1] المصدر نفسه.

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٦١).

[3] جولة تاريخية في عصر خلفاء الراشدين، ص (٣٥٨ ـ ٣٥٩).

جارێك خۆی بە تەنها ڕۆیشت بۆ نزیکی دوژمن، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە ناوچەی (مەرفا)ی وڵاتی ڕۆمەکان لەوێدا سواڵکەرەکانی مەرفای بەداماوی بینیو بە کزوماتی دانیشتبوون، عەبدوڵڵا بەزەیی جۆشاو خێری پێکردن، ژنێك لە سواڵکەرەکان گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆیو وتی: بە پیاوەکانی ئاوایی دەنگوباسی عەبدوڵڵا دەزانن؟ وتیان لە کوێیە؟ وتی: لە (مەرفایە)، وتیان: ئەی دوژمنی خودا تۆ چۆن عەبدوڵڵا دەناسی؟ ئەویش ترساندیو تورەی کردن وتی: ئێوە زۆر لەوە کەمترن عەبدوڵڵا بترسێ لێتان، ئەوانیش بە جارێ خرۆشانو هێرشیان هێنایە سەری، ئەویش هەتاتوانێ درێغی لە شەڕکردنیان نەکرد، بەڵام عەبدوڵڵا پێکرا، زۆری پێ نەچوو ترازوی شەڕ بەودیودا هەستایەوە هاوەڵانی عەبدوڵڵا بە لێشاو هاتن بەسەرۆکایەتی سوفیانی کوڕی عەوفی ئەزدی، کە جێگری عەبدوڵڵا بوو تێك ڕژانو بەشەڕ هاتن، سوفیانیش خۆش خۆش گاڵتەی بە سەربازەکانی دەکردو تەشەری لێ دەدان، بۆ ئەوەی دەماخیان گەرمبێتو زیاتر هەڵبچن، لەناکاو کەنیزەکەکەی عەبدوڵڵا وتی: ئەی هاوار عەبدوڵڵا شەهید بوو، سوفیان وتی: دەڵێی چی؟ وتی: دەڵێم بە تەوژم پەلاماریان بدەن دادەماڵرێن، سوفیان بەبێ لوتبەرزی وازی لە نەخشەکانی خۆی هێناو چووە سەر پلانی تەوژم بردنو بە جارێ لەناویان بردن، مسوڵمانان لەو شەڕەدا تەزینو شەڕەکە بووبە دوا ساتی تەمەنی عەبدوڵڵاش[1].

وترا بەو ژنەی کە ڕۆمەکانی خرۆشاندە سەر عەبدوڵڵا، چۆن عەبدوڵڵات ناسی؟ وتی: کاتێ داوای خێرم لێکرد وەکو بازرگان وابوو، کاتێ بەشی دام وەکو پادشا وابوو، تێگەیشتم ئەمە عەبدوڵڵای قەیسە[2].

خودای گەورە بەم چەشنە ویستی عەبدوڵڵا بێگەیەنێ بە شەهیدیو بۆیە دەرفەتی بۆ ڕەخساند لەم شەڕەدا شەهید ببێ و سومعەی موسڵمانان لە شەڕی دەریاییدا لەکەدار نەبێت، عەبدوڵڵا خۆی بە تاقی تەنیا کەوتبووە پەیجوری دوژمنو سۆراغی دەکردن، بەڵام ئەو ژنە بە وردی تەماشای کردو دەرکی پێکردو بوو بە سیخوڕی، لە بینینی یەکەمدا ڕواڵەتی لە بازرگانێکی ئاسایی دەچوو، لە دووەمدا وەکو پادشایەك دەستی

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٦٠).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٦٠).

درپییەوە لەو حاڵەتەدا هێمای سەرکردەکەی‌و رابەرییەکەی ئاشکرابوو، ئەم ژنە دەیزانی ئەم فەرماندە دوژمنەکانی خۆی داغان دەکات‌و پیاوێکی چاونەترسە، ئەم رابەرە سیاسییە لەگەڵ بێباوەڕانیشدا ئەوەندە دڵفراوان‌و بەخشندە بوو هەتا خۆی‌و بارەگاکانیشی بۆ دوژمن ئاشکرا کرد، بێگومان ویستی خودای گەورە لەم شەهیدییەدا دەبوو هەر جێبەجێ ببێت، چونکە خودای گەورە کردبووی بە خەلاتی، ڕابەرانی ئیسلامی هەمیشە نموونەی هەر بەرزیان بە خودی خۆیان تۆمار کردووە بۆ ئەوەی سەرکەوتنی بالاّ لەسەر دەستی ئەوان بەدی بێت‌و گیانی خۆیان بەخت بکەن، پێشەنگی چاکە بۆ پاشینەکانی خۆیان، بڕوانە ئەم فەرماندە جەربەزە بەخودی خۆی هەستاوە بە کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی دوژمنەوەو نەیکردووە بە ئەرکی سەرشانی سەربازەکانی‌و مەترسی ئەوەشی لەڕێگەدا بووە بکەوێتە داوی دوژمنەوەو گیرۆدە بێت، کەچی گەمەی بەڕۆحی خۆی کردووە، هەروەها بەم کارە ناوازەیە ڕەوشتەبەرزەکانی ئیسلامی نواندووە، تەنانەت لەگەڵ ژنێکی بێباوەڕی دوژمندا سەرمایەی خۆی پێداوە، کە بە نرخترین ماڵی دونیایەو مرۆڤ شانازی پێوە دەکات، پێشتریش لەگەڵ سەربازو بەردەستەکانی خۆیدا تەنك بووە بە سۆز بووە، قەت توندوتیژو لووت بەرز نەبووەو سەرزەنشتی هاوەلاّنی نەکردووە هەرگیز زویر نەبووە لێیان، هەرکاتی قسەیەك دڵگرانی کردبێت گەش بین بووە، دڵنیابووە تەمومژ هەردەڕەوێتەوە، هەرگیز ئەوەندە خۆی فەرز نەکردووە بەسەر سەربازەکانداو ئەوانیش کارەکان گەندەڵ بکەن‌و گزی لێ بکەن، هەروەها سوفیانی جێگریشی فەرماندەیەکی چاك‌و لێهاتوو بووە، ئەو بابەتەش کە لاقرتێ کردوە بە سەربازەکانی بە پێویستی زانیوە بۆ هاندان‌و خێزدانیان، هەروەها تازە بە تازە ببووە سەرلەشکریان‌و ئەرکی سەربازی گرتبووە ئەستۆ دەبوو گوڕو تینێکیان بە بەردا بکات‌و غیرەتیان بجۆشێنێ.

هەروەها سوفیان لەوەرگرتنی قسەی حەقدا فیزی نەکردوە کاتێ کەنیزەکەکە پێی وت ئەو پلانە بگرەبەر کە ئەمیرەکەمان (عەبدوڵلا) دەیگرتە بەرو پیادەی دەکرد. سوفیان بەبێ لوتبەرزی بە قسەی کرد، هەرچەند رای کەنیزەیەك بوو ئەم گوێگرتنە، نموونەیەکە لە خۆنەویستی‌و سادەیی ئاکارێکی پەسەند لە توێژی یەکەمی ئیسلامدا بەم ڕەوشتە جوانانە فتوحاتەکان بەرقەراربووە فەرماندەکان لە ئیدارەی ولاّتدا سەرکەوتنیان

بەدەست هێناوە، ماشەڵلا لە نەوەکانی جیلی یەکەم، شۆرەتیان تاکوێ چووە، دورترین ڕێگە بڕیوەو چەندەها ملهوڕی سەرزەوی پێ داتەپیوە هاوەڵان دەستو پێیان بەهاوکاری هەژاران سپی بووە[1].

**پێنجەم: قوبروسییەکان سوڵحەکەیان پێشێل کرد**

لە ساڵی سیو دووی کۆچیدا قوبرسییەکان کەوتنە ژێر فشاری ڕۆمەکانو ناچاریان کردن بە گەلەکەشی یارمەتی سوپای ڕۆم بدەن بۆ لیدانی وڵاتی موسڵمانان ئەوانیش چوونە پاڵ دەنگیانو بەمەش کەلێنیان خستە مەرجەکانی سوڵحەکەوە، موعاویەش بەم خیانەتەی زانی، بۆیە بڕیاریدا دەست بگرێ بەسەر دورگەی قوبروسداو بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، هەر بۆیە هێرشێکی پڕپەلی کردە سەریانو بە گرتنو بە کوشتن تەفرو تونای کردن، سوپای معاویە لە لایەکەوەو سوپای عەبدوڵلای کوڕی سەعدیش لە لایەکی ترەوە لە ئەنجامدا چەکدارێکی زۆریان کوشتو کەنیزەو سامانێکی زۆریان دەست کەوت[2] و حاکمی قوبروس ناچار کرا خۆی بدات بە دەستەوە، ئەویش تەسلیم بوو پاشان سوڵحی کرد، معاوییەش قبوڵی کرد لەسەر سوڵحی یەکەم[3]، ئەمجارە معاویە بەبێ پاسەوان بەجێی نەهێشتن، شاندێك میلیشیای بەجێهێشت لەناویاندا بۆ ئەوەی بەربەستی شاڵاوی دوژمنان بکەنو دوورگەکە لە ئاریشە بپارێزنو ئارامیش تیا بەرقەرار کەنو کەسێکی تر بیر لە سەرکەشی نەکاتەوە، لەمەزیاتریش دوانزە هەزار سەربازی بۆ ڕەوانە کردنو شاندێکی دروست کردو مزگەوتی بۆ دروست کردنو موچەو بژێوی بۆ تەرخان کردن، بەم شێوەیە دورگە، کە ئاسایش بوویەوەو خەتەری شاڵاوی ڕۆمەکان کۆتایی پێهات، هۆکاری گەورەی مانەوەی موسڵمانان لە دورگەی قوبروس ئەوەبوو موسڵمانان باش دەیانزانی قوبروسیەکان لە بەرامبەر خواستەکانی ڕۆمدا هیچیان پێناکرێو توانای سەربازییان لاوازەو ڕۆمەکان بەکاریان دەهێنن بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان موسڵمانەکانیش بەئەرکی خۆیان زانی کە لە ستەمو جەوری ڕۆمەکان بیانپارێزنو

---

[1] تأريخ الطبري (٤٠٢/١٢).

[2] جولة تأريخية، ص (٣٥٩ ـ ٣٦٠).

[3] البلاذري ص(١٥٨).

لە چاوچنۆکی بێزەنتییەکان دوریان خەنەوە، ئیسماعیلی کوڕی عەیاش دەڵێ: "خەڵکی قوبروس بێدەسەڵاتو چەوساوەی دەستی ڕۆمەکان بوون، بە خۆیانو ژنەکانیانەوە، ئەرکی سەرشانی ئێمەی موسوڵمان بوو بەرگرییان لێ بکەینو پارێزگارییان لێ بکەن"[1].

**شەشەم: مرۆڤ ئەگەر تاوان بکات بێ ڕەواجە لای خودای گەورە**

لە میانەی غەزای قوبروسدا باسی ئەبی دەردا هاتووە، کاتی چاوی بە کەنیزەی دوژمنان کەوتووە گریاوەو وتویەتی (مرۆڤ چەند بێ ڕەواجە لای خودای گەورە ئەگەر سەرپێچی خودا بکات، تەماشاکەن گەلەکانی ڕۆم چەند زاڵو کوێخابوون بەرامبەر ناحەزەکانیان، بەڵام ئێستا وازیان لە فەرمانەکانی خودای گەورە هێناوەو سەرپێچی کردووە بزانە چییان بەسەر هاتووە)[2].

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە جوبەیری کوڕی نەفیر وتویەتی بە ئەبودەردا بۆچی لەم ڕۆژەدا کە ئیسلامو موسڵمانان سەربەرزن تۆ دەگریت؟ ئەویش وتویەتی: قوڕبەسەرت ئەم گەلە کاتی خۆی بە زەبربوون پادشایان هەبوو، کەچی فەرمانەکانی خودایان زایە کرد، ئاوەهایان لێ بەسەرهات خودای گەورە کۆیلەی زاڵ کردوە بەسەریاندا هەرگەلێ کۆیلە زاڵ بێت بەسەریا ئەوە خێری تیا نەماوە، ئای مرۆڤ چەند بێڕەواجە کە نافەرمانی خودا بکات[3].

ئەم تێرامانەی ئەبودەردا نموونەیەکە لەبەرچاوڕونیو حاڵی بوون لە فەرمانەکانی خودای میهرەبان ئەم هاوەڵە دەگریو داخ هەڵدەکێشێ بۆ ئەو کەسانەی لەئاستی حەق نابینانو سەمسایان نەماوە، باجەکەی بە چارەڕەشیو ژان دەدەنەوەو لە پادشایی وە خلبونەتەوە بۆ ڕسوایی، لە ئەنجامی سەرکەشیو فیزکردندا، ئەگەر ئاوەزیان هەبایە بێلامو جیم دەهاتنە ناو بازنەی ئیسلامو موڵكوماڵیان دەپارێزراو دەکەوتنە سێبەری ئیسلامەوە، ئەم تەفرەنجە قوڵەی (ئەبی دەردا) وێنەیەکە لە سۆزو بەزەیی کە لەناخی

---

[1] جولة تأريخية، ص (٣٦١).

[2] تاريخ الطبري (١٢/٣٦٩).

[3] البداية والنهاية (٧/١٥٩).

مرۆڤدا سەرهەڵدەداتو بە فرمێسك بەرجەستە دەبێتو شرۆڤە دەكرێت، ئەبو دەردا بەزەییەكەی خۆی بە حەسرەت گوزارشت كرد، كە بۆچی ئەم گەلە لەسەر گومڕاییو بێباوەڕی یەكدەنگنو بونەتە دوژمنو ناحەزی خۆیان، موسڵمان چەند پێی خۆشە تاكێكی تر بێتە ناو ئیسلام، ئەبودەردایش ئەوەندە نیگەران بوو بێباوەڕان لە گومڕاییدا بمێننەوە، چونكە دەیزانی چ سزایەكی سەخت چاوەڕێیانە لە رۆژی پەسلاندا سەرەڕای زەلیلیو ئاوارەییو ڕیسوایی دونیایان[1].

## حەوتەم: عوبادەی كوڕی سامیت دەسكەوتی قوبروسی دابەشكرد

عوبادەی كوڕی سامت وتی: بە مەعاویە تۆ لە غەزای حونەیندا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوویت، خەڵكی گلەییان لە دابەشكردنی دەستكەوت هەبوو، پێغەمبەریش ﷺ بڕكەیەك بێچووە وشتری گرتبوو، فەرمووی (ئەم دەستكەوتەی كە خودای گەورە بەخشیویەتی بە ئێوە هیچی بۆ من نییە، پێنج یەكی نەبێ، پێنج یەكەكەش دەگەڕێنمەوە بۆتانو دەتان دەمێ).

ئەی مەعاویە لە خوا بترسەو دەستكەوتەكان وەكو خۆی دابەش بكە، سنوورشكێنی مەكە، مەعاویەش وتی: تۆ دەكەم بە حەكەم، چونكە لە شامدا لە تۆ بەڕێزترم دەست ناكەوێو تۆش بە ئەنازە دابەشی بكەو لەخودا بترسە، عوبادەش لە نێوان سەربازەكاندا دابەشی كردو ئەبودەرداو ئەبو ئومامەش یارمەتییاندا[2].

---

[1] التأريخ الاسلامي (١٢/٣٩٧).

[2] الرياض النطره في مناقب العشرة لابي جعفر أحمد، ص(٥٦١).

## باسی سێیەم: فتوحاتی لەشکرەکان لەڕووی میسرەوە

### یەکەم: بەرپەرچدانەوەی یاخیبووەکانی ئەسکەندەرییە

ڕۆمەکان زۆر پێیان داخبوو ئەسکەندەرییەیان لە کیس چووە، خۆیان مەڵاسدابوو هەلێ بقۆزنەوەو بیگەڕێنەوە ئامێزی خۆیان دەستیان کرد بە هاندانی خەڵك بۆ گێرەشێوێنیو یاخیبوون[1]، بەتایبەت ڕۆمەکان بڕوایان وابوو کە ناتوانن بە ئاسایش بژین ئەگەر ئەسکەندەرییە نەخەنەوە سەر موڵکی خۆیان، وردە وردە مەرامەکەیان سەری گرتو بشێوییان نایەوە لەو لاشەوە نامەیان نووسی بۆ قوستەنتینی کوڕی هیرقلو سکاڵای سەرشۆڕی ڕۆمەکانو نەعرەتەی موسڵمانیان کرد[2]، لەم کاتەشدا ئیمامی عوسمان عەمری کوڕی عاصی لەسەر کار لابردبوو، لە شاری میسردا و عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ئەبی سەرحی کردبووە جێگری، هەر لەماوەیەدا (مەنویلل حەسا)ی فەرماندەی سوپای ڕۆمەکان هاتبوو بۆ گەڕانەوەی ئەسکەندەرییەو لێدانی موسڵمانان بەسوپایەکی سەربازیو سێ سەد کەشتی بارهەڵگرەوە کە هەموویان پڕبوون لە چەكو تەقەمەنیو چەکدار[3]، کاتێ خەڵکی میسر هەواڵیان بیست نامەیان نووسی بۆ خەلیفەو داوایان کرد عەمری کوڕی عاص بگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی بەرەنگاری سوپا شەڕەنگێزەکەی ڕۆمەکان بێتەوە، چونکە عەمر باشدەزانێ بیانبەزێنێو سامێکی گرانی هەیە لە دڵیاندا، خەلیفەش دیسانەوە عەمری کوڕی عاصی بۆ ناردنەوەو بە پلەی ئەمیری، (مەنویلل حەسا)یش بە خۆیو سوپاکەیەوە ئەسکەندەرییەیان فەرهود کردو بە وێرانی جێیان هێڵاو چون بۆ لادێکانی دەوروبەری هەتا چەپاوی کەن، عەمری کوڕی عاصیش ڕێگەی بۆ والاکردن بۆ ئەوەی لەناو گەندەڵیو کاولکاریدا ڕۆبچنو دڵی خەڵکی میسر پڕ ببێت لە توڕەییو قین بەرامبەریانو هاوسۆزییەکەیان بپسێت، سوپای مەنویل هەتا میسری خوارەوە چوون کەس بەرەنگارییان نەبوویەوە، هەندێ لە هاوەڵان ترسیان لێ نیشت، بەڵام عەمر رایەکی تری هەبوو دەیوت لێیان گەڕێن بابزانین چی دەکەن، بێگومان ماڵو

---

[1] الكامل لابن الأثير.

[2] جولة تاريخية، ص (٣٣٥).

[3] المصدر نفسه.

ژیانی خەڵکی بە تاڵان دەبەن‌و دەکەونە ناو بێ عەقڵییەوەو خۆیان قیزەون دەکەن‌و دەبوغزێن هەرکاتێ ئێمە بێنە دەست لێیان میسرییەکان یارمەتیمان دەدەن، ناوەڕۆکی بۆچوونەکەی عەمر ئەمەبوو (وازیان لێ بێنن با بێنە نزیکمان، ئەمانە شڕەتن، بدەن بە لای هەر ئاوەدانییەکدا تاڵانی دەکەن لە ئەنجامیشدا خۆیان خۆیان سەرشۆڕ دەکەن)[1].

ئەم بۆچوونە بەراست دەرچوو، رۆمەکان نابوت بوون‌و بوونە چەتەی شاران‌و میسرییەکانیش هەراسان بوون‌و بە تەمای رزگارکەرێ بوون[2]، (مەنویلل حەسا) گەشتە نقیوس، عەمریش خۆی نا بەیەکەوە بۆ رووبەڕووبوونەوەیان‌و هەردولا لەلای قەلای نقیوس لەسەر کەناری روباری نیل بەیەك گەیشتن‌و هەلگژان بەیەکدا بەلام شێرانە، بەلام کاتێ شەڕ تاوی گرت، عەمری کوڕی عاص خۆی فڕێدایە ناو ریزی دوژمنان‌و ولاغەکەی بردە مۆلگەی ولاخەکانیان‌و شمشێرەکەی بردە ناو شمشێرەکانیان‌و دەستی کرد بە کوشت‌و بڕی ئەندامەکانیان‌و ملی پالەوانەکانی قرتاند، تیرێك دای لە ولاخەکەی‌و بوو بە پیادە، کاتێ موسڵمانان گیانبازی عەمریان بینی بە دلێکی شێر ئاساوە چونە ناو جەرگەی دوژمن‌و لە شریخەی شمشێر نەسلەمینەوە[3] بەجارێ هیممەتی رۆمەکان داتەپیوو هێزیان چزاو هەلهاتن بەرەو قەلاکانی ئەسکەندەرییەو لە پاڵ پایە ئەستوورەکاندا خۆیان شاردەوە بۆ ئەوەی لە تارمایی مەرگ رزگار بن[4]، لە نسکۆی رۆمەکاندا میسرییەکانیش یارمەتییاندان‌و وێرانکارییەکانی ولاتەکەیان چاك کردەوەو پردە رووخاوەناکیان نۆژەنکردەوەو شادیان دەربڕی بۆسەرکەوتنی موسڵمانان بە هەموو شێوەیەك کۆمەکیان هێنا بۆیان[5]، چونکە حورمەتیان بۆ گەرایەوەو مالیان سەلامەت بوو، لە دواییدا عەمر شورایەکی کرد بە دەوری شارداو مەنجەنیقی دابەست لەسەری‌و پەناگەو قولەکانی روخاند، بۆ ئەوەی بێ بایەخی بکات‌و خەلکەکەی پێ چاوشکێن

---

[1] جولة تأريخية ص(٣٣٦).

[2] المصدر نفسه (٣٣٦).

[3] المصدر نفسه (٣٣٨).

[4] البلاذري ص(٦٩).

[5] جولة التأريخية ص(٣٣٨).

بکاتو حەشارگەیان نەهێڵێ، موسڵمانەکان بە شمشێری برشتاوییەوە هاتنەوەو قارەمانەکانی رۆمیان کوشتو بێدەسەڵاتەکانیان دیل کردو پاشماوەشیان هەڵهات بەرەو دەریاو وێڵبوون.

(مەنویلل حەسا) یەکێك بوو لە ژمارەی کوژراوەکانو تاقە کەسێ دوژمن نەمابوو بێتە رێگەیان[1]، پاشان عەمر فەرمانی کرد لەو جێگەی شەڕەکەی تیا تەواوبووە مزگەوتێ دروست بکەن بە ناوی (مزگەوتی رەحمە) بەم چەشنە ئارامش گەڕایەوە بۆ پایتەختی ئازادکراو دڵی هاوولاتیانی ئۆقرەی گرتو ئاوارەکانیش هاتنەوە ناوماڵو خاکی خۆیان، یەکێ لەوانە (بنیامین) بوو، کە لە رێگەی قیبتەوە گەڕایەوە هاتە خزمەتی عەمرو داوای لێ کرد بە خراپی هەڵسوکەوت نەکات لەگەڵ قیبتییەکاندا، چونکە ئەوان لەسەر پەیمانی خۆیان ماونەتەوەو کەمتەرخەمییان نەکردووە لە ئەرکەکانیان، تکاشی لێ کرد جارێکی تر سولح لەگەڵ رۆمەکان مۆر نەکات، بنیامین وتی: هەرکاتێ مردم لە کەنیسەی بەحنەس بمنێژن[2]، میسرییەکان بە جارێ لە بەرزاییو نزمامییەوە هاتن بۆ سوپاسکردنی عەمرو سوپاکەیو داوایان لێکرد ماڵو سامانو ئاژەڵەکانیان کە رۆمەکان بە فەرهود بردویانەو ئێستا لەبەردەستی ئێوەدایە بماندەنەوەو ئیتر لەمەولا ئێمە دۆستو گوێ لە مشتی ئێوەینو پەیمان شکێنی ناکەینو جەماوەری ئێوەین، عەمریش وتی: هەرکەسێکتان بەڵگەو شاهیدی هەبێو ماڵی خۆی بە رۆشنی بناسێ بۆی دەگەڕێنمەوە، بەم تەرزە ئەسکەندەرییە سەرانسەر بوو بە ئارامگە، بەشی رۆژهەڵات لە ژێر دەستی موسڵمانان بوو وێڕای باشورەکەی، بەڵام بەشی رۆژئاوای عەمر بە فەتح کردنی بەرەو تەرابلوسو زۆیلە ئارامی کردەوە، خەڵکی ئەم شارانەش ملکەچی سولحو سەرانە بوون، بەڵام بەشی باکوری لەژێر چنگی رۆمەکان بوو، موسڵمانان وانەیەکی وایان پێدادرابوو بیر لە گەڕانەوە نەکەنەوە، گەر بیریشیان لێ بکردایەتەوە ئەی هو تا بەخت یاوەریان ببایە، چونکە تەنزیمەکانی ئەسکەندەرییەیان نەمابوو سوپای ئیسلام زیتەڵو وریابوو[3].

---

[1] المصدر نفسه (٣٣٨).

[2] المصدر نفسه (٣٤٠).

[3] المصدر نفسه، ص(٣٤١).

**دووەم: رزگارکردنی شارەکانی نەوبە**

لەپاش مۆڵەت وەرگرتن لەئیمامی عوسمان، عەمری کوڕی عاص بەرنامەی دارِشت بۆ رزگارکردنی شارەکانی نەوبە، لەو ناوچەیەشدا کەوتنە شەڕێکەوە موسڵمانان پێی رانەهاتبوون، (شەڕی چاوتەقاندن)بوو، هەردوولا رێکو راست تیریان دەتەقاند بۆ چاوی یەکتر، هەتا کوێردەبوون، ئەنجامی ئەم شەڕە بە کوێرکردنی سەدو پەنجا چاو کۆتایی هات، پاشان ئەوان داوای سوڵحیان کرد، بەڵام عەمری کوڕی عاص قبوڵی کردو مەرجی قورسی رەتکردەوە[1]، هەروەها ئیبنو سەعد بوو بە فەرماندەی ئەوبەری غەزی میسر لە ساڵی (٣١)ی کۆچیو کۆمەڵێ کەڵەپیاوو خەڵکی ئەوبەری تیا کوژراو چاوی زۆرێك لە موسڵمانان پێکرا، شاعیرەکەیان دەڵێت:

هیچ چاوێ رۆژی وەکو رۆژی چاوتەقاندنی نەدیوە[2].

تەنانەت هێسترە سەرکەشەکانیش بەرگی غیرەتیان لەبەر کەنیوە

خەڵکی ئەوبەر داوای ئاگربەستیان کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی سەعد، ئەویش قبوڵی کرد بۆ ماوەی شەش سەدە مایەوەو لە سای ئەو ئاگربەستانەدا شارەکان بە سەربەخۆیی و هاوولاتیان بە هێمنی ژیانو شاری نەوبە بوو بە گوزەری بازرگانییو دەستەیەك خزمەتکار هەموار کرا بۆ راژەی ولاتی ئیسلامیو موسڵمانان، خەڵکی نەوبە لە ئەنجامی تێکەلاویو نزیکی زۆریان لێ موسڵمان بوو[3].

**سێیەم: رزگارکردنی ئەفریقا**

نیازی عەمری کوڕی عاس لەو غەزایەدا رزگارکردنی بەرقەو تەرابلوسو ناچەکانی تری لیبیا بوو، توانی ئەم شارانە رزگار بکاتو تاغوتی تیا بڕوخێنێ و دڵی بەندەکان یەکلایی بکاتەوە بۆ خوای گەوەرو رێچکە چەوتەکانیان بۆ رۆشن بکاتەوەو کەڵچەری جوداکردنەوەی چاكو خراپیان بۆ ڕوون بکاتەوە، وردە وردە بارودۆخێ دروست بوو بە ئازادی رای خۆیان دەردەبڕیو نوری ئیسلام گزنگیدا لە ناویانداو تاریکی بتپەرستی و

---

[1] الخلافة والخلفاء الراشدين ص(٢٢٩).

[2] قادة فتح البلاد المغرب (٦١/١).

[3] الخلافة والخلفاء الراشدين ص(٢٤٩).

نەفامی دڕنی داو لە بەندایەتی دروستکراوەکانەوە بەرزبوونەوە بۆ بەندایەتی دروستکاری مەزن[1].

لە بارەی غەزای عەبدوڵڵای کوڕی سەعدەوە دکتۆر صالح مستەفا دەڵێت: لەساڵی (٢٦)ی کۆچی واتە ساڵی (٦٤٦) زایینی عەمری کوڕی عاص لە ئەمیری لابراو عەبدوڵڵای کوڕی سەعد کرا بە ئەمیر، ئەویش کەتیبەی (جزائد الخیلی) نارد بۆ تەمێکردنی ناوچەکانی پەراوێزی ئەفریقاو دەورەبەری[2] و مەبەستیان تونس بوو زیاتر، ئەم پارتیزانییە وەکو دەستپێکی رزگارکردنی ئەفریقا وابوو، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری هێزو توانای دوژمنان بوو، ئەم کەتیبە (جرائد الخیلی)ە تاقمێکی پەیجوری بوو، کە لە سیاسەتی سەربازیدا بەر لە سوپا دەنێردرێن بۆ تاقیبات‌و سۆراغ کردن وەکو چاوی دەوڵەت، کاتێ زانیاری تێرو تەسەل لە بارەی ئەفریقاوە بەدەست هات ژمارەی سەربازو بڕی هێزو پێگەی جوگرافی ستراتیژیەتیان هەژمار کرا، عەبدوڵڵا نامەی نارد بۆ ئیمامی عوسمان‌و زانیاری تەواوی ئەفریقای بۆ نووسی‌و داوای مۆڵەتی رزگارکردنی کرد، ئیمامی عوسمانیش داواکەی پەسەند کرد، دکتۆر صالح مستەفا دەڵێت: (کاتێ عەبدوڵڵا داوای رزگارکردنی ئەفریقای کرد لە ئیمامی عوسمان، ئەویش سەرجەم هاوەڵانی کۆکردو راوێژی پێکردن رایان وابوو رزگاری بکات تەنیا ئەبو ئەعوەر نەبێت پێچەوانەی ئەوان بوو، چونکە لەسەر رایەکەی ئیمامی عومەر مابووەوە، کە وتبووی با هیچ موسڵمانێ ئەفریقا رزگار نەکات)، ئیمامی عوسمان لەسەر یەکدەنگی هاوەڵان شەیپوری جیهادی لێداو مەدینەی پایتەخی خەلافەتی تاودا بۆ کۆکردنەوەی جیهادی گیان‌و ماڵ‌و شاندێکی بەجەرگی لێ رێکخستن‌و ناردنی بۆ میسر بۆ غەزای ئەفریقا بە قیادەیی عەبدوڵڵای کوڕی سەعد.

رزگارکردنی ئەفریقا زۆر بە بایەخەوە سەیر کراوە، گرنگی تایبەتی پێدراوە، لەبەر ئەوەی ئەو موجاهیدانەی، کە چوون بۆ گۆڕەپانی ئەم غەزایە، پڕبوو لە هاوەڵە بەڕێزەکان‌و گەنجە تازە پێگەیشتووەکانی ئالو بەیت‌و کوڕانی ئەنساری‌و موهاجیرین

---

[1] الشرق والتسامي بحركة الفتح الاسلامي، ص(١٨٩).

[2] ليبيا من الفتح العربي ص(١٠)، انتقال الخلافة الفاطمية الى مصر د. صالح مصطفى مفتاح.

بوون، وەکو (حەسەنو حسەینو عەبدوڵڵای عەباسو ئیبنو جەعفەرو هاوەڵانی تر)، وێڕای ئەمەش شەش سەد پیاوی تیرەی (مەهر) لەگەڵیان دەرچووە حەوت سەد پیاویتر لە تیرەی (غەنپ)و حەوت سەدی تر لە تیرەی (مەیدەعان)، دوای ڕێکخستنیان واتە دوای ڕێکخستنی ئەم تیرانە ئیمامی عوسمان وتاریکی بۆدانو دەمەزەردی کردنەوە بۆ جیهادکردن، وتی پێیان: (حارسی کوڕی حەکەم دەکەم بە ئەمیرتان هەتا دەگەنە لای عەبدوڵڵا لەوێ ئەو ئەمیرتانەو دەتانسپێرم بە خودای گەورە)، دەڵێن ئیمامی عوسمان بە هەزار وشتر یارمەتی ئەم غەزایەی داوە، کاتێ ئەم سوپایە گەشتە میسر یەکسەر چونە ریزی سوپاکەی عەبدوڵڵاو لە ڕێگەی فستاتەوە هەنگاویان ناو سنووری میسرولیبیایان بڕی، ژمارەیان بە بیست هەزار سەرباز مەزندە دەکرا، وەختێ برقەیان گرت عوتبەی کوڕی نافیعی فەهریش هاتە پاڵیان بەخۆیو لەشکرەکەیەوە تووشی هیچ کۆسپێ نەبوونو مەرجەکانی عەمری کوڕی عاصیان نەشکاند، خەڵکی برقەش وەفایان هەبوو بەرامبەر پەیمانەکەیان تەنانەت بارچاوەشی سەرانەش نەچووە ناویان، خۆیان سەرانەیان هێنا بۆ میسر، عەمری کوڕی عاص دەربارەی ئەمەکداری خەڵکی برقە وتویەتی (ئەگەر ماڵم لە حیجاز نەبوایە لە برقە دەمامەوە هیچ قیبتییەکی میسری پەیمانی لە ئەستۆی مندا نییە خەڵکی برقە نەبێت ئەوانە پەیماندارنو بەوەفان)[1]، بەم چەشنە هەڵمەت بەرەو ئەفریقا چوو، عەبدوڵڵا هێزەکانی تری گرتە ئەستۆی خۆیو هەتا نەگەیشت بە مەبەستی خۆی کۆڵی نەداو پێش خۆی ڕێگەوبانەکانی تاقیب کردو چاوەکانی نارد بۆ کۆکردنەوەی زانیاریو دەزگاکانی ڕێکخستنی خستە گەڕو حسابی بۆ گشت ڕەهەندەکان کردو قەرەوڵی بۆ گرتنو پلانی داڕشت بۆ لە پڕێکدا بدات بە سەریاندا، چالاکی دەزگا ڕێکخستنەکان ئەوەبوو، کە گەلە کەشتی ئیمپارتۆریەتی ڕۆمیان ئاشکراکرد لە کەناری دەریای لیبیادا لە نزیك شاری تەرابلوس خۆیان مەڵاس داوبوو سەنگەریان گرتبوو، زۆری پێ نەچوو ئەو کەشتیانە بوونە دەستکەوتی موسڵمانانو پتر لە سەد سەربازیشیان بەدیل گرت، ئەمەش یەکەمین دەستی کەوتی رزگارکردنی ئەفریقا بوو[2]، پاشان گەشتنە ئەفریقاو لەوێ چاوەکانی خەلافەتی لە

[1] ليبيا من الفتح العربي ص(١٠)، انتقال الخلافة الفاطمية الى مصر ص(٣٩).

[2] الشرف والتسامي بحركة الفتح الاصلاح ص (١٩١).

هەموو قۆڵێکەوە بڵاوکردەوە هەتا گەشتنە شاری سەبیلەو لەوێدا ڕووبەڕووی سوپای ئەفریقا بوونەوە کە جەرجیر پاشا سەرلەشکریان بوو، ژمارەی سەربازی ئەوان سەدو بیست هەزار بوو، سەرەتا لە نێوان عەبدوڵلای سەعدو جەرجیردا، کە دوو سوپا سالاربوون، نامەگۆڕینەوەو ئاخاوتنی دووبەدوو هاتە کایەوە، ناوەڕۆکی نامەکانیش رونکردنەوەی پەیامی ئیسلامو بانگهێشتکردنی جەرجیر بوو بۆ ئەوەی تەسلیمی فەرمانەکانی خودای گەورە ببێت یان سەرانە بداتو لەسەر دینی خۆی بمێنێتەوە، بەڵام جەرجیر هەموو پێشنیارەکانی ڕەد کردەوەو فیز بەری نەدا، چونکە خۆیو سەربازەکانی لە خۆبایی بوون، بۆیە جەنگ لە نێوان هەردوولا بۆ ماوەی چەند ڕۆژێ کڵپەی سەندو یارمەتی لە لایەن عەبدوڵلای زوبێرەوە گەیشت بە موسڵمانانو بە لە ناوچوونی جەرجیر شەڕەکە کۆتایی هات[1]، ڕۆمەکان پەندیان لە دەرەنجامی ئەم شەڕە وەرگرتو خەڵکی سەبیتەش ترسو لەرز دایگرتنو نامەی تکاخوازییان بۆ یەکتری دەنووسیو یەکتریان لە سامو بیمی عەبدوڵلا ئاگادار کردەوەو دەستەودامانی یەکتر دەبوون.

بەڵێنیاندا سێ سەد قینتار ئاڵتون وەکو سەرانە ڕەوانە بکەن بۆیان بە مەرجێ بگەڕێنەوەو بیانوو نەگرن، لە هەندێ ریوایەتدا هاتووە، کە ئامادەبوون ساڵانە سەد قینتار سەرانە بدەن بە مەرجێ موسڵمانان دەرچن لە شارەکەیان، عەبدوڵلاش وەری گرتو قبوڵی کرد، شەڕ لەگەڵ ئەفریقا درێژەی کێشاو لە پەسا یارمەتییان بۆ دەهاتو موسڵمانان خۆیان بۆ یەکلایی کردەوە، عەبدوڵلا نەخشەیەکی دارِش، وتی: سبەینێ شاندێکی بەجەرگ لە خێمەکان با بمێننەوە ساغو ئیسراحەت بن، ئێمەش هەڵکوتینە سەر بارەگاکانیانو هەراسانیان بکەینو بە شەکەتییان بگەڕێنەوە خێمەو بنەکەکانیان، پاشان ئەم موجاهیدە تازە وچانانە کە دەستو پێیان سپییە بابێنە سەریان، بەڵکو خودای گەورە سەرمان خات بە سەریاندا، بۆ ئەم نەخشەیە راوێژی کرد بە هاوەڵە دیارەکان ئەوانیش تەساڵەیان لەسەردا. بۆ سبەینێ عەبدوڵلا بەرنامەکەی خۆی بەکارهێناو شاندێکی گل دایەوەو ئەوانی تری بردە بەرەی شەڕ هەتا نیوەڕۆ شەڕ بەردەوام بوو بە سەختی لەدوای نیوەڕۆ ڕۆمەکان ویستیان وەکو نەریتی جاران بگەڕێنەوە

---

[1] البداية والنهاية (٧/١٥٨).

پشوو بدەن، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر دەستی لە کۆڵ نەکردنەوە هەتا کفتی کردن، ئینجا گەڕایەوەو هەردولا چەکیان فڕێداو ماندوو بوون ئالەوساتەدا موجاهیدە هەڵگرتووەکانیان (واتە ئەو هەموو موجاهیدەی تایبەت کرابوون بەو چالاکییە) خستە گەڕو هەڵمەتیان بردە سەریان، ئەفریقییەکان پێیان نەزانین هەتا چوونە ناویان‌و دەستیان کرد بە (الله أكبر)و نەیان هێشت دەست بکەنەوە دایان بەسەریانداو جەرجیر لە لایەن عەبدوڵڵای زبێرەوە کوژراو ڕۆمەکان تێکوپێك شکان تەنانەت کچەکەی جەرجیر بە کەنیزە گیرا، پاشان چوونە ناو شار ڕزگاریان کرد ئەوەندە سامانیان دەست کەوت کە پێشتر نەیان دیبوو، پشکی سوارەکان هەر سوارێ سێ هەزار دینارو هی پیادەکانیش هەر پیادەیەکیش هەزار دینار بوو، پاشان هێزەکەیان بەناو شاردا بڵاوکردەوەو لەوێشەوە بەرەو قەفسە ڕۆشتن‌و دەستکەوت‌و ئەسیریان گرت‌و دوامەنزڵیان بردە قەڵای ئەجم عەبدوڵڵا شارەکانی تری بە گەمارۆ فەتح کردو سوڵحیان کرد لەگەڵیان، عەبدوڵڵاش کچەکەی جەرجیری بەخشی‌و ئیبن‌و سەعدی نارد بۆ لای ئیمامی عوسمان مزگێنی بداتێ کە ئەفریقا فەتح کراوە[1].

### چوارەم: پاڵەوانیەتی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر لە ڕزگارکردنی ئەفریقادا

عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر گیانبازیەکی بێ وێنەی هەیە لە ئازایەتیدا وەکو ئیبن‌و کەسیر باسی دەکات‌و دەڵێت: (کاتێ موسڵمانان ویستیان ئەفریقا ڕزگار بکەن، بیست هەزار سەربازبوون‌و عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ئەبی سەرح ئەمیریان بوو، لە ریزی سوپاکەیدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو عەبدوڵڵای کوڕی زوبێری تێدابوو، سوپای جەرجیر پادشای بەربەرییەکان سەدو بیست هەزار سەرباز بوو، هەتا دەڵێن دووسەد هەزار بووە، کاتێ هەردوولا دەستەویەخە بوونەوە سوپای ئەوان یەکسەر حاتەی موسڵمانانیان داو خستنیانە هەڵوێستێکی زۆر ناسۆرو تۆقێنەر)، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر دەڵێ: (تەماشای جەرجیر پادشام دەکرد لە کەوانوی ریزەکانەوە سواری برزونێ بوو بوو دوو کەنیزەش بە پەڕی تاوس باوەشێنیان دەکردو سێبەریان بۆ کردبوو، چووم بۆلای عەبدوڵڵای کوڕێ سەعد داوام لێکرد دەستەیەك سەربازم لەگەڵ بنێرێت لە دواوە

---

[1] الكامل لابن أثير (٢/٤٥).

بمپارێزن، دەمەوێ جەرجیر بکوژم، ئەویش دەستەیەك کوڕی جەربەزەی لەگەڵما ناردو فەرمانی پێکردن، کە لە پشتەوە بمپارێزن، منیش ڕۆشتمو ریزەکانم قاژ کرد، وا تێگەیشتن من دەڕۆم لە پاشاکەیان دەپاڕێمەوەو سکاڵام هەیە، کاتێ لێی نزیك بوونەوە هەستی بە دوژمنایەتی من کرد بۆیە بەسەر برزونەکەیەوە رای کردو منیش دوای کەوتمو گرتمو بە ڕەمەکەم لەتو پەتم کردو سەرم لەلاشە جیاکردەوە، سەرەکەیم کرد بە نوکی رمەکەمداو جاڕی (الله أکبر)م لێدا، کاتی بەربەرەکان ئەم دیمەنەیان بینی پرش‌و بڵاو بوون‌و هەڵهاتن، وەکو قازو قولنگ دەیان قیژاند، موسڵمانانیش کەوتنە دوایان‌و دەستکەوتی باش‌و کەرەسەی زۆریان بەدەستهێنا، وێڕای کەنیزەو ئەسیر).

ئیبن‌و کەسیر دەڵێ: (ئەم گیانبازییەی عەبدوڵڵا یەکەمین هەڵوێستە کە نەبەردی‌و کەسایەتی ئەوی تیا دەردەکەوێت)[1]، ئەم فیداکارییە جۆرێکە لە بەرجەستەکردنی ئاواتە بەرزەکانی مرۆڤو خۆچزانە بە ئاسنی سوردا سەرباری ئەوەی پێشتر مەشقی وای نەکردبوو، تەمەنیشی بیست‌و حەوت ساڵان بوو، یەکەمین پاڵەوانییەت بوو نواندی‌و کارێکی دنیای خەیاڵات بوو هێنایەبوون ، وەك دەڵێن موغارەمەی کرد، چونکە فیداکارییەکەی پڕبوو لە دڕدۆنگی‌و بە حاڵو نەحاڵ دڵنیایی تێدابوو بە پێوەدانگی خەڵکی رشۆکی (خۆکوژی بوو)، ئەم گیانبازییە کە بە شێوەی موغامەرات کردی لە دوو بۆچوونەوە سەرچاوەی گرتبوو:

١ـ سەردەکەوێت‌و پادشاکەیان دەکوژێت‌و سەربازەکانی پەرتەوازە دەبن کە نەریتیان وایە پادشا نەما هەریەك بەلایەکدا دەڕوات، بەمەش موسڵمانان دەپارێزرێن لە شەڕی خوێناوی‌و دڕندایەتی دوژمن.

٢ـ یان شەهید دەبێت‌و دەگاتە دیداری خودای گەورەو پلەی پیاوچاکان بە دەست دێنێ، کە تاسەمەندیان دەکردو بێباوەڕوان دەتۆقێنێ‌و ترس‌و لەرزیان هەڵدەقوڵێ و دوژمن وا حاڵی دەبێ موسڵمانان گشتی بەم تەرزە بەجەرگن، کەواتە هەقە تاجی دڵێری بخرێتە سەر ئەو کەسانەی، کە موغامەرە دەکەن‌و خۆیان دەهاونە تەنوری شەڕ، هەروەها بێگومان هیچ کەسێ ناتوانێ بگاتە ئەو بلیمەتییە جگە لەو پیاوانەی کە بۆچوونیان وایە

---

[1] البداية والنهاية (١٥٨/٧).

به هەشت لەودیوی ئەم فیداکارییەوەو موشتاقی دیداری خودای گەورەن وێڕای ئەمەش عەبدوڵلا زگوردو تەمەن کاڵ بوو خۆشیو خەڵەتێنەرەکانی دونیا پێکۆڵی نەکردبوو، بەڵکو زۆر بە ئاواتی ئەو میواندارییەوە بوو کە خودای گەورە گفتی داوە بە تێکۆشەرانی ڕێبازەکەی یان سەریان دەخات یان بەهەشتیان پێشکەش دەکات[1]، خودا کردی بە سەرکەوتن کۆتایی هاتو بەربەرەکان بە قاوقیژو هەڵهاتن موسڵمانان تاریان نان، هەرچەندە زۆریان لێ کوشتنو لێشیان بەدیل گرتن، ئەم سەرکەوتنە وێنەیەك بوو لە گفتەکانی خودای گەورە کە داویەتی بە دۆستە باوەڕودارەکان لە تەنگو چەڵەمە قوتاری کردنو لە کەندەڵانێك دەربازی کردن، چونکە دوژمن شەش ئەوەندەی ئەوان لە ژمارەو توانادا زۆر بوون، دەبوو لە هەموو لایەکەوە شەڕیان لەگەڵدا بکەن، ئەمەش کارێکی دژواربوو بۆ سوپایەکی بچووك وەك دەڵێن قورسترین شەڕگە بوو کە ڕووبەڕووی بوونەوە، بەڵام گیانبازێکی نموونەیی دەگمەن، ترازووی شەڕەکەی گۆڕیو شەڕ بەئاراستەی سەرکەوتندا چوو[2]، با لە بیرمان نەچێ ئەو نەبەردانەی کە لە پشتەوە پاسەوانی عەبدوڵلایان دەکرد کوڕی یەکانی یەكو فیداکاربوون هەرچەند مێژوو ناوی تۆمار نەکردوون، بەڵام تابلۆیان هەتا دونیا ماوە بە زیندوویی دەمێنێتەوە، چونکە بوونەتە مایەی شانازی بۆ ئوممەتی ئیسلام، لە ڕۆژی پەسلانیشدا بە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت فەریح دەبنەوە[3].

**پێنجەم: شەڕی (ذات الصواري)**

ڕۆمەکان لە شەڕی ئەفریقادا زەربەیەکی گورچك بڕیان لێ کەوتو دەریاکانیان کەونە مەترسییەوەو گەلە کەشتی موسڵمانان باڵی کێشابوو بەسەر دەریای ناوەڕاستداو هەر لە ڕودس هەتا بەرقەیان کۆنترۆڵ کردبوو، قوستەنتینی کوڕی هیرەقل گەلە کەشتییەکانی کۆکردەوە بە هەزارسەربازەوە هاتن بۆ لێدانی موسڵمانانو بۆ ئەوەی هەقی زیانە کەڵەکەبووەکانی وشکانی وەرگرنەوە، ئیمامی عوسمانیش فەرمانی کرد بەربەستیان

---

[1] التأريخ الاسلامي (١٢/٣٩٠).

[2] التأريخ الاسلامي (١٢/٣٩٢).

[3] المصدر نفسه.

بکەن، بەرهەڵستییان بکەن، معاویەش کەشتیە بارهەڵگرەکانی شامی بە قیادەی بوسری کوڕی ئەرتات هەنارد لەگەڵ کەشتییەکانی میسردا بە قیادەیی عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ئەبی سەرحو بە سوپا سالاری خۆی، ژمارەی کەشتییەکان دووسەد دانەبوو، ئازاترین موجاهیدی بەئەزموونی لەگەڵ خۆی بردو پێشتریش پەندیان بە دوژمن دادابوو، هەرچەندە ژمارەیان کەمبوو، بەڵام دوژمن لە ناخیاندا بێ ئەرزش‌و کونی بوو عەزمی ئەوانیان لەلا وردو خاش بوو.

موسڵمانان بەرەو دەریا چوون بە هیوای سەرخستنی ئایینی ئیسلام‌و ریشەکێش کردنی دوژمنانی دین‌و راماڵینی سام‌و قوربی رۆمەکان، ئەم شەڕە لەبەر چەند هۆکارێك هاتە کایەوە:

١- بۆ وەڵامدانەوەی لێدانە بەزەبرەکانی موسڵمان بوو، کە دژ بەرۆمەکان لە ئەفریقا وەشاندبویان.

٢- رۆمەکان گیریان کردبوو، لە کەناری رۆژهەڵات‌و باشوور، بە هۆی گەلەکەشتی موسڵمانانەوە کە رێگەیان لێ بڕیبوون.

٣- رۆمەکان دەترسان گەلەکەشتی موسڵمانان دەست بگرێ بەسەر قوستەنتەنیەدا.

٤- قوستەنتین ویستی سام‌و شکۆی خۆی بێنێتەوە پاش دۆڕانە وشکانیی‌و دەریاییەکانی لە شام‌و میسرو کەناری برقە.

٥- ویستیان شەڕێکی بێئامان بکەن‌و دەست بکێشن بەسەر دەریای ناوەڕاستداو هەڵکوتنە سەر کەنارەکانی عەرەبی‌و جەختیشیان کردبووەوە لە سەرکەوتن.

٦- زۆر مەبەستیان بوو ئەسکەندەرییە بکەوێتەوە ناو قەڵەمڕەوی خۆیان، چونکە بەنرخ بوو لە لایان‌و کاتی خۆیشی نامەی بەڵێننامەیان نووسی بوو بۆ قوستەنتین[1].

ئەم شەڕە لە کوێ‌و لە چ جێگایەك روویدا؟

مێژوونووسەکان یەك وەڵام نین لە دیاری کردنی دەقاودەقی شوێنی روودانی شەڕەکەو سەرچاوە عەرەبییەکانیش دیارییان نەکردووە تەنیا یەك سەرچاوە نەبێت بە وردی دیاری دەکات، سەرچاوەیەکی تر دەڵێ بەرەو ئەو شوێنە چوون، لە کتێبی (فتح مصر

---

[1] ذات الصواري ـ شوقي أبو خليل ص (٦٠ ـ ٦١).

واخبارها)[1] هاتووه دەڵێ: (عەبدوڵڵای کوڕی سەعد وتویەتی هەواڵم پێگەیشتووە کە هیرقل بە هەزار کەشتی بارهەڵگرەوە هاتووەتە ئەم بەرەوە.. بەڵام شوێنی شەڕەکەی دیاری نەکردووە)، هەروەها کتێبی (تەبەری)[2] لەبەسەرهاتی ساڵی (٣١)ی کۆچی شەڕی (ذات الصواري) باس کردووەو ئاماژەی بە دەستکەوتی موسڵمانان کردووە لە ڕۆمەکان، لە ئەفریقاو دەڵێ: (بە ئۆردوویەکەوە هاتن هەرگیز ڕۆم ئەوەندە گلێر نەبوو)، لە کتێبی (الکامل فی التاریخ)[3] شوێن‌و ڕووداوی باسنەکردووە، بەڵام هۆکارەکانی باسکردووە، کە موسڵمانان ویستوویانە بیکەنە پەنایەکی قایم بۆ سەرکەوتنی خۆیان بە تایبەتی لە ئەفریقا، لە کێبی (البدایە والنهایە)[4] هاتووە کاتێ عەبدوڵڵا لە شەڕی فەرەنجی‌و بەربەرەکانی ئەفریقا سەرکەوت ڕۆمەکان لە لای قوستەنتینی کوڕی هیرەقل بە ئاپۆڕایی کۆبوونەوە تەکبیری گەلەکۆمەیان کردو بە لێشاو پەلاماری موسڵمانانیان داو پێنج سەد کەشتی بارهەڵگریان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو بۆ بنەبڕکردنی عەبدوڵڵاو لەشکرەکەی کتێبی (تأریخ الامم الاسلامیە)[5] باسی شوێنی شەڕەکەی نەکردووە[6]، دکتۆر شەوقی ئەبو خەلیل جەخت لەوە دەکاتەوە شەڕەکە لە کەناری ئەسکەندەرییە ڕوویداوە بەپێی ئەم نیشانانە.

١ـ لە کتێبی (النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة)[7] بە جوانی باسی شەڕی (ژات الصواری) کردووەو لە دەریایەك نزیکی ئەسکەندەرییە ڕویداوە.

٢ـ (تأریخ ابن خلدون)[8] هاتووە، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەعد سەرکەوت بەسەر شارەکانداو ئەوانیش هاتنە ژێر ڕکێفی، پاشان گەرانەوە بۆ میسر، قوستەنتین بە شەش سەد کەشتی بارهەڵگرەوە هێرشی هێنا بۆ سەر شاری ئەسکەندەرییە بۆ شەڕکردن،.

---

[1] المصدر نفسه (٦١).

[2] المصدر نفسه (٦١).

[3] تأريخ الطبري (٥/٢٩٠).

[4] البداية والنهاية (١٦٣/٧).

[5] (٢٩/٢) للشيخ الخضري.

[6] ذات الصواري ص(٦٢).

[7] النجوم الزاهرة (١/٨٠).

[8] تأريخ ابن الخلدون (٤٦٨/٢).

سەرچاوە عەرەبییەکانم تاوتوێی کردووە هیچیان شوێنی رووداني شەڕەکەیان دیاری نەکردووە، بەڵام زیانی رۆمەکان روونە، بۆ زانیاری گەلەکەشتی رۆمەکان بە ئەزموون بوونو سەرداری دەریای ناوەڕاست بوونو بە خۆیاندا دەپەرموییەوەشالاو بهێنە سەر کەنارەکانی وڵاتی ئیسلامو زۆر بە پەرۆشبوون بۆ گەڕانەوەی شاری ئەسکەندەرییە بۆ حوکمڕانی خۆیان، چونکە ئەسکەندەرییە بایەخێکی گرنگی هەبوو لە ناخیانداو بە لێننامەشیان هەبوو لەگەڵ هاووڵاتیانیو دەست بگرنەوە بەسەر دەریای لەکیس چویانو لانەی موسڵمانان بشێون، سەرچاوە بیانییەکان دەڵێن شوێنی شەڕی (ذات الصواري) (فونیکە) بووە، فونیکەش دەکەوێتە خۆرئاوای شاری ئەسکەندەرییە لە نزیك شاری (مرسی مەتروح) بووە.

## کارەساتەکانی ئەم شەڕە

مالیکی کوڕی ئەوسی حەدەکان دەڵێ: لە شەڕی (ذات الصواري) من لە گەڵیان بووم، لە دەریا بەیەك گەشتن، تەماشای کەشتییە بە بارهەڵگرەکانمان کرد هەرگیز شتی وامان نەدیبوو لەو وەختەشدا ڕەشەبایەك لێی هەڵکردین لەبەرژەوەندی رۆمدا بوو، ماوەیەك خۆمان گیرداو ئەوان لە ئێمە کۆبوونەوە، پاشان بایەکە کپ بوو، وتمان بە رۆمەکان بارێکبکەوینو ئاشتی بکەین، وتیان ئاشتی چی ئێمە تۆڵەمان دەوێ، پاشان وتمان گەر حەزدەکەن با بچینە وشکانی شەڕ بکەین، ئامادەیشین لە دەریا شەڕتان لەگەڵ بکەین، دەڵێ هەموویان بە جارێ قوولاندیان، وتیان نەخێر ئاو، ئاو، ئاو. دەردەکەوێت کە زۆر لە خۆیان ڕاببینیوەو لە شەڕی دەریاییدا کارامە بوونو لەگەڵ جموجوڵەکانیدا ژیاونو خێرو بێریان هەڵگوشیوە بە دڵنیاییەوە چاوەڕوانی سەرکەوتن بوون موسڵمانەکانیش تازە بەتازە هاتبوونە شەڕی دەریاییەوە[1]، بەرهەحاڵ شەڕ داگیرساو موسڵمانان شپرزەبوون فەرماندەکەیان وتی: بە هاوەڵانی با ڕاوێژێ بکەین؟ وتیان با دوژمن تاقیکەینەوە خۆمان زاخاودەین شەوێ راوێژ دەکەین کە شەو داهات دەستیان کرد بە نوێژو پاڕانەوەو یادی خودای گەورەو زۆر کوشان وەکو شارە هەنگ زڕەیان دەهات، خەریکبوو کەشتییەکان لە شەپۆلی دەنگیان بجولێ، بەڵام رۆمەکان دەستیان

---

[1] ذات الصواري ص(٦٦).

کرد به دوزه له لێدانو سەما کردن، که ڕۆژبوویەوه قوستەنتین ویستی دەست پێشخەری بکاتو دەست بوەشێنێ، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی سەعد دوای بەرنوێژی بەیانی راوێژی کرد به پیاوه ناودارو بەئەزموونەکانیو پلانێکیان دارشت بەهەرجۆرێك ببێت شەڕەکە ببەنه دەرەوەی دەریا، ئەمەش به قورسی دەلوێ! عەبدوڵڵا فەرمانی کرد به سەربازەکان نزیك ببنەوه له کەشتی دوژمنو ئینجا (بۆقه پیاوەکان) بچنه ناو دەریاکەو لەژێرەوه کەشتییەکانی هەردوولا بەگوریسی ئەستور گرێدەن پێکەوه، کەشتییەکانیش ژمارەیان (١٢٠٠) کەشتی بوو بەستیان بەیەکەوه وەکو پارچەیەك زەوییان لێ کرد، عەبدوڵڵاش پەیتا پەیتا موسڵمانانی هاندەداو گوڕوتینی پێدەدانو دەی وت قورئان بخوێنن سورەتی (أنفال) بخوێنن ئایەتەکانی پڕه له خۆگریو لەنگەرگرتن[1]، ڕۆمەکان دەستیان کرد بەشەڕ، چونکه سەرکەوتن مسۆگەر بوو لەدڵیانداو به خەیاڵی خۆیان موسڵمانانیان شکاندووه سەرەتا شەڕەکه لەسەر هەردوولا دژواربوو خوێنێکی بێ شومار ڕژایه دەریاو ئاوەکەی سوربوو، ڕووەکەی بەتەرم داپۆشرا ئەوەنده کوژرا به تایبەتی له ڕۆمەکان هەژمار نەدەکرا، هەتا مێژوونووسی بێزەنتینی (ڤیوڤانس) ئەم شەڕه بەیەرموکی دووەم ناودەبات[2]، تەبەریش بەم چەشنه باسی دەکاتو دەڵێت: (خوێن ئاوی دەریاکەی ڕووپۆش کرد به ڕەنگی سوور) هەوڵیاندا کەشتی قایدی موسڵمانان نغرۆ بکەن، نزیکبوونەوەو زنجیرێکی کەمەنیان هەڵدا بۆ کەشتییەکەی عەبدوڵڵاو ڕاپێچی بکەن، بەڵام عەلقەمەی کوڕی یەزیدی غەتەفی بەمەی زانیو به شمشێرەکەی زنجیرەکەی بچڕی[3]، هەرچەنده بارەکه سەخت بوو، کەچی موسڵمانان پێیان له جێی خۆی نەخزانو ئارامیان گرت خودای گەورەش سەرکەوتنی بۆ ناردن تەنانەت نزیکبوو قوستنەنتینی پادشایان ئەسیر کەن، بەڵام کەبینی هێزەکەی هەرەسی کرد هەڵهاتو شەپۆلی ئاو سەربازەکانی دایه کەناری دەریاو گەلەکەشتییەکەی پارچه پارچه بوو، به جەستەی بریندارو دڵی پڕ له داخەوه سەری شۆڕکردو خۆی قۆڕدا بۆ دوورگەی سەقلیه[4]، که

---

[1] المصدر نفسه ص(٦٧).

[2] المصدر نفسه (٦٧).

[3] تاريخ الطبري (٢٩٣/٥).

[4] تاريخ ابن خلدون (٤٦٨/٢).

سوکارەکەی پرسیاری سەرکەوتنیان لیّ کرد وتی گاور نەدەستمایەی ماوە نەپیاو)، موسلّمانان هەتا هەرکەویّ چوبایەن کەیفی خۆیان بوو بەربەست نەما لە ریّگایان[1].

دەرەنجامەکانی شەڕی (ذات الصواری)

١ـ یەکەمین شەڕی مانو نەمان بوو تووشی هاتنو بە ئیمانو ئارامو نەخشەی ورد بەلای خۆیاندا پارسەنگییاندایەوە بە گوریس گۆڕەپانێکیان دروست کردو بەمەرگ ساتی رۆمەکان کۆتایی هات.

٢ـ بەرنامەی ریشەکێشکردنی موسلّمانان بوو لە سیاسەتی رۆمەکانداو هەروەها بۆ گەڕاندنەوەی میسرو رکێفکردنی ولاّتی شام بوو، بەلاّم شکانو تەنانەت ناوی دەریای رۆمییەشیان سڕییەوە بۆ هەتا هەتایەو شارەکانی قوبروسو کرێنو کورسیکاو سردینیاو سەقلیەو جوزرو بلیاردیشیان دا بەدەستەوەو موسلّمانان هەتا جنوەو مرسیلیا چوون.

٣ـ قوستەنتین کوژراو قوستەنتینی چوارەمین جێگەی گرتەوە بە ئیزنی خودا هێرشێکی تر دێتە کایەوە بۆ گرتنی قوستەنتینی ئێستاش.

٤ـ لە پێش شەڕکردن خاوێن کردنەوەی دڵو دەروون گرنگترە بۆ سەرکەوتن بە زمانی ئەمڕۆ پێی دوترێت (مەعنەویات وەرگرتن) (خۆشەحنکردنەوە) ئەم کارەش بە چەشنێك بێت دڵت یەکلایی بکەیتەوە بۆ خودای گەورە هەموو ئامرازە دونیاییەکان حازر بکەیتو بەکوڵ لە خودای کەرەسەکان بپاڕێتەوەو سڵ لە کۆسپەکان نەکەیتەوەو بە هیممەتی بەرز رووبەڕووی بچی، ئەم شەڕو کارەساتانە هەموویان دەرسو پەندن بۆ ئێمە نەخوازەڵلاّ ژیانو سەرگوزشتەی هاوەڵان بێت کە لەسەدا سەد پێشەنگن بۆ ئێمە[2].

٥ـ دەریاری ناوەڕاست بوو بە دەریای ئیسلامییو گەلەکەشتی موسلّمانان بوو بە سەرداری، گەلەکەشییەکەشیان بو داگیرکارییو قەلو پەل کردن نەبوو، بەڵکو بۆ شکاندنی سامی موشریکینو گەیاندنی پەیامی ئیسلام بوو.

٦ـ موسلّمانان شارەزای دەریاوانیو کەشتی گەڕی بوونو لە شەڕی دەریایی کارامە بوون، هەروەها شارەزای گەردون ناسیش بوونو پەیوەندی نێوان گەردوونو دەریایان

---

[1] المصدر نفسه.

[2] ذات الصواري (٧١ ـ ٧٢).

کەشف کردو کامێرای (ئیستیرلاب)و (بوسلەی فەلەکیان) دروست کردو ڕۆژئاواییەکانی وەکو (کریستۆڤەر کولومبوس‌و وامریکۆ فیسبوش) لە پشکنینەکانیاندا بەکاریان هێنا[1].

٧ـ ئەم سەرکەوتنە وێنەیەکە لە سەرکەوتنی بیروباوەڕ بەسەر زانیاری سەربازیی‌و چەکداری‌و تەقەمەنیدا، سەیرەکەین پاش ئەزموون‌و شارەزایی سەربازی زۆرو چەکی بەهێز ڕۆمەکان دۆڕان‌و موسڵمانەکان لەچاو ئەوان نە بەکام بوون لە گشت ڕوویەکەوە، کەچی کە مەکە سەرکەوت بەسەر زۆرەکەدا، پاشان سەلیقەی فەرماندەکان وەك (عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ئەبی سەرح) دەوری دووەمی گێرا لەسەرکەوتنیاندا، هەروەها ئەم شەڕە نموونەیەکە لە مەرگبازی‌و خۆبەختکردن[2].

**شەشەم: گرنگترین پەندو سودەکانی فتوحاتی ئیمامی عوسمان**

**١ـ بەدیهاتنی بەڵێنی خودای گەورە بۆ باوەڕداران**

ئین‌و کەسیر لە باسی ئیمامی عوسماندا دەڵێ: (خودای گەورە لەسەر دەستی عوسمان کۆمەڵێ هەرێم‌و شاری رزگار کردو قەڵەمڕەوی ئیسلامیی پێ زیاد کردو خەلافەتی پێغەمبەری ﷺ درێژکردەوەو پەیامی ئیسلامیی بەرۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای زەوی گەیاندو شرۆڤەی ئەم ئایەتەی بەدیارچاوی هاوەڵانەوە بەرجەستە کرد، دەفەرموێ (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ) (التوبە: ٣٣)).

هەر لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (ئەگەر قەیسەر لەناوچوو قەیسەرێکی تر نایەت دوای ئەو، ئەگەر کیسراش لەناوچوو کیسرایەتی تر نایەت لەدوای، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە خەزێنەی هەردووکیان لە ڕێگەی خودادا دەبەخشرێتەوە)[3]، ئەم دەقانە لە دونیای واقیعدا بەدی هاتوو سەلما[4].

---

[1] المصدر نفسه (٧٦).

[2] التأريخ الاسلامي (٤٠٧/١٢).

[3] مسلم ـ كتاب الفتن رقم (٢٩١٨ ـ ٢٩١٩)

[4] البداية والنهاية (٢١٦/٧).

**٢ـ لە هونەری جەنگ‌و سیاسەتدا پێ گەیشت**

جاران لە ناو گەل‌و هۆزەکاندا شەڕ لە پێناوی موڵکداری‌و دەستدرێژیی کردن هەڵدەگیرسا، بەڵام لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ خەلیفەکانی لە پێناوی پەیامدا دەکراو موسڵمانان دەیانویست جیهان وشیار بکەنەوەو مرۆڤەکان بکەن بە بەندەی خودای گەورەو هرزە چەوتەکان ڕامالن‌و عەقیدەی بتپەرستی‌و ئاگرپەرستی بنەبڕ بکەن، ئەم بانگەوازەش هەر بەشەڕکردن نەکراوە، بەڵکو سێ شتیان خستووەتە بەردەم خەڵکان بۆ ئەوەی لێی هەڵبژێرن یان موسڵمانبوون یان سەرانەدان یان شەڕکردن، زۆربەی زۆریان موسڵمان بوونیان هەڵبژارد تەنها ئەوانە نەبێت، کە کینەبازو داخ لەدڵ بوون، یان ئەوانەی سەر بە گێچەڵ‌و ئاژاوەگێڕبوون ئەمانەش پێویستیان بە مۆچاندن هەبووە[1].

**٣ـ لەسەردەمی ئیمامی عومەردا تۆمارگەی سەربازی حکومی دانراو لەسەردەمی عوسمان درێژەی پێدرا**

شەڕی قادسیە بوو بە هۆکارێك، کە ئیمامی عومەر بڕیاری کردنەوەی تۆمارگەی سەربازی بدات‌و فەرمانی کرد هەرچی سوارچاك‌و بەئەزموون‌و لێهاتوو کارامەی هەرێمەکانە بە خۆیان‌و وڵاخ‌و چەکیانەوە بۆم بێنن[2]، ئەگەر بە خۆشی خۆیان هاتن باشە ئەگینا بەزۆر بیانهێن‌و خێرا وەرنەوە، تەنانەت یەك دانەشیان لەبیر نەکەن، کاتی کۆی کردنەوە کردنی بەسەربازی میری‌و ناونووسی کردن‌و مووچەی بۆ بڕینەوە، ڕێکخستن‌و دیوانی سەرۆکایەتی‌و تۆمارگەی سەربازی پێکەوە بەستەوە.

لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا سەربازەکانی سەرپشك کرد بۆ بەشداری غەزاکان بەتایبەتی ئەو غەزایەی کە مۆڵەتی دا بە معاویەو شەڕی دەریایی تیا کرد لە هەمان کاتیشدا تۆمارگەی سەربازی کردەوەو بژاڤی فتوحاتی ناونووس کردو موچەی بۆ دیاری کردن، بەڵام بەتۆپزی نەبوو[3].

**٤ـ ئیمامی عوسمان بایەخی بە سنووری خەلافەتی ئیسلام دەدا**

---

[1] عصر الخلفاء الراشدين، د. عبدالحميد بخيت، ص (٢١٦).

[2] اتمام الوفاء، ص (٧٠).

[3] النظم الاسلامية، صبحي صالح ص(٤٨٩).

دوای سیاسەتی بەرگریکردن لە وڵاتی ئیسلام بەڕووی دوژمناندا، هاتنە سەر فراوانکردنی خەلافەت بەتایبەت لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا، ئیمامی عوسمان بە سەربازە چاونەترس‌و داکۆکیکارەکان قەڵەمڕەو خەلافەتی پان‌و بەرین کردو کە لەبەرەکانی سواغداو سنووری وڵاتی پەرژین کرد وتی: (پاش سوپاسی خوداو سەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئێوە پەرژینی ئیسلامن‌و خەخۆری موسڵمانان ئەو شتانەی، کە ئیمامی عومەر پێی داون لە ئێمە شاراوە نییە، بەڵکو بە راوێژی ئێمە کردویەتی هیچکامتان جێ گۆڕکێ‌و ئەملاوئەولا نەکەن، چونکە خودای گەورە ئەو بەخششەی داویەتی پێتان لێتان دەسێنێتەوەو لاتان دەبات‌و هیتر دەیهێنێتەوە شوێنتان، جاران چۆن بوون هەروا بن منیش بە پێی ئەو توانایەی خودا داویەتی پێم دەست گیرۆیتان دەکەم‌و کاروباری خەلافەتی پێ بەرێوە دەبەم)[1].

ئیمامی عوسمان قایمکردنی کەلەبەرەکانی شام‌و جەزیرەو دورگەکانی سپارد بە معاویەو پێی وت درزەکانی شمشاتیش یان خۆت یان کەسێکی تر قایمی بکەن ئەوانەی بۆ داسپێرەکە دلێرن و تاسەمەندی جیهادن، وە لە فرۆفیێلی رۆم شارەزان[2]، هەروەها نامەی نووسی بۆ مەعاویە کە درزو کەلەبەری ئەنتاکییەش بخاتە ئەستۆی شاندێك‌و هەر گرۆیەك بووە زەحمەتی رێگەیان ئەوانیش زەحمەتی بدەن[3]، ئیمامی عوسمان زۆر وریای کەلەبەرەکانی دەکردو فەرماندەی شارەزای بۆ دەرنارد[4]، کاتێکیش معاویە غەزای عموریيەی کردو ئەو قەڵایەی گرت کە دەکەوێتە نێوان ئەنتاکییەو ئەتوسەوە هەستا شاندێ لە سەربازی شام‌و جەزیرەو قنسرینی بۆ داناو فەرمانی کرد لەوێدا بمێننەوەو لە گەڕانەوەی سوپای ئیسلامدا لە پشتەوە بمان پارێزن، پاشان دوای ساڵێ یان دووساڵ یەزیدی کوڕی حەڕی عەبەسی[5] (ئەندامەکانی رێکخستن‌و هێزە بەرگرییەی)کانی

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٢٤٤).

[2] الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٤٦٦).

[3] فتوح البلدان ـ البلاذري (١/١٧٥).

[4] الخراج وصناعة الكتابة لابن قدامة، ص(٤١٣).

[5] الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/٤٦٦).

لەگەڵ خۆی برد بۆ وڵاتی رۆم کاتێ گەڕایەوە، بە هەمان شێوە شاندێکی چڕوپڕی بەدوای خۆیانەوە بەجێ هێشت، وەکو معاویەی بەڕێوەبەرو ئەزموونداری[1]، هەر بەم چەشنە ئیمامی عوسمان نامەی نووسی بۆ عەبدوڵڵای ئەبی سەرحو فەرمانی پێکرد کە لە بەرەکانی ئەسکەندەرییە بەسەربازە چاونەترسەکان بگرێتو خۆش خۆش بەدلیاتیان پێ بکاتو خۆراكو موچەیان بداتێ بۆ ئەوەی بێ تاقەتو دابڕاو نەبن، پاشان پێی وت: (وریای ئەسکەندەرییە بە ئەوانە دووجار پەیمان شکێنیان کردووە، سەربازە شارەزاکان رەوانە بکە بۆیانو سەربازەکان وەرەسو بێ دەرامەت مەکە)، بەجێ هێشتنی شاندێکی چاونەترسی سەربازە دلێرەکان لە شارە رزگارکراوەکاندا نەریتێکی فەرماندەکانی سەردەمی ئیمامی عوسمان بوو ئەو شاندە قەڵاکانیان نۆژەن دەکردەوەو سەنگەریان لێدەداو چەندین بنکەو بارەگاشیان تیادا دروست دەکرد، بۆ نموونە ئەو قەڵایانەی کە مەعاویە دەستی پیا هێنا قەڵاکانی فورات بوو، وەکو (سمیسات، مەلتیە، شمشات، کومنحو قالیقی)، ئەم قەڵایانە لە رزگارکردنی ئەرمینییە بەدەستیان هێناو تازەکرانەوەو بوونە شوێنی نیشتەجێکردن[2]، بۆ نموونە حەبیبی مەسلەمەی فەهری هەزار سەربازی گیانلەسەر دەستی هێزە بەرگرییەکانی لە قەڵای قالیقلا نیشتەجێ کرد[3]، لە هەمان کاتدا بەربەست کردنی کە لەبەرکانی شامیشی پێ سپێردرابوو، هەربەم شێوەیە کاتی بەڕائی کوڕی عازیب قەزوینی رزگار کرد پێنج سەد سەربازی بە جەرگو فەرماندەیێکی تیا بەجێ هێشتو پارچە زەوییەکی بێخاوەنی بۆ پچڕین، ئەوانیش بە بیرو کشتوکاڵ ئاوەدانیان کردەوە[4]، کاتێ سەعیدی کوڕی عاسیش تەمیسەی[5] رزگار کرد هەزار سەربازی تێیدا بەجێ هێشت[6]، هەروەها ئەو قەڵایانەش کە رزگار کران سەربازیان تیا بەجێ هێڵرا، ئیمامی عوسمان گرنگی دەدا بە بەڕێوەبردنی

---

[1] المصدر نفسه (٢/٤٦٧).

[2] من تأريخ الالتحيصنات، محمد عبدالهادي ص(٤٣٤).

[3] فتوح البلدان (١/٢٣٤).

[4] الادارة العسكرية (٢/٤٦٩).

[5] تةميسة: شاريَكة لة تةبرستان.

[6] الادارة العسكرية (٢/٤٦٩).

هێزی ڕێکخستن‌و بەرگری[1]، ئاسانکاریی بۆ دەکردن‌و فەرماندەی بەسەلیقەی بۆ دیاری دەکردن، هاوکاری دەکردن یەکێ لە هاوکارییەکانیان ئەوەبوو معاویە لە مەنبەج پردێکی دروست کرد بۆ هاتووچۆی ڕێکخستنەکان، هەروەها غەزای ڕۆمەکانی دایە دەستی معاویەو فەرماندەێکی بە هێزی ڕێکخست، کە معاویەی عەوفی بوو، هێزی ڕێکخستن‌و هێزی بەرگری لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا چ لە دەریابێ یان لە وشکانی دریغییان نەکردووە[2].

**٥ـ دابەشکردنی دەستکەوتەکان لە نێوان خەڵکی عێراق‌و شامدا**

حەبیبی مەسلەمە توانی ڕۆمەکان تەفروتونا بکات لە ئەرمینیە بەرلەوەی یارمەتی وەلیدی کوڕی عەقەبەی لە کوفەوە پێ بگات، هەتا سوپای کوفە هات سوپای شام سەرکەوتن‌و دەستکەوتیان گرتبوو، بۆ دابەشکردنی دەستکەوتی شەڕەکە ڕایەك دروستبوو ئایا بەشی کوفەی تێدایە یان نا؟ حەبیبی کتابی نووسی بۆ معاویە ئەویش نووسی بۆ عوسمانی خەلیفەو هەواڵی پێدا ئەویش حوکمی دەرکرد ئەهلی شام بەشی ئەهلی عێراق بدەن واتە کوفە لە دەستکەوتەکان، حەبیب حوکمەیکەی خوێندەوە هەموویان وتیان گوێڕایەڵی‌و ملکەچیمان هەیە بۆ ئەمیری ئیمانداران ئیمامی عوسمان، پاشان برا بەشیان کرد[3].

**٦ـ پەرۆشی یەکدەنگی بوون لە بەرهەڵستی دوژمندا**

لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا عەبدوڵڵای کوڕی عامیر قەیسی کوڕی هەیسەمی کردە جێگیری خۆی، پاش ماوەیەك (قارن) ئاپۆڕایەکی کۆکردەوە زیاتر لە چل هەزار سەرباز دەبوو بە ڕێگای (تبسین)ەوە هات‌و شاڵاوی هێنا بۆ موسڵمانان، قەیسیش ڕاویژی کرد بە عەبدوڵڵای حازم وتی: تۆڕات چییە؟ وتی من پێم باشە شار چۆڵ کەین، چونکە من ئەمیرم مۆڵەتنامەی عەبدوڵڵای عامریشم پێیە، کە من ئەمیری شەڕی خۆراسان بم، نامەیەکی ساختەکاری دەرهێنا، قەیسی ئەمیر پێی ناخۆشبوو ملەجەڕێ

---

[1] الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٢/ ٤٧٠).

[2] المصدر نفسه (٢/ ٤٧٠).

[3] الفتوح ابن اعثم (١/ ٣٤١، ٣٤٢).

بکاتو ئاژاوه دروست بکات هەستا شارەکەی بەجێ هێشت[1]، ئەم کارەی بەلاوە باشتربوو هەتا دووبەرەکیو ئاژاوه بکاتو ریزی موسڵمان شەق بکاتو هورەی سەربازەکان بپۆکێنێتەوە، کەچی ئەنجامی شەڕەکەش بەسەرکەوتنی موسڵمانان دوایی هات[2].

**٧ـ ئەو مەرجەی لە بەندەکانی سولحدا سەربازەکان پێویستیان بوو**

لە سەردەمی عوسماندا فتوحات تەشەنەی کردو هەندێکیان بە سولح فەتح دەکرد، مەرجێکی پێویستیان لە سولحەکاندا تۆمار دەکرد، ئەویش یارمەتیدانی سوپابوو لە لایەن خەڵکی شارەکانەوە بە خواردنو ئاژەڵو کەرەسەی جەنگی بۆ ئەوەی ئامێری رزگارکردنیان لەبەردەستدا بێت لە ناوەندی سەرکردایەتییەوە داوای زەکاتو خەراجیان لەو شارانە نەدەکرد، چونکە دەیاندا بە سەربازەکانی نێو خۆیانو نەیان دەبرد بۆ سەرۆ[3].

**٨ـ کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی دوژمنەوە**

فتوحاتەکانی ئیمامی عوسمان زۆر گرنگی دەدا بە دەزگا زانیارییەکانو لێی دەکۆڵییەوە[4] و زۆر بایەخی دەدا بە چاوەکانی خەلافەت، واتە: (هەواڵگریی) بە وردی دوژمنی دەخوێندەوە[5]، هەرکاتێ بەیعەتی وەرگرتبایە لە بەڵێندەرەکان بەو مەرجە دەیکرد موسڵمانان ئاگادار بکەنەوە لە مەرامەکانی دوژمنو وریای سەلامەتیان بکەن[6].

**٩ـ عەبدوڕڕەحمانی رەبیعەی باهیلی یەکێك بوو لە فەرماندەکانی فتوحات لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا**

---

[1] الادارة العسكرية (٨٩/١)، نقلا عن تأريخ الطبري.

[2] المصدر نفسه.

[3] الطبقات (٥٩/٣).

[4] الادارة العسكرية (٤٠٣/١).

[5] تأرلايخ اليعقوبي (١١٦/٢).

[6] الادارة العسكرية (٤٠٣/١).

عەبدوڕڕەحمان فەرماندەیەکی چاونەترسبوو لە ئاستێکی بەرزدا، بیروباوەڕێکی ئەستووری هەبوو، بە خودای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ پلەی فەرماندەو پلەی سەربازی بۆ ئەو تەوفیری نەبوو، وێڕای ئەمەش پێشڕەوو شەرعزان بوو، بۆیە کرا بە والیو فەرماندەی شاری (باب الابوب) دوای مردنی سوراقەی کوڕی عەمر، هەتا شەهیدبوو لە پلەی خۆی دانەبەزێنرا، بە بەردەوامی نامەگۆڕینەوەی هەبوو لەگەڵ پایتەختداو زۆر سەرقاڵی کەرەستەکانی شەڕی سوارچاکی بووە هەرگیز گزیو ساختەکاری نەکردووەو لە پشتەوە خنجەری نەوەشاندووەو[1] شوێنەواری دێرینی بەجێ هێشتووە لە (باب الابواب)و باشووری دەریای خزرو رۆژهەڵاتی، چالاکییەکانیشی هێورکردنەوەی بارودۆخی خەڵكو بەرپاکردنی دادو گەشەپێدان بووە تەنانەت ئەوەندە ئارانی کردۆتەوە کردوویەتی بە ناوەندی بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامو رزگارکردنی باکور، سەرەڕای مەینەتیو باڵە شەڕخوازەکان، ئیسلامی لەو ناوچە بێوەرەدا دامەزراند هەتا ئێستاش[2] یەکێ لە یادگارییە زیندووەکانی کە لاپەڕەکانی مێژوو نووسیویانە ئەمەیە کاتێ سوپاکەی دەباتو راستەوخۆ دەچێتە شاری (باب) شهریار پاشا پێی دەڵێ: ئەتەوێ چی بکەیت؟ دەڵێ بەلەنجەرو تورکم دەوێ، دەڵێ: ئێمە ئاشتین لەگەڵیان لە شاری ئێمەوە مەچن بۆیان، ئەویش وتی: بەڵام ئێمە لێیان رازی نین دەبێ هەر بچینە، ماڵەکانیان، با بزانی کەسانێکم لەگەڵدایە ئەگەر بێفەرمانی ئەمیرەکەمان نەبێت هەتا بەنداوی رەدم کە لە وڵاتی سینە دەیان بەم، وتی: ئەوان چ کەسێکن؟ وتی: کەسانێکن هاوەڵی پێغەمبەریان کردووە ﷺو بە دڵپاکی هاتوونەتە ناو ئیسلامو لە نەفامیدا شەرمو نتمیان هەبووە ئێستاش زیادی کردووەو جیهاد بووەتە پیشەیانو سەرکەوتن بووەتە هاوڕێیان مەگەر لێیان بگۆڕێ ئەگینا هەمیشە باڵادەستن[3].

عەبدوڕڕەحمان توانی شەڕی بلەنجەر بکاتو تورکەکان بشکێنێ، تورکەکان وتبوویان موسڵمانەکان فریشتەیان هێناوە ئەگینا پەڵ خوردیان نەدەکردین، بە روسووریو

---

[1] قادة المفتح الاسلامي في أرمنية، ص (١٥٥).

[2] المصدر نفسه ص(١٥٨).

[3] الكامل لبن الثير (٢٩/٣)، تأريخ الطبري (١٤٦/٦).

سەرکەوتوویی گەڕایەوە دوای ئەوەی دووسەد فەرسەخ لە بلەنجەر دوورکەوتبووەوە تاقە سەربازێکیان لێ شەهید نەکرا، سەربازەکانی سەرکەوتنیان مسۆگەر بوو[1]، چونکە مەعنەویاتیان بەخوداو دینەکەی بەرزبوو، کەچی گەلانی تر بێ مەبدەئو بێ هیممەت مابوونەوە، بۆیە موسڵمانان سەردەکەوتن بەسەریان وەکو زانراوە تورکەکان بەبێ شەڕ هەڵهاتن لە سامی ئەمان[2]، عەبدوڕڕەحمان لەسەر بوراقی تەقواو ئەتواری چاك بوو تەنانەت هەڵوێستی لەگەڵ دۆڕاوانیش هەرچاك بوو مرۆڤێکی بە سپاردەو ئەمەکدار بوو، پادشای باب نامەبەرێکی ناردبوو بۆ لای پادشای سین بە دیارییەکەوە، بەر لەوەی موسڵمانان وڵاتی باب رزگار بکەن، نامەبەر هاتەوە سەیرەکا دەور گۆڕاوە چوە لای پادشاکەی خۆیانو دیارییەکی پڕ لە یاقوتی سوری لەوسەرەوە بۆ هێنابوو لای پاشای سین، ئەوکاتەش عەبدوڕڕەحمان پادشا بوو، پادشاکە (شهریار) دیارییەکەی وەرگرتو دای بەدەستی عەبدوڕڕەحمانەوە یەکسەر پێی دایەوە پادشا سەری سوڕما وتی: (ئەمە یاقوتە باشترین کانزای ئەم وڵاتەیە، بەڵکو لە وڵاتەکە بەنرخترە، سوێند بەخوا ئێوە لە حاکمەکانی ئالی کیسرا خۆشەویسترن لەلای من، ئەگەر لە کۆڕی سوڵتانی ئەواندا بومایەو ئەم یاقوتەیان دیبایە لە دەستمیان هەڵدەپوڕکاند، سوێند بێ بەخودا جگە لەو کارانەی کە پادشا گەورەکەتان واتە خەلیفە فەرمانی پێ کردووە هیچی تر ناکەم)[3]، ئەم پاشایە ناهەقی نەبوو سەرسامی دەیگرت، چونکە بە درێژایی تەمەنی لە ململانێو گزیکاریو ئاڵۆزیدا ژیاوە، واقیعەکەی پڕبووە لە زوڵمو ناهەقی، کاتی فەرماندەیێکی بە ئەمەكو چاوتێر دەبینێ رادەچڵەکێو پادشا خراپەکارەکانو سامانە تاڵان کراوەکان دێتەوە بیری، بۆیە بەم وشانە گوزارشت لە ناخی خۆی دەکات[4]، عەبدوڕڕەحمان دەیزانی زەوتکردنی ئەو یاقوتە کە نرخەکەی لە ژمارە نایەت نە پشکی خۆیەتیو نەهی بەیتولماڵ، ئەوەندە بەرچاو سێرف بوو جیاوازی نەدەخستە نێوان یاقوتو خۆڵ، چونکە

---

[1] تاريخ الطبري (١٤٦/٥).

[2] قادة الفتح الاسلام في أرمنية، ص (١٥٠).

[3] تاريخ الطبري (١٤٨/٥).

[4] قادة الفتح الاسلام في أرمنية، ص (١٥٤).

خۆی بەخشندە بوو لە خواترس‌و خۆپارێز بوو، شارەزای کرۆکی دین بوو، خۆی نەدەکردە خاوەن پوش‌و پەلاشی دونیا، ئەم پیاوە تەمەنی خۆی لەسەربازیدا تەواو کردو لە ساڵی (٣٢)ی کۆچی لە ناوچە بلەنجەر شەهید کرا[1]، عەبدوڕڕەحمان فەرماندەی فتوحاتی سەردەمی عوسمانەو هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووەو درەنگ موسوڵمان بووە.

**١٠- سەلمانی کوڕی رەبیعەی باهیلی یەکێك بوو لە فەرماندەکانی فتوحاتی سەردەمی عوسمان**

ئەم هاوەڵەمەزنە یەکەمین دادوەری کوفە بووە، لە لایەن ئیمامی عومەرەوە بە هەمان شێوە ئیمامی عوسمانیش لەکاتی والیەتی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسدا کردی بەدادوەری کوفەو بەشداریی شەڕی قادسیەی کردووەو لە دواییدا کراوەتە داوەری مەدائین، هەرکەسێ شیاو نەبێت ناکرێتە دادوەر بە تایبەت لە رۆژانی عومەردا، هەموو کەسێکیش نەدەکرا بە دادوەری کوفە، چونکە پڕبوو لە پیاوی هەڵکەوتووی عەرەب‌و هاوەڵی گەورە گەورە، ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی تریشەوە چەندین هۆزو تیرە جۆربەجۆری تێدابوو، کەواتە سەلمان زانستە کەی لێزمەی کردووەو دینداریییەکەی بێخەوش بووەو لە ئاوەزای خۆی بەهرەمەند بووەو کەسایەتییەکەی بەهێز بووەو جێگەی متمانەی گشت لایەك بووە، هەر بەو چەشنە بوو بەناوبژیوانی دەستکەوتەکانی رزگارکردنی مەدائین‌و شەڕی باب، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر سەلیقەی بەربلاوی، ئەم کەڵە پیاوە راساڵە، هەموو ساڵێ حەجی کردووە، هەندێ لە گەورە تابیعییەکان فەرموودەیان لێ ریوایەت کردووە، لە رووی ئاکارە بەرێزەکانەوە، دڵفراوان‌و بەخشندەو راستگۆو چاکەخوازو وەفادارو بەرێز بووە، هەرچی بۆخۆی پێی خۆشبوایە بۆ خەڵکیش پێی خۆش بووە، کاتێ پلەی شەهیدی بەرکەوت نەپارەو نە موڵك‌و نە کەسەری بەجێنەهێشت‌و وێڕای ئەوەی سەرتاپای ژیانی لە تێکۆشان‌و دادوەری‌و سەرداریی بردە سەر، جارێکیان ئیمامی عوسمان نامەی نارد بۆ وەلیدی کوڕی عەقبەی بریکاری، لە کوفە فەرمانی پێ کردبوو تێیدا کەشاندێ سەربازی چاونەترسی سوپای کوفە هەواڵە بکات بۆ لای سوپای ئەهلی شام‌و پیاوێکی بلیمەت‌و دیندارو جەربەزە بکاتە

---

[1] قادة الفتح الاسلام في أرمنية، محمود شيت خطاب، ص (١٥٨).

فەرماندەیان، وەلیدیش بەبێ دوودڵی سەلمانی هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتیکردنی ئەم کارە سەختە، هەرچەندە ژمارەیەك زۆر فەرماندەی تریش هەبوو، لەبەر ئەوە سەلمان نموونەیەکی پێکەوتووبوو لە ئەزموونداریو زەبروەشێنیو پاڵەوانی وێڕای ئەم سیفاتانەش خوداناسو خۆپارێز بوو، واقیعەن پاڵەوانێکی بە هەڵمەتو پێشڕەوبوو، لە هونەری جەنگدا شارەزابوو، بە هۆی بەرخودانەوە چەندەها ئەزموونو سەربوردەی هەبووە لە سەرکردایەتی لەشکرو لێدانی جومگەو شادەمارەکاندا تیرئەنداز بووە[1]، لە سوارچاکیدا بەتایبەت لە هێستر بەریدا لێزان بووە، لە هەموو شارەکانەوە هێستری کوێتی دەهێنا بۆ ئیمامی عومەرو قاشاوی دەداو مەشقی جیهادی پێ دەکردن[2]، بۆ نموونە لە کوفە چوار هەزار هێستری قیتی هەبوو لە کاتی پێویستدا بەکاری دەهێنانو دزەی دوژمنیان پێ سەرکووت دەکرد[3]، لە سوارچاکیدا ئەوەندە لێزان بوو خۆی دەڵێ: (بەم شمشێرەم سەد جەللادی قەڵغان لەبەرم کوشتووە، هیچیان موسڵمان نەبوون، نەمهێشتووە هیچ کامیانم دەست بدرێتەوەو هۆمان هۆکانم لەگەڵدا بکات)، لەگەڵ موشریكو بێباوڕدا نەبێت شەڕی لەگەڵ کەسی تر نەکردووەو لە گۆڕەپاندا خۆی مەلاس نەداوەو قەرەوڵی گرتووەو شەقەی لێ هەستاندووەو بەفرۆفێڵ شەڕی نەکردووە[4]، بە ڕاستی نموونەی موجاهیدێکی راستگۆ پاداشت ویست بووە، چونکە تێکۆشانەکەی بۆ بەرزکردنەوەی (لااله الا الله محمد رسول الله) بووەو نەدەکەوتە بەر ئەندێشەی لەکوێو بەچی مێشکی دەپشێ لە دواهەمین شەڕیدا بە تافەی خوێنی برینەسۆدارەکانی کەو[5]، بەڵام شمشێرەکەی لە دەست نەکەوتو لە ساڵی (٣٢)ی کۆچی یان (٣٣)ی کۆچی، شەهید کرا[6].

---

[1] تهذيب ابن عساكر (٦/٢١٠) تأريخ الطبري (٥/٣٠٩).

[2] قادة الفتح الاسلام في أرمنية، ص (١٦٩).

[3] اسد الغابه في معروفة الصحابة، لابن الأثير (٢/٣٢٧).

[4] الاستيعاب في معروفة الأصحاب (٢/٦٣٣).

[5] قادة الفتح الاسلام في أرمنية، ص (١٧٠).

[6] المصدر نفسه (١٧١).

قوربی ئەم کەڵەپیاوە ئەمانەبوون: (شەرعزان بوو، فەرموودەناس بوو، قازییەکی دادپەورەربوو، دەستپاکێکی بێ لەکەبوو، بەڕێوەبەرێکی گورج و گۆڵ بوو، سوارچاکێکی گیانبازبوو، فەرماندەیێکی فاتیح بوو، پاڵەوانێکی شەهید بوو)، سەلمانی کوڕی رەبیعەی باهیلی[1].

**١١- حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فەهری یەکێکە لە فەرماندەکانی فتوحاتی سەردەمی ئیمامی عوسمان**

حەبیب هەرچەند تازەساڵ بوو و لە گۆڕەپانێکەوە دەیگوازتەوە بۆ گۆڕەپانیکی تر، جاریّ رزگارکەربووە جارێکی تر یارمەتیدەر بووەو هەمیشە سەرکەوتن هاوپەیمان بووە، چوبێتە هەر شەڕێك براوە بووە، چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بە موجاهیدی بۆ شاری مەدینەو ئەو رۆژە منداڵ بوو، وە بەشداریی غەزای تەبوکی کردووە لە ژێر بەیداخی پێغەمبەردا ﷺو بەم غەزایە دەستی کرد بە جیهادو تەمەنی تازە پێی نابووە بیست ساڵان، کاتێ ئیمامی عومەر بینی لەشی بەهێزەو زۆر بەگورجی دەپلیسکێتەوە بە تاقیکردنەوەیەکی کردەیی تاقیکردەوە تا بۆی دەرکەوێ چ جۆرە پیاوێکە، بۆیە پێشنیاری کرد گەنجینەی دارایی یان گەنجینەی چەك و تەقەمەنی بگرێتە ئەستۆ، ئەویش چەکەکەی هەڵبژاردو خۆی دوورگرت لە دارایی، فەزڵدانی چەك بەسەر داراییدا یەکێکبوو لە نیشانەکانی سەرکردەیی و ئەوینی سەربازیی قوڵپی دەدا لە قوڵایی دەروونیدا، حەبیب بوو بە سەرداری قیادەی کردوس لە شەڕی یەرموکی مانو نەماندا و تەمەنی بیستو چوار ساڵان بوو، ئەم کارانە ئاشێرەبوو، بۆ دەرکەوتنی هێماکانی قیادەیی لە سپیدەی گەنجی و لاوێتیدا.

ئیمامی عومەر کردی بە والی عەجە (جەزیرە) لە بەڕێوەبەردنو کاری ئیداریدا عومەر بە ئاسانی ئەو پلەو پایە بڵندانەی بە هەموو کەسێك نەئەدا، چونکە ئیمامی عومەر پابەندی کۆمەڵێ سیفاتی دیاریکراو بو لەدەستنیشانکردنی سەرکردەدا لە کەم پیاوێکدا هەبوو، لە دوایشدا ئیمام کردی بە والی ئەرمینیەو ئازر بیجان، کە دوو ناوچەی چەپو دوورە دەستو قیادەکردنیان ئەوپەڕی دژوارە، ونکە بە ناڕەحەت

---

[1] قادة الفتح الاسلام في أرمنية، ص (١٧٢).

خەڵکەکەی ڕێشمە دەکرێتو زۆر دوورن لە بنکە سەرەکییو پێشکەوتووەکانی موسڵمانان، مومارەسەی ئیدارەو فەرمانداری کردووە لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا هەتا حەزبکەیت ئازابووە، لە پێشڕەویدا پێشڕەوێکی کاملبووە، کاتێ رووی کردە شەڕی موریان بە شەش هەزار سەربازەوە موریانەکان حەفتاهەزار بوون، حەبیب وتی: بەوانەی لە گەڵیدابوون: ئەگەر ئەوان خۆیان بگرنو ئێوەش خۆتان بگرن، ئێوە ئەوبەرترن بەلای خوداوە هەتا ئەوان، ئەگەر ئەوان خۆیان گرتو ئێوە هەراو هوریاتان کرد ئەوکاتە خودا لەگەڵ ئارامگرانایە، شەوی دەستەویەخەبوونەوە وتی: (ئەی خودایە هەڵهاتنی مانگ دوابخە، بارانی ئەم شەوە بگرەرەوەو خوێنی هاوەڵەکانم ڕانەدەی، بە شەهید قبوڵیان بکەی، خودای گەورە فەتحی کرد بۆی)[1]، یەکێ لە هۆکاری سەرکەوتنی بەسەر دوژمندا لە پاڵ فاکتەرە ئیمانییەکەدا هێرشبردنی شەوبوو، کە لە پڕ دایان بەسەر دوژمنداو وەریان داتەپاندو پاشان پشتیان هەڵگرد[2]، کەسایەتییەکی زیندوو و نموونەیی هەبوو بۆ سەربازەکانی، لە ئازایەتی پێشڕەویدا کەوا سووری بەرلەشکربووە لە پێشی پێشەوە دەیوت پێیان شوێنمکەون، لە نەخشەکانی دواوە خۆی نە ئەهێلایەوەو عەودالی سەلامەتیو بێوەیی نەبووە کاتێ بڕیاری یەکجاریدا لە مۆریان رۆژ بکاتەوە ژنەکەی گوێی لێبوو ئەم بڕیارەیدا پێی وت: شوێنمان کوێ بێت؟ وتی: ماڵی سورادیقی موریان، ئەو شەوە حەبیب چووە موریانو هەرکەسێ هاتە رێگەی کوشتی، کاتی گەشتە ماڵی سورادیق سەیرەکا ژنەکەی پێش ئەم گەیشتووەتە ئەوێ[3] تەنیا حەبیب پاڵەوان نەبوو، بەڵکو ژنەکەشی پاڵەوان بوو، بە کردەوە بوێرەکانی جوانترین نموونەی دەنواند بۆ سەربازەکانی، بەڵکو خێزانەکەی نموونەیەکی تربوو، وەکو پاڵەوان شوێنەواری خۆبەختکردنو فیداکاری هەبوو[4].

---

[1] تهذيب ابن عساكر (٣٧/٤).

[2] قادة الفتح الاسلام في أرمنية، ص (١٨٩).

[3] قادة الفتح الاسلامي في أرمينية، المصدر نفسه.

[4] المصدر نفسه.

حەبیب ڕاوێژی بە پیاوەکانی دەکردو بۆچوونیی وەردەگرتن، بە بۆچوونی تر کاریگەر ئەبوو، بەڵکو بە دانایی بۆچونی پیاوەکانی دەقۆستەوە، هەرچییەکی بە باش بزانیایە پیادەی دەکردو پوختەکەی جێبەجێ دەکرد، لە پاڵ ئەمەشدا دانیشتنی راوێژکارانی دەبەست پێش شەڕکردن، وە لە کاتی شەڕکردنو لە پاشیشدا، ڕۆژێکیان گوێی لێبوو یەکێ لە پیاوەکانی دەیوت ئەگەر من یەکێ بومایە لەوانەی کە حەبیب گوێ بۆ راوێژی دەگرێ، ئاماژەی هەرمانێکم بۆ دەکرد کە سەرکەوتنو سەربلندیمان بە ئیزنی خودا بەدەست بهێنایە[1]، حەبیب گوێی لە قسەکە بوو، وتی بە هاوەڵەکەی ڕاوێژەکەت چییە؟ وتی: من پێشنیارم ئەوەیە هەموو ئەسپسوارەکان بچن لە پێشمانەوە، پاشان سەربازەکان بکەونە دوای ئەسپەکانو لە نیوەی شەوداو دەست بکەن بە شەڕکردن، لەگەڵ بەری بەیاندا تۆش بە ڕەشایی سەربازەکانەوە هێرش بهێنین باوابزانن یارمەتیمان بۆ هاتووە، خودای گەورە ترس دەخاتە دڵیانو بەوترسە هەرەس دێنن، یەکسەر حەبیب گازی ئەسپسوارەکانی کردو لە شەوێکی شەوەزەنگی باراناویدا بەڕێی خستنو پاشان خۆی کەوتە ڕێ لە دوای ئەسپ سوارەکان، بەڵام نەریتی وابوو لە سپێدەی بەیانیدا دەچووە سەر دوژمن خۆیو هاوەڵانی هەڵمەتیان برد، دوژمن تێکشکاو دەستکەوتێکی زۆریان بەرکەوت[2]، حەبیب خاوەنی فێڵ بوو، بیری دەکردەوەو پلانی دادەنا، پاشان راوێژی دەکرد بە پیاوەکانیو ئینجا دەچووە گۆڕەپانی شەڕەوەو هەموو زانیاریی جۆراو جۆری لەسەر دوژمن دروێنە دەکرد، پاشان نەخشەی سەربازی لەسەر، شارەزاییو چاوڕوونی دادەنا.

کارە جیهادییەکانی حەبیب لەسەر نەخشەیەکی رێکخراو بوو نەك نەخشیەکی بێسەروبەرە، بۆیە سەرکەوتن ببووە بەیداخی، لە ترسناکترین گۆڕەپانی شەڕدا، لە پاڵ ئەمەشدا کە نیشانەی سەرکردەییو لێهاتوویی هەبوو پیاوێکی ئیمانداربوو ئیماندابەستراو بوو، هەرکاتێ ڕووبەڕووی دوژمن بوایەتەوە یان پەلاماری قەلایەکی بدایە حەزی دەکرد بڵێ: (لاحول ولا قوة الا بالله العي العظيم)[3].

---

[1] تهذیب ابن عساکر (٣٧/٤).

[2] قادة الفتح الاسلامي في أرمينية (ص١٩٠).

[3] تهذیب ابن عساکر (٣/٤).

بەڕاستی حەبیب سەردارێکی ناوازەبوو، هەموو سیفاتەکانی فەرماندەی ناوازەی تیابوو (سروشتی پڕبوو لە بەهرە، زانستێکی بەئەزموونی هەبوو، ئەزموونی کردەیی هەبوو[1]، متمانەی بە خودای گەورە زۆربوو، حەبیب شێربوو بۆ فتوحاتی ئیسلامیی‌و چالاکییەکانی لەبیر ناکرێت، بێگومان نایابترین فەرماندەی فەتح بوو لە سەردەی ئیمامی عوسماندا، ئەم فەرماندە گەورەیە ساڵی (٤٢)ی کۆچی وەفاتی کرد، لە تەمەنی (٥٤) ساڵیدا، ژیانی لە ژمارەی ساڵدا کەمبووە، بەڵام لە تیراژی کردەوە جوامێرییەکاندا زۆربووە، تەمەنی کەم بووە، بەڵام شوێنەوارەکانی بە درێژایی ساڵ‌و سەدە ڕێزگرتووەکان هەردەمێنێ، خودای گەورە لەم هاوەڵە مەزنە ڕازی بێت، کە فەرماندەیەکی سیاسی بەهێزبوو، کوڕی ڕۆژی تەنگانەو فەرماندەیێکی ڕزگارکەر بوو، حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فەهری[2].

[1] قادة الفتح الاسلام في أرمينية، ص (١٩٢).

[2] المصدر نفسه.

## باسی چوارەم: گەورەترین شانازی بۆ ئیمامی عوسمان ئەوەیە ئوممەتی کۆکردەوە لەسەر یەك پەرتووك (قورئان)

### یەکەم: ئەو قۆناغانەی کە تێپەڕی بەسەر نووسینەوەی قورئانی پیرۆزدا

#### ١- قۆناغی یەکەم لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ

بەبەڵگەی گومان بڕ سەلمێنراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە نووسینەوەی ئەو قورئانەی کە دابەزیوەتە سەری، سەلمێنراوە کە پێغەمبەر ﷺ نووسەری هەبووە یان کۆمەڵێ نووسەری هەبوە نیگایان بۆ نووسیوە، هەتا زەیدی کوڕی سابیت بە نازناوی نووسەری پێغەمبەر ﷺ ناوی دەکردووە، چونکە تایبەتکراوەو پسپۆڕبووە لە نووسینەوەی نیگادا، ئیمامی بوخاری بەشێکی تەرخانکردووە لەکتێبی (فەزلی قورئاندا) بە ناونیشانی نووسەرانی پێغەمبەر ﷺو لە دوو فەرموودەدا باسی دەکات.

١- ئەبوبەکر وتی بە زەید (تۆ نیگات دەنووسی بۆ پێغەمبەر ﷺ)[1].

٢- (براو) دەڵێ ئایەتی (لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ) دابەزی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (بانگی زەیدم بۆ بکەن‌و پارچەدارێکی تەختەو پارچە ئاسنێکم بۆ بێنن)[2].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ پێش کۆچکردن قورئانی دەنووسی، ئەوانەش کە بۆیان دەنووسی عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ئەبی سەرح بوو، لە دواییدا دین هەڵگەڕایەوە، پاشان ساڵی فەتحی مەککە موسڵمان بوویەوە، ئەمە چیرۆکێکی زڕاوی هەیە - باسم کردووە - ئەوی زانراوە هەرچوار خەلیفە راشیدە، کە قورئان نوسیان بووە، بێگومان قورئانیان لە مەککە نوسیوەتەوە ئەوەی ئاشکرایە کە قورئان لە سەردەمی مەککە نووسراوەتەوە بە بەڵگەی چیرۆکی موسڵمانبوونی ئیمامی عومەر، کە دەچێتە ماڵی خوشکەکەی‌و سەیردەکا نووسراوێکی بەدەستەوەیە سورەتی (طه)ی تیا نووسراوە- خودای گەورە باش دەیزانی ئەم قورئانە پیرزە لە پەرتووکێکدا کۆدەکرێتەوە بۆیە دەیفەرموو: (رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفاً مُّطَهَّرَةً) (البينة: ٢).

---

[1] البخاري، كتاب الفضائل القران رقم (٤٩٨٦).

[2] البخاري، كتاب الفضائل القران رقم (٨٥٩٣).

کاتێ پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، قورئان هەر هەمووی نووسرابووەوە، بەڵام لەیەك پەرتوکدا کۆنەکرابووەوە، لەسەر گەڵای (پەلی) دارخوماو بەردی سپی تەنگو لە سنگی پیاوانیشدا دەرخ کرابوو، لەگەڵ ئەوەی، کە لە پەڕاو سنگدا هەڵگیرابوو، جوبرەئیل هەموو ساڵێ جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەوری دەکردەوە، ئەو ساڵەی کە کۆچی دوایی کردو ڕۆحی سپارد دووجار دەوری کردەوە لە گەڵیا[1]، پێدەچێ پێغەمبەر ﷺ قورئانی لەیەك پەراودا کۆنەکردبێتەوە لەبەر ئەوەی چاوڕوانی هاتنی شۆردنەوەی هەندێ حوکم یان هەندێ دەقی کردبێت کاتێ ئاکامی تەواوبوو، خودای گەورە سروشی کرد بۆ خولەفای راشیدین هەستن بەم کارەو وەفایان هەبێ بەرامبەر ئەو بەڵێنە ڕاستەی کە خودا داویەتی بە ئوممەتی موحەممەد ﷺ کە پارێزگاری لەم قورئانە بکات بۆ ئوممەتی موحەممەد ﷺو پاراستنی خستووەتە ئەستۆی خۆی (جل جلاله)[2].

**٢ـ قۆناغی دووەم لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکردا**

ڕیزی موسڵمانە شەهیدەکانی شەڕی یەمامە زۆربەیان قورئان لەبەرەکان بوون، لە بەر خاتری ئەمە ئیمامی ئەبوبەکر هەستا راوێژی کرد لەگەڵ ئیمامی عومەر بۆ کۆکردنەوەی قورئان، قورئانی لە پەلی دارخورماو پارچە ئێسكو پارچە کاغەزو سنگی پیاوان کۆکردەوە[3]، ئیمامی ئەبوبەکر ئەم کارە گرنگە مەزنەی سپارد بە هاوەڵی پڕشکۆ زەیدی کوڕی سابیتی ئەنصاری، زەیدی کوڕی سابیت خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: (ئیمامی ئەبوبەکر ناردی بە شوێنمدا بۆ شەڕی ئەهلی یەمامە چووم سەیرەکەم عومەری کوڕی خەتتاب لە لایەتی، ئیمامی ئەبوبەکر وتی: عومەر هاتووە بۆ لام دەڵێ لە ڕۆژی یەمامەدا زۆربەی قورئانخوێنەکان کوژراونو کوشتن دورێنەی کردون، منیش ترسی ئەوەم هەیە قورئانخوێنەکان گشتیان بە کوشتن بچن، لە گۆڕەپانی شەڕداو زۆربەی ئایەتەکانی قورئانمان لە کیس بچێ، من پێم باشە لیژنەیە دروست بکەین بۆ کۆکردنەوەی قورئان، منیش وتم: بە ئیمامی عومەر چۆن کارێك دەکەیت کە پێغەمبەر

---

[1] البخاري، كتاب الفضائل القران رقم (٤٩٩٨).

[2] المدينة النبوية فجر والعصر الراشدى، ص (٢٤٠)، نقلا عن فتح الباري (١٢/٩).

[3] حروب الردة وبناء الدولة الاسلامية ـ أحمد سعيد، ص (١٤٥).

ﷺ نەیکردووە؟ عومەر وتی: وەڵڵاهی ئەمە کارێکی خێرە، عومەر وازی لە ڕوونکرنەوە نەهێناو بۆی شیکردمەوەو هەتا سنگم فراوان بوو بۆ ئەو کارەی کە سنگی عومەری بۆ فراوان بووە.

ئەو ڕێنماییانەم بەدی کرد، کە عومەر بەدی کردبوو، زەید دەڵێ: ئیمامی ئەبوبەکر وتی: ئەی زەید تۆ پیاوێکی گەنجو ژیریو لەتۆ شیاوترمان نییەو تۆش نیگات نووسیوەتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ جا شوێن دۆزی قورئان بکەو بیچنەوەوەو کۆی کەرەوە، زەید وتی: وەڵڵاهی کەژێ لە کەژەکان بگوازمەوە بەلامەوە سوکترە لەوەی روم لێ بنێن قورئان کۆبکەمەوە، گەرا بەدوای قورئانداو لە پەلی دارخورماو تاشە بەردو سنگی پیاوانو چەرمو تەختەو ئێسقانەکان چنییەوەو کۆی کردەوە، دەڵێ: لای ئەبی حوزەیفەی ئەنصاری دواهەمین سورەتمان کە سوورەتی تەوبەیە دەست کەوتو لای غەیری ئەو نەبوو (لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (التوبة: ١٢٨)، هەتا سورەتەکە تەواو دەبێت، ئەو پەرتووکە قورئانە لای ئەبوبەکر بوو، هەتا کۆچی دوایی کرد، پاشان لای عومەر بوو هەتا کۆچی دوایی کرد، پاشان لای حەفصەی کچی عومەر مایەوە[1].

قۆناغی دووەمی کۆکردنەوەی قورئان لە ئەنجامی هەندێ هۆ هاتە ئاراوە:

أ ـ کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لە ئەنجامی ترسان لە تیاچوونی قورئان بە بۆنەی مەرگی ژمارەیەکی زۆر لە قورئانخوێنەکان لە شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا، ئەمە بەڵگەیە، کە قورئانخوێنو زانایانی ئەودەمە لە پێشی خەڵکەوە بوون بۆ کرداری چاکەو جیهادکردن، بۆ بەرزکردنەوەی قوربی ئیسلامو موسڵمانان بە ڕەفتارو هزرو شمشێرەکانیان ئەوانە باشترینی دەستەی ئوممەت بوون پێویستە شوێن پێشیان هەڵبگرین.

ب ـ کۆکردنەوەی قورئان لەسەر بنەمای (بەرژەوەندی گشتییو بەربڵاو) هاتە گۆڕێ، بەڵگەشمان وتەکەی ئیمامی عومەرە کە وتی بە ئیمامی ئەبوبەکر،وەختێ ئەبوبەکر پرسیاری لێکرد چۆن ئیشێك بکەین، کە پێغەمبەر ﷺ نەیکردبێت، وتی: (ئەمە خێرو

---

[1] البخاري، رقم (٤٩٨٦).

چاکەیە)، لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە ئیمامی عومەر پێی وتووە: (ئەم کارە خێرەو بەرژەوەندیی موسڵمانانی تێدایە)، ئیمامی ئەبوبەکریش هەمان وەڵامی زەیدی کوری سابیتی دایەوە کاتێ هەمان پرسیاری لێکرد، ئەگەر ئەم ڕیوایەتە ڕاست بێت، کە وشەی (بەرژەوەندی) تیایە یان ڕاست نەبێ وەکو یەك وایە، چونکە گوزارشت دانەوە ـ پاساودانەوە بە وشەی (خێرو چاکە) خودی مانای بەرژەوەندیش هەڵدەگرێت لە ڕاستیشدا کۆکردنەوەی قورئان بەرژەوەندیی موسڵمانانی تێدایە، سەرەتای ئەم کارە لەسەر (بەرژەوەندیی گشتییو بەربڵاو) بنەڕەتەکەی دامەزرا، پاشان کۆدەنگی (ئیجماع)ی لەسەر بەسترا دوای ئەوەی هەموو لایەك دانی پیادا ناو بڕیاریان دا بە قسەی ڕاشکاو یان درکاو، ئەم کارەش کاری کۆکردنەوەی قورئانە، بەڵگەیە لەسەر دروستێتی (بەرژەوەندی گشتییو بەربڵاو) وە بکرێتە پەیژەیەك بۆ گەیشتن بە کۆدەنگی، ئەمە بە نیسبەت ئەوانەی دەیکەن بە بەڵگە، هەروەها لە پەڕاوەکانی ئسوڵی فیقهدا بڕیاری لەسەر دراوەو ئاماژەی پێکراوە[1].

ج ـ تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی زەیدی کوڕی سابیت چیبوو، کە ئەم کارە گرنگەی پێ سپێردرا.

ئیمامی ئەبوبەکر زەیدی کوڕی سابیتی هەڵبژارد بۆ ئەم کارە زۆر گرنگە، چونکە ئەم تایبەتمەندییە بنچینەییانەی تیا بەدی دەکرد، بۆ ڕێکخستنی ئەم کارە:

أ ـ ئەودەمە زەید گەنج بوو، تەمەنی (٢١) ساڵ بوو زۆر چالاکبوو، بۆیە ئەم خواستەی لێی داوا کرا.

ب ـ لەبەر ئەوەی زۆر دەرکەوتوبوو بە باشی قورئانی دەرخ کردبوو، یەکێ بوو لەوانەی کە خودای گەورە ئاوەزاێکی ترازی پێ بەخشیبوو ڕێگەی چاکەی بۆ ئاسان کردبوو.

ج ـ لەبەر ئەوەی جێگەی متمانەبوو قەت لە جێگەی تۆمەتو گومانا نەبووە کارەکانی ڕەوا بووەو دەروونی خەڵکی ئۆقرەی گرتبوو بەرامبەری، دڵیان پێی خۆشبوو.

---

[1] الاجتماع في الفقه الاسلام، ـ عبدالسلام السليماني، ص(١٢٧)

د ـ خۆی نووسەری نیگا بوو زانیاری باش‌و لە میژینەی هەبوو لەم بوارەداو بەکردەوە ئەم کارەی مومارەسە کردبووەو نامۆ نەبوو لەم کارەدا، یەکەمجاری نەبوو[1].

هـ ـ لەگەڵ ئەمانەشدا یەکێك بووە لەو چوار کەسەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قورئانیان کۆکردووەتەوە، لە قەتادەوە هاتووە دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئەنەسی کوڕی مالیك، کێ قورئانی کۆکردەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ؟ وتی: چوار کەسبوون، هەرچواریان ئەنصاری بوون، ئوبەی کوڕی کەعب‌و موعازی کوڕی زەیدو زەیدی کوڕی سابیت‌و ئەبو زەید[2]، ئەو شێوازەی کە زەیدی کوڕی سابیت گرتبوویە بەر بۆ کۆکردنەوەی قورئان هیچ ئایەتێکی قورئانی وەرنەگرت هەتا بە نوسراوی نەیدیبێ، لە سەردەم لە بەردەستی پێغەمبەردا ﷺ نەنووسرابێت‌و هاوەڵانیش لەبەریان نەکردبێت، هەرگیز بەلەبەرکراوی وازی نەهێناوە بە نووسراوی نەبێت لە ترسی ئەوەی نەوەکو لە دەرخکردنەکەدا هەڵە یان ئەندێشەی تێکەوتبێ، دوبارە هیچ ئایەتێکی لەکەس وەرنەگرتووە، کە بۆی هێنابێ، هەتا دوو شاهید شایەتییان بۆ نەدابێت، کە ئەم ئایەتە لەبەردەستی پێغەمبەردا ﷺ نووسراوەتەوەو بەو شێوەشە کە هاتووەتە خوارەوە[3]، زەید لەسەر ئەم رێبازە بەردەوامبوو بۆ کۆکردنەوەی قورئان، زۆر سڵی دەکردەوە زۆر وردبوو لە پشکنین‌و تێرامانـدا[4].

**جیاوازی نێوان نووسراوەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ‌و سەردەمی ئەبوبەکر**

جیاوازی نێوان نووسراوەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ‌و نوسراوەکانی سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکر: قورئان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نوسرابووەوە، بەڵام پارچە پارچە بوو، لە کاغەزو تەختەو پەلی دارخورماو قوماش‌و توێکڵ‌و کەرەسەی تر نوسراوە هەموو ئایەتەکانی پێکەوە کۆنەکرابووەوە لەیەك سورەت‌و سیپارەدا، بەڵام کۆکردنەوەکەی سەردەمی ئەبوبەکر لە نووسینەوەی قورئان ئەوەبوو هەموو سورەتێك لە

---

[1] التفوق والنجابة على نهج الصحابة حمد العجمي، ص (٧٣).

[2] سير اعلام النبلاء الامام الذهبي (٢/٤٣١).

[3] التفوق والنجابة على نهج الصحابة، ص(٧٤).

[4] الانشراح ورفع الضيف بسيرة أبي بكر الصديق للصلابي، ص (٢٠٦).

پەڕاوێکدا نوسرایەوەو سورەتەکان ڕێکخرانو ئایەتەکان بە گوێرەی ئەو شێوەیەی لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ لەبەریان کردبوو، ڕێکخستنی هەر سورەتێکیان لە پەڕاوێکدا نووسییەوە، ئەرکی زەیدی کوری سابیتیش ئەوەبوو نووسراوەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لە پەرتوکێکدا بنووسێتەوە، هەر سورەتێ ئایەتەکانی ڕێکبخاتو یەك لەدوای یەك بە جەختلێکراویو چەسپاوی[1].

**٣ـ قۆناغی سێیەم لە کۆکردنەوەی قورئاندا لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا**

یەکەم: هۆکاری کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی ئیمامی عوسمان، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە، کە حوزەیفەی یەمانی هاتە خزمەتی ئیمامی عوسمان لە کاتی فەتحی ئەرمینییەو ئازربیجان کە ئەهلی عێراق کردیان، خوزەیفە زۆر لێوبەباربوو، چونکە خەڵکی جۆراوجۆر قورئانیان دەخوێندەوە، بۆیە حوزەیفە وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەم ئوممەتە خەریکە لە کتابەکەی خودای گەورەدا ناکۆکی تێ دەکەوێت، وەکو ناکۆکییەکەی گاورو جولەکە، ئیمامی عوسمانیش نامەی نارد بۆ لای حەفصەی کچی عومەر کە ئەوپەرتوکە قورئانەی لایەتی بۆمان بنێرێ، هەندێ نوسخەی لەبەر دەگرینەوەو بۆی دەنێرینەوە، حەفصەش ناردی بۆی، ئیمامی عوسمان ئەمری کرد بە زەیدی کوڕی سابیتو عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرو سەعیدی کوری عاصو عەبدوڕڕەحمان کوڕی حاریس کە نوسخەی لەبەر بگرنەوە، ئیمامی عوسمان وتی: بەم تاقمە قورەیشیانە: ئەگەر ئێوە لەگەڵ زەیدی کوڕی سابیت ناتەبابییتان بۆ دروست بوو لە شتێکی ئەم قورئانەدا ئەوکاتە بە زمانی قورەیش بی نووسن، چونکە قورئان بە زمانی ئەوان هاتووەتە خوارەوە سا ئەوانیش وایان کرد هەتا چەند نوسخەیان لەبەری پەرتوکە قورئانەکە گرتەوە، پاشان عوسمان پەرتوکەکەی گەڕاندەوە بۆ حەفسە، پاشان بۆ هەر قۆڵێ نوسخەیەك لەو پەرتوکەی رەوانە کردو فەرمانی کرد هەر پەڕاوو پەرتوکێکی تر کە قورئانی تیا نوسراوە بیسوتێننو ئەم قورئانە لای خۆیان بیهێڵنەوە[2].

لەم گفتوگۆ راستو دروستە حوزەیفەو ئیمامی عوسمان ئەم خاڵانە وەردەگرین:

---

[1] المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدي (٢/٢٤١).

[2] البخاري، كتاب فضائل القران رقم (٤٩٨٧).

أ ـ ئەو هۆکارەی کە عوسمانی هەڵنا قورئان کۆبکاتەوە هەرچەند بەڕێکوپێکی کۆکرابووەوە لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا، بریتی بوو لە جیاوازیو ناکۆکی خوێندنەوەی قورئان لە لایەن موسڵمانە خوێنەوارەکان تەنانەت ناکۆکی لە خوێندنەوەیدا نزیك بوو سەر بکێشێت بۆ مەترسیدارترین ئاژاوەو دووبەرەکی لە کیتابەکەی خودای گەورەدا، کە بناغەی شەریعەتەو کۆڵەکەی دینەو بنەڕەتی تەلاری ئوممەتە بۆ سیاسەتو ڕەوشتو کۆمەڵایەتی، هەتا وای لێهاتبوو هەندێ لە قورئانخوێنەکان دەیان وت بەواتی تر: خوێندنەوەکەی من لە خوێندنەوەکەی تۆ باشترە، بۆیە حوزەیفە دڵەخورپە دای گرتو بە هەڵەداوان هات بۆلای خەلیفەو پێشەوای موسڵمانانو داوای لێکرد فریای ئوممەت بکەوێت بەرلەوەی تووشی ناکۆکیو دووبەرەکی بێنو بە شەڕبێنو کار لەکار بترازێو فیتنەی بۆ هەڵگیرسێو دەسکاری دەقی قورئانەکە بکرێتو ئایەتو وشەکانی لە ڕێگەو جێگەی خۆی، لابدرێت، وەکو لە نێو گاورو جولەکەکان روویداو هەرگەلێ لەوی تر جودا بوویەوە کتابی بۆ خۆی دارِشت.

ب ـ ئەم گفتوگۆ راستو دروستە گومان برِە کە قورئانی پیرۆزی لەیەك پەرتووکدا کۆکردەوەو بەیەك نەبرِدا هۆندییەوە لەسەر یەك شێوەزار ڕێکیخست، هەموو ئوممەتی ئیسلام بە چاکی ڕێککەوتوون لەسەری قبوڵیان کردووە، ئەو نووسراوەی لەم پەرتووکەدایە خودی ئەو قورئانەیە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستراوەو وەرگیراوە وەکو ئەو قورئانە وایە کە دەستپاکی نیگاهێنەر (جوبرەئیل) هێناویەتی، ئەم پەرتوکە قورئانەش لە ژێر چاودێری خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری صدیقدا کۆکراوەتەوەو نوسراوە، پاشان داویەتی بە دەستی عومەری کوڕی خەتاب دوای خۆی، کاتێ عومەر ئاکامی نزیکبوویەوەو دەسەڵاتی خەلافەتیشی نەدابووە دەست کەسێکی دیاریکراو، بەڵکو کارەکەی کرد بە راوێژکردن دەستەیەك هاوەڵی هەڵبژارد، کە پێغەمبەر ﷺ لێیان رازی بوو، وەسیەتی کرد ئەم پەرتوکە قورئانە بدەنە دەستی حەفصەی دایکی ئیمانداران، ئیمامی عوسمانیش لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئاندا سەرنجی خستبووە سەر ئەم پەرتووکەو پەرتووکی رەسمییو سەرتاسەری لێ گرتەوەو فەرمانی کرد بە چوار قورئان خوێنی ناودار، کە بە وردی قورئانیان لەبەربو بە باشی پیتەکانیان دەردەبڕیو بە جوانی

دەیانخوێندەوە لە شیکردنەوەو زاراوەکەی تێگەیشتبوون، سیانیان قورەیشیو یەکیان ئەنصاری بوو، ئەویش زەیدی کوڕی سابیت بوو کە خاوەنی کۆکردنەوەی یەکەمە لە سەردەمی ئەبوبەکردا بە ئاشێرەی ئیمامی عومەر قورئان بکەن بەیەك شێوەزار، لە هەندێ ریوایەتدا ئەو کەسانەی کە ئیمامی عوسمان فەرمانی پێکردن، ئەم قورئانە بنووسنەوە دوانزە پیاو بوون ئوبەی کوڕی کەعبو ئەوانی تر قورەیشو ئەنصاری بوون[1].

ج - دەرەنجامەکەی ئەمەیە: فتوحات لەسەردەمی ئیمامی عوسماندا بە مۆڵەت وەرگرتن بووەو فەرمانی لەسەردراوە، بڕیاری سەربازی لە مەدینەوە دەرچووەو هەموو لایەنەکانی ئیسلام گوێ لە مشتی فەرمانی خەلیفە بوون ئەمەش بەڵگە لەسەر کۆدەنگی هەموو هاوەڵانو شوێنکەوتوان لە هەموو هەرێمەکاندا کە خەلافەتی ئیمامی عوسمان تەواوەو بێخەوشەوە، بە پەلە هاتنی حوزەیفەی یەمانی بۆ مەدینە بۆ نەهێشتنو قەلاچۆکردنی ناکۆکی خەڵکی لە خوێندنەوەی قورئاندا، هەروەها بەڵگەشە کە بابەتە شەرعییە گەورەکان راوێژی خەلیفەی بۆ دەکرا لە مەدینە، شاری مەدینە بەردەوام هێلانەی سوننەتو مۆڵگەی هاوەڵە شەرعزانەکان بووە[2].

**دووەم: راوێژکردن بەهاوەڵان بۆ کۆکردنەوەی قورئان**

ئیمامی عوسمان موهاجیرینو ئەنصاری کۆکردەوەو راوێژی پێکردنو چەندین چاوساغی ئوممەتو پێشەوای بلیمەتو هاوەڵی بەماریفەتی گاز کرد، وە لە سەروی هەمووشیانەوە عەلی کوڕی ئەبی تالیبو ئیمامی عوسمان ئەم پرۆژەی خستە بەرچاوی هەڵبژێردراوانی ئوممەتو سەرداره رێنیشاندراوە رێ نیشاندەرەکانو لەم کارە بکۆڵنەوەو تاوتوێی بکەن، شرۆڤەیان کردو لەگەڵ یەکتر پەیڤین بۆ ئەوەی بۆچوونی یەکتر بزاننو بە گەرمی هاتن بە پیر بۆچوونەکەی ئیمامی عوسمانەوە بە ئاستەم درزێ نەبوو گومان بچێتە دڵی ئیماندارانەوە، لەم پرۆژەیەدا لە هەر چوار قورنەی زەویدا بەستنی ئیجماعی هاوەڵان ئاشکرا کرا بۆ خەڵکی، بەهیچ کلۆجێ لەو رۆژەدا کەسێ دەرنەکەوت پێچەوانەو

---

[1] عثمان بن عفان صادق عرجون، ص (١٧١).

[2] المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدى (٢/٢٤٤).

دژی ئەم کارە بێت تاقە کەسێ نییە نەیاری کردبێت، چونکە قورئان لە تاکەکانی ئوممەت شاراوە نییە، چ جای ئەوەی لە زاناو پێشەوای هەڵکەوتووی ئوممەت[1]، ئیمامی عوسمان لە کۆکردنەوەی قورئاندا شتێکی تازەی دانەهێناوە، بەڵکو بەر لە ئەم ئەبوبەکر ئەمەی کردبوو، وە بە بۆچوونی دەروونی خۆی نەیکرد بە راوێژی هاوەڵان کردیو ڕەزامەندییان دەربڕیو وتیان بۆچوونەکەت زۆرباشە، دووبارە وتیان زۆر جوانە، واتە: کۆکردنەوەی قورئان لە چەند نوسخەیەکدا بە یەك زار[2]، موصعەبی کوڕی سەعد گەشت بە هەندێ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئیمامی عوسمان فەرمانی کرد پەرتوکەکانی تر بسوتێنن، دەبینێ ئەم کارەیان بەلاوە سەیرەو واقیان وڕماوە[3]، ئیمامی عەلیش نەهی کرد لەوانەی رەخنەیان دەگرتو گلەییان دەکرد، وتی: (ئەی خەڵکینە بێز مەکەن لە عوسمانو قسەی چاك نەبێت هیچی تر مەڵێن وەڵلاهی ئەم کارەی لە خۆیەوە نەکردووە کۆمەڵێ زانای شارەزای لە ئێمە کۆکردەوەو ئینجا ئەم کارەی کرد، وەڵلاهی منیش ببمە خەلیفە ئەوکارەی ئەو دەکەم[4]، دوای گردبوونەوەی ئەم کۆمەڵە بەڕێزە کە باشترین مرۆڤی ئومەتەن لەسەر یەك قورئانی و یەك زاری پیرۆز کارەکە ڕۆشن بوویەوە بۆ گشت لایەك تەنیا بۆ هەوەسباز نەبێت، وە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك رازی بێت بەم ئیشەی کە ئیمامی عوسمان ئەفراندیو قورئانی پێ پارێزرا[5].

قورتوبی لە کتێبی تەفسیرەکەیدا دەڵێ: ئیمامی عوسمان ئەم کارەی کرد (قورئانی لەبەر قورئانەکەی حەفصە گرتەوەو بەیەك شێوەو بەیەك نوسخە بەهەرچوارلادا بڵاویکردەوەو نووسینەکانی تری سوتان)، دوای ئەوەی کە موهاجیرینو ئەنصارو کەڵەپیاوانی ئیسلامی کۆکردەوەو راوێژی پێکردن، ئەوانیش ڕێککەوتن لەسەر ئەم خوێندنە ناسراوە باوەی ئێستا، کە بە راستیو سابیتی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوەو

---

[1] عثمان بن عفان صادق عرجون، ص (١٧٥).

[2] فتنة مقتل عثمان بن عفان (٧٨/١).

[3] التأريخ الصغير للبخاري (٩٤/١)، اسناده حسن لغيره.

[4] فتح الباري (١٨/٩)، اسناده صحيح.

[5] فتنة مقتل عثمان بن عفان (٧٨/١).

بیستراوە، غەیری ئەم شێوازەیان خستە لاوە، هەموویان بۆچوونەکەی عوسمانیان بە ڕاست زانی، چونکە بۆچونێکی فزەبڕو هاوجوتی ئیسلام بوو[1].

**جیاوازی نێوان کۆکردنەوەی ئەبوبەکرو کۆکردنەوەی عوسمان**

ئیبنو تین دەڵێ: (جیاوازی نێوان کۆکردنەوەی ئەبوبەکرو کۆکردنەوەی عوسمان ئەوەبوو، کۆکردنەوەی ئەبوبەکر ئەوەبوو دەترسا شتێ لە قورئان نەمێنێ بە هۆی تەمانی هەڵگرەکانییەوە، چونکە ئەوکاتە لە یەك شوێنو پەڕاودا کۆنەکرابووەوە هەستا لە چەند پەڕاوێکی ڕێکوپێکدا ئایەتی سورەتەکانی کۆکردەوەو بەوپێیەی کە لە پێغەمبەر ﷺ وەریگرتبوو، بەڵام کۆکردنەوەی ئیمامی عوسمان لەبەر ئەوەبوو ناکۆکی دروست بووبوو لە خوێندنەوەی قورئانداو هەرکەس بە جۆرێ دەیخوێندەوەو هەتا هەرکەس بەو شێوەزاری خۆی دەیخوێندەوە، زارەکانیش چەند زۆرن ئەمە وای کردبوو هەندێ دەیوت بە هەندێکی تر خوێندنەوەکەی تۆ هەڵەیە، بۆیە ترسا کار لەکار بترازێ، نوسخەی گرتەوە لەو پەرتوکە قورئانەو کردی بە یەك جۆر قورئانو سورەتەکانی ڕێکخستو هەموو زارەکانی خستە لاوەو بە قورسی هاتە سەرشێوەزاری قورەیش بە بیانووی ئەوەی قورئان بەم زاراوە دابەزیوە هەرچەند لە سەرەتای دابەزینی قورئاندا خوێندنەوەی قورئان فراوان بوو بە زارەکانی تر دەخوێنرایەوە، بۆ ئەوەی گازندەو ئەستەمی دروست نەبێت، عوسمان زانی ئەو پێویستییەش نەماوە قورئانی خستە سەر یەك شێوەزارو قەتیسی کرد، قازی ئەبوبەکری باقلانی دەڵێ: ئیمامی عوسمان نەیویست خودی ئەم قورئانە لە نێوان دووبەرگدا کۆیکاتەوە، بەڵکو ویستی خودی ئەم قورئانە لە سەر شێوازی خوێندنەوەو زاراوە سابتەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆیکاتەوە، هەرچی ترە هەڵوەشێنێتەوەو بچنە سەر پەرتوکە قورئانێك کە پێشخستنو دواخستنی ئایەتی تیا نەبێتو چەمكو ماناکەی وەکو ڕۆژی دابەزینی بمێنێتەوە نووسینی ئایەتەکانی نەشێوێنرێت هەستا بە پیت و دەنگو شێوەزاری قورەیشی وێنەی گرتو بە ئایەت جێگیری کردو خوێندنەوەو لەبەرکردنی فەرز کرد، ترسی ئەوەی گەندەڵیو سۆی تێنەکەنەوێت دوای خۆی.

حارسی موحاسبی دەڵێ: لای خەڵکی وا باوە کە ئیمامی عوسمان کۆکەرەوەی قورئانە، بەڵام وانییە، بەڵکو عوسمان خەڵکی خستە سەر یەك شێواز خوێندنەوە لەسەر

---

[1] الجامع الأحكام القران (١/٨٨).

بۆچوونی خۆی و سەرجەم موهاجیرین و ئەنصارەکان هەستان کۆبوونەوەو راوێژیان کرد لە ترسی ئاژاوەو فەرتەنەی ئەهلی عێراق و ئەهلی شام کاتێ ناکۆکی کەوتە نێوانیان لەسەر پیتەکانی خوێندنەوەی قورئان، بەڵام پێش ئەم مشتومڕە قورئان بە ڕێنووس و خوێندنەوە جیاوازەکان دەخوێنرایەوەو بەو حەوت جۆرە خوێندنەوە ئازادەی کە قورئانی پێ هاتە خوارەوە دەوترایەوە، پاشان ئەو کەسەی کۆی کردەوەو دەرزەنی کردو ڕشتەی بۆ کرد ئەبوبەکری صدیق بوو، پاشان ئیمامی عوسمان، ئیمامی عەلی دەڵێت: (ئەگەر منیش ببمە خەلیفە ئەوکارەی کە عوسمان کردی بە پەرتوکە قورئانەکان منیش دەمکرد)، واتە هەمووی لەسەریەك شێواز دەچەسپاند[1].

قورتبی دەڵێت: ئەگەر بوترێ بۆ ئیمامی عوسمان خەڵکی کۆکردووەتەوەو ریزیکردن لەسەر یەك پەرتوك و یەك شێواز خوێندنەوە؟ خۆپێشتر ئەبوبەکر ئەمەی کردووەو لەم کارە بووەتەوە؟ پێی دوترێ عوسمان نەی ویستووە بەو کارە خەڵکی کۆ بکاتەوە لە هۆنینەوەی یەك پەرتوکی قورئان، بەڵکو ئەنێرێ بە دوای پەرتوکەکەی حەفصەداو دەڵێ ئەوپەرتوکەمان بۆ بنێرە با برێ نوسخەی لەبەر بگرینەوەو دەیگەڕێنینەوە بۆت؟ عوسمان ئەم کارەی لەبەر ئەوە کرد خەڵکی ناکۆکی کەوتبوە نێوانیان لە شێوەی خوێندنەوەی قورئاندا بەهۆی پرش و بڵاوی زانایان و هاوەڵان بە شارەکاندا ئەم ناکۆکییەش تاوی سەندبوو جیایی و شوبهە هەڵزنابوو، لە نێوان ئەهلی عێراق و ئەهلی شامدا ئەو رووداوە روویدا کە حوزەیفە گێڕایەوە[2].

## سێیەم: ئایا پەرتوکە قورئانەکەی عوسمان لەسەر هەر حەوت پیتەکە بوو هەموویانی دەگرتەوە؟

شێخی لیکۆڵەر (صادقی عرجون رای وایە کە پەرتوکەکەی صدیق لە بنەڕەتدا کراوەتە پەرتوکی پێشەنگ و ئەسڵی و ئیجماعی موسڵمانانی لەسەر بەستراوە، حەوت پیتەکەی گرتووەتە خۆی کە لە فەرمودەی صەحیحدا هاتووە ئاشکرایە قورئان بەو حەوت پیتە دابەزیوە، بەڵام لەسەریەك پیت نوسراوەتەوە ئەو پیتەشیان هەڵبژاردوە کە

---

[1] عثمان بن عفان، صادق عرجون، ص (١٧٨).

[2] الجامع لأحكام القران (١/٨٧).

عامەی پاشین (خەلەف) دەیانخوێندەوەو دەیانوتەوە پێغەمبەریش ﷺ لە کۆتایی ژیانیدا ئۆقرەی لەسەر گرتبوو، ئەم حەوت پیتەی کە قورئانی پێدەخوێنرێ، یەکەم بۆ ئاسانکاری ئوممەت پەیدا بوو، پاشان حوکمەکەی هەڵگیرا کاتی قورئان بڵاوەی کردو خەڵکی هەمە جۆر هاتن بە ناو یەکداو هەر یەکێ بە زارێ قسەی دەکرد، ئیتر کاری پێنەکرا.

ئیمامی تەحاوی دەڵێ: (خوێندنەوەی قورئان بە حەوت پیتی جیاواز دەست شل کردن بوو بۆ خەڵکی لە پیتەکاندا، چونکە نەیان دەتوانی لە قورئان تێبگەن بە شێوەزاری خۆیان نەبوایە لەبەر ئەوەی نەخوێنەواربوونو کەمێکیان نەبێ سەوادیان نەبوو، کاتێ سەیرکەن بۆ خاوەن زارەکانی تر سەختە قورئانەکە بگۆڕی بۆ زارەکەی خۆی ئەگەر ئەمەش ڕەوا بوایە، چونکە نەیدەتوانی سازی کات بە نارەحەتییەکی دژواتر نەبوایە، بۆیە وەلا نرا دەربڕینی قورئان بە گوتنی جیا جیا بۆ فراوانخوازی هاتە ئاراوە بە مەرجێ ماناو مەبەستەکەی تێك نەچێت، وە بەمجۆرە مایەوە هەتا زۆربەی زۆریان نوسییانەوە بە زاری خۆیان، بەڵام هەموو زارەکانیان گێڕایەوە بۆ زارو زمانی پێغەمبەر ﷺ بەم گەزە پێوایان بۆ ئەوەی دەربڕینو ئاخاوتنەکەی پارێزراو بێت ئیتر دەرفەتیان نەما پێچەوانەی ئەم شێوە زارە بیخوێننەوە، ئیبنو عەبدول بیڕ دەڵێ: (ماوەیەك بە حەوت پیت دەخوێنرایەوە (بە زاری جیاواز جیاواز) ئەمە بۆ کاتێکی تایبەتو زەرورەتێك بوو وای دەخواست، پاشان ئەم زەرورەتە هەڵگیراو حوکمی ئەم حەوت پیتەش هەڵگیراو قورئان گەڕایەوە سەریەك پیتو بە یەك زار دەخوێنرایەوە[1]، تەبەری دەڵێت: (خوێندنەوەی قورئان لەسەر حەوت پیتی جیاواز واجب نەکراوە، لەسەر ئوممەت بەڵکو مۆڵەتەو روخستە بۆیان، کاتێ هاوەڵان بینییان ئوممەت وا خەریکە دووبەرەکیو ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانو لەسەریەك پیتو یەکجۆر خوێندنەوە ڕێکناکەون هەستان کۆدەنگییان بەستوو یەکدەنگیو کۆڕاییان گرێدا لەسەر یەك شێوازی قورئان، بێگومان کۆدەنگی ئەمانەش بە هیچ شێوەیەك گومڕایی تیا نییە[2]، ئەم پیتەی کە قورئانی پێ

---

[1] عثمان بن عفان، صادق عرجون، ص (١٨٠).

[2] المصدر نفسه.

نوسرا کۆدەنگی گومان بڕی لەسەر کراوە هەموو قورئانەکانی تر لەمەوە نقلّ کراوە، هەر حەوت جۆرە خوێندنەوەکەی کۆکردووەتەوە لە یەکجۆرداو جۆرەکەشی ئەمەیە، کە دەیناسین‌و دەیخوێنینەوەو بە دەماو دەم نقلّ کراوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەرچەند ئەو خوێندنەوانەی، کە لە فەرمودەدا هاتووە ئەم جۆرە خوێندنەوەیە نییەو بەم پیتانە نەنوسراوە)[1].

قورتوبی دەڵێت: (زۆربەی زاناکانمان وەکو داودی‌و ئیبن‌و ئەبی صوفرەو جگە لەمانەش دەڵێن ئەو حەوت جۆرە خوێندنەوەیەی کە دەدرێتە پاڵی حەوت قورئان خوێنەکە ئەو حەوت جۆرە خوێندنەوەیە نییە کە هاوەڵان روخسەتیان پێدراوە، بە راستی قورئان گەرێنرایەوە سەر یەك پیت لەو حەوت پیتەو پیتەکەش ئەوەیە کە قورئانی لەسەر کۆکرایەوە[2]، نزیکترین بۆچوون لە چەمکی ئێمەوە ـ بە بڕوای خۆمان ـ لە مانای پیتەکاندا ئەو بۆچوونەیە کە دەڵێ: (ئەم پیتانە پاراوترین‌و ناسراوترین زاری عەرەبن، کە قورئانی پێ نەخشێنراوە، قاسمی کوڕی سەلام‌و ئیبن‌و عەتیەو کۆمەڵێ لەکەڵە پیاوان رایان وایە)[3].

**چوارەم: ژمارەی ئەو پەرتوکە قورئانانەی کە ئیمامی عوسمان ناردی بۆ شارەکانی**

کاتی ئیمامی عوسمان لە کۆکردنەوەو لەبەر گرتنەوەی پەرتوکە قورئانەکان بویەوە بۆ هەر ئاسۆیەك قورئانێکی رەوانەکردو فەرمانی پێکردن هەر قورئانێ پێچەوانەی ئەم نێردراوەیە بە جۆرێکی تر نووسراوە بیسوتێنن، جیاوازی هەیە لە ژمارەی ئەو قورئانانەی کە پەخشی کردووەو بەسەر شارەکاندا دەڵێن چواردانەبوو زۆربەی زانایان لەسەر ئەم ژمارەیە کۆڕان، دەڵێن پێنج دانەبووە، دەڵێن شەش دانەبووە، دەڵێن حەوت دانە بووە، دەشڵێن هەشت دانەبووە، ئەوەی کە دەڵێ چوار دانەبووە، قورئانێکی لە مەدینە هێشتووەتەوەو قورئانێکی ناردووە بۆ شام‌و یەکێکی بۆ کوفەو یەکێکی تریش بۆ بەصرە، ئەوەش دەڵێ پێنج دانەبووە، ئەو چوارەو یەکێکی بۆ خۆی داناوە بە تایبەت،

---

[1] المصدر نفسه.

[2] الجامع الأحكام القران (١/٧٩).

[3] الاتفاق للسيوطي (١/١٤٤ ـ ١٤٨).

بۆ شەش دانەکە ئیختیلاف هەیە دەڵێن یەکێکی ناردووە بۆ بەحرەین، بۆ هەشتەکەش دەڵێن ئەو قورئانە بووە، کە خۆی دەیخوێندەوەو وەختێ شەهید کرا لەبەردەستیابوو[1]، لەگەڵ هەموو قورئانێکدا ڕێبەرێکی دەنارد بۆ ئەوەی خەڵکی شارەزای خوێندنەوەی بکاتو بە گوێرەی ئەو وێنە پیتانە بی خوێنێتەوە، کە هەڵای واردووە پەسەندی کردووە، بەپێی فەرمودەی سەحیحو متەواتەر، عەبدوڵڵای کوڕی سائیبی کردە هامڕای قورئانەکەی مەککە، موغەیرەی کوڕی شەهابی کردە هامڕای قورئانەکەی شامو ئەبو عەبدوڕڕەحمانی سەلەمی کردە هامڕای قورئانەکەی کوفەو عامری کوڕی قەیسی کردە هامڕای قورئانەکەی بەصرەو فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیت بۆ مەدینەی بخوێنێتەوە[2].

**پێنجەم: دژە هەڵوێستی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بەرامبەر قورئانەکەی عوسمان**

نەسەلماوە گوایە ئیبنو مەسعود لەم کارەدا پێچەوانەو دژایەتی عوسمانی کردووە، هەرچییەك لەم بارەیەوە ڕیوایەت کراوە سەنەدەکانی پەڕپوتە ئەو ریوایەتانەش بەڕپوتە، کە ئەم باسەی ترنجانووەتە خۆی.

سەلماوە کە ئیبنو مەسعود گەڕاوەتەوە سەر ڕێککەوتنی هاوەڵان لە کۆکردنەوەی قورئانداو لاری نەبووە، بەو ئیجماعە تەنانەت هەستاوە لە ناو خەڵکدا مزگێنی ئەم کارەی داوەو فەرمانی پێکردوون بگەڕێنەوە سەر ئیجماعی موسڵمانان[3]، وتویەتی خودای گەورە هەرگیز زانست هەڵناپروکێنی لە دەستمان، وە هەرگیز خودای گەورە ئوممەتی موحەممەد ﷺ لەسەر گومڕایی کۆناکاتەوە، ئێوەش وەرنە سەر ئەو کارەی کە ئەوان کۆبوونەوە لەسەری، حەق ئەوەیە ئەوان لەسەری بوون، وە ئەم قسانەشی نووسیی بۆ ئیمامی عوسمان[4].

---

[1] أضواء البيان في تأريخ القران، ص (٧٧).

[2] المصدر نفسه (٧٨).

[3] فتنة مقتل عثمان بن عفان (٧٨/١).

[4] فتنة مقتل عثمان بن عفان (٧٩/١).

ئیبنو کەسیر هێناویەتی کە ئیبنو مەسعود گەڕاوەتەوە بۆ هەماهەنگی ئەوان[1]، ئیمامی زەهەبیش جەختی لەسەر ئەم گەڕانەوە کردووەتەوەو دەڵێ: (واریدبووە کە ئیبنو مەسعود بەم کارە رازی بووەو شوێنی عوسمان کەوتووە سوپاس بۆ خوا[2]، چیتر ئاوڕ مەدەنەوە بۆ ئەو نوسراوەی تەها حسێن، کە نووسیویەتی لە باسی مەسەلەی نووسینەوەی قورئانو پەیوەندی عوسمان لەگەڵ ئیبنو مەسعوددا کە بە شێوازێکی ژەهراویی دایرشتووەو چەندین ئەتواری تیایە لە رۆژهەڵاتناسەکانی مامۆستای وەریگرتووە[3]، ئەوانەنیش پێیان لەسەر ریوایەتە پەڕپوتەکانو رافزەیەکان داگرتووە لە شێواندنو ئاڵۆسکاندنی پەیوەندیی نێوان هاوەڵان (رەزای خودا لەهەر هەموویان)[4]، ئیبنو مەسعود ئەو ئیبنو مەسعودەیە، کە نوێژی قەصری لە مونا واز لێهێنا لە ترسی ئەوەی ئاژاوەو دووبەرەکی نەکەوێتەوە بە پێچەوانەوە شوێنپێی خەلیفەی هەڵگرت، ئایا چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێ بچێتە سەر مینبەرو خەڵکی هانبدات بۆ دووربەرەکیو ناکۆکی، لەهەمان کاتدا خۆی وتویەتی (دووبەرەکیو ناکۆکی شەڕە)[5]، مێژوونووسە رافزییەکان کۆمەڵێ ریوایەتیان هەڵبەستووەو داویانەتە پاڵ ئیبنو مەسعود، کە گوایە هەڵوەستەی کردووە بەرامبەر عوسمان دژایەتی کردووە، لەو درۆو دەلەسانەدا وا دەردەکەوێت هاوەڵان گرۆیەکی کینەبازو ناتەباو شڕەت بوون، پاشقولیان لەیەکداوەو زمانیان شڕبووە لە قسەکردندان ئەم ریوایەتانە قێزەونن لەبەردەم رەخنەی بابەتیو هێوردا خۆیان ناگرنو زەوقی ئیماندارو ئاوەزوی پێگەیشتوو رەفزی دەکاتەوە، رافزییەکان گومانی درۆو شایەتی دەلەسەیان دروست کردووە، کە ئیبنو مەسعود تەشەری لە عوسمان داوەو بە کافری زانیوە، عوسمانیش بڕیاری داوە ئەوەندەی لێی بدرێ هەتا دەمرێ، ئەمە درۆیەکی شاخدارە لەسەر ئیبنو مەسعود، زانایانی نەقڵ دەزانن

---

1 البداية والنهاية (٢٢٨/٧).

2 سير اعلام النبلاء (٣٤٩/١).

3 الفتنة الكبرى (١٥٩/١).

4 فتنة مقتل عثمان بن عفان (٨٠/١).

5 عبدالل بن مسعود، عبدالستار الشيخ، ص (٣٥٥).

ئیبنو مەسعود قەت عوسمانی تەکفیر نەکردووە، بەڵکو پاش ئەوەی بەیعەتی خەلافەتی دا بە عوسمان عەبدوڵلای کوڕی مەسعود لە مەدینەوە چوو بۆ کوفە کاتێ کە گەشتە ئەوێ سوپاس‌و ستایشی خودای گەورەی کردو پاشان وتی: ئەمیری ئیمانداران عومەری کوڕی خەتتاب کۆچی دوایی کرد لەناومان هیچ ڕۆژێکم نەدیوە ئەوەندەی ئەو ڕۆژە لوشکەی گریان هاتبێ، ئێمەی هاوەڵانی موحەممەد ﷺ پاش سپاردنی ئیمامی عومەر.

کۆبووینەوە سەرمان نەلەقاندو دەستمان نەدا لە سنگمان بۆ باشترین کەسمان نەبێت کە بتوانێت ئەم ڕێگەیە بە باشی ببڕێ‌و گت نەکات، هەر بۆیە بەیعەتماندا بە ئەمیری ئیمانداران عوسمان‌و ئەویش پەیمانی پێدایین)[1].

ئەم لێدوانە ڕۆشنە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر پلەوپایە بڵندی ئیمامی عوسمان لە دڵی ئیبنو مەسعوددو سەرجەم هاوەڵاندا ئەو هاوەڵانەی کە خودای گەورە تاریفیان دەکات‌و لێیان رازییە، زۆرچاك تێگەیشتبوون لە مانای (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً)، وتەکانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ڕاست‌و ڕەوان بوو حەقیقەتی لێڵ نەبوو سەیرەکەین چەند لە قەناعەتەوە هەڵقوڵابو لە هەستی خاوێنی دەرهاتبوو، نە لە ترسا نە لە زەلیلیدا نەی وتبوو، بەهەرەمەکی قسەی فڕێ نەدابوو بۆ فریودان‌و گۆڵمەز نەبوو یاخود بۆ ئەوە نەبوو پلەو پایەیەکی چنگ کەوێ لەم خەلافەتە تازەدا، ئەوە شتێکی بەڵگە نەویست‌و روونە، کە قینێك‌و کینەیەك لە دڵی هیچکامیاندا نەبووە، بەرامبەر بە ئەوی تر، گەر شتێکیش ڕویدابێت لە پێناوی هەق‌و بەرژەوەندیی موسڵماناندا بووە[2]، بە پەیژەی چەمکی ئامۆژگارییدا گوزەری کردووەو بە ئامۆژگاریی ڕەعیەت حساب کراوە، بەڵام ئەو تۆمەتانەی رافزییەکان‌و ئەڵقەلەگوێکانیان هەڵیدەبەستن کە ئیمامی عوسمان داویەتی لە ئیبنو مەسعود هەتا مردووە، ئەمە درۆیە بە یەکدەنگی هەموو ئەهلی عیلم.

---

[1] طبقات ابن سعد (٣/٦٣).

[2] عبدالله بن مسعود، ص (٣٢٤).

ئەبوبەکری کوڕی ئەلعەرەبی دەڵێت: (لێدانکردنی ئیبن‌و مەسعودو بەخشیش لێگرتنەوەی قسەیەکی ناماقوڵەو شایەتی درۆیە[1]، رافزییەکان بۆیان نییە بە چیرۆکی ئیبن‌و مەسعود تانەو تەشەر بدەن لە عوسمان، چونکە نە لێی داوەو نە گرانی خستووەتە سەری، بە پێچەوانەوە ڕێزی لێ دەگرت‌و لە شوێنی مەزنی خۆی دایدەنا هەروەها ئیبن‌و مەسعود زۆر توندوتۆڵ بوو بۆ گوێڕایەڵی ئەو ئیمامەی کە بەیعەتی پێدابوو، قەناعەت‌و بڕواشی وابوو کە باشترین کەسە لەناو موسڵماناندا، بۆیە بەیعەتی پێدا[2].

حەوتەم: تێگەیشتنی هاوەڵان لە ئایەتەکانی قەدەغەکردنی دوبەرەکی‌و ناکۆکی.

خودای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) (الأنعام: ١٥٣)، سیراتی موستەقیم واتە قورئان‌و ئیسلام‌و فرچك ئەو فرچکەی خودای گەورە ئادەمیزادی لەسەر ئەفراندووە، ڕێچکە واتە هەوەسبازی‌و بیدعەو کوتلەگەری‌و زیادەڕۆیی، موجاهید دەڵێ: (وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ) واتە بیدعەو گۆترەو گومان‌و گومڕایی[3]، خودای گەورە نەهی کردووە لەم ئوممەتە کە وەکو گەلانی پێشوو بکەونە داوی دووبەرەکی‌و ناکۆکی‌و تیرەگەری سەرەڕای ئەوەی بەڵگەی ڕۆشنمان بۆ هاتووەو کیتابمان لە لایەن خوداوە بۆ دابەزیوە، خودای گەورە دەفەرموێ: (وَلاَ تَكُونُواْ كَالَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَاخْتَلَفُواْ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُوْلَـئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (آل عمران: ١٠٥)، هەروەها نەهی کردووە لە ئوممەت وەکو موشریکین بن ئەوانەی ئایینیان گۆڕی پەلپەلیان کرد، خودای گەورە دەفەموێ (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ* مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ* مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ) (الروم: ٣٠ ـ ٣٢).

---

[1] العواصم من القواصم، ص (٦٣).

[2] عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام (١٠٦٦/٣).

[3] تفسير معاهد، ص (٢٢٧).

پێغەمبەر ﷺ رایگەیاندووە کە دوورەپەرێز بن لەوانەی دینیان ئاڵوگۆڕ کردووەو بوونەتە گرۆو حیزبی جیاواز[1]، خودای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعاً لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ) (الأنعام: ١٥٩).

لە میانەی چیرۆکی کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی عوسماندا مەدای تێگەیشتنی هاوەڵان لەمەڕ ئایەتەکانی نەهیکردن لە دووبەرەکیو گەڕەلاوژە دەردەکەوێت، کە جوانی خۆیان پاراستووەو سڵیان کردووەتەوە لە گەڕەلاوژەو چەمکی خۆیان قوڵ کردبوو، لەمبارەیەوە ئەم ئایەتانەیان پیادەدەکرد بە کردەوە، کاتێ حوزەیفە سەروبەندی گەڕەلاوژەو ناکۆکی بەرگوێ کەوت لە خوێندنەوەی قورئاندا کتوپڕ خۆی گەیاندە شاری مەدینەو هەواڵیدا بە ئیمامی عوسمان چی بینیوەو چی بیستووە، عوسمان دەستبەجێ هەستا بە دەمیەوەو وتارێکی دا بۆ خەڵکیو ئاگاداری کردنەوە لە دوومانی ئەم گەڕەلاوژەیەو راوێژی کرد بە هاوەڵان، کە چارەسەرێك دانێن بۆ ئەم مەینەتەی سەری هەڵداوە، ئیمامی عوسمان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا کارەکەی بخات بە بارێکداو دەرگای ئەو گەڕەلاوژەیە داخست، کە خەریکبوو هەڵگیرسێ، ئیمامی عوسمان یەکەمجار هەستا بە کۆکردنەوەی هەموو قورئانە نووسراوەکانو سەرلەنوێ لە دووتوێی یەك قورئاندا نووسییەوە بە گوێرەی لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکان پەرتوکە قورئانەکەی ئەبوبەکر بەمشێوەیە دەرگای ناکۆکی داخست.

بە داخستنی دەرگای ئاژاوەو دووبەرەکی موسڵمانان زۆر شادومان بوون، هەرچەند مونافیقەکان پیشیان دەخواردو مزگێنییان دەدا بە دەرکەوتنی سەروبەندی گەڕەلاوژەو شپرزەیی زۆر دەمێك بوو چاوەڕێیان دەکردو بۆی دەکۆشان، کاتێ گەڕەلاوژە وخراپە بە باری خێرا هەڵقاوێزکراو درزێ نەما بۆ مونافیقەکان چاوی پیا بگێڕنو کنەی تیا بکەن، بۆیە زیاتر کینەیان هەڵگرت لە ئیمامی عوسمانو شانیان کرد بە پڕوپاگەندە کردن لەسەریو کارە باشەکانیان بە خراپ لە قەڵەم دەداو بۆ سەپاندنی ئەم کارەشیان تەنافێکی کاکڵەموشەییان تەند لە ئیمامی عوسمان، بۆ ئەوەی تەشەری لێ بدەنو رێگە

---

[1] دراسات في الاهراء والفرق والبدع، ناصر العقل (٤٩).

بهەنون بۆ ئەوەی کودەتای لیٚ بکەن، هەستان خەڵکیان بە شێوەیەك تێدەگەیاند ئەم کارە، واتە: (کۆکردنەوەی قورئان لەیەك جۆر پیتو خوێندنەوەدا) کارێکی ناهەموارەو پێویستە لێی بەدەنگ بێین[1]، هاوەڵانیش ڕەزای خودایان لیٚ بێت نەیانهێشت هیچ قورئانخوێنیٚ لەسەر شێوازە خوێندنەوەکەی خۆی بمێنێتەوە، بەڵکو هەر هەموویان هێنا سەر یەکجۆرە خوێندنەوە یەك جۆر پیتو یەك ڕیزو یەك ئامانج ئەمەوانەیەکی گەورەیە کە لە لێکدانەوەی مێژووی خولەفای راشیدیندا دەیخوێنینەوە سەرەڕای ئەوەی ژیانیان بە پەندو وانەو پێشەنگی ئاهەنگی کراوە[2]، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: (خودای گەورە بە سیٚ شت لێتان ڕازی دەبێت، بی پەرستنو هیچ شتیٚ مەکەنە هاوبەشی، دەست بگرن بە گوریسی خوداوەو واتە (قورئان) ناکۆکی جیایی نەکەن، ئامۆژگاری ئەوانە بکەن کە خودای گەورە دەیکاتە سەردارتان)[3]، ڕێگەی دەستگرن بە گوریسی خوداوە ئەوەیە پابەندی قورئانو سوننەتەکانی پێغەمبەر بین بنچینەی دینە، بەڵکو مەحکەمترین بنچینەی ئەم دینە مەزنەیە، ئیبنو تەیمییە دەڵیٚ: (بنچینەی هەرەگەورەی ئیسلام ئەوەیە پابەندی قورئانو سوننەت پێغەمبەر ﷺ بین).

خودای گەورە دەستگرتنی بە قورئانو سوننەت زۆر بە هەند باس کردووە لە قورئانداو زۆر بەسەختیش سەرکۆنەی ئەوانە دەکات، کە (قورئانو سوننەت) دەخەنە لاوە، وەکو گاورو جولەکەو جگە لەمانەش، هەروەها پێغەمبەریش ﷺ زۆر بەمەزنی وەسیەتی بەم کارە کردووە لە جێگەی تایبەتو گشتیدا[4].

هەر لەبەر ئەمەیە خودای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە بە هەموو شێوەیەك پارێزگاری گلێریو هۆگریو برایی موسڵمانان بکات، نەهی لێکردووە کە شتیٚ بکات ڕوونی ئەم دینە پیرۆزە لێڵو تەڵخ بکات، بە ڕاستی ئەو دووبەرەکیو دابڕانو داپاچینو یەکتر بڕینەی ئێستا هەموو هۆکاری پابەند نەبوونە بە قورئانو

---

[1] فتنة مقتل عثمان بن عفان (١/٨٢).

[2] المصدر نفسه (١/٨٣).

[3] سند أحمد (١/٢، ٢٦).

[4] مجموع الفتاوى (٢٢/٣٥٩).

سونن‌ه‌ته‌وه فه‌رامۆش کردنیانه‌، ده‌بینین ڕیزی موسڵمانان شه‌قاری تێکه‌وتووه‌، یه‌کێتییان کزبووه‌و بوونه‌ته گرۆ حیزبی جوداو هه‌ریه‌که‌شیان دڵخۆشه به به‌رنامه‌ی خۆی[1]، یه‌ککرتوویی موسلمانان‌و یه‌کێتییان خواستێکی شه‌رعییه‌و مه‌به‌ستێکی گه‌وره‌یه له مه‌به‌سته‌کانی شه‌ریعه‌ت به‌ڵکو گرنگترین هۆکاری سه‌قامگیرکردنی دینه‌که‌ی خودای گه‌وره‌یه‌، ئێمه‌ش داسپێرراوین که حه‌ق‌و راستی بپارێزین، پێویسته هه‌وڵ‌و تێکۆشانی بانگخوازه‌کان پتر بێت‌و ڕابه‌ری بزووتنه‌وه ئیسلامییه‌کان‌و زانایان‌و فێرخوازانی زانست هیممه‌ت بکه‌ن بۆ چاکسازییه‌کی راسته‌قینه‌یی نه‌ك دوو په‌له‌یی، شێخ عه‌بدوڕڕه‌حمان سه‌عدی ده‌ڵێ: جیهاد دووجۆره‌، جیهادێکیان مه‌به‌ست تێدا چاککردنی باری موسڵمانانه‌و چاکسازی کردنه له بیروباوه‌ڕو ڕه‌وشت‌و ئاداب‌و هه‌موو کاروباره دینی‌و دونیاییه‌کان، په‌روه‌رده زانستییه‌کان ئه‌م جۆره جیهاده بنه‌ڕه‌ته بۆ پێکه‌وه نان‌و دامه‌زراندنی جۆری دووه‌م که جیهادێکه مه‌به‌ست تێیدا ڕێگرتنه له ده‌ستدرێژییکه‌رانی دوژمنی ئیسلام‌و موسڵمانان وه‌ك کافران‌و مونافیقین‌و چه‌په‌کان‌و هه‌موو دوژمنه‌کانی تر، ئه‌م جۆره‌ش ده‌کرێ به‌دوو لقه‌وه‌، جیهادکردن به به‌ڵگه‌و مه‌دره‌ك‌و زمان، جیهادکردن به چه‌کی گونجاو له کات‌و شوێنی خۆیدا[2].

پاشان بابه‌تێکی سه‌ربه‌خۆی نووسیوه له ژێر ناونیشانی (ئه‌و جیهاده‌ی، که په‌یوه‌سته به موسڵمانه‌وه ئه‌وه‌یه‌، که‌هه‌ستێ به دروستکردنی دۆستایه‌تی‌و یه‌کده‌نگی‌و یه‌ك دروشمی)[3] پاش ئه‌وه‌ی ئایات‌و فه‌رموده له‌مباره‌یه‌وه ده‌هێنێته‌وه ده‌ڵێ: (گه‌وره‌ترین جیهاد ئه‌وه‌یه تێ بکۆشی بۆ به‌دیهێنانی ئه‌م بنجینه‌یه‌)، (دڵی موسڵمانان ڕێك خه‌یت‌و له‌سه‌ر دینداری گلێرییان بکه‌یته‌وه‌و به‌رژه‌وه‌ندیی دین‌و دنیایان بۆ ده‌سته‌به‌ر بکه‌یت)[4]. له‌به‌ر ئه‌وه سه‌یر ده‌که‌ین ده‌ست گرتن به‌و ئامرازانه‌ی به‌ره‌و یه‌ك دڵی موسڵمانان ده‌مانبات‌و ریزیان یه‌کگرتوو ده‌کات گه‌وره‌ترین جیهاده‌، چونکه ئه‌م

---

[1] تبصير المؤمنين بفقه انصر والتمكين للصلابي، ص (٣٠٧).

[2] وجوب التعاون بين المسلمين للسعدي، ص (٥).

[3] المصدر نفسه.

[4] وجوب التعاون بين المسلمين للسعدي، ص (٥).

هەنگاوە زۆر گرنگە بۆ سەربلندی موسڵمانانو راستکردنەوەی ولاتیان، شەرعی خودا ببێتە حاکمیان، سەیری چەمکی خولەفای راشیدین بکە، کە لە نایابترین وێنەدا ئەم یەکگرتنە دەدرەوشێتەوە، بۆ نموونە ئیمامی عوسمان ئوممەتی ئیسلامی لەسەر یەك شێواز قورئان کۆکردەوە.

## باسی یەکەم: هەرێمەکانی وڵات لەسەردەمی عوسماندا و سیاسەتی لەگەڵ والییەکاندا

### یەکەم: مەککەی پیرۆز

کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب کۆچی دوایی کرد، خالیدی کوڕی عاصی کوڕی هیشامی کوڕی موغەیرەی مەخزومی کردبووە والی شاری مەککە[1]، پاشان عوسمان ماوەیەکی کەم هێشتییەوە، بەڵام قورس بوو بە لایەوە خالیدی بۆ دیاری بکاتو بیهێڵێتەوە، پاشان هەستا لایبرد، باسی هۆکاری لابردنەکەی نەکراوە، بۆ؟ هەڵبژاردنی والی مەککە یەکێك بوو لە کارە هەرە گرنگەکانی، دەوڵەتی ئیمامی عوسمان لە دوای لابردنی خالید عەلی کوڕی رەبیعەی کوڕی عەبدول عوزای کردە والی مەککە، پاشان لە دوای ئەمیش کۆمەڵێ ئەمیری کرد بە والی مەککە، هەرچەند دیاریکردنی ماوەی والییەکان قورس بوو لەسەرشانی یەکێ لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری حەزرەمی بوو، ئەم پیاوە یەکێك بوو لە والییەکانی ئیمامی عوسمان لەسەر مەککە، هەروەها دەقەکان ئەو هەواڵەیان گەیاندووە، کە عوسمان جارێکی تر خالیدی کوڕی هیشامی گەڕاندووەتەوە بۆ سەرشاری مەککەو بووەتە والی هەندێ سەرچاوەی تر جەختیات کردووەتەوە کە وەختێ ئیمامی عوسمان کۆچی دوایی کردووەو خالید والی[2]، مەککە بووە عەلی هەستاوە لایبردووەو یەکێکی تری کردووەتە والی، بە ریوایەتێکی تر سەلماوە کاتێ عوسمان بە ناحەق کوژرا[3]، عەبدوڵڵای کوڕی خەزرەمی والیی مەککە بووە، شاری مەککە تایبەتمەندیی ئاسایشو سەقامگیری هەبوو سەرباری ئەو هەموو ئاژاوەیەی کەوتبووە شارەکانی تر لە دوا دوایی خەلافەتی عوسماندا[4].

---

[1] تجريد أسماء الصحابة الإمام الذهبي، ص (١٥١).

[2] الولاية على البلدان في عصر الخلفاء الراشدين، د. عبدالعزيز العمري (١/١٦٦).

[3] لغاية الإرب في فنون الأدب للنويري (٢/٧٢).

[4] الولاية على البلدان (١/١٦٧).

### دووەم: مەدینەی منەوەرە

مەدینەی منەوەرە لە سەردەمی عوسماندا یەکێك بوو لە شارە گەورەکانی ئیسلام‌و چەقی خەلافەت بوو، نوێنەری شارە جۆربەجۆرەکان دەهاتنە ئەوێ لەگەڵ سەربازەکانی ئیسلامدا، زۆربەی کەڵەپیاوانی هاوەڵانی موهاجیرین‌و ئەنسار تێدا نیشتەجێ بوون لەبەر ئەمانە بایەخێکی تایبەتی هەبوو، عوسمان بە درێژایی حوکمی خەلافەتەکەی لە مەدینە نیشتەجێ بووە، هەواڵی خۆشی ناخۆشی خەڵکەکەی دەزانی[1]و سۆراغی دەکردن، تەنانەت پرسیاری نرخی شمەکە خۆراکییەکانی لێدەکردن، دەنگوباسی هاوولاتیانی دەپرسی، هەرکاتێ عوسمان سەفەری حەجی بکردایە یەکێ لە هاوەڵانی دەکردە بریکاری خۆی، هەتا دەگەڕایەوە زۆربەی جار زەیدی کوڕی سابیتی دەکردە بریکاری خۆی[2]، لە شاری مەدینە بەیتولمال‌و دیوانی موچەو بەخششی تێدا بوو، وەکو شارانی تر.

مەدینە لە هەموو شارە ئیسلامییەکانیتر زیاتر ئاسایش‌و کپ بووە، لە ماوەی خەلافەتی عوسماندا جگە لەو ڕووداوانەی کە لە ڕۆژانی دوایی خەلافەتیدا ڕوویدا، هیچ کارەساتێکی تیا روو نەداوە، لە کۆتاییدا بارودۆخی خەڵکی دوای هاتنی لەشکری ئاژاوەگێڕیی‌و گەمارۆدانی ماڵی ئیمامی عوسمان تێکچوو هەندێ لە هاوەڵە مەزنەکان دەرچوون بەملاولادا[3].

### سێیەم: بەحرەین‌و یەمامە

کاتێ عومەری کوڕی خەتاب کۆچی دوایی کرد، عوسمانی کوڕی ئەبی عاصی سەقەفی والی بەحرەین بوو، عوسمانیش ماوەیەکی کەم بێدەنگ بوو لەسەری لە ریوایەتەکان وادەردەکەوێت، کە عوسمانی کوڕی عاص هەتا سێ ساڵ دوای بەیعەتدان بە عوسمان هەر والی بەحرەین بووە، واتە هەتا ساڵی ٢٧ی کۆچی، چونکە بە خۆی‌و سوپاکەیەوە لەگەڵ سوپای بەسرەدا بەشداریی هەندێ فتوحاتی کردووە[4]، دیارە ئەو

---

[1] تأريخ المدين (٣/٩٦١، ٩٦٢).

[2] الولاية على البلدان (١/١٦٨، ١٩٦).

[3] المصدر نفسه (١/١٦٩).

[4] تأريخ الخليفة بن خياط، ص (١٥٩)، الولاية على البلدان (١/١٩٦).

هەرەوەزییەی لە نێوان ویلایەتی بەحرەین‌و ویلایەتی بەسرەدا دەستی پێ کردبوو لە سەردەمی ئیمامی عومەردا بەسترابوو، لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا پەرەی سەندو تۆکمەبوو، بەتایبەتی دوای والییەتی عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی کورەیز لەسەر بەسرە[1]، ئاشکرایە کارگێڕی بەحرەین یەکێ لە تابیعینە گوێڕایەڵەکان بوو بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عامری والی بەسرە، دەقە مێژووییەکان ئاماژەیان کردووە بە شوێنکەوتەیی بەحرەین بەرامبەر بەسرە ـ هەتا ئەوەندە ماڵ لەیەکبوون عەبدوڵڵای کوڕی عامر لە لایەن خۆیەوە کارگێڕی بۆ بەحرەین دیاری دەکرد[2]، یەکێ لە توێژەرەوەکان ئەم تەعاروفە جەخت دەکاتەوە دەڵێ: (لە سەردەمی عوسماندا، کە خەلیفەی سێهەمە بەحرەین نوسابوو بە بەسرەوە بە تایبەت لەم دواییەدا کە بەسرە بوو بە بنکەیەك بۆ رزگارکردنی وڵاتی فارس‌و باشووری ئێران‌و ویلایەتی بەحرەین بو بە پاشکۆی ویلایەتی بەسرە، شیرازەی نێوان بەسرەو بەحرەین توندوتۆڵ کرا[3]، پاشان باسی والییەکانی بەحرەین دەکات، کە لە لایەن عوسمانەوە دانراون وەکو مەروانی کوڕی حەکەم‌و عەبدوڵڵای کوڕی سورادە[4]، لە سەردەمی عوسماندا بەحرەین رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە رزگارکردنەکاندا[5]، بارودۆخی بەحرەین لە سەردەمی عوسماندا هەتا وەفات کردنی سەقامگیر بوو، بەڵام یەمامە لە سەردەمی عومەردا تابیعی ویلایەتی بەحرەین‌و عەمان بوو هەتا رادەیەکی زۆر، بەڵکو والی بەحرەین هەندێ جار ئەمیری بۆ یەمامە دەنارد، بەڵام لە سەردەمی عوسماندا ئەوەی دەرکەوتووە ئەمەیە کە یەمامە لە لایەن عوسمانەوە راستەوخۆ والی بۆ دانراوە، لە روداوی ئاژاوەچییەکاندا دوای کوشتنی ئیمامی عوسمان باسی کراوە بە تایبەت ئەو پەرتوکانەی کە هەڵچوون بۆ کوشتنی ناحەقی ئیمامی عوسمان[6].

---

[1] الطبقات لابن سعد (٥/٤٤).

[2] الولاية على البلدان (١/١٦٩).

[3] البحرين في صدر الاسلام عبدالرحمن بن النجم ص (١٤١).

[4] الولاية على البلدان (١/١٧٠).

[5] المصدر نفسه.

[6] المصدر نفسه.

## چوارەم: یەمەن و حەزرەمەوت

کاتێ ئیمامی عومەر کۆچی دوایی کرد یەعلای کوڕی عویەینەی کرده والی بەسرەو یەمەن کاتێ یەعلا لە ڕێگەی یەمەن بۆ مەدینە دەگەڕایەوە، پاشان لە لایەن عوسمانەوە هەواڵی وەفاتی عومەرو بەیعەت پێدانی تازەی پێ ڕاگەیەنرا، ئەویش بەیعەتی داو ئیمامی عوسمان لە لایەن خۆیەوە کردی بە سەرپەرشتیاری (سەنعاو) لەسەر والیەتی سەنعا بەردەوامبوو هەتا وەفاتی عوسمان[1]، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعی کردە والی شاری یەمەن، بە درێژایی خەلافەتەکەی بەرکەنار نەکرا[2]، وەك دەرکەوتووە هەندێ والی تر بوونەتە والی شارەکانی یەمەن، بەڵام سەرچاوە سەرەکییەکان ڕشدیان خستووەتە سەر ئەم دوو والییە، لە ڕاستیدا سەرچاوەکان درێژەیان نەداوە بە باس و خواسی یەمەن و قسەیان زۆر لەسەر نەکردووە بەتایبەت لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عوسماندا، هەروەك چۆن بە کەمی باسی نامەگۆڕینەوەی نێوان عوسمان و ویلایەتەکەی یەمەنیان کردووە، جگە لەو کارە گشتییانەی کە بە نامەناردوویەتی بۆ سەرجەم ویلایەتەکانیتر و لقی تریان[3]، ئەوەی زانراوە خەڵکی یەمەن لە ماوەی دەسەڵاتی عوسماندا گوێڕایەڵی و ملکەچییان هەبووە بۆ ئەمیرەکانیان، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە ریوایەت کراوە عوسمان پیاوێکی سەقەفی نارد بۆ یەمەن کاتێ گەڕایەوە، ئیمامی عوسمان پرسیاری ئەو خەڵکەی لێکرد، پیاوەکە وتی: خەڵکانێکم بینی (چیان داوابکرایە پێیان ئەدرا هەق بوایە یان ناهەق)[4]، وەك زانراوە ژمارەیەك لە تیرە یەمەنییەکان کۆچیان کردووە لە کاتی فتوحاتەکانی سەردەمی عومەردا بۆ شارە ئیسلامییە تازەکان ئیتر عێراق بێت یان میسر یان شام بەم چەشنە پەیوەندی یەمەن و خەڵکەکانی بەم شارانەوە بە درێژایی سەردەمی عوسمان نەپساوە، ئاشکرایە تاقمێ لە جولەکەکانی یەمەن ڕۆڵێکی نەگریسیان هەبوو لە هەڵگیرسانی ئەو کێچەڵەی کە لە دوا

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٤٤٢).

[2] تأريخ خليفة بن خياط، ص (١٧٩).

[3] الولاية على البلدان (١/١٧١).

[4] تأريخ اليمن السياسي في العصر الاسلامي، حسن سليمان، ص (٧٩).

دوایی سەردەمی عوسماندا رویداو عوسمانی تیا شەهید کرا، لە سەرووی هەمووشیانەوە (ئەو سەرسەریانە بوون، کە ئاژاوەکەیان گێڕا) بە داشی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء، لە دوای کوشتنی عوسمان کۆمەڵێ لە والییەکان یەمەنیان بەجێ هێشتو هاتن بۆ حیجاز بۆ بەشداریکردنی ئەو ئاریشانەی هاتووەتە پێش وەکو یەعلای کوڕی عویەیینەو عەبدوڵڵای کوڕی رەبیعە[1].

## پێنجەم: ویلایەتی شام

ئەو دەمەی عوسمان هاتە سەر خەلافەت مەعاویە والی زۆربەی زۆری شام بوو، عوسمانیش لێی بێدەنگ بوو دانی پیانا[2]، وەکو بێدەنگ بوو لە سەر والییەکانی تر، واتە هەندێ والی لە دوای وەفاتی عومەر لەسەر کاری خۆیان مانەوە، بۆ نموونە وەکو یەمەنو بەحرەینو میسرو هیتریش.

ئاریشەکان پەرەیان سەندو هەندێ ناوچەی تر خرایە ئەستۆی مەعاویە هەتا مەعاویە بوو بە والی سەرانسەری ولاتی شام، بەڵکو بوو بە بەهێزترین والی عوسمانو زۆرترین جەماوەری هەبوو، بەتایبەت لە سەرەتای خەلافەتی عوسماندا، هەروەها لە شام هەندێ والی تری هەبوو یەکێ لەوانە عومەری کوڕی سەعدی ئەنصاری بوو، کە والی حیمیص بوو، لە پلەو پایەدا (مکانە) لای عوسمان لەگەڵ مەعاویەی کوڕی ئەبی سوفیاندا مونافەسەی دەکرد، بەڵام عومەر تووشی نەخۆشییەك بوو پەکی کەوت لە رێکخستی ویلایەتەکەی بۆیە داوای کرد لە ئیمامی عوسمان ئیعفای بکاتو ئەویش ئیعفای کردوو ویلایەتەکەی خستە ئەستۆی مەعاویەی ئەبوسوفیان، بەمەش جەماوەری مەعاویە زیادی کردو هەتا حیمص درێژ بوویەوە، کە پێشتر عەبدوڕڕەحمانی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید والی بوو[3]، تێیدا هەروەها عەلقەمەی کوڕی میحرەز کە والی فەلەستین بوو مرد.

عوسمان ویلایەتەکەی خستە پاڵ ویلایەتەکەی مەعاویە دوو ساڵ دوای خەلافەتی عوسمان هەرهەموو شام بوو بە ویلایەتی مەعاویەو کرا بە والی ڕەهای شام بە درێژایی

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٤٤٢).

[2] تاريخ خليفة بن خياط، ص (١٥٥).

[3] تاريخ الطبري (٥/٤٤٢).

ساڵەکانی خەلافەتی عوسمان  بە والیەتی مایەوە هەتا عوسمان کۆچی دوایی کرد[1]، ماوەی والییەتی مەعاویە بەسەر شامدا پڕە لە رووداوو ئاریشە، چونکە شام گرنگترین ناوچەی جیهادکردن بوو وێڕای ئەمەش لە ناوخۆیدا بارودۆخەکەی نا سەقامگیرو دانەمەزراو بوو، ئیسلام سەرپەرشتی دەکردو ڕۆمەکان زۆر بە گەرمی هەوڵیان دەدا گرژیو ناکۆکی

بوروژێنن، تێدا، هەرچەندە شام پاشکۆی زەویە رەشەکان بوو، کە موڵکی رۆمەکانە، بەم چەشنە دەرگا کراوەبوو لەبەردەم مەعاویەدا لەو قوڵانەوە جیهاد بکات، پێشتر باسمان کردووە، مەعاویە لە کۆتایی خەلافەتی عوسماندا لە وڵاتی ئیسلامدا قورساییەکی سیاسیی هەبوو یەکێبوو لەو والیانەی کە عوسمان کۆبوونەوەی لەگەڵ کردو راوێژی پێکرد لە کاتی سەرهەڵدانی داستانی ئاژاوەگێڕیدا مەعاویە هەندێ بۆچوونی تایبەتی خستە ڕوو ئاڕاستەی عوسمانی کرد[2] لەو کۆبوونەوەدا، بە ئیزنی خودا باسی دەکەین.

**شەشەم: ئەرمینییە**

بۆیەکەمجار لە سەردەمی عوسماندا سوپای ئیسلامی رووی کردە ئەرمینییە یەکەمین لەشکری ئیسلامیش رووی کردە ئەو ناوچەیە لە وڵاتی شامەوە، چونکە نزیکترین ویلایەت بوو لێیەوە، بە پێشڕەوی حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فەهری بوو سوپاکەشی نزیکەی هەشت هەزار سەرباز بوو ئەم سوپایە توانی شوێن گەلێکی زۆر لە ئەرمینییە رزگار بکات، تەنیا ئەوکاتە نەبێت، کە حەبیب هەستی بە مەترسی کرد لە ئەنجامی پاڵپشتی کردنی ئاپۆڕایەکی ڕۆمی کە دەیانویست یارمەتی ئەرمەنەکان بدەن لە دژی موسڵمانەکان، لەبەر ئەوە داوای کۆمەکی سەربازی کرد لە خەلیفە ئەویش فەرمانی کرد لەشکرێکی کوفە بە سەرکردایەتی سەلمانی کوڕی رەبیعەی ئەلباهلی نزیکەی شەش هەزار پیاوی سەرباز بوو چوونە هاوکاریان[3]، لە دوای ئەمەش کێشەیەك لە نێوان حەبیبی کوڕی مەسلەمەو سەلمانی کوڕی رەبیعەدا روویداو ئیمامی عوسمان هەڵوەستەی

---

[1] المصدر نفسه (٤٤٣/٥).

[2] الولاية على البلدان (١٧٦/١).

[3] الطبقات (١٣١/٦).

کرد، لە سەریو هەستا نوسراوێکی نووسی[1]، کە سەلمان ببێتە ئەمیری ئەرمینییە[2]، پاشان سەلمانی کوڕی ڕەبیعە ئەرمینیەی بڕیو دوورکەوتەوە پاشان ولاّتی خەزەرییشی بە فاتیحیو سەرکەوتوویی بڕی، تەنانەت شەڕێکی خوێناوی ڕوویدا لە نێوان سوپاکەی کە (دە هەزار سەرباز بوو) لەگەڵ سوپای پادشای حەزەردا کە سوپاکەی سێ سەد هەزار سەرباز بوو، وەکو ریوایەتەکان دەیگێڕنەوە، سەلمانو سەربازەکانی کوژران، ئیمامی عوسمان جارێکی تر نوسراوێکی نووسی بۆ حەبیبی کوڕی مەسلەمە، کە بچێت بۆ شارەکانی ئەرمینییە، ئەویش بە خۆیو سوپاکەیەوە ڕووی تێکردو شوێنەکانی بۆ جاری دووەم رزگار کردەوە، موسڵمانان هاتن بە پیرییەوەو هەندێ پەیمانی لەگەڵ ئەهلی شارەکەدا بەست[3]، پاشان عوسمان پێی باشبوو کە ئەو روو بکاتە کەلەبەرەکانی دوورگە، چونکە زۆر شارەزایە لە دورگەداو بەتواناو لێزان بوو، حوزەیفەی یەمانی خستە شوێنەکەی خۆی وێڕای ئەوەی والی ئازربیجان بوو هەستا بە ئەنجامدانی کۆمەڵێ غەزا بەرەو شارەکانی حەزەر لە ئەرمینیە[4]، دوای ساڵێك عوسمان حەبیبی لابردو موغەیری کوڕی شوعبەی کردە والی ئەرمینییە هەتا عوسمان کۆچی دوایی کرد لە یەك کاتدا والی ئەرمینییەو ئاربیجان[5] بوو ئەم ویلایەتە ولاّتێکی تازە بوو عوسمان خستیە پاڵ ولاّتی ئیسلامیی، لە (ویلایەتی ئەرمینیە) موسڵمانان تووشی ناسۆری سەخت بوون لە رزگارکردنو ڕێکخستنو سەقامگیرکردنی کاروبارەکانیدا[6].

### حەوتەم: ویلایەتی میسر

والی میسر لە خەلافەتی عومەری کوڕی خەتتابدا عەمری کوڕی عاص بوو کە ماوەی چوار ساڵ حوکمی کردن[7]، ئەوکاتەش عومەر کۆچی دوایی کرد، عەمر والبی

---

[1] الخراج ووصناعة الكتاب، قلامين جعفر، (٣٢٦).

[2] الفتوح بن أعثم (١١٢/٢).

[3] الولاية على البلدان (١٧٧/١).

[4] الولادة على البلدان (١٧٧/١).

[5] تأريخ اليعقوب (١٦٨/٢)، الولاية على البلدان (١٧٧/١).

[6] الولاية على البلدان (١٧٧/١).

[7] النجوم الزاهرة في ملوك، مصر والقاهرة، د. جمال الدين بردي (٧٧/١).

میسر بوو، عوسمانیش لە سەرەتای خەلافەتیدا ماوەیەکی کەم بێدەنگ بوو لەسەریو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرحیش[1] لە هەندێ لە چمکی شارەکانی میسرەوە لە کاروبارەکانیدا یارمەتی دەدان، چونکە هاوڕێی عەمری کوڕی عاص بوو لە ڕۆژانی ڕزگارکردنی فەلەستینەوە هەتا ڕزگارکردنی میسر[2]، لە تاقمی سەرکردەکانی بوو بەشداری هەبوو لەگەڵیا، عوسمانیش دەستنیشانی کردو دای مەزراند[3]، واتە (ئەبی سەرح) بوو بە کارگێڕی بەشێك لەناوچەی سەعیدی میسر.

دەرکەوتووە عەمری کوڕی عاصو عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح هەندێ ناکۆکی ڕوویدا لە دیدو بۆچوونیاندا، عەمری کوڕی عاص نوێنەری نارد بۆ لای عوسمان دوای ئەوەی بەیعەتی خەلافەتی پێدابوو، داوای لێکرد عەبدوڵڵای ئەبی سەرح لە ویلایەتی (صەعید) لابات، عوسمانیش ڕەفزی داواکەی کردو باسی ئەوەی بۆ کرد، کە عومەر عەبدوڵڵای ئەبی سەرحی کردووەتە والیو کارێکی واشی نەکردووە پێویست بە لابردن بکات، عەمر زۆر پێداگری کرد بۆ لابردنی ئەبی سەرح، عوسمانیش زۆر پێداگری کرد لەسەر بەقسە نەکردنی، ئەنجامی پێداگری هەردوولایان لەسەر ڕای خۆی، عوسمان پێی باشبوو عەمر لە ویلایەتی میسر لاببباتو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح بخاتە جێگەی ئەمەی بە گونجاو زانی، ئەم کارەشی کرد[4]، لەو بارودۆخەشدا ڕۆمەکان دەستیان کردبوو بە هێرش کردن بۆ سەندنەوەی ئەسکەندەرییەو ڕکێفکردنی هەستان هەموو ئەو موسڵمانانەیان کوشت کە تێیدایە، بۆیە ئەمیری ئیماندار (عوسمان) بە پێویستی زانی عەمری کوڕی عاص بکاتە فەرماندەی سوپای میسر، بۆ ڕزگارکردنی ئەسکەندەرییە سەرلەنوێ دەست بگرێت بەسەر سوپای ڕۆمدا، بە فیعلی ئەمەشی کرد[5]، ئەم باسەم بە دوورودرێژی کردووە لە باسی فتوحاتدا، پاشان عوسمان ویستی

---

[1] سیر اعلام النبلاء (٣٣/١).

[2] المصدر نفسه.

[3] ولاة مصر للكندي، ص (٣٣) فتوح وصر وأخبارها ص (١٧٣).

[4] الولاية على البلدان (١٧٨/١).

[5] الولاية على البلدان (١٧٨، ١٧٩).

عەمر بکاتەوە بە والی ویلایەتی هەرچوارلای میسرو جەنگەکانیو عەبدوڵڵای ئەبی سەرح بکاتە کاربەدەستی باج بەڵام عەمر ڕفزی ئەم کارەی کرد، لەو سەردەمەدا خەریکبوو دەنگوناوی ویلایەتی عەمر لە میسردا دەرکەوێتو ببیستریّ ئەوەندە کارابوو لە ماوەی خەلافەتی عوسماندا جگە لە ڕۆڵە جیهادییەکانی کە باسکراوە، وەکو بەرپەرچدانەوەی ڕۆمو تارنانیان لەئەسکەندەرییەو جێگیرکردنی ئاسایش لە سەرانسەری میسرداو ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە. مەسەلەی ئەو خەراجەی کە مشتومڕو بۆچوونی جیاوازی خستە نێوان عوسمانو عەمری کوڕی عاص دوای لابردنی جاری دووەمی عەمربوو تازە بووبوو بە والی ئەسکەندەرییە یاخود لە کاتی ویلایەتی ئەسکەندەرییەدابوو کە زۆربەی ڕایەکان وادەڵێن[1]، لە ئەنجامی ئەوەی عەمر پێشنیارەکەی ئیمامی عوسمانی ڕەت کردەوە، کە فەرمووی (عەمر ببێتە والی بەسەر شارەکانەوە عەبولڵای ئەبی سەرح بکاتە باج سێن)، ئەویش نەیکرد بۆ جاری دووەم عوسمان بڕیاریدا عەبدوڵڵای ئەبی سەرح بکاتە والی میسرو بە ڕەسمی کرابە بەڕێوەبەری فیعلی ویلایەتی میسر بە شارو داهاتو هەموو کاروبارەکانییەوە[2]، لە سەرەتاوە میسر هێورو سەقامگیر بوو، لە سەرەتای دەستبەکاربوونییەوە هەتا ئاژاوەچییەکان ئاژاوەکەیان هەڵخزان وەکو عەبدوڵڵای کوڕیّ سەبەئو ئەوانیتر هەرکە هاتە میسر خەڵکەکەی وروژاند، ئەمانەو گویّ لەمشتەکانیان ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە کوشتنی ئیمامی عوسماندا[3]، لەمەودوا بە درێژیی باسی دەکەین.

### هەشتەم: ویلایەتی بەسرە

کاتیّ ئیمامی عومەر شەهید کرا، ئەبو موسای ئەشعەری والی بەسرە بوو، کۆمەڵگەی بەسرە ئەو دەمە کۆمەڵیّ گۆڕانکاری بنەڕەتی تیا هاتبووە ئاراوە، لە ڕووی پێکهاتەی دانیشتوان کۆمەڵگاوە وێڕای ئەمەش بەسرە ببووە گەورەترین سەربازگەی ئیسلامیی، چونکە ژمارەیەك لە هۆزەکان کۆچیان کردبوو، بۆ ئەویّ، سەربازەکانی زۆر

---

[1] الولاية على البلدان (١/١٧٩)، فتوح البلدان، ص (٢١٧).

[2] الولاية على البلدان (١/٧٩).

[3] المصدر نفسه.

شوێنێکیان رزگار کردبوو، بەم چەشنە بەسرە بایەخێکی تایبەتی بەدەست هێنا، لە سەرەتای خەلافەتی عوسماندا[1]، خەڵکەکەش سەرقاڵی ئیشی تایبەتی خۆیان بوون لە پاڵ ئەنجامدانی کاروبارە گشتییەکان وەکو جیهادو شتی تر، بەمجۆرە والیەتی کردنی ئەم جۆرە ناوچانەو ئەو هەرێمانەش کە لە چواردەوریەتی بەکارێکی زۆر گرنگ هەموار دەکرێت، هەروا کارێکی ئاسایی نییە دەبێ سەلیقەیەکی لەبارت هەبێ بۆ بەڕێکردنی بارودۆخی ئەم ویلایەتانە، لەوانەیە عومەری خەتاب دەرکی بە تواناو لێهاتوویی ئەبی موسا کردبێت بۆ والیەتی‌و ویلایەتی بەسرە هەر بۆیە وەسێتی کردبوو خەلیفەکەی پاش خۆی کە دەست بەرداری ئەبا موسای ئەشعەری نەبێ‌و لە ویلایەت بیهێڵێتەوە هەتا چوار ساڵ دوای کۆچی دوایی خۆی[2]، ماوەی والیەتی ئەبوموسا بۆ بەسرە هەرەتی جیهادو لێدان دەست وەشاندن، کە خەڵکی بەسرە رۆڵیان تیادەگێڕا ئەبو موسای ئەشعەری هەڵکەوت‌و دەرکەوت‌و دەنگی دایەوە.

بە رزگارکردنی ژمارەیەك شوێن‌و پێگەی وڵاتی فارس، وێڕای ئەمەش شوێن موسڵمانانی قایم کرد لە پێگە رزگارکراوەکانی پێشوودا، واتە ئەو شوێنانەی کە دەیانویست پەیمان شکێنی بکەن دوای وەفاتی ئیمامی عومەر ئەبو موسا هەستا بە غەزاکردنیان‌و ئیسلامی لەو سوچانەدا جێگیر کرد[3]، لە پاڵ ئەمەشدا کە بە توانا بوو لە فتوحاتدا هەستاوە بە رۆڵێکی گرنگتر لە رێکخستنی ئاودێری و هەڵکەندنی جۆگەو روبارەکان لە بەسرە لە ساتە وەختی ویلایەتی خۆیدا، لەسەردەی ئیمامی عوسماندا، هەستاوە بە هەڵکەندنی کەناڵێك بۆ دەستەبەرکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ بەسرە لە دوای خۆشی خەڵك کردبوویانە سەرچاوەی ئاوی خواردنیان، هەروەها دەستی کرد بە پڕۆژەکانی هەڵکەندنی کۆمەڵێ کەناریتر، بەڵام لە والیەتی لابراو هێشتا تەواوی نەکردبوو[4]، عەبدوڵڵای کوڕی عامری جێگرەوەی هەستا بە تەواوکردنی[1]، ئەبی موسا

---

[1] التنظيمات الاجتماعية والاقتصادية في البصرة، صالح العلي، ص (١٤).

[2] سير اعلام النبلاء (٢/٣٩١)، الولاية على البلدان (١/١٨٦).

[3] الولاية على البلدان (١/١٨٧).

[4] المصدر نفسه.

زۆر بەردەوام نەبوو، ماوەدرێژنەبوو لەسەر والیەتی بەسرە، چونکە عوسمان ساڵی (٢٩)ی کۆچی لایبرد[2]، وەکو زۆرینەی ڕیوایەتەکان پارسەنگیان داوە، عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی کورەیزی خستە جێگەکەی، مێژوونووسەکان ژمارەیەك ریوایەتیان هێناوە لە بارەی لابردنی ئەبی موساو لێرەدا کورتی دەکەینەوە: کێشەیەك ڕاس بوویەوە لە نێوان ئەبی موساو سەربازەکانی بەسرەدا، (رای جیاواز هەیە لەسەر هۆکارەکەی)، کۆمەڵێ لە خەلکی بەسرە هاتنە خزمەت ئیمامی عوسمانو سکالآیان کرد، ئەبی موسا لاببات‌و پێیان وت: (ئێمە هەرهەموومان حەزناکەین پرسیارمان لێ بکەیت دەربارەی ئەبی موسا، لایبەو کەسێکی تر بخە شوێنی)، عوسمان وتی: حەز بەکێ دەکەن؟ وتیان: هەرکەس دابنێت لە جێگەی ئەو قبوڵمانە، داوایان کرد لە ئیمامی عوسمان کەسێکی قورەیشی بکاتە والییان[3]، عوسمانیش ئەبی موسای لابردو عەبدوڵڵای کوڕی عامری کردە والییان لە شوێنی ئەو، ئالێرەدا حیکمەتی ئەبی موسا درەوشایەوەو سنگفراوانی‌و گوێڕایەڵی فەرمانی خەلیفەکەی خۆی وەرگرت، ئەبی موسا زۆر پەرۆشی والیەتی نەبوو، وەکو هەندێ وا گومان دەبەن کاتێ هەواڵی لابردن‌و دانانی عەبدوڵڵای کوڕی عامر لە شوێنەکەی، پێگەیشت هەستا چووە سەر مینبەرو سوپاسی خودای کردو پاشان وەسفی عەبدوڵڵای کوڕی عامری کرد، کە گەنجێکی تازەلاوبوو تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو، ئەبی موسا بەم شێوەیە مەدحی کردو وتی: (گەنجێکی خاڵوان چاك‌و ماموان چاك‌و باپیران چاکەو لە هۆزی قورەیشەوە هاتووە بۆ ناوتان ماڵو ژیان دەڕژێنێ بەسەرتاندا)[4]، عوسمان توانی لەو بارودۆخە سەختەدا کە ویلایەتی بەسرەی پیا تێپەڕی والییەکی تازەی بۆ بەسەرە دامەزراندو هەموولایەن‌و پارچەکانی پێی رازیبوون‌و بەم شێوەیە ریزی خۆیان توندوتۆڵ کرد بەرامبەر دوژمنان، زیاتر لەمەش ئەو لابردنە ڕێزێك بوو بۆ ئەبی موسا بە پێچەوانەی ئەو عەوامانەی بە سوکایەتییان دەزانی، وەکو ئەوانەی، کە ئەلقەلەگوێی هەرچی‌و پەرچییەکان‌و بیرۆکە یاخی‌و وێڵبووەکان بوون، لە دەروونی خۆیاندا بەخراپیان

---

[1] المصدر نفسه.

[2] تأريخ الطبري (٥/٢٦٤).

[3] المصدر نفسه.

[4] المصدر نفسه (٥/٢٦٦)، سير اعلام النبلاء (٣/١٩).

دەزانیو ناوو ناتۆرەیان دەدایە پاڵیو نەنگییان پێوە دەپێچا[1]، کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی عامریش بوو بە والی بەسرە شارەکە بە بارودۆخێکی سەختدا دەڕۆیشت، ئەمە وای لە عوسمان کرد کە گۆڕانێکی بنەڕەتی بکات لە ئیدارەی ویلایەتەکەدا، هەستا هەرێمەکانی بەحرەینو عومانی خستە پاڵ بەسرەو دایە دەستی عەبدوڵڵای کوڕی عامر، بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن دەسەڵاتێکی بەهێز هەتا بتوانێ ڕووبەڕووی ئەو ململانێیانە بوەستێتەوە کە هاتووەتە پێشی لەو ماوەیەدا، ئەم دانە پاڵە کاریگەرێکی گەورەی هەبوو بۆ بەهێزبوونو جەماوەرگری عەبدوڵڵای کوڕی عامر لە ڕوویەکی ترەوە کاریگەری هەبوو بۆ خودی بەسرە بوو بە یەکێ لە پێتەختە سەقامگیرەکانی ئیسلامیو هۆزەکان لە هەموو لایەکەوە لە جاران زۆرتر کۆچیان دەکرد بۆ ئەوێ[2]، بەم چەشنە ئیشوکاری ویلایەت زیادی کرد چ لە ڕووی دیوانو چ لە ڕووی ڕێکخستنی کاروبارە جۆربەجۆرەکانی ترەوە ویلایەت لە ڕووی بەڕێوەبەرایەتیو داراییو ئاسایشو جگە لەمانەش، هەنگاوی نا ویلایەتی بەسرەو هەرێمەکانیو خودی عەبدوڵڵای کوڕی عامر فتوحاتی مەزنیان کردو ڕاستەوخۆ دوای دەستبەکاربوونیو والیەتییەکەی عەبدوڵڵا بە ماوەیەك پێش کوشتنی ئەمیری ئیمانداران ئیمامی عوسمان کۆتایی هات[3]، بەسرە لە ڕۆژگاری عەبدوڵڵای کوڕی عامردا پایەیەکی ناوازەی بەدەست هێنا لەناو ویلایەتە ئیسلامییەکاندا لە ئەنجامی هاوخەمیو ئاوڕدانەوەی عوسمانی خەلیفەو لە ئەنجامی ڕزگارکردنو فراوانبوونی لە هەموو بوارەکانداوە، بوو بە ناوەندێکی ئیداری دەوڵەمەندو زۆربەی ناوچە ئیسلامییەکان خێرو بێریان تیا دەچنییەوە[4]، عەبدوڵڵای کوڕی عامر بەرپرسی دابەشکردنی ناوچە جۆربەجۆرەکانی سەر بە ویلایەتەکەی بوو بە ڕێککەوتنی لە مێژینەی لەگەڵ ئیمامی عوسماندا، بەمجۆرە بەرپرسیارێتییەکەی زۆر گەورەبوو، عەبدوڵڵا خۆی فەرماندە بوو خۆی ئەمیری هەڵدەبژاردو دیاری دەکردن بۆ ناوچەکانی پاشکۆی ویلایەتەکەی، گرنگترینیان عومانو بەحرەینو سجستانو خۆراسانو فارسو

---

[1] الولاية على البلدان (١/١٨٩).

[2] التنظيمات الجتماعية والاقتصادية في الجرة في القرن الاول الهجري صالح العلى ص (١٤١).

[3] الولاية على البلدان (١/١٨٩).

[4] المصدر نفسه (١/١٩٣).

ئەهواز بوو، ئەم ناوچانەش چەندین شاری جیاوازو مەملەکەتی فراوانی تێدابوو[1]، ئاژو گوێز هەبوو لە نێوان ئەمیرو دارۆغەکاندا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی ترو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بەپێی بەرژەوەندیی ئەو رۆژە، وەك ئاشکرایە لە رۆژگاری عەبدوڵڵای عامردا بەیتولمالی بەسرە داهاتی زیادی کردو خەرجیشی زیادی کرد، بەرپرسی بەیتولمال لە سەردەمی عوسمان زیادی کوڕی ئەبی سوفیان بوو، ئەم زیادە لە باتی عەبدوڵڵای کوڕی عامر هەندێ پرۆژەی هەڵکەندنی رووبارەکانی ئەنجامداوە[2]، هەروەها لە ویلایەتی عەبدوڵڵای کوڕی عامر سکەی درهەم لە سەرانسەری فارسی سەر بە ویلایەتی بەسرە لێدراو وشەی عەرەبی لێ نوسرا، لە ماوەی نێوانساڵی ٣٠ی کۆچی تا ٣٥ی کۆچی[3]، عەبدوڵڵا لە رۆژی یەکەمی چوونە بەسرەوە لە دڵی زۆرینەی خەڵکی بەسرەدا خۆشەویست بوو، هەرچەندە لە چواردەوری قسەڵۆك دەکرا کە گوایە عوسمان لەبەر خزمایەتی کردوویەتی بە والی، بێتاقەتی دەکرد، بەڵام ئەهلی بەسرە بە گەرمی شوێنی کەوتبوون[4]، لەم پەسەندکردنەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە ویلایەتی بەسرە لە سەردەمی عوسماندا لە دوو پیاودا کورتی هەڵهێناوە ئەوانەش ئەبو موسای ئەشعەریو عەبدوڵڵای کوڕی عامر، هەریەك لەم دوانەش رۆڵێکی سەرەکییان هەبوو لە رێککردنی کاروباری بەسرەرو دەوروبەرەکەیدا[5].

**نۆیەم: ویلایەتی کوفە**

کاتێ بەیعەتی خەلافەت درا بە عوسمان موغەیرەی کوڕی شوعبە والی کوفە بوو، لە دوادوایی سەردەمی عومەردا والیەتی گرتبووە دەست[6]، عوسمان هەستا موغەیرەی کوڕی شوعبەی لابردو سەعدی ئەبی وەقاصی خستە شوێنەکەی، باسی هۆی لابردنەکەشی کراوە، کە بە وەسیەتی عومەر لابراوە، عومەر وەسێتی کرد بۆ

---

[1] نهاية الإرب (٤٣٣/١٩).

[2] الولاية على البلدان (١٩٤/١).

[3] الدراهم الاسلامية، و داد على القزاز ص (١٤).

[4] الولاية على البلدان (١٩٤/١).

[5] المصدر نفسه (١٩٥/١).

[6] تاريخ الطبري (٢٣٩/٥).

خەلیفەکەی پاش خۆی کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بکاتە والی کوفە لەبەر ئەوەی عومەر لە ئاخیری خەلافەتەکەیدا سەعدی لە والیەتی کوفە لابردبوو وتبووی (من لەبەر گزیو نالەباری سەعدم لانەبردووە، وەسیەت دەکەم بۆ خەلیفەکەی پاش خۆم بیخاتەوە کوفە بە والیەتی)[1]، سەعدی ئەبی وەقاص بوو بە والی کوفەو بڕیاری دامەزراندنیشی بەهاوبەشی نێوان سەعدو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بوو، واتە هەردووکیان هاوبەش بوون لە ئیدارەکردنی کوفەدا، سەعد بۆ نوێژو سەربازەکان عەبدوڵڵاش بۆ بەیتولمال[2]، سەعدی ئەبی وەقاص خاوەنی سەلیقە، لەبەڕێوەبردنی کوفەدا، هەروەها شارەزاییەکی تەواوی هەبوو لە کاروباری هاوولاتیانو سەربازەکانو دەروونی دانیشتوانەکەیدا[3]، چونکە لە سەردەمی عومەردا خۆی دامەزرێنەری ویلایەتی کوفە بوو.

ئەوکاروچالاکیانەی سەعد لە ماوەی والیەتییەکەیدا پێی هەستا لە سەردەمی عوسماندا ئەوەبوو سەردانی ئەو دەڤەرانەی کرد کە سەر بە ویلایەتی کوفەیەو هەندێ کاری بۆ کردن، لەوانە ئاودێری بوو کارو ئاتاجی ڕێکخستن بوو، کە زەبتی کرد بۆیان، لە ساڵی (٢٥)ی کۆچی[4]، هەروەها هەستا بە دامەزراندنی کۆمەڵێ ئەمیرو کاربەدەستی تازە لە (هەمەدان)و دەوروبەری، ماوەی والیەتی سەعدی ئەبی وەقاص درێژەی نەبوو، چونکە لە نێوان ئەوو عەبدوڵڵای مەسعوددا ناکۆکی هاتە ئاراوە، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود سەرپەرشتیاری بەیتولمال بوو، سەعد هەندێ پارەی قەرز کردبوو لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هەتا کاتێکی دیاری کراو، کاتی قەرزبژاردنەکە هاتە پێشو سەعد نەیتوانی قەرزەکە ببژێرێ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هاتو داوای قەرزەکەی لێ کرد، بوو بە دەمەقرەیانو خەڵك لێیان کۆبوویەوە، بۆیە عوسمان بڕیاریدا سەعد لاببات‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بهێڵێتەوە، سزای سەعد لابردنەکەی بوو، سزای عەبدوڵڵاش هێشتنەوەی بوو لەسەر کارەکەی، وەکو نەبەری وتویەتی[5]: ئەم چیرۆکە بەڵگەیە لەسەر

[1] المصدر نفسه (٥/٢٢٥).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٥٠)، الولاية على البلدان (١/١٩٦).

[3] عثمان بن عفان ، صادق عرجون ص (١٠٥)، الولاية على البلدان (١/١٩٦).

[4] الولاية على البلدان (١/١٩٧).

[5] تاريخ الطبري (٥/٢٥١).

خۆپارێزی ئەم دوو هاوەڵە، بەڵگەیە لەسەر موحتاجی سەعد بۆ ماڵو بژێوی و کەم ژیانی بۆیە ناچار بووە لە بەیتولمال قەرزی کردووە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر پەرێشانی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بۆ پاراستنی سامانی موسڵمانانو پەرۆشی بۆ گەڕاندنەوەی قەرزەکانی، گەرچی کەوتبێتە لای سەعد، کە والی کوفەیەو حاکمیەتی، والیەتی سەعد لەسەر کوفە ساڵێكو مانگێ بووە[1]، دوای لابردنی سەعد عوسمان وەلیدی کوڕی عەقەبەی ئەبی موعیتی کردە والی کوفە پێشتر بەر لەوەی ببێتە والی کوفە فەرماندەی سوپایەك بووە لە سوپاکانی ئەبوبەکر لە ئوردون، پاشان عومەر کردوویەتی بە سەرکاری عەرەبەکانی دورگە[2]، لە کۆتایی خەلافەتی عومەرو بەرایی خەلافەتی عوسماندا وەلید یەکێك بووە لە فەرماندەی سەربازەکانی کوفە، جیهادی زۆری کردووە لەو جێگەو ڕێگەیانەدا[3] فەرماندەی ئەو هەرێمانەبووە بەر لەوەی لە کوفە دامەزرێتو بکرێتە والی کوفە، خاوەنی شارەزایی بوو، دەربارەی کوفەو هەرێمەکانیو سەربازەکانیو کاروبارە هەمەچەشنەکانی نەریتی خولەفای راشیدین وابوو خاوەن خیبرەیان هەڵدەبژاردو بەسەر ئەوانی تردا، لە کاتی پێویستدا والی تازەو لێهاتوویان دادەمەزراند.

عوسمان وەلیدی کوڕی عەقەبەی هەڵبژارد بۆ ویلایەتی کوفە، زۆربەی ئەوانەی لە بارەی دامەزراندنی عوسمانەوە نووسیویانە نووسەرانی پێشوویان ئەمانەی دوایی هەوڵی ئەوەیانداوە ئیمامی عوسمان تۆمەتبار بکەن لە دامەزراندنی وەلید بۆ کوفەو دەڵێن: (عوسمان بۆیە وەلیدی کردووە بە والی کوفە برای دایکی خۆی بووە)[4]، ئەمە تەشەرێکی راستەوخۆی تێدایە بۆ ئیمامی عوسمان[5]، لەسەرەتای والیەتی وەلیددا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هاوبەشی بوو سەرپەرشتیاری بەیتولمال بوو، هەتا ئەوکاتە مشتومڕێ کەوتە نێوان وەلیدو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لەسەر کارێك، کە پەیوەندیی بە داهاتی وڵاتەوە بوو کێشەکەیان بەرزکردەوە بۆ لای ئیمامی عوسمان بۆ ئەوەی باشیان

---

[1] المصدر نفسه (٥/٠ ٢٥).

[2] المصدر نفسه (٢٥١/١).

[3] الولاية على البلدان (١٩٨/١).

[4] المصدر نفسه (١٩٨/١).

[5] انظر الا تهامات التي القاها (طه حسين، في كتابة الفتنة الكبرى) (٩٤/١).

بۆ دابنێ، ئیمامی عوسمان وای بەباشزانی ویلایەتەکەو بەیتولماڵ یەك چاو بکاتەوەو یەکگرتووی بکاتو بیداتە دەستی وەلیدو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی لابرد، بیروبڕوای وابوو بەرژەوەندیی گشتیی لەوەدایە[1]، کە شەریکیو دووبەشیەکە نەهێڵێتەوە، وەلید مایەوە لە کوفەو لە دڵی خەڵکی کوفەدا خۆشەویست بوو، خانووەکەی دەرگای پێوە نەبوو[2]، لە هەموو کاتێکدا خەڵك دەهاتنەماڵی بۆ حەلی کێشەکانیانو بەباشی هەڵدەستا بە ئەرکی سەرشانیو هەتا هەندێ رووداو هاتە گۆڕێ لە کوفە، کە هەندێ کینە بازو داخ لە دڵ نایانەوە بۆی، رووداوەکەش ئەوەبوو کۆمەڵێ گەنجی سەرسەری هەستان بە کوشتنی ئیبنو حوسەیمان، وەلیدیش بە ڕەزامەندی عوسمان تۆڵەی لەم گەنجە دەستدرێژی کەرانە کردەوەو کوشتنی، لەو رووداوە بەدواوە کەسوکاری ئەم گەنجانە، کە تاوانبار بوون خزمەکانیان پڕوپاگەندەیان رازاندەوە لەسەر وەلیدی کوڕی عەقبەو هەوڵیان دەدا ڕاوی هەڵەکانی وەلید بکەن، بە هەموو توانایەك نهێنگرییان دەکرد، خاوەن کوژراوەکان توانییان قەزییەی دژایەتی وەلید گەشە پێ بکەن، یەکێ لەو هەولاّیانە ئەوەبوو وتیان ئارەقی خواردووە، بەم بۆنەیەوە داری حەددی لێدراو لە والیەتی کوفە لابرا، موئامەرەچییەکان ئەمەیان دەویست[3]، لەمەودوا بە وردی باسی قەزیەی ئارەقخواردنەکەی وەلید دەکەین لە باسی والییەکانی ئیمامی عوسماندا (ان شاو الله)، دوای لابردنی وەلید عوسمان نامەیەکی نارد بۆ ئەهلی کوفەو نووسیبووی: لە بەندەی خواوە عوسمان ئەمیری ئیمانداران بۆ خەڵکی کوفە سلاّو، پاش ئەوەی وەلیدی کوڕی عەقبەم کردە والیتان، ویستی سەرپێچی بکات رێگام نەدا، هاتەوە سەر رێگای راست، ئێستا لە باشترین پیاوەکانی هۆزەکەی خۆیەتی، پێم وتبوو باش بێت لەگەڵتانو هیچم بەئێوە نەوتبووە بۆ ئەوی بکەن، هەر کە خێرو چاکەی بۆ رژاندنو لە خراپە دوری گرتنو لەچاکەکرندا لێی بردنەوە ئێوە بە خراپەکردن بەنهێنی تاوانبارتان کرد، خوا لەئێوە

---

[1] عثمان بن عفان، صادق عرجون ص (١٠٨).

[2] تاريخ الطبري (٢٥١/٥).

[3] الولاية على البلدان (٢٠١/١).

زاناتره. ئێستاش سەعیدی کوڕی عاص دەکەمە ئەمیرتان[1]، سکاڵای ئەهلی کوفە دەربارەی وەلیدو لابردنی ئەڵقەیەك بوو لەو زنجیرە سکاڵاو لابردنە دووورودرێژانەی کە ئەهلی کوفەتەشکیان پێوە گرتبوو بەرامبەر بە ئەمیرەکانیان[2]، زۆرێك لە خەڵکی کوفە پەستو تووڕە بوون بۆ لابردنی وەلید، دوای وەلید ئیمامی عوسمان سەعیدی کوڕی عاصی دیاری کرد بۆ ئەمیری کوفە ساڵی (٣٠) کوچی، ئەوکاتە سەعید نیشتەجێی مەدینە بوو باری کرد بۆ کوفە، نوێنەری ئەهلی کوفە بوو بە هامڕای سەعید، نوێنەرەکەش ئەو کەسە بوو، کە هاتە لای کە هاتە لای ئیمامی عوسمانو سکاڵای لە وەلید کردو ئەشتەری نەخەعیو غەیری ئەویشیان لەگەڵ بوو[3]، کاتێ سەعید گەشتە کوفە چووە سەر مینبەرەکەو سوپاسی خودای کردو ستایشی پێغەمبەری ﷺ کرد، پاشان وتی: (وەڵلاهی من نێردراوم بۆ لای ئێوە، بەڵام پێم ناخۆشەو بێتاقەتم پێی بەڵام (ناچارم کە فرمانم پێکرا فرمان بەرداربم ) ئایا دەزانن ئاژاوە لوتو چاوەکانی هێناوەتە دیار وەڵلاهی ئەکێشم بەناو چاویا هەتا قەڵاچۆی دەکەم یان تەمێی دەکەم، ئەمڕۆ من جڵەوگیری دەروونی خۆمم)، پاشان لە مینبەرەکە دابەزی[4].

لە ڕاڤەی ئەم وتارەدا بۆمان دەردەکەوێ کە سەعید دەرکی بەسەروبەندی ئاژاوە کردبوو، کە لە کوفە سەری هەڵداوە پێش ئەمارەتی ئەم دەستی پێکردووە[5]، هەروەها وتارەکەی هەڕەشەئامێز بوو بۆ ئاژاوەچییەکانو جەسور بوو بۆ بنەبڕکردنی ئەو ئاژاوەیە، کە هەستی بەسەرەتاکەی کردبوو، سەعید توانی کارەکانی ڕێکبخاتو ئەمیرو والی بۆ گشت شارو شوێنەکانی سەر بە کوفە دیاری بکاتو کاروباریان سەرلەنوێ ساز بکات[6]، کۆمەڵێ غەزای سەرکەوتوویی کرد، وەکو لە باسی فتوحاتدا باسمان کردوە،

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٢٨٠).

[2] الولاية على البلدان (١/٢٠٦).

[3] تأريخ الطبري (٥/٢٨٠).

[4] تأريخ الطبري (٥/٢٨٠).

[5] الولاية على البلدان (١/٢٧).

[6] المصدر نفسه (١/٢٠٨).

پاشان بەرەبەرە ئاژاوەو فیتنە سەری هەڵدا کە لە کوفە ساڵی (٣٣) کۆچی، بە دووروودرێژی باسی دەکەین.

ئەشتەری کوڕی نەخەعی موئامەرەیەکی تەندەوە دژی سەعیدی کوڕی عاص بە کۆمەڵێ خەڵکی ڕەشۆکیو نەفام، ئەشتەر فریبی دانو بوونە هاودەنگی ئەشتەر، بۆ بەرکەنارکردنو لابردنی سەعید، سەرەتا داوایان کرد لە ئیمامی عوسمان سەعید بگۆڕێ بە یەکێکی تر، سەعیدیش والیەك بوو لەو والیانەی کە زووتر ئەهلی کوفە رەخنەیان لێدەگرتو بیانووی لابردنیان دەگرت، وەکو کردیان بە سەعدی ئەبی وەقاصو وەلیدی کوڕی عەقەبەو جگە لەمانەش، بەرکەنارکردنی سەعیدو هاوشێوەکانی شۆڕشێك بوو کودەتایەك بوو هەرچیو پەرچییەکان چەکیان بۆ هەڵگرتو ئەم کردارە رابردوویەکی گەندەڵە لە مێژووی کوفەدا، بەڵکو لە هەموو مێژووی ئیسلامدا ئەهلی کوفە هۆکارێکی حەقیقییشیان بەدەستەوە نەبوو تەنیا هۆکارەکە گەشەسەندنی ئەو بارە ناهەموارە بوو، کە دەروونی خەڵکی ئاخنرابو، بە گومانو بوهتان بە تەئسیری جارچییەکانو بە فیتی هەڵگەڕاوەکان، ئیمامی عوسمان فەرمانی دەرکرد ئەبو موسای ئەشعەری ببێتە والی کوفەو سەعیدی کوڕی عاص لابرێت بە خواستی هەندێ لە ئەهلی کوفە، ئەبو موساش کاروباری ویلایەتی گرتە دەستو وتارێکی خوێندەوە بۆ ئەهلی کوفەو وتی: (ئەی خەڵکینە ڕامەپەڕن بۆ ئەم جۆرە کارانەو مەگەڕێنەوە سەر بابەتی ئاوەها پابەندی کۆمەڵی موسڵمانان بنو گوێڕایەڵ بن ئامانتان بم هەرگیز پەلە مەکەن ئارامگربن، چونکە ئێوە ئەمیرتان هەیە، وتیان نوێژمان بۆ بکە، وتی: نایکەم هەتا گوێڕایەڵیو ملکەچی نەکەن بۆ ئیمامی عوسمان، وتیان ئەوا گوێڕایەڵو گوێلەمشتی عوسمانین)[1]، عوسمان نوسراوێکی نووسی بۆ ئەهلی کوفە (بسم الله الرحمن الرحيم، پاشان ئەو کەسەی، کە خۆتان هەڵتان بژارد کردومە بە ئەمیرتان، رزگارم کردن لە سەعید وەڵلاهی نەرمونیانی خومتان بۆ ڕادەخەم، سەبری خۆمتان بۆ شل دەکەم، بە کۆششی خۆم چاکسازیتان دەکەم، هەرشتێ ئێوە پێتان خۆشبێتو داواتان کردبێت، زانیبێتم گوناهی تیا نییە بۆم کردوون، هەرشتێکیش پێتان ناخۆش بێت زانیبێتم

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٣٩).

گوناهی تیا نییە چاوپۆشیم کردوون، ئەمانەشم لەوکاتەدا کردووە، کە ئێوە پێتان خۆشبووە بۆ ئەوەی هیچ گلەییتان بەسەرمەوە نەبێت)[1].

ئەبو موسا بە هەمیشەیی والی کوفە بوو هەتا شەهیدبوونی ئیمامی عوسمان[2] بەم جۆرە ویلایەتی کوفە لە سەردەمی عوسماندا پێنج والی گۆڕیوە یەکەمین موغەیرەی کوڕی شوعبەو دواهەمین ئەبو موسای ئەشعەری بوو، لە ماوەی والیەتی هەریەك لە مانەشدا ژمارەیەك رووداوو کارەسات روویداوەو کاریگەری راستەوخۆیان هەبووە لەسەر رەوتی ولاّتی ئیسلامیی، ئاژاوەو فیتنە لە کوفە چەکەرەی کردو بەناو دانیشتوانەکەیدا پەلی راخستو لێ خوێندنو بەرهەڵستکاری ئەمیرەکان بوو بە نەریتی خەڵکەکەیو زۆرجار ئەمیریان رەفز دەکردەوە بە کەیفی خۆیان، بۆ نموونە شکاتیان کرد لە سەعدی ئەبی وەقاص، شکاتیان کرد لە وەلیدی عەقەبە، سەعیدی کوڕی عاصیان دەرکرد، هەر ئەمانەبوون پێش عوسمان عومەریان وەڕەس کردبوو، هەندێ لە خەڵکی کوفە رۆڵێکی راستەوخۆو سەرەکییان هەبوو لە کوشتنی ئیمامی عوسماندا، شایانی باسە کە هەندێ ویلایەتی لقی سەر بە ویلایەتی کوفە بوون، وەکو تەبرستانو ئازربیجانو هەندێ ناوچەی تری باکوور لە شارەکانی فارس[3]، ئەو گرێیەی، کە ئەم ویلایەتانەی دەبەست بە کوفەوە ئەوەبوو والیەکانی کوفە وەکو سەعیدی کوڕی عاص ئەوان دەچوون لە ناحیەکانی کوفە فتوحاتیان دەکردو لە کاتی سەرپێچیدا خەڵکەکەیان تەمێ دەکردو دەیان مۆچاندن، ئەم ویلایەتە فەرعیانە دەورێکی خول خواردوو یان هەبوو بە کوفەوە[4].

لە میانەی باسی ویلایەتە ئیسلامییەکانی سەردەمی عوسماندا بۆمان دەردەکەوێ هەندێ ویلایەت هەبووە لە زەتی لە سەقامگیری وەرگرتووەو بە درێژایی سەردەمی ئیمامی عوسمان وەك ئەو ویلایەتانەی، کە کەوتوونەتە دەڤەری عەرەبی وەکو بەحرەینو یەمەنو مەککەو تائیفو غەیری ئەمانە، هەروەها شامیش، لە زەتی لە سەقامگیری

---

[1] تاريخ الطبري (٣٤٣/٥).

[2] المصدر نفسه.

[3] الولايات على البلدان (٢١٣/١).

[4] المصدر نفسه.

وەرگرتووە، لە خەلافەتی عوسماندا، بەڵام بەسرە خەڵکەکەی لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی عامری والیاندا هەر سەرقاڵی فتوحات بوون، بەڵام میسرو بەسرە لە دوا دوایی خەلافەتی عوسماندا پڕبوو لە گێرەو کێشە بەم چەشنە فیتنە لە هەردووکیاندا سەری هەڵدا، کۆمەڵێ لە خەڵکی ئەم دوو شوێنە هاتن بۆ گرتنی مەدینەو کوشتنی ئیمامی عوسمان لە باتی غەزای دوژمنان بکەن هاتن بۆ غەزای پایتەختی ئیسلام[1].

---

[1] المصدر نفسه (١/٢١٤).

## باسی دووەم: سیاسەتی عوسمان لەگەڵ والییەکاندا بۆ دیاریکردنی مافەکانیان و ئەرکەکانیان

### یەکەم: سیاسەتی عوسمان لەگەڵ والیەکاندا

ئیمامی عوسمان لە سەرەتای ساڵی (٢٤)ی کۆچیدا دەسەڵاتی خەلافەتی گرتە دەست، ئەوکاتە والییەکانی عومەر لە شارە ئیسلامییەکاندا بڵاوەیان کردبوو، عوسمانیش ساڵێکی تەواو بێدەنگ بوو لەوالێتییان، پاشان دەستی دایە لابردن و دامەزراندن لە شارەکاندا بە گوێرەی ئەو دەسەڵاتەی پێیدرابوو، هەروەها بە پێی ئەو بەرژەوەندییانەی، کە ڕەچاوی کردبوو بۆ موسڵمانان، لەوانەیە عوسمان کەوتبێتە شوێنی وەسێتی ئیمامی عومەر، کە وەسێتی پێکردبوو لە ساڵێ زیاتر بێدەنگ مەکە بۆ هیچ کارگێڕێکم، بەڵام بۆ ئەبو موسا چوار ساڵ بێدەنگ بکە[1]، عوسمان لە سیاسەتیدا بەرامبەر والییەکان لە زۆربەی هەڵسوکەوتەکاندا گرنگی دەدا بە ڕاوێژی هاوەڵان، هەروها هەندێ ویلایەتی دەخستە سەر ویلایەتەکانی تر، چونکە بەرژەوەندیی موسڵمانانی تیا بەدی دەکرد، لەبەر ئەوە هەندێ لە والییەکانی دامەزراندووە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە هەندێ ناوچەدا، بەم تەرزە بەحرەینی خستە پاڵ بەسرەو هەندێ ویلایەتی شامی خستە سەر ئەوانی تر بە بۆنەی مردنی هەندێ لە والییەکان یان بە بۆنەی دەست لەکارکێشانەوەی هەندێ لە والییەکان، عوسمان هەمیشە ئامۆژگاریی والییەکانی دەکرد دادپەروەر بن و لە نێو خەڵکدا بە بەزەیی بن، یەکەمین نوسراوێك کە نووسی بۆ والییەکان دوای بەیعەت پێدانی خەلافەت، ئەمەبوو (پاش سوپاسی خودای گەورە، خودای گەورە فەرمانی کردوو پێشەواکان خەمخۆرو شوانی خەڵکی بن و نەیانچەوسێننەوەو دیکتاتۆر نەبن بەسەریانەوە، ئەوەڵی ئەم ئوممەتە ڕەوشتیان دڵسۆزانە بووە نەك ملهوڕانە، زۆر نزیکە پێشەواکان ببنە چەوسێنەر نەبنە غەمخۆر ئەگەر ستەمی وایان کرد شەرمو وەفاو ئەمانەت باردەکات، ئایا دەزانن پوختەترین ژیانتان ئەوەیە کە لە کاروباری موسڵمانان وردببنەوە لە هەرکوێدا قەرزاری گەل بوون بیان دەنەوە، ئەگەر هەقیان کەوتووەتە سەر لێیان وەرگرێتەوە، پاشان ئاوڕبدەنەوە لە ئەهلی زیمە ئەوەی

---

[1] سیر أعلام النبلاء (٢/٣٩١).

مافی خۆیانە بیاندەنەوەو ئەوەشی کەوتووەتە سەریان لێیان وەرگرنەوە، پاشان ئەو دوژمنانەی پەشیمان بوونەتەوە وەفا دەردەبڕن بۆیان)[1].

لەو لێدوانەدا دەبینین عوسمان کۆمەڵێ ڕێنمایی سیاسیی دەستنیشان کردووە بۆ والییەکانو بە پێویستی زانیوە لەسەری بڕۆن، مافەکانی موسڵمانان بدەنەوەو ئەرکی خۆیان بخەنە سەریانو مافەکانی ئەهلی زیمە بدەنەوەو ئەرکی خۆیان بخەنە سەریان، وەفایان هەبێ لەگەڵ دوژمناندا و بۆ هەقی هەموولایەك دادپەروەر بن نابێ خەونو خەیاڵیان سامان بچڕین بێت)[2]، بە هەمان شێوە عوسمان نوسراوێکی نووسی بۆ کاربەدەستەکانیو هەندێ زانیاری تایبەتی بۆ نووسین دەربارەی ئەو کاروبارە تازانەی کە پەیوەندی هەیە بە ئیدارەی ویلایەتەکانەوە، وێڕی نوسراوە گشتییەکانی تر، کە زانیاری نوێی تیا دەنووسیو دەبوو گشت لایەك پەیوەست بێت پێیەوە، یەکێ لە پەیوەستبوونە گشتییانە ئەوەبوو خەڵکی پەیوەست کرد لە هەموو ویلایەتەکاندا دەست بگرن بەو قورئانەی کە لە مەدینە نوسراوەتەوە[3] بە دیار چاوی هاوەڵە بەڕێزەکانە، بەم دەستوورە قورئانی هەنارد بۆ کوفەو بەسرەو مەککەو میسرو شامو بەحرەینو یەمەنو جەزیرە، هەموویانی خستە سەر قورئانەکەی مەدینەو فەرمانی کرد هەموو قورئانە نووسراوەکانی تر کۆبکەنەوەو ئاگری بدەن، ئەمەش بە کۆدەنگی هاوەڵانی مەدینە کرا، هەروەك ئیمامی عەلی گێراویەتییەوە[4]، عوسمان زۆر پەرۆش بوو بۆ مونافەسەکردنی ئەمیرەکان لە نێو خۆیاندا بۆ جیهادو رزگارکردنی شارەکان، هەربۆیە نوسراوێکی نووسی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عامر کە والی بەسرەیوو، بۆ سەعیدی کوڕی عاص لە کوفە پێی وتبوون (هەرکامتان پێشتر بچنە خۆراسان ئەوتانە دەکەمە ئەمیری خۆراسان ئەمەش بوو بە پاڵنەرێ بۆ عەبدوڵڵا، کە خۆراسان فەتح بکاتو سەعیدی کوڕی عاسیش فەتحی تەبرستانی کرد[5]. عوسمان هەندێ جار کۆمەڵێ مەرجی دادەنا بۆ ئەوەی لە

---

[1] تأريخ الطبري (٥/٢٤٤).

[2] الولايات على البلدان (١/٢١٥).

[3] تأريخ المدينة، أبوزيد البصري (٣/٩٩٧).

[4] المصدر نفسه (٣/٩٩٥ ـ ٩٩٦).

[5] تأريخ اليعقوبي (٢/١٦٦).

هەڵسوکەوتیدا بەرژەوەندیی موسڵمانان لە بەرچاو بگرێت، بۆ نموونە مەعاویەی ئەبی سوفیان نوسراوێکی بۆ نارد بۆ ئەوەی رێگەی بدات شەڕی دەریایی بکات، عوسمانیش نووسی بۆی: ئەگەر خۆت و خێزان و ماڵەکەت دەبەیتە ناو دەریا ئەوا سەربازەکانیش ببە ناوی، هەتا خاووخێزانت لە پێشا نەبەیت نابێ کەس بخەیتە ناو دەریا ئەویش چووە دەریاو خێزانەکەی لەگەڵ خۆی برد)[1].

**دووەم: ئەو شێوازانەی کە عوسمان بەکاریدەهێنا بۆ چاودێریکردنی کاربەدەستەکانی و سۆراغی دەنگوباسیان پێدەکرد**

عوسمان کۆمەڵێ شێوازی گرتبووە بەر بۆ چاودێریکردنی والییەکانی، هەروەها بۆ زانینی حاڵ و ئەحواڵیان، یەکێ لەو شێوازانە

١ـ ئامادەبوونی لە وەرزی حەجکردندا

ئیمامی عوسمان پەرۆش بوو بۆ حەج کردن و گەشتن بە حاجیان بۆئەوەی گوێ بیستی سکالایان بێت و پرسیاری دادوەری والییەکانیان لێ بکات، بۆ ئەم مەبەستەش داوای دەکرد لەکاربەدەستەکانی لە وەرزی حەجدا لە بارەی بارودۆخی خۆیانەوە نامەی بۆ بنێرن، هەروەها نووسی بۆ شارەکانیش لە هەموو وەرزێکی حەجدا لە بارەی کاربەدەستانەوە نامەی بنێرن و شکاتیان لە کێ هەیە تیا بنووسن[2]، ئەم کارە بەردەوامبوو، سەرەتا لە سەردەمی عومەرەوە دەستی پێ کرد لەسەردەمی عوسماندا درێژەی پێدرا، وەکو دیداریکی سالانە لە نێوان خەلیفەو والی و جەماوەردا دەبەسترا[3].

٢ـ پرسیاری لە رێبواران دەکرد، کە لەشارو ویلایەتەکانەوە دەهاتن ئەم رێگەیان پرسیارە بە ئاسانترین شێوە دادەنرێت، کە ئەرکی نەدەخستە سەر شانی خەلیفەکان زۆر، زۆربەی حاربە بێ پێشەکی و بێ ئاگاداری دەهاتن زانراوە، کە خولەفای راشیدین هەر چواریان کاریان بەم شێوەیە کردووە، بونی خەلیفە لە مەدنیەی منەوەرە خۆی لە خۆیدا

---

[1] الولايات البلدان (٢١٦/١)، الخراج وصناعة الكتاب ص (٣٠٦).

[2] الولايات البلدان (٢١٦/١)، نقلا عن تأريخ الطبري.

[3] أعصر نفسه (٢١٦/١).

ببوه هۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ هەرسێ خەلیفەکە، چونکە نوێنەری شوێنانی بە ئاسانی دەبینی، کاتێ دەهاتن بۆ زیارەت، بە تایبەتی لە وەرزی حەجدا[1].

٣ـ پەیامنێری هەبوو لەناو ئەهلی شارەکان، نوسراویان بۆ دەنووسی هەواڵیان دەدایە، عوسمانیش دەچوو بە پیر ئەو نووسراوانە کە بۆی دەهات لە لایەن هاوولاتیانی خەڵکی شارەکانەوە، لە سکالاکانیانی دەکۆڵییەوە، بە هەمان شێوە عوسمان پێشوازی کرد لەو نووسراوەی ئەهلی کوفە بۆیان نارد، هەروەها ئەو نووسراوەش کە ئەهلی میسر بۆیان نارد، هەروەها نووسراوەکەی ئەهلی شام، عوسمان لەنووسراوەکان وردبوویەوە چارەسەری دەکردن[2].

٤ـ ناردنی لیژنەی پشکنین (مفتش) بۆ ویلایەتەکان عوسمان ژمارەیەك پشکێنەری رەوانە کرد بۆ هەندێ ویلایەتەکان بۆ زانینی حاڵو باڵیانو شارەزابوون لەو پروپاگەندانەی کە دەکرا بۆ والییەکان بەرامبەر لە گەلەکانیان، ئەم لیژنانە بە راپۆرتی تێرو تەسەلەوە لە بارەی وەزعی هاوولاتیانەوە دەگەرانەوە[3]، بۆ ئەم مەبەستە عەمماری کوری یاسری نارد بۆ میسرو موحەممەدی کوری مەسلەمەی نارد بۆ کوفە، ئوسامەی کوری زەیدی نارد بۆ بەسرە، عەبدوڵلای کوری عومەری نارد بۆ شام، وێرای ئەمانەش کۆمەڵێ پیاوی تری نارد بۆ شوێنەکانی دیکە[4].

٥ـ سەفەرکردن بۆ ویلایەتەکانو پرسیارکردن لە بارودۆخیان، راستەوخۆ عوسمان لە کاتی حەجدا سەردانی مەککەی دەکردو پرسیاری گوزەرانی لێدەکردن، وتووێژی دەکرد لەگەڵ والییەکانداو لەگەڵ حاجی شارەکاندا، و پرسیاری حاڵو ژیانی لێ دەکردن.

٦ـ داوای نوێنەری دەکرد لە ویلایەتەکانەوە بێن بۆ ئەوەی پرسیار بکات لە والیو ئەمیرەکانیان.

---

[1] الولآية على البلدان (٢/٢١٧).

[2] المصدر نفسه (١/٢١٧).

[3] المصدر نفسه.

[4] المصدر نفسه.

خەلیفە راشیدینەکان زۆرجار داوایان دەکرد لە والییەکان، کە کەسانێك لە خەڵکی شارەکان بنێرن بۆیان، بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکەن، عومەرو عوسمانو عەلی چەندین جار ئەمەیان کردووە، بەڵام ئەبوبەکر سەرقاڵی کاروباری جیهادبوو نەیدەپەرژایە سەر ئەم کارە، هەروەها تەمەنی خەلافەتەکەی کەمبوو، بۆیە کەم لەم کارانەی کردووە[1].

٧ـ بانگهێشتکردنی والییەکانو پرسیارکردن لە ئەحواڵی شارەکەیان.

ئەم شێوازە مەشهور بوو لە سەردەمانی هەر چوار خەلیفە راشیدینەکەداو پەیوەندی بەردەوام هەبووە لە نێوان عوسمانو والییەکاندا بۆ باسی کاروبارە هەمەچەشنەکانی وڵات، گرنگترین ئەم پەیوەندییانەش ئەو کۆبوونەوانەبوون، کە عوسمان دەیبەست لەگەڵ والییەکاندا لە مەدینەو بانگهێشتی والی بەسرەو کوفەو شامو میسرو غەیری ئەمانەشی کرد، هەروەها بانگهێشتی هاوەڵە مەزنەکانی کردو کۆبوونەوەیەکی لەگەڵدا بەستو سەروبەندی ئاژاوەی تاووتوێ کرد لەگەڵیان، کە تازە سەری هەڵدابوو، ڕای والییەکانی وەرگرت لە بارەی ئاژاوەو چوونیەتی چارەسەرکردنی بەوە هەر والییەك بۆ چونێکی دەربڕی بۆ چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیە[2].

٨ـ نامەگۆڕینەوە لەگەڵ والییەکان.

داوای ڕاپۆرتی لێدەکردن لە بارەی گوزەرانی گەلو ئەحواڵی شارەکانیانەوە ئەم شێوەیە لە سەردەمانی هەر چوار خەلیفە راشیدینەکاەدا مەشهور بووە، زۆر بە گەرمی ئەم شێوەیە لە سەردەمی ئەبوبەکرو عەلیدا پیادە دەکرا[3]، ئەم ڕێگەیە گرنگترین شێواز بوو کە عوسمان لە سەری دەڕۆیشت بۆ چاودێریو بەدواداچوونی والییەکانی، عوسمان جەسوربوو لەسەر ئەوەی والییەکان هەستن بە ئەرکەکانیان لە سەرپێچییەکان ئاگاداری بکەنەوە، بۆ ئەوەی بەپێی زانیاری خۆی ڕێنماییان بکات هەڵەکانیان بۆ ڕاست کاتەوە، ئەگەر سەلما لەسەر والییەکان کە سەرپێچییەکیان کردووە فەرمانی سزادانی داون بەبێ ئەوەی بڕوانێتە چالاکییەکانیو گومانە باشەکان، بۆ نموونە حەددی ئارەقخواردنەوەی دا

---

[1] الولاية على البلدان (١٢٢/٢).

[2] المصدر نفسه (١٢٣/٢).

[3] المصدر نفسه (١٢٢/٢).

لە وەلیدی کوڕی عەقەبە دوای بەدیهاتنی مەرجەکان بەبێ ئەوەی بڕوانێتە ئەوەی ئایا شاهیدەکان راستگۆن یان بە پێچەوانەوە[1] دوای حەدد لێدان لە والییەتی کوفەش لایبرد[2]، قۆناغ قۆناغ نوسراوی دەنووسی بۆ ئەهلی شارەکانو والی تازەی بۆ دادەمەزراندن بۆ ئەوەی پەیامەکانی خەلیفە جێبەجێ دبکات، هەروەها زۆر جارێ نوسراوی دەنارد بۆ عامەی خەڵك لە شارەکانو ئامۆژگاری دەکردن بۆ ئەوەی لەگەڵ والییەکان کاروباری گەل ئاسان بکەن، یەکێ لەو نوسراوانە کە ناردی بۆ شارەکان و هەرێمەکان تێیدا وتبووی (پاش سوپاسی خودا، من کاربەدەستم هەڵبژاردووە کە لە هەموو مەراسیمێکدا سەردانم بکات، ئاگاداری بارودۆخەکەییم، لەو رۆژەوەی دەسەڵاتم گرتۆتە دەست فەرمانم بە چاکە کردووەو رێگریم لە خراپە کردووە، کەمتەرخەمیم بەرامبەر هیچ شتێكو هیچ کەسێ نەکردووە ئیللا مافی خۆیم پێداوە، نە بۆ خۆم نە بۆ خێزانەکەم هیچ مافێکم بڕیار نەداوە پێش گەلەکەم، ئەگەر کەسێ بە بێئاگایی من لێی درابێت یان جنێوی پێ درابێو لە من پەنهان بێت، با دادی خۆی بکات هەرکەسێ سکاڵایەکی هەیە لە مەراسیمێکدا با بێت بۆ لام مافی خۆی وەرگرێت، یان لە خۆم یان لەکاربەدەستەکەم یان بمان بەخشێت خودای گەورە پاداشتی بەخشندەکان دەداتەوە.

کاتێ نووسراوەکەی لە شارەکاندا خوێندرایەوە خەڵك دەستیان کرد بە گریانو دوعای خێریان کرد بۆ ئیمامی عوسمان[3].

**سێیەم: مافو حەقی والییەکان**

لە سەردەمی خەلیفە راشیدینەکاندا بڕیاردرابوو، کە والییەکان مافی جۆراوجۆریان هەیەو هەندێکیان پەیوەندیی بەگەلو جەماوەرەوە هەیەو هەندێکیشیان پەیوەندی بە خەلیفەوە هەیە، وێڕای مافەکانی تر کە پەیوەندیی بە بەیتولمالەوە هەبوو، هەموو ئەو مافە ماددیو مەعنەویانە بە پلەی یەکەم ئامانجی هاوکاریی کردنی والییەکانە بۆ

[1] المصدر نفسه (١٢٦/٢).

[2] المصدر نفسه (٢١٧/٢).

[3] تأريخ الطري (٣٤٩/٥).

بەجێگەیاندنی واجباتی خۆیانو خزمەتکردن بەرژەوەندیی گشتیی، گرنگترین مافەکانیش ئەمانەن:

١- لە گوناهو سەرپێچیدا گوێڕایەڵیان نەکەن.

خودای گەورە دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا) (النساو: ٥٩).

قورتبی دەڵێت: (لە ئایەتەکانی پێشوودا بە والییەکان دەستی پێ کردو فەرمانی پێکردن ئەمانەتپارێزبنو لە نێوان خەڵکدا دادگەربن، لەم ئایەتەدا فەرمانی کردووە بە ڕەعیەت گوێڕایەڵی خودای گەورە بنو بەر لە هەموو کەسێ فەرمانەکانی بەرجەستە بکەنو دوورکەوتنەوە لە نەهییەکانی، پاشان گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکەن، لەو کارانەی فەرمانی پێکردووە یان قەدەغەی کردووە، پاشان گوێڕایەڵی ئەمیرەکان بکەن، ئەمەش لەسەر ڕای کۆماری هاوەڵانو ئەبی هورەیرەو ئیبنو عەباسو جگە لەمانەش[1]،

لە سەردەمی ڕاشیدیندا کۆمەڵگەی ئیسلامی بە گشتیی، شەریعەتی لە سەرووی هەموانەوە داناوە حاکمو مەحکوم سەری بۆ کەچ کردووە، لەبەر ئەوە گوێڕایەڵی حاکمو ئەمیرەکان بەستراوە بە گوێڕایەڵی خودای گەورەو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (نابێ گوێڕایەڵی لە تاواندا بکرێت، گوێڕایەڵی بەس لە چاکەدا دەکرێت)[2].

٢- بەخشینی ئامۆژگاریی بۆ والییەکان.

لە ڕوانگەی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەوە، یەکێکە لەو بنەڕەتانەی، کە سەرجەم ئوممەت ئاشنایەتیو دەیخوێنێتەوەو چەندین ئەمری لەسەر هاتووە لە دووتوێی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ و بە شێوەیەکی گشتیی ئاماژەیان پێکردووە، ئەوەیە فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە، بکەن بە تایبەتی والییەکان فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە کە ئامۆژگارییان بکەن، واتە ئامۆژگاری والییەکان

[1] تفسير القرطبي (٥/٢٥٩).

[2] البخاري كتاب الاحكام رقم (٧١٤٥).

خەلیفە راشیدینییەکان هەر چواریان نەریتیان وابوو نوسراویان دەنووسی بۆ والییەکانیان و بە بەردەوامی

ئامۆژگارییان دەکردن ئەو دەقانەی لەمبارەیەوە هاتوون زۆرن بە نارەحەتی هەژمار دەکرێن و جەم دەکرێن[1].

٣ـ پێویستە لەسەر گەل هەواڵی راستو دروست بگەیەنن بە والی، هەواڵەکان راست بن، ئیتر لە بارەی بارودۆخی گشتیی خەلکەوە بێت، یان لە بارەی هەواڵی دوژمنەوە بێت یان لە بارەی بریکارەکانی والییو فەرمانبەرەکانییەوە بێت، بە پێی توانا پەلەی تیا بکرێت بە تایبەت ئەو رەوشانەی پەیوەندیی بە جەنگو هەواڵی دوژمنەوە هەیە، ئەوانەش کە پەیوەندی بە کاربەدەست و غەیری ئەمانەشەوە هەیە، ئەمەش لە سۆنگەی هاوکاری کردن لە بەرپرسیاریەتی والیدا دەکرێت بۆ رەچاوکردنی بەرژەوەندیی گشتیی ئوممەت[2].

٤ـ پشتیوانی کردنی والی لە هەڵوێستەکانیدا.

کاتی ئاژاوە بەرپابوو سەرانی ئاژاوەگێڕ داوایان کرد لە عوسمان هەندێ لە والییەکان لاببات و بەرکەناریان بکات، ئیمامی عوسمان ئەمەی ڕەفز کرد، ئەم بە قسەنەکردنە بۆ خزمەتی ئامانجی گشتیی ولاتی ئیسلامی بوو، بۆ ڕێگرتن لەشڵەقاندنی بارودۆخ بوو، مانای ئەوە نەبوو ئاوڕ لە سکالای جەماوەر نەداتەوەو بە بێ لێکۆڵینەوە پتشگیری لە والییەکان دەکات، بەڵکو ئەم بەقسەنەکردنەی خولەفا دوای لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەی ئەو سکالایانە بووەو دوای لێپێچینەوەی ورد بووە، لیژنەی تایبەتییان لە هاوەڵان ناردووە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو کێشانە، لە هەمان کاتدا پشتیوانی کردن لە والی واجبێك بووە لەلایەن خەلیفەوە، هەروەها واجبیش بووە لە لایەن گەلەوە، پێویست بووە لەسەر خەڵك ریزیان لێ بگرێن و بیان نرخێن[3]، عوسمان هەندێ والی لابردووە دوای ئەوەی بۆی دەرکەوتووە، کە بەرژەوەندیی جەماوەری تێدایە.

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٥٦).

[2] المصدر نفسه (٢/٥٧).

[3] المصدر نفسه (٢/٨٥).

٥- دوای لابردنی والییەکان دەبێ هەر ڕێزیان لێ بگیرێت

عوسمان ڕێزی گرتووە لە ئەبو موسای ئەشعەریو عەمری کوڕی عاص، دوای لابردنیشیان، بەڵکو تێبینی دەکەین عوسمان ڕاوێژی بە عەمری کوڕی عاص کردووە لە مەسەلە گەورەکانی وڵاتدا دوای لابردنی، ئەمە ڕێزێکی گەورەبوو لە عوسمانەوە بۆ ئەو والییانەی کە لە ویلایەتداری لایبردبوو.

٦- موچەو دەرماڵەی والییەکان

یەکێ لە مافی والییەکان ئەو مووچەیە بوو کە پێی دەژیان، بەرنامەی ئازوخەو موچەی کاربەدەستەکان بوو، کە خەلیفە راشیدینەکان ڕێککەوتبوون لە سەریو لاسایی پێغەمبەریان ﷺ دەرکردووەو چاویان لەو دەکرد، تەنانەت ریوایەتەکان باسی موچەی هەندێ لە کاربەدەستەکانی کردووە، چەمکی ئەم ریوایەتانە ئەمەیە هەموو کاربەدەستان موچەو دەرماڵەیان هەبووە، بە درێژایی سەردەمی راشیدینەکان، زۆربەی ئەو ریوایەتانەی لەم بارەیەوە هاتوون بە پلەی یەکەم رشدیان خستووەتە سەر سەردەمی ئیمامی عومەر، تەنانەت باسی ئازوخەی هەندێ لە والییەکانی ئەو سەردەمە دەکەن، عوسمانو عەلیش لەسەر ئاکاری دوو خەلیفەکەی پێشی خۆیان دەڕۆیشتن بۆ پیادەکردنی ئازوخەی کارگێڕو والییەکان، بەڵام لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا بەخشیش پێدانو دەرماڵە زۆر فراوانو بەرین بوو بۆ خەڵك بە گشتییو بۆ والییەکان بە تایبەتی، بە پێی ئەو داهاتە زیادەی دەهاتە نێو بەیتولمال لە ئەنجامی فتوحاتی والییەکانی عوسمان لە خۆرهەڵاتو ئەرمینییەو ئەفریقاو شوێنەکانی تر، بەڵکو عوسمان موکافەئەی براوەی دەبەخشی بە بریکارە تایبەتو لێهاتووەکانی، بۆ نموونە پێنج لە پێنج یەکی دەستکەوتی فەتحی باکووری ئەفریقای دا بە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ئەبی سەرح لە پاداشتی ئەو فەتحەدا، بەم چەشنە پێی وتبوو: (ئەگەر خودای گەورە سبەینێ ئەفریقای لەسەر دەستی تۆ فەتح کرد لەو دەستکەوتەی بە دەستی دەهێنی پێنج لە پێنجی بۆ تۆ، وەکو خەڵاتێ[1]، بە هەرحاڵ دەبێ پێدانی ئاروخەو موچەی کاربەدەستەکان، بەجۆرێك بێت پێویستییان تێر بکات، بێباك بن لە خەڵکی، ئەم

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٥٢).

بەرنامەیە (بەرنامەی موچەو خۆراكدان بە والییەكان) پێغەمبەر ﷺ رەنگی رشتووە، خەلیفە راشیدینەكان لەسەری ڕۆشتوون، هەتا سەركارەكان بێباكو بوون لەماڵو دارایی خەڵكو یەكلابوونەوە بۆ كاركردنو بەرژەوەندیی دەوڵەت)[1].

**چوارەم: ئەركی والییەكان**

**١ـ پیادەكردنی ئاین دیارترین ئەركیان بووە**

أ ـ بڵاوكردنەوەی ئایینی ئیسلام لە نێو خەڵكدا، هەرچەند ئەو سەردەمە تایبەت كرابوو بۆ فتوحاتی گەورە گەورە، پێویست بوو والییە فەرماندارەكان بە جوانی، كە ئاین لە وڵاتە رزگاركراوەكاندا بڵاوبكەنەوەو پشت ئەستووربن بەو هاوەڵانەی لەگەڵیاندایە، والییەكان بەم موهیمەیە هەڵدەستان وێڕای كەسانێك كە هاریكاری دەكردن لە سەرەتای فەتحدا، لە سەردەمی ئەبوبەكردا، پاشان ئەمە لە سەردەمی عومەردا شارەكان پشتیان دەبەست بەمامۆستاو شەرعزانەكان، كە بۆیان ڕەوانە دەكرا، دوای پەرەسەندنو بنیاتنانی شارە نوێیەكان لە ماوەی دوا كۆتایی خەلافەتی عومەردا جەخت كرایەوە لە رەوانەكردنی مامۆستای ئاینییەكان، وە لە ماوەی خەلافەتی عوسمانو عەلیشدا لە بەر زۆری ژمارەی دانیشتوان لە شارەگەورەكانداو زۆری تەلەبەی عیلمو سەرقاڵی والییەكان بە ڕەوشە جیاوازەكانەوەو فراوانی ویلایەتەكانیان كە هەموویان شوێنكەوتەی یەك ویلایەت بوون ژمارەیەك لە شارەكانو پێویستیان بە شەرعزانو مامۆستا هەبوو[2].

**ب ـ ئیقامەی نوێژكردن**

خەلیفەكان خودی خۆیان بە درێژایی سەردەمی هەر چوار خەلیفەكە هەڵدەستان بۆ بەجێكردنی نوێژی هەینیو جەماعەتو جەژنەكان لەو شارانەی كە تێدا حوكمڕانیان دەكردو وتاریان بۆ خەڵك دەدا لە هەینیو جەژنەكانو بۆنەكاندا، بە هەمان شێوە جێگرەكانیشیان لە شارەكاندا بەم موهیمیە هەڵدەستان، بە ردێژایی سەردەمی خەلیفەكانی راشیدین لەناو خەڵكدا خۆیان وتاریان دەداو ئیمامەتیان لە نوێژدا دەكرد[3].

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٦٤).

[2] الولاية على البلدان (٢/٦٦).

[3] الولاية على البلدان (٢/٣٧).

ج - پاراستنی بنەماکانی ئاین

خەلیفەکانی راشیدین دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هەستیان کردووە بە گەورەیی ئەو ئەرکەی خراوەتە ئەستۆیان بۆ پاراستنی دین لە سەر بنەما دروستەکانی ئەو بنەمایانەی کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەر ﷺ تێکۆشانو لێبڕاون بۆ زیندووکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، بنەبڕکردنی بیدعەو کارکردن بۆ بەرزڕاگرتنی ئایینی خوداو رێزی پێغەمبەرەکەی ﷺو بەرپەرچی ئەو دەستکیسانە بدەنەوە کە دەیانەوێ پۆخڵەوات بخەنە ناو ئەم دینە، ئیمامی عوسمان کاری کرد بۆ نووسینەوەی قورئانی پیرۆزو نوسخەی لێ گەیاند بە شارەکانو فەرمانی کرد بە والییەکانی ئەو قورئانە نووسراوانەی تر کە لای خەڵکە بیسوتێنن لە پێناو پاراستنی گرنگترین بنەماکانی دیندا کە قورئانی پیرۆزە[1].

والییەکانی عوسمان کۆششێکی زۆریان بەخشی بۆ بەرەنگاری ئەو سەبەئیانەی کە راوبۆچوونی نامۆیان هێنابووە ناو ئیسلام، تەنگیان پێ هەڵچینینو تاریان نان[2]، بە شێوەیەگی گشتیی پاراستنو پارێزگاریی ئەم دینەو رێزگرتنی، گرنگترین ئەرکی سەرشانی والییەکان بوو[3].

د - نەخشەگرتنو تەلاری مزگەوت

کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەشتە (قوبا)، هەستا بە دروستکردنی یەکەمین مزگەوتی ئیسلام تێیدا، لە دوای دروستکردنی مزگەوتی شاری مەدینە، دەستی کرد بە دروستکردنی بینای مزگەوتی قوبا، خەلیفە راشیدینەکانیش بە هەمان شێوە بەردەوامبوون لەسەر دروستکردنی مزگەوت لە شارو پێتەختەکانو شوێنە رزگارکراوەکان گەرچی والییەکان هەڵنەستاون بە بنیاتنانی هەر هەموو مزگەوتەکان، بەڵام رۆڵێکی مەزنیان هەبووە لە بنیاتنانی مزگەوتە سەرەکییەکاندا لە زۆربەی مزگەوتی ئەو ناوچەی سەر بە ویلایەتەکانیان بەتایبەت لە دروستکردنی مزگەوتە گەورەکان.

---

[1] تاريخ المدينة (٣/٩٩٦ ـ ٩٩٩).

[2] عبدالله بن سبأ وأثر في أحداث النفسه، سلمان العودة، ص (٢١٤).

[3] الولاية على البلدان (٢/٦٩).

### هـ ـ ئاسانکاریی بۆ ڕەوشی حەج

والی هەرێمەکانو شارەکان لە سەرەتای ئیسلامدا بەرپرسبوون لە ئاسانکاری ڕەوشتی حەج لە ویلایەتەکانی خۆیانداو سەلامەتییان دابین دەکرد بۆ حاجییەکان، والییەکان هاریکاری ئەمیرەکانیان دەکرد بۆ قافڵەی حەجو ماوەی سەفەری حەجی بۆ دیاری دەکردنو هیچ حاجییە لە شاری خۆی دەرنەدەچوو بە مۆڵەتی والی نەبێت، هەندێ لە ئەمیرەکان بە ڕێکخستنی تەدارەك وازیان نەدەهێنا بەڵکو هەیانبوو کاری بۆ ڕێکخستنی دابینکردنی ئاو دەکرد لەو ڕێگایانەی کە حاجییەکان پێیدا دەڕۆشتن، ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی کورەیزە ئاوی دابین کردبوو لە ڕێگەی حاجییەکانی بەسرەدا، کاتێ کارگێڕی ئیمامی عوسمان بوو لەسەر ئەو ڕێگایەی کە لە بەسرەوە دەچێتە مەککە[1].

شەرعزانەکان لە دوای ئەم کارە جەختیان کردووەتەوە، کە ئاسانکاری بۆ حاجیان، کارێکە لە ئەرکەکانی والییەکان بۆ بەرامبەر شارەکانی خۆی، ماوەردی دەڵێ: (ئاسانکاری بۆ حاجیانو مەراسیمی حەج، یەکێکە لە ئەرکەکانی ویلایەتگەریی، چونکە لە جوملەی ئەو یارمەتییانەیە کە دەخرێتە ئەستۆی ئەمیر)[2].

### و ـ جێبەجێکردنی سزا شەرعییەکان

جێبەجێکردنی سزا لەسەر سەرپێچیکەرانی فەرمانی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ واجبێکی دینی بووەو خراوەتە ئەستۆی والییەکان، بەڵکو یەکێك بووە لە کارە سپێردراوەکانی سەرشانیان، ئیتر ئەو سزایە لەسەر سەرپێچییەك بێت کە دەبێتە کۆسپی موسڵمانان بە گشتیی یاخود ئەو سەرپێچییانەبێت کە دەبێتە زیان بۆ گرۆیەکی دیاریکراو[3]، ئیمامی عوسمانو والییەکانی هەستاون بە جێبەجێکردنی سزا شەرعییەکان لە سەردەمی خۆیاندا.

### ٢ـ سرەوتنی خەڵك لە شارەکانی خۆیاندا

پارێزگاریکردنی ئاسایشی خەڵك لە ویلایەتەکاندا، یەکێکە لە ئەرکە هەرە گەورەکانی ئەستۆی والی، لە پێناو دەستەبەرکردنی ئەم کارەدا دەبی والی هەستێ بە

---

[1] الولاية على البلدان (٢/١٩٢).

[2] الاحكام السلطانية، أبو الحسن الماوردي ص (٣٣).

[3] السياسة الشرعية لأبن تيمية، ص (٦٦).

ژمارەیەك كاروباری تر ، بۆنموونە گرنگترینیان جێبەجێ كردنی سزایە لەسەر تاوانباران‌و لە ڕێ دەرچووەكان[1]، سزا بۆ ئەو تاوانانەی كە ژیانی خەڵك‌و ماڵ‌و سامانیان دەخاتە مەترسییەوە، بەم چەشنە ڕووداوە ئەمنییەكان كەمدەبێت‌و كوشتن‌و دزی‌و ڕێگری‌و ئاژاوە نامێنێ، بەڵكو ئاسایش وا بەرقەرار دەبێ خەڵك بەرامبەر خەڵكانی تر قسەی نابەجێ‌و بوهتان‌و بۆ هاوێشتن نامێنێ، جێبەجێكردنی سزا، ڕێگری دەكات، لە دەمدرێژیی ئەدەبی بۆ سەر خەڵك، هەروەها ناموس‌و شەرەفیان دەپارێزرێت، تەئمینكردنی ژیانی خەڵك‌و پاراستنی هەندێكیان لە هەندێكی تریان ئەركی سەرشانی والییەكان بوو، بەڵكو كارگێڕەكان بە فەرمانی خەلیفەكان كاریان بۆ زامنكردنی ئاسایشی جانەوەرو كەوەمارو دوپشكی ویلاتەكەی ژێر دەستیان كردووە، بەلازری دەڵێت: كارگێڕی نسیبین نوسراوێكی نووسی بۆ مەعاویە، ئەوكاتە مەعاویە والی شام‌و جەزیرە بوو، سكالای نووسی بوو، كە كۆمەڵێ لە موسڵمانان دوپشك ژیانی پێ تال كردوون، ئەویش نووسی بۆی، فەرمانی پێكردبوو سكالآیان بردە لای، كە كۆمەڵێ لە موسڵمانان بەدەست دوپشكەوە گیرۆدە بوون، ئەویش داوای لێ كردن چاكبن بەرامبەری دووپشكەكانی شارەكەو خۆمان بپارێزین‌و هەموو شەوێك ئەزكار بخوێنێت ئەوانیش بە قسەیان كرد، بەڵام دووپشكەكان زیانبەخشبوون بۆیە فەرمانی كرد بیانكوژن[2].

### ٣ـ تێكۆشان لەبەر خاتری خودا

تایبەتمەندی هەرەدیاری سەردەمی خەلیفە راشیدینەكان ئەوەبوو والییەكان فەرمانداری جیهادبوون لە شارو ناوچەكاندا، هەر بەم شێوەیە بە والییەكان لە سەردەمی عوسماندا رۆڵێكی گەورەیان هەبوو لە فتوحاتەكاندا یەكێ لەوانە عەبدوڵلای كوڕی عامری كوریزو موغەیرەی كوڕی شوعبەو ئەبو موسای ئەشعەری بوو ئەمانە فەتحیان گەیاندە خۆرهەڵات، عەبدوڵلای كوڕی سەعدی ئەبی سەرحیش فەتحی گەیاندە باكوری ئەفریقا، مەعاویەی كوڕی ئەبی سوفیانیش فەتحی گەیاندە چوارقوڕنەی ئەرمینیەو ولاتی رۆم، گشتمان باش دەزانین ئەمیرەكان لە سەردەمی خەلیفە راشیدینییەكاندا

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٧١).

[2] فتوحات البلدان، البلازري، ص (١٨٣).

وێڕای بەڕێوەبردنی ویلایەتەکانیان موجاهیدەبوون بۆ قوڵەکانی دوژمنو خۆیان نەخڵەفاندووە لە کارە پێ سپێردراوەکانیان دوانەکەوتوون، بێ سۆ جیهادکردن هاوپێچی کۆمەڵێ کاری دەستنیشان کراوە، کە خزمەت بەکاروباری گشتیی دەکات، سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەیان بۆ گرنگترین ئەو کارانە کردووە، کە لە لایەن ئەمیرەکانەوە ڕێکراوەو ئەنجامدراوە وەکو:

أ ـ ناردنی خۆبەختکەران بۆ جیهاد لە لایەن ئەمیرەکانەوە.

والی یەمەنو بەحرەینو مەککەو عومان موجاهیدەکانیان ڕەوانە دەکرد لە ماوەی تافی سەردەمی ئەبوبەکرو عومەرو عوسماندا[1].

ب ـ بەرگری کردن لە ویلایەت دژی دوژمنانان.

والییەکانی شام بەرهەڵستی ڕۆمەکانیان دەکرد بە درێژایی سەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکان، هەروەها هەر بەم جۆرە والییەکانی عێراق بەرهەڵستی فارسەکانیان دەکرد هەتا بۆیان هەڵکەوت دواهەمین پادشای فارسیان کوشت لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا.

ج ـ پەرژینکردنو قایمکردنی وڵات.

ئیمامی عوسمان فەرمانی دەکرد بە پەرژین کردنی کەنارەکانو کون بڕکردنیان، هەروەها (مووچە بڕینەوە بۆ ئەو سەربازانەی لەو شوێنانەدا دەمێیننەوە بۆ ئەوەی پڕبن لە جوامێریو هیممەتی پیاوانە)[2].

د ـ بەدواداچوون، واتە کەوتنە پەیجورو سۆراغکردنی هەواڵی دوژمن.

والییەکان هەڵدەستان بە سۆراغ کردنی هەواڵی دوژمنانو ئاڕاستەی بەرەوەندییەکانیان دەدۆزییەوەو خاڵی هەرە گرنگیان دیاری دەکردو ڕەدیان دەگرتو دەیانتوانی ڕیزی دوژمنان بشێوێننو چاو (سیخوڕ) بچێنن لە ناویاندا کە سەربەخۆیان بێت.

هـ ـ بە هیممەتی ئەسپەکان شارەکانیان دەپاراست.

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٧٢).

[2] المصدر نفسه (٢/٧٣).

ئەسپ بایەخێکی تایبەتی هەبوو لە جیهاددا، موسڵمانان بایەخیان دەدا بە مۆچاندنو مەشق پێکردنی ئەسپ، وە لە رۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ زۆر گرنگییان پێدەدا پاشان ئیمامی عومەر سیاسەتێکی گشتگیری دارِشت، بۆ زۆرو زەوەندکردنی ئەسپ بۆ جیهادکردن لە شارە ئیسلامییەکاندا[1]، هەروەها ئیمامی عوسمانیش لەسەر هەمان سیاسەتی عومەر دەچوو لە بایەخدان بە ئەسپ ئەم ئەسپانە ئامادەباش دەکران بۆ بەرگری کتوپڕ لە وڵاتی ئیسلامیی.

و- ڕاهێنانی مێردمنداڵانو ئامادەکردنیان بۆ جیهاد.

سەردەمی خەلیفە راشیدینەکان ئەمیرەکان بایەخیان دەدا بە پەروەردەی منداڵانو راهێنانیان بۆ ژیانی جیهادی ئایندە.

ز- برەودان بە تۆمارگەی سەربازیی واتە (دیوانی سەربازیی).

عوسمان لە سەر پەیڕەوی سیاسەتی عومەر دەچوو، لە گرنگیدان بە دیوانی سەربازیی، ئیمامی عوسمان زۆر گرنگی دەدا بە دیوانی شارەکان، چونکە بیروڕای وابوو خەڵکی شارەکان زۆر پێویستیان بە زەبتکردن هەیە، بە تایبەت ئەو شارانەی کە نزیکن لە دووژمنەوە، چونکە ئەم شارانە پێویستیان بە سەرباز هەیە بە بەردەوامی، والییەکان بەرپرسیاری راستەوخۆ بوون، لە دیوانی سەربازیی شارو هەرێمەکەیاندا هەرچەندە هەندێ فەرمانبەری تر سەرپەرشتی ئەم کارەیان دەکرد، بەڵام والییەکان راستەوخۆ ئەم کارەیان دەکرد، چونکە ئەمیری جەنگ بوون، بەرپرسیارییەتیان بەرامبەر دیوانی شارەکەیان وەکو بەرپرسیاریەتی خەلیفە وابوو، بەو پێیەی نوێنەری خەلیفە بوون[2].

ح - جێبەجێ کردنی پەیماننامەکان.

بۆ پەرەسەندنی فتوحاتی ئیسلامیی، لە سەردەمی خەلیفە راشیدینەکاندا لەگەڵ دوژمناندا نامەیان دەگۆڕییەوە، هەروەها لەگەڵ خەڵکی وڵاتە فەتحکراوەکاندا، وتوێژیان دەکرد ئەمیرەکان وێڕای سەرکردایەتی کردنی سەربازەکان بەرپرسی یەکەمیش بوون لە گرێبەستەکاندا، بۆ نموونە سوڵحکردنو جێبەجێکردنی[3].

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٧٤).

[2] الولاية على البلدان (٢/٧٥).

[3] المصدر نفسه (٢/٧٥).

**٤ـ كۆشش كردن بۆ دەستەبەركردنی ئازوخەی خەڵك**

خەلیفە راشیدینەكان لە سەردەمی ئەبوبەكری صدیقدا رێگەیەكی تازەیان كێشا بۆ پەخشكردنەوەی بەخشیش‌و كەلوپەل بەسەر موسڵمانانندا، بە گوێرەی ئەو داهاتەی، كە دەستی بەیتولمال دەكەوت لەسەرەتاوە دابەشكردن‌و پێدان كاتی بۆ دیاری نەكرابوو، بەڵام لە سەردەمی ئیمامی عومەردا گۆڕانی بەسەردا هات، گۆڕانەكەش كەوتە دوای دانانی تۆمارگاكان لە شارە جیاوازەكاندا، لەم سەردەمەدا دەستیان كرد بە دابەشكردنی كەلوپەكان بە شێوازێكی دەوری رێكوپێك مانگانە دابەش دەكرا، عوسمانیش هەمان بەرنامەی پیادە كرد، خەلیفەو والییەكان لە سەردەمی خۆیاندا بە دابینكردنی خۆراك‌و كەلوپەل‌و شمەكەوە نەوەستان، بەڵكو شوێنی نیشتەجێ بوون‌و دابەشكردنی زەوی بو بە كاری هەرە گرنگی دامودەزگاكانیان، هەروەها ئەمیرەكان سەرپەرشتی دابەشكردنی خانووەكانیان دەكرد لە شارو شوێنە رزگاركراوەكاندا[1].

**٥ـ دامەزراندنی فەرمانبەرو كارمەندەكان**

دامەزراندنی كارمەندو فەرمانبەران لەو كارانەیە، كە سەر بە ویلایەتە، پێویستبوو لەسەر شانی والییەكان بۆ شاییەكان پڕ بكەنەوە، ئەوكاتە ویلایەت بە زۆری لە شارێكی سەرەكی پێكدەهات‌و شارو هەرێمەكانی تر دەخرایە پاڵ بۆ ئەوە دەخرانە پاڵ سەری بە ویلایەتەكان، چونكە پێویستیان بە رێكخستنی رەوشەكانیان هەبوو، والییەكان هاریكاری دەكران لە لایەن كارمەندو فەرمانبەرانی ئەو ناوچەوە، لە سەردەمی عوسماندا ئەو كارمەندانەی سەر بە ویلایەت بوون وایان لێهات بوو حوكمی ناوچەیەكی گەورەیان دەكرد، وردە وردە ویلایەتەكان فراوان بوون لە ئەنجامی فەتحكردن بۆیە هەرێمی گەورە گەورە، خرایە سەریان كە پێشتر سنورداربوون، وەكو بەسرەو كوفەو شام‌و غەیری ئەمانەش بەم چەشنە دابەشكردنی كارمەند بۆ بەڕێوەبەرایەتییەكان‌و رێكخستنیان كارێكی گەورە بوو لە كارەگرنگەكانی ویلایەت كە والییەكان پێی هەڵدەستان.

**٦ـ رەچاوكردنی ئەهلی زیمە**

خاترگرتنی ئەهلی زیمەو رێزگرتنیان‌و رێزگرتن لە پەیماننامەكانیان‌و هەستان بە مافە شەرعییەكانیان‌و داواكردنی ئەو ئەركانەی دەكەوتە سەریان‌و سۆراغ كردنی

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٧٩).

گوزەرانیانو تۆڵەسەندن لەو کەسانەی زوڵمیان لێ دەکەن بە بێ ناوگیری، بەپێی فەرمانی شەرع ئەم کارانە ئەرکی سەرشانی والییەکانە[1].

**٧ـ ڕاوێژکردن بە خاوەن ڕەئییەکان لە ویلایەتەکان**

خەلیفەکان لەسەر پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ دەچوون لە ڕاوێژکردن بە ئەهلی ڕەئی، هەموو جارێك بە گەرمو گوڕی دانیشتنیان دەبەست بۆ هاوەڵە گەورەکانو لە کاروبارەکاندا ڕاوێژیان پێدەکردن[2]، هەر بەم شێوەیە فەرمانیان دەکرد بە والییەکان ڕاوێژ بکەن لەگەڵ خاوەن ڕەئی شارەکانی خۆیان، والییەکانیش ئەمەیان جێبەجێ دەکردو مەجلیسیان دەگرت بۆ خەڵکانی خاوەن ئەزموونو ڕەئی[3].

**٨ـ ئاوڕدانەوە لە پێداویستی ئاوەدانکردنەوەی ویلایەت**

لە خەلیفە ڕاشیدینەکانو والییەکانیانەوە زانراوە کە بایەخیان داوە بە ئاتاجی دانیشتوان لە ڕووی بیناسازیو کشتوکاڵییەوە هەستاون، بە هەڵکەندنی بیرو کارێز تەنها لە بەسرەدا نا، بەڵکو لە شوێنەکانی تردا کە زۆرن[4].

**٩ـ ڕەچاوکردنی باری کۆمەڵایەتی دانیشتوانی ویلایەت**

والییەکان لە سۆنگەی ڕێنماییەکانی ئیسلامیی گشتگیرەوە ڕەچاوی ئەم بوارەیان کردووە بە هەموو وردەکارییەکانییەوە، بە تایبەت والییەکانی ئەو سەردەمە بە ئاڕاستەکاری خەلیفە ڕاشیدینەکان بە هەندێ کاری کۆمەڵایەتی هەستاون، کە سەختە بەلای ئەو کەسانەی کە پایەی وایان هەبێ هەستن بەو جۆرە کارانە، سەرکردەی تر پێی هەڵناسێ خەلیفەکان زۆر پەرۆشبوون لە سەر ئەوەی کە خەڵکان لە شوێنی خۆیاندا دابنێن و بە ئەندازەی زەحمەتی خۆیان بیانرخێننو ڕێزی ئەهلی شەرەفو پێشینەکانی ئیسلام بگرن[5]، جارێك کارگێڕەکەی عوسمان لەسەر شاری کوفە نوسراوێکی نووسی بۆ عوسمانو سکاڵای کرد لە دەستی دەشتەکیو لادێییەکان کە بوونەتە زەحمەت بۆ ئەهلی

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٨٠).

[2] المصدر نفسه.

[3] الولاية على البلدان (٢/٨٠).

[4] المصدر نفسه (٢/٨١).

[5] المصدر نفسه (٢/٨٢)، تأريخ الطبري (٥/٢٨٠).

شەرەف‌و ئەهلی پێشینەکانی ئیسلام، عوسمانیش بۆی نووسی (پاش سوپاسی خودای گەورە، فەزڵی ئەهلی پێشین‌و زووهاتووکان، کە خودای گەورە ئەم وڵاتانەی لە سەر دەستیان فەتح کرد، بدە بەسەر ئەوانیتردا، چونکە ئەمانە پێشڕەون‌و ئەوانیتر شوێنکەوتەی ئەمانن، هەروەها ئەوان لەگەیاندنی ئەم حەقەدا تەمەڵیان کردووە پێی هەڵنەستاون‌و ئەمان پێی هەستاون، قوربی هەموو یەکێکیان بپارێزەو حەقی شەرعی خۆیان بدە بە هەر هەموویان، چونکە شارەزایی دەربارەی خەڵك دەتگەیەنێت بە دادپەروەری)[1].

۱۰ـ کاتەکانی کاری (دەوامی) والی

مەشهورە لە وەلیدی کوڕی عەقەبە والی عوسمانەوە لە شاری کوفە کە خانووەکەی دەرگای نەبووە، لە هەموو کاتێکدا پێشوازیی لە خەڵك کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تامکردنی ئازادیی موراجەعەکردنی ئەمیر بەبێ تەگەرەو بەبێ ماتەڵ کردن[2]، والی بەشێکی خانووەکەی هەمیشە کراوەبوو بۆ خەڵك، هەرکاتی بیانویستایە دەهاتنە خزمەتی ئەو بەشەخانووە ماڵ‌و منداڵی تیا نەبووە.

---

[1] الولاية على البلدان (٢/٨٢).

[2] المصدر نفسه.

## باسی سێیەم: حەقیقەتی والییەکانی عوسمان

مێژوونووسەکان زۆر باسی ئەوە دەکەن کە عوسمان سۆزو خۆشەویستی هەبووە بۆ خزمەکانیو زاڵی کردوون بەسەر ئەزمەی حوکمدا لە سەردەمی خۆیدا ڕەخنەو گلەیی زۆربەی خەڵکی وروژاوە بەرامبەری، هاوولاتیان هاتنە جۆشو ڕەخنەیان لێگرت بۆ ئەوەی خزمەکانی خۆی لە کاروباری وڵات دەستیان کۆتاکەن[1]، ئیمامی عوسمان دەستیان پێ کۆتا بکات، ئەو خزمانەی کە عوسمان کردبوونیە والی، یەکەمینیان مەعاویەو دووەمیان عەبدوڵڵای ئەبی سەرح، سێیەمیان وەلیدی کوڕی عەقبە، چوارەم سەعیدی کوڕی عاصو پێنجەم عەبدوڵڵای کوڕێ عامر بوو، ئەم پێنجەی عوسمان کردنی بە والی بە گومانی خۆیان (مێژوونووسەکان)، هەر هەموویان خزمی خۆی بوون، ئەمە تانەیە لەسەر عوسمان، با تەماشا بکەین، یەکەمین جارێ والییەکانی عوسمان کێ بوون، ئەبو موسای ئەشعەریو قەعقاعی کوڕی عەمرو جابری کوڕی موزەنیو حەبیبی کوڕی مەسلەمەو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی خالیدو ئەبو ئەعوەری سەلماو حەکیمی کوڕی سەلامەو ئەشعەسی کوڕی قەیسو جەریری عەبدوڵڵای بەجەلیو عەینەی کوڕی نوهاسو مالیکی کوڕی حەبیبو نووسەیری عەجەلیو سائیبی کوڕی ئەقرەعو سەعیدی کوڕێ قەیسو سەلمانی کوڕی ڕەبیعەو خونەیسی کوڕی حوبەیش، ئەحنەفی کوڕی قەیسو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبیعەو بەعلی کوڕی مونیە[2]و عەبدوڵڵای کوڕی عەمری حەزرەمیو عەلی کوڕێ ڕەبیعەی عەبدول عوزا، ئەمانە والییەکانی عوسمان بوون، کەواتە ئەگەر ئامارێك بکەین ژمارەی والییەکان هەژدە والی بووە، بە دڵنیاییەوە پێنجیان لە بەنی ئومەیەیەو شایستەی والیەتیش بوون، هەروەها باش دەزانین پێغەمبەر ﷺ لەناو تیرەکان زیاتر بەنی ئومەیەی دەکردە والی هەتا کەسانی تر، پاشان دەڵێم ئەم والییانە هەرپێنجیان لەیەك کاتدا والی نەبوون، بەڵکو عوسمان وەلیدی کوڕێ عەقبەی کردە والیو پاشان لایبردو سەعیدی کوڕی عاسی کردە والی، ئەم پێنجە هاوکات والی نەبوون، عوسمان هێشتا مابوو دووبارە سەعیدی کوڕی عاصیشی لابرد کاتێ عوسمان

---

[1] الدولة الأموية المفترى عليها، ص (١٥٩).

[2] وهو يعلى بن امية بن أبي عبيدة التميمي، سير اعلام النبلاء (٣/١٠٠).

شەهیدکرا لەبەنی ئومەیە لەم سیانە زیاتر والییان نەبوو، ئەویش مەعاویەو عەبدوڵڵای سەعدی ئەبی سەرحو عەبدوڵڵا عامری کورەیزو هیچی تر عوسمان وەلیدی عەقەبەو سەعیدی عاصی لابرد، بەڵام لە چ شوێنێ لایبرد؟ لەو کوفەیەی کە عومەر سەعدی ئەبی وەقاصی تیا لابرد، کوفە بە هیچ والییەك رازی نەبووە، کاتێ عوسمان والییەکانی کوفەی لابرد لەبەر ئەوە نەبووە والییەکان نالەبار بوون، بەڵکو شارەکە نالەبار بوو، ئەمەش لە کەیە بەناوچاوی شارەکەوە[1].

پێغەمبەر ﷺ بەنی ئومەیەی لە ژیانی خۆیدا بەکارهێناوە دوای ئەویش خەلیفەکان بەکاریان هێناون‌و گوێیان نەداوەتە خزمایەتی، بۆ نموونە ئەبوبەکرو عومەر هیچ تیرەیەك نییە لە تیرەکانی قورەیش ئەوەندەی بنەماڵەی عەبدی شەمس کارگێڕی (کارمەند)یان هەبێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەوان زۆرزۆر بوون، شەرەف‌و سەرداریان تێدابوو، پێغەمبەر ﷺ عتابی کوڕی ئوسەیدی ئەبی عاصی کوردۆتە کارگێڕی مەککەو ئەبی سوفیانی کوڕی حەربی کردە کارگێڕی نەجران‌و خالیدی موڕی سەعیدی کردە سەرپەرشتیاری صەدەقاتی بەنی مەزبەج‌و ئەبانی کوڕی سەعیدی کردە سەرکردەی هەندێ سریەو پاشان کردی بە کارگێڕی بەحرەین، عوسمانیش هیچ بەنی ئومەیەیەکی کار بەدەست نەکرد ئەوانە نەبێ کە پێغەمبەر ﷺ کردنی، یان هاوڕەگەزەکانیان، یان پیاوی هۆزەکانیان، بە هەمان شێوە ئەبوبەکرو عومەریش لە دوای ئەو ئەبوبەکریش یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیانی کردە ئەمیری فەتحی شام، عومەریش ئیقراری لەسەر کردو پاشان عومەر مەعاویەی برای کردە والی[2].

ئەو پرسیارەی کە خۆی دەهاوێتە ڕێگەمان ئایا ئەم والی ئومەویانە شایستەی والیەتی بوون یان نا؟ لەمەودوا شایەتی ئەهلی عیلم دێنین دەربارەی ئەم والیانەی کە عوسمان کردونی بە والی (ان شاء الله)، عوسمان خەلیفەیەکی راشیدەو چاوی لێدەکرێ‌و کردارەکانی پێشینەیەکی دەستوورییە لە ناو ئومەتدا، چۆن عومەر دابێکی داهێنا بۆ دوای خۆی، کە خزمە نزیکەکانی دوور دەخستەوە لە دەسەڵات، عوسمانیش دابێکی

---

[1] حقبة من التأريخ ص (٧٥).

[2] منهاج السنة (٣/١٧٥، ١٧٦).

هێنایه کایەوە بۆ دوای خۆی کە خزمەکانی نزیکی دەسەڵات دەکردەوە ئەگەر شایستەو لێوەشاوەبونایە، هەرکەسێ شوێن ئاکاری عوسمان بکەوێت با دڵنیابێت لە شیاویی بەڕێوەبردنی عوسمان ئەو ڕەخنانەی کە کراوەتە گلەیی لەسەر عوسمان لە بازنەی موباح دەرناچێت[1].

ئەو والیانەی کە عوسمان کردنی بە والی لە خزمەکانی خۆی، سابت بووە، ئەو والیانە لێهاتووی‌و توانای بەڕێوەبەردنی کاروباری ویلایەتیان هەبووەو خودای گەورە زۆربەی شارانی لەسەر دەستی ئەوان فەتح کردووەو لە ناو گەلەکەیاندا بە ڕەفتاری دادگەرانەو چاکەخوازی ڕۆیشتوون، تەنانەت هەندێکیان مەهامی ویلایەت گەرییان پیادەکردووە پێشتر لەسەردەمی ئەبوبەکرو عومەردا[2].

با بڕوانینە وتەی ئەهلی عیلم لە بارەی ئەم والیانەوە:

**یەکەم: مەعاویەی کوڕی ئەبی سوفیانی کوڕی حەربی ئومەوی**

نووسەرەکان فەزڵێکی بێشوماری ئەم هاوەڵە بەڕێزەیان باس کردووە، ئەمەش نەختێکێتی وەکو:

١ـ لە قورئانی پیرۆزەوە، مەعاویە بەشداریی جەنگی حونەینی کوردووە، خودای گەورە دەفەرموێت: (ثُمَّ أَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُوداً لَّمْ تَرَوْهَا وَعذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ) (التوبة: ٢٦). مەعاویەش یەکێکبوو لەوانەی بەشداریی غەزای حونەینی کردووەو یەکێکە لەو ئیماندارانەی کە خودای گەورە دڵئارامی باراند بەسەریاندا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ[3].

٢ـ لە سوننەتدا هاتووە، پێغەمبەر ﷺ پاڕاوەتەوە بۆ مەعاویە یەکێ لە دوعاکانی ئەمەیە (ئەی خودایە بیکە بەچاوساغی خێرو ڕێنمایی بکەیت بۆ خێرو خەڵکانیش بەهۆی ئەمەوە ڕێنمایی بکەیت)[4]، دوعایەکی تری پێغەمبەر ﷺ ئەمەیە (ئەی

---

[1] الاساس في السنة وفقهها ـ سعيد هوى (١٦٧٥/٤).

[2] تحقيق مواقف الصحابة من الفتنة (٤١٧/١).

[3] مرويا خلافة معاوية في تأريخ الطبر خالد الغيث ص (٢٣).

[4] صحيح سنن الترمزي للألباني (٢٣٦/٣).

خودایه مەعاویه فێری کتابو حساب بکەیتو له عەزاب بی پارێزه)[1]، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (یەکەمین سوپایەك که له رێگەی دەریاوه غەزا دەکەن کارێکی وا دەکەن شایانی بەهەشتنو خۆیان دەسەپێنن بۆ بەهەشت)[2]، ئومو حەرام وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ منیان تێدایه فەرمووی (تۆشیان تێدایه)، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (یەکەمین سوپایەك له ئومەتی من که شاری قەیسەر غەزا دەکەن خودا لێیان خۆش بووه)، ئومو حەرام دەڵێ وتم: (ئایا منی تێدایه ئەی پێغەمبەر ﷺ؟ فەرمووی: (نەخێر)[3]، موهەلەب[4] دەڵێ: لەم فەرمودەیەدا نرخو قوربی مەعاویەمان بۆ دەردەکەوێ، چونکه یەکەمین کەسبوو له رێگای دەریاوه غەزای کردووه[5].

٣- سەنای ئەهلی عیلم دەربارەی مەعاویه.

أ - سەنای عەبدوڵڵای کوڕی عەباس.

وترا به ئیبنو عەباس ئایا زانیوته مەعاویەی ئەمیری ئیمانداران یەك رکات نوێژی ویتر دەکات، وتی: (مەعاویه شەرعزانه)[6]، لێرەدا دەکرێ هەندێ لەو مەسائیله فیقهیانه باس بکەن، که مەعاویه کردویەتی و شوێنەواری بەجێ هێشتووه.

- لێوەی دەگێڕنەوه، که یەك ڕکات نوێژی ویتری کردووه.

- لێوەی گێڕاوەتەوه (نوێژەبارانەی بەو کەسانه کردووه، که چاکه کاریان لێی خوێنراوەتەوه)[7].

- لێوەی دەگێڕنەوه (به دەرککردنی نیومەن گەنم سەرفیترەی قبوڵ کردووه)[8].

---

[1] موراد الظعان (٢٤٩/٧)، اسناده حسن.

[2] أوجبوا: اي فعلوا فعلا وجبت لهم الجنة، فتح الباري (١٢١/٦).

[3] البخاري، رقم (٢٩٢٤)

[4] المهلب بن أحمد الاندلسي، منصف شرح صحيح البخاري، توفي (٤٣٥هـ).

[5] فتح الباري (١٢٠/٦).

[6] فتح الباري (١٣٠/٧).

[7] المغني لابن قدامه (٣٤٦/٣).

[8] زاد المعاد (١٩/٢).

- لێوەی دەگێڕنەوە (کە بۆنخۆش کردنی لەشی بە سوننەت زانیوە بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ ئیحرام ببەستن[1].
- (کڕین و فرۆشتنی محلەکانی مەککەی بە دروست زانیوە)[2].
- ژن و مێردی جیاکردووەتەوە[3]، بە هۆی نەخۆشی (عونەوە)[4] بێگونی.
- (تەلاّقی سەرخۆشی خستووە).
- (موسڵمانی لە تۆڵەی کافردا نەکوشتووە).
- بکوژی زیندانی کردووە، هەتا خاوەن خوێن هاتووە[5].
ب ـ سەنای عەبدوللاّی کوڕی موبارەك دەربارەی مەعاویە.
عەبدوللاّی کوڕی موبارەك دەڵێ: معاویە لای ئێمە سام و شکۆی هەبوو، هەرکەسێکمان بینیبێتمان قسەیەکی نابەجێ کرابێت بەرامبەری دەمکوتی بێژەرەکەمان کردووە، واتە: (ئێمەی هاوەڵان) [6].
ج ـ سەنای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.
پرسیار کرا لە ئیمامی ئەحمەد وتیان رەحمەتی خودات لێبێت دەربارەی ئەم وتەیە چی دەڵێیت، کە دەڵێت: ناڵێم مەعاویە نوسەری وەحی بووەو ناڵێم خاڵۆی ئیماندارانە، چونکە ئەو بەزەبری شمشێر داوەری کردووە[7]، ئەحمەدیش وتی: (ئم قسەیە وتەیەکی خراپ و هەڵێت و پەڵیتەو لە کەسانێك دەوەشێتەوە کەوا نەفامن و دانانیشن وازناهێنن و پڕوپاگەندەی خۆیان بڵاو دەکەنەوە بە نێو خەڵکدا[8].

[1] المغني (٥/٧٧).
[2] المصدر نفسه (٦/٣٦٦).
[3] القاموس المحيط (١٥٧٠).
[4] مرويا خلافة معاوية في تأريخ الطبر خالد الغيث ص (٢٣).
[5] المصدر نفسه، ص (٢٩).
[6] مريات خلافة معاوية ص (٢٩).
[7] مريات خلافة معاوية ص (٢٩).
[8] السنة للخلال، تحقيق عطه الزاهراني (٢/٤٣٤).

د ـ سەنای قازی ئیبنولعەرەبی دەربارەی مەعاویە.

ئیبنول عەرەبی باسی ئەو خەسڵەتانە دەکات، کە لە مەعاویەدا کۆبووەوەو وەك (.. هەستاوە بە پاراستنی کەلەبەرەکانی دوژمن‌و کونبڕی کردووە، سەربازەکانی سەرخستووە بەسەر دوژمنداو زاڵبووە بەسەرسیاسەتی بەڕێوەبردنی خەڵکدا [1]، موحیبەدینی خەتیب ئەم دەقەی ڕۆشن کردووەتەوەو دەڵێ: (مەعاویە ئەوەندە خاوەن هیممەت بووە هەمیشە بایەخی بەزاڵبوون داوە بەسەر دوژمندا ئەوکاتەی لەگەڵ عەلیدا لە صەفین لە شەڕی (من منە)دا بوو هەڕەشەی ناردە سەر پاشای ڕۆمەکان، چونکە هەواڵی پێ گەیشتبوو کە پادشای ڕۆم بە کۆمەڵێ سەربازی گەورەوە نزیك بووەتەوە لە سنوور)[2]، لێرەدا ئیبنو کەسیر دەڵێ: (پادشای ڕۆم تەماحی کردبووە مەعاویە ڕاکێشی بۆ لای خۆی مەعاویەش ترساندی‌و ڕسوای کردو سەبازەکانی بۆ هەڵجەراندو جۆشی دان)، کاتێ پادشای ڕۆم بینی مەعاویە سەرقاڵی شەڕکردنە هەستا نزیکی هەندێ لە شارەکان بوویەوە بە کۆمەڵێ سەربازی زۆرەوەو تەماحی کردبووە وڵاتی ئیسلام، مەعاویەش نووسی بۆی وەڵڵاهی ئەگەر دەست هەڵنەگری‌و نەگەڕێیتەوە بۆ شارەکەی خۆت، ئەی نەفرەت لێکراو ئەوا خۆم‌و ئامۆزاکەم تەمێت دەکەین، لە هەموو شارەکان دەرت دەکەین‌و سەرزەویت لێ تەسك دەکەینەوە کە چەند فراوانە، لەبەر ئەمە پادشای ڕۆم ترساو نوێنەری ناردو داوای ئاگربەستی کرد)[3].

هـ ـ سەنای ئیبنو تەیمیە دەربارەی مەعاویە

ئینو تەیمیە دەربارەی مەعاویە دەڵێ: (.. سابت بووە بە تەواتور کە پێغەمبەر ﷺ مەعاویەی کردووەتە ئەمیر کەم کەسێکیشی دەکرد بە ئەمیر، هەروەها جیهادی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردووە، ئەمین بووە لە لای پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ نووسیوە، هەرگیز پێغەمبەر ﷺ لە نووسینی وەحیدا تۆمەتباری نەکردووە، عومەری کوڕی خەتاب کردویەتی بە وەلی، کە عومەر شارەزاترین کەسبوو لە پیاوناسیدا خودای گەورە حەقی

---

[1] العواصم من القواصم، ص (٢١٠ ـ ٢١١).

[2] مريات خلافة معاوية ص (٣١).

[3] البداية والنهاية (١١٩/٨).

خستبووه سەر دڵو زمانی عومەر، هەرگیز لە والییەتییەکەیدا گلەیی لە مەعاویە نەبووە)[1].

و ـ سەنای ئیبنو کەسیر دەربارەی مەعاویە.

ئیبنو کەسیر دەربارەی ئەو دەڵێ: (هەموو گەلو میللەت کۆدەنگبوون لەسەر بەیعەت پێدانی ساڵی چلو یەکی کۆچی، مەعاویە سەربەخۆ بوو لە دەسەڵاتەکەیدا، لەو ماوە دوورەدا هەتا ئەو ساڵەی وەفاتی تێدا کرد، بەردەوام بووە، لە جیهادکردن لەسەر وڵاتی دوژمنان هەر بە خەمی وشەی (لااله الا الله)بوو، ئاڵاکەی هەر شەکاوە بوو لە دەستی نەکەوت، لە هەر چوار چمکی زەویەوە خێرات دەهاتە بەردەستی موسڵمانان لە ئاسودەییو دادپەروەریدا بوون، لە لێبوردنو چاوپۆشی بووە بەشیان)، دیسانەوە دەڵێ: (مەعاویە لەسەرخۆ[2] و دامەزراو بوو، سەرکردەبوو سەیدبوو لەناو خەڵکیدا، دەستی گوشادبوو دادگەرو هەڵکەوتوو بوو)[3]، دیسانە دەڵێ: (ئاکاری سیرەی پاکبوو، لیبوردنی چاکبوو، چاوپۆشی جوان بوو، پەردەپێدانی زۆر بوو، ڕەحمەتی خوای لێبێت)[4].

٤ـ مەعاویە فەرموودەی ریوایەت کردووە.

مەعاویە بە یەکێك لەوانە هەژمار دەکرێ کە گەشتووەتە شەرەفی ریوایەت کردن لە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەمەش لە پای ئەوەی پەیوەستی پێغەمبەر ﷺ بووە دوای فەتحی مەککە، لەبەر ئەوەی خەزووری بووەو نووسەری بووە مەعاویە (١٦٣) فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کردووەو بوخاریو موسلیم لەسەر چوار فەرمودەیان ئیتیفاقیان هەیە، بوخاری بە تەنها چوار فەرمودەی لێوە هێناوە، موسلیمیش پێنج فەرمودەی لە رێگەی ئەوەوە پێگەیشتووە[5]، سیرەی مەعاویە لەگەڵ گەلدا لە کاتی

---

[1] الفتاوى (٤/٤٧٢)، البداية والنهاية (٨/١٢٢)، سير اعلام النبلاء (٣/١٢٩).

[2] أفراد ابن أبي الدنيا، وأبوبكر بن أبي عاصم تصنيفا في حلم معاوية.

[3] البداية والنهاية (٨/١١٨).

[4] المصدر نفسه (٨/١٢٦).

[5] مرويات خلافة المعاوية في التأريخ الطبري، ص (٣٣).

دەسەڵاتیدا باشترین سیرەی والییەکان بووەو خەڵکی زۆر خۆشیان ویستووەو بە فەرمودەی صەحیح سابت بووە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (باشترین پێشەواتان ـ واتە حاکمتان ـ ئەوانەن کە خۆشتان دەوێن‌و ئەوانیش ئێوەیان خۆش دەوێت، ئێوە دوعای خێریان بۆ دەکەن‌و ئەوانیش دوعای خێر بۆ ئێوە دەکەن، نەگریسترین پێشەواتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانەو ئەوانیش رقیان لێتانە، نەفرەتیان لێ دەکەن‌و ئەوانیش نەفرەت لە ئێوە دەکەن)[1].

باسی مەعاویە بەم قسەیەی قازی ئەبوبەکری ئیبنولعەرەبی کۆتایی پێ دێنین دەڵێ: (عومەر کردی بە والی‌و سەرانسەری شامی دایە دەستی، عوسمانیش پەسەندی لەسەر کرد، بەڵکو ئەبوبەکریش کردی بە والی لەبەر ئەوەی یەزیدی برای کردبووە والی‌و یەزیدیش مەعاویەی کردە جێگری خۆی، عومەریش پەسەندی کرد، چونکە پەیوەندیی بە خەلافەتی ئەبوبەکرەوە هەبوو، جێگرەوەی والییەك بوو، کە ئەبوبەکر دایناﺑوو، سا عوسمان دوای عومەر هات‌و ئەویش پەسەندی کرد).

بڕوانە ئەم زنجیرە ئەڵقەکانی چەند ئەستوورە[2]، سابت بووە کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی بە نووسەری خۆی ئەمە ببووە سەنەدی والییەتییەکەی، ئەوەندە خەڵك کۆبوویەوە بۆ کاربەدەستکردنی مەعاویە بۆ هیچ کەسێکی تر لە پێشی ئەم یان لەدوای ئەم ئەوەندە کۆنەبووەیەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی رازی بوو، پاش ئەمیش هەر سێ خەلیفەکە پێی رازیی بوون، پاشان کە سوڵح کرا حەسەنی کوڕی عەلی سیبتی پێغەمبەر ﷺ ئیقراری خەلافەتی بۆ کرد[3].

## دووەم: عەبدوڵلای کوڕی عامری کوڕی کورەیزی

ناوی عەبدوڵلای کوڕی عامری کوڕی کورەیزی کوڕی ڕبیعەی کوڕی شەمسی کوڕی عەبدوی مەنافی کوڕی قوصەی قورەیشی عەبشەمییە[4]، لە سەردەمی پێغەمبەردا

---

[1] مسلم، کتاب الإمارة رقم (٦٥).

[2] العواصم من القواصم، ص (٨٢).

[3] المدينة المنورة، فجر الاسلام والعصر الراشدي، (٢/٢١٦).

[4] البداية والنهاية (٨/٩١).

ﷺ لەدایکبووە، لە ساڵی چوارەمی کۆچی[1]، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا عەمرەی قەزاوی کردو چووە مەککە عەبدوڵڵایان هەڵگرتو هێنایان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئیبنو حەجەر دەڵێ: (.. عەبدوڵڵا بایشکی داو دەمی کردەوە، پێغەمبەر ﷺ تفی کردە ناودەمی، فەرمووی ئەمە کوڕی سولەمییە، وتیان بەڵێ فەرموی: ئەمە وێنەیەکە لە ئێمە، کاتی پێغەمبەر ﷺ تفەکەی کردە ناو دەمیو سپاردی بە خودای گەورە، ئەویش تفەکەی پێغەمبەری ﷺ قوتدا)، دەڵێ: ئەو عەبدوڵڵایە بوو بە ئاودێر، چارەسەری هیچ زەوییەکی نەکردووە ئیللا ئاوی تیا دەرکەوتووەو بوەتە بەراو[2].

عەبدوڵڵای کوڕی عامر هیچ پایەیەکی ئیدارییو عەسکەری نەکردبوو، هەتا بوو بە والی بەسرە، لە ساڵی (٢٩)ی کۆچی (٦٤٩)زایینی، کوڕی خاڵی ئیمامی عوسمان بوو، چونکە دایکی عوسمان ئەرواى کچی کورەیز بوو، دایکی عەبدوڵڵاش لە تیرەی بەنی سولەیم[3] بوو، کاتێ کرا بە والی بەسرە تەمەنی بیستو چوار بیستو پێنج ساڵ بوو[4]، هەر والیی بەسرە بوو هەتا کوشتنی ئیمامی عوسمان کاتێ هەواڵی شەهیدبوونی ئیمامی عوسمانی پێگەیشت بە سوپایەکی زەبەلاح خۆی سازداو هەرچی چەكو چۆڵی هەبوو، هەڵی گرتو رۆیشت بۆ مەککە، پاشان گەڕایەوە بۆ بەسرەوە لەکارەساتی شەڕی جەمەل بەشداریی کرد بەڵام بەشداریی کارەساتی سەفینی نەکرد، هەرچەند (قەلقەشەند)ی باسی ئەوە دەکات کە لە شەڕی سەفەیندا بە لایەنگرییو هاوسۆزی لەگەڵ مەعاویەدا بوو[5]، لە خەلافەتی مەعاویەدا ماوەی سێ ساڵ ئیمارەتی بەدەست بوو، پاشان لایبردو لە مەدینە نیشتەجێ بوو، لە ساڵی (٥٧)ی کۆچی هەر لەوێ وەفاتی کرد[6]. لە ریوایەتی ئیبنو قوتەیبەدا لە مەککە وەفاتی کردووە لە شاخی عەرەفات

---

[1] تهذيب التهذيب (٢٧٢/٥).

[2] سير اعلام النبلاء (١٩/٣)، تهذيب التهذيب (٢٧٣/٥)، أسر الغابة (٢٩٣/٣) رقم (٣٠٣١).

[3] الطبقات (٣١/٥)، تهذيب التهذيب (٢٧٢/٥).

[4] البداية والنهاية (٩١/٨).

[5] مجلة مؤرخ العربي رقم (٢١)ص (١٢٨).

[6] سير اعلام النبلاء (١٢/٣).

نێژراوه له ساڵی (٥٩)ی کۆچی[1]، ئیبنو سه‌عد په‌سنی ده‌داته‌وه ده‌ڵێ: (عه‌بدوڵلا شه‌ره‌یف بووه سه‌خی بووه، که‌ریم بووه،، دارایی‌و منداڵی زۆر بووه، زۆر حه‌زی به ئاوه‌دانکردنه‌وه بووه)[2].

ئیبنو حه‌جه‌ر له باره‌یه‌وه ده‌ڵێ: (عه‌بدوڵلا به‌خشنده‌و به‌ڕێز بوو باشترین که‌سبوو[3]، بوێر بوو[4]، عه‌بدوڵلای کوڕی عامر شوێنه‌واری په‌سه‌ندی هه‌یه[5]، له فتوحاتدا توانی ئاواتی فارسه‌کان بنه‌بڕ بکات به شێوه‌یه‌کی تێرو ته‌سه‌ل، ئه‌وکاته‌ی ده‌ستی گرت به‌سه‌ر دواهه‌مین کۆسی ئاواتی فارسه کۆنه‌کاندا، چونکه دواهه‌مین پادشای فارسه‌کانی له بێخ ده‌رهێنا، که یه‌زگورد پاشای کوڕی شه‌هریاری کوڕی کیسرا بوو، حه‌رزادو مه‌هری برای رۆسته‌م، ئه‌م دوانه ده‌یان ویست موعاره‌زه‌یه‌کی فارسی دژی موسڵمانان به‌رپا بکه‌ن، وێڕای ئه‌مانه‌ش عه‌بدوڵلای عامر له کاروباری ئیداریی‌و سه‌ربازیشدا ورده‌کاربوو، زۆر گرنگی ده‌دا به مه‌عاریفه ئیسلامییه‌کان، رێوایه‌تکراوه که فه‌رموده‌ی له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ ریوایه‌ت کردووه، ئیبنو قوته‌یبه ده‌ڵێ: (له یه‌ك فه‌رموده زیاتر فه‌رمووده‌ی ریوایه‌تی نه‌کردووه[6]، له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ جگه له‌م فه‌رموده‌یه له‌گشت کیتابه فه‌رمووده‌ییه‌کاندا هیچی تری ریوایه‌ت نه‌کردووه)[7]، ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ش که ریوایه‌تی کردووه ئیبنو قانع‌و ئیبنو منده له رێگه‌ی موصعه‌بی زوبێره‌وه ریوایه‌تیان کردوه‌و: باوکم بۆی گێڕامه‌وه له باپیرمه‌وه موصعه‌بی کوڕی سابیتی کوڕی حه‌نزه‌ڵه‌ی کوڕی قه‌یس ئه‌ویش له عه‌بدوڵلای زوبێره‌وه ئه‌ویش عه‌بدوڵلای عامره، که پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموی (هه‌رکه‌سێ له پێناو ماڵ‌و حاڵی خۆیدا بکوژرێ ئه‌وه شه‌هیده)[8].

---

[1] المعارف لابن قتيبة، ص (٣٢١).

[2] مجلة المؤرخ العربي رقم (٢١)، ص (١٢٩).

[3] تهذيب التهذيب (٢٧٢/٥).

[4] العقد الفريد (٢٩٣/١ ـ ٢٩٤).

[5] صبح الأعشى في صاعة الانشاء، أبو العباس القلقشند (٤٥٠/١ ـ ٤٥١).

[6] المعارف، ص (٣٢١).

[7] المصدر نفسه.

[8] الحاكم في المستدرس (٦٣٩/٣)، اسناده ضعيف له مايقوية في الباب.

## چاكسازییە ئابورییەكانی عەبدوڵڵای عامر لە بەسرەدا

ناوی عەبدوڵڵای كوڕی عامر نزیكو هاوپێچی ژمارەیەك چاكسازییە لە بەسرە، كەمتەرخەمیشی نەكردووە لە هەڵسوكەوتە سەربازییە دەگمەن نموونەییەكانیدا، لەو ژمارە سەركەوتنانەی كە تۆماری كرد سەركەوتنەكەی بوو بەسەر ئاگرپەرستەكاندا پاشماوە داتەپیوەكانیانی ریشەكێش كردو دەستی گرت بەسەر ئاواتەكانی یەزگوردداا.

چاكسازییە ئابورییەكانی نموونەیەك بوو لە بایەخدانو برەودان بە بازاڕی بەسرە، ئەم بازاڕەی بە پارەی خۆی كڕیو بەخشی بە هاووڵاتیان[1]، بازاڕەكەش لە ناوەڕاستی بەسرەدا بوو، بە پێی ئەو بەڵگەیەی كە خەلیفە (بن خەیات) باسی كردووە، بازاڕەكە لەسەر لێواری ئەو رووبارەبوو كە لە ناوەڕاستی شاردایە، ئەمە رایەكی جوانە چونكە بازاڕ ناوەندێكی گرنگەو لە ناوەڕاستی شاردایە، لەوانەیە دیارترین كارە چاكسازییەكانی لە بەسرەدا لە بواری ئاوادانو ئاوداشتیدا بێت، عەبدوڵڵای عامر زۆر گرنگی دەدا بەم بوارە.

ئیبنو قوتەیبە باسی ئەوە دەكات كە عەبدوڵڵای عامر لە بەسرە دوو روباری هەڵكەندن یەكێكیان لە خۆرهەڵاتو ئەوی تریان پێی دەوترێ (ئومو عەبدوڵڵا) بە ناوی دایكی عەبدوڵڵاوە ناونراوە[2]، عەبدوڵڵا فەرمانی كرد بە زیادی كوڕی ئەبی سوفیان (ئەبلە) بكەنێ، ئەوكاتە زیاد سەرپەرشتیاری دیوانو بەیتولمال بوو لە لایەن عەبدوڵڵای كوڕی عامرەوە، هەركاتی عەبدوڵڵا بڕۆشتایە بۆ فتوحات زیادی لە شوێنی خۆی دادەنا[3]، خەلیفەی كوڕی خەیات باسی ئەوە دەكات، كە زیاد رووباری ئەبلەی كەندووە، هەتا گەشتە كۆتایی شاخەكە، ئەوەی سەرپەرشتی هەڵكەندنەكەی زیادی دەكرد عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكر بوو[4]، كاتی عەبدوڕڕەحمان ئاوەكەی ڕادا، ئەسپەكەی

---

[1] الطبقات الكبرى (٥/٧٣)، مجلة المؤرخ العربي هي العمدة في ترجمتي لعبداللع بن عامر، حيث استفدت من الاستاذ محمد حمادي جزاره الله خيرا.

[2] مجلة مؤرخ العربي، رقم ٢١، محمد حمادي، ص (١٣٤).

[3] فتوح البلدان للبلاذري، ص (٣٥١).

[4] تأريخ خليفة بن خياط.

غارداو خەریکبوو ئاوەکە پێشی بداتەوە[1]، عەبدوڵلای عامر حەوزێکی هەڵکەندو ناوی دایکی خۆی لێناو پێیان دەوت حەوزی دایکی عەبدوڵلا[2]، بەلازری باسی ئەوە دەکات کە عەبدوڵلای کوڕی عامر روبارێکی هەڵکەندو سەرپەرشتی کاری کەندنەکەی سپارد بە بەردەستەکەی، کە ناوی (نافز) بوو، نافز سەرکەوتوو بوو لە کارەکەیدا بۆیە، پێی دەڵێن روباری (نافز)[3]، هەروەها روباری مورەی هەبوو، چونکە عەبدوڵلای مورە سەرپەرشتی دەکرد بۆ عەبدوڵلای عامر، کۆیلەی ئەبوبەکری صدیق بوو[4]، هەروەها بەسرە روباری ئەساویرەی هەبوو، کە عەبدوڵلا خۆی کەندی بۆیان، بەلازری باسی ڕوباری (قورە) دەکات، دەڵێ: (قورە) ئاماژەیە بۆ قورەی کوڕی حەیانی باهیلی، هەروەها روبارێکی کۆن هەبوو، دایکی عەبدوڵلای عامر[5] سەندیو کردی بەخێر بۆ فریاگوزاری ئەهلی بەسرە[6].

لەم پێشینەیەی باسمان کرد بۆمان روون دەبێتەوە، کە عەبدوڵلای عامر زۆر برەوی داوە بە کەندنی روبارو چەم، لە پێناوی ئەوەی گەشە بە کشتوکاڵ بدات، کە بنەمای ژیانی ئابوورییە، وێڕای ئەوەی بەسرە شوێنێکی ستراتیژیشە بە نیسبەت رێگە بازرگانییەکانەوە، لە رووی سەبارزییەوە وەکو بنکەیەکی فتوحاتی ئیسلامیی لە خۆرهەڵاتدا دەکرێ تێبینی مەدای ئارەزووی عەبدوڵلای عامر بکەین لە چاکسازیدا لەم وتەیەدا دەڵێ: ئەگەر بۆم بڕەخسایە ئەوەندە ئاوم دابین دەکرد ئافرەتان بەسواری ولاخەکانیان بچونایە بۆ پێداویتسییەکانیان ئاویان لێ نەبڕایە هەتا تەوافی مەککەیان دەکرد، واتە: (لە بەسرەوە هەتا مەککە ئاوی لێ نەبڕایە)[7].

---

[1] فتوح البلدان ص (٣٥١).

[2] مجلة مؤرخ العربي رقم (٢١)، عبدالله بن عامر، ص (١٣٤).

[3] مجلة مؤرخ العربي الرقم (٢١)، (١٣٥)، فتوح البلدان، ص (٣٥٤).

[4] مجلة مؤرخ العربي الرقم (٢١)، (١٣٦)، فتوح البلدان، ص (٣٥٤).

[5] مجلة مؤرخ العربي الرقم (٢١)، ص (١٣٥).

[6] فتوح البلدان، ص (٣٥٤،٣٥٣).

[7] المعارف لابن قتيبة، ص (٣٢١).

لە ڕاستیدا چاکسازییەکان گرنگی فتوحاتی خۆرهەڵاتی لە دڵی عەبدوڵڵادا کەم نەکردەوەو فەرامۆشی نەکرد، ئەوکاتە بەسرە بوو بە بنکەیەکی سەربازیی بۆ خەلافەت لە ڕووی وڵاتانی خۆرهەڵاتەوە، دکتۆر صالح عەلی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە فتوحاتە پانو پۆڕەکان وای کرد بوو داهاتی بەسرە زیاد بکات خۆشگوزەرانی تەشەنە بکات باری ئابووری چاك بکات، وەهانی بازرگانو پیاوە کاسبەکانی دا کە بازارِتیژی بکەن، بەم شێوەیە ژیانی شارستانی بەخێرایی لە بەسرەدا گەشەی کرد[1]، دۆخی دارایی لە ئیمارەتی بەسرەدا زۆر باش بوو لە دەرئەنجامی فتوحاتە فراوانەکانی خۆرهەڵات وە چالاکی ئابووری بازرگانی بەسرە زیادی کرد، ئاسایش بەرقەرار بوو، عەبدوڵڵای عامر پیاوێکی خاکەسار بووە دەرگای لە ڕووی خەڵکدا کراوەبووە، هەستا سزای دەرگاوانەکانی داوەو فەرمانی پێ کردون، کە نە شەوو نە ڕۆژ دەرگاکەی دانەخەن[2]، لە ڕاستیدا عەبدوڵڵای عامر بوو بە خاوەنی ناوبانگێکی گەورە لە بەسرەدا، ئیبنو سەعد دەڵێ: خەڵك هەر دەڵێن: ئیبنو عامر وتی ئیبنو عامر کردی)[3]، ئەمە لە دەرئەنجامی کردارە چاکسازییەکانەوە بووەو ئاکاری پەسەندبووەو گەل زۆر خۆشیان ویستووە[4]، عەبدوڵڵای عامر لە بەسرەمایەوە هەتا کوشتنی ئیمامی عوسمان[5].

ئەمە عەبدوڵڵای کوڕێ عامر بوو، یەکێکە لە والییەکانی عوسمان ئەو بوو ڕوباری بەسرەی شەقکردو کەندی، یەکەمین کەسبوو لە کێوی عەرەفات حەوزی کردووەو چاوگە ئاوەکانی تێڕژاندووە[6]، ئەو پیاوەیە کە چاکەکاریو ئەوینی لە دڵی خەڵکیدا هەبووەو ئینکاری ناکرێ وەکو ئیبنو تەیمییە[7] دەڵێ: زەهەبی لە بارەیەوە دەڵێ: (یەکێکە لە

---

[1] التنظيمات الاجتماعية والأقتصادية، ص (٣٠ ـ ٣١).

[2] مجلة مؤرخ العربي العدد (٢١) عبدالله بن عامر ـ محمد عادي، ص (١٣٨).

[3] الطبقات (٥/٣٣).

[4] مجلة مؤرخ العربي العدد (٢١) عبدالله بن عامر ـ محمد عادي، ص (١٣٨).

[5] البداية والنهاية (٨/٩١).

[6] المصدر نفسه.

[7] منهاج السنة (٣/١٨٩، ١٩٠)

ئەمیرە هەرە گەورەکانی ئیسلام‌و دلێرترین‌و سەخیترینیانە نەرم‌و نیانیی‌و لەسەرخۆیی تێدابووە)[1].

## سێیەم: وەلیدی کوڕی عەقەبە

ناوی وەلیدی کوڕی عەقەبەی کوڕی ئەبی موعیتی کوڕی ئەبی عەمری کوڕی ئومەیەی کوڕی عەبدی شەمسی کوڕی عەبدی مەنافە، پێی دەوترێ ئەبو وەهبی ئومەوی، هاوەڵێیەتی کەمبووە[2]، برای دایکی عوسمانە، وەلیدی کوڕی عەقەبە یەکێکە لە پیاوانی وڵاتی

ئیسلامی لە سەردەمی ئەبوبەکرو عومەردا، ئەم دوانە کە کەسی شیاو ئەمانەتپارێزیان هەڵدەبژارد بۆ کارەکانیان لە ناو پیاواندا، ئەمەش بوو بە گەورەترین هۆکار بۆ بڵاوبوونەوەی بەرەکەتی ئیسلام لە فراوانترین چوارچێوەدا لە سەردەمی ئەم دوانەدا، وەلید جێگەی متمانەو بایەخی هەردوو خەلیفەکە بووە، کاتێ هەردووکیاتن لێوەشاوەیی‌و ئیمانڕاستییان[3] تیا بەدی کرد کۆمەڵێ کاروباری پڕبایەخیان دایە دەستی‌و یەکەمین کەسبوو نامەی نهێنی نێوان خەلیفەو (خالیدی کوڕی وەلیدی) سەرلەشکری هەڵگرتووە لە ڕووداوی (المزار) دژی فارسەکان[4] لە ساڵی (١٢) کۆچی، پاشان وەکو یارمەتی دەرێك ناردی بۆ یارمەتیدانی عیازی کوڕی غونمی فەهری[5]، لە ساڵی (١٣) کۆچی صەدەقاتی خوزاعەی کۆدەکردەوە، پاشان کاتێ ئەبوبەکر عەزمی کرد فەتحی شام بکات، وەلید وەکو عەمری کوڕی عاص وابوو بەلایەوە لە متمانەو حورمەت‌و کەرامەتدا بۆیە نامەی نووسی بۆ عەمری کوڕی عاص‌و نامەشی نووسی بۆ وەلیدی کوڕی عەقەبەو بانگهێشتی کردن بۆ سەرکردایەتی سوپای جیهاد، عەمری کوڕی عاص بەیداخی لیوای ئیسلامیی هەڵگرت بەرەو فەلەستین، وەلیدیش بو بە

---

[1] سیر اعلام النبلاء (٣/٢١).

[2] سیر اعلام النبلاء (٣/٤١٢، ٤١٣).

[3] فصل الخطاب في موافق الاصحاب، محمد صالح الفرسی، ص (٧٨).

[4] تأريخ الطبري (٤/١٦٨).

[5] أعصر نفسه (٤/١٩٤).

فەرمانداری خۆرهەڵاتی ئوردون[1]، پاشان دەبینین وەلید لە ساڵی (١٥)ی کۆچی لە سەردەمی عومەردا ئەمیری مەملەکەتی بەنی تەغلیبو عەرەبی جەزیرە بووە[2]، لەم ویلایەتەدا پشتەوەی موجاهیدنی پاراستووە لە وڵاتانی شام نەوەکو لە پشتەوە دزەیان بۆ بکەن، وەلید هەلی دەقۆزتەوە لە ویلایەتەکەیداو هەمیشە جمەی دەهاتو پڕبوو لە کاری جیهادی جەنگیو کاری ئیداری بانگەوازکارێك بوو بۆ ڕێبازی خودا، شێوازو حیکمەتو ئامۆژگاریی چاکی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی گاورەکانی ئیادو بەنی تەغلەب بێنە ناو ئیسلامەوە[3]، بەم رابردووە شکۆدارەی وەلید هاتو لە خەلافەتی ئیمامی عوسماندا کرایە والی کوفەو باشترین والی کوفەش بوو نەرمو نیانو دادگەرو چاکەخوازبوو، سوپاکەشی لە ماوەی والییەتییەکەیدا بە ئاسۆیی خۆرهەڵاتدا دەهاتنو دەچوون، بە فاتیحیو سەرکەوتوویی بۆ هاتوویی، هەروەك گەورەترین قازی ئیسلام لە مێژوودا لە ڕووی زانستو فەزڵو ویژدانەوە شایەتی بۆ داوە بەبێ ئاگاداری خۆی ئەویش ئیمامی شەعبییە[4]، کە تابیعییەکی بەڕێزە وەسفی غەزاو ئەمارەتەکەی وەلید دەکات بەم وتەیە (کاتێ باسی غەزای مەسلەمەی کوڕی عەبدول مەلیکیان[5] بۆ دەکرد وتی: (ئەگەر غەزاو ئەمارەتی وەلیدتتان ببینایە لەمە زیاترتان دەوت) غەزای دەکرد هەتا کوێو کوێ نەدەوەستا هەرگیز کەمتەرخەمی نەکردووە، کەس گەمەی پێ نەکردووە هەتا لە کارەکەی لابراوە)[6]، وەلید خۆشەویسترین خەڵك بوو لەناو خەڵکداو نەرمونیان بوو بەرامبەریان، پێنج ساڵ تێپەڕیو خانووەکەی دەرگای پێوە نەبوو[7]، عوسمان دەڵێ: (لەبەر برایەتی وەلیدم نەکردووە بە والی، لەبەر ئەوە کردومە کوڕی ئومو حەکیمی بەیزای پوری پێغەمبەر ﷺو جمکی باوکیەتی)، کردنە والیش ئیجتیهادە، عومەر

---

[1] فصل الخطاب في موافق الاصحاب، ص (٧٨).

[2] تأريخ الطبري (٥/٢٨ ـ ٢٩).

[3] فصل الخطاب في موافق الاصحاب، ص (٧٨).

[4] المصدر نفسه.

[5] مسلمة بن عبدالمليك بن مروان احد قادة الفاتحين كوفي سنة ١٢٠هـ.

[6] التمهيد والتبيان، ص (٤٠).

[7] تأريخ الطبري (٥/٢٥١).

سەعدی ئەبی وەقاصی لەسەر کار لابردو لە خواری ئەوەی کرد بە والی، پلەو پایەی کەمتر بوو[1].

نمایشکردنی سیرەی ئەم هاوەڵە بەڕێزەو ئەم پاڵەوانە ئیسلامییە مەزنە جێگەی متمانەی هەر سێ خەلیفە راشیدینەکانەو گومانی تیا نییە، ئەوەندە شیاوی ویلایەتە ئەو گومانانە دەسڕێتەوە کە گوایە ئایەت دابەزیوە لە دژیو ناوی ناوە فاسقو ئارەقی خواردووە، ئەم قسەو قسەلۆکانە پیویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، ئەم دوو قسەلۆکەت بۆ لێکدەدەمەوە[2].

ئایا سابت بووە کە وەلید ئایەت دابەزیوە لە دژی و خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ) (الحجرات: ٦).

بۆ ئەم چیرۆکە ڕاوییەکان نووسیویانەو دەڵێن (پێغەمبەر ﷺ وەلیدی کوڕی عەقەبەی ناردووە بۆ بەنی موصتەلەق بۆ کۆکردنەوەی صەدەقە، زۆری پێنەچوو وەلید هەواڵی هێناوەتەوە، کە بەنی موستەلەق هەڵگەراونەتەوەو حاشا دەکەن لە صەدەقەدان بەنی موستەلەقیش چوون بە دەم وەلیدەوە وەلیدیش ترساندونیو گوێی نەگرتووە بۆ قسەکانیانو گەڕاوەتەوە لە ناویانو هەواڵی پاشگەزبوونەوەی داوە بە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ خالیدی کوڕی وەلید دەنێرێتو فەرمانی پێدەکات کە تەمێیان بکات، بەنی موستەلەقیش پێی رادەگەینن کە دەستیان لە ئیسلام بەر نەداوە، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی[3]، ژمارەیەك ریوایەتی تر هاتووە، بەڵام ئەم چیرۆکە سەنەدێکی گەێنراو صەحیحی نییە[4]، چیرۆکەکە لەوە کەمترە وەسفی بکەین بڵێین سەنەدەکەی لاوازە، خۆ ئەگەر سەنەدی لاوازیش وەرگرین لەو کارە باشانەی، کە حەرامی پێ حەڵاڵ نابێتو حەڵاڵی پێ حەرام نابێت ئەوا سەنەدی لاواز لە چیرۆکی وەلیددا وەرناگرین،

---

[1] العواصم من القواصم، ص (٨٦).

[2] فصل الخطاب في موافق الآصحاب، ص (٧٩).

[3] المدينة النبوية فجر الاسلام (١٧٦/٢).

[4] أعصر نفسه.

چونکە حەرامیٰ حەلاڵ دەکات، وەسفی پیاویٚ بە خراپی دەکات کە هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ حەلاڵ نییە بۆ ساتێکیش بێت ناو بنرێت فاسق، ئێمە چۆن سەنەدی لاواز قبوڵ دەکەین ئەم ئایەتە خۆی باسی جەختکردنو سۆراغکردنی هەواڵ دەکات، ئەوسا قبوڵ دەکریٚ، هەروەها ئەم ئایەتەیە بەردی بناغەی زانستی ریوایەتیکردنی داناوە[1]، چیرۆکی وەلیدی کوڕی عەقبەو ئەو قسەو قسەلۆکانەی دەیدەنە پاڵی قبوڵ ناکریٚ، هەتا هەوالێکی صەحیحی دەق راستو سەنەد دروستی نەبێت، چونکە ئەم ریوایەتە بە فاسق ناوی دەبات، ئەمە تەشەرەو شلگیری تیا ناکریٚو قبوڵ ناکریٚ، ئەگەر پیاوێکی ئەم سەردەمە کە پانگزە سەدە دوای سەردەمی بانگەوازی ئیسلامە بەم سیفەتە وەسف بکرێت قبوڵ ناکریٚو ئیتر چۆن شلگیری دەکریٚ بۆ قبوڵ کردنی ئەو سیفەتە کە بدرێتە پاڵ پیاوێك کە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا ژیابیٚو لە سەردەمی خەلیفە راشیدینەکاندا ژیابێتو کۆمەڵیٚ کاری ترسناکی ناهەمواری بخەیتە ئەستۆ، ئەم چیرۆکەو رووداوەکانی پەیوەندیی بە عەقیدەی ئیسلامییەوە هەیە، هەواڵی ئەم بابەتە لە مێژووی ئیسلامدا نابێت شلگیری بکرێت لەوەرگرتنیدا، وەکو شلگیریی دەکریٚ لەمەڕ وەرگرتنی ئەو هەوالانەی پەیوەندیی بە ئاوەدانی و شارستانییەوە هەیە، پاشان وەلیدی کوڕی عەقبە یەکێکە لە پیاوانی فتوحات زۆربەی ئەو تەشەرانەی دەگیرێتە ئیسلام بۆ ئەم گرۆ خەڵکەیە، هەندیٚ لە مێژوونووسان واگومان دەبەن ئەوانە بە ناچاری موسڵمان بوونو ئیمان نەچووەتە دڵنیان، ئەمە بێگومان گومانێکی پوچەڵە[2]، دەنگوباسی وەلیدی کوڕی عەقبە راوییەکان پڕوپاگەندەیان تیٚ خستووەو ئەوەندە هەوەسی مەزهەبیو سیاسیی و گۆڵمەزی تیا کراوە باسەکەی شێواندووە، وردە وردە بووەتە گۆڕەپانی ڕکەبەری چیرۆکنووسەکان بۆ دەرخستنی توانا دەست هەڵبەستنو سەلماندنی بلیمەتی ئەدەبی[3] تاوانکارییان، ئەوەی کە لێڵو تەڵخە لەلای راوییەکان ناردنی وەلیدی کوڕی عەقبەیە بۆ کۆکردنەوەی خێراتی بەنی موستەلەق، لەبارەی تەمەن منداڵی وەلیدەوە

---

[1] المدينة المنورة فجر الاسلام (١٨٢/٢).

[2] المدينة المنورة فجر الاسلام (١٧٣/٢).

[3] المصدر نفسه.

لەوکاتەدا قسەیەکی سەنەد گەیەێنراوی پیاوە سیقەدارەکان هەیە بەرپەرچیئەو ریوایەتە دەداتەوە، کە هەڵبەستراوە دەڵێت: وەلیدی کوڕی عەقەبە ڕۆژی فەتحی مەککە منداڵ بووە، هەرکەسێ لە تەمەنی ئەودا بووایە پێغەمبەر ﷺ بە بریکاری خۆی وەکو کارگێڕی نەیدەنارد بۆ هیچ لایەك، لە فەیازی کوڕی موحەممەدی روقاوە ئەویش لە جەعفەری کوڕی بڕقانەوە ئەویش لە سابتی کوڕی حەججاجی کیلابییەوە، ئەویش لە عەبدوڵڵای هەمەدانییەوە، ئەویش لە وەلیدی کوڕی عەقەبەوە دەڵێ: (کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەتحی مەککەی کرد، خەڵکی مەککە منداڵەکانی خۆیانیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ دەستی دەهێنا بەسەریانداو دوعای خێری بۆ دەکردن، منیان هێنا بۆ لایو منیش بە خەلۆق بوون خۆش کرابووم، دەستی نەهێنا بەسەرمدا لەبەر ئەوەی دایکم خەلوقی لێدابووم، دەستی پیا نەهێنام لەبەر خاتری خەلوقەکە[1]، ئەم چیرۆکە هەوەسبازی مەزهەبی باری پێکردووە، وەلید ئەمەویو عوسمانییە ئەو کەسەی ناوی وەلیدی ناشیرن کردووە بە چیرۆکی هاتنەخوارەوەی ئایەتی (إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ) شیعەیەکی رافزییە ناوی (موحەممەدی کوڕی سائیبی کەلبی)یە، ئیبنو حەجەر دەربارەی ئەم پیاوە دەڵێ: (کوفە دوو درۆزنی تێدایە لۆکەکەیان (پاکەکەیان) موحەممەدی کەلبییەوو دواهەمینەکەیان (سەدی)یە[2]، وەلیدی هەڵبژاردووە بۆ ئەم چیرۆکە، چونکە پەیوەندی هەبووە بە کۆکردنەوەی خێراتەوە، وەلید لە سەردەمی ئەبوبەکردا کاری کۆکردنەوەی زەکاتو صەدەقاتی خوزاعەی کردووە (قوطاعة)، لە سەردەمی عومەردا کاری کۆکردنەوەی صەدەقاتی بەنی تەغلەبو جەزیرەی کردووە، شیعەکان بە بۆنەی چیرۆکەکەی وەلیدەوە تانەشیان داوە لە عوسمانو عەیبدارییان کردووە[3]، ئێمە ئینکاری ئەوە ناکەین کە ئەم ئایەتە بە بۆنەی ناوەڕۆکی چیرۆکی بەنی موستەلەقەوە دابەزی، بەڵام ئەوەی ئێمە نکولی لێدەکەین ئەوەیە، کە وەلید بە فاسق وەسف کرابێت لەم ئایەتەدا، چونکە فەرمودەی (إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ) بە سیغەی نەکیرە هاتووەو هەموان دەگرێتەوەو دەست نیشان

---

[1] مسند أحمد (٣٢/٤).

[2] المدينة المنورة فجر الاسلام (١٧٩/٢).

[3] المصدر نفسه(١٨٠/٢).

نەکراوە، چونکە نەکیرە لە سیاقی شەرتدا هات گشتگیرە هەروەك گشتگیرە ئەگەر کەوتە سیاقی نەفی ئەگەر راستبێ وای کردبێت)[1].

**داری حەددان لە وەلیدی کوڕی عەقەبە لەسەر ئارەق خواردنەوە**

بەڵام حەددان لە وەلید لەسەر ئارەق بەڕیوایەتی بوخاریو موسلیم سابت بووە، کە عوسمانداری حەددی لێداوە دوای ئەوەی شایەت شایەتی لەسەرداوە، ئەمە گلەیی نییە لەسەر عوسمان، بەڵکو مناقیبێکە لە مناقیبەکانی عوسمان[2]، کە هەستاوە داری حەددی لێداوەو لە ئەمیریی کوفە لایبردووە بوخاری باسی ئەم بەسەرهاتەی کردووە لە (بابی مەناقیبەکانی عوسماندا)، ئیمامی عەلی دەڵێت: (ئێوە ئەو تانانەی دەیدەن لە عوسمان وەکو ئەو کەسە وایە ڕم بدات لە خۆی بۆ ئەوەی هێزی خۆی بکوژێ)[3]، عوسمان تاوانی چییە دەربارەی پیاوێك لەسەر ڕەفتارەکەی داری حەددی لێدابێتو لەسەر والییەتی لایبردبێت، عوسمان تاوانی چییە لەوەی بەرپابووە لە کاروبارماندا[4]، پاشان ئەم جۆرە رووداوە تەنیا لە سەردەمی عوسماندا تاین نەبووە، لە هیچ سەردەمێکی تردا نەبووبێت، بەڵکو پێشتریش هەبووە لە سەردەمی عومەردا کە باسکراوە کە قومەدای کوڕی مەزعون، هاوەڵێەتیشی هەبووە، کەچی ئارەقی خواردووە لە هەمانکاتدا ئەمیری بەحرەینیش بووە لە لایەن عومەرەوە، ئەویش حەددی لێداوەو لەسەر کار لایبرد[5]، هەندێ لە مێژوونووسان دەڵێن سابت نییە، کە وەلید ئارەقی خواردبێت، حافق) لە (الاصابە)دا دەڵێت: هەندێ لە خەڵکی ئەهلی کوفە غەرەزیان لێگرتو بە ناحەقی شایەتییان لەسەرداوە[6]، ئیبنو خەلدون ئاماژەی بۆ ئەم رووداوە کردووە دەڵێ: (بەردەوام پڕوپاگانتە - واتە لەسەرکارمەندەکانی عوسمان لە لایەن ئاژاوەچییەکان - تەشەنەی کردووەو شەپۆلی داوە وەلیدی کوڕی عەقەبەیان تۆمەتبار کردووە بە ئارەقخواردنو

---

[1] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/١٨٠).

[2] البخاري، كتاب مناصب عثمان.

[3] الردء: هو العون، تأريخ الطبري (٥/٢٧٨).

[4] تحقيق موافق الصحابة في الفتنة (١/٤٢١).

[5] العواصم من القواصم، ص (٩٣).

[6] اصابة (٣/٦٣٨).

جەماعەتێکی خەڵکی کوفە شایەتییان داوە لەسەری، عوسمانیش داری حەددی لێداو لەسەر کار لایبرد[١]، ئەوەی تەبەری باسی کردووە بە دوورودرێژی، کە کوڕانێك کە هی ئەبی زەینەبو ئەبی موەرەعو جوندیی کوڕی زوهرە بوون، چونە سەر ماڵی ئیبنو حوسەیمانو کوشتیان، شورەحی خوزاعی، کە هاوەڵە شایەتی لەسەر دانو کوڕەکە ئەبو شورەیحیش شایەتی لەسەر دان ـ چونکە دراوسێی ئیبنو حوسەیمان بوون ـ وەلیدیش تۆڵەی لێ سەندنەوە، باوکی ئەم کوژراوانە تەڵەو داویان نایەوە بۆ وەلیدو دەستیان کرد بە موراقەبەی جموجوڵەکانی، جارێکیان ئەبو زوبێدی شاعیر بوو بە میوانی وەلید، کە کابرایەکی گاور بوو لە هۆزی بەنی تەغلیبی خاڵوانی بوو لەسەر دەستی وەلید موسڵمانبوو، ئەم میوانە بە ئارەقخۆر ناسراوبوو، هەندێ گێلو گەمژە قسەیان دەکرد لەسەر هاوڕێیەتی ئەبو زوبێد لە لایەن وەلیدەوە ئالەم کاتەدا ئەبو زەینەبو ئەبو مورەع باشترین هەلیان قۆستەوە، کردیان بە قاوە قاوو رۆشتن بۆ مەدینە، چونە لای ئیمامی عوسمانو شایەتیان دا لەسەر وەلید کە ئارەقی خواردووە، ئەوان بینیویانە ئارەقی هەڵهێناوەتەوە، ولیدیان لە کوفە هێنایەوە سوێندی خوارد بۆ عوسمانو هەواڵی مەرامی ئەم دوانەی پێگەیاند، عوسمان وتی: (حدودی خودای گەورەت بەسەردا جێبەجێ دەکەم، با ئەو شایەتە ناهەق بێژانە بکەونە ناو ئاگر براکەم خۆت بگرە)[٢]، (محب الدين الخگيب) دەڵێ: ئەو زیادەیەی کە لە ریوایەتی موسلیمدا هاتووە، کە وەلیدی هاتووە، دوو ڕکات نوێژی بەیانی کردووە، پاشان وتویەتی بۆتان زیاد بکەم، لە ڕێگەی ئیمامی ئەحمەدەوە هاتووە، کە وەلید نوێژی بەیانی چوار رکاتی کردووە، ئەمە بە شاهیدی شایەتەکان نەسەلماوەو نەوتراوە، ئەمە قسەی (حچینی) چیرۆکگێڕەوەکەیەو خۆی شایەت نییەو لە شایەتەکانیشی نەبیستووە، لە کاتی ئەم رووداوە پڕگومانەدا ئەم چیرۆکنووسە قسەی لێوەرناگیرێت[٣].

---

[١] تاريخ ابن خلدون (٢/٤٧٣)، فصل الخطاب في موافق الأصحاب، ص (٨١).

[٢] تاريخ الطبري (٥/٢٧٧).

[٣] العواصم من القواصم، ص (٩٦ ـ ٩٧).

وەلید والی عوسمان بوو لەسەر کوفە، وەلیدی کوڕی عەقەبە پیاوێکی موجاهیدو فاتیحە، ئەو دادگەرە مەزلۆمەیە کە هەرکارێکی خاوێنی توانیبێت ئەنجامی داوە بۆ گەلەکەی، پاشان بە چاوی خۆی بینی پیاو خراپان پڕوپاگەندە دەکەن بۆ پیاو چاکان و باتڵەکانیش گوێی بۆ دەگیرێنو پەسەند دەکەن، هەستا دوای کوشتنی ئیمامی ئیمامی عوسمان دورەپەرێز بوو لە خەڵکو کەناری گرت، لە شیوێکدا دابڕابوو لە ژاوەژاوی کۆمەڵگا بانزە میلدوورکەوتەوە لە شارو لە زەوی ئەو دورگەی، کە جیهادی تیا کردو بانگەوازی خەلکی تیا کرد بۆ ئیسلامەتی لە سەردەمی عومەر داوە[1] دوری گرت لە هەموو ئەو شەڕانەی کە روویدا لە نێوان عەلیو مەعاویەدا، هەر لە شیوەکەی خۆی مردو هەر لەوێش نێژرا لە ساڵی (٦١)ی کۆچی، دەشڵێن لە رۆژگاری مەعاویەدا مردووە[2].

## چوارەم: سەعیدی کوڕی عاص

ناوی سەعیدی کوڕی عاصی ئومەیەی کوڕی عەبدی شەمسی کوڕی عەبدی مەنافی قورەیشی ئومەوییە[3]، ئیبنو حاتەم دەڵێ: (هاوەڵێەتی کردووە دوای وەلیدی کوڕی عەقەبە بووەتە والی کوفەو یەکێکە لە زمانپاراوەکانی قورەیش، لەبەر ئەمە عوسمان دەستنیشانی کردووە بۆ نوسینەوەی قورئان، لە جوملەی ئەوانەی کە دیاری کردوون)، ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: عوسمان فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیتو عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرو سەعیدی کوڕی عاصو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام کە قورئان لە پەڕاوەکاندا بنوسنەوەو نوسخەی لێ بگرنەوە، عوسمان وتی: بە سیانە قورەیشییەکە (ئەگەر ئێوەو زەیدی کوڕی سابیت لە شتێکی قورئاندا ناکۆکیتان بۆ دروست بوو ئەوا بە زمانی قورەیش بینوسنەوە[4]، ئیملای عەرەبی قورئان لەسەر زمانو بە پێی زمانی سەعیدی کوڕی عاص ساغ کرایەوە، چونکە سەعید زۆر شێوەزاری لە

---

[1] المصدر نفسه، ص (٩٤).

[2] البداية النهاية (٢١٦/٨).

[3] البداية النهاية (٨٧/٨).

[4] البخاري، كتاب فضائل القرآن رقم (٤٩٨٧).

زاری پێغەمبەر ﷺ دەچوو، زاری سەعید بە زاری پێغەمبەر ﷺ دەشوبها، نۆ ساڵ تەمەنی بەسەربردووە لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا ﷺ)، باوکی لە ڕۆژی بەدردا بە موشریکی کوژراو عەلی کوڕی ئەبی تالیب کوشتی[1].

گوێ بگرە بۆ ئەم هەواڵە بزانە ئیمانی چەند بەهێزە، ریوایەت کراوە کە عومەری کوڕی خەتتاب وتویەتی بە سەعیدی کوڕی عاص باوکتم نەکوشت، تەنها عاصی کوڕی هیشامی خاڵتم کوشت، سەعید وتی: ئەگەر بت کوشتایە تۆ لەسەر حەق بوویتو باوکم لەسەر ناحەق، عومەر سەرسام بوو بە وەڵامەکەی.

لە ڕۆژگاری والیەتی کوفەدا غەزای تەبرستانی کردو فەتحی کرد، غەزای جورجانیشی کردو حوزەیفەو جگە لەمەش هاوەڵی تر سەربازی ئەو بوون[2]، بە چاکەو کەرەمداری بەناوبانگ بوو، هەتا سواڵکەر داوای شتی لێکردوە هیچی پێ نەبووە بیداتێ چەندێکی ویستووە بۆی نووسیوە کە بیدەنێ[3]، سەعید زۆر پێی خۆشبووە ئۆرامی موسڵمانان کۆ بکاتەوەو قەڵسبووە بە ئاژاوەو فیتنەو رای دەکرد لێی، عوسمان لە دوای وەلیدی کوڕی عەقبە کردی بە والی کوفە، وە جارێکیش بوو بە نوێنەری مەدینە، کاتێ گەڕایەوە بۆ کوفە ئاژاوەچییەکان سەنگەریان لێ گرتو سەربازیان هێنایە ڕێگاو ڕێگرییان لێ کردو نەیانهێشت بێتە ناو کوفە گەڕایەوەو لە مەدینەدا مایەوە ئەو کەسانەی ڕێگرییان لێ کرد کە بگەڕێتەوە بۆ ویلایەتەکەی هەر ئەوانەبوون کە ئیمامی عوسمانیان کوشت، وێڕای ئەوانەش لە شەڕی جەمەلو صەفین دوورەپەرێز بوو هانی ئەهلی شەڕی جەمەلی دەدا کە دانیشنو دەرنەچن بۆ شەڕکردن[4]. ئائەمە ژیاننامەی خاوەن کەرەمو ئازایەتیو جیهادو خۆشخوانێك بووە دەشوبهابە خۆشخوانی پێغەمبەر ﷺ، سەعید ئەم قورئانە پەڕاوەی کە ئەمڕۆ ئێمە دەیخوێنینەوە بۆ زەیدی کوڕی سابیتی دەخوێندەوە، وردبەرەوە لەم مەناقیبە سابتاتنەی کە بە ریوایەتی صەحیح چەسپاوە، بەراوردی بکە لەگەڵ ئەو

---

[1] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١١).

[2] المصدر نفسه.

[3] الاصابة ترجمة (٣٢٦٨).

[4] الطبقات (٥/٣٤).

پڕوپاگەندانەی، کە دەیدەنە پاڵیو هیچ بەڵگەیەکیان نییە، رابمێنە بزانە کێ دەنگۆی پێدەکا، بۆت دەردەکەوێ کە ئەم قسەو قسەلۆکانە دوو پەلەن، چونکە دوو شتی دژ بەیەك لەیەك پیاودا کۆکراوەتەوە ـ سەخاوەتو ڕەزیلی، داناییو نادانی تێکۆشەر و تێشکاو مەعقول نییە ئەم شتانە لە پیاوێکی ساغو سەلیمدا کۆببێتەوە[1] هەندێ ریوایەت کە سەنەدێکیان نییە وا گومان دەبەن کاتێ سەعید بوو بە والی کوفە دوای وەلید هەندێ لە کۆیلەکان، ناڕەزاییان دەربڕی وتیان:

ئەی هاوار وەلید لابرا

سەعیدە برسیکەرمان بۆ هات

مەنەکە کەمتر ئەکاتو زیاد ناکات[2]

ئەمە ناڕەزاییەکی دەستهەڵبەستەو چیرۆکێکی داتاشراوە بێگومان[3]، چونکە کۆیلەکان لە ساڵی (٣٠) کۆچیدا بوو، واتە: ئەسیرەکانی شەڕ زمانی عەرەبییان بەباشی نەدەزانی بەڵکو ئەم نیوە دێڕانە قسەی شیعرە لەبەر ئەوەی سەعیدی کوڕی عاص بەناوبانگ بوو لە نانبدەییو بەرچاوتێریدا، چۆن دەپۆڕێ بە چاوبرسی وەسف بکرێت، ئەگەر شاعیرانو خەڵك وەلید بە کەرمداری وەسف بکەن، بێگومان سەعید نموونەیە لە بەخشندەییو دەست گوشادیدا کەرەم[4]، بە سەعیدیان وتووە شیلەی هەنگوین فەرز دەق لە بارەی کەرەمییەوە باس دەکاتو دەڵێ:

ترى الغر الجحاجح من قريش　　اذا ما الامر في الحدثان عالا

قياما ينظرون الى سعيد　　كانهم يرون به هلالا[5]

ئەگەر لە یەکەم هاتنی سەعیددا بۆ کوفە کۆیلەکان ئەم ناڕەزایەیانەی دەربڕیبێ کۆیلەکان چۆن سیاسەتی سەعیدیان زانی ئایا بۆ برسی کردن هاتووە یان بۆ تێرکردن هاتووە، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە ڕاوییەکان ئەم هەواڵە دەگەینن بە سیاقێك هەندێکی

---

[1] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٢).

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٧٩).

[3] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٢).

[4] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٢).

[5] البداية والنهاية (٨/٨٨).

ڕەخنە لە هەندەکەی تری دەگریو دەڵێن عوسمان سەعیدی کردە والی کوفەو سیرەیەکی دادگەری تیا بەسەر برد، بەڵام هەندێ لە کۆیلەکان (ئەسیرەکانی) شەڕی (ڕیخریان)[1]، ناڕەزاییان دەربڕی باشە دەگونجێ سیرەی دادگەرێ ئەسیرەکان بە برسیکەر وەسفیان کردبێت!

سەعید زۆر خێرۆمەندبووەو هەموو کەسێ لێی بەهرەمەند بووە، باراندویەتی بەسەریاندا، سیرە دادگەرانەکەی هەموو چاکەخوازییەکانی گرتبووە[2]، ڕەحمەتی خودا لە مێژوونووسە کۆنەکان، هەمیشە گومانی باشیان بردووە بە خوێنەرو ریوایەتە دژبەیەکەکانیان کۆکردووەتەوەو نووسیویانە، وایان داناوە کە خوێنەر لە هەموو سەردەمێکدا دەتوانێ قسەی لەڕو لاواز لە قەڵەو جیا بکاتەوە مێژوونووسەکان بۆیە ڕاستو ناڕاستیان نووسیوە بە بیانوی ئەوەی ئەوان نووسراو بۆ سەردەمی خۆیان دەنووسنەوە، ئەمەیان نەزانیوە، کە لەم سەردەمانەدا خوێنەر گوێ بۆ ئەوانە دەگرێ کە بە شەو چیلکە دەچنەوە (تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێن)[3]، ئیبنو سەعید لە وەرگێڕانی سەعیددا بەبێ سەنەد ریوایەتی کردووە، دەڵێت: (وتویانە کاتێ سەعید بە والیەتی هات بۆ کوفە ـ گەنجێکی خۆشگوزەران دیاربوو کە وێنەی نەبوو، وتی: ناچمە سەر مینبەرەکە هەتا پاك نەکرێتەوە، فەرمانیدا شۆردیانو لەسەر مینبەرەکە وتی: ئەم ڕەشاییە بێستانی غوڵامێکی قورەیشە ئەوانیش لەلای عوسمان شکاتیان لێ کرد)[4]، ئەم قسەیە ڕاست نییە، چونکە نەدراوەتە پاڵ هیچ کەسێ و سەنەدی نییە، لەبەر ئەوەی ئەو سەعیدی کوڕێ عاصەی کە قیادەی سوپای جیهادو فتوحاتی دەکرد وانەبوو، کە قسەکەران وەسفیان کردووە، پاشان ئیبنو سەعد ئەم قسەیەی سەعیدی لەسەر زمانی ئەشتەری کوڕی مالیکی کوڕی حاریسەوە ریوایەت کردووە، ئەوکاتە بۆ ئەشتەر ڕێگەی گرت لە سەعیدی کوڕی عاصو نەی هێشت بێتە ناو کوفەوە، دوای چەند ساڵێ کە والی بوو لە کوفە، ئەشتەر وتی: ئەمە سەعیدی کوڕی عاصە هاتووە بۆ ناوتان وا گومان

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٧٩).

[2] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٣).

[3] فجر المدينة المنورة فجر السلام (٢/٢١٣).

[4] المصدر نفسه (٢/٢١٣)، الطبقات (٥/٣٢).

دەبات کە (ئەم ڕەشاییە بێستانی چەند غولامێکی قورەیشە، ئەم ڕەشاییە شوێنی لەدایکبوونتانەو بنکەی ڕمەکانتانەو لانەی باوباپیرانتانە"[1].

مالیکی کوڕی حارس کە بە ئەشتەر ناوزەد دەکرێ ئاژاوەچی بووە، یەکێك بوو لە سەرکردەکانی ئەو خەوارجانەی کە گەمارۆی عوسمانیان داو کوشتیان، شتێکی نامۆ نییە، کە ئەمانە قسەلۆکیان هەڵدەبەستو درۆیان دائەتاشی بۆ جۆشاندنی ڕقی خەڵك، ئەگەر ئەم ڕستەیە وترابێت ئەوانە وتویانە، کە هەڵگەڕانەوە لە خەلافەت، چونکە ئەمانە ئەم بۆچوونە سەقەتەیان وەرگرتو کە چ حاڵی بوون، چونکە کەوتنە شوێن ئەمیرەکانی عێراق بە تایبەت ئەمیرەکانی کوفە کە دژی قورەیش بوون، چونکە دەرمارگیری خێڵایەتی لەم ڕستەیەدا بە ڕۆشنی دەرکەوتووە[2]، ئیمامی زەهەبی لە بارەی سەعیدەوە دەڵێ: ئەمیرێکی شەریفو حەوادو پەسەنکراو لە سەر خۆو خاون عەقڵو سەلیقە بوو بۆ والیەتی زۆرشیاو بوو[3]، بەڵام قسەی بەرهەڵستکارانو ئەوانەی توانج دەگرنە عوسمان بۆ ئەوەی سەعیدی کوڕی عاصی کردووەتە کاربەدەستی کوفە بوو بە ڕاپەڕینو کار گەشتە ئەوەی خەڵکی کوفە سەعیدیان دەرکرد[4]، دەرکردنی سەعید لەلایەن خەڵکی کوفەوە مانای ئەوە نییە سەعید تاوانێکی وای کردووە پێویستی بە دەرکردن هەبووە، هەرکەسێ کوفە بناسێو لە دەنگوباسی ڕابمێنێ دەزانێ کە خەڵکەکەی گازندەکارو سکاڵاچی بوون لەوالییەکانی خۆیان بە بێ بیانووی شەرعیو زەڕەیەك هۆکار، تەنانەت عومەری کوڕی خەتاب لە بارەیانەوە وتویەتی: (خەڵکی کوفە بێزاریان کردم و تووشی تەنگو چەڵەمەیان کردم، لەکەس ڕازی نابنو کەسیش لێیان ڕازی نییە، چاك نابنو کەسیش لەسەریان چاك نییە)[5]، لەگێڕانەوەیەکیتردا هاتووە

---

[1] المصدر نفسه (٢/٢١٤).

[2] فجر المدينة المنورة فجر السلام (٢/٢١٤).

[3] السير أعلام النبلاء (٣/٤٤٧).

[4] تاريخ الطبري (٥/٢٧٩).

[5] المعرفة والتأريخ، للفسوى (٢/٧٥٤).

خەڵکی کوفە وتویەتی: "ناڕەحەتیانکردووم[1]، ئەگەر کەسێکی توندوتیژ بکەمە کاربەدەست بەسەریانەوە ئەوە سکاڵای لەدەست دەکەن لەلام"[2].

سەعید وتویەتی: (بۆ میوانو هامنشینەکانم سێ شت دەکەوێتە سەرم، هەرکەنزیك بوویەوە دەگەشێمە بۆی ئەگەر دانیشت دڕنی بۆ دەدەم، ئەگەر قسەی کرد ڕووی تێ دەکەم)، وتویەتی بەکوڕەکەی خوا پاداشت دەداتەوە ئەگەر دوو شەڕخواز هاتنە لاتو یەکیان دەمو چاوی خوێنی پێدا ئەچۆڕیا یەکسەر پشتیوانیت کردو حەقت پێدا سوێند بەخۆدا هەر هەموو ماڵەکەت بدەی بەوی تریان هەر قەرزاری دەبیت، (ئەی کوڕی خۆم سوعبەت لەگەڵ کەسی بەڕێزدا مەکە، چونکە ڕقت لێ هەڵدەگرێت، لەگەڵ خوێڕیشدا سوعبەت مەکە لەلای سووك دەبێت) ڕۆژێك ئافرەتێکی خوداناس چوو بۆ لای سەعید، کە ئەمیری کوفە بوون ئەویش ڕێزی لێگرتو چاکەی کرد بەرامبەری، ژنەکە وتی: خودای گەورە وای لە تۆ کردووە ئاتاجت بە لە ئیم نەبێ بە هەمیشەیی منەتت وا لە ئەستۆی کەرەمەکاندا ئەگەر نیعمەتی بەخشندەیەك لابچێت تۆ سەبەبی بۆ گەڕاندنەوەی، کاتێ سەعید سەرەمەرگی هات منداڵەکانی کۆکردەوەو پێی وتن ( هاوڕێکانم تەنها دەموچاوی منیان لێ ون دەبێت، ئەوەی من پێم دەگەیاندن پێیان بگەیەنەوە ئەوەندە شتیان بدەنێ کە داوای شت نەکەن لە کەسی تر، چونکە پیاو ئەگەر داوای پێداویستییەکانی کرد بنەماکانی بە دامەزراوی نامێنێ و لەساڵی (٥٨) کۆچی وەفاتیکردووەو دەڵێن لەساڵی ٥٧)و ئەشڵێن لە (٥٩) کۆچی وایی کردووە[3].

### پێنجەم: عەبدوڵلای کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح

بە زۆری مێژوونووسەکان ئەمەیان هاوپێچ کردووە کاتێ باسی عەبدوڵلای ئەبی سەرحو بە ئەمیرکردنەکەی دەکەن لە لایەن عوسمانەوە بۆ ویلایەتی میسر دەڵێن: (عوسمان عەبدوڵلای ئەبی سەرحی کردە والی میسرو برای شیری خۆی بوو)[4]، ئەم

[1] تحقيق موافق الصحابة في الفتنة (١/٤٢٣).

[2] المنهاج لابن تيمية (٣/١٨٨).

[3] البداية والنهايتى (٨/٩٠).

[4] انظر: الكامل، لأبن الاثير (٣/٨٨).

دەستەواژەیە (برای شیری خۆی بوو) لە باسکردنی والییەتێکەیدا کە هاوپێچ کراوە تێل نیشانێکەو گوزارشت لە تۆمەتباردنی ئیمامی عوسمان دەکات لە لایەن مێژووناسەکانەوە، گوایە لە بەر برای شیرییەتی کردوویەتی بە والی میسر، ئەو بۆچوونەی مێژوونووسەکان دەریانبڕیوە راست نییە، بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەوانە بدەینەوە، کە تانەو تەشەر دەدەن لە ئەمیری ئیمانداران عوسمانی کوڕی عەففان، کۆششی ئەم سوارچاکەی تیرەی بەنی عامری کوڕی لوئەیە دەخەینە روو[1] واتە: (عەبدوڵلای ئەبی سەرح) عەبدوڵلای خیبرەو زانیارییەکی تەواوی هەبوو لە بارەی میسرو ناحیەکانییەوە لەئەنجامی بەشداریکردنی لەگەڵ سوپای عەمردا کە رزگاریان کرد، هەروەها لە ئەنجامی والییەتی کردنی لە هەندێ لە ناحیەکانی میسردا، وە لە کاتی خەلافەتی ئیمامی عومەردا، سەعید کاربەدەستی میسر بوو[2]، هەروەها لە سەرەتای خەلافەتی عوسمانیشدا، ئەو شتەی عەبدوڵلای شایستەی ئەمیری کرد ساڵێك والی میسر بووە، بەهێزترین پاڵێوراو بوو بۆ ئەم ویلایەتە دوای عەمری کوڕی عاص لە ئەنجامی پسپۆڕییەکانی، دەرکەوتووە عەبدوڵلای ئەبی سەرح توانیویەتی داهاتی میسر رێکوپێك بکات و زیاتری کات لەو داهاتەی کە عەمری کوڕی عاص کۆی دەکردەوە جاران، لەوانەیە هۆکاری ئەمەش ئەوەبێت عەبدوڵلای کوڕی سەعد هەنگاوی بۆ سیاسەتی دارایی گۆڕی بێت، بەم چەشنە کەرەسەکانی داهات کەڵەکەبوو لە میسردا[3]، عەبدوڵلای کوڕی سەعد لە کاتی والییەتیدا هەستاوە بە جیهادکردن لە کۆمەڵێ شوێندا، فتوحاتی هەمەچەشنەی هەبووەو قوربێکی زۆری هەبووە، یەکێ لە غەزاکانی غەزای ئەفریقابوو ساڵی (٢٧)ی کۆچیو فەتحیشی کردو پادشای ئەفریقاش کە ناوی جەرجیرە کوژراو لەم غەزایەدا کۆمەڵێ هاوەڵ هاوڕێی بوون، وەکو عەبدوڵلای کوڕی زوبێرو عەبدوڵلای کوڕی عومەرو عەبدوڵلای کوڕی عەمرو غەیری ئەمانەش، ئەم غەزایە بە سوڵح کردن لەگەڵ بەتریقی ئەفریقادا لەسەر پێدانی سەرانە بە موسڵمانان[4]،

---

[1] فصل الخطاب في موافق الأصحاب، ص (٧٧).

[2] تحقيق موافق الصحابة في الفتنة، ص (٤١٨).

[3] الولاية على البلدان (١/ ١٨٠).

[4] فتوح مصر وأخبارها، ص (١٨٣)، والولاية على البلدان (١/ ١٨٠).

کۆتایی هات عەبدوڵڵای ئەبی سەرح گەڕایەوە بۆ ئەفریقا جارێکی تر لەوێدا ئیسلامی چەسپاند لە ساڵی (٣٣)ی کۆچی[1]، هەروەها گرنگترین کارەکانی ئەبی سەرح غەزای وڵاتی نەوبەیە کە پێی دەوترێ غەزای ئەساویدە یان غەزای حەبەشە لای هەندێ لە مێژووناسان ئەم غەزایە ساڵی (٣١) کۆچی رویدا، شەڕێکی خوێناوی لە نێوان سەربازی موسڵمانان و سەربازەکانی نەوبەدا روویدا، کۆمەڵێ لە موسڵمانان پێکران لەبەر ئەوەی ئەهلی نەوبە ڕاوەکی بوون لە تیرهاوێشتنندا، ئەم غەزایە بە سوڵح کۆتایی هات کە لە نێوان عەبدوڵڵای ئەبی سەرح و خەڵکی نەوبەدا بەستراو سەرانەیەکی دیاریکراو دیاری کرا[2]، عەبدوڵڵای سەعد بە یەکەم فەرماندەی موسڵمان دەژمێردرێ کە توانیویەتی نەوبە تێك بشکێنێ، سەربازەکانی بکوژێو سەرانە بسەپێنێ بەسەریاندا، بارودۆخەکە سەقامگیربوو لە رۆژگاری ئەودا ئاشتی هەبوو لە نێوان موسڵمانانو نەوبەدا، هەروەها گرنگترین کارەکانی عەبدوڵڵای کوڕی سەعد غەزای (ذات الصواری) بوو موسڵمانانەکان بەسەر رۆمدا سەرکەوتن، والیەتی عەبدوڵڵا لەسەر میسر بە گشتیی پەسەند بوو لە لای میسرییەکانو شتی خراپیان لێ نەدیوە[3]، ئیمامی زەهەبی لە بارەیەوە دەڵێ: (دەستدرێژیی نەکردووەو کارێکی نەکردووە رەخنەی لێ بگرنو یەکێکە لە پیاوە ئاقڵەکانو بەخشندەترینیان بووە[4]، سەرەتای ویلایەتی میسر لە ئەوەڵی دەسەڵاتدا هێورو سەقامگیر بوو هەتا ئەو کاتەی ئاژاوەچی گومانیان وروژاند وەکو عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء، عەبدوڵڵای سەبەء کاتێ گەشتە میسر خەڵکی شڵەقاند، هەر ئەمانەو ئەڵقە لە گوێکانیان رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە کوشتنی ئیمامی عوسماندا هەروەك چۆن بارودۆخی میسریان هەڵەقو بەڵەق کرد لە ئەنجامی دەکردنی والی شەرعی خۆیان گرۆیەکی تر بە رێگەیەکی ناشەرعی دەستیان کێشا بەسەر رەوشی وڵاتی میسردا، ئەم ئاژاوەچیانە بۆیان رێککەوت ئەو ماوەیە ناڕەحەتیو ناڕەزاییان لە دڵی

[1] النجوم الزهراة (٨٠/١).

[2] الولاية على البلدان (١٨١/١)، وفتوح مصر وأخبارها، ص ١٨٨.

[3] الخطط (٢٩٩/١).

[4] سير أعلام النبلاء (٣٤/٣).

خەڵكدا بڵاوكردەوە لە دژی عوسمانی خەلیفە، فیڵو فڕایان نایەوەو درۆو دەلەسەیان هەڵخستو بڵاویانكردەوە[1]، لەمەولا باسی دەكەین (ان شاء الله).

كاتی ئاژاوەی كوشتنی عوسمان بەرپا بوو عەبدوڵڵای ئەبی سەرح دووری گرتو لە عەسقەلان نیشتەجێ بوو یان لە ڕەملەی فەلەستین بە غەوی بە سەنەدی صەحیح ریوایەتی كردووە لە یەزیدی ئەبی حەبیبەوە دەڵێ: (ئەبی سەرح رۆشت بۆ ڕەملەی فەلەستین كاتێ نوێژی بەیانی دەكرد، وتی: ئەی خودایە دواهەمین كارم بكەی بە نوێژی بەیانی، دەستنوێژی گرتو پاشان نوێژی كردو سەلامی لای راستی دایەوە، ویستی سەلامی لای چەپ بداتەوە خودای گەورە گیانی كێشاو كۆچی دوایی كرد)[2].

**شەشەم: مەروانی كوڕی حەكەمو باوكی**

مەروانی كوڕی حەكەم یەكێك بوو لە خزمە تایبەتو هەرەنزیكەكانی عوسمانە لە هەموویان زیاتر شیرازەی قایمی هەبوو لەگەڵ سەنتەری خەلافەتو پەیوەندیدارترین كەسبوو بەو رووداوانەی كە بوبووە ڕەشەبای یەكێتیی ئیسلامیی، لە سەردەمی عوسماندا نهێن پۆشو باوەڕپێكراوی دەوڵەت بوو، یاخود مۆرهەڵگری پادشا بوو[3]، بەدڵنیاییەوە مەروان راوێژكاری تایبەتی نەبوو، بۆ ئەو خەلیفەیەی كە راوێژی بە هاوەڵە گەورەكانو گچكەكان دەكردو هەرگیز لە پیاوانی راوبۆچوون دورەپەرێز نەبوو، هەروەها مەروان ئەو وەزیرە نەبوو كە هەموو دەسەڵاتی دەوڵەتی لە ژێر ركێفدا بێتو هەموو شتی لە ژێر دەستدا بێت، تەنیا ئەوەندە هەبوو نووسەرێكی خەلیفە بوو، ئەمەش وەزیفەیەك بوو بایەخی ئەم وەزیفەیەش لە ژێر دەستی خەلیفەدا بوو بەمۆڵەتی خەلیفە نووسراوەكان مۆر دەكران، بەڵام ئەو پڕوپاگەندەی كە عوسمانی تێوەگلاوەو خەڵكی لێ ورووژاندووە گوایە ئیمامی عوسمان ویستویەتی دوای خۆی خەلافەت بگوازرێتەوە بۆ بنەماڵە بەنی ئومەیە، گریمانەیەكەو هیچ راستییەكی تیا نییەو لە واقیعیشدا دەركەوت دوای قۆناغێكی دژوارو خەلافەتی كەوتە دەستی بەنی ئومەیە مەروان هیچ دەورێكی ناشیرینی لە مەدا نەبوو، پاشان عوسمان ئەوەندە كەسایەتی لاواز نەبوو هەتا بوار بلۆێ

---

[1] الولاية على البلدان (١/١٨٦).

[2] الاصابة ترجمة ٤٧١١، وسير أعلام النبلاء (٣/٣٥).

[3] عثمان بن عفان، لصادق عرجون، ص (١١٧).

بۆ نووسەرەکەی ئەو ئەندازەیەی کە راوییەکان دەماندویانە[1]، مەروانی کوڕی حەکەم هیچ تاوانێکی نییە ئەگەر لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ بالغ نەبوونی بە ئیتیفاقی ئەهلی زانست، بەڵکو تەمەنی دە ساڵان بوو یان لەو دەورەدا، مەروان موسڵمان بوو قورئانخوێنو شەرعزان بوو لە دین تێگەیشتوبوو لە پێش ئەوەی ئاژاوە روویدات بە هیچ شتێکی خراپ تۆمەتبارنەکرابوو، تارەخنەی لێ بگیرێن ئیمامی عوسمان تاوانی نییە لە هەڵسەنگاندنیدا کردویەتی بە نووسەری خۆی، سەیرە کە فیتنە تووشی کەسێ هات لە مەروان ئەفزەڵتر بوو[2]، ئەویش بوو گوایە پێغەمبەر ﷺ باوکی مەروانی راوناوە (دەرکردووە) سەنەدو مەتنی ئەم قسەیە لاوازە، شێخولئیسلام ئیبنو تەیمییە سەرنجی ئەمەی داوە لاوازیو پوچەڵی ئەم هەواڵەی روونکردووەتەوە[3]، کە مەروان بە زانستو شەرعزانو دادگەر پێناس دەکرێو پیاوماقوڵێکە لە ساداتی گەنجانی قورەیش بە تایبەتی کاتێ ئەستێرەی بەختی بڵندبووەوە لە سەردەمی عوسماندا، ئیمامی مالیك شاهیدی فیقهی بۆ داوە لە کیتابی (موطأ)دا قەزاوەتو فتواکانی کردووە بە بەڵگەو لە کۆمەڵێ شوێندا، هەروەها لە شەش کیتابە سوننەکاندا کە لەبەردەستی ئیمامەکانی ئەهلی سوننەتدا فتواکانی مەروان هاتووەو کاری پێ دەکەن[4]، ئیمامی ئەحمەد لە بارەیەوە دەڵێ: (لای مەروان قەزاوەت هەبووەو شوێن قەزاکانی عومەری کوڕی خەتتاب کەوتووە[5]، مەروان خوێنەروارترین کەسبووە بۆ قورئانو هەروەها فەرمودەی شەریفی ریوایەتی کردووەو لە هەندێ لە هاوەڵە مەشهورەکان وە هەندێکیشیان لە ئەو ریوایەتیان کردووە[6]، هەروەها هەندێ لە تابیعین فەرمودەیان لێ ریوایەت کردووە زۆر پەرۆشبووە بۆ دۆزینەوەی سوننەتو کارپێکردنی، لەیسی کوڕی سەعد فەقیعهی میسرە بە سەنەدی خۆی ریوایەتی کردووە، کە، مەروان لە ناشتنی جەنازەیەکدا

---

[1] لتدولة الأموية المفترى عليها، لحمدى شاهين، ص ١٦٠.

[2] منهاج السنة (٣/١٩٧).

[3] المصدر نفسه (٣/١٩٥ ـ ١٩٦).

[4] الدولة الأموية المفترى عليها، ص ()١٦٩.

[5] البداية والنهاية (٨/٢٦٠).

[66] البداية والنهاية (٨/٢٦٠).

ئامادەبوو کاتێك نوێژی لەسەر کرا، مەروان هەستاو رۆیشت، ئەبی هورەیرە وتی: قیراتێك خێری دەست کەوت‌و قیراتێك خێری لەکیس چوو[1]، مەروان گەڕایەوەو لەسەر هەردوو ئەژنۆی دانیشت، ئەوەندە دانیشت هەتا خۆی مۆڵەتی دا[2]، لە پێشەکی فەتحولباریدا هاتووە، دەڵێن مەروانی کوڕی حەکەمی کوڕی ئەبی عاصی کوڕی ئومەیەی کوڕە مامی عوسمان پێغەمبەری ﷺ دیوە ئەگەر ئەمە سابت بێت ئیتر کەلێنێك نامێنێتەوە بۆ دەمدرێژی کردن[3]، ئیبن‌و کەسیر دەڵێت: لای خەڵکانێکی زۆر مەروان هاوەڵە لەبەر ئەوەی لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ لە دایکبووە[4]، مەروان بووەتە والی مەدینە لە لایەن مەعاویەی ئەبوسوفیانەوە، توندوتیژبوو بەرامبەر فاسقەکان‌و دژی دیاردەی رابواردن‌و گاڵتەوگەپ[5] بوون لەگەڵ گەلەکەیدا دادگەر بوو سڵی دەکرد لە موجامەلە کردن بۆ خزمەکانی، یاخود یەکێ لە خزمەکانی ئوم‌و شکوکەی خراپ بەکار بهێنن، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حەکەمی برای مەروان زللەیەکی کێشا بە خزمەتکارێکی ئەهلی مەدینەدا، کە کاری حناکی دەکرد لەو ماوەیەی کە مەروان والی مەدینە بوو، (حناکە) کە سکاڵای کرد لای مەروان ئەویش عەبدوڕڕەحمانی برای هێناو لە بەرامبەری (حەناگە)دا دایناو پێی وت زللەکەی پیا کێشەرەوە (حەناگە) کە وتی: وەڵڵاهی من بۆ ئەمە شکاتم نەکردووە تەنیا ویستوومە تێی بگەیەنم کە لەسەروی ئەمەوە سوڵتان هەیەو سەرم دەخات بەسەریدا، من دەیبەخشم بەتۆ، مەروان وتی: قبوڵی ناکەم حەقی خۆت وەگرە، وتی: وەڵڵاهی زللەی لێ نادەم، بەڵام دەیبەخشم بە تۆ بەخودا دەیناکەم، مەروان وتی: وەڵڵاهی من نامەوێ و پێزانی نیم ئەگەر حەقی خۆت دەبەخشی بیبەشخە بەو کەسەی لێیداوی یان بیبەخشە بە خودای گەورە، وتی: باشە دەیبەخشم بە خودای گەورە، عەبدوڕڕەحمان شیعرێکی جنێوباری وت بە مەروانی برایدا لەسەر ئەم حاڵەتە[6]، ئەم وینە جوانە نموونەیە لە زانست‌و دادو فیقھ و دینداری مەروان زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو

---

[1] المصدر نفسه (٨/٢٦٠)، والمسند رقم (٤٤٥٣، ٤٦٥٠).

[2] الدولة الأموية المفترى عليها، ص (٣٠٠). البداية والنهاية (٨/٢٦٠).

[3] فتح الباري (٣/١٦٤)، وأباطيل يجب أن تمحى من التأريخ، ص (٣٥٤).

[4] البداية والنهاية (٨/٢٥٩).

[5] الدولة الأموية المفترى عليها، ص (٣٠٠).

وێنه ناشیر[1]ینەی کە هەندێ مێژوونووس‌و ڕاوی بۆ دەنەخشێن، ئەوانە کۆشش دەکەن بۆ شێواندنی ژیانی ئەم پیاوە تەنانەت کاتی مردنەکەشیان شێواندووە، هەوڵیانداوە ئەوەش لەکەدار بکەن، گوایە خێزانەکەی، کە ناوی ئومو خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی مەعاویە ـ بە بەرماڵ خنکاندوویەتی یاخود ژەهرخواردی کردووە، گوایە مەروان لە ناو کۆمەڵێ خەڵکدا جنێوی بە کوڕی ئەو ژنە داوە، ئەم چیرۆکەو ڕەهەندەکانی لە ڕەگەزی دژیەك دروست کراوە، هەر لەسەرەتای گێڕانەوەکەدا ئەڵێی ئەفسانەیەکەو ئەندێشەی پیرەژنەکان هەڵی بەستووەو پاشان دەماودەم هاتووە، ئەم قسەڵۆکانە بۆ چەنەبازی‌و لەکەدارکردنی سومعەی ئەم بنەماڵە پلەوپایەدارەیە، هەروەها حەسودی بردنە بەو سەروەرییەی کە مەروان دەستی کەوتووە[2]، ئایا مەروان بەشێوەیەکی ئاسایی مردووە یان بە توشهاتنی تاعون، یان بە خنکانی خێزانەکەی، هەلەق‌و پەلەقی ریوایەتەکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕاستییەکەی نەزانراوە، ئەو ریوایەتانەی کە پێیان وایە خێزانەکەی خنکاندویەتی بە دەستی خۆی یان بەواسیتەی کە نیزەکەکانییەوە ئەمە باوەڕپێکراو نییە، چونکە ئەم ژنە خانمێکی شەریف بووە لە خانەوادەی عەبدی شەمس بووەو مێردەکەشی خزمی نزیکی بووە ئەمە لە ژنە شەریفەکان ناوەشێتەوە پاشان ئێمە هیچ ئەسەرێکمان نەدی باسی ئەم تیرۆرە بکات، وە لەم خانەوادەیەدا هیچ ناکۆکییەك نەبووە، هەتا پێویست بە تۆڵەسەندنەوە بکات، خالیدی کوڕی مەروان بوو بە خاوەن مەکانەت لای عەبدولەلیك، هیچ پاڵنەرێ نییە بۆ ئەم حاڵەتە هەتا ئەم ژنە پەنا بۆ قەتڵ ببات[3]، لای هەندێ لە ئەهلی عیلم باسکراوە کە مەروان دواهەمین قسەیەك کە کردوویەتی وتویەتی: (بەهەشت دەدرێ بەوکەسەی کە دەترسێ لە ئاگری دۆزەخ)، نەقشی مستیلەکەی ئەمەبوو (العزه لله)، دەڵێن (أمنت بالعزيز الرحيم)[4]، ئیبنو قەییم دەڵێ: (قسەو باسی زەمی وەلیدو زەمی مەروانی کوڕی حەکەم هەمووی درۆیە)[5].

---

[1] الدولة الأموية المفترى عليها، ص (٣٠٠).

[2] البداية والنهاية (٢٥٩/٨).

[3] الدولة الأموية المفترى عليها، ص (٢٠١).

[4] البداية والنهاية (٢٦٢/٨).

[5] المنار المنيف، ص ١١٧، وفصل الخطاب في مواقف الأصحاب، ص (٧٧).

**حەوتەم: ئایا عوسمان موجامەلەی هیچ خزمێکی خۆی کردووە لە سەر حسابی موسڵمانان؟**

ئەگەر عوسمان موجامەلەی هیچ خزمێکی نزیکی خۆی بکردایە لەسەر حسابی موسڵمانان ئەوا موحەممەدی کوڕی حوزەیفەی رەبیبی خۆی (واتە داردەستەکەی) ئەوبەرترین کەسبوو بۆ موجامەلەکردن، بە پێچەوانەوە خەلیفە قەت رێگەی نەداوە شتێ بسپێردرێ بە کەسێ کە شایستەی نەبێت، وەکو وتویەتی: (ئەی کوڕی خۆم ئەگەر لێت رازی بم، پاشان داوای کارەمەندیم لێ بکەیت دەتخەمە سەر کار، بەڵام تۆ لەو ئاستەدا نیت ئێستا)[1]، بۆ ئەوە وای نەوتووە، کە رقی لە کوڕەکەی بێت یان بێزاربێت لە دەستی خۆ کاتێ سازیداو پەروەردەی کردو پێی گەیاند، کاری پێداو وەزیفەی بەخشی، کاتێ مۆڵەتی دا دەربچێ بۆ میسر[2]، بەرنامەی بەکارهێنانی پیاوە لێهاتووەکان بۆ ڕووداوەکان لە لایەن عوسمانەوە هەمان ئەو بەرنامەیە بوو، کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەریگرتبوو، پێغەمبەر ﷺ لە دواساتەکانی ژیانیدا. سوپایەکی بۆ غەزای رۆمەکان سازدابوو، ئوسامەی کردبوو بە بەرپرسی سوپا[3]، پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردو ئەبوبەکر سوپاکەی نەشێواندو رەوانەی کردن، بەڵام هەندێ لە هاوەڵان حەزیان دەکرد ئوسامە بگۆڕێ‌و فەرماندەیەکی لێهاتووتر بخاتە جێگەی، ئیمامی عومەر لەمبارەیەوە قسەی کرد تا بزانێ ئەبوبەکر رای چۆنە؟ کاتێ ئەبوبەکر ئەم قسەیەی بیست توڕەبوو وتی بە ئیمامی عومەر، ئەی عومەر پێغەمبەر ﷺ کردویەتی بە سوپادارو تۆ بەمن دەڵێی لایبە[4]، ئیمامی عوسمان خودی خۆی وەڵامی ئەم دیاریکردنەی دایەوە لەبەردەم کۆمەڵێ لە زانای صەحابیدا وتی: (کەسێکم نەکردووە بە سوپادار هەتا ئەقڵ‌و هۆشی کۆ نەبوەتەوەو باش پێنەگەیوەو لێی ڕازی نەبووم، ئەمانە هاوپیشەی ئەوانن پرسیاریان لێ بکەن، ئەوانەش هاونشینیانن پرسیاریان لێ بکەن، لە پێش منیشەوە رووداوی وا هاتبووە کایەوە، ئەوەی بە من دەڵێن بە پێغەمبەر ﷺ

---

[1] تحقيق موافق الصحابة في الفتنة (١/٢٤٧).

[2] المصدر نفسيه (١/٢٤٧) وتأريخ الطبري (٥/٤١٦).

[3] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٢٤٧)، تاريخ الطبري (٥/٤١٦).

[4] تاريخ الطبري (٥/٤٦).

وتراوه لەو دەمەی ئوسامەی کردە سوپادار ئایا وانەبوو؟!)، وتیان بەڵێ، ئەمانە خەڵك عەیبدار ئەکەن بەبێ ئەوەی شرۆڤەی بکەن[1]، پێم دەڵێن هیچ کەسێ نەکەی بەکاربەدەست ئیللا پیاوێکی گەورەو بەتەمەن نەبێت، کەچی پێغەمبەر ﷺ عیتابی کوڕی ئوسەیدی کردە والی مەککە تەمەنی (٢٠) ساڵان بوو[2]، والی شارەکان لە سەردەمی عوسماندا جاهیل نەبوون بە کاروباری شەرع کەمتەرخەمییان نەکردووە لە دیندا ئەگەر گوناهێکیان هەبووبێ چەندقات چاکەیان هەبووە، وێڕای ئەوەی کە خراپەو تاوانی ئەمانە دەشگەڕێتەوە بۆ سەر خۆیان، هیچ کاریگەرییەکی نییە لە سەر کۆمەڵگای ئیسلامیدا، ئێمە سۆراغی شوێنەواری والییەکانی رۆژگاری ئیمامی عوسمانمان کرد لە ویلایەتەکاندا، بینیمان سودی زۆر گەورەیان هەبووە بۆ ئیسلامو موسڵمانانو سەدان هەزار کەس لەسەر دەستی ئەم والیانە هیدایەتی پێ بەخشراوە بۆ ئیسلامو بە هۆی فتوحاتیانەوە چەندین هەرێمی فراوان خراوەتە پاڵ خەلافەتی ئیسلام، ئەگەر ئەمانە ئازاو دیندار نەبونایە نە جیهادیان دەکردو نە رابەرایەتی سوپای جیهادیان دەکرد، کە لە سەنگەری مانو نەمانو دەستهەڵگرتن ئیسراحەتو لەزەتی دونیادا کردبو ئێمە شوێن دۆزی سیرەی ئەم والیانەمان کرد هەریەکەیان فەتحێك یان چەند فەتحێکی هەیە، لەو رووەوەی کە دراوسێی ویلایەتەکەی بووە لەگەڵ ئەمەشدا مەناقیبو سیفاتی چاکی وایان هەبووە شایستەی فەرماندەیی بوون[3]، ئەوی بگەڕێتەوە بۆ ڕاستی ڕون لە رووداوە مێژووییەکانداو سۆراغی سیرەی ئەو پیاوانە بکات، کە ئیمامی عوسمانی خەلیفەی ئیمانداران (ذي النورين) پشتی پێدەبەستن ڕەزای خودایان لێبێت، جیهادەکانیان شوێنەواری جوانی بەجێ هێشتووە لە مێژووی بانگەوازی ئیسلامیدا، ئەمانەش بە ئیدارەی چاكو رێکوپێك بەدەست هاتووە، بە هۆی ئەو دەرئەنجامە بووە، کە بە هەنای ئوممەتو سەرفرازییەکانیەوە بوون، هەرکەسێ مێژوویان بە باشی

---

[1] المصدر نفسه (٥/٣٥٥).

[2] البداية والنهاية (١٨٧/٧).

[3] المدينة المنورة فجر الإسلام (٢١١/٣).

بخوێنێتەوە ناتوانێ خۆی بگرێو سەرسامیو شانازی دەرنەبڕێ، (ئەگەر بەوردی سەیری ئەو سەردەمەی مێژووی ئیسلام بکات)[1].

عوسمانو والییەکانی سەرقاڵی بەرپەرژدانەوەی دوژمنو تارنانیان بوون، ئەمە ڕێگەی لێ نەگرتوون کە نەتوانن قەڵەمڕەوی وڵاتی ئیسلامیی فراوانکەنو لە ناوچە تازەکاندا جەماوەری زۆرکەن، والییەکان کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆیان هەبوو لە ڕووداوەکانی ئاژاوەداو تۆمەت ناڕاستەی ئەوان کراوەو دەستدرێژی کراوەتە سەریان لە لایەن خەڵکەوە، بەڵام ئێمە ڕووداوێکی دیاریکراو بەسەر هاتێکمان نەدیو دەست نەکەوت کە ئەم والیانە ستەمیان لە یەکێ کردبێت، کە زۆر کەس وا گومان دەبەنو پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن هەروەك عوسمان تۆمەتبار دەکەن بە کاربەدەستکردنی خزمەکانی خۆی ئەم پروپاگەندەیەمان پوچەڵ کردەوە، بە هەمان شێوە دەبینین عوسمان تەمەڵیی نەکردووە لە ئامۆژگاریی ئومەت لە کاربەدەستکردنی ئەو کەسانەی کە شایستەی والییەتین سەرەڕای ئەوەش عوسمان والییەکانی بێوەی نەبوون لەو تۆمەتانەی کە ناڕاستەیان کرا لە لایەن ئاژاوە چییەکانەوە لە کاتی خۆیدا.

هەروەها عوسمان سەلامەت نەبوو لەو توێژەرەوانەی کە لە کیتابە ناڕاستو بێویژدانەکانیاندا نوسیویانە لە سەردەمی عوسماندا بە تایبەت توێژەرەوە بیدعەچییەکان کە لە خۆیانەوە حوکمیان دەرکردووەو گوێیان بە لێکۆڵینەوە نەداوە، یان لە ڕووداوو دیاردەکاندا گوێیان نەداوە بە سەرچاوە متمانەدارەکان زۆربەی زۆریان کەوتونەتە نێو ریوایەتە لاوازو رافزییەکانەوە، حوکمی پوچەڵو زوڵمیان لە حەقی خەلیفە ڕاشیددا عوسمانی کوڕی عەفان هەڵچنیوە، بۆ نموونە تەها حسین لە کتێبەکەیدا بە ناوی (فیتنەی کوبرا).

ڕەزا عەبدوڕڕەحمان لە کتێبی (الادارة والحرب)، سوبحی صاڵح لە کتێبی (النظم للاسلامي) مەولەوی حسین لە کتێبی (تراث الخلفاء الراشدين في الفقه والقضاء)، تۆفیق الیوزکی لە کیتبی (دراسات في النظم العربي والاسلامي)، موحەممەد ئەلمەلحەم لە کتێبی (تأريخ البحرين في القرن الاول الهجري)، بدوي اللطيف لە کتێبی (النظم

---

[1] حاشية المنتقي من منهاج الاعتدال، ص(٣٩٠).

الاسلامية)، وه محمد الريس له كيتبى (النضريات السياسية) على حسن الخربوطلى له كتێبى (الاسلام والخلافة) ئەبوئەعلاى مەودودى له كتێبى (الملك والخلافة)، سەيد قوتب له كيتبى (العدالة الاجتماعية) ، غەيرى ئەمانەش به ڕاستى عوسمان ئەو خەليفه مەزلۆمەيه كه به بيانوى خزمەكانى، پێشووەكان درۆيان بۆ داتاشيوه پاشينانيش بێويژدانييان بەرامبەر نواندووه[١].

[١] الولاية على البلدان (١/٣٢٢ ـ ٣٣٢).

## باسی چوارەم: حەقیقەتی پەیوەندیی نێوان ئەبو زەڕی غیفاریو عوسمان

### یەکەم: تێبکرای چیرۆکەکە

داخلەدڵەکانی عوسمان دەستیان کرد بە پڕوگاگەندەکردن، کە ئیمامی عوسمان ئەبوزەڕی نەفی کردووە بۆ رەبزە، هەندێ لە مێژوونووسان وا گومان دەبەن کە ئیبنو سەودا، واتە عەبدوڵلای کوڕی سەبەء گەشتووە بە ئەبوزەڕ لە شامو ئەبو زەڕ ڕێبازی قەناعەتو زوهدی بۆشی کردووەتەوەو باسی هاوخەمی هەژارانو واجبێتیی سەرفکردنی دارایی زیادەی کردووە، بە تایبەت ئەو داراییەی کە لە پێویستی زیادە هەروەها ڕەخنەی لە مەعاویە گرتووە، عوبادەی کوڕی صامت گرتوویەتی هێناویەتی بۆ لای مەعاویە پێی وتووە وەڵامی ئەم کابرایە ئەبازەر ناردوویەتی بۆ لات، مەعاویە ئەبوزەڕی لە شام دەرکرد[1]، ئەحمەد ئەمین هەولّی داوە کە رووی لەیەکچوونی بۆچوونی ئەبوزەڕو بۆچوونی مەزدەکی فارسی بدۆزێتەوە، دەڵێ روی لەیەکچوونیان هەیەو دیارە ئیبنو سەبەء لە یەمەن بووە سەردانی عێراقی کردووە فارشەکانیش لە یەمەنو عێراقدا هەبوون، پێش ئیسلام لەوانەیە ئەبوزەڕ لە ڕێگەی ئیبنوسەوداوە ئەم هزرەی مەزدەکی پێگەیشتبێت لە مەزدەکییەکانی عێراقەوە وەری گرتبێ پەیڕەوی کردبێت بە نیازێکی باشەوەو بە بیروباوەڕێکی پتەوەوە[2]، هەرچی دەوترێ لە چیرۆکی ئەبی زەڕ دڵنیابە پڕوپاڵانتەیەی دەیڕێسن لەسەر ئیمامی عوسمان، چونکە پوچەڵەو بودەڵەو لەسەر ریوایەتی دروست هەڵنەچنراوە، هەرچی دەوترێ دەربارەی پەیوەندیی ئەبوزەڕ بە ئیبنو سەوداوە پوچەڵەو ڕێی تێناچێ[3]، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەبوزەڕ بە ئارەزووی خۆی هەواری بەست لە ڕەبزە، ئەمەش بە هۆی ئەو ئیجتیهادەوەبوو لە چەمکی ئایەتێك کە هاوەڵان پێچەوانەی ئەم شرۆڤەیان دەکرد، ئەبوزەڕ زۆر جەسوربوو لەسەر ڕای خۆی کەس هاودەنگی نەبوو لەسەر ڕایەکەی داوای کرد، بچێت بۆ ڕەبزە[4]، ڕەبزە شوێنێکە لە

---

[1] المدينة المنورة فجر الإسلام (٢/٢١٦، ٢١٧).

[2] فجر الإسلام، ص(١١٠).

[3] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٦، ٢١٧).

[4] فجر الإسلام، ص(١١٠).

ڕێگای نێوان عێراقو مەککەدایە، کەنارگرتنەکەی لە ڕەبزە نەفی کردنو دوروخستنەوەو تۆران نەبوو، یان مانەوەی دەستبەسەری نەبوو، خەلیفە فەرمانی بەسەردا نەکرد لە رایەکەی خۆی دەست هەڵبگرێ، چونکە بە دیوێکدا مەقبول بوو، هەروەها موسڵمانانیشی ناچار نەکرد دەستی پێوە بگرن[1]، راستترین ریوایەتی ئەم چیرۆکەی ئەبوزەڕ ئەوەیە کە ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی لە زەیدی کوڕی وەهەبەوە دەڵێ بە ڕەبزەدا گوزەرم کرد گەشتم بە ئەبی زەڕو وتم پێی چی تۆی هێناوە بۆ ئەم شوێنە؟ وتی: من لە شام بووم لەگەڵ مەعاویە نارێك بوین بووین لە ئایەتی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّ كَثِيراً مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) (التوبة: ٣٤).

مەعاویە دەیوت ئەم ئایەتە مەبەستی ئەهلی کیتابەو باسی ئەوان دەکات، منیش دەڵێم باسی ئێمەو ئەوانیش دەکات مەبەستی هەردوولامانە، جیاوازی نێوان منو ئەو لەسەر ئەمەبوو نوسراوێکی نووسی بۆ ئیمامی عوسمانو شکاتی لێکردم، ئیمامی عوسمانیش بۆی نوسیم بچم بۆ مەدینە، منیش چووم بۆ لایو خەڵکی زۆر لێم کۆبوونەوە، وەك بڵێی لەوەوپێش نەیانبینیوم، منیش وەزعەکەم باسکرد بۆ عوسمان، ئەویش وتی پێم ئەگەر حەزدەکەیت بڕۆ بۆ ڕەبزە لێمانەوە نزیکی، ئەو گفتوگۆیە هێناومی بۆ ئێرە، ئەگەر عەبدێکی حەبەشی فەرمان بکات بەسەرمدا گوێی بۆ دەگرمو گوێڕایەڵی دەکەم[2]، ئەم ئەسەرە ئاماژە بۆ کۆمەڵێ ڕەوشتی گرنگ دەکات وەکو:

١- زەیدی کوڕی وەهب پرسیاری لێ کردووە بۆ ئەوەی بکۆڵێتەوە لەو پڕو پاگەندانەی کینەبازەکانی عوسمان بڵاوی دەکەنەوە، ئایا عوسمان ئەبوزەڕی نەفی کردووە یان بە ئارەزووی خۆی ئەو شوێنەی هەڵبژاردووە، وەکو لە سیاقی ئاخافتنەکەدا هاتووە ئەبوزەڕ دوای ئەوەی خەڵك لێی کۆبوویەوەو پرسیاریان لێ دەکرد بۆ دەرچووە لە شام، لە دەقی گفتوگۆکەدا نەهاتووە، کە ئیمامی عوسمان فەرمانی بەسەردا کردبێت بچێت بۆ ڕەبزە،

---

[1] المدينة المنورة فجر الاسلام (٢/٢١٧).

[2] البخاري، كتاب الزكاة، باب ما ادي زكاته، رقم (١٤٠٦).

بەڵکو خۆی بە ئارەزووی خۆی چووە بۆ پشتیوانی ئەم ڕایە ئەمە هەیە، کە ئیبن‌و حەجەر لە عەبدوڵڵای حامتەوە باسی ئەوە دەکات کە دەڵێ: (لەگەڵ ئەبوزەڕدا چوومە لای ئیمامی عوسمان و سەری داخستبوو ئەبوزەڕ وتی: وەڵڵاهی من لەوانە نیم یەعنی خەواریج، ئەویش وتی: ئێمە ناردوومانە بە شوێن تۆدا بۆ ئەوەی ببیتە ئاومالْمان لە مەدینەدا، وتی: من پێویستم بەم شوێنە نییە مۆڵەتم بدە بچم بۆ ڕەبزە، وتی: باشە)[1].

٢ـ ئەو قسەیەی، کە دەڵێ من لە شام بووم هۆکاری نیشتەجێبوونی شامی روون کردووەتەوە، کە (أبو ليلى) لە ڕێگەی زەیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی دەڵێ: ئەبوزەڕ پێی وتم پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموم: (ئەگەر تەلاری مەدینە گەشتە (سلعا) سەلعەن کۆچ بکە بۆ شام)، کاتێ بینا گەشتە سەلعا رۆشتم بۆ شام‌و لەوێدا نیشتەجێ بووم[2]، لە ریوایەتێکی تردا دایکی ئومو زەڕە دەڵێ: (وەڵڵاهی عوسمان ئەبوزەڕی دەرنەکرد بۆ ڕەبزە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەگەر بینا گەشتە سەلعا دەرچۆ لە مەدینە)[3].

٣ـ چیرۆکی ئەبی زەڕە لە مەسەلەی داراییدا ئیجتیهادێکی کردووە لە چەمکی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّ كَثِيراً مِّنَ الأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ* يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَـذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ) (التوبة: ٣٤ ـ ٣٥).

ئیمامی بوخاری لە ئەبوزەڕەوە ریوایەتی کردووە، کە ئەبوزەڕ ئەم ئایەتەی کردبووە بەڵگەو تەفسیری ئەم هەڕەشەیەی کردووە لە دەوڵەمەندەکان‌و (يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا) خەڵکی پێ دەترساند، لە ئەحنەفی قەیسەوە هاتووە کە ئەبوزەڕ قسەی کردووە وتویەتی (لەناو کۆمەڵێ پیاو ماقوڵی قورەیشدا دانیشتبووم پیاوێکی قژ نەرم‌و بیچم نەرم‌و پۆشاک نەرم هات، هەتا هاتە راست سەریان‌و سەلامی کرد، پاشان وتی: مژدە بدەن بە زێڕدارەکان[4]، کە بەردی گەرم داخ دەکرێت لەناو ئاگری دۆزەخداو پێیاندا دەچزێنرێت،

[1] فتح الباري (٢٧٤/٣).

[2] المدينة المنورة فجر الإسلام (٢١٩/٢).

[3] سير اعلام النبلاء (٧٢/٢)، الإسناد صحيح.

[4] الرضف: الحجارة المعماة وأحدها رضفة.

پاشان ئەوبەردە گەرمە دەخەنە سەر گۆی مەمکیان هەتا لە ناوشانیانەوە دەردەچێ[1]، دەخرێتە سەر پشتیان هەتا لە مەمکیانەوە دەردەچێو دەکەونە زەلالەت[2]، پاشان پشتی هەڵکردو لای ستونێکدا دانیشت، منیش دوای کەوتمو چووم دانیشتم لەلای، من نەمدەزانی ئەمە کێیە پێم وت: ئەم جەماعەتەم وا دێتە بەرچاو کە ئەو قسانەی تۆیان پێ ناخۆشبوو ئەویش وتی: ئەوانە هیچ ئەقڵیان نییە)، ئەبوزەڕ ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەکردە بەڵگە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (پێمخۆشە ئەوەندەی ئوحود ئاڵتونم هەبایە هەموویم ئەبەخشی سێ دیناری نەبێ)[3].

٤- کۆماری هاوەڵان پێچەوانەی ئەبوزەڕ بوونو ئەو هەڕەشەشیان دەبردەوە بۆ ئەوکەسانەی کە زەکاتیان مەنع کردووەو ئەو فەرمودەیان دەکردە بەڵگە کە ئەبو سەعیدی خودری ریوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە پێنج هۆقە بەلاوە سەدەقەی هەیە لە پێنج زود بەو لاوە سەدەقەی هەیە لە پێنج ویسق بەولاوە سەدەقەی هەیە(٤)، حافزی ئیبنو حەجەر دەڵێ: چەمکی ئەم فەرمودەیە ئەوەیە هەرچی لە پێنج زیاتر بوو سەدەقەی دێتە سەر، بە گشتیی ئەو مانایە هەڵدەگرێ، هەمووماڵێ سەدەقەی دەکەوێتە سەر، بەڵام هیچ هەڕەشە نییە لەسەر خاوەنەکەی، هەرماڵێك دوای صەدەقە لێ دەکردن، مایەوە پێی ناوترێ کەنز[5]، ئیبنو ڕوشد دەڵێ: هەرچی لە پێنج کەمتر بێت زەکاتی ناکەوێتە سەر خۆی حەقی خۆی لێدەرکرد هەرگیز بە کەنز ناژمێردرێن وەڵلاهی وەسفی زەکات کراوە، هەرشتێ وەسف بکرێ لە فەرزەکانی ماڵو دراییی قەت بە دوایدا زەم نایەت لە ڕوویەکی ترەوە لەسەر ئەو شتەی کە بە بۆنەیەوە وەسفی کراوە ئەویش داراییە[6]، حافز دەڵێ: بە پوختی دەتوانین بڵێین هەر شتێ صەدەقەی نەکەوێتە سەر پێی ناوترێ کەنز، چونکە بەر چاوپۆشی کەوتووە، ئەو شتەی

---

[1] نغض: العظم الدقيق الذي على طرف الكتف او على اكتف.

[2] يتزلزل: يظطرب ويتحرك.

[3] البخاري، كتاب الزكاة، رقم (١٤٠٧).

[4] البخاري، كتاب الزكاة، رقم (١٤٠٥).

[5] فتح الباري (٣/٢٧٢).

[6] فتنة مقتل عثمان (رضي الله عنه) (١/١٠٧).

زەکاتی لێ دەردەکرێ بە هەمان شێوە بە کەنز ناژمێردێت، چونکە بە دەرکردنی ئەندازەی فەرزەکە خاوێنو بەخشراو بووە، ئیتر پێی ناوترێ کەنز)[1]، ئیبنو عەبدولبەر دەڵێ: کۆدەنگ لەسەر ئەوەن کەنزی سەرکۆنەکراو ئەوەیە زەکاتی لێ دەرنەکرێ ئەم فەرمودەیەی ئەبی هورەیرەیان کردووە بە شایەت کە دەفەرموێ: (ئەگەر زەکاتی ماڵەکەت دا ئەوە واجبی سەرشانت جێبەجێ کردووە)، کەس پێچەوانەی ئەم رایە نییە، گرۆیەك زاهید نەبێ وەکو ئەبوزەڕ[2].

٥ـ لە وانەیە تەفسیری مەزهەبی ئەبوزەڕ لە بەخشیندا وەکو ئیمامی ئەحمەد لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ ئەبوزەڕ فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووەو تیژڕەو تیابووە پاشان ئەبوزەڕ رۆشتووە بۆ ناو هۆزەکەی خۆیو سەلامی لێ کردون لەوانەیە ئەبوزەڕیش تیژڕەوی کردبێت لە سەریان، پاشان پێغەمبەر ﷺ لە دواییدا ڕوخسەتی تیاداوە، بەڵام ئەبوزەڕ نەی بیستووە بۆیە ئەبوزەڕ بە شرۆڤە توندەکەوە نوساوە[3].

٦ـ ئەو قسەی کە دەڵێ ئەگەر ئارەزوت هەیە خۆت بدە ئەو کەنارە، تۆ لە ئێمەوە نزیکی، ئەمە بەڵگەیە، کە ئیمامی عوسمان داوای کردووە لە ئەبوزەڕ خۆی لەمەدینە لابدات، بە نەرمو نیانی داوای لێ کردووە ئەمری بەسەردا نەکردووەو ئەو شوێنەشی بۆ دیاریی نەکردبوو کە بۆی چوبوو ئەگەر ئەبوزەڕ دەرچوونەکەی ڕەفز کردبایە ئیمامی عوسمانیش زۆری لێ نەدەکرد بەڵام ئەبوزەڕ گۆێڕایەڵی خەلیفە بوو، چونکە لە کۆتایی فەرمودەکەدا دەڵی: ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی ببێتە ئەمیرم گوێی بۆ دەگرمو گوێڕایەڵی دەکەم[4]، ئەمەش بەڵگەیە کە ئەبوزەڕ بە ئاژاوە نانەوە قەڵس بووەو پێی ناشیرین بووە هەڵگەڕێتەوە لە ئیمامی بەیعەت پێدراو، ئیبنو سەعد ریوایەتی کردووە، کە خەڵکانێکی ئەهلی کوفە وتویانە بە ئەبوزەڕ کە لە ڕەبزە بووە ئەم پیاوە، واتە

---

[1] المصدر نفسه.

[2] فتح الباري (٣/٢٧٣).

[3] المسند (٥/١٢٥).

[4] البخاري، رقم (١٤٠٦).

ئیمامی عوسمان وای پێکردیو وەهاو وەهای کردووە، ئایا تۆ ئالایەك هەڵناكەی لە دژی - واتە بەشەڕ نایەت - وتی: نەخێر ئەگەر عوسمان لە خۆرهەڵاتەوە هەڵمدات بۆ خۆرئاوا بە قسەی دەکەم، گوێڕایەڵی دەبم[1].

٧- هۆکاری لادانی ئەبوزەڕ لە شاری مەدینە ئەگەر خۆی ڕۆشتبێ یاخود بە خواستی عوسمان بوبێت، ئەوەبوو فیتنە دەستی پێکردو لە هەرێمەکانداو سەری هەڵدابو کینەبازەکان قسەی دووپەلەیان بلاوکردەوەو ویستیان سوود وەرگرن لە ئینکارییەکەی ئەبوزەڕ، کە لکابوو بە مەزهەبو رایەکەی خۆیەوەو ئامادە نەبوو لێی جودا بێـەوە، بۆیە عوسمان وای بەباش زانی پالنانی خراپەیەك بخاتە پێش بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەك لەبەرئەوە مانەوەی ئەبوزەڕ لە مەدینەدا بەرژەوەندییەکی گەورەی تێدابوو کە زانستەکەی بلاو بکاتەوە لە نێو فێرخوازانی زانستدا وێڕای ئەمەش ئیمامی عوسمان ئەوەی پێباشتربوو دەست بنێ بەو ناکۆکییەوە، کە لە ئەبوزەڕە بە بۆنەی ئەوەی کە بەتوندی دەستی گرتووە بە مەزهەبەکەیەوە لەم بابەتەدا.

٨- ئەبوبەکری کوڕی ئەلعەرەبی دەڵێ: ئەبوزەڕ پیاوێکی زاهید بوو، خەڵکی دەبینی لە وڵاخی سواریو جلوبەگو کەشخەدا بڕەویان سەندووە کە ئەم شتانەی دەبینی نکولیو گلەیی لێ دەکرد، دەیوست ئەو شتانە هەمووی لاببات لە ژێر دەستیان کە پێویستیان پێی نییە، لە نێوان ئەبوزەڕو مەعاویە وتووێژی دروست بوو لە شام، پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە خەڵك لێی کۆبوونەوە، هەستا ئەم ڕێگەی گرتە بەرو چوو بۆ ڕەبزە، عوسمان پێی وت ئەگەر دورە پەرێز بێت باشە، واتە تۆ لەسەر مەزهەبێکی بۆ ئەوە ناشێ تێکەڵاوی خەڵك بیت، هەرکەسێکی تر لەسەر ئەم بۆچوونەی ئەبوزەڕ بوایە وا پێویستی دەکرد وەك ئەو تاك ببێتەو تێکەڵاوی خەڵکی نەکات هەرکەسێك حەزی کردبایە دەیتوانی بچێتە سەر هزری ئەوە، چونکە لە شەرعدا حەرام نەبوو، ئەبوزەڕ بە زاهیدێکی بەرێز دەرچوو، شاری مەدینەی بە جێهێشت هەردوو لایان لەسەر خێرو بەرەکەتو فەزڵ بوو،، حاڵی ئەبوزەڕ ئەفزەڵتر بوو، بەڵام بە هەموو خەڵك دەستی نەئەدا ئەگەر بچوونەتایە سەر ئەو

[1] الطبقات (٤/٢٢٧).

مەزهەبە تیا ئەچوون پاكو بێگەردی بۆ ئەو خودایەی كە جێگەو ڕێگەیان ڕێكدەخات[1].

ئیبنولعەرەبی دەڵێ: لە نێوان ئەبی دەرداو مەعاویەدا وتوویژ روویداوە، ئەبو دەردا زاهیدێكی بەڕێز بووەو قازی ئەوان بووە لە شام كاتێ توندوتۆڵی كردووە لە حەقداو ڕێچكەكەی ئیمامی عومەری هەڵبژاردووە لە نێو خەڵكدا، تەحەمولیان نەكردووە، بۆیە لە قازییەتی لایان بردووە گەڕاوەتەوە بۆ مەدەینە، ئەم كارانە هەمووی بەرژەوەندیی تێدا هەبووە، لەكەو پەڵە نییە بۆ دین، بە هیچ سەبارەتێك تەئسیر ناكاتە سەر پلەوپایەی هیچ موسڵمانێ، ئەبو دەرداو ئەبوزەڕ لە هەموو عەیبێ بەرین، عوسمان بەریئەو گەورەترین بەرائەتی هەیەو زۆر خاوێنە، هەكەسێ ریوایەتی ئەوە بكات كە ئەبو زەری نەفی كردووە یان بلێ هۆكارێك بووە ئەو قسانە هەموو پوچە[2].

٩- هیچ یەكێ لە هاوەڵان نەیوتووە بە ئەبوزەڕ تۆ هەڵەی لە ڕاكەتدا، چونكە مەزهەبێكی پەسەندكراوبوو بۆ هەركەسێ بیتوانیایە، عوسمان فەرمانی نەكرد بە ئەبوزەڕ پاشگەزبێتەوە لە مەزهەبەكەی تەنیا داوای لێكرد كە واز بێنێ لە گازندەكردن لەو كەسانەی كە ماڵو سامانی حەڵاڵیان دەست كەوتووە، كەسانێ هەن ریوایەتیان كردووە، كە عوسمان نەهی كردووە لە ئەبوزەڕ بۆ هەتا هەتایە فتوا بدات، ئەم ریوایەتە نەگەشتووەتە پلەی خەبەری صەحیح[3]، ئەوەی كە راستە لای ئیمامی بوخاری ئەمەیە، كە ئەبوزەڕ وتویەتی ئەگەر پەتی قەنارە بخەنە گەردنمو پاشان بمتاسێنن من هەر ئەو فەرمایشتە جێبەجێ دەكەم، كە لە پێغەمبەرم بیستووە بەر لەوەی سەرزەنشت بكرێم جێبەجێی دەكەم[4] هەر لە بوخاریدا ریوایەت نەكراوە، كە وانییە ئیمامی عوسمان نەهی كردبێت لە ئەبوزەڕ كە فتوا نەدات، چونكە نەهی كردن لە هاوەڵان كە فتوا نەدەن بەبێ دیاریكردنی بابەت كارێكی هەروا ئاسان نییە[5].

---

[1] العواصم من القواصم، ص(٧٧).

[2] المصدر نفسه، ص(٧٩).

[3] المدينة المنورة، فجر الاسلام (٢/٢٢٣).

[4] البخاري، كتاب العلم، باب العلم قبل القول والعمل (١/٢٩).

[5] المدينة المنورة، فجر الاسلام (٢/٢٢٤).

١٠ـ ئەگەر عوسمان نەهی فتوای لیّ کردبیّ بە ڕەهایی یان شوێنێکی بۆ هەڵبژاردبێت، کە کەسی تیا نەبینێت یان لە مەدینە سجنی کردبێت یان مەنعی هاتن ناو مەدینەی لیّ کردبێت، بەڵام ئیزنی داوە لە شوێنێکدا هەوار بگریّ کە زۆر خەڵکی بەوێدا گوزەر دەکەن، چونکە ڕەبزە مەنزڵێك بووە لە مەنزڵی حاجییەکانی عێراق، ئەبوزەڕ دەستو پێوەند بوو لەگەڵ مەدینە، نوێژی لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، دەکرد عوسمان پێی وت ئەگەر لەکار لاچیت تۆ هەر لە ئێمەوە نزیکی، ڕەبزە دوور نەبوو لە مەدینە، پاوەنی وشتری سەدەقە دراوسێی بوو، لەبەر ئەوە ریوایەت کراوە، کە ئیمامی عوسمان ئەو ناوچەیەی بحری بوو جیایی کردبووە لە باوکی عائیشەی وەرگرتبوو دابووی بە کۆیلەکانو بژێوی وەکو شەرتانە پیّ دەدان، ڕەبزە باشترین مەنزڵ بوو لەسەر رێگەی مەککە(١)، ئیمامی تەبەری دوای ئەوەی باسی ئەو هەواڵانە دەکات، کە ئەبوزەڕ بە ئارەزووی خۆی کەنارگیریی گرتووە دەڵێ: (ئەوانی تر هۆکاری ئەم دورگرتنەی ئەبوزەڕیان بردووەتەوە بۆ شتی جۆراو جۆر شتی نەشیاو، پێم خۆش نییە باسیان بکەم)[٢]، راستی مێژوویی دەڵێ: ئیمامی عوسمان ئەبوزەڕی نەفی نەکردووە، بەڵکو مۆڵەتی داوە، کە ئەو مۆڵەتی خواستووە، بەڵام دوژمنەکانی عوسمان پڕوپاگەندە دەکەن، کە عوسمان نەفی کردووە، هەر بۆیە کاتێ غالبی قەتان پرسیاری کرد لە حەسەنی بەسری ئایا ئیمامی عوسمان ئەبوزەڕی دەرکرد؟ حەسەن وتی: نەخێر، پەنا دەگرم بەخوا[٣]، ئەو ریوایەتانەی کە دەڵێن عوسمان نەفی کردووە بۆ ڕەبزە سەنەدەکەی لاوازەو لە دەردی کوشندە رزگاری نەبووە، سەرەڕای ئەوەش دەقەکەی لاریو لاساری ریوایەتە پەسەندەکان دەکات، کە رۆشنیان کردووەتەوە ئەبوزەڕ داوای مۆڵەتی دەرچوونی کردووە بۆ ڕەبزەو عوسمانیش ئیزنی داوە[٤]، بەڵکو ئیمامی عوسمان ناردی بە شوێنیداو داوای کرد لە شام بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە دراوسێی لە مەدینەدا[٥]، ئەمیش پێی وتووە:

---

[١] تاريخ الطبري (٥/٢٨٩).

[٢] المصدر نفسه (٥/٢٨٦).

[٣] التأريخ المدينة، ابن شبةت، ص(١٠٣٧)، اسناده صحيح.

[٤] فتنة مقتل عثمان (رضي الله عنه) (١/١١٠).

[٥] تاريخ المدينة، ص(١٠٣٦ ـ ١٠٣٧)، اسناده حسن.

لای من بهێنەوە بەیانیان دەدەین بەلاتداو ئێواران دەگەڕێینەوە لات[1]، ئایا کەسێ ئەمە بڵێ نەفی دەکات؟[2] هیچ ریوایەتێکو دەقێك نییە لەسەر نەفی کردنی تەنیا ئەو ریوایەتە نەبێ کە ئیبنو سەعد ریوایەتی کردووە، بورەیدەی کوڕی سوفیان ئەسلەمی لە ریوایەتەکەدایە، کە حافزی ئیبنو حەجەر لە بارەیەوە دەڵێ: کەسێکی بەهێز نییەو ڕەفزیشی هەیە، ئایا ریوایەتی رافزی وەردەگرێ لە کاتێکدا پێچەوانەی ریوایەتە صەحیحو حەسەنەکان بێت[3]؟ رافزییەکان ئەم چیرۆکەیان قۆزتەوە بە گلاوترین قۆستنەوە، کردویانە بە پڕوپاڵانتە، کە ئیمامی عوسمان ئەبوزەڕی نەفی کردووە بۆ ڕەبزەو ئەمەیان کردووەتە عەیب بەسەریەوە لە لایەن ئەوانە لێی هەڵگەڕانەوە یاخود ئەوانەی هەڵگەڕانەوەیان سبوغکرد جوانیان کرد[4]، بەمە عوسمان عەیبدار دەکەن، ئیبنو موتەهەری حولی ڕافزی کە لە ساڵی (٧٢٦) مردووە، عوسمانی لەکەدار کردووە بەم ڕووداوە، بەڵکو ئەوەشی زیاد کردووە، کە عوسمان داویەتی لە ئەبوزەڕ لێدانی گورچك بڕ[5].

شێخول ئیسلام ئیبنو تەیمییە ڕەدی داوەتەوە، ڕەدێکی بەهێزی گلێر[6]، سەلەفی ئەم ئوممەتە لەسەر ئەم راستییە چوون، کاتێ وترا بە حەسەنی بەسری، ئایا ئیمامی عوسمان ئەبوزەڕی دەکرد؟ وتی: نەخێر، معاذ الله[7]، ئیبنو سیرین ئەگەر باسیان بکردایە لە لای، کە عوسمان ئەبوزەڕی هەناردو دەری کرد، ئەم قسەیەی بە گوناهێکی گەورە دەزانی، دەیوت خۆی بە ئارەزووی خۆی دەرچووە، عوسمان نەیناردووە[8]، وەکو لە ریوایەتە صەحیحە سەنەدەکان پێشتر باسمان کرد ئەبوزەڕ کاتێ بینی خەڵکی زۆر لێی خرۆشاوەتەوە ترسی فیتنەی لێ نیشت ئەمەی باسکرد بۆ ئیمامی عوسمان، وەکو بڵێی

---

[1] الطبقات، لابن سعد (٢٢٦ ـ ٢٢٧).
[2] فتنة مقتل عثمان، (رضي الله عنه) (١١١/١).
[3] المصدر نفسه.
[4] المصدر نفسه.
[5] منهاج السنة لابن تيمية (١٨٣/٦).
[6] المصدر نفسه (٢٧١/٦ ـ ٣٥٥).
[7] تأريخ المدينة (١٠٣٧)، اسناده صحيح.
[8] تأريخ المدينة (١٠٣٧)، اسناده صحيح.

داوای دەرچوونی لێ کرد، ئیمامی عوسمانیش پێی وت ئەگەر حەز دەکەیت خۆ بدە کەنارێ تۆ نزیکی لە ئێمە[1].

**دووەم: پووچی گومانی، کاریگەری ئیبن سەبەئی لەسەر ئەبوزەر**

سەعید ئەفغانی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (عائیشەو سیاسەت) نووسیویەتی ئیبنو سەبەئە رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە فیتنەکەداو هەموو موئامەرەکانو فیتنەو داستانەکانی داکەوتووی بەرپابوونی نێوان هاوەڵان دەخرێتە پاڵی ئەو، سەعید پێی وابوو ئەم گەلەکۆمەی محکەم بووەو ئەهرەیمەنە خەبیرەکانی شەوخونییان پێوە کێشاوەو نەخشەکانیان کونبڕ کردووە بە گەرمیی پەیمانیان لەسەر داوە هەتا بەروبوومی لە گشت هەرێمەکاندا شین بوو، بۆیە بەم ناونیشانە نووسیویەتی (ئیبنو سەبەء پاڵەوانێکی شاراوەو ترسناکە)[2] وادیارە ڕۆڵی ئیبنو سەبەء رۆڵی کابوس بووە لای ئەفغانی لەوەدا کە وەسفی دەکات کە پیاوێکی ئەوپەڕی زیرەكو فیراسەت (الفراسه) دروستو تیژەمان دوورو فێڵزانو جێگای خۆ کەرەوە بووە لەناودڵی خەڵکدا[3]، قسەکان دەبڕێو دەڵێ: یەکێکە لە قارەمانەکانی ڕێکخراوی تەلمودیەی نهێنیی ئامانجیشی کەمکردنی دەوڵەتی ئیسلامە[4] خەریکە بڕیار بدات کە ئیبنو سەبەء بۆ بەرەژەوەندیی وڵاتی رۆمەکان کاری کردووە، کە موسڵمانان لە فەترەیەکی کەمدا دوو وڵاتی گرنگییان لەبێخ دەرهێنا ئەو دوانەش میسرو شام بوو، جگە لەمانەش شارانی تری ناوەڕاستیان ڕزگار کرد، چالاکی ئیبنو سەبەء چەندین بواری گرتبووە خۆی لە ڕووی دینیو سیاسیو جەنگەوە[5]، ئەو پێی وایە کە ئیبنو سەبەو سەرکەوتوو بووە، بە هەموو شێوەکانی سەرکەوتن لە دیدارەکەیدا لەگەڵ ئەبوزەڕدا لە درێژەی ئەم دیدارەی کە هۆنیویەتەوە لەسەر میزاجی ئەبوزەڕ، ئەوە یارمەتی ئیبنو سەبەئی دا لەسەر ئەم کاریگەرییە تێگەیستنە زۆرباشەکەی بوو لە ڕوانگەی میزاجی خەڵكو هەواڵە راستو ڕێکخراوەکانی بوون ئەم

---

[1] البخاري، كتاب الزكاة رقم (١٤٠٦).

[2] عائشة والسياسة ص(٦٠).

[3] تاريخ الطبري (٥/٢٨٥).

[4] البداية والنهاية (٧/١٧٠، ١٨٠).

[5] البخاري، رقم (١٤٠٦).

گومانە واتە کاریگەری ئیبنو سەبەء لەسەر ئەبوزەڕ بنەمای نییەو لە راستییەوە دوورە لە چەند روویەکەوە:

أ ـ کاتێ مەعاویە سکاڵای بیروبۆچوونی ئەبوزەڕی گەیاندە ئیمامی عوسمان، هیچ ئاماژەیەکی تیا نەبوو، کە ئیبنو سەبەء کاریگەریی تێ کردبێت، معاویە بە ئەوەندە وازی هێنا ( ئەبو زەر گێچەڵم پێ ئەگێڕێو بۆچوونی ئەمەو ئەوەیە)[1].

ب ـ ئیبنو کەسیر باسی ئەو جیاوازییەی نێوان ئەبوزەڕو مەعاویە دەکات، لە شام چەند جار لە کتێبەکەیدا، بەڵام لە هیچ کامیاندا ناوی ئیبنو سەبەئی نەهێناوە[2].

ج ـ لە صەحیحی بوخاریدا ئەو وتوێژەی هێناوە کە ئاماژە بۆ ئەسڵی جیاوازیی نێوان ئەبوزەڕو مەعاویە دەکات، بەڵام هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە بۆ ئیبنو سەبەء نە لە نزیکەوە نە لە نەدوور[3].

د ـ لە بەناوبانگترین ئەو کتێبانەی کە ژیاننامەی هاوەڵان باس دەکات گفتوگۆی نێوان مەعاویەو ئەبوزەڕیان هێناوە، پاشان هەوارگرتنی لە ڕەبزە بەڵام کاریگەری ئیبنو سەبەء لەسەر ئەبوزەڕ بە هیچ شێوەیەك باسنەکراوە[4].

هـ ـ بەڵکو بە تەبەریدا هەواڵەکە بەم شێوەیە هاتووە ئەوانە گلەیی دەکەن لە معاویە لەمبارەیەوە واتە: ناردنەوەی ئەبوزەر بۆ مەدینە لە لایەن معاویەوە باسیان کردووە لەم چیرۆکەدا کە ئیبنو سەبەو هاتووەتە شامو دیداری لەگەڵ ئەبوزەڕ بەستووەو دیویەتی(٥) ئەم هەواڵەی کە تەبەری هێناویەتی درۆیەو بودەڵەیە ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو زەمەنە بە درۆ دەخەنەوە، با ڕوونی کەینەوە:

ـ باس لەوە دەکەن کە ئیبنو سەبەء لە سەردەمی عوسماندا موسوڵمان بووە، جولەکەیەکی خەڵکی مەدینە بووە چالاکییە ماڵو وێرانکەرەکانی لە حیجازە دەست

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٨٥).

[2] البداية والنهاية (٧/١٧٠ ـ ١٨٠).

[3] البخاري، رقم (١٤٠٦).

[4] عبدالله بن سبأ واثره في احداث الفتنة، ص(٥١).

[5] تاريخ الطبري (٥/٢٨٥).

پێ کردووه، بەڵام باسی ئەوەیان نەکردووە کە بە کەس گەشتبێ یان کەس پێی گەشتبێ لە حیجاز.

- یەکەمجار لە بەسرە دەرکەوت دوای سێ ساڵ ئەمیریەتی عەبدوڵڵای عامر، عەبدوڵڵاش دوای ئەبو موسای ئەشعەری هات ساڵی (٢٩) کۆچی بەم شێوەیە (٣٢) کۆچی لە بەسرەدا دەرکەوت، عەبدوڵڵای عامر لە رۆژی عەرەفە لە بەسرە دەریکرد.

- دەڵێن روی کردە کوفە لەوێ هێلکەی کردو بێچووی هەڵهێنا خەڵکی هاندا لەموعاوییە بێگومان ماوەیەك لە شام مایەوە بۆ ئەوەی حاڵی پیاوەکانی بزانێو لەوێ پیلانەکانی دابرێژرێو جارنامەکەی بڵاوکاتەوە، ئەگەر خشتەیەك دابنێن بۆ ئیبنو سەبەء لە دوا دوای (٣٣) کۆچی بێلایەنەکەی ناساند لە شام.

ئەی خوێنەری بەرێز، چی دەڵێی کە زانیت ریوایەتە صەحیحەکان دەڵێن ئەبوزەر وتوێژەکەی لەگەڵ مەعاویەدا لە ساڵی (٣٠) بەستووە گەڕاوەتەوە بۆ مەدینە لە ڕەبزە لە ساڵی (٣١)ی کۆچی یان (٣٢)ی کۆچی مردووە، مانای وایە ئیبنو سەبەو لەو کاتەدا دەرکەوتووە[1]، کە ئەبوزەڕ تێیدا مردووە ئیتر چۆن یەکتریان دیوە، چۆن ئیبنو سەبەء پێی گەشتووە؟ بە ڕاستی ئەبوزەڕ نە لە نزیكو نە لە دوور کاریگەر نەبووە بە رایەکانی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئی جولەکەوە، لە ڕەبزە مایەوە هەتا وەفاتی کرد، ئامادەی هیچ شتێکی ڕووداوەکانی ئاژاوەگێڕی نەبوو[2]، پاشان ئەبوزەڕ ئەو فەرمودانەی ریوایەت کردووە کە نەهی لە خەڵك دەکات بچنە ناو فیتنەوە[3]، ئیتر چۆن خۆی دەچێتە ناو فیتنەوە.

**سێیەم: کۆچی دوایی ئەبوزەڕ، ئیمامی عوسمان خێزانو منداڵەکانی ئەبوزەڕی هێنایە ناو خێزانو منداڵەکانی خۆیەوە**

لە غەزای تەبوکدا وترا بە پێغەمبەر ﷺ ئەبوزەڕ بەجێماوەو وشترەکەی تەمەڵ دوای خستووە، فەرمووی (وازی لێ بێنن ئەگەر خێری ئەوی تێدابێت ئەوا خودای گەورە دەیگەیەنێت پێتان، خۆ ئەگەر واش نەبێ ئەوا خودای گەورە رزگاری کردن لێی ئەبوزەڕ

---

[1] المدينة المنورة فجر الإسلام (٢/٢٢٥).

[2] أحداث الفتنة الاولى بين الصحابة في ضوء قواعد الجرح والتعديل، د. عبدالعزيز دخان، ص(١٧٤).

[3] المصدر نفسه.

چاوەڕێی وشترەکەی بوو[1]، کاتێك زانی دوای خست کەلوپەلەکەی داگرتو خستیە سەر پشتی خۆی، پاشان کەوتە شوێن پێی پێغەمبەر ﷺ، بە پێی پێغەمبەر ﷺ لە مەنزلێك لایداو یەکێ لە موسڵمانان ئەبوزەڕی بینی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (لەخودا دەپاڕێمەوە ئەوە ئەبوزەڕ بێت)[2]، کاتێ خەڵکەکە لێی وردبوونەوە وتیان ئەی پێغەمبەر ﷺ وەڵاهی ئەوە ئەبوزەڕە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی (خودا ڕەحم بکات بە ئەبوزەڕ، بە تەنیا ڕێ دەکات، بە تەنیاش دەمرێ هەر بە تەنیاش زیندوو دەبێتەوە)[3].

زەمان تێپەڕیو سەردەمی ئیمامی عوسمان هاتە پێشەوە ئەبوزەڕ لە ڕەبزە مایەوە کاتی سەرەمەرگی هات وەسیەتی کرد بە خێزانو غولامەکەی، ئەگەر مردم بمشۆنو کفنم بکەن، پاشان هەڵمگرن بمبەن لەسەر چەقی ئەو ڕێگایەدامنێن یەکەمین کاروان دای بەلاتاندا پییان بڵێن ئەمە ئەبو زەڕە. کاتێ مرد وایان پێکرد چۆن وتبووی، کاروانی یەکەم دەرکەوت لێیان، بە ئەبوزەڕیان نەزانی خەریك بوو وڵاخەکانیان پێ بخاتە سەر دارەمەیتەکەی، ئیبنو مەسعود لەو پۆلەدا بوو، کە خەڵکی کوفە بوون، وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: جەنازەری ئەبوزەڕە، ئیبنو مەسعود هاواری کردو گریاو وتی: پێغەمبەر ﷺ راستی فەرموو، فەرمووی (خودا ڕەحم بکات بە ئەبوزەڕ، بە تەنیا دەڕواتو بە تەنیا دەمرێو بەتەنیاش زیندوو دەبێتەوە)[4].

شۆردراو کفن کراو نوێژیان لەسەر کردو ناشتیان، کاتێ ویستیان بچن کچەکەی پێی وتن ئەبوزەڕ سەلامی لێ کردوونو سوێندی خواردووە ئێوە نەچن هەتا نان دەخۆن، ئەوانیش بەقسەیان کردن بارەکەیان برد هەتا گەشتنە مەککەو هەواڵی مردنی ئەبوزەڕیان دا بە ئیمامی عوسمان، ئەویش کچەکەی هێنا بۆ ناوماڵو منداڵەکەی[5]، لەریوایەتێکدا هاتووە.. کاتێ ناشتویانەو گەشتنە مەککەو هەواڵەکەیان دا بە عوسمان، وتی: خودای گەورە ڕەحم بکات بە ئەبوزەڕ، لێشی خۆش بێت، کە چووە ڕەبزە بەزی،

---

[1] تلوم علي بصير: تمهل.

[2] كت أباذر: لفظه لفظ الأمر ومعناه الاعاء: أرجوالله أن تكون اباذر.

[3] السير النبوية، لابن هشام (١٧٨/٤).

[4] السير النبوية، لابن هشام (٤٧٨/٤).

[5] التمهيد والبيان في مقتل الشهيد عثمانن ص(٨٧، ٨٨).

کاتی زانی دەرچوو رێگەی ڕەبزەی گرتە بەرو خێزانو منداڵەکانی برد بۆناو خێزانی خۆیو عوسمان بەرەو مەدینە گەڕایەوەو ئێمەش بەرەو عێراق[1].

[1] تاريخ الطبري (٥/٣١٤).

## باسی یەکەم: گرنگیدان بەتاوتوێکردنی ڕووداوەکانی فیتنەی کوشتنی عوسمانو ئەو کارەساتانەی کە بە دواییداهاتو حیکمەت لە هەواڵدانی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەدواداچوونی

### یەکەم: بایەخی لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکانی کوشتنی عوسمانو ئەو کارەساتانەی هاتن بە دواییدا لە جەمەلو صەفین

جگە لەمانەش لە زۆربەی زۆری زانایانو پێشیناندا هاتووە، کە فەرمانیان کردووە بە زمانگرتن لە دەم وەردان لە وردەکارییەکانی ئەو شەڕانەی کەوتە نێوان هاوەڵان، حوکمەکەیان بەجێ بهێڵن بۆ خودای دادگەرو داناو وێرای ئەم هەڵوێستەش ڕازی بن لە هەردوولایانو بیروباوەڕی وابووە کە ئەوان موجتەهیدنو بە ئیزنی خودا هەردوولایان بەپاداشتن، کەواتە خۆتان بپارێزن لە توانج لێدانو کەوتنە وێزەیانو لێ خوێندنیان، چونکە سەردەکێشێ بۆ تەشەردان لە شەریعەتیش، خۆیان هەڵوێستیان ئەرێی بووە، ئەم هەڵوێستەشیان بۆ ئێمە ڕەوا نەبینیوە، بۆ نموونە لە عومەری عەبدولعەزیزەوە ڕیوایەت کراوە، کە پرسیاری لێکرا دەربارەی شەڕکەرانی ئەهلی صەفین، وتی: (ئەوە خوێنێك بوو خودای گەورە دەستی منی لێ خاوێن کردووە، پێشم خۆش نییە زمانم هەڵۆەنم پێیدا)[1]، پرسیار کرا لە یەکێکی تر لە پێشینان لەمبارەیەوە بەم ئایەتە وەڵامی دایەوەو وتی: (تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ) (البقرة: ١٣٤)، ئەم خۆ لێبواردن و نەهیکردنە بۆ تێنەکەوتن، لەبەر هۆیەکە، هۆیەکەش ئەو مەترسییەیە کە باسمان کرد کە تووشی توانج تێگرتنو لێی خوێندنو لێ هەڵتەکاندنیان نەبین، بکەوینە بەر خەشمو سزای خودا، خۆ ئەگەر ئەم ترسو عیللەتە لابەین، وا دیارە باسکردنی ئەم شەڕە گلەیی تیا نییەو لێکۆڵینەوەی قەیناکا، کەواتە گەر قسەو توێژینەوە بکەین، وردەکاری بکەین لەو ڕووداوەی کەوتە نێوانیان سەرناکێشێ بۆ توانج گرتن لە هیچ شێوەیەك، باسی ئەم ڕووداوە هیچ گازندەیەکی تێدا نییەو قوڵبوونەوە لە هۆکارو پاڵنەرەکانی و بە وردی تاوتوێ کردنی و دەرئەنجامو خواستەکانی لەسەر کۆمەڵگەی هاوەڵان کێشە نییە، پاشان لەسەر پاشینانی ئەوانیش، زانایان نوسراویان

---

[1] حلية الاولياء (٩/١١٤)، وعون المعبود (١٢/٢٧٤).

هەیە دەربارەی ئاژاوە بۆ نموونە ئیبن‌و کەسیرو تەبەری‌و جگە لەمانەش، لە بارەی رووداوی ئەو ماوەیەی کە تەڵخە لە مێژووی ئیسلامدا، بۆ زۆربەی ئەو کێشانەی کە پەیوەندیی هەیە، بەم ماوەیەوە چەندین بەشیان داناوە، هەیانە رۆشتووە تا سنووی تاوتوێکردنی یەکێ لەم دووبەرەیە، یان هەردولایان، بە پشتبەستن بەو دەق‌و ریوایەتانەی کە راست‌و ناڕاست تێك ئالاوە[1]، لێرەدا چەند هۆکارێك هەیە، کە بانگهێشتی زانایانی ئەهلی سوننەو فێرخوازانی زانستەکەیان دەکات، کە خۆیان دابهێڵن بۆ قولایی فیتنەی بەو مەرجەی، کە بکۆڵنەوە لە هۆکارەکان‌و رابمێنن لە دەقی توێژینەوەو وردەکارییەکانی، ئەو هۆکارنەش ئەمانەن:

١ـ نوسراوەکانی ئەم سەردەمەی، کە لە بەرپابوونی فیتنەی نێوان هاوەڵان دەکۆڵنەوە دەکرێن بە سێ جۆرەوە:

أ ـ ئەو نووسراوانەی کە خوێنەرەکانی لەسەر چەشتەی هزری رۆژئاوایی پەروەردە دەکات، ئەم نوسراوانە کینەیان هەیە لە مێژووی ئیسلام یان شارەزاییەکی ئەوتۆیان لەمێژووی ئیسلامدانییە، شتێکی جوانی تێدا نابینن، دەچن توانج‌و تەشەر لە هاوەڵان‌و تابیعین دەدەن بە شێوازێك راژەی ئامانجەکانی دوژمنانی ئیسلامی دەکەن، داخ لە دڵەکانی دەحەوێنەوە، ئەوانەی هەستاون بە باسی رووداوەکانی ئەم ماوەیەو راڤەی وایان کردووە، کە تەشەر بدرێت لە هەر هەموو هاوەڵان، دەستیان وەشاندووە لە ڕەگ‌و ریشاڵی ئیسلام، هەروەها ئەو رووداوانەیانە کردووە بە کێشمەکێشی سیاسیی‌و کردویانە بە هەڵپەی کورسی‌و مەنسەب‌و هاوەڵانیان داڕنیوە لە ئیمان‌و تەقواو راستگۆیی، خستونیان بە باری دونیاویستی‌و عەشقی کورسی‌و هەڵپەرستی‌و خوێن‌و رشتنی کەسیان بە خەیاڵدا نەهاتووە، گیان لە دەستدان‌و فەرهودکردنی سامانیان بە گرفت نەزانیوە هەرچی حەرامە حەلاڵیان کردووە ئەمانەشیان لە پێناو بەدەستکەوتنی سەرۆکایەتی‌و دەسەلاتدابووە یەکێك لەو نووسەرانەی، کە بایەڵانی گرتوویەتی (تەها حسین) بووە لە کتێبی (الفتنة الکبری)[2] بە ڕاستی ئەم کتێبە فیتنەی کوبرایە لەسەر ئەقڵی ڕۆڵە تازە پێگەیشتووەکانی موسڵمانان، تەها حسین چووە پڕوپاڵانتەی

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، د. عبدالعزيز دخان، ص(٧٩).

[2] انظر: الفتنة الكبرى، علي ونبوه.

هەڵبەستووە بۆ هاوەڵانو درۆنگی خستووەتە نیەتیان، بە تۆمەتی دەرخەزبازی تاوانباری کردون لەبەر خاتری ئامانجەکانی دوژمنانی ئیسلامو موسڵمانان[1]، زۆر کەسێك کاریگەربوو، بە ڕێبازەکەی دەرکەوتووە ئەمانەو هاوشێوەکانیان پشتیان بەستووە بەو ریوایەتە مێژووییانەی کە مێژوونووسان هێناویانە وەکو تەبەریو ئیبنو عەساکیر جگە لەئەمانە، بەڵام قەڵەوو لەڕیان هۆندووەتەوە راستو درۆیان تێکەڵاو کردووە بەبێ رەچاوکردنی سروشتی خودی مێژوونووسەکان، کە بە چ شێوەیە نوسراویان نووسیوەو هەستاون قسەکانی ئەوانیان نقلْ کردووە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەڵەیەکی گەورەیە[2]، ئەم جۆرە نوسراوانە کاریگەرن بە هزری رافزیو ئەو کیتابە شیعەگەرییە رافزییانەی کە مێژووی ئیسلامی پێ نووسراوە[3]، رافزییەکان دەستیان کردووە بە نالەباری و نیشتون بە پیساییەوە لە نوسراوە مێژووییەکانیاندا، کە بۆ مێژووی ئیسلامیان نووسیوە، هەروەك لە ریوایەتو هەواڵەکانی کەلبی[4] و ئەبی میخنەق[5] و نەصری کوڕی فراهمی مینقەریدا هاتووە[6]، ئیبنو حیبان دەڵێ: کەلبی سەبەئی یەکێك بووە لەوانەی کە دەیوت: (ئیبنو عەدی دەڵێ: ئەبو میخنەف شیعەیەکی موحتەریقە کوشندەیە[7]، خەڵکی کوفەیە ساڵی ١٥٧ کۆچی مردووە. کتێبی زۆرە وەکو (الردة، الجمل، الصفين) زەهەبی دەڵێ: (مزاهیمی مینقەری رافزییەکی سەر سەختە مەرەخەسی کەن)، لە ساڵی (٢١٢)ی کۆچی مردووە کتێبەکانی ئەمانەن (وقعة صفين، الجمل، مقتل الحسين، ميزان الاعتدال)، ئەوەی کە بە نووسراو هاتووە هەتا لای

---

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٨٠).

[2] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٨١).

[3] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٨١).

[4] محمد بن السائب الكلبي، قال ابن حبان كان سبئيا من اولئك الذين يقولون: ان عليا لم يموت وانـه راجـع الى الدنيا، توفي نة (١٤٦) ه، ميزان الاعتدال (٥٥٨/٣) وابن ابي حاتم، الجرح والتقديل (٢٧٠/٧، ٢٧١).

[5] لوط بن يحى بن سعيد بن مضنف الازدى، من أهل الكوفة، قال ابن عدي: شيعى محترق صاحب أخبارهم توفي سنة (١٥٧)ه، له تصانيف كثيرة منها الردة، الحمل، صفين وغيرها.

[6] نصر بن مزاحم بن سيار المنقري الكوفي قال الذهبي: رافضى وتركوه، توفى نـة (٢١٢)ه، ومـن كتبـه، وقعـة صفيت، وهو مطبوع والجمل ومقتل الحسين، ميزان الاعتدال (٢٥٣/٤).

[7] اصول مذهب الشيعة الامامية، لناصر الغفاري (١٤٥٧/٣).

تەبەریش لە مێژوونامەکەیدان بەڵام تەبەری کاتێ باسی مێژووەکە دەکات دەیداتە پاڵ ئەم کەسانە، ئەهلی عیلمیش گەر وریا بێت گێڕانەوەی ئەو کەسانە دەناسێت، هەروەها لە کتێبەکانی مەسعودیەدا لە (مروج الذهب)دا، لە یەعقوبییەدا لە مێژووەکەیدا..
مامۆستا (محی الدین الخطیب) لە پەراوێزی (العواصم)دا ئاماژەی کردووە، کە نووسینەوەی مێژوو لە دوای دەوڵەتی ئەمەوی دەستی پیکردووەو دەستە شاراوەکانو کوتلەبازە نەگریسەکان لە ژێر پەردەی شیعەگەریدا رۆڵێکی زلیان هەبوو لە کوژاندنەوەی مەشخەڵەکانی چاکەو سەروەرییەکانی مێژووی ئیسلامی، وە لاپەڕە گرنگدارەکانیان رەش کردووە[1]، پوخڵ کردووە، هەرکەسێ کتێبی (العواصم من القواصم) بە سەرەنجەوە بخوێنێتەوە کە ئیبنولعەرەبی دایناوە ئەم فرو فێڵەو تەڵەکەبازییەی بۆ دەردەکەوێ، (محب الدین الخطیب) پەراوێکی نایابی نووسیوە، تەماشاکەن شێخەکانی رافزی هەزاران لاپەڕەیان رەش کردووەتەوە بە جنێودانو لاقرتیکردن بە ئەفزەڵترین سەدەیەك کە مرۆڤایەتی ناسیبێتی، هەموو کاتو کۆششی خۆیان بە فیڕۆداوەبۆ ناشیرین کردنی مێژووی موسڵمانان[2]، ئەم باسو بانورە کە گاڵەی دەمی رافزییەکانەو داهێنراوەو لەو کتێبە مێژووییانەدا هاتووە کە رافزییەکان نووسیویانە، یان بەشدارییان تیا کردووە، لە هەندێ هەواڵو دەست هەڵبەستیاندا دەبینرێ لە کتێبە حەدیسیەکانیاندا وەکو کافیو بیحارو ئەو باسانەش کە شێخە کۆنەکانیان نووسیویانە، وەکو (أحقاق الحق)و لە بواری فەرمودەشدا وەکو (کیتابی الغدیر) ئەم مێژووە رەشە تاریکە بۆ گەنە ناقولایە بووەتە مەرجەع کە دوژمنانی ئیسلام لە رۆژهەڵاتناسو نەوەکانی تر نوسیویانە، ئەم گرۆپە لە لایەنی رۆحییەوە هەرەسیان هێنابوو، ئەو کەسەی وای دەزانی و وای پێ باشبوو کە رۆژئاوا پێشەنگی بێ، سەرمەشقی لە رۆژئاواییەکان وەردەگرت، هەرچی بە خامەی رۆژهەڵاتناسەکان نوسرایەوە وەری گرتو قوتی داو کردی بە سەرچاوەو کانیاوی خۆیو بیری ئەوانی هەڵچنیو گومانەکانی بڵاوکردنەوە لە وڵاتی موسڵماناندا، ئەمەش شوێنەوارێکی ترسناکی بەجێهێشت لە هزری موسڵمانانو ژیارەکەیاندا.

---

[1] المصدر نفسه (١٤٥٨/٣).

[2] اصول مذهب الشيعة الامامية (١٤٥٨/٣).

ڕەتکردنەوەی ئەم هەمووە پۆخڵەواتە شتێکی پێویستە، لێکۆڵینەوەی ئاوێزان بوونی بیرو بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسەکان بە شیعەگەری، خۆی بۆ خۆی بابەتێکی هەندو جێگەی تێرامانەو پێویستی بە تاوتوێکردنو بەدواداچوون هەیەن دەرکەوتووە دوژمنە بێباوەڕکان سودیان لە گومانو دوودڵییەکانی ڕافزیو درۆو دەلەسەکانیان وەرگرتووە، کە دژی ئیسلامو موسڵمانان کردویانە لە زەمانی ئیمامی ئیبنو حەزمەوە (م ـ ٤٥٦ ـ کۆچی)[1].

ب ـ کتێبە نوسراوەکانی زانایانی ئەم سەردەمەی ئوممەت، ئەمانە بە گشتیی بەکەڵکن، بەڵام شێوازی نمایشکردنی ڕووداوەکانو شرۆڤەکردنیان بۆ هەڵوێستی هەندێ لە هاوەڵانو تابیعین زۆریان بێویژدانی پێوەیە، بۆ نموونە ئەو نووسینانەی ئەبوعەلای مەودودی لە کتێبی (الخلافة والملك)، ئەو نوسراوانەی شێخ موحەممەد ئەبو زەهرە لە هەردوو کتێبی (تأريخ الامم الاسلامية)، (الامام زيد بن علي) ئەم دوو کتێبە پڕ پڕن لە ڕەخنەو گازندە کردن لە پلەو پایەی هەندێ لە هاوەڵانو تەشەردان لە خەلیفەکانی بەنی ئومەیەو سوکایەتی پێکردنو داشۆرینیان، لە هەموو ڕەفتارێکی پەسەند یان کارێکی باش[2]، دیارە نموونەی ئەم زانایانە هەرگیز نەکۆڵیونەتەوە لە ریوایەتە مێژوویەکان، خلیسکاونەتە ناو ریوایەتە ڕافزییە شیعەکانو لە ئیمەشیان تێکداوە.

ج ـ نوسراوی ترمان هەیە، نووسەرەکانیان هەوڵیان داوە، کە ڕێبازی زانایانی زامو بیمار بگرنە بەر لە هەڵسەنگاندنی ریوایەتە مێژووییەکانداو بە ئاقاری فەرمودەی زانەکاندا باسی بکەنو لەسەر بنەماکانی ڕێبازی فەرمودەزانی نمایشی بکەن، لە رووی دەقو سەنەدەوە لە پێناوی ئەوەی ساغو نەخۆش ڕاستو چەپەڵ لەیەك هەڵاوێر بکەن، لەم کتێبە نوسراوانەدا هەواڵێکی زۆر باشو زەحمەتێکی پێ زانراو هەیە بۆ وەستانەوەو بەرابەری ئەم پۆخڵەواتەو ڕووداوەکانی بە شرۆڤەیەکی ڕاستی لێکدەداتەوە کە بە جۆرێك بێت لەگەڵ فەزڵی هاوەڵاندا پێك هەڵپرژان نەکاتو دژی ئیمانو جیهادیان نەبێت[3]،

---

[1] اصول مذهب التشيع (١٤٥٩/٣).

[2] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٨١).

[3] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٨١).

ئەو کتێبە نوسراوە زۆرباشانەش نوسراوەکانی یوسف العش لە (تأريخ الدولة الاموية) نوسراوەکانی محب الدين الخطيب، کە کردویەتی بە پەراوێزی (العواصم من القواصم)، کە هی ئەبوبەکری کوڕی ئەلعەرەبییە، نوسینەکەی (صادق عرجون) لە کیتبی (عثمان بن عفان) نوسینەکانی دکتۆر سلێمان بن حمد العود لە کتێبی (عبداللة بن سبأ واثره في احداث الفتنة في صدر الاسلام) نوسینەکانی محمد أمحزون لە کتێبی (تحقيق موافق الصحابة في الفتنة) نووسینەکانی عوسمان ئەلخەمیش لە کتێبی (حقبة من التأريخ) نووسینەکانی دکتۆر محمد حسن وڕاب لە کتێبی (المدينة النبوية فجر الاسلام والعصر الراشدي) لێکۆڵینەوەکانی محب الدين و پەراوێزە نیشان شکێنەکانی کە لەسەر کتێبی (العواصم من القواصم والمنتقي) کردویەتی، جگە لەمانەش ئەو کتێبو توێژینەوەو نامانەی کە لەسەر خودی ئەم ڕێبازە دەڕۆن، ئاشکرایە لەم روونکردنەوە زۆر پێویستە چەندەها دانراوو نوسراوو کتێب بێنە ئاراوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم مێژوو کاول کەرو مێژوو ئاوەژووکەرانە بدرێتەوە کە مێژووی ئیسلامو پلەو پایەی هاوەڵانیان هەڵشیوتووە هەتا لێکۆڵینەوەیەکی وردی ڕووداوەکان نەکرێتو چۆماڵ نەکرێتو هەموو هەواڵو ریوایەتەکان نەدرێن لە بێژەنگو بە ترازووی زامو تیمار نەکێشرێنو راستیو ناڕاستی لەیەك جودا نەکرێتەوە[1]، ڕاستییەکان دەرناکەون لە ئیبنو تەیمیەوە هاتووە دەڵێ: (ئەگەر بیدعەچییەك دەرکەوت، بەشتی پڕوپوچ لەکەداری کردن، واتە هاوەڵانو تابعین ئەوە دەرگای بۆ مەکەنەوەو ڕێگەی بۆ ئاچوخ مەکەن، دەبێ باسی بەڵگەکان بکرێن بە شێوەیەکی دادوەرانەو زانستیانە بۆ پوچەڵکردنەوەی رایەکانیان)[2].

ئیمامی زەهەبی لە مبارەیەوە مەزهەبێکی تری هەیە بانگەشەی ئەوە دەکات ئەو کتێبانەی کە درۆو شێواندی پلەو حورمەتی هاوەڵانی تێدایە بسوتێنرێت، دەڵێ: بڕیار وایە وازبهێنرێت لەو ڕووداوەی کەوتووەتە نێوان هاوەڵانو ئاگادارین کە براکوژییەکەیان لە پەڕاو نامیلکەکاندا بە بەردەوامی دەدرێت بە گوێماندا دەیجونەوە، بەڵام زۆربەی زۆری گێڕانەوەکانی (بچڕبچڕ)و زەعیفەو هەندێکیشی درۆیە، ئەمەی لەبەردەستی

---

[1] المصدر نفسه، (٨٣).

[2] منهاج السنة (١٩٢/٣).

ئێمەو زانایاندایە وا پێویست دەکات لولی کەین‌و بیشارینەوە، بەڵکو وا باشە بیدڕێنین‌و فڕێی دەین بۆ ئەوەی دڵمان بێخەوش بێت‌و بەرامبەر هاوەڵان‌و خۆشەویستی‌و ڕەزامەندیمان هەڵقولێ بۆیان[1]، ئیمامی زەهەبی لە قسەکانیدا سودێکی مەزنمان پێدەگەیەنێ، کە بە ڕاشکاوی دەڵێ: زۆربەی ئەو نووسینانەی لەم بارەیەوە نوسراون لە کیتب‌و نامیلەکەو نووسراوەکاندا درۆو شایەتی ناهەق‌و دەست هەڵبەستە لەسەر ڕێزی هاوەڵان، هەرچەند زەهەبی پێشنیاری سوتانی ئەو کتێبانە دەکات، بەڵام ناپۆڕێ، چونکە ئەو کتێبانە بڵاوەیان کردووە، چەندین یانەی چاپ‌و پەخش چەندجارێ چاپیان کردووەتەوە، لە لایەن مەرام گڵاوەکانەوە، چارەسە نەماوە تەنیا دروستکردنی ناوەنیدێکی لێکۆڵینەوەو تاووتوێژ کردن نەبێت، تا هەرچی هەڵەو درۆو چەواشەکاری هەیە تێیدا روونی کەینەوە بۆ ئەوەی نەوەکانی موسڵمانان پارێزراو بن لە لادانی ڕەوشت‌و عەقیدە[2].

٢ـ ئاوڕدانەوە لە باسی فیتنەی کوشتنی عوسمان‌و ئەو ڕووداوانەی نوساوە پێوەی بە ئاشکرا هۆکارەکانی فیتنەی راستەقینەمان بۆ دەردەخات، ئیتر ئەم هۆکارانە ناوخۆیی بن یان دەرەکی، لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە دەبێتە هۆی زانینی کاریگەری ئەو پیلانانەی کە بۆنەتە هۆکاری بەرپابوونی ڕووداوەکان، ئا لێرەدا ئەوەندە هۆکار هەیە لەمباسەدا دەبێ پلەداری بکەین‌و ڕێکبخەین، هەرکەسێ چمکی لەو نوسراوانەی خوێندبیتەوە کە لە بارەی ئەم فیتنەوە نووسراوە تێدەگات کەلەکۆمەکارییەکە زۆر گەورەبووەو ڕەنگ ڕێژی بۆ کراوەو ئاگرپەرستەکان‌و گاورو جولەکەکان‌و دووڕووەکان دەستیان کردووە بە یەکدا بۆ جێبەجێکردنی، ئەم کێشەگەلە کۆمەی دوژمنانی ئوممەتی ئیسلامە لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی دوورودرێژدا[3]، خۆ ئەگەر فاکتەری لاوازی ناوخۆیی نەبوایە ئەم گەلەکۆمەکارییە سەرکەوتنی بەدەست نەدەهێنا، ئەم بێ هێزییە ناوەکییە داڵدەی سەرکەوتنی موئامەرەکەیدا، کەواتە ڕەوایە لە سەردەمی هاوەڵان بکوڵینەوە بە تایبەت

---

[1] سير اعلام النبلاء (٩٢/١٠).

[2] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٨٤).

[3] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٨٣).

ئەم فیتنەیە، واجبێکە لە واجبەکان لە پێناو ناسینی هۆکارەکانی لاوازبوونی ئوممەتی ئیسلامییو دیاریکردنی ئەو خاڵانەی، کە هەرەسی ئوممەتی تیا بەرجەستە دەبێت، بە هیوای ئەوەی ئایندەی ئوممەتی پێ تیمار بکەینو لە لەزمەکانی ژیان دوری خەینەوە[1]
ئەو رووداوە گەورانەی هاتنەکایەوە لە فیتنەی کوشتنی ئیمامی عوسماندا و ئەو کارەساتانەی هات بە دوایدا پێویستی بە لیکۆڵینەوەیەکی قوڵو لەسەرخۆ هەیە بۆ ئەوەی لە و چەردە مێژووییە وانەو پەند دەربهێنینو ئێستامانی پێ ڕۆشن بکەینەوە بۆ ئەوەی بیکەینە رێنمایی بۆ هەوڵە توندوتۆڵەکانمان بۆ گەڕانەوەی خەلافەتی راشیدین لەسەر رێبازی پێغەمبەران (درودی خوایان لەسەر بێت)، هەتا مرۆڤایەتی

بە دینی خوداو شەرعەکەی بە ختەوەر ببینو لەبەدبەختیو تەنگوچەڵەمەو زەلکاو بێنە دەرەوە، کە بە هۆی دوورکەوتنەوەیان لە شەرعی خودا تێی کەوتوون.

**دووەم: حیکمەتەکانی هەواڵی ڕووداني ئەم رووداوە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ**

پێغەمبەر ﷺ لە زۆر فەرمودەیەکیدا هەواڵی داوە کە ئەم ئوممەتە ناکۆکیو کوشتار دەکەوێتە نێوانیانو ئەو رووداوانەی هەژمار کردووە کە ئاماژە دەکەن بۆ ئەم رووداوانە بە گشتییو بە دووررودرێژیو هەموو جۆرەکانی ئامرازی هەواڵدانی لەمبارەیەوە بەکارهێناوەو لە باسکردنی هۆکارەکانی فیتنەدا، یاخود دەرئەنجامەکانی یاخود هەندێ لە کارەساتەکانیو لە هەلومەرجەکانی یاخود بۆ کێ هەڵدەگیرسێو شتی تریش، زۆربەی ئەم روونکردنەوانە لە وەڵامی پرسیاری ئەو هاوەڵە بەرێزانەدا دەدرایەوە، کە دەیانخستە بەردەمی، ئەوان دەست لەدەست بوونو ئەو نیعمەتەی گەورەیان دەچەشت کە خودای گەورە پێی بەخشیون، ئەویش نیعمەتی برایەتیو یەکڕیزیو یەکدەنگی بوو، هاوەڵان ئەرۆشتن پرسیاریان لەوە دەکرد ئەگەر ئەم نیعمەتە تیا بچێت یان کۆتایی ببێت چی بکەن، پێغەمبەریش ﷺ بە وەحی فێری دەکردن ئەم برایەتییە تاسەر نابێت، پێی باشبوو وا پەروەردەیان بکات، ئامادەی فیتنەو ناسۆرییان تێدا بێتو بەرگەی بگرن بۆ ئەوەی بە باشی هەڵسوکەوت بکەن گەر رۆژی لە رۆژان خودای تەقدیری کارێکی وای کرد فیتنەدا کەوێت، بۆ ئەوەی پەلەقاژە بکەن لە وەختی خۆیدا چارەسەری بکەن، لە

---

[1] المصدر نفسه ، ص(٨٥).

ئەنجامی‌سەرنجدانی سەرجەم فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە لە باسکردنی فیتنەدا هاتوون پەنجە بۆ ئەم حوکمانە رادەکێشت[1]:

١ـ پێغەمبەر ﷺ ئەم فیتنەو رووداوانە باس دەکات مەبەستی ئەوەیە ئوممەت لەو ریاییو ئامادەباشی پەروەردە بکات، بۆ ئەوەی بە باش هەڵسوکەوت بکات، گەر رۆژێ روودانی ئەم فیتنەیە هاتە پێش بۆ ئەوەی دەستوبرد بکات لە کاتی خۆیدا چارەسەری بکات.

٢ـ لەم فەرمودانەدا ئاماژەکراوە بۆ ئەو کەسانەی هەڵی دەخرێنن ئەوانە لە گۆریەك بەرووکەش ئیماندارو قایمو قوڵن بەڵام عەقڵیان لایداوەو دڵیان چەرخاوە ئەوانە بە گشتی لە دۆخێکدان دەرك ناکەنو ناحاڵێن[2].

٣ـ ئەم فیتنانە پەردە لەڕوو هەڵدەماڵێو دڵی ئیماندارانی دادەکوتێو ئیمانیان پێی زیاد دەکاتو هانان دەدات بۆ فەرمانکردن بە چاکەو رێگریکردن لە خراپەن ئەم فیتنانە جۆرێکن لە تاقیکردنەوە دەرونی پێ جێگر دەبێت ناخی پێ خاوێن دەکرێتەوەو تێکۆشانی دەخرێتە سەر لەو کاتانەدا خێر دەناسێتو فەرمانی پێ دەکەینو شەڕ دەناسینو دووری لێدەگرین[3].

٤ـ ئەم هەواڵانەی لە بارەی ئەم فیتنەوە هاتووە لە ناوەڕۆکیدا سڵەمینەوەیەکی توندوتۆڵی هەڵگرتووە کە تێی نەکەوین یان بە هیچ شێوەیەك خۆمان لە قەرەی نەدەین، چونکە باوەڕدارانی ئەم ئوممەتە لە هاوەڵانو غەیری ئەمانەش کاتێ هەواڵێکی پێغەمبەر ﷺ دەبیستن تێ دەگەن کە هەیانە کوشتاری لەدەست دەردەچێتو هەشیانە وابەستەی دونیایەو هەیانە واز لە جیهاد دەهێنن بە هەمان شێوە بابەتی تریان هەیە لە ناخیاندا کۆمەڵێ هەست دەبزوا بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم فیتنەیە هەریەکەیان دەیان وت بەڵکو من لێی دەربازبم هەڵوێستیان هاتە سەر ئەوەی ترسیان لێ نیشت درێژە بکێشێتو بکەونە ئەم قەیرانەوە بەبێ ئاگاییو نەزانی ـ ترس لە مبارەیەوە گەورەترین

---

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٦٨).

[2] الوحدة الاسلامية، لمحمد ابو زهرة، ص(١٣٧).

[3] المصدر نفسه، ص(١٣٦ ـ ١٣٧).

ڕێگای دەربازبوونە[1]، ئیبنو تەیمییە دەڵێ دوای ئەوەی کۆمەڵێ فەرمودەی مەرفوع هاتووە لەبەرپابوونی ئەم ناکۆکییەداو ئەم دووبەرەکییەدا لەناو ئوممەتی ئیسلامدا:

(ئەم چەمکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەبەر کراوەو بە چەند شێوەیەك باسکراوە هەموویان ئاماژە دەکەن بۆ ئەو دووبەرەکیو گەڕەلاوژێیەی، کە بەرپا دەبێت لە ناو ئوممەتی ئیسلامدا، بۆیە ئوممەتی لێ هۆشیار کردووەتەوە هەتا ئەو کەسانەی خودای گەورە حەزدەکا بە سەلامەتییان بۆ ئەوەی دەرباز بن)[2].

٥- هەواڵ لە بارەی ئەم فیتنەوە بەوردی ڕێگای دەربازبوونی دەستنیشان کردووە مرۆڤ هەرچەند زۆر زۆر سڵ بکاتەوە لە مەترسییەك کە هەڕەشەی لێدەکات، گەر ئەم مەترسییەی بۆ دەستنیشان نەکرابێت یان چۆنیەتی بەرپابوونی بۆ ڕوون نەکرابێتەوە، ئەوە پێشبینی ئەو ڕێگایانە ناکات کە لێیەوە ڕوودەدات، سروشتی ئەو کێشەو قەیرانەی کە دێتە پێشێ بۆ ڕوون نابێتەوە، بەڵکو دەکەوێتە ئەو مەترسییەی کە لێی دەترسێ بەبێ ئەوەی مەبەستی کەوتنی هەبێتو هەست پێ بکات[3].

٦- هەواڵەکانی ڕوودانی ئەم فیتنەیە لە هەندێ فەرمودەدا نزیك کراوەتەوە لەناوبردنی هۆکارەکانی یاخود ڕۆشنکردنەوەی دەرەنجامەکانی یان هەڵوێستی موسڵمان تێیدا، ئەمە سوودی بۆ موسڵمان هەیە، یان بۆ ئوممەت بە گشتیی لە ڕەچاوەکردنی هۆکارەکانی فیتنە یان بڕیاردان بەسەر ڕووداوێکی دیاریکراو لە ئەنجامی تێڕوانینی دەرەنجامەکانی یان وەرگرتنی هەڵوێستێکی دروست هەر لە سەرەتاوە.

٧- پاشان ئەم هەواڵانە بەڵگەیەکی ئاشکرای تێیدا لەسەر ڕاستیو دروستی پەیامی پێغەمبەر ﷺو نێردراویەکەی، ئیمانی ئەو هاوەڵانەی پێ زیادبوو کە ئەم فەرموودانەیان بیستووە، پاشان واتای فەرمودەکانیان بە چاوی خۆیان بینی لە ژیانی ڕۆژانەیاندا دوای ماوەیەك، ئیمانی هەموو ئیماندارێکی پێ زیادبوو لە هەموو شارو

---

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٦٩).

[2] المصدر نفسه، ص(٧٠).

[3] المصدر نفسه.

سەردەمەکاندا، رووداوەکانی ئەو فیتنەو دووبەرەکییەی کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی بەرپابوونی دابوو بەرپابوو[1].

دکتۆر عەبدولعەزیز صەغیری فەرمودەکانی فیتنەی کۆکردووەتەوەو هەستاوە بە لێکۆڵینەوەی‌و جیاکردنەوەی صەحیح لە زەعیف، لە کیتابەکەیدا (أحداث أحاديث فتنة الهرج)ن پاشان لە فەرمودە صەحیحەکان کۆمەڵێ مانای دەرهێناوە لە چەمکەکانی ئەم فەرمودانەدا وەکو:

١ـ فیتنەکەوتنەوە سونەتی خودایە، لەناو ئوممەتاندا، لەم ئوممەتەشدا هەتا رۆژی قیامەت ئەو فیتنەیەش وەکو پارچە شەوێکی تاریك‌و ئەموستەچاو شەوەزەنگ هەر کەسێ دەستی تێ وەردا، لە دونیاو ئاخیرەتدا تیا دەچێ، هەرکەسێکیش دەستی لێ بگرێتەوە رزگار دەبێت لەوە ناچێت هیچ کەسێ هەڵوێستی باش بخاتە روو، ئەو کەسانە نەبێت کە خودای گەورە بە زانست وشیاری کردبنەوە بە تەقوا توێشەبەرەی پێدابێت، بە ئیزنی خۆی رێنمایی کردبێت، بۆ ئەو حەقەی کە ناکۆن تێیداو وێڵ بووە لێیان[2].

٢ـ لەم فەرمودانەوە ئەوە هاتووە کە فیتنەی کوشتارو شەڕکردن لە نێوان موسڵماناندا کارێکی واقیعییەو مەجالی تێدا نییەو رێگایەك نییە بۆ نکوڵی کردنی‌و بەنامۆ ناوبردنی.

بە رووداوەکانی نێوان هاوەڵان‌و تابعین دەستی پێ کردوو بەسەردەم‌و قۆناغەکانی ئیسلامدا تێپەڕیوە هەتا ئەمڕۆ، بەڵام پێویست وایە هۆکارەکانی ئەم کوشتارە بناسین بۆ ئەوەی تێوەنەگلێین یان هەوڵ بدەین، بۆ کوژاندنەوەی ئاگری فیتنەکە هەرکاتی لە شاری موسڵماناندا بڵاوەی کرد، نابێت موسڵمان هەڵوێستی دەست بگرە بە کڵاوی خۆتەوەی هەبێت.

٣ـ ئەم فیتانەش رەحمی خودایە بۆ ئەم ئوممەتە کە هەر لە دونیادا لە گوناهەکانیان خۆش دەبێت، ئەو کوشتارو فیتنەیەی کە دەبارێتە گۆڕەپانی ژیان‌و ئەو بومەلەرزانەی کە دێتە پێش تەنیا بۆ وەرینی گوناهەکان دێت‌و بۆ پاکبوونەوەی موسڵمانە.

---

[1] المصدر نفسه.

[2] المصدر نفسه، ص(٣٤٥).

٤- لە هەندێ لەم فەرمودانەدا ئاماژەیەکی ئاشکراو ڕاشکاو هەیە، زۆربەی ئەم فیتانە لە رووی رۆژهەڵاتەوە سەرهەڵدەدات هەروەك بە واقیعی بینیمان فیتنەی یەکەم لە کوفەوە ئەزنەکی داوە دەستی پێکردووە لە بەسرەوە، فیتنەی شەڕی جەمەل لەوێ روویدا.

٥- لە هەڵگیرسانی فیتنەدا گرۆیەك دینیان دەفرۆشن، بە کالآیەکی بێ ئەرزشی دونیاو شەهەوات‌و شوبوهات دەبێتە حاکمیان وایان لێ دێت ئەهلی ئیسلامی راستیان لەلا نامۆ دەبێت لە هەڵسوکەوت‌و ئاکاریاندا، ئەوانەی دەستیان دەگرن بە دینیانەوە هەروەکو ئەوانەیان لێ دێت، کە پشکۆیان بە مشت هەڵگرتووە، یاخود دەکەونە سەر دڕك‌و داڵ، بەڵام خۆگرو چاولە پاداشت‌و بەرامبەر ئیش‌و ئازاری ئەو ناڕەحەتیانەی کە لە پێناوی دینەکەیان پێیان دەگات‌و باوەڕیان وایە، کە راستە.

٦- لە فیتنەدا خودای گەورە گرۆیەك لە خەڵکی دەپارێزێت‌و نالکێن بە فیتنەوەو دەستیان بە خوێنی موسڵمانان ڕەنگ ناکەن‌و هەوڵدەدەن ئاشتی بخەنە نێوانەوەو بانگەشەی خەڵك دەکەن، بۆ بنەما دروستەکانی ئیسلام لە برایەتی‌و بەزەیی خوازیی، بە بێگومان هەڵوێستیان ناوازەیە لە ناوەڕاستی ئاپۆرەیەکی کەفو کولاّوی‌و هەوەسبازییەکی بڕیاردەردا[1].

٧- لە فیتنەدا زمان ڕۆڵێکی ترسناك دەگێڕێ کە لەشمشێر بەبڕشترە، بەڵکو زمان زۆربەی جار دەبێتە هەڵگیرسێنەری فیتنەو بەلاّ، زۆرجارێ وشەیەکی نەگریس کە لە دەم دەردەچێت ئاگرێك لە دڵدا دادەگیرسێنێت‌و هەستە کپبووەکانی دەرون هەڵدەکوڵێنن‌و هەڵدەچێنێت‌و سۆزەکان داغان دەکات‌و دەبێتە هۆی فیتنەیەکی لابەلا[2].

٨- لە فیتنەدا زانست کەمدەکات یان بە مردنی زانایان یان بە ماتبونیان یان بە گۆشەگیر یان بۆ ئەوەی بێوەی بمێنین یاخود بۆ ئەوەی خەڵك دەستیان لە کۆڵکەنەوەو بە بۆنەی هۆکارێکەوە، ئا لەوکاتەدا نەفامیەت دەبێتە فەرمانڕەواو خەڵکی سەرۆکی نەفام و نەشارەزا دەدۆزنەوەو ئەوانیش بە نەزانی فتوایان بۆ دەدەن سەر لەخۆیان‌و ئەوانیش

---

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٣٤٦، ٣٤٧، ٣٤٨).

[2] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٣٤٨).

دەشێوێنن‌و رووەبیبزەکان واتە خەڵکی ئاست نزم‌و سەرسەری دەبنە گەورەی خەڵکی‌و گەمژەکان بەرز دەبنەوە بەسەر بڵندەکاندا[1].

٩ـ ئالەم فەرمودانەدا هاتووە، کە خودای گەورە گرەنتی داوە بە پێغەمبەر ﷺ، کە ئەم ئوممەتە بە برسییەتی‌و گرانی‌و بێ بارانی نافەوتێنێ، دوژمن ناکات بە سەرەخۆریان، واتە بە هەمیشەیی‌و هەتا هەتایی دوژمن زاڵ نابێت بەسەریاندا هەرچەند ئەو دوژمنە تواناو زەبرو زەنگی هەبێت، بەڵام ئەوکارەی کە خودای گەورە گفتی نەداوە بە پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە، کە ئوممەت دووبەرەکی‌و ناکۆکی تێ نەکەوێت، ئەمە ئەو دەرگایەیە کە دوژمنی دەرەکی لێیەوە دێتە ژوورەوە کەواتە ئەگەر ئوممەت دووبەرەکی کەوتە نێوانیان‌و هەندێکیان هەندێکیانی کوشت‌و ئامرازەکانی کارامەو هێزی تێدا لاوازبوو، مەرامەکانی دوژمن دەستی دا ئەوکاتە خێرو خۆشی بە خۆڕایی دەڕوات، کۆتایی نایەت هەتا نەگەڕێتەوە بۆ بەرجەستەکردنی هێز بەیەکگرتن‌و کۆکردنەوەی گشت لایەك لەسەر یەکدەنگ‌و حوکم بەشەرعی خودای گەورە نەکەن[2].

١٠ـ لە فەرمودەکاندا، کە دەڵێ: فیتنە بەرپا دەبێت‌و بەردەوام دەبێت ئەوەی لێ فام دەکرێت کە تاقمێکی لادەر، لە رێنماییەکانی ئیسلام دەردەکەون‌و ئەهلی باتڵ سەردەردەهێنێت‌و دادەچەسپێت.

١١ـ لە فیتنەدا رەوشتی خەڵکی گۆڕانی بەسەردا دێت‌و ئازوگوێز دەکات‌و خەڵکی بۆ کرداری چاکە زاهید دەبێت‌و لە پرۆژەی چاکەکاریدا کەم ویست دەبێت لە نێوان خەڵکدا دوژمنایەتی‌و قین‌و کینەبازی دەکەوێتەوەو چاکەو خراپە تێکەڵ دەبن.

١٢ـ لە فەرمودەکاندا هاتووە، کە پیش ئەم فیتنەیە ئاسایش‌و سەقامگیری‌و چاکسازی بارودۆخی خەڵکی لە ڕووی ماددی‌و ئۆقرە دەستەبەر دەبێت تەنانەت سوار لە عێراقەوە هەتا مەککە دەڕوات ئاوڕناداتەوە مەگەر رێگەی لێ تێك بچێت، ئەم حاڵەتەش لە سەردەمی عوسماندا هاتە دی، بە ڕاستی سەردەمی سەقامگیریی‌و

---

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٣٤٨).

[2] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٣٤٨).

ئاسایش‌و لێشاوی سامان‌و خێرات بوو، پاشان فیتنەی هەرج روویدا بارودۆخەکەی ئاوەژو کردووە هەتا کار گەشتە ئەوەی باری ئاسایش بوو بە ترس.

١٣ـ لە فیتنەدا خەڵکی هەڵبژاردەو ئاقڵ‌و خاوەن رەئی دەکوژرێ‌و هەرچی‌و پەرچی دەمێنێتەوە نە چاك بە چاك دەزانن‌و نە خراپە بە خراپە دەزانن[1].

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٣٤٩، ٣٥٠).

## باسی دووەم: هۆکارەکانی فیتنەی کوشتنی ئیمامی عوسمان

ئیمامی زوهری دەڵێ: عوسمان دوانزە ساڵ ئەمیری ئیمانداران‌و فەرمانڕەوایان بوو، شەش ساڵی یەکەمی خەڵکی هیچ گلەییەکیان لێ نەبوو، لە ئیمامی عومەر زیاتر خۆشەویستی هەبوو بۆ قورەیش، چونکە ئیمامی عومەر توندوتۆڵ بوو بەرامبەریان، بەڵام ئیمامی عوسمان دڵنەرم بوو بۆیان‌و خزمایەتی دەکردن‌و سەرکێشی دەکردن، پاشان دوای ئەمە فیتنە بەرپابوو مێژوونووسە موسڵمانەکان رووداوەکانی شەشەمی دووەمی خەلافەتی عوسمان لە (٣٠ ـ ٣٥)ی کۆچی بە فیتنە ناو دەبەن، درێژەی کێشا هەتا شەهیدکردنی ئیمامی عوسمان[1]، موسڵمانان لە خەلافەتی ئەبوبەکرو عومەرو سەرەتای خەلافەتی عوسماندا کۆك بوون‌و هیچ ناکۆکییەك نەبوو لە نێوانیاندا، پاشان لە دوادوای خەلافەتی عوسماندا بەسەرهاتێك روویدا، جۆرە تەفرەقەیەکی دروست کردو تاقمێك لە ئەهلی فیتنەو زوڵم تووشی ناکۆکی بوون[2]، کۆمەڵگەی ئیسلامی لە خەلافەتی صدیق‌و فارووق‌و نیوەی یەکەمی عوسماندا ئەم شەقلانەیان پێوە دیار بوو، وەکو:

١ـ بە شێوەیەکی گشتی ئەو کۆمەڵگەیە کۆمەڵگەیەکی موسڵمان بوو، بە هەموو ماناکانی ئیسلامەتی‌و باوەڕبوون بە خوداو رۆژی دوایی زۆر قوڵ بوو، بە جدی‌و بە رۆشنی هەڵسوکەوتەکانی ئیسلامیان جێبەجێ دەکرد، بە ئاشکرا پەیوەستی بوون، کەمتر رێژەی گوناە بەدی دەکرێ لەناو ئەو کۆمەڵگەدا بە درێژایی مێژوو دینداری ژیانی خەڵکی بوو ئایین شتێکی پەراوێزخراو نەبوو، جار جارە بگەڕێنەوە سەری، بەڵکو ژیانی خەڵکی بەس دینداری بوو گیانیان لە دروشمێکی پەرستندا قەتیسیان نەکردبوو، زۆر پەرۆشبوون لەسەر رویەکی صەحیح پیادەی بکەن، ئیسلام ببووە هەڵسوکەوت‌و ئەتواریان بووە جێگە بایەخ‌و ڕەخنەو راو بەهاو پەیوەندیی کۆمەڵایەتی‌و گرێی خیزانی‌و کاسەو سێی دراوسێیەتی‌و کڕین‌و فرۆشتن‌و کۆچوبار کردنیان لە شانەکانی زەویداو کردبویانە کۆششیان لە دەستهاتی بژێویداو ئەمانەتی مامەڵەکردن‌و خەمخۆری

---

[1] مجموعة الفتاوى (١٣/ ٣٠).

[2] طبقات ابن سعد (١/٣٩، ٤٧)، البداية والنهاية (٧/١٤٤ ـ ١٤٩)، والخلفاء الراشدين للخالدي، ص(١١٢).

بەهێزەکان بوو بۆ بێهێزەکانو فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەکردنو چاودێریی و مەزنەی حاکمو والییەکان بوو، ئەمانە مانای وا نییە کە هەموو تاکێکی ئەو کۆمەڵگایە ئەم ڕەوشتانەی هەبووبێت، بەڵکو لە ژیانی دونیادا هەرگیز بەرجەستە نابێ لە تاك بەتاکی کۆمەڵدا، لە هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتیشدا، لە کۆمەڵگەی پێغەمبەردا ﷺ، وەکو لە قورئاندا باسی هاتووە دووڕووەکان بە ئاشکرا ئیسلامەتی خۆیان دەربڕیبوو، بەڵام لە ناخی دڵنیادا

دوژمنی بوون، وە ئیمان لاوازەیشیان تێدابووەو گزیکارو ورگدڕاوو ترسنۆكو گلاوچی، بەڵام ئەم تاقمانە هیچ قورساییەکان نییە لە کۆمەڵگەداوە هیچ توانایەکیان نەبوو ڕەوتی کۆمەڵگە ئاستەنگ کەن، چونکە تەوژمی ڕاتەکیوو تەوژمی ئیماندارە، ئیماندارە دروستو موجاهیدە خۆبەختکەرانی ڕێگەی خودا بوو بە ماڵو گیانو پابەندی زانیارییەکانی ئیسلام بوون[1].

٢ـ ئەو کۆمەڵگەیە بوو بە بەرزترین واتای ڕاستەقینە ئوممەتیان بەرجەستە کردو بوونە نموونەی هەرەبەرزی ئوممەتی ئیسلام ئەو کۆمەڵگەیە کۆمەڵێ مرۆڤ نەبوون کە یەك زمانیو یەك نیشتمانیو یەك بەرژەوەندیی کۆی نەکردبونەوە، بەڵکو ئەم پەیوەندییانە پەیوەندی مرۆڤەکان بوون لە سەردەمی نەفامیدا، خۆ ئەگەر لەسەر ئەم پەیوەندییانە چوبان دەبونە کۆمەڵگەیەکی جاهیلی، بەڵام ئوممەت بە واتا یەك خوداناسییەکەیو یەك پەروەردگارییەکەی ئەو ئوممەتەیە کە گرێ کوێرەی نیوانیان عەقیدەیە بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە زمانو ڕەگەزو ڕەنگو نیشتمانو بەرژەوەندیی، ئەو پەیوەندییە ئیمانییەی لە ئوممەتی ئیسلامدا بەدیهات لە مێژووی هیچ گەلێکدا بەدی نەهاتووە، ئوممەتی ئیسلامی ئەو ئوممەتەیە کە لەسەر دەمارگیری نیشتمانو ڕەگەزو ڕەنگو بەرژوەندیی هاوسییەییو ئەمشتانە دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر گرێ بەندەکانی عەقیدە بنیات نراوە، پەیوەندیی خستبووە نێوان عەرەبیو حەبەشیو ڕۆمیو فارسی، پەیوەندی خستبووە نێوان خەڵکی شارە فەتحکراوەکانو خەڵکە فاتیحەکان لەسەر بنەڕەتی برایەتی کامڵ لە دینداریدا، ئەو چەمکەی ئوممەتی ئیسلام بەرجەستەیان کرد درێژترین تەمەنی

[1] كيف نكتب التأريخ الاسلامي، ص(١٠٠).

هەبوو لەوەتی زەوی دروستکراوە، ماوەی سەرەتای ئیسلام گولڵدارترین ماوەبوو رازاوەترین تەمەن بووە، کە هەر هەموو ماناو مەبەستەکانی ئیسلامی تێدا بەرجەستە بووە، بە شێوەیەك ئومەتیان وێنا کرد لەپێشدا نموونەی نەبووەو ناشبێت.

٣ـ کۆمەڵگەیەکی ئەخلاقی بوو لەسەر رێسایەکی ئەخلاقی روونو درێژخایەن راوەستابوو لە ژێر رکێفی فەرمانو ئاڕاستەیەکی پەرستنندایە ئەو رێسای ئەخلاقیی ئەو کۆمەڵگەیە تەنها پەیوەندی ڕەگەزی نەدەخواست، بەڵکو لە رووی ئەخلاقییەوە گەورەترین شەقڵی ئەم کۆمەڵگەیە ئەوەبوو دەم رووتو سیخوڕی تێدا نەبوو تێکەڵاویی بێسەروبەری تێدا نەبوو خاڵی بوو لەو شتانەی کە شەرمو شکۆ دەڕوشێنن چ بە کردەوە بێت یان بە قسە یان بە ئیشارەت ، خاڵی بوو لە داوێن پیسی تاکو تەرا نەبێت، کە بە شێوەیەکی رەها هیچ کۆمەڵگەیە لێی بێبەش نابێت، بەڵام رێسا ئەخلاقییەکە زۆر لەوە فراوانتربوو کە لە پیوەندی دوو ڕەگەزدا قەتیس بکرێت، بەڵکو سیاسەتو ئابووریو کۆمەڵایەتیو هزرو گوزارشتی دەگرتە ئەستۆ، حوکمەکە لەسەر ئەخلاقیاتی ئیسلام بنیات نرابوو، پەیوەندی نێوان تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لەسە راستگۆییو ئەمانەتپارێزیو نیازپاکیو هاوکاریو خۆشەویستی دەچوو بەڕێوە نەپاشملە نە توانجو نە دووزمانیو نە بووهتانکردنی نامووسی تێدا نەبوو[1].

٤ـ کۆمەڵگەیەکی جدیی بوو سەرقاڵی مەشخەڵە بەرزەکان بوو نەك کارە بێ بایەخو بێ ئەرزشەکان، جدییش پێویستی بە گرژیو مۆنیو زبری نییە، بەڵکو بە گیانێکی هیممەت بەرزیو زیندووکردنەوەی هیممەتو هاندانی خەڵك بووە لەسەر چالاکییو بزوتنو کارکردن، گرنگیدانیان زۆر بڵندترو وردتر بووە لەو واقیعە هەست پێکراوەی کە لەبەرچاویان بووە، نیشانەکانی کۆمەڵگەی دەست بەتاڵو تەوەزەلی تیا نەبووە، کە لەماڵو رێگاوبانەکاندا پاڵی لێ بدەنەوە یان بە بەلاش بگەڕێن، وەك ئەو کەسانەی کاتی خۆیانی پێ دەکوژن لە تاوی بێکاریو فەراغو بەتاڵی[2].

٥ـ کۆمەڵگەیەك بوو بۆ کارکردن توندوتۆڵ بوو لە هەموو روویەکەوە گیانی سەربازیەتی بە ئاشکرا رەنگیدابووەوە، تەنیا لەشەڕدا سەرباز نەبوون، بەڵکو لە گشت

---

[1] كيف نكتب التأريخ الاسلامي، ص(١٠٢).

[2] المصدر نفسه.

بوارەکاندا سەرباز بوون، ئەگەر جیهاد بۆ ڕەزای خودا بهاتایەتە ئاراوەە برێکی زۆر گەورە لە ژیانی ئەم کۆمەڵگەیە بۆ تەرخان دەکرا، لە هەموو لایەنەکانەوەو تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە قۆڵی کارکردنی هەڵماڵی بوو، بە تایبەت ئەو چرکەساتەی داوای کاریان لێ بکرایە سەرەڕای ئەوەی پیویستیان بە مەشقی سەربازیو مەدەنی نەبوو خۆیان بە کاریگەری دەروونی خۆیان پڕپڕ دەبوون لە پاڵنەرەکان و چالاکیی خۆیان دەبەخشی لە گشت بوارێکدا[1].

٦ـ کۆمەڵگەیەکی عیبادەت کاربوون ڕۆحی عیبادەت کردن بەروونی لە هەڵسوکەوتیاندا ڕەنگیداوبووەوە تەنیا لە جێبەجێکردنی فەرزەکانو سوننەتەکاندا کورتی هەڵنەهێنابوو، بەڵکو لە پیادەکردنی سەرجەم کارەکاندا بۆ ڕەزامەندی خودا دەجولانەوە، کارکردن لە هەستو بۆچونیاندا عیبادەت بوو بە گیانی عیبادەت کارییەوە جێبەجێیان دەکرد حاکمەکان سەرۆکاری گەلیان بە ڕۆحی عیبادەتەوە دەکرد ئەو مامۆستایەی کە قوتابی فێری قورئان دەکردو خەڵکی شارەزای دینداری دەکرد بە ڕۆحی عیبادەتەوە فێری دەکردن بازرگانەکان ڕەچاوی فەرمانەکانی خودایان دەکرد لە مامەڵەو کڕینو فرستندا بە ڕۆحی عیبادەتەوە دەیان کرد مێردەکان سەر بەرپستی ماڵەکانی خۆیان دەکردەوە وەکو عیبادەت، هاوسەرەکانیش چاوداشتی ماڵی مێردەکانیان دەکرد بە ڕۆحی عیبادەتەوە، ئەمانەش بۆ جێبەجێ کردنی تەوجیهاتەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە دەفەرموێ: هەمووتان شوانن‌و هەمووشتان بەرپرسیارن لەبەردەستان[2].

ئەمانە گرنگترین ئادگارەکانی سەرەدەمی صدیق‌و خولەفای ڕاشیدین بوو سەیر بکەین هەتا لە سەردەمی پێغەمبەراتیەتی ﷺ نزیك دەبینەوە ئەم نیشانانە بەهێزو بتەون، هەتا لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی بەرەو خوار بێین، ئەم نیشانانە لاواز دەبێت، ئەم ئادگارانە وایان کردبوو کۆمەڵگەیەکی موسڵمانو ساغ لە بەرزترین ئاسۆوە دیار بکەوێت، ئەم ماوەیە بە ماوەیەکی نموونەیی ناوەزەد دەکرێ، لە مێژووی ئیسلامیدا، هەر ئەمەش وای کرد ئەم دینە بە خێراییەکی سەرسوڕمان بڵاو بێتەوە بە گشت لایەکدا،

---

[1] المصدر نفسه.

[2] المصدر نفسه.

بزووتنەوەی فەتحکردنەکانیش خێراترین بزووتنەوەی فەتح بووە لە مێژوودا بە چەشنێك بوو لە ماوەی پەنجا ساڵدا بوون بە خاوەنی زەوییەك هەر لە زەریای رۆژئاواوە هەتا هندی رۆژهەڵاتیان بە دەستەوەبوو، ئەمە دیارییەکە کە تۆرمارگەو قەوارەی تێدا بەرجەستە بوو، هەروەها خەڵکی بە لێشاو لە وڵاتە رزگارکراوەکانەوە بە بێ زەختو زۆر، بە راستی ئەو خورپەوشتانەی کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر بنیات نرابوو، شایانی ئەو روخسارە جوانو نموونە زیندووە بوو نزیکترین کەس لە ئیسلامەوە ئەوەیە کە وێنە سەرسوڕمان و درەوشاوە جێبەجێ بکاتو پێی خۆش بێت هەمیشە ئیسلام لە گەردنو ئەستۆیدا بێت[1].

لێڕامانی ئەو ماوە مێژوویە پێویستە لە دەروونی لێکۆڵەردا سروشتێکی وا دروست بکاتو ئاماژەنمای وا بەجێ بێڵێت کە ئیسلام دینێکی واقیعییەو قابیلی جێبەجێ کردنە، لە جیهانی وافیعدا بە هەموو نمونە باڵاکانییەوە، ئیسلام میسالییەتێك نییە، بە حەواوە هەڵبەسترابێت لەسەر ئەرزی واقیعدا جێبەجێ نەکرێتو تەنها بۆ هیواخوازی و ئاواتبردن دابەزی بێت، بەڵکو میسالییەکی واقیعییەو لە بواری بەرجەستەکردنداییەو جێبەجێ دەکرێت، ئەگەر مرۆڤ بە گەرمو گوڕیو بە واجبی شانی بداتە بەر بە جوهدی خۆی حەقی خۆی بداتێ، پاشان سروشتێکی وا وەرگرێت ئەو چاکەیەی جارێ توانی بیکات یان ئەوەی مرۆڤێ توانی بیکات تۆش دەتوانی بیکەیت لە بەر ئەوەی مرۆڤەکان لە ئاستێکدا گشتیان مرۆڤن، هەمیشە مرۆڤ دەتوانێ هەوڵی سەرکەوتن بدات، جار لەدوای جار خۆ ئەگەر لێ ببڕێن هەڵدەکشێنو سەرکەوتنو لەنگەرگرتن بەدەست دێنن[2]، وەکو خودای گەورە دەفەرموێت: (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (النور: ٥٥).

ئەو کاروبارانەی کە هاریکاری موسڵمانان دەکات بۆ گەڕانەوەی خەلافەتی راشیدین ناسینی ئەو فاکتەرانەیە زانینی ئەو هۆکارانەیە کە ببووە لەمپەری رووخانو لابردنی بۆ

[1] كيف نكتب التاريخ الاسلامي، ص(١٠٣).

[2] المصدر نفسه (١٠٣، ٣٠٤).

ئەوەی کار بکەین بۆ فریدانی دەست بگرین بەو هۆکارانەی کە خودا کردوویەتی بە پەیژەیەك بۆ ڕێزگرتنی ئەم ئوممەتە، لەم بۆنەیەوە دەمەوێ بە دوورودرێژی هۆکارەکانی بەناهەق کوشتنی ئیمامی عوسمان شی بکەمەوە، چونکە بایەخێکی ئەوتۆی هەی، گرنگترین هۆکارەکانیش ئەمانەن:

**یەکەم: خۆشگوزەرانیو شوێنەوارەکانی لەناو کۆمەڵگادا**

پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی خۆی دی، کە چەند ناسۆرییان چەشتووەو هەمیشە دەیانناڵاند بە دەست هەژاریو ئاستەنگەکانی ژیان و بێنەواییەوە، ئەویش رایدەهێنانو دڵی دەدانەوە، پاشان هەواڵی پێدان ئەم دۆخەی ئێوەی تێدایە درێژە ناکێشێو گەنجینەکانی دونیاو، خێرو بێرەکەیتان بۆ دەکرێتەوە، ئاگاهیشی پێ دەدان، کە سەرقاڵی خۆشگوزەرانی نەبن، لە کردای چاکەو جیهاد دورتان نەخاتەوە، لەزەتو خۆشییەکانی دونیا کەمەندکێشتان نەکات بەرەو باوەشکردن بە رابواردنو مەتاعە ڕەوتەنییەکانیدا[1]، عومەری کوڕی خەتتاب لەم ئاگادارییانە باش حاڵی بوو بوو، سیاسیەتی وابوو بەربەستی دەکرد لە موسڵمانان نەکەونە لەزەمەکانی فیتنەیماڵو دارایيو باقو بریقەکانی دونیا، زۆر هەوڵی دەدا بۆ رێگرتن لە موسڵمانان کە لە وڵاتانی ئەملاولادا پرشو بڵاو نەبنەوە، ئەگەر بەرژەوەندییەکی ئەوتۆ نەهاتایەتە پێشیان رێگەی نەئەدان بڵاوە بکەن بەملاولادا، مەگەر پێویستی یەخەی بگرتایە، بەڵام هەرگیز رێگەی گەورە هاوەڵانو موهاجیرینو ئەنسارەکانی دانیشتوانی مەدینەی نەئەدا بە هیچ سەبارەتێك مۆڵەتی نەئەدان[2]، بێگومان ئەوکارەی عومەر پەسەندی کردبوو بەڵگەیە لەسەر هەستو دەرکی ئیمامی عومەرو ترسانی، لە بڵاوبوونەوەی موسڵمانان لە شارێکدا کە هەموو جۆرە خێرو خۆشگوزەرانییەکی تیا دەستەبەر بوبێتو بە هەموو رەنگێ رازابێتەوە ئەوکاتە دونیا خۆی بکێشێ بەسەر دڵیانداو قیامەتیان بۆگەن بکات[3]، پاشان سەردەمی عوسمان هاتە کایەوەو فتوحات بە خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا

---

[1] أحداث وأحاديث فتنة الهرج، ص(٥٥٩).

[2] المصدر نفسه، ص(٥٦٥).

[3] المصدر نفسه.

پەرەی سەندو ماڵو دارایی قەتارەی بەست بۆ بەیتولمال لە دەستکەوتو بەخششی خودایی‌و دەستی خەڵکی پڕبوو لە خێراتو ئەزراق[1]، ڕونو ئاشکرایە نازو نیعمەتو خێرانو داهاتی فتوحاتەکان شوێنەواری دەرکەوت لەسەر ژیانی کۆمەڵگەو مۆرکی خۆی چەسپاند هەرکاتێکیش خۆشگوزەرانیی‌و هەرزانی‌و هاوماناکانی خەڵکی سەرقاڵی دونیا کردو گیرۆدەیان دەکاتو سواری سەریان دەبێت، هەروەها دەبێتە کەرەسەی مونافەسەو کینەبازی بەتایبەت لە نێوان ئەوانەی کە ئیمامن لە دڵنیاندا رەگی دانەکوتاوەو تەقوا نەتواوەتەوە لە ناخیاندا وەکو ئەعرابە دەشتەکییەکانو کەللە رەقەکان، موسڵمانەکان وڵاتانیان رزگارکردو نەوەی ئەو گەلانەی، کە بەناز پەروەردە کرابوونو خۆشگوزەران بوونو هاتوونەتە ناو بازنەی ئیسلام و تەمەنێکی دووروردرێژیان لە باقو بریقی دونیاو تریفەکانیدا بەسەر بردووەوە ئالوالی دونیایان چەشتووەو کردوویانەتە مەبەستو هیوای خۆیانو کێ برکێیان لەسەر کردووە، عوسمان دەرکی بەم دیاریدەیە کردو ئاگایی بڵاوکردەوە، کە سەرەنجامی کاری ئەم ئوممەتە بەم زووانە دەگۆڕێو دیوادیو دەبێت، لەو نامانەدا ئاگاداری کردنەوەکە، کە ئاڕاستەی جەماوەرەی دەکرد، دەیوت: کاری ئەم ئوممەتە بەرەو تازەبابەتی‌و بیدعەکاری دەڕوات ئەگەر سێ شتتان تێدا کۆبوویەوە، خۆشگوزەرانی‌و نیعمەت زۆری، پێگەیشتنی منداڵانی کەنیزەکەکان (سبایا) خوێندنەوەی قورئان لە لایەن ئەعرابی‌و عەجەمەکانەوە[2]، لە بارەی خۆشگوزەرانی‌و نیعەمەتی زۆرییەوە حەسەنی بەسری ـ کە خۆی بە چارەسەر بینیویەتی ـ باسی بارودۆخی ئەو کۆمەڵگەو لێشاوی خێراتو کەڵەکەبوونی سامانو ناشکوری خەڵكو ئەو بارودۆخەی، کە خەڵکی سازیان دابوو دەڵێت: گەشتوم بە خزمەتی عوسمان ئەوکاتەی نەکەوتبووە ناو فیتنەوە کەم رۆژی هەیە بەسەر موسڵماناندا تێپەڕی بێتو موسڵمانان خێرو دەستکەوتیان کۆنەکردبێتو دابەش نەکردبێت، ئیمامی عوسمان پێی دەوتن ئەی گرۆی موسڵمانان وەرن بۆ خەڵاتەکانتانو بە ئارەزوی خۆتان لێی هەڵگرن بە لێشاو، پاشان پێی دەوتن وەرن بۆ ڕۆنو بۆ هەنگوین

---

[1] المصدر نفسه.

[2] تاريخ الطبري (٥/٢٤٥).

بەخشیش‌و پێداویستی بەردەوامەو هەیە، خۆراك هەڵدراوەتەوە دوژمن پەرژین کراوە کامەرانی کەوتووەتە بەردەستمان و خێرات زۆرە..

ئەو دەمە شمشێر لەسەر ئەهلی ئیسلام خرابووە کێلانەوە، لە لایەن دوژمنەوە، بەڵام خۆیان هەڵیان کێشابوو بۆ گیانی خۆیان، وەڵڵاهی خەڵکی هەتا ئەمڕۆش هەڵیان کێشاوە، سوێند بەخودا من دەزانم ئەو شمشێرە خۆشگوزەرانییە هەتا ڕۆژی قیامەت هەر لەکاردایەو هەڵکێشراوە[1]، بەڵام بالغبوونی منداڵانی موسڵمانان لە کەنیزەکەکان ئەمانە دەستیان دایە ڕابواردن‌و تورەیی‌و کارەکانیان لە هەرزەییدا وێنا دەکرد، یەکەمین خراپەیەك کە لە مەدینەدا بەدیارکەوت کاتی دونیا ڕژابوو بەسەریانداو خەڵکی گەشتبووە ئەو سەری کامەرانی ژیانی بریتی بوو لە کۆتربازی‌و نیشانە شکاندن‌و تیربازی[2]، عوسمانیش پیاوێکی تیرەی (لەبپی) کردە سەرپەرشتیاریان لە ساڵی هەشتەمی خەلافەتیدا[3] و کەوانی تیرهاویشتەکانی شکاندو ڕاوی نان‌و گومی کردن[4]، پاشان لەناو خەڵکدا ئاوی تری‌و مێوژگرتن نەشونمای کرد عوسمان پیاوێکی بەعاسایەکەوە ناردە سەریان‌و کردی بە چاودێریان بۆ ئەوەی ڕێگرییان بکات، کاتێ ئەم گوشینە بروزی کرد، ئیمامی عوسمان سکالای کرد لە لای دەوروبەرەکەی، ئەوانیش کۆبوونەوە لەسەر جەڵد لێدانی ئەوانەی کاری گوشین دەکەن، چەند کەسێکی لێ گرتن‌و جەڵدی لێدان، پاشان ئیمامی عوسمان کەسی لەوانە نەدەگرت کە شەڕێك دەکەن یان چەك دەردەخەن لەناو مەدینەدا ئیللا نەفی دەکردن، لە شاری مەدینە باوکی ئەم لاوانە کردیان بە هەراو هوریا[5] و ئیمامی عوسمان لە مەدینە هەستاو وتی: (خەڵکی لە بارەی ئەوانەوە قسەی هەڵیت‌و پەڵیتیان پێ ڕاگەیاندوم ئایا دەزانن من دەرونی خۆم جڵەوگیر کردووە بە لەقاوێ لە قاوم کردووە باشبزانن بەلابردنی جڵەوەکە دەرونم جۆش دەدرێت‌و

[1] البداية والنهاية (٧/٣٣٤).

[2] قوس البذق الذمي يرمى به.

[3] أى في السنة الشافية من خلافته.

[4] تاريخ الطبري (٥/٤١٥).

[5] المصدر نفسه (٥/٤١٥).

به قایمکردنی دائەسەکنیٚ[1] لە ئێمەوە هەتا ئێوە وەکو دووسەری گوریسەك وایە هەر کەسیٚ شوێن من بکەویٚ ئەیگەیەنمەوە ئەو کارەی کە دروستەو چاکە، هەر کەسێکیش شوێنم نەکەویٚ خۆی بە هەڵدێردا دەبات، ئایا دەزانن هەموو کەسێك لە رۆژی قیامەتدا شۆفێرێكو شاهیدێکی لەگەڵدایە شۆفێرەکە بەفەرمانی خودای گەورە لێی دەخوڕیٚو شاهیدەکەیش شایەتی کردارەکانی دەدات، هەکەسیٚ بە تەمای خودایە مزگێنی لیٚ بێت، هەر کەسێکیش چاوی لە دونیایە ئەوە زیانبارە)[2].

بەم شێوەیە عوسمان ئەو کەڵەپیاوە خودا ناسەبوو ئەو خەلیفە راشیدەبوو، کە بە واجبی خۆی هەستاو لێپێچینەوەکانیش سەرکۆنە کردنی کوڕە دەوڵەمەندەکان بوو ئەو کوڕانەی کە دەستیان دابووە جۆرە ژیانێکی بیٚ هودەیی و رەوشت سستی، ئەم لاڕیٚ بوانە خۆیان دابووە پاڵ هەرچیو پەرچیو ناحاڵییەکان هەروەها بە نیسبەت خوێندنەوەی قورئان لە لایەن عەرەبە دەشتەکییەکانو عەجەمەکانەوە بە شێوەیەکی ئاشکرا چینێك لەناو کۆمەڵگەی موسڵمانناندا دروست بوو بە دیارکەوتن، قورئانیان دەخوێندو حەزیان لە پاداشتی نەبوو، بە تەمای پاداشت نەبوون، بەڵکو حەزیان لە پێچەوانەی ئەو کارانەبوو، کە خەلیفە پێی خۆشبوو تەشخیسی دەکردن[3]، پێویستە تێبینی ئەوە بکەین ئەم گۆڕانکارییانەی کە تەرزەکەی دەرکەوت یەکەمجار لە دەورووبەری دەوڵەتی ئیسلامی بوو، پاشان دەمی کێشاو بە سکە خشە خۆی کرد بە پایتەختی وڵاتی ئیسلامدا، هەر ئەمەش بو وای کرد لە ئیمامی عوسمان لە وتارەکانیدا بیری موسڵمانان بخاتەوە کە زۆر پێویستە وریابن لەبەر خاتری دونیاو پوشو پەلاشەکانی خۆیان لەبەین نەبەن، لە یەکیٚ لە وتارەکانیدا ئەمەی وتووە: (خودای گەورە بۆیە دونیای داوە بە ئێوە بۆ ئەوەی قیامەتی پیٚ بخوازن بۆ ئەوەی نەیداوە پێتان پاڵی پێوە بدەنو لە ئامێزی بگرن دونیا تیادەچێت قیامەت هەتاییە، ئەم دونیا ونبووە فریوتان نەداتو لە دونیای هەمیشەیی مەشغوڵتان نەکات وریابن با خودای گەورە غیرەتی نەجۆشیٚ پابەندی

[1] أي من الكبع، وهو: المنع.

[2] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٦١).

[3] الوثائق السياسية في العهد والخلافة الراشدة، ص(٣٩٢).

کۆمەڵێ موسڵمانان بن‌و خۆتان مەکەن بە چەند حزبێکەوە)[1]، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (ئاڵ عمران: ١٠٣).

لە بارودۆخێکی ئاوەهادا کە خێروخۆشی هەڵڕژابێت دونیا ڕەهیلەی کردبێت بەسەر موسڵمانانداو لە دوای رزگارکردنی هەرێمەکان دەستیان بەتاڵ بووبێت‌و ئەرخەیان بن لە ماڵ‌و ژیانیان‌و هەستان دەستیانکرد بە ڕەخنەگرتن‌و توانجدان لە خەلیفە[2]، لێرەدا زانیمان خۆشگوزەرانی‌و رەفاهیەت چ ڕۆڵێکی هەبوو لە خێزەدانی فیتنەدا، دووبارە لیرەدا ئێستا باش تێدەگەین لەو وتەیەی عوسمان، کە وتی بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی رەبیعە کە لە دەروازەی شاری (باب) بوو[3]، وتی: (گەلی باب زۆر مرِ هەڵاتوون‌و ورگیان کەندووەتەوە لێیان بگرەوە، بەڵام موسڵمانان کزۆڵ مەکە، چونکە من دەترسم تووشی بەڵاو نارەحەتی ببن)[4]، دواهەمین وتاری عوسمان کە ئامۆژگاری موسڵمانانی کرد دوای ئەوەی‌دەرگای دونیا کرابوو بەڕوویاندا وتی: (ئاگاداربن دونیای لەناوچوو فریوتان نەدات‌و لە دونیای هەمیشەیی مەشغوڵتان نەکات.. خۆتان بپارێزن لە گورانە تازەبابەتەکانی ئەم سەردەمە پابەندی گرۆی موسڵمانان بن‌و دەستە دەستەو حزب حزب لەیەك دامەبڕێن)[5].

**دووەم: سروشتی ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەی لە سەردەمی ئیمامی عوسماندا هاتە کایەوە**

کۆمەڵێ گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی قوڵ روویداو بە چەشنێك بوو ئەوەندە بەهێزو گورج‌و گۆڵ بوو کە زۆربەی خەڵکی تێبییان نەدەکرد تەنانەت بەم شێوە توندوتیژە تەقییەوەو لە نیوەی دووەمی خەلافەتی عوسماندا دەرکەوت ترۆپکی هەڵقوڵانەکەی

---

[1] أحداث و احاديث فتنة الهرج، ص(٥٦٧).

[2] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٦٢/١).

[3] المقصود بالباب منطقة في جات أذربيجان تسمى الدر البند، معجم البلدان (٣٠٣/١).

[4] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٦٢/١).

[5] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٦٢/١).

گەشتە ئەوەی هەڵگەرانەوە لە ئیمامی عوسمانو شەهیدیان کرد[1]، کاتێ دەوڵەتی ئیسلامیی تەشەنەی کرد بە بۆنەی رایەڵەی بزووتنەوەی فەتح کردنەوە گۆڕانی پێکهاتەیی کۆمەڵگە هاتە ناوەوەو تاڵی تر کەوتنە نێو کۆمەڵگەی پڕخێری موسڵمانان، چونکە ئەم خەلافەتە لە ڕووی ڕوبەرو مرۆڤەوە پەرەی سەندو لەسەر پارچە زەوی ئەم خەلافەتە فراوانە چەندین رەگەزو ڕەنگو زمان کەڵچەرو نەریتو ئاکارو ئەفکارو عەقیدەو هونەری ئەدەبیو بیناسازیو ئاگادارییی تر بوونە میراتگری، لەسەر تەختایی ئەم پارچە چنراوە ڕەنگی بڕسکاو پچڕ پچڕی خوارو خێچ دەرکەوتبوو ببوە قوماشێکی ناڕێکو نەلواو وای لێهاتبوو ببووە کۆمەڵگەیەکی ناڕەگەزو پێکەوە نەشیاو لە پێکهاتەی تەنینەکەیدا بە تایبەتی لە شارە گەورەکاندا لەبەر پێگەو گرنگییان، لەم شارانەوە سوپای رزگارکردن بە ڕێ دەخرانو دەچوونو دەگەڕانەوە بە ژمارەیەکی کەمترەوە، چونکە لێیان مردبوو لێشیان کوژرابوون لە باتی ئەمانەدا یان لەمان زۆرتر خەڵکێکی زۆر لە گەنجو کوڕانی ناوچە رزگارکراوەکانەوە دەهاتن بۆ شارە گەورەکان وەکو فارسو تورکو رۆمو قیبتیو کوردو بەربەر، زۆربەی ئەوانە هاتن فارسو گاوری عەرەب غەیرەی ئەمانە بوو[2]، وەکو جولەکەکان، زۆربەی دانیشتوانی ئەم شارە گەورانە ئەوانەبوون کە بەشدارییان کرد لە بزووتنەوەی فتوحاتی ئیسلامیدا، پاشان لەم شارانەدا نیشتەجێ بوون، زۆربەی زۆری ئەم کەسانەش لە تیرە عەرەبییەکان بوون لە باکوورو باشوورەوە ئەمانە لە دابو نەریتی هاوەڵانیان نەدەزانی بەواتایەکیوردتر، ئەمانە لە سەردەستی پێغەمبەر ﷺو جیلی یەکەمی هاوەڵان پەروەردەی پێویستیان وەرنەگرتبوو، باش گۆش نەدرابوون بە هۆی سەرقاڵییان بە فتوحاتەوە یان بە هۆی کەمبوونەوەی هاوەڵانەوە، بۆیە گۆڕانکاریی لە چنراوی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئەو کۆمەڵگەیەدا هاتە کایەوە، کە لە جیلی یەکەم پێشینانو دانیشتوانی وڵاتە رزگارکراوەکانو ئەعرابەکانو گاورو جوولەکەکانەوە پێکهاتبوون عەرەبە دەشتەکییەکان بەر لە گشتی هەڵگەڕانەوەو لە ڕووی چنراوی سەقافی ئەو کۆمەڵگەیەوە

---

[1] الدولة الأموية المفترى عليها، ص(١٦٦).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٧٩).

گۆڕانکاری تیّ کەوتو لە بواری ڕاخستنی ژیانو بژێوی کۆمەڵگەوە لە ڕووی دەرکەوتنی جۆرێکی تازە لە لادان و لە قبولّ کردنیپڕوپاڵانتەوە گۆڕانکاری ڕوویدا[1].

١- ئەو گۆڕانانەی کەوتە چنراوی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئەو سەردەمە

أ - ئەم چنراوە کۆمەلایەتییە لە کۆمەڵیّ کەرتی جیا جیا پێکهاتبوو، کەرتی پێشینان، کە لە هاوەڵانو ئەو کەسانە پێکهاتبوو کە چاودێری هاوەڵان بوویبوو بە خەلاتیانو شەرەفی ئەوانیان بەرکەوتبوو، بەڵام ئەم کەرتە وردە وردە کەمیان کردو وشکاویان هات، بە هۆی مردنو شەهیدبوونەوە لە گۆڕەپانی فتوحاتەکاندا، یان بە هۆی پرشو بڵاوبوونیان لە شارەکاندا ئەمانە وای کردبوو کەمێکیان مابوونەوەو نیشتەجێبوون لە شارە رزگارکراوەکانداو لە شارە گەورەکانی وەکو بەسرەو کوفەو شامو میسرو ئەمانەدا بڵاوەیان کردبوو، هەندێکیشیان لە نیوەدورگەی عەرەبیدا دەرچوبوون، پاشان جارێکی تر گەڕانەوە ناوی[2].

ب - دانیشتوانی ناوچە ڕزگارکراوەکان ئەمانە زۆرینەی ئەو کۆمەڵگەیانە پێکدەهێنا لە چاو ئەوانەی کە پێشتر موسڵمانان بووبوون، ئەمەش بە هۆی بزووتنەوەی فەتح کردنەوە، کۆمەڵگەی ئیسلامیی پێشینەکانی بوو بە کەمایەتی هەرچەندە ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لەبەڕێوەبردنی وڵاتداو کاریگەری ئاکارو ڕەوشتو هزرو زمانەویان هەبوو لەگەڵ ئەم تەئسیراتانەدا بە کەمینە گوزارشت دەکران، ئەم کەرتە واتە کەرتی دانیشتوانی ناوچە رزگارکراوەکان، لە نیشتەجێبووندا کەمتەرخەم بوون، گەڕۆك بوون، بەتایبەت لە دەڤەری خۆیاندا ئۆقرەیان نەدەگرت، سەرەڕای ئەمەش هەندێکیان لە شارەکانی خەلافەتی ئیسلامی، ئازو گوێزیان دەکردو هەندێکی تریان لە شارە گەورەکانی خەلافەت یان لە پایتەختی دەوڵەت نیشتەجیّ دەبوون، بە شێوەی کەنیزەو کۆیلە لە خزمەتی میرەکانیاندا بوون یان بە شێوەی ئالووێری بازرگانیو مەعاریفیو ئیداریی‌و هیچ یاسایەکیش نەبوو ڕێگرییان بکات، لەم ئەمسەرو سەرە، ئەگەر هاندەران کۆمەك نەکرابن ئەو عەجەمانەی کە لە شارە رزگارکراوەکانەوە هاتبوون خێراترین کەس

---

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨٠).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨٠).

بوون بۆ فیتنەنانەوە[1]، چونکە زۆرینەی عەجەمەکان لەگەڵ داخ لە دڵەکان میللەتە داخ لەدڵەکان بوو،، جا ئەمانە زۆر گورج بوون بۆ فیتنە هەڵگیرساندن لەسەر زۆر هۆکارێك، وەکو:

- نەفامییەتیان، زۆربەیان تازە بەتازە لە کافریەتی وازیان هێنابوو، ئەو موڵكو دەسەڵاتدارییەی کە هەیانبوو ئەو عیزەتەی هەیانبوو لێیان سەنرابووەو رفێنرابوو لەبەردەستیان.

- زۆربەکەمی شارەزاییان هەبوو لە دیندا بە هۆی عەجەمیەتیو شتی ترەوە.

- دەمارگیریو ڕقبوونەوە لە عەرەب.

- چەندین تاقمیان هەبوو بەبەهانە هاتبوونە ناو ئیسلام لە ترسی شمشێرو سەرانەدان، لەناوەڕۆکیاندا تەڵەکەو شەڕیان هەڵگرتبوو بەرامبەر ئیسلامو موسڵمانان سا بۆیە زۆر بەخێرایی خۆیان دەکوتا بۆ هەموو فیتنەیەك.

- تەماحی هەوەسبازەکان لەم جۆرە کەسانەدا، چونکە ئەم گرێیانەیان تێدابوو، دنەی دەدانو رێگەیان بۆ خۆشدەکردن[2].

ج - کەرتی سێیەم عەرەبە دەشتەکییەکان بوو، ئەمانە بە دانیشتوانی بیابانەکان ناسراو بوون، ئەمانەش وەکو باقی مەنەی خەڵك وابوون، موسڵمانانی خودا ناسییان تێدابوو وە کافرو مونافیقیشیان تێدابوو، ئەو دەردەیان هەبوو، وەکو خودای گەورە دەفەرموێت: (الأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْراً وَنِفَاقاً وَأَجْدَرُ أَلاَّ يَعْلَمُواْ حُدُودَ مَا أَنزَلَ اللّهُ عَلَى رَسُولِهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (التوبه: ٩٧). ئەمەش لەبەر ئەوەیە رەقترین دڵو گرژترین سروشتو وشکترین قسەیان هەبوو، لەبەر ئەم رەوشتانە شایەنی ئەوەبوون، کە سنوورەکانی قورئان نەزانن و لە کەوشەنی شەرعو ئەحکامو جیهاد دەربچن[3]، ئەمانە بە پلترین کەسبوون لە فیتنەبازیدا، گورجوگۆڵییەکەشیان لەبەر ئەم هۆیانە:

- زۆربەکەمی شارزای دین بوون.

---

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨٠).

[2] دراسات في الأهواء والفرق وابدع، ناصر العقل، ص(١٦١).

[3] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨٠)، نقلا عن الشوكاني فتح القدير (٢/٣٩٥ - ٣٩٧).

- هەریەکێ لەوان زۆر لە خۆی بایی دەبوو ئەگەر چەردەیەك قورئانی بزانیبا، ئیتر وای دەزانی بەو زانستە کەمە بووەتە زانا.

- وشکبوون بەرامبەر زانایانو نەدەچوونە خزمەتیانو دیداریان، چاویان لێ نەدەکردن.

- خەڵکی چاوچنۆك فریبی دەدانو نەفامیەتیو گێلیەتێکەی دەڕەتاند.

- تیژی سروشتو هەڵهاتنیان لە شارستانییەتو تێکەڵاوی خەڵك، گومانی خراپ بردن بە خەڵکی بەبێ ئەوەی بیانناسن ئەمە سروشتی هەموو دەشتەکییەکە لە هەموو سەردەمو شوێنێکدا.

- لە دینداریدا زۆر توندویژتربوونو بەبێ زانستی پێویست زیادەڕەوییان دەکرد بۆیە زۆربەی خەواریج لەمانەیە[1].

لەناو ئەم ئەعرابیانەدا پیاوانێك بەدیارکەوتن بە قورئانخوێن ناسرابوون، بەڵام لە سنووری قورئانخوێن دەرچووبوونو مانای قورئانخوێنی جارانی نەئەداو لە چەمکی وشەکە دەرچوبوون ئەو قورئانخوێنانە ئاماژەیەك بوو ئەو کەسانەی تایبەتبوون بە قورئان خوێندنەوە، کە لە توێی ئەو واقیعەدا بەڵگەو چەمکی رقیان دەردەهێنا، هەیانبوو لەسەر رێبازی خەواریج بوو بە رێگەیەکی تایبەت بە خۆیان قورئانیان لێکدەدایەوە هەشیانبوو زاهیدبوو حەقیقەتی ئەو قورئانە تێنەئەگەشت کە دەیخوێندەوەو نەیدەتوانی بساچێ لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگەدا[2]، ئەم قورئانخوێنە ناحاڵیانە زۆر بە پلبوون بۆ فیتنەنانەوە، ئەمەش لەبەر ئەم هۆکارانە:

- زۆرتوندوتیژبوون لە نەزعەی دینداریدا سەرەڕای ئەوەی کەم تێگەشتبوون لە دینو زوو غیرەتیان بۆ دین دەجۆشا بەبێ چاورۆشنیو زانیاریو ئارەزوو عاتیفە خێزەی دەدان بە ناوی غیرەتنواندن بۆ دین بەبێ ئەوەی سەیری ئەنجامەکەی بکەن، لە رێساکانی شەرع تێ نەگەیشتبوون وەکو لادانی زیانو بەدەستهێنانی سوودو بەرژەوەندیی ئاین.

- لە خۆباییبوونی هەریەکەیان بەو چەند ئایەتو فەرمودانەی کە دەیانزانی بەبێ فیقهو چاورۆشنی وا دەهات بە خەیاڵیاندا کە ئەهلی زانستن، بە کەیفی خۆیان گرییان

---

[1] دراسات في الاهواء والفرق والبدع، ص(١٦١).

[2] درالات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨١).

دەکردەوە گرێیان دەبەست لە بەرژەوەندییەکانی موسڵماناندا فتوایان دەداو فتوایان هەڵدەوەشاندەوە، لە بەرژەوەندیی خەڵکی موسڵماندا.

- بە نیسبەت زانایانو پێشەوایانەوە وا تێدەگەیشتن گەشتوونەتە پلەی بێباکی لە زانستو فیقهی زانایان لە ژێر دروشمی ئێمە پیاوینو ئەوانیش پیاون.

- هەندێ سەرۆکی نەزانییان کردبووە موفتی خۆیانو دوریان گرتبوو لە زانایانو پێشەوایان.

- - ئەمانە خەڵکی هەوەسبازبوو سەرانی بیدعەو فیتنەبوون زۆربەی زۆریان لە تەڵەکەباز بوون، بە هەڵەداوان دەچوون بۆ لای قورئانخوێنەکان سەریانلێ دەشێواندو سەرگەرمیان دەکردنو نەزعەدینداریيەکەیان دەقۆستەوە تێیاندا و غیرەتیان دەوروژاندن بەبێ چاوڕۆشنی.

- نەفامبوون بە ڕیساکانیو بنەماکانی بەڵکەو ئەحکامەکانی فیتنەبازی[1].

د - کەرتێ هەبوو یاخود تاقمێ هەبوو لە چنراوی ئەو کۆمەڵگە ئیسلامییەدا کە پێش هەمووان لەدین هەڵگەرابوونەوە، ئەمانە لە ئیسلامدا ژیانێکی کەمیان بەسەر بردبوو، بەڵام ناچاربوون لایەنگری بکەن ئێمە نکولی ئەوە ناکەین کە هەیانبووە سوڵحاوبووەو دەروونی خاوێن بووە، کەسانێکی بەڕێزیان هەبووە، بەڵام هەیانبووە تامو چێژی ئیسلامی نەچەشتبوو هەرچەندە خۆی دابووە پاڵ ئیسلام، بەڵام هەر بە عەقڵیەتەکەی جارانییەوە دەژیاو لەسەر نەفسییەتی خۆی بوو، کە بەر لە ئیسلام لەسەری دەڕۆشت لەسەر دارو باینگە خێڵەکایەتییەکەی بوو، کە دەمارگیری گێژی دەدا، وایان دەزانی ئیسلام نەچووەتە ناویان یاخود وایان دەزانی هیچ دژایەتییەك نییە لە نێوان ئەو زانیاریانەی ئەوان دەیزانن و زانیاری ئیسلامداو ئەو هەڵسوکەوتەی دەیانکرد لە واقیعدا بە پاڵنەرە خێڵەکییەکان دەیان کرد[2]، چەند تاقمێك لە هەڵگەڕاوەکان ڕەگەزێکی پتەویان پێکهێنابوو لە بەرپاکردنی هەلومەرجی فیتنەدا، هەڵگەڕانەوەکان لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەردا ڕوویدابوو، بەڵام شتێکی تازە هاتە کایەوە ئەویش جیاوازی سیاسەتی ئیمامی عوسمان بوو لە سیاسەتی دوو خەلیفەکەی

---

[1] دراسات في الاهواء والفرق والبدع، ص(١٦٣).

٢ دراسات في عهد النبو والخلافة الراشدة، ص(٣٨١).

پێش خۆی بەرامبەر هەڵگەڕاوەکان، ئەبوبەکر نوسراوێکی نووسی بۆ کارگێڕەکانی: کە پشت نەبەستن بە هەڵگەڕاوەکان لەجیهاددا، لە شەڕی دوژمناندا جەختی دەکردەوە لە خالیدی کوڕی وەلیدو عەیاضي کوڕی غەنم، کە نابێت کەسێ لە هەڵگەڕاوەکان غەزایان لەگەڵدا بکات هەتا خۆی ئەستۆ پاکی بۆ نەکات[1]، لە سەردەمی خۆیدا هەڵگەڕاوەی نەدەکرد بە شاهید ئیمامی شەعبی دەڵێ: ئەبوبەکر لە غەزاکانیدا پشتی بە هیچ کەسێکی ئەهلی هەڵگەڕاوەکان نەبەستووە هەتا کۆچی دوایی کردووە[2]، لەبەر ئەوە هەندێك لە هەڵگەڕاوەکان دوای ئەوەی بە چاکی موسڵمان بوونەوە هەر شەرمیان دەکرد دیمانەی ئەبوبەکری صدیق بکەن، بۆ نموونە تولەیحەی کوڕی خووەلد هاتە مەککە بۆ عەمرە کردن، بەڵام نەیتوانی ڕووبەڕی ئەبوبەکر بێتەوە لە نزیکەوە ببنێ هەتا کۆچی دوایی کرد[3].

لە خەلافەتی عومەردا ئەم سیاسەتە کزی کرد بەرامبەر هەڵگەڕاوەکان، ئەهلی هەڵگەڕاوەکانی ڕەوانە کرد بۆلێدانی شام‌و عێراق[4] لە ڕۆشتنی سوپای ئەبی وەقاصدا لە شەڕی قادسیەدا قەیسی کوڕی مەکسوحی موراديو عەمری کوڕی مەعدییە کروبی تێدابوو، حەماسەتی خەڵکیان هەڵدەگیرساندو هەستیانی دەبزواند ئەمە دوای ئەوەی، کە ئیمامی عومەر مۆڵەتی دا بە ئەهلی هەڵگەڕاوە، کە بەشداریی غەزا بکەن[5]، ئەم دەرچوونە لە سیاسەتی ئەبوبەکر لای عومەر وێڕای جۆرە حەزەرو ئاگاهیو لە بێژەنگدانێك بوو لە بنەماو مەرجە بەندکراوەکان دەرنەئەچوو، لە ڕێسا هەژمارکراوەکان بەدەر نەبوو، ئەهلی هەڵگەڕاوەکان نەدەبوونە سەرلەشکری سەد سەرباز، لەبەر ئەوە سەعد ناچاربوو قەیسی کوڕی مەکشوح بکاتە ئامری حەفتا سەربازو بۆ شاڵاوی عەجەمەکان هەتا لە شەوێکی ئەموستەچاودا لە وێزە دەریان بهێنێت[6].

---

[1] عبدالله بن سبأ وأثره في أحداث الفتنة، ص(١٥٥).

[2] البداية والنهاية (٣٤٧/٦).

[3] التاريخ الاسلامي (٥٩/٩).

[4] عبدالله بن سبأ وأثره في أحداث الفتنة، ص(١٥٦).

[5] عبدالله بن سبأ وأثر في احداث الفتنة، ص(١٥٦).

[6] تاريخ الطبري (٣٨٢/٤).

پاشان عوسمان هات له سیاسەتی هەڵگەڕاوەکان پێی وابوو کارگێڕی ئەو زەکاتەی، کە هەڵگەڕانەوەی تیادا بەرپابوو ڕۆیشتووەو بەسەرچووە، چونکە پێی وابوو ئەم سەردەمە قوتاربوون لەوانەی هەڵگەڕاونەتەوەو خلتەیان نەماوە، عوسمان ئیجتیهادی کرد ئەهلی هەڵگەڕاوەی کردە کاربەدەستو کاری پێ سپێرانو بە چاکبوو سەیری دەکردن، بەڵام شیاوی ئەوە نەبوون، بەڵکو خراپیو نالەبارییان زیادی کردوو ئەو وتەیان پەیڕەوی کرد کە کابرا گوتەنی

منو عومەر سەگەکانی خۆمان تێر کردو
ئەو سەگانەش بەکەڵبەو چنگول زاماریان کردوە[1].

دەرئەنجامی بەکارهێنانی هەڵگەڕاوەکان لە لایەن عوسمانەوە لە کوفە لەبەر ئەوەبوو، کە خەڵکەکەی گۆڕاو بەرەو چاکسازیی هەنگاوی ناو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ڕەبیعەبوو بەسەرلەشکریان، کە لە غەزای تورکەکاندا پێکرا، ئەو عەبدوڕڕەحمانەی کە لە سەردەمی عورمەدا غەزای دەکردو پەرتەوازەی دەکردن، تەنانەت تورکەکان دەیان وت: (هەرکاتێ ئەو پیاوە واتە (عەبدوڕڕەحمان) هاتبێتە پەلارمار فریشتەیەکی لەگەڵدا بووە، نەیهێشتووە بمرێو بەرگری لێکردووە)[2].

کۆمەڵێ ئاسار بە شێوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوت لەو فیتنەیەی کە بە کوشتنی ئیمامی عوسمان کۆتایی هات، هەر بۆیە ناوی ئەو تاوانبارانەی دەستیان هەبوو لە خوێنی عوسماندا ئەو پیاوانەبوون، کە سەر بەو خێڵانەبوون کە لە تیراژی هەڵگەڕاوەکاندا بوو، بۆ نموونە (سودانی کوڕی حەمرانی سکونیو قەتیرەی کوڕی فلانی سکونیو حەکیمی کوڕی جەبلەی عەبدی)یە[3].

هـ - گاورو جولەکەکان بڕێکی زۆریان دەرکران لەجەزیرەی عەرەبی لە شارە گەورەکاندا نیشتەجێبوون وەکو کوفەو بەسرە، بە تایبەتی جولەکەکان بە پێی سروشتی خۆیان لە هەموو شارە پانو بەرینەکاندا بڵاوەیان کردبوو، بە پێی فتوحاتەکانو خەریکی

---

[1] عبدالله بن سبأ وأثر في احداث الفتنة، ص(١٥٧).
[2] تاريخ الطبري (١٤٦/٥).
[3] عبدالله بن سبأ وأثر في أحداث الفتنة، ص(١٥٧).

پیشە زڕاوە دووپەژمەکەی خۆیان بوونو سەرقاڵی کەسابەتی دوڕوویی، خۆیان بوون، ئەویش زاڵبوون بەسەر داراییدا بە هەموو کەرەسە جیاوازەکانو موئامەرەکردن بۆ بڕینی ئەو دەستەی کە دەستی درێژکردووە بۆ یارمەتی موسڵمانان[1]، لەمەولا باسی ڕۆڵی جولەکە دەکەین بە ئیزنی خودا.

٢ـ پێکهاتەی دارِشتنی ئەو کۆمەڵگە لە رووی شارستانییەوە.

لە پاڵ ئەو ئاڵسکاوە مرۆڤیەدا ئاڵسکاوییەکی تری هەبوو، کە مەترسی لەم کەمتر نەبوو، ئەویش ئالسکاویو تێکچڕژاوی بوو، بە شێوەیەك بوو چەندەها کەڵچەرو ئەفکارو نیزامو بیروباوەڕی جیاواز لەگەڵ ژمارەی مرۆڤەکاندا هەڵدەقولاو سەری دەردەهێنا، واتە لەگەڵ ژمارەی دانیشتواندا ژمارەی کەڵچەرو هزرەکانیش زیادی کرد، ئەمەش بووە بارێکی زەبەلاح بەسەر شانی کۆمەڵگەی ئیسلامییەوە، ئەوەی زیاتر قوڕەکەی خەست کردەوە سەرەڕای ئەوەی موسڵمانان تێکەڵاوی پێکهاتەو دارِژاوی کۆمەڵگەی شارەزا رزگارکراوەکان بوون، بەم شێوەیە لەناو جەرگەی میللەتانی تردا ژیانو ژنو ژنخوازییان لەگەڵ کردنو فێری زمانیان بوونو جلوبەرگی ئەوانیان کردە بەرو دابو نەریتی ئەوانیان پەیڕەوی دەکرد وێڕای ئەم تێك ئاڵانە لە بەرامبەردا کاریگەرییان لەسەر هاوولاتیانی شارە رزگارکراوەکان سنووردار بوو لەو ماوە نوویەرەیەداو لەو بەرەبەیانەدا[2]، هاوولاتیانی ئەو شارە رزگارکراوانە پشکێکی فرەیان لە پەروەردەی ئیسلامەتی وەرنەگرتبوو بە باشی لە کرۆکەکەی تێ نەگەیشتبوونو لە کیانی ئیسلام پاراو نەبوونەوە، وەکو هاوەڵانی کۆچەریو ئەنساری تینویان نەشکابوو، هەروەها ئەو خێڵە عەرەبانەی کە تێکەڵاوی خەڵکی شارو وڵاتە رزگارکراوەکان بوون، ئیسلام لەنگەری گرت لە ناوەندی ئەم خێڵە جیاوازانەدا، لە بۆتەیەکدا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئەوەی زۆر پێویستە بیخەینە بەر باسو تێڕامان ئەوەیە کە پرۆسەی فێرکردنو پەروەردەکردن، کە بنچینەیەکی قایمو پتەوە کۆچەرەییەکانو ئەنسارەکان رابەرایەتییان دەکرد توانای نەبوو فامی ئەم پۆل پۆلە گەورانەی نەدەکردو نەیدەتوانی هەموویان لە

---

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨١).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨١).

ئامێز بگرێت، مەوالییەکانیش کۆیلەکان لە ئەفکارو دابو نەریتی جارانی خۆیان دەرنەچوبوون، کە سەردەمی نەفامی لەسەری بوون، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ناهاوسەنگی لە نێوان بزووتنەوەی فراوانی ئاسۆیی رزگارکردنی وڵاتان فراوانبوونی سەرنشینیداو لە ژمارەی هاووڵاتیاندا لە فێرکرددنی خەڵك‌و تێگەیاندنیان لە کیتابی خوداو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بزووتنەوەی جیهاد دەبوو داعی‌و مامۆستای لەگەڵدا بووایەو هامڕای بوایە، بۆ ئەوەی خەڵکی تێگەیەنن لە شەرع‌و دین هەتا ترازوی پەروەردە لارەسەنگ نەبێت‌و ژاوەژاو نەکەوێتە ریزی ئیسلامییەکانەوەو درز نەکەوێتە نێوان رزگارکەرەکان‌و دانیشتوانی زەوییە رزگارکراوەکانەوە ببێتە هۆکاری بەرپابوونی دیاردە سلبییەکان‌و کار بکاتە ریزی هەڵپێکراوی موسڵمانان‌و یەکێتیی سیاسیی‌و فیکرییان[1]، ئەگەر لە مەیدانی زانست‌و پەروەردەی ئیسلامیدا گەرم‌و گوڕی‌و ماندو هەبێت ئەم لایەنە سلبییە کاریگەری نابێت هەرچەندە پەرەسەندن لە زەویدا خێراو فراوان بێت، عێراق‌و دەوروبەری و وڵاتانی شام لە چەند ساڵێکی کەمدا رزگار کران‌و لە توانای وزەی مرۆڤایەتیدا نەبوو لە مەیدانی زانست‌و پەروەردەکردندا ئیستیعابی ئەو ماوە زۆرە لێشاوە بکات‌و تەعلیمیان بدات، لە دانیشتوانی ئەو ناوچانە[2]، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە ئەو هاووڵاتیانەی کە پێویست بوو هەستن بە ئەم راسپاردەیە خەڵکی فێری زانست بکەن‌و پەروەردەی بکەن‌و زۆربەی زۆریان لە گۆڕەپانی جیهاددا شەهید کرابوون‌و چەند کەسێکی کەمیان لێ مابووەوە پرش‌و بڵاو بووبوون‌و ئەو موسڵمانانەی ئارەزوویان دەکرد فێری زانست بن لە دەوریان کۆبوونەوەو پاشان چینی تابیعین دەرکەوت، ئەمانەش ئەوەندە ملکەچ بوون هەر لە سەرتاوە لە گۆڕەپانی جیهاددا شەهید کران[3]، ئەو سەردەمە پێشەواو هاوەڵی پێویستی زەمان نەمابوو هەتا تەعالیمی ئیسلامیی بچێنێ لە ناخی زۆربەی خەڵکەکەدا وێڕای ئەو کەلێنانەی دەرکەوتبوو وەکو کەلێنی هزری دیاردەی سلبی کە دزەی کردبووە ناو ڕێبازی ئیسلام ئەمانە شوێنەواریان هەبوو لە

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٥٨/١).

[2] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٣٥٨/١).

[3] اليمن في صدر الاسلام للشجاع، ص(٣٣٤).

ناجێگرکردنی ئاسایشی وڵاتداو لە ساڵانی دوا دوایی خەلافەتی ئیمامی عوسماندا بە ئاڵەمی ئاشکرا دەرکەوت[1].

٣ـ تێگەیشتنی نەوەیەکی تازە

لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا گۆڕانێکی گەورە روویدا، چونکە جیلێکی تازە لە خەڵك پێگەیشتنو هەریەکەیان پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ خۆی دەستبەر کرد، وەکو جیلی هاوەڵان نەبوون جیلێك بوون لە سەردەمێکدا دەژیان جیاوازبوو لە وەسفەکانی هاوەڵان ئەم جیلە بە گشتیی بەوە دەخەملێنرێت لە خوار جیلی یەکەمەوەن[2] و شەکەتی دروستکردنی دیواری دەوڵەتو راگیرکردنیان لەسەر شان نەبوو، خۆیان نەدابووە ژێر باری گران، جیلی یەکەمی موسڵمانان بە هێزی ئیمانو تێگەیشتنی دروست لە ناوەڕۆکی عەقیدەی ئیسلامو ئامادەباشی تەواو بۆ ملکەچکردنی نەفس بۆ دەستووری ئیسلام، کە لە قورئانو سوننەت بەرجەستە کراوە دەناسراو جیا دەکرایەوە، ئەم شەقڵە تایبەتانە زۆر بە دەگمەن لە جیلی تازەپێگەیشتوودا هەستی پێ دەکرا، کە لە ئەنجامی فتوحاتی فراوان پێگەشتبوون، ئەمانە تەماعی تاکرەوییان تیا دەرکەوتبوو، دەمارگیری رەگەزو هۆزایەتییان تیا زیندوو بوەوە، هەندێکیشیان خڵتەیەکی زۆر لە خڵتەو نیشتووەکانی سەردەمی نەفامیەتیان تیا بووە، وەکو هاوەڵان لە عەقیدەی دروستی ئیسلامەتی بەهرەمەند نەبووبوون، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ لەبەر زۆرییان لەبەر سەرقاڵی هاوەڵان بە جەنگی رزگارکردنو فتوحاتی تازەوە[3]، هاوەڵان کەمترین نارەحەتیو ئاژاوەیان هەبووە لەوانەی دوای ئەوان هاتوون، چونکە هەتا دوورترین لەسەر دەمی پێغەمبەرایەتی ﷺ زۆرترین ئاژاوەو دووبەرەکی دەکەین[4]، جیلی تازەپێگەشتوو رازی نابێت بەرو بارودۆخەی کە جیلی پێشووی خۆی پێ ناسراوە خو دەگرن بەو شتانەی کە ئەوان وازیان لێ هێناوە، وای لێدێت بە ئاوەزێکی تازەو

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٥٩).

[2] الدولة الأموية، يوسف العش، ص(١٣٢).

[3] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٥٦).

[4] ذوالنورين عثمان بن عفان، مال الله، ص(٩٩).

بۆچونێکی تازەوە ژیان لێکبدەنەوە، لێکدانەوەکەش دوورە لەو عەقلیەتەی کە لەسەردەمی خەلیفە راشیدینەکاندا کاری پێ کراوە، وای لێدێت لەو ئەقلیەتە تێ ناگات‌و ناتوانی قومی لێبدات‌و هەوڵ نادات گوێ بگرێ بۆ داناییەکانی[1] هەر لەبەر ئەمەیە لادەرەکان خۆیان دەخزێنە پاڵ جیلی تازە بۆ گاڵدانی فیتنەو ئاژاوە.

٤ـ ئامادەباشی ئەو کۆمەڵگەیە بۆ قبولکردنی پڕوپاگەندە بەم چەشنە لە ئەنجامی ئاڵسکاوی‌و تێکەڵاوی نەگونجاو ناڕێکی لە داڕشتنی کۆمەڵگەدا دەرك بەم حاڵەتە دەکەین‌و دەبێت ساز دەدرێت بۆ لەرەلەرو ئامادەبێ بۆ گێرمەو کێشەی گوێی هەڵدەخات بۆ وەرگرتنی قسەوباس‌و قسەلۆك‌و پڕوپاگەندە[2] و هاشەو هوشە وەکو ئیبن‌و تەیمیە بە جوانی گوزارشتی ئەو کۆمەڵگەیە دەکات‌و دەڵێ: (بۆیە خەڵکی لە سەردەمی ئەبوبەکرو عومەر هەردوکیان فەرمان کرابوو بە موسڵمانان شوێن پێی ئەوان هەڵبگرن، وەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمووبووی بکەونە شوێن هەنگاوی ئەو دوانەی کە دوای من دێن، ئەبوبەکرو عومەر، نزیکترین سەردەم بوو لە دابەزینی پەیام‌و ئیمان‌و چاکەخوازی زۆر مەزن بووەو لایان لەسەر رێوشوێنی پێغەمبەر ﷺ بەجێیان هێناوەو زۆر چەسپاوبووە لە دڵنیاییدا هەرگیز نەدەکەوتنە فیتنەوە بە تایبەت لە حوکمی دادپەروەرانەدا، بەڵام کاتێ کەوتنە دوادوای خەلافەتی ئیمامی عوسمان‌و خەلافەتی عەلی دەروونی خاوێن نەما، چونکە بەشی سێیەم زۆر بوو، کە خەڵکی دەروون سەرزەنشتکەرە (نفس اللوامە)، ئەمانەش کاری چاك‌و کاری خراپیان هەڵدەشێوا پێکەوە ئارەزووبارزی‌و دڕدۆنگی لەگەڵ ئیمان‌و دیندا ئاوێتە بوو، ئەم دەردە گەشتە هەندێ والی‌و هەندێ شوان‌و چاوساغ، پاشان ئەم بەشە تەشەنەی کردو ئەوانەی چاك‌و خراپیان تێکەڵاو دەکرد، لە دواییدا ئەو فیتنەیە سەری هەڵدا کە بووە هۆی ئەو پیشهاتەی کە روویدا کە گوێڕایەڵی‌و تەقواکەیان بژاردە دەکرد و تێکەڵاوی جۆرە هەوەسێکیان کردبوو لەهەردوولاوە خەڵکیان تاوانبار دەکرد هەریەکەشیان پاساوی بۆ خۆی دەهێنایەوە، بەوپێودانگەی فەرمانی بە چاکە دەکردو رێگریی لە خراپە دەکرد، بەس ئەو لەگەڵ حەق‌و دادوەریدایە لەگەڵ ئەم راڤەکردنەدا

---

[1] الدولة الأموية، يوسف العش، ص(١٣٣).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٨٢).

جۆرە ئارەزوویەكو جۆرە گومانێكی تێدابوو، چونكە بۆ هەوەسی دەروونی خۆیان پاكانەیان دەكرد، هەرچەند بەرەیەكیان ڕاست تر بوایە لە بەرەكەی تر[1]، ئەم واقیعە زۆر بەجوانی لەو گفتوگۆیەدا روون دەبێتەوە كە لە نێوان ئەمیری ئیمانداران عەلی كوڕی ئەبی تالیبو یەكێ لە شوێنكەوتەكانیدا روویدا پیاوەكە وتی: ئەوە چییە موسڵمانان لەسەردەمی تۆدا دووبەرەكیو ناكۆكییان تێكەوتووە، لە سەردەمی ئەبوبەكرو عومەردا نەیان دەكرد؟ عەلیش وتی: لەبەر ئەوەی ئەبوبەكرو عومەر خەلیفەی پیاوی وەكو من بوون منیش ئەمڕۆ خەلیفەی پیاوی وەكو تۆم[2]، ئەمیری ئیمانداران عوسمان دركی كردبوو، كەچی دەسوڕێتەوە لە ناوەندی كۆمەڵگەكە بۆیە لەنامەكەیدا نووسی بۆ والییەكان وتبووی: (پاش سوپاسی خودای گەورە بەڕاستی میللەت گەزراوە بە بڵاوەكردنو پاشان روویكردۆتە شەڕو خراپەو سێ شتیش راپێچی كردووە دونیای كاریگەر هەوەسی تاین بوو ئارەزووی گورج، داخو مەراقی هەڵگیراو خەریكەو زۆرنزیكە ئەمانە هەڵبێنو وێرانی بەرپا بێت)[3].

**سێیەم: هاتنی ئیمامی عوسمان لە دوای ئیمامی عومەر**

هاتنی عوسمان راستەوخۆ دوای عومەرو جیاوازیی نێوان سروشتیان ئەمە وای كرد شێوازی هەڵسوكەوتیان جیاواز بێت، لەگەڵ گەلداو بە ڕێگەی تایبەتی خۆیان مامەڵە لەگەڵ خەڵدا بكەن، سەیرەكەین عومەر بە هێزێكی پتەوو تۆكمە كاری دەكرد، بە توندی موحاسەبەی نەفسی خۆی دەكرد، هی ژێر دەستەكانیشی، واتە گەلەكەی، بە هەمان شێوە دەكرد، بەڵام ئیمامی عوسمان سروشتی نەرمو تەبیعەتی ناسك بوو لە ئاكاریدا ئەو سەرزەنشتەی نەدەكرد لە دەروونی خۆیو لە كەسانی بەردەستی، كە ئیمامی عومەر دەیكردو ئەرتەوی لێدەگرتن، تەنانەت عوسمان دەیوت بە نەفسی خۆی ڕەحمەتی خودا لە عومەر كێ ئەوەی پێ دەكرێ، كە ئیمامی عومەر كردی[4]، خەڵكی لە شوتی یەكەمی

---

[1] مجموعة فتاوى ابن التيمية (٢٨/١٤٨ ـ ١٤٩).

[2] مقدمة ابن خلدون، ص(١٨٩).

[3] الشهيد والبيان، ص(٦٤).

[4] تاريخ الطبري (٥/٤١٨).

خەلافەتی ئیمامی عوسماندا بۆیە حەزیان دکردو خۆشحاڵبوون لەبەر ئەوەبوو عوسمان نەرم بوو لەگەڵیانو پێشتر عومەر توندبوو بەرامبەریان، هەتا خۆشەویستی ئیمامی عوسمان بۆ خەڵکی ببووە پەندو نموونە.

لە دوییدا ڕەخنەیان لێدەگرتو لێی راست دەبوونەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەرمو نیانیو لوتفو سروشتی ناسکیو رەوشتی هێدییو دڵ ناسکیو هێوری ئیمامی عوسمان لە هەندێ ئەسەردا رووی جیاوازی سەردەمی ئیمامی عوسمانو سەردەمی ئیمامی عومەری پێشخۆی دەرکی بەو جیاوازییە کردووە، کاتی وتی بەو تاقمانەی کە سجنی کردبوون، وتی: ئەزانن ئێوە بۆچی بەو ڕووی مندا دەوێرن؟ ئەوە هێمنیو لەسەرخۆیی منە ئێوە لە ڕووی مندا دەوێرن[1]، کاتێ چرۆی یاخیبووەکان دەرکەوتو دەستی پێکرد، ئیمامی عوسمان ناچاری کردن بەڵگەیەك بهێنن بۆ بەرپەرچدانەوەی لەسەر ئەو رەخنانەی کردبوویانە گاڵە لەسەری لەبەردەمی هاوەڵانو خەڵکیدا، موسڵمانان بڕیاریان دا بیان کوژن، عوسمانیش بڕیایدا وازیان لێ بهێنێ لەبەر هێنمیو حیلمی خۆی شەڕنەخوازی هەموو کاردانەوەیەکی ئەمەبوو (نەخێر لێتان دەبوورمو قبوڵتان دەکەم)، بە هەوڵی خۆی تێی دەگەیاندنو تۆڵەی نەخستە سەر کەس هەتا تاوانێکی حەداری نەکردایە یان کافرییەتی لێ دەرنەکەوتایە[2].

**چوارەم: دەرچوونی هاوەڵە گەورەکان لە شاری مەدینە**

عومەر کەڵەپیاوەکانی قورەیشی قەتیس کردبوو، واتە نەیدەهێشت پیاوە مەزنەکانی کۆچەرییەکان بچن بۆ شارەکانی تر بە مۆڵەتو ماوە نەبوایە رێگەی نەئەدا ئەوانیش سکالایان کردو ئەویش پێی گەشتەوە، هەستاو وتی: ئایا دەزانن من تەمەنی ئیسلامم پێواوەو بەراورد کردووە، بە تەمەنی وشتر لە سەرەتاوە کۆرپەیە، پاشان دوو ساڵەیە، پاشان پێ لە چوارە، پاشان پێ لەشەشە، پاشان بە نۆساڵی دانی دەکەوێت[3]، ئایا پاش نۆ ساڵەیی پیرو نوقسانی نایەت بەسەر وشتردا، ئایا دەزانن ئیسلام بازەڵەبووە،

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٥٠).

[2] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٦٤).

[3] البازل: الذي انشق نابه بدخوله في التاسعة (٤١٣).

واتە نۆ ساڵەیەتی، ئەوەش قورەیشە دەیانەوێ ئەم سامانی خودایە بە کۆمەك بەرن‌و کەسی تر نەیبات هەتا کوڕی خەتتاب مابێت شتی وا نابێت من بەم گەلە سەریلندەوە جوان‌و ڕاوەستاوم، دەست دەگرم بە گەردنی قورەیشەوە[1] و بەربەستیان دەکەم با نەکەونە ئاگری دۆزەخ)[2].

عومەر دەترسا لەم هاوەڵانە کە بڵاوە بکەن بە ناوشارە ڕزگارکراوەکانداو لەو زەوییە پان‌و بەرینەدا زایە ببن‌و لە چاکەکاری دابڕێنن پیاوێکی کۆچەری کە یەکێك بوو لەوانەی لە مەدینە گیردرابوو داوای مۆڵەتی دەرچوونی کرد، عومەریش وەڵامی دایەو، ئەو خێرو پاداشتەی دەستت کەوتووە لەو غەزایانەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردووتە سەرو زیادەو لە غەزاکانی ئەمڕۆت باشترە بۆت، ئایا دونیا نابینی‌و دەرکی پێ ناکەین[3]، هەرچەند ئەو تۆ نابینێ، بەڵام، کە ئیمامی عوسمان هات ڕێگەی دەرچوونی بۆ ئاچۆغ کردن‌و نەرم‌و نیان بوو لەگەڵیان، ئیمامی شەعبی دەڵێ: کاتی ئیمامی عوسمان بوو بە فەرمانڕەوا ڕێگەی بۆ چۆڵکردن ئەوانیش دەرچوون بەملاولاداو بە شاراندا، خەڵکی لێیان خڕ بوویەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ، بەمەش عوسمان لە عومەر خۆشەویستتر بوو لەلایان[4]، ئەنجامی ئەم بڵاوەکردنە چەند پیاوێکی قورەیشی لە شارەکاندا بوونە سەرمایەدارو خەڵکیش بوونە دەسەودایەرەیان، بەردەستەیان[5]، لە ریوایەتی تردا کاتی عوسمان کرا بە فەرمانڕەوا ئەو ڕێگرییەی لێ نەدەکردن، کە عومەر دەیکرد، ئەوانیش کۆچیان کرد بە شاراندا کاتی دونیاوە شارانیان بینی‌و خەڵکیش ئەوانی دەست کەوت‌و بینی هەرکەسیان هەژارو نەدار بوو نیعمەتی ئیسلامی بەر نەکوتبوو بوونتە موریدو بەردەستەیان ئەم هاوەڵانە گمبوون لە ئاپۆڕای خەڵکدا.

---

[1] الحلاقيم: جمع حلقوم.

[2] تاريخ الطبري (٥/٤١٣).

[3] المصدر نفسه (٥/٤١٤).

[4] المصدر نفسه.

[5] المصدر نفسه.

یەکەمین لاوازییەك (وهن) کەوتە ئیسلامو یەکەمین فیتنەیەك کەوتە ناو عامەی خەڵکی هیچ هۆکارێك نەبوو ئەم بڵاوبوونەوەیە نەبێت[1].

**پێنجەم: دەمارگیری نەفامی**

ئیبنو خەلدون دەڵێ: کاتێك فتوحات گەشتووەتە ترۆپكو میللەت بێ شومار بیروباوەڕی خەلیفە جیهانگیر بوو، عەرەبیش دابەزییە ناو شارەکان لە چوارچێوەی ئەو گەلانەی خۆیاندا وەکو بەسرەو کوفەو شامو میسر ئەمانە تایبەتبوون بە هاوەڵییەتی پێغەمبەر ﷺو هاوڕێیەتییان کردبوو لە شوێن هەنگاوەکانی دەچوونو دەستیان گرتبوو بە سوننەتەکانییەوە، وەکو کۆچەریو ئەنسارو خەڵکی قورەیش ئەهلی حیجازو ئەوانە کە سوودمەند بووبوون وەکو ئەمان، بەڵام سەرجەم عەرەبەکانی بنەماڵەی بەکری کوڕی وائیلو عەبدول قەیسو هەموو بنەماڵەی ڕەبیعەو ئەزدو کندەو خوزاعەو ئەوانی تریش، ئەمانە هاودەمیو هاوەڵییەتییەی پێغەمبەریان ﷺ بەر نەکەتبوو کەمێکیان نەبێت، ئەمانە دەستیان هەبوو لە فتوحاتدا پێشتر هەر ئەمەشیان بۆ خۆیان بە باش دەزانی کە فتوحات بکەن وێڕای ئەو دینداریيەی دەیان کردو کەسە بەڕێزەکانیان دەناسیو ڕەچاویان دەکرد هەرگیز بەدهۆشو دەهشەیان نەکردوە دەربارەی کاری پێغەمبەرایەتیو هاتنەخوارەوەی نیگای هامەشۆی فریشتە، کاتی ئەم شوێنکەوتنو تەبابیە کزی کردو بارودۆخ هەندێ شتی لە بیر بردنەوەو دوژمن زەلیل بوو، پادشای وڵات گەڵەگەت بوو ئەوکاتە دەمارەکانی نەفامی جمەیان کردو سەیرەکەن کۆچەریو ئەنسارو قورەیشییەکانو ئەوانی تر بوونەتە سەرۆکیان دەرونیان بێزار بوو دەستیان دایە تەوەلایی، ئەمەش کەوتە سەردەمی عوسمان بە ئاشکرا توانجیان دەدا لە والییەکانی عوسمان لە شارەکانداو بە چورتەو بە هەنگاو ڕەخنەیان دەگرتو گلەییان دەکرد، لە گوێڕایەڵیدا سستییان دەکردو بە لێزمە داوای زوڵمو زۆرو لەکارلابردنیان لێ دەکردنو گلەییو گازندەیان هەڵدەڕێژا بەرانبەر ئیمامی عوسمانو لەناو دارو دەستەکانی خۆیاندا قسەو قسەڵۆکیان بڵاو دەکردەوە بە زوڵم دەیانگەیاندە قۆڵەکانی ترو بە زوڵم شرۆڤەیان دەکرد، هەتا تەشەنەی کرد بۆ بەرکەنارکردنی عوسمان، ئەگەر ئەمیرەکانی لەسەر کار

---

[1] المصدر نفسه.

لانەبات، ئیمامی عوسمانیش نوێنەری نارد بۆ شارەکان کە دەنگوباسی بۆ بێننەوە، ئەوانیش گەڕانەوەو وتیان: ئێمە نکولی هیچ شتێکمان نەکرد لەبەرچاوی موسڵمانانو عەوامەکانو بەرپەرچی هیچمان نەدایەوە[1].

**شەشەم: وەستانی فتوحات**

کاتی فتوحات راوەستاو کۆتایی پێهات، لە دوادوایی سەردەمی ئیمامی عوسماندا لەبەر بەربەستە مرۆییەکان یان سروشتییەکانو هەنگاو نەنان بە ڕووی فارسەکاندا یان بەڕوی باکوری وڵاتی شامو روی ئەفریقادا ئەوکاتە دەستکەوتەکانیش لە شوێنی خۆیدا وشکاوی هات جا ئەعرابەکان پرسیاریان دەکرد ئایا دەستکەوتە کۆنەکان چی پێ کرا؟ خۆیان دەزانن[2]، چەندین پڕوپاگەندەی پوچەڵ بڵاوبوویەوە هەمووشی عوسمانی پێ تۆمەتبار دەکرا، کە گوایە عوسمان لە زەویە وەقفکراوەکان بە کەیفی خۆی بەکاردێنیو بە پێی ئارەزووی خۆیو بۆ هەرکەسێ مەیلی لێ بێت بەشێکی بۆ دەپچڕێت، ئەمەش کاریگەرییەکی هەبوو لەسەر دڵی ئەعرابەکان نەخاسمە زۆربەی زۆریان بەبێکار مابوونەوە، دەم بەتاڵ بوون نیوەی کاتی خۆیان بە خواردنو خەوتن بەسەر دەبردو نیوەی تریشی بە توێییە کردنی سیاسەتی دەوڵەتەوە، قسەکردن لە بارەی مامەڵەی ئیمامی عوسمانەوە، کە سەبەئییەکان شەنیان دەکرد، یەکێکی لەکار گێڕەکانی عوسمان دەرکی کرد بەم هاشەو هوشە ئەویش عەبدوڵڵای کوڕی عامر بوو، ئاماژەی کرد بۆ خەلیفە لەوکاتەی خەلیفە بانگی وەزیرو راوێشکارانی خۆی کرد کە لە ڕاوبۆچوونەکانیدا ئیجتیهاد بکەن، تێبینی دا بە خەلیفە کە فەرمان بکات بە خەڵکی جیهاد بکەنو نێڵەیان بدات بۆ غەزا کردن هەتا داڵغەو هەمی هیچ کامیان نەبێتە سپیو بداتە سەریانو نەبێتە گەندەی وڵاخەکانیان[3]، لەو کەشو هەوایەدا کە باسو خواس بوو لای هاوولاتیان گەڕانەوە لە غەزاکردنو بە باشیش حاڵی نەبوو لە دینو دەلوا هەموو خراپەیەکیان لێ داکەوێت، ئەوەندە بەس بوو ئەو ئەعرابیانە بجوڵێنرێتو یەیەکجار

[1] تأريخ ابن خلدون (٢/٤٧٧).

[2] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٣٤٤).

[3] تاريخ الطبري (٢/٣٤٠).

ئاراسته بکرێن ئیتر ئەوان هەڵدەچوون بگرەو بەردەو فیتنەیان هەڵدەنوخان، بە کردەوەش ئەمە روویدا، چونکە ئەعرابەکان، بە هۆی راوەستانی فتوحاتەوە دەستپێشخەرییان کرد لە ئانسەری فیتنەی یەکەمداو بوونە هۆیەك لە هۆکارەکانی گڕسەندنیو بەرپابوونی[1].

**حەوتەم: بەهەڵە تێگەیشتن لە وەرع**

وەرع لە شەریعەتدا خاوێنەن بریتییە لە دەستهەڵگرتنو وازهێنان لەو شتانەی کە هیچ گوناهێکی تێدا نییە، لە ترسی ئەوەی نەکو گوناهێکی تێدا بێت، لەبنەڕەتدا وەرع لەسەر شتە موباحەکان هەڵدەگیرێ بۆ خوداو لەبەر خودا، وەرعکردن شتێکی شەخسییە ئەگەر مرۆڤ بیخاتە سەر دەروونی خۆی دروستەو باشە، بەڵام راست نییەو دروست نییە بیسەپێنێت بەسەر کەسانی تردا، ترسناکترین جۆرەکانی وەرع ئەو وەرعە نەفامانەیە کە موباح حەرام دەکات یان فەرزی دەکات ئەم جۆرەیان بوو تاقمی فیتنەکەران تێی کەوتن، ئەوکاتە دوژمنانی ئیسلام لەو رۆژەدا ئەم هەلەیان قۆستەوەو هەستی ئەمانەیان رفاندو فویان تێکردو دەماندیان، وایان دەزانی ئەوکارانەی کە موباحەو بەرژەوەندیی تێدایەو عوسمان دەیکات دەرچوونە لە ئیسلامو گۆڕینی سونەتی پێش خۆیەتی، ئەم بابەتەیان گەورە کرد لە چاوی نەفامەکانداو خوێنی خەلیفە عوسمانیان بە ئیباح زانیو یارمەتی ئیباحەیان دەداو دەرگای فیتنەیان لە موسڵمانان کردەوە هەتا ئەمڕۆ، ئەم وەرعە نەفامانە لە هەڵسوکەوتی هەندێ موسڵماندا ئەمڕۆش دەبینرێت ئەوانەی سورن لەسەر گونجاندنی ئەحکامەکانی ئیسلام بە گوێرەی حەزو رِقی خۆیان یان بەپێی خوو نەریتو لاسایی خۆیان[2].

**هەشتەم: تەماعی تەماعکاران**

لە جیلی دووەمی نەوەی هاوەڵاندا، ئەوانەی کە گوزارشتیان لە تازەکردنەوەو نوێکردنەوەی حوکمو ئیدارە دەکرد، ئەم نەفامانەو هاوچەشنەکانیان وایاندەزانی ڕێگای بەردەمیان داخراوەو تەنراوە، عادەتیش وایە هەرکاتێ تەماعکاران بۆ تەماعی خۆیان هەناسە هەڵمژینێکیان دەست نەکەت ئەوا دەچنە نێو بازنەی ئەو کارانەی گۆڕانکاری

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة، ص(٣٥٣).

[2] الأساس في السنة (١٦٧٦/٤).

دروست دەكاتو گۆم لیڵ دەكات، چارەسەركردنی كاروباری ئەم چینە زۆر گرنگە ئەوپەڕی گرنگە[1].

**نۆیەم: موئامەرەی كینەبازەكان**

چەندەها دووڕووی داخ لەدڵ هاتبوونە ناو ئیسلامو دڵیان پڕپڕبوو لە كینەو گلەیی‌و گازندەو دەهۆبازی‌و نەیان دەتوانی ئەم خاڵە لاوازانە بدۆزنەوە كە لە شەقارییەوە بتوانن فیتنەی لێ تاو دەن، بەڵام كەسانێكیان دەست كەوت بە گوێ قولاغەوە گوێی بۆ دەگرتن‌و لە شوێنەواری ئەمانەدا، ئەمەش بەرپا بوو، كە بینیمان[2]، بە ڕاستی پێشتر باسی كیانی جولەكەو گاورو فارسمان كرد، ئەمانە هەموویان ناسراون كە هۆكاری قین‌و كینەو غەرەزن، لەسەر ئیسلامو وڵاتی ئیسلامی.. بەڵام ئێمە لێرەدا ئەو گرۆیە باس دەكەین كە داری حەدو تەمێكردنیان بەسەر هاتبوو بە بۆنەی تاوانێكەوە كە لەناو جەرگەی وڵاتدا كردبوویان‌و خەلیفەش یان والییەكان لە هەندێ لە شارەكاندا سزایان دابوون بە تایبەت لە بەسرەو كوفەو میسرو مەدینە جولەكەو گاورو فارس‌و كەسوكاری تاوانبار كە داخ لەدڵبوون، چەند دەستەیەك لە خەڵكیان قۆستەوەو تەنزیم كرد زۆربەی زۆریان لە ئەعرابەكان بوون ئەوانەی كە لەم دینە تێنەگەشتبوون لە سەر حەقیقەتی خۆی، تاقمێك دروستبوو بۆ ئەم داخلەدڵانە كە بە خەڵكی شەڕەنگێزو خراپەكار دەناسران بەشاهیدی ئەوانەی كە بینیویانن، بە ڕاستی بە سەرسەری ئەهلی شارەكان وەسفكراون[3]، چونكە ئەمانە گوركەمێشی عەرەب بوون[4]، ئەمانە بێ ئەرزش خەڵك بوون، لە شەڕەنگێزی یەكدەنگ بوون[5]، ئەمانە ناحاڵی‌و كاڵفامبوون لە هیچ حاڵی نەدەبوون[6]، ئەمانە خوێڕی‌و پەتەڕی‌و تیرە قەرەجەكان بوون[7]، ئەمانە ئەهلی

---

[1] أحداث وأحادث فتنته الهرج، ص (٥١٧).

[2] المصدر نفسه.

[3] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص (٣٩٢).

[4] المصدر نفسه.

[5] الطبقات (٧١/٣)، هذا وجف ابن سعد.

[6] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص (٣٩٢).

[7] شذرات الذهب (٤٠/١)، هذا وجف ابن العماد.

وشکهەڵهاتوو، بێ سەرویەرو کەللە ڕەق‌و هەرچی‌و پەرچی خێڵەکان بوو، خوێڕی و ڕیسواو ئەملاو ئەولا بوون[1]، ئەمانە ئامێری شەیتانێ بوون[2]، ناوی عەبدوڵلای کوڕی سەبەئی سەنعانی یەهودیی بوو، لە جوملەی ئەم داخلەدڵە دوابڕاوەدا بوون کە دەخەزیان گرتبوولە سەرچاوەکاندا بە چەندبارە کراوەیی ناوی دەبرێت.

عەبدوڵلا جولەکە بوو، پاشان موسڵمان بوو بەڵام دەستی لە مەرامە گڵاوەکانی هەڵنەگرتبوو، هاتوچۆی دەکرد، لە نێوان شارە ئیسلامییەکاندا بەو ئیعتیبارەی کە تاکێکە لە موسڵمانەکان[3]، لەمەولا باسی دەکەین لە توێژینەوەیەکە سەربەخۆدا بە ئیزنی خودا.

**دەیەم: نەخشەسازییەکی توندوتۆڵ بۆ وروژاندنی گلەیی‌و گازندە لەعوسمان**

کۆمەڵگە هەمیشە ئامادەییە بۆ وەرگرتنی پڕوپاگەندەو قسەڵۆك لە ئەنجامی کۆمەڵێ هۆکارو ئامرازی ناوخۆیی، هەروەها گۆڕەپانەکە ئامادەباشکرابوو پێکهاتەی کۆمەڵگەکەش شایانی ڕووبەڕووی خروقات بوو، فیتنەچییەکان کۆبوونەوەو ڕێکەوتن لەسەر تەشەردان لە ئەمیرەکان بە بیانووی فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگریکردن لە خراپە بۆ ئەوەی خەڵکی کێشکەن بۆ ناو ریزەکانی خۆیان، ڕەخنەو تەشەردان گەشتە عوسمانیش‌و خودی عوسمان توانجبار کرا بەو پێیەی رابەری یەکەمی دەوڵەتە ئەگەر ئەو گازندانە هەژمار بکەین کە برەویان پێ دەداو ڕەواجیان پێدەدا لە دژی خەلیفەو تەشەریان لێدەدا پێی دەکرێ لە پێنج کۆمەڵەدا ریزبەندی بکەین:

١ـ هەڵوێستە شەخسییەکان پێش فەرمانڕەوایی خەلافەت (واتە غایب بوونی لە هەندێ غەزاو پێگەکان).

٢ـ سیاسەتی داراییەکەی ـ بەخشینەکانی، پاوەنەکان.

٣ـ سیاسەتی ئیدارییە کردەییەکانی، کاربەدەستی کردنی خزمەکانی، رێبازەی کاربەدەستکردنی لە کەسەکاندا.

---

[1] شرح صحيح مسلم (١٤٨/١٥، ١٤٩).

[2] تاريخ الطبري (٣٢٧/٥).

[3] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة.

٤- ئیجتیهاده تایبەتییەکانی یان ئیجتیهادەکانی بۆ بەرژەوەندیی ئوممەت (وەکو چوار رکات کردن لە مینا کۆکردنەوەی قورئان، گەورە کردنی لە مزگەوتەکان.

٥- هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵاندا وەکو عەممارو ئەبی زەڕو ئیبنو مەسعود[1].

هەڵوێستی ئیمامی عوسمان رۆشن کراوەتەوە لە هەموو ئەو شتانەی رووبەڕوویان دەکردەوە، لە شوێنو کاتی خۆیداو گازندەی هیچکامیان نەماوە جگە لە عەممار، لەمەولا باسی دەکەین (ان شاء الله)، چەندین زیادە خراوەتە سەر ڕووداوی دەرخستنی گازندەکانی ئەو گلەییانە کە کراوە لە عوسمان ئیتر لە سەردەمی خۆیدا بێت ئەو دەمەی ئاراستەیان کردووە، ئەویش لە کاتی خۆیدا وەڵامی داوەتەوە یان لە دواییدا بۆیان هەڵبەستووە لە لایەن راویو کیتاب نوسەکانەوە، ئەمانە راست نینو نەگەێنراونەتە ئەنازەیەك کە ببێتە باعیسی کوشتنی[2]، ئەو گلەییانەی پێشوو باسکراونو نوسراوەتەوە لە مێژووی تەبەریو غەیری ئەویشدا لە کیتبە مێژوویەکانو ریوایەتە وەرگیراوەکان لە ڕێگەی نەفکارەکان هەوالدەرە لە ڕوولاوازەکان بووە، بەتایبەت ڕافزییەکان، ئەم رافزییانە بەردەوام بەلایەکی ناگەهان بوون، لەسەر حەقیقەتەکانی سیرەی خولەفاو پێشەوایان، بە تایبەت لە قۆناغی بگرەو بەردەو فیتنەندا، زۆر بەداخەوە سیرەی ئیمامی عوسمانی ئەمیری ئیمانداران کۆمایەکی بێ شوماری بەرکەوت لە بگرەو بەردە ریوایەتی رووداوەکانی تر پڕ هەڵەن، کە پۆخڵەوات لەسەر رێبازی (هەرچی پێوە لکا لولی دەدا) هەندێکە لەو شێواندو دەستکارییەی خراوەتە سەر سیرەی درەوشاوەی ئیمامی عوسمان، ناشرین کردنی پیاوە بەنرخەکان لە ئەنجامی ئیرەییو داخ لە دڵی بۆ سوکایەتیو ناوزڕاندنو لەکەدارکردن.

ئیمامی عوسمان خودی خۆی دەرکی بەم حاڵەتە کرد کاتێ نوسراوێکی نووسی بۆ ئەمیرەکانی وتی: (پاش سوپاسی خودای گەورە، میللەت لەبڵاوەکردنیدا گەزراوەو

---

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص (٣٩٤).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٣٩٤).

خزاوەتە ناو شەڕو، نەزعە دەكات بۆ خراپە، سێ شتیش وای لیّ كردووە دونیای سەرنجكێش‌و ئارەزووی خێراو ڕفێنراو داخ‌و مەراقی پیشدراو)[1].

ئیبنول عەرەبی دەڵێ دەربارەی ئەو ڕەخنانە بە گشتیی دەڵێت: (بە زوڵم وتویانەو خۆیان بە ڕیوایەتی درۆزنەكانەوە بەستووە)[2]، دەڵێن ئیمامی عوسمان لە قەڵەمڕەوییەكەیدا زاڵم‌و نالەبارەی هەبووە، ئەمانە هەمووی لە رووی سەنەدو دەقەوە باتڵەو بێ بنەمایە، ئیبن‌و تەیمییە رۆشنی كردووەتەوە، كە ئیمامی عوسمان بێگوناه نییە دەڵێ: (ڕێسایەكی گشتی‌و گشتگیر بۆ ئەم ڕووداوانە ئەمەیە هیچ كەسێك نییە بیروروباوەڕی وابێت جگە لە پێغەمبەر ﷺ كەسێك هەبێت مەعسوم بێت تەنانەت خەلیفەكان‌و غەیری ئەوانیش دەكرێ هەڵەیان كردبێت‌و گوناهیان لێداكەوتبێ‌و تەوبەیان لیّ كردبێت، بەڵام ئەمانە بە هۆی حەسەناتی زۆریانەوە پاك بوونەتەوە، هەروەها بە چەندین موسیبەتی گوناه شۆر تاقی كراونەتەوە، بە شتی تر پاكبوونەتەوە هەموو ئەو شتانەی كە نقڵی دەكەن لە بارەی عوسمانەوە مەبەستیان ئەوەیە بیكەنە هەڵەو تاوان، ئیمامی عوسمان چەندەها هۆكاری لێخۆشبوونی بۆ هاتە كایەوەو لە چەند ڕوویەكی زۆرەوە وەكو دەست پێشخەری كردنی لە بڕواهێنانداو لەبەر ئیمان‌و جیهادو شتی تر لە گوێڕایەڵییەكانی، جێگیر بووە، كە پێغەمبەر ﷺ شایەتی داوە بۆ عوسمان، بەڵكو مژدەی بەهەشتی پێداوە لەسەر بەڵایەك كە گیرۆدەی دەبێت[3]، هەروەها تەوبەی كردووە لە هەموو ئەو شتانەی كە كردبوویانە ڕەخنەو گازندە لەسەری وە تووشی بەڵایەكی گەورە بوو خودای گەورە هەموو گوناهەكانی پیّ شۆردەوە، ئەویش سەبری گرت هەتا بە مەزلومی‌و بەناحەق شەهیدكرا، ئەمە گەورەتین بەڵایە بۆ سڕینەوەی گوناهەكان)[4].

---

[1] التمهيد والبيان، ص(٦٤).

[2] العواصم من القواصم، (٦١ ـ ٦٣).

[3] مسلم، كتاب فضائل الصحابة، (١٨٦٧/٤، ١٨٦٩).

[4] ذوالنورين عثمان بن عفان، محمد مال الله، ص(٦٣).

**یازدەیەم: بەکارهێنانی ئەو ئامرازو شێوازانەی کە خەڵکی وروژاند**

گرنگترین ئەو شێوازانە پڕوپاگەندەی راتەکێنەربوو بە شێوەیەك وشەکانی پڕوپاگەندەو هاشوهوشەی زۆریان دەڕیسایەوە، خەڵکیان دنە دەداو دیمانەو مشتومڕی بەرامبەریان بە بەرچاوی خەڵکەوە دەکرد، لەگەڵ خەلیفەو تانەیان دەدا، لە والییەکانی و ساختەکاریان دەکرد، لە نامەو نوسینداو لەسەر زمانی هاوەڵان درۆیان هەڵدەبەست بە ناوی ئەوانەوە بە ناوی عائیشەو عەلیو تەلحەو زوبێرەوە، پڕوپاڵانتەیان دەکرد گوایە عەلی ئەبی تالیب شیاوترە بۆ خەلیفەییو ئەو میراتگرە دوای پێغەمبەر ﷺو لە بەسرەو کوفەو میسر فیرقەیان ڕێکخستبوو چوار فیرقە بوو لە شارەکان، ئەمە بەڵگەیە لەسەر پیلاندانانی پێشوەخت ئەهلی مەدینە وایان دەزانیو ئەندێشەیان وابوو ئەمانە بە بانگهێشتی هاوەڵان هاتوونو لە خۆیانەوە نەهاتوون ئەم ڕووداوانەیان هەڵکشان هەتا گەیاندیانە قەتڵ[1] ئەوەندە جوڵاندیان قەتڵی لیێ کەوتەوە لە پاڵ ئەم شێوازانەدا.. کۆمەڵێ دروشمیان بەکارهێناوە تەکبیریان دەکرد دەیان وت جیهاد دژی بەزاڵم بوو دەکەین دەیان وت بە فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە هەستاوین داوای گۆڕینی عوسمانیان کرد ئەوەندە بوێرییان درێژە پێداو داخوازییان کرد بەڵکو پەلەیان کرد لە کوشتنی خەلیفە بەتایبەتی کاتی هەواڵیان پێگەشت کە خەڵکی شارەکان هاتوون بۆ پشتیوانی خەلیفە ئەمە حەماسەتی تاو سەندو زیاد کرد بۆ ئەوەی تەنگ بە خەلیفە هەڵچنو بیتەپێنن هاندان بکەن بۆ کوشتنی، ئیتر بە هەرهۆکارێك بێت[2].

**دوانزەیەم: شوێنەواری سەبەئییەکان لە ڕووداوەکانی فیتنەکەدا**

١ـ ئایا سەبەئییەکان حەقیقەتە یان ئەندێشەیە گشت زانایانی پێشوو کۆڕایان هەیە لەسەر بوونی سەبەئییەکان بە بیێ ناوگیری، بەڵام کەسانێکی کەم لە زانایانی ئەم چەرخە کە زۆربەیان شیعەن سەرپێچی ئەو ڕاستییە دەکەن، ئینکاریی بوونی دەکەنو بیانووی ئینکارییەکەشیان ئەوەیە کە ئەم ناوە (سەبەئی) داهێنراوە لە خەیاڵییەکانی عومەری کوڕی سەیفی تەمیمییە، عومەریش ئەو کەسەیە، کە هەندێ لە زانایانی پیاوناس

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة، ص(٤٠١)، كتاب الإنقاذ من وعادي الإنقاذ للتاريخ الإسلامي.

[2] المصدر نفسه ص(٤٠٢).

خۆیان لێ پاراستووه له بواری ریوایه‌تی فه‌رموده‌دا، قسه‌یان لێ وه‌رنه‌گرتووه، ئه‌ی ئه‌وه نییه زانایان قسه‌كانی عومه‌ریان به به‌ڵگه داناوه‌و هه‌واڵه‌كانی به‌راست زانراوه، وه‌ك ده‌زانین لای ئیبنو عه‌ساكیر ریوایه‌تی زۆر هاتووه‌و باسی عه‌بدوڵلای كوری سه‌به‌و ده‌كات، راویه‌كانیش عومه‌ری كوری سه‌یف نییه، ئه‌لبانی حوكمی داوه به‌سه‌ر هه‌ندێكیدا كه راسته ئیتر له كتێبی فیرقه‌كاندا بێت یان كتێبی (رجال)دا یان كیتبی فه‌رموده، به‌ڵام ناوی عومه‌ری كوری سه‌یفی تێدا نییه له نزیك‌و نه له‌دوور دكتۆر سه‌لمان ئه‌لعوده له كیتبه‌كه‌یدا به‌ندێكی به ناونیشانی عه‌بدوڵلای سه‌به‌ء و شوێنه‌واره‌كانی له رووداوه‌كانی فیتنه‌و هه‌ڵگیرسانیدا له قۆناغی یه‌كه‌می ئیسلامدان هه‌ندێك له توێژه‌ره‌وان گومان ده‌كه‌ن له بوونی عه‌بدوڵلای كوری سه‌به‌ء[1] ده‌ڵێن، كه كه‌سایه‌تییه‌كی وه‌همییه‌و ئینكاری بوونی ده‌كه‌ن، به بێ به‌ڵگه‌و ده‌لیل ئه‌وانه‌ی ئینكاریی كه‌سایه‌تی ئیبن‌و سه‌به‌ء ده‌كه‌ن تاقمێك له رۆژهه‌ڵاتناس‌و برێك له توێژه‌ره‌وه عه‌ره‌به‌كان‌و زۆربه‌ی زۆری شیعه هاوچه‌رخه‌كانن ئه‌وه‌ی جێگه‌ی سه‌رسامییه ئه‌م رۆژهه‌ڵاتناسانه‌و كلكه‌كانیان له رافزییه‌كان‌و نامۆكارنی ئه‌م سه‌رده‌مه‌ی خۆمان ئینكاریی كه‌سایه‌تی عه‌بدوڵلای كوری سه‌به‌ء ده‌كه‌ن‌و به كه‌سایه‌تییه‌كی وه‌همی داده‌نێن‌و ئاماژه به بوونی ناكه‌نن ئه‌مانه له نه‌فامی‌و بێشه‌رمیدا تا چ راده‌یه‌ك گه‌شتوون كتێبه مێژووییه‌كان‌و كتێبی گروپه‌كان پر پره له ته‌رجه‌مه‌و باسی عه‌بدوڵلا، راوییه‌كان كارو كرده‌وه‌كه‌یان نه‌قڵ كردووه‌و ده‌نگوباسی عه‌بدوڵلا چین چین كه‌وتووه‌ته سه‌ریه‌ك له ئاسۆی كتێبه‌كاندا، مێژوونووسان‌و فه‌رموده‌زانه‌كان‌و نووسه‌ری كتێبه‌كانی ئه‌لفیره‌ق‌و میله‌ل‌و نیحه‌ل‌و ته‌به‌قات‌و ئه‌ده‌ب‌و ئه‌نساب‌و ئه‌وانه‌ی وجودی سه‌به‌ئییه‌كان رۆشن ده‌كه‌نه‌وه عه‌بدوڵلای كوری سه‌به‌ء كه له كتێبه‌كانی ئه‌هلی سوننه‌دا ناوی براوه‌و باسكراوه كه‌سایه‌تییه‌كی راسته‌و وجودی هه‌یه، هه‌روه‌ك له كتێبه شیعه‌ییه‌كاندا ده‌ركه‌وتووه كه كه‌سایه‌تییه‌كی مێژووی حه‌قیقه‌ته له‌به‌ر ئه‌م راستیانه هه‌واڵه‌كانی فیتنه‌و رۆڵی عه‌بدوڵلای كوری سه‌به‌ء ته‌نیا له مێژووی ئیمامی ته‌به‌ریدا باس نه‌كراوه‌و به‌س ته‌نها نه‌خراوه‌ته پاڵ ریوایه‌ته‌كانی عه‌مری ته‌میمی به‌ڵكو له ریوایه‌تی زۆر راویدا

---

[1] عبدالله بن سبأ الملقب بابن الشوداء، يهودي من صفاء، أظهر اسلام فيزمن عثمان بن عفان ظهر له نشاط ملحوظ في الشام والعراق ومصر خاصة.

هاتووه، بەڵکو هەواڵی بڵاوە لە ریوایەتی زانایانی پێشوودا، لە هەردوو کتێبی رووداوە مێژوییەکانی ئیسلامو راوبۆچوونی فیرەقو نیحەلەکاندا لەو ماوەیەدا بە راشکاوی باسی کراوە، تەنیا ئەوە هەیە مێژووی ئیمامی تەبەری جیاوازییەکی هەیە لە وانی تر بابەتەکەی بە فراوانی باسکردووەو زۆر بە دوورودرێژی شیکردووەتەوە، با ئاگاداربین گومانو دوودڵی لەم رووداوانە، کە هیچ سەنەدو بەڵگەیەکیان نییە، مانای ئەوە دەگەیەنێت هەموو ئەم هەواڵانە دەڕوخێتو هەرەس دێنێتو زانایانو هەواڵدەرەکانی بە گێلو درۆزن دەردەچنو راستییە مێژوییەکان دەشێوێتو ئاوەژوو دەبێت، ئەوە کە بۆچونێکی راستەو کە مەنهەجە بە نموونەیەکی هەڵهێنجانی عەقڵی وشكو رووت رووبەڕووی ئەو هەموو دەقو ریوایەتە لێشاوە زەفەر بەرە بوەستنەوە، ئایا ئەوە راستییەو مەنهەجییە بە نموونەی لاپەڕەیەك پشت بکەینە گشت سەرچاوە گەورەکانی زانایانی پێشوو، زانایانی دوایی، کە هەر هەموویان سەلماندوویانە کە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەو کەسایەتییەکی واقیعییە[1]، باسی ئیبنو سەبەو لە کیتبی ئەهلی سوننەدا زۆر هاتووە، وەکو ئەعشاری هەمەدانی[2]، کە شاعیرێکی فارسییەو یەکێکە لە شەرعزانە قورئانخوێنەکان، بەڵام شیعری وتووەو بە شاعیر ناسراوە ئیمامی زەهەبی دەڵێت شاعیرێکی بەناوبانگی خۆشخوانەو خوداناسێکی بەرێزە لە ساڵی ی کۆچی کوژراوەە بە زمانی خۆی باسی سەبەئییەکانی کردووەو موختاری کوڕی ئەبی عوبەیدی سەقەفیو دەستەو داریەرەکەی داشۆریوە کە ئەهلی کوفە بوون، دوای ئەوەی لەگەڵ پیاوەماقوڵەکانی ئەهلی کوفە رای کرد بۆ بەسرەو بەم شێوەیە دایشۆرینو وتی: "من شایەتم، کە ئێوە سەبەئین، من دەزانم ئێوە داردەستی کوفرو چاك دەتان ناسم"[3].

ئالێرەدا ریوایەتێکمان لە ئیمامی شەعبییەوە کە لە ساڵی (١٠٣)ی کۆچی مردووە ئەوە دەگەیەنێت کە یەکەمین کەسێك درۆی هەڵبەستو دیعایەی کرد عەبدوڵڵای کوری سەبەء بوو[4]، هەروەها ئیبنو حەبیب[1]، کە ناوی موحەممەدی کوڕی حەبیبە کوڕی

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (١/٧٠).

[2] هو عبدالرحمن بن عبدالله بن الحارث الهمداني، المعروفشاعر فارسي أحد الفقهاء القراء لكتبه قال الشعر وعرف به، قال الذهبي، شاعر مضوه شهر، كان متعبدا فاضلا قتل عام (٨٣)ه.

[3] ديوان: أعشى همدان، (١٤٨).

[4] تاريخ دمشق، لابن عساكر (٩/٣٣).

ئومەیەی هاشمیە زانایە لە زانستی نەسەبو هەواڵو زمانو شیعردا، لە ساڵی (٢٤٥)ی کۆچی مردووە باسی عەبدوڵڵای سەبەء دەکاتو بە یەکێك لە کوڕانی حەبەشەی حساب دەکات[٢] هەروەها ئەبو عاصمی خۆشەویستی کوڕی ئەحرەم کە لە ساڵی (٢٥٣) کۆچی مردووە.

هەواڵی سوتاندنی ئیمامی عەلی ریوایەت دەکات کە کۆمەڵێ لە سەبەئییەکانی سوتاندووە، لە کیتبی (الاستقامە)دا[٣]، هەروەها جاحیز[٤]، کە لە ساڵی (٢٥٥) کۆچی مردووە یەکێکە لە سەرتەڵەکان ئاماژە بۆ عەبدوڵڵای سەبەئی[٥] دەکاتو ریوایەتەکەشی پێش ئیبنو سەبەء نییە، وەکو دکتۆر جەواد عەلی تێگەیشتووە[٦]، دەنگوباسی سوتاندنی زەندیقەکان لە لایەن ئیمامی عەلی-یەوە ریوایەتە صەحیحەکانی کتێبە صەحیحەکانو سوننەنو مەسانیدەکان دەردەخاتو دەسەلمێنێت[٧]، وشەی زەندیق دوور نییە لە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء دارو دەستەکەی، ئیبنو تەیمیە دەڵێ: (پەیڕەوی رافزییەکانو بەرنامەیان لە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئی زەندیقەوە سەرچاوەی گرتووە)[٨]، ئیمامی زەهەبی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئی تیژڕەوی زەندەقییەکانە، سەرلێشێواوو سەر لێ شێوێنەرە[٩]، ئیبنو حەجەر دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕ سەبەو لە تیژڕەوی زەندیقەکانە، دەستەو دائیرەیەکی هەبووە پێیان وتراوە سەبەئییەکان بیروباوەڕیان وایە، کە عەلی ئەبی تالیب خودایەتی تێدایەو

---

[١] محمد بن حبيب بن أمية الهاشمي، عالم بالانساب والاضبار واللغة والشعر، توفي عـام (٣٤٥)ه، تـأريخ بغـداد (٢٧٧/٢)..

[٢] المجر، لابن حبيب، ص(٣٠٨)، عبدالله بن سبأ، العودة ص(٥٣).

[٣] هو خشيش ين أحرم بن الأسود النسائي، ترجم له الذهبي، تذكرة الحفاظ (٥٥١/٢).

[٤] هو عمر بن بحر بن محبوب الكتابي، من أئمة الادب والعلم، توفي عام (٣٥٥)ه.

[٥] البيان والتبين (٨١/٣).

[٦] تحقيق مواقف الصحابة (٢٩٠/١)، عبدالله بن سبأ، للعودة، ص(٥٣).

[٧] تحقيق مواقف الصحابة (٢٩٠/١).

[٨] مجموعة الفتاوى (٤٨٣/٢٨).

[٩] ميزان الاعتدال للذهبي (٤٣٦/٣).

خودایه، عەلیش لەسەردەمی خەلافەتیی خۆیدا سوتاندنی بە ئاگر[1]، باسی عەبدوڵڵای سەبەء لە کتێبەکانی جەرح‌و تەعدیلدا هاتووەو ئیبنو حیبان کە لە ساڵی (٣٥٤)ی کۆچی مردووە دەڵێت: کەلبی موحەممەدی کوڕی سائیبی ئیخباری سەبەئییەو یەکێکە لە پیاوەکانی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء و یەکێکە لەوانەی کە دەڵێن عەلی نەمردووەو دەگەڕێتەوە بۆ دونیا پێش هەستانی قیامەت، ئەگەر هەورێك ببینن دەڵێن ئەمیری ئیمانداران عەلی تێدایە[2]، هەروەها کتێبەکانی رەچەڵەکناسی جەخت دەکەنەوە لە ناوی سەبەئیییەکان، کە نیسبەتە بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء بۆ نموونە کیتابی (الانساب للسمعانی)[3]، کە لە ساڵی (٥٦٢)ی کۆچی مردووە[4]، ئیبنو عەساکیر کە لە ساڵی (٥١٧)ی کۆچی مردووە، بەم شێوەیە پێناسەی عەبدوڵڵای سەبەء دەکات، دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء، کە سەبەئییەکان دەدرێتە پاڵی‌و ئەمانەش تیژڕەوی رافزییەکانن، عەبدوڵڵا لە ئەسڵدا یەمەنییەو جولەکەیەو بەبانا ئیسلام بووە[5]، عەمری کوڕی سەرف تاکە سەرچاوەیەك، کە هەواڵی عەبدوڵڵای کوڕی گێڕابێتەوە، سەیرەکەین ئیبنو عەباس‌و عەساکیر لە مێژووەکەیاندا هەندێ ریوایەتیان هێناوە، کە عەرمی سەیفی هەر تێدا نییە، ئەم ریوایەتانە عەبدوڵڵای سەبەء دەسەلمێنن‌و جەخت لە هەواڵەکانی دەکەنەوە[6]، شێخ ئیسلام ئیبنو تەیمیە، کە لە ساڵی (٧٢٨)ی کۆچی مردووە باس دەکات، کە ئەسڵی رافزییەکان لە مونافیقە زەندیقەکانەوەو داهێنراو داشی عەبدوڵڵای سەبەئی زەندیقەو زیادە رەوییان لە عەلیدا ئاشکرا کردووە، داوای ئیمامەتیان کردووەو دەقی قورئانیان پیدا وتووەو بانگەشەی بێگوناهی عەلییان کردووە[7]، شاتبی، کە لە ساڵێ (٧٩٠)ی کۆچی مردووە[1]، ئاماژەی کردووە کە

---

[1] لسان میزان، (٣/٢٩٠، ٣٨٩).

[2] المجر وحسن (٣/٢٥٣).

[3] عبدالكريم بم محمد المعاني، توفي عام (٥٦٣)ە، وتذكره الحفاظ (٤/١٣١٦).

[4] الاناب (٧/٢٤).

[5] تاريخ دمشق (٩/٣٢٨، ٣٢٩).

[6] تحقيق مواقف الصحابة (١/٢٩٨).

[7] مجموع الفتاوى (٤/٤٣٥).

بیدعەی سەبەئی لەو بیدعە بیروباوەڕیانەیە، کە پەیوەستە بە هەبوونی خودایەکی تر لەگەڵ خودادا، ئەمە بیدعەیەکە جیاوازە لە بیدعەکانی ترو قسەوباسەکانی تر[2]، لە کیتابی (خطط)ی مەقریزیدا کە لە ساڵی ساڵی (٨٤٥) کۆچی مردووە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕە سەبەء لە زەمانی عەلیدا هاتوو بیدعەی داتاشیوە وتوویەتی عەلی وەسیەتی خەلیفەیی پێ کراوە، عەلی دەگەڕێتەوە بۆ دونیا، گیانی عەلی دەچێتە قاڵبی خەڵکی تر یان نوسخەی لەبەر دەگیرێتەوە[3]، بەڵام سەرچاوەکانی شیعە ئەوانە کە باسی عەبدوڵڵای سەبەئیان کردووە ئەمانەن کەشی لە موحەممەدی عەولەوییەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: سەعدی کوڕی عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە ئەویش لە یەعقوبی کوڕی یەزیدەوە، موحەممەدی کوڕێ عیسا ئەمیش لە عەلی کوڕی مهزیارەوە ئەویش لە قوزالەی کوڕی ئەیوبی ئەزدییەوە ئەویش لە ئەبانی کوڕی عوسمانەوە دەڵێ: بیستم لە ئەبا عەبدوڵڵا دەیوت: خودا لەعنەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء، چونکە ئەو عەبدوڵڵایە بانگەشەی ئەوەی کرد، کە ئەمیری ئیمانداران عەلی خۆی خودایە، وەڵڵاهی ئەمیری ئیمانداران بەندەیەکی گوێڕایەڵی خودایە، وەیل بۆ ئەوەی درۆمان پێوە دەلکێنێو درۆمان بۆ دەکات، خەڵکانێك هەن شتی وا دەڵێن بە ناوی ئێمەوە ئێمە لە دڵی خۆشماندا نایڵێینو نەمان وتووە، ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای خودا، تەبەرا دەکەین لەوانە[4]. ئەم ریوایەتە لە رووی سەنەدەوە صەحیحە[5]، لە کیتابی (الخصال)دا قومی ئەم هەواڵەی ریوایەت کردووە بەڵام گەیاندوویەتییە سەنەدێکی تر، بەڵام خاوەنی (روضات الجنات) باسی ئیبنو سەبەئی کردووە لای خۆی لەسەر زمانی ئەو راستگۆ باوەڕپێکراوەی کە لەعنەتی کردووە لە ئیبنو سەبەو لەبەر تۆمەتی درۆکردنو ساختەکاریو گازەرگێشانی نهێنییەکانو شرۆڤەکردنی نارەسەن (التأويل)[6]، دکتۆر

---

[1] ابراهيم بن موسى، محمد الفرناطي، توفي عام (٧٩٠)ه.

[2] الاعتصام (١٩٧/٣).

[3] المواعظ والأعتيار (٣٥٦/٣، ٣٥٧).

[4] رجال الكشى (٣٢٤/١).

[5] عبدالله بن سيأ الحقيقة المجهول، لمحمد على المعلم (ص٣٠).

[6] عبدالله بن بأ، العودة، ص (٦٢).

(سەلمان العودە) لە کتێبەکەیدا باسی کۆمەڵێ لەو دەقانە دەکات، کە کتێبە شیعەییەکانو ریوایەتەکانیان فوداوەو ئاخنیویانە، لە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئەوە، ئەم دەقانە لەوەسیقە تۆمار کراوەکان دەچێت، کە موتەئەخیرینی شیعە نووسیویانە هەوڵی ئەوە دەدەن، کە ئینکاری عەبدوڵڵای سەبەء بکەن یان دوودڵی بخەنە هەواڵەکانییەوە بە بەڵگەی کاڵو کرچو سەرچاوەی زەعیفو ئەو سەرچاوانەی کە هەواڵەکان دەگێڕێتەوە[1]، کەسایەتی ئیبنو سەبەو حەقیقەتێکی مێژووییە هیچ لێڵییەکی تێدا نییە لە سەرچاوە سوننییەکانو لە سەرچاوە شیعییەکاندا چ ئەوانەی کۆن یان تازەکانیان وەکو یەك باسی عەبدوڵڵا دەکەن.

هەروەها لای زۆرینەی رۆژهەڵاتناسەکان وەکو (فلهاوزن[2]، فان فولتن[3]، لیفی دیلافیدا[4]، جولد تسهیر[5]، و رینولد نکلسن[6]، دواین رونلدسن)[7]، هەتاکو ئێستاش ئیبنو سەبەو جێگەی گومانەو بە ئەفسانە دەزانرێ، لای دەستەیەکی کەم لە رۆژهەڵاتناسەکان وەکو (کیتانیو بردنارد لویس)[8]، فرید لندر المتأرجع[9] با ئەوەش بزانین ئێمە پشت بە ئەمانە نابەستین لە رووداوەکانی مێژووماندا، ئەوەی سەرچاوەکان سەلماندوویانە، بڕیاریان داوە سەرچاوە کۆنەکان یان تازەکان لای سوننیو شیعە جەختی ئەوە دەکەنەوە کەێ یبنو سەبە وجودی هەیەو وجودەکەشی ریوایەتە مێژووییەکان جەختی لێدەکەنەوە، وە کتابەکانی عەقیدە بە لێزمە باسی دەکات، کتێبەکانی فەرمودەو پیاوانو مرۆڤو ویژەو زمان، باسی دەکەنو زۆربەی لێکۆڵەرو توێژەری

---

[1] المصدر نفسه.

[2] الخوارج والشيعة، يوليوس فلها وزن، ص(١٧٠).

[3] السيادة العربية والشيعية والاسرائيليات، ص (٨٠) فان فولتن.

[4] تحقيق مواقف الصحابة (٣١٢/١).

[5] العقيدة والشريعة تلاسلامية جولد شهير، ص(٢٩).

[6] تأريخ العرب الآدبي في الجاهلية وصدر الاسلامي، ص(٢٣٥).

[7] عقيدة الشيعة، ص(٥٨).

[8] أصول الاسماعيلية، ص(٨٦).

[9] تحقيق مواقف الصحابة (٣١٢/١).

فەرموودە ناسەکان لەسەر ئەم راستییە کۆکن، دەرکەوتووە یەکەمین کەسێ کە گومانی کرد لە وجودی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء هەندێ لە رۆژهەڵاتناسەکان بوون، پاشان زۆرینەی شیعە پاڵپشتی ئەم بۆچوونەیان کرد بە تایبەتی موحەدیسەکانیان، بەڵکو هەندێکیان ئینکاریی یەکجارەکی ئیبن‌و سەبەئیان کرد کە مرۆڤی وا هەر نەبووە، پاشان هەندێ توێژەری عەرەبی ئەم سەردەمە ئەوانەی کە سەرسامن بیروبۆچوونی رۆژهەڵاتناسەکان دەرکەوتن ئەمەیا رستووە، ئەوانەش کاریگەرن بە کتێبەکانی شیعەو موحەدیسەکان، بەڵام ئەمانە هەرهەموویان هیچ بەڵگەیەکیان پێ نییەو پاڵپشتیان نییە تەنیا گومان‌و ئینکارییە ئەم گومانەشیان داوەتە پاڵ ئەندێشەو واهیمەو گریمان[1]، هەرکەسێ دەیەوێت بە فراوانی بچێتەوە ناو ئەو سەرچاوەو مەرجەعانەی کەسوننی‌و شیعەو رۆژهەڵاتناسەکان نووسیویانە، لە ئیبن‌و سەبەو باسیان کردووە، با بگەڕێتەوە سەر ئەم کتێبانە (تحقیق موافق الصحابە فی الفتنە) لەنووسینی دکتۆر محمد أمحزون، عبداللە بن سبأ واپرە فی احداپ الفتنە فی صدر الاسلام لەنووسینی دکتور سلیمان بن حمد العودە.

٢- رۆڵی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء لە جوڵاندنەوەی فیتنەکەدا.

لە ساڵانی کۆتایی خەلافەتی عوسماندا لە ئاسۆی خەلافەتەوە شڵەژان سەری هەڵدا لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لە ئەنجامی هۆکارەکانی ئەو گۆڕانەی کە باسمان کرد، هەندێ لە جولەکەکان بۆ هەلێ دەگەڕان دەرکەوتنی هەڵچووەکان کە بوونە کەرەسەی فیتنەو ئەوانەی کە بە ئاشکرا موسڵمان بوون‌و لە ژێرەوە وانەبوون، بۆ خۆپاراستن ئیسلامیان وەرگرتبوو، یەکێ لەم جولەکانە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەو بوو، کە بە ئیبن‌و سەودا ناسراوە، ئەگەر لێ خوێندن‌و فوتێکردنی عەبدوڵڵای سەبەء دروست نەبێت وەکو هەندێ لە پێداگرەکان رۆڵەکەی لە فیتنەبازیدا[2] هەڵ دەئاوسێنن هەر بە جۆرەش دروست نییە بکرێتە گومان‌و دوودڵی‌و رۆڵەکەی بە سوك‌و بێ قاویلەت سەیر بکرێت، کە چ دەورێکی هەبوو لە هەڵگیرسانی فیتنەدا وەکو کەرەسەیەك لە کەرەسەکانی فیتنە، کە بەڵکو

---

[1] المصدر نفسه.

[2] مثال سعيد الافغاني في كتابه (عائيشة والسياسة).

ناهەموارترین‌و ترسناکترین هۆکاری فیتنەکە بوو هەرچەندە کەش‌و دۆخەکە ساز درابوو بۆ فیتنەو کۆمەڵێ هۆکاری تر دەستواری بوو، مەبەست لەو کارانەی ئیبن‌و سەبەو کردی ئەو راوبیرو باوەڕە بوو، کە بانگەشەی بۆ دەکردو خۆی هەڵیدەبەست بە کەیفی خۆی‌و دڵە جوولەکەیی‌یە کینەبازەکەیەوە دروستی دەکردو رێکیدەخست‌و بۆ مەرامەکانی رەواجی پێدەداو دەی هۆندەوەو ئامانجەکانی پێ دەچاند، ئەو کابرایە دەستێك بوو لە کۆمەڵگەی ئیسلامیداو ئیرەیی بەسەر بڵندی‌و یەکێتیی موسڵمانان دەبردو ئاگری فیتنەی هەڵدەخشان‌و تۆوی دووبەرەکی دەچاند لە نێوان تاکەکانی موسڵماناندان ئەم کابرایە لە جوولەی ئەو هۆکارانەبوو کە بوونە مایەی کوشتنی ئیمامی عوسمان‌و ئوممەت بوو بەگرۆ گرۆو حیزب حیزب[1].

پوختەی ئەم قەناعەتانەی عەبدوڵلا کە هاوردی لە سەرەتاوە کۆمەڵێ دەستپێکی راست‌و جوانی هێنا، بەڵام پەیامێکی بودەڵەو خراپی لەسەر بنیات ناو لە لای کاڵ فام‌و تیژپەڕەکان‌و هەوەسبازەکان رازاندییەوەو رەواجی پێدا، لەمەوە رێگەیەك لە رێگەکانی خواروخێچی خۆش کرد، بەڵام کەسانی چواردەوری باش حاڵی نەدەبوون لە رایەکانی بۆیە کۆبوونەوە لە لای ئەویش دەرگای قورئانی بۆ کردنەوە بە مەرامە گلاوەکانی قورئانی بۆ تەئویل کردن‌و بەم چەشنە وتی: (سەرم سوڕ دەمێنێت لەو کەسانەی گومانیان وایە عیسا دەگەڕێتەوە کەچی باوەڕیان نییە موحەممەد دەگەڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ)، کەواتە موحەممەد زیاتر شایەنی گەڕانەوەیە هەتا عیسا)[2]، هەروەها رێگەیەکی قیاسی فاسدی کردەوە بۆ بانگەشەکردن لەسەر ئیسپاتکردنی وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ عەلی، کە عەلی میراتگری جێگرەوەی بێت، بەم قسەیە پاساوی دەهێنایەوە، کە (هەزار پێغەمبەر هەبووە، هەر پێغەمبەرێکیش جێگرەوەی هەبووە، عەلیش جێگرەوەی موحەممەدﷺە)، پاشان دەیوت: (موحەممەد ﷺ دواهەمین پێغەمبەرە، عەلیش دواهەمین جێگرەوەیە)[3]،

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٢٧).

[2] تاريخ الطبري (٥/٣٤٧).

[3] المصدر نفسه.

کاتێ ئەم بۆچونانە لە ناخی شوێنکەوتەکانیدا جێگەی گرت ئیتر هەنگاوی نا بۆ ئامانجە نەخشەکێشراوەکانی، ئەویش دەرچوونی خەڵکە لە فەرمانی خەلیفە عوسمان، ئەم حەزو ئاواتەش لە ناخی هەندێ لەو کەسانەی چواردەوریدا سەری گرت، ئەویش پێی وت: (باشە کێ لەوە زاڵمترە، وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ بشکێنێو پێ بخاتە سەر وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ، خۆی بکاتە فەرمانڕەوای ئوممەت)، پاشان پێی وتن، کە عوسمان ئەم خەلافەتەی بە ناحەق وەرگرتووە، چونکە لە وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ لایداوە، ڕاپەڕن بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم کارەو بیجوڵێننو دەست بکەن بە توانجدان لە والییەکانی عوسمانو فەرمان بکەن بە چاکەو ڕێگری بکەن لە خراپە خەڵکیش مەیلی دەسوڕێ بەلاتانداو بانگیان بکەن بۆ ئەم کارە گرنگە[1]، بەم شێوەیە جارچییەکانی پرشو بڵاو کردو کتابو نووسراوی نووسی بۆ ئەوانە، کە نالەباربوون لە شارەکاندا ئەوانیش بۆیان دەنووسییەوە، ڕایەکەی خۆیانیان بە نهێنی دەهێشتەوە لەسەریشەوە خۆیان وا نیشان دەدا، کە فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکەن، نامەیان دەنووسی بۆ خەڵکی شارەکان بە نوسینێك بوو کە هەرچی نەنگیو خواری والییەکان بوو تیایدا دەنووسیو براکانیشیان لە شارەکان بەم چەشنە وەڵامی یەکتریان دەدایەوە، لەم شارەوە بۆ ئەو شار بەم دەستوورە ئەم جارچییەیانە هەر یەکەیان لە شاری خۆیدا بڵاویان دەکردەوە بۆ ئەوەی ببێتە چەرەساتی خەڵکی شارو بە پانتایی زەویدا پەخش ببێتەوە، ئەمانە ئەو مەبەستەیان هەبوو کە دەربڕیان نەدەکرد پێچەوانەی ئەو شتە دەجوڵانەوە کە ڕایان گەیاندبوو، بە پەنهانی کاریان دەکرد خۆیان دەر نەئەخست ئەهلی میسر وتیان (ئێمە سەلامەتین لەو شتانەی کە ئەوان پێوەی گیرۆدەبوون، ئەهلی مەدینە لە هەرهەموو شارەکانەوە نامەی گلەییو شۆڤاری هات بۆیان وتیان ئێمە سەلامەتین لەو شتانەی خەڵکی تێی کەوتوون)، لەم دەقەوە ئەو شێوازە دەردەکەوێت کە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء پەیڕەوی کردووە ئەویش ویستوویەتی کە کێشەو ناکۆکی بخاتە ناو خەڵکی لەنێوان دوو هاوەڵ لە چاوی خەڵکدا[2].

---

[1] المصدر نفسه.

[2] تاريخ الطبري (٣٤٨/٥).

یەکێکیان دابنێت بە حەق لێ زەوتکراوو مەزلوم ئەویش (عەلی)یە، دووهەمیشیان دابنێت بە حەقخۆر ئەویش عوسمانە، پاشان دوای ئەمە هەوڵی داوە خەڵکی ببزوێنێت بە تایبەتی لە کوفەدا دژی ئەمیری والییەکان بە ناوی فەرمانکردن بە چاکەو رێگری کردن لە خراپە، ئەمانەش بۆ بچوکترین رووداو دەخرۆشانە سەر والییەکانو دەوروژان، باش بزانە عەبدوللا زۆر گرنگی دەدا بەو عەرەبانەی کە کەرەسەیەکی خاو بوونو لە باربوون بۆ بەجێهێنانی پیلانەکانی ئەعرابە قورئانخوێنەکانیان هەڵدەناو ئیشتیبایان دەکردن بە ناوی فەرمان کردن بە چاکەو رێگری کردن لە خراپەو تەماعبازەکانیان بە پڕوپاگەندەی ڕەقاویو دەست هەڵبەست هەیەجان پێ دەکردنو دەیانهێنانە چەپۆکان لە دژی ئیمامی عوسمان، بۆ نموونە دەیان وت: عوسمان هەرگوێ بە خزمەکانی خۆی دەداتو بە لێشاو لە بەیتولمالی موسڵمانانیان پێ دەبەخشێو پاوەن قۆرغ دەکات بۆ خۆیو شتی تر لەو تۆمەتو تەشەرانەی کە دەروونی غەوغاچییەکانی پێ دەبزوا لە دژی عوسمان، پاشان ئەم کابرایە دەستەو تابیعەکەی خۆی تێزە دەدا بۆ ناردنی نامەو گەیاندنی هەواڵە خراپە هەراسانکەرەکان لە شاری خۆیانەوە بۆ شارەکانی تر بە هەمان شێوە خەڵکی هەموو شارەکان وا بیریان دەکردەوە بارودۆخ ئەوەندە خراپ بووە زیاتر هەڵناگرێو بارودۆخ تەواو تێکچووە، ئەوەی کە سوودی لە بارودۆخەکە وەرگرت سەبەئییەکان بوو، چونکە خەڵکی قسەکانی ئەمانی حەواندو کەڵکی ئەوەیان وەرگرت کە بڵێسەی ئاگری فیتنە هەڵگیرسێت لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا[1]، ئیمامی عوسمانیش هەستی کرد بەم حاڵەتە کە شتێك لە ژیانی شارەکاندا هەیەو گێژی دەدەنو ئوممەت دراوە بەشەڕو ئاژاوە، بۆیە وتی: (وەڵلاهی ئاشی فیتنە ئەگەڕێو دەستی پێ کردووە خۆشبەختی بۆ ئیمامی عوسمان ئەگەر بمرێ، بەلام دەستکاریی نەکاو نەیجوڵێنێت)[2].

ئەو شوێنە کە ئیبنو سەبەء کردی بە هێلانە لە میسر بووە لە میسریشدا کە سانێك هەبوو دەنگۆیان دەتەندەوە دژی عوسمان، خەڵکی دنە دەدا، کە روو بکەنە شاری مەدینە وروژاندنی فیتنە بینوی ئەوەی، کە عوسمان بە ناحەق خەلافەتی گرتووەتە دەستو عەلی

---

[1] الدولة الأموية، يوسف العش، ص(٦٨)، وتحقيق مواقف الصحابة (١/ ٣٣٠).

[2] تاريخ الطبري (٥/ ٣٥٠).

یان بە جێگرەوەی پێغەمبەر ﷺ حساب دەکردو باسی وەلی عەهدی پێغەمبەری ﷺ، مەبەستی ئیمامی عەلی بوو[1]، بە نووسینێك قۆپی کرد لە خەڵکەکە ئیدیعای ئەوەی کرد کە ئەم نوسراوە لە هاوەڵە مەزنەکانەوە ریوایەت کراوە، تەنانەت چوو بۆ لای ئەعرابەکانی مەدینەی منەورە کۆبوونەوەی کرد لەگەڵ هاوەڵاندا کەسی دەست نەکەوت پشتی بگریو لەسەری بێتو تەبەرایان کرد، لەو نامەو کیتابانەی کە درابووە پاڵیانو بە ناوی ئەوانەوە بڵاوی کردبووەوە، کە خەڵکی هان بدەن لەسەر ئیمامی عوسمان[2]، ئیمامی عوسمانیش هاتە رێگەی ئەم ئاژاوە چیانەو هەقو ناهەقی بۆ لێکدانەوە، بەڵکو وتووێژی لەگەڵ کردن دەربارەی ئەو شتانەی دابوویانە پاڵیو بەرپەرچی درۆ هەڵبەستەکانیانی دایەوە، کارە راستو دروستەکانی بۆ لیخن کردن، هەتا یەکێ لە ئەعرابییەکان کە مالیکی کوڕی ئەشتەری نەخەعی بوو وتی: لەوانەیە ئەمە فێڵێك بێتو بەسەر ئێوەدا بێت[3] ئیمامی زەهەبی دەڵێت عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء هەڵگیرسێنەری فیتنەیە لە میسرداو ئەو تۆوی دووبەرەکی میحنەتو تەنگو چەڵەمەی چاندووەو بەشاندوویەتی بەسەر والییەکاندا بەسەر ئیمامی عوسماندا[4] لەم کارەشدا ئیبنو سەبەء تەنیا نەبووە، بەڵکو کارەکانی لە ناواخنی تۆڕێکدا بووە لە موئامەرەچییەکانو هەزار پێیەك بووە لە دروستکردنی شێوازەکانی فێلو تەڵەکەو ساختەچییەتیو چنینو دۆزینەوەی ئەعرابو قورئانخوێنەکانیانداو غەیری ئەمانەش ئیبنو کەسیر ریوایەتی کردووە کە یەکێك لە هۆکارەکانی هاندان لەدژی عوسمانو هەڵنانی حزبەکان بۆ سەر عوسمان دەرکەوتنی عەبدوڵڵای سەبەء و رۆشتنی بوو بەرەو میسرو بڵاوکردنەوەی ئەو قسانەبوو کە لەلایەن دەروونی خۆی بەوە دایتاشیبوو هەڵیبەستبوو، خەڵکێکی زۆری ئەهلی میسری پێ موبتەلا بوو[5]، مێژوونووسو زانا

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٠)، تاريخ الطبري (٥/٣٤٨).

[2] تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٠)، تاريخ الطبري (٥/٣٦٥).

[3] تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣١).

[4] المصدر نفسه (١/٣٣٨).

[5] البداية والنهاية (٧/١٦٧، ١٦٨).

ناودارەکانی پێشینو ئەم ئوممەتەو پاشینەکەیشی ڕێکن لەسەر ئەوەی عەبدوڵڵای سەبەو لەناو موسڵماناندا بە کۆمەڵێ بیروباوەڕو هزرەوە دەرکەوتو پلانی سەبەئییەکانی کێشا بۆ ئەوەی موسڵمانان لە دینەکەیان دوورکەونەوەو پێچی تێدەنو لە گوێڕایەڵی ئیمامەکەیان دەرچنو دووبەرەکیو ناکۆکی بخەنە نێوان موسڵمانان، کۆمەڵێ خەڵکی ئاژاوەچی لە دەوری کۆبوویەوەو تاقمی سەبەئی لێ پێك هات ئەو سەبەئییەی کە ناسراوە بە هۆکارێ لە هۆکارەکانی ئەو فیتنەیەی کە بە کوشتنی ئەمیری ئیمانداران عوسمان کۆتایی هات، ئەوەی ئاشکرا بووە لە پیلانی سەبەئییەکان ئەوەیە، کە زۆر تەنزیمیان هەبووە، زۆر لێزان بوون لە ئاراستەکردنو پەخش کردنەوەی بیروبۆچوونەکانیاندا بۆ ئەوەی ببێتە جڵەوکێشی پڕوپاگەندەکانیو کاریگەری بخاتە نێوان ئاژاوەچیو کاڵفامو شوانەکان هەروەها زۆر چالاك بوون لە دروستکردنی لقو شانە لە بەسرەو کوفەو میسرو دەمارگیری خێڵایەتییان دەقۆستەوە وە مەکۆی نارەزایی ئەعرابو کۆیلەو ژێردەستەکانیان دەوروژاند زۆر لێزان بوون بۆ ئەو شوێنانەی کە لە ژیانی خۆیاندا حەساسنو بەچی حەساسییان بەرز دەبێتەوە[1].

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة، ص(٣٣٩).

## باسی یەکەم: هەڵگیرسانی فیتنە

درۆزنە داخ لەدڵەکان لە لابردنو بەرکەنارکردنی وەلیدی کوڕی عەقەبەدا سەرکەوتنو لە والییەتی کوفە لایان بردو عوسمانیش سەعیدی کوڕی عاصی دەستنیشان کردو کردی بە والی تازەی کوفە، کاتی سەعید گەشتە ویلایەتی کوفە چووە سەر مینبەرەکەو سوپاسو ستایشی خودای کردو وتی: (ئایا دەزانن فیتنەو ئاژاوە سەری دەرهێناو لەناوتاندا؟ وەڵلاهی ئەکێشم بە رومەتیدا هەتا لە بێخ دەری دەهێنم، یان زاڵ دەبێت بەسەرمدا ئەو رۆژە دەبمە جڵەوگیری دەروونی خۆم)[1].

پاشان سەعید سەردانی ئەهلی کوفەی کردو ئەحواڵی پرسینو راوبۆچوونی خەڵکی هەڵسەنگاند دەرکی کرد فیتنە قووڵ رۆچووە کۆمەڵێ خەواریجو داخ لەدڵو دوژمنی ئیسلام تۆپەڵیان بەستووە، بۆ فێڵ و تەڵەکەو ئاژاوە نانەوە، شوانو هەرچیو پەرچیو ئەعرابو ئاژاوەچییەکان چوونەتە سەر قەناعەتیان[2]، سەعیدیش نامەیەکی نووسی بۆ ئەمیری ئیمانداران عوسمانو هەواڵی ئەو وەزعە هەڵەقو بەڵەقەی کوفەی تێیدایە نووسیبووی: (ئەهلی کوفە کاروبارەکانیان هەڵشێواندووەو شلۆغ کردووە، خەڵکی ماقوڵو بەشەرەف پەراوێز خراوە پێشینو مێژینەکانیان فەرامۆش کردووەو ئەوەی دەنگی سوارە پاشینە پاشکۆکانو ئەعرابە رەجاڵەکانە تەنانەت کەسێکی ماقوڵو ئەزموونداری تێدا نییە!..)، ئیمامی عوسمانیش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە، نامەیەکی بۆ ناردو داوای لێ کردبوو بارودۆخی خەڵکی رێك بخاتەوەو لەسەر بنەمای جیهادو پێشینەیی پۆلێنیان بکاتەوەو ئەهلی عیلمو راستگۆو جیهاد بخاتە پێشی ئەوانی ترەوە، تێیدا نووسیبووی: (ئەهلی دەستپێشخەرو پێشینەکان بخە پێشی ئەوانی ترو فەزڵیان بدە بەسەر ئەوانی تردا، چونکە خودای گەورە لەسەر دەستی ئەمانە شارو وڵاتانی رزگار کرد، ئەوانەی کە دوای ئەمانە چوونەتە ئەو وڵاتانەو پاش فەتحکردن تێی چوون وەکو ئەعرابەکان بخە دوای پێشینە موجاهیدەکان مەگەر ئەو پێشینانەی، کە سستییان کردووە لە جیهادو گەیاندنی حەقو پێی هەڵنەستاونو پاشینەکانیان کردوویەتی،

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٨٠).

[2] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٣٣).

پێگەی هەموو مرۆڤێ بپارێزەو حەقی هەر هەموویان بە دادپەوەریی بدە، چونکە ناسینی کەسایەتی مرۆڤەکان دەتگەیەنێت بە دادپەروەری نێوانیان)[1].

سەعد هەستا بە جێبەجێکردنی تەوجیهاتەکانی عوسمانو هەوالّی دا بە خەلیفە کەچی کردووەو چۆنی کردووە، عوسمان هەستا ئەهلی (حلّ و عەقد)ی کۆکردەوە لە مەدینەو هەوالّی بارودۆخی کوفەی پێدانو باسی داچوونی فیتنەکەی کوفەی بۆ کردن، وێڕای لێپێچینەوەکانی سەعیدی کوڕی عاص کە رووبەڕووی بووەتەوە، ئەوانیش وتیان: (کارێکی پەسەندت کردووە پێکاوتە، ئەهلی فیتنە چاوشکێن بکەو بۆ هیچ شتێو مەیانخە پێشی خەلّکانی ترو خواردەمەنیو بژێوییان مەدەرێ و کارێکیان پێ مەسپێرە کە شایستەیان نەبێت، چونکە ئەگەر کارێك بدەیتە دەستیانو شایستەیان نەبێت ئەوکاتە جێبەجێی ناکەن، بەلّکو کاولی دەکەن)، ئیمامی عوسمانیش وتی بەوان: (ئەی ئەهلی مەدینە خەلّکی ملیان ناوە بەرەو فیتنە ئێوەش خۆتان ئامادەکەن بۆ رووبەڕووبوونەوەی، دەست بگرن بە حەقەوە بەم زوانە هەوالّی فیتنە دەبیستنو یەك بەیەکیتان بۆ دەگێڕمەوە)[2].

**یەکەم: هەوەسبازەکان ئازاریان دەچەشت بە چاکسازییەکان**

خەلّکی رەشۆکیو شوانو عەرەبە وشکەکان پەستو نارەحەتی ئەوەبوون هاوەلّە پێشینەکانو تێکۆشەرەکانو زانایانو خواناسەکانو ستەمدیدەکانیان دەخستە پێشی ئەوانو فەزلّیان دەدا بەسەریانداو بانگ دەکران بۆ کۆڕو دانیشتنو راوێژکردنو سەرۆکایەتی وایان لێ هاتبوو رەخنەو گلەییان دەگرتە ئەو والییانەی کە ئەمانەی پێش دەخستو راوێژی پێدەکردنو ئەم کارەیان بەفەرقو جیاوازیی دادەناو بە وشکیو ئایخیان حسێب دەکرد بۆ خۆیانو بەبێ رەواجیو نادانیان دادەنا بۆ خۆیان، مرۆڤە کینەبازوو دوابڕاوەکان ئەم رایەیان قۆستەوە لە دلّی خۆیانداو بێزاریو ناڕازییەتیان چاند لە دەروونی خەلّکدا دژی خەلیفەو دەولّەتو کارەکانی سەعیدی کوڕی عاصیان رەفز کردەوەو پڕوپاگەندەیان لە دژی سەعید بلاّوکردەوە لە نێوان خەلّکیدا، خەلّکی کوفە بە

---

[1] تاريخ الطبري (٥/ ٣٨٠).

[2] المصدر نفسه (٥/ ٣٨١).

گشتیی قسەو قسەلۆكی ئەم داخ لەدلانە رەفز كردەوە، بە دەرچوونیان دانانو بە قسەیان نەكردن، بەڵام داخ لە دڵەكان لێی بێدەنگبوونو دڕدۆنگییەكەیان شاردەوەو دەبریان نەدەكرد، چونكە زۆربەی زۆری موسڵمانان ڕەفزی قسەی ئەوانی دەكرد، بەڵام بە نهێنیی لایەنگرە عەرەبە دەشتەكییەكانو غەوغاچییەكانو داخ لە دڵە هەڵخەڵەتێنراوەكانیان تێ دەگەیاند [١]، دوژمنە سەرسەختەكان لە جوولەكەو گاورو ئاگرپەرستەكان موئامەرەیان دەكرد لە دژی ئیسلامو موسڵمانانو پڕوپاگەندەی درۆینەیان بڵاودەكردەوە لە دژی خەلیفەو والییەكانو ئەو هەڵەو سەهوانەیان دەچنییەوە كە لە هەندێكیان دەردەكەوت لە ئەنجامی هەیەجانی عامەی خەڵكی لە دژیانو سەدان درۆو ساختەو دەست هەڵبەستیان پێوە دەلكاند ئامانجیشیان بڵاوكردنەوەی فەوزاو بەرەڵڵایی‌و قوڵكردنەوەی تەفرەقە بوو لە نێوان موسڵماناندا ئەمانەشیان بۆ خزمەتكردنی كینەو داخ‌و غەیری خۆیان بوو دژی ئەو ئیسلامەی كە زاڵبووبوو بەسەر دیانەتە پوچەڵەكەیانداو نیزامی حوكمی ئیسلام دەسەڵاتی روخاندبوونو هەڵقەی وڵاتی دابوو، دەستی كێشابوو بە سەر سوپاكەیاندا، ئەم دوژمنانە خۆیان سازدابوو بۆ بە دەستهێنانی مەرامەكانیان، ئەم سەرسەختانە لە خەڵكی رەشۆكی شوانو گێل‌و گەمژە پێكهاتبوون، داخ لەدڵەكانیش چواردەوریان گرتبوونو تەمییان دەكردنو تیژیان دەكردنەوەو خێزەیان دەدان دژی خەلیفە یان یەكێك لە ئەمیرەكانی، ئەم دوژمنانە كۆمەڵەیەكی نهێنییان پێكەوەنا كە پڕ چەپەڵی بوو ئەو كەسانەیان كردە ئەندامی ئەم كۆمەڵەیە كە دەهاتن بە دەمیانەوەو بووبوون بە شوێنكەوتەیان لە شارە گەورەكانو هەرێمە تازەكانو تۆڕی پەیوەندیی نێوانیان كردبووە نهێنیی [٢] و گەورەترین لقی ئەم دەستە گڵاوە لە كوفەو بەسرەو میسر بوو، لە شامو مەدینەی منەوەرەش هەندێ ئەندامیان هەبوو [٣].

---

[١] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٣٤).

[٢] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٤).

[٣] المصدر نفسه ص(١٢٤).

**دووەم: عەبدوڵڵای سەبەئی جووڵەکە سەردەستەی عەصابەکان بوو**

عەبدوڵڵای سەبەئی تاوانکار وەسیەتی کردبوو بۆ شوێنکەوتەکانی لە ناو ئەو کۆمەڵە سرِییە نەگریسەدا کە لە هەموو شارەکاندا بڵاوەیان کردبوو، پێی وتن: (راپەڕن لەم پێناوەداو بوڵێنو سەرەتا دەست بکەن بە توانجو تەشەردان لە والیو ئەمیرەکانو ئەو کاربەدەستانەی کە خەلیفە دەستنیشانی کردوونو بشڵێن فەرمان بە چاکەو رێگریی لە خراپە دەکەین[1]، بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکی رابکێشن بە لای خۆتانداو بانگەشەیان بکەن بۆ ئەم شۆرشە)، عەبدوڵڵای سەبەء جارچییەکانی پرشو بڵاو پێکرد بە شارەکانداو نامەی نووسی بۆ شوێنکەوتەکانی ئەوانەی، کە گەندەڵ بوون لە شارەکانداو خۆیان دابووە پاڵ عەبدوڵڵا، ئەوانیش وەڵامی نامەکەیان دەدایەوە، عەبدوڵڵا شوێنکەوتەکانی دەجولاند لە شوێنەکانی تر بەڕاو بۆچوونەکانیو بانگی لایەنگرەکانی دەکرد بە نهێنی بۆ ئەوەی هەڵگەڕێنەوە لە والییو خەلیفە کار بکەن، بۆ لابردنی عوسمان لەسەر خەلافەتی ئەم دوژمنانە بە رواڵەت وایان دەردەخست کە فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپە دەکەن، بۆ ئەوەی کار بکەنە سەر دەروونی خەڵکیو سەرنجی خەڵك رابکێشنو فریبیان بدەن، شوێن کەوتەکانی ئیبنو سەبەء دەستیان کرد بە درۆ هۆنینەوەو هەڵبەستن لەبارەی هەڵەو عەیبی ئەمیرو والییەکانو لە کاتێکدا بڵاویان دەکردەوەو دەیان گەراند بە شارەکانداو بۆ یەکترییان نارد خەڵکی ئەم شارە کیتابی لێ خوێندنی دەنووسیو دەینارد بۆ شارێکی ترو پڕی دەکرد لە درۆو دەلەسە، خەڵکی شارەکانیش ئەم نوسراوە ساختەکارییەیان دەخوێندەوە بەسەر خەڵکداو گشتیی عەیب گرتنو هەڵە دۆزینەوەی والییەو ئەمیرەکان بوو دەیان بیست بۆ ئەوەی ئەوانیش گوێ هەڵخەن بۆ تەنگیو هەڵەی والییەکان خەڵکی شارەکانی تر دەیان وت ئێمە شوکر سەلامەتین لەو نارِەحەتیانەی هاتووە بەسەر موسڵماناندا هیچ کێشەیەکمان نییە، بەڵام ئەو قسانەی دەیان بیست تەصدیقیان دەکردو دەیان حەواند، ئا بەم شێوەیە سەبەئییەکان زەوییان گەندەڵ کرد، سەریان لە موسڵمانان شێواندو دروشمیان لەتو پەت کرد ناجۆرییان خستە نێوا برایەتیو یەکێتیی خەڵکەوە خەڵکیان دنەداو هەڵیان چاند دژی

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٤٨).

والی‌و ئەمیرەکان‌و چەندین ئیفتیراو پالآنتەیان بلآو کردەوە دژی خودی عوسمانی خەلیفە، ئا بەم تاوانە رێکخراوە موتالاکراوە، کە بەوپەڕی لێزانییەوە چنرابوو ئەو شتەیان دەیوست کە دەریان نەدەخست‌و ئەو مەرامەیان دەشاردەوە، کە بانگەوازیان بۆ نەدەکرد، ئامانجیان لابردنی ئیمامی عوسمان‌و دەستگرتن بە سەر دەوڵەتی ئیسلامدا[1] بوون ئیبن‌و سەبەء رووی کردە شام بۆ ئەوەی سەر لە هەندێ کەسی ئەوێ بشێوێنێت‌و سەرەنجیان راکێشێت، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو ئامانجە شەیتانییەکەی بەدی نەهات، چونکە مەعاویە لە کەمیندا بوو[2] بە تەوەرەی خۆیەوە بوو، چووە بەسرە بۆ ئەوەی شوێنکەوتووە سنوربەزێنەکان‌و داخ لەدڵەکان‌و شوانە گەمژەکان هەڵخزێنێ ئەوکاتە والی بەسەر عەبدوڵلای کوڕی عامری کورەیز بوو پیاوێکی بڕیاربەدەست‌و دادوەرو راساڵ بوو، کاتی ئیبن‌و سەبەء گەشتە بەسرە چووە ماڵی پیاوێکی پیس‌و نالەبار کە بە شەقاوەو چەتە ناسراوبوو ئەویش حەکیمی کوڕی جەبلە بوو[3]، هەواڵ گەیشت بە عەبدوڵلای عامر، کە پیاوێکی نامۆ لای حەکیمی کوڕی جەبلە لایداوە میوانی ئەوە، حەکیمی کوری جەبلە پیاوێکی دزو جەردەبوو، کاتێ سوپاکانی جیهاد گەڕانەوە بۆ بەسرە، حەکیم خۆی دواخست‌و نەگەڕایەوە بۆ ئەوەی لە وڵاتی فارسەکاندا فەساد بنێتەوەو غیرەتی ئەهلی زیمە بجوڵێنێت‌و دەستدرێژیی بکەنە سەر زەوی موسڵمانان‌و بە کەیفی خۆیان لێی ببڕن، ئەهلی زیمەو موسڵمانان سکالآیان گەیاندە ئیمامی عوسمان ئەویش نوسراوێکی نووسی بۆ عەبدوڵلا عامر پێی وتبوو: (حەکیمی کوڕی جەبلە) زیندانی بکەو مەهێڵە بچێتە دەرەوە، هەتا ئەقڵ‌و هۆشی دەردەکەوێت، عەبدوڵلای عامریش لە خانووەکەی خۆیدا زیندانی کردو نەیدەتوانی لە بەسرە دەربچێت، ئا لەو کاتەی کە حەکیمی کوری جەبلەی دزو جەردە لە ژێر مانەوەی زۆر کاریدا بوو، لە خانووەکەی خۆیدا، عەبدوڵلا سەبەئی جولەکە لایدا لای‌و رابەرایەتی[4] و کینەو داخ‌و

---

[1] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٢٦).

[2] المصدر نفسه.

[3] المصدر نفسه (١٢٨).

[4] الأزعر: سيئ الخلق.

گازندەو یاخیبوونەکەی حەکیمی قۆستەوەو سازیدا بۆ مەرامەکانی، حەکیمی جەبلە بوو بە داردەستی ئیبنو سەبەء لە بەسەرەدا، حەکیمیش هەستا سەرسەختە لەڕێ دەرچووەکان هاوچەشنی خۆی ناساند بە ئیبنو سەبەء، ئیبنو سەبەئیش ئەفکارەکانی خۆی چاند لە ناخیداو کردنی بەسەربازی کۆمەڵە سرپییە نەگریسەکەی، ئیبنو سەبەء کاتێ عەبدوڵڵای عامر زانی بە ئیبنو سەبەء بانگی کردو پێی وت تۆ کێی؟ وتی: من عەبدوڵڵای سەبەئم، پیاوێکی ئەهلی کیتابمو ئیسلامم بۆ باسکراوە منیش موسڵمان بووم، باسی پەنای تۆم بۆ کراوەو حەزم بە سایەی تۆیەو هاتوومەتە لاتان، عەبدوڵڵای عامر وتی: ئەم قسانە چییە لێتی دەبیستم لە ویلایەتی من دەرچۆ بڕۆ، عەبدوڵڵا لە بەسرە دەری کردو ئیبنو سەبەء بەسرەی بەجێهێشت، دوای ئەوەی چەند پیاوێك و چەند شوێن کەوتەیەکی تیا بە جێهێلاو کردنی بە لقێکی حزبی سەبەئی جوولەکە، ئیبنو سەبەء چوو بۆ کوفەو لەوێ کۆمەڵێ پیاوی موتحەریفی دەست کەوتو ئامادەباش بوون بۆ پیشوازی کردنیو سازیدانو کردنی بە حزبو جەماعەتی خۆیو لەوێ هێلانەی دروست کردو هێلکەی کردو جووجەڵەی هەڵهێناو کاولی کردو فەسادی نایەوە، کۆمەڵێ خەڵکی گەمژەو گاوانو لۆرە حەزیان پێ کردو خۆیان دایە پاڵی بە تایبەتی ئەوانەی کە داخ لەدڵو تاوانبارو یاخیبووەکان بووە، ئیبنو سەبەو پەیوەندی نهێنی پێکەوە دروستکرد لە نێوان بنکەکەی خۆیو شوێنکەوتەکانیدا لە مەدینەو بەسرەو کوفەو میسر، عەبدوڵڵا پیاوەکانی دەسوڕاند لە نێوان ئەم شارانەدا[1]، هەوڵو کۆششی ئیبنو سەبەء و دارو دەستەکانی ماوەی شەش ساڵی خایاندو کارە شەیتان ئاساکانیان لە ساڵی سیدا دەستی پێکردو لە کۆتایی ساڵی سیو پێنجی کوشتنی ئیمامی عوسماندا سەرکەوتنو لە درێژایی خەلافەتی ئیمامی عەلیدا هەر فەسادیان دەخستەوە، سەبەئییەکان بڕیارندا سەرەتای فیتنەکەیان لە کوفە دەست پێ بکەن[2].

---

[1] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٢٩).

[2] المصدر نفسه، ص(١٣٠).

**سێیەم: ئەهلی فیتنە لە مەجلیسی سەعیدی کوڕی عاصدا فەسادو ئاژاوەیان دەنایەوە.**

ڕۆژێ لە ڕۆژانی ساڵی (٣٣)ی کۆچی سەعیدی کوری عاص لە دانیشتنێکی گشتیدا دانیشتو عامەی خەڵکی لە چواردەوری بوو، لە نێوان خۆیاندا گفتوگۆیان دەکردو مشتومڕیان دەکرد، ئەم خەواریجە سەبەئییەیانە دزەیان کردە ناو ئەم مەجلیسەو کاریان بۆ فەسادو وێران کردنی دەکردو ئاگری فیتنەیان خۆش دەکردن قسەو وتوێژ هاتو چوو لەو دانیشتنەدا، لە نێوان سەعیدو یەکێ لە ئامادەبواندا، کە خونەیسی کوڕی حوبەیشی ئەسەدی قسەیەك دروست بوو، گرفت کەوتە نێوانیانو ڕای جیاوازیان هەبوو، حەوت خەواریجیش کە فیتنەچی بوون، ئاژاوەگێڕبوون لەوێ دانیشتبوون، ئەوانەش جوندوبی ئەزدی بوکە کوڕە دزەکەی خۆی کوشتی بە هۆی ئەوەی، کە بەشداریی کردبوو لە کێشەی پیاوکوژیداو یەکێکی تریان ئەشتەری نەخەعی بووە، ئیبنو ئەلکەواو بووە، صەعصەعەی کوری صوحان بوو، ئەم فیتنەبازانە ئەم هەلەیان گرتەوەو هەستان بۆ لێدانی خونەیسی ئەسدی لە مەجلیسەکەداو باوکی خونەیسیش هەستاو یارمەتی داو رزگاری کرد لێیاندا سەعیدیش هەوڵیدا دەستیان بگرێتو لە یەکتری نەدەن دەستیان هەڵنەگرتو کورو باویکان بوراندەوەو ڕایان کرد بە لێدان لەولاوە خێڵی ئەسەد هاتن بۆ تۆلەکردنەوەی نەوەکانیانو خەریك بوو جەنگ بکەوێتە نێوان هەردوو گرۆیەکە، بەڵام سەعید توانی کارەکانی چاك بکاتو ئاشتیان کاتەوە[1] کاتێ ئیمامی عوسمان بەم ڕووداوەی زانی داوای کرد لە سەعید کە ئەو مەوزوعە بەدانایی چارەسەر بکاتو فیتنەبازەکان بخاتە تەنگەبەرییەوە هەتا دەتوانێت، خەواریجە فتولەکان ڕۆشتنەوە بۆ ماڵی خۆیانو دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەندەو درۆ بوختانیان هەڵبەستن لە دژی سەعیدو لە دژی عوسمانو دژی پیاوماقوڵی ئەهلی کوفە، کوفە بێزارو بوو لێیانو داوایان کرد لەسەعید سزایان بداتو تۆڵەیان لێ بسێنێت، سەعیدیش پێی وتن عوسمان قەدەغەی کاری وایکردووە لێم، ئەگەر حەزدەکەن سزایان بدەم هەواڵ بدەن بە ئیمامی عوسمان، ئەشرافو راساڵەکانی ئەهلی کوفە نوسراوێکیان نوسی بۆ ئیمامی

---

[1] تاريخ الطبري (٣٢٣/٥).

عوسمان دەربارەی ئەم چەند کەسەو داوایان لێ کرد لە کوفە دەریان بکاتو دوریان خاتەوە، چونکە ئەمانە شەڕفرۆشو کاولکەری موفسیدن، عوسمانیش فەرمانی کرد بە سەعیدی کوری عاص والی خۆی لە کوفە دەریان بکات، ئەمانەش دە پانزە پیاو بوونو سەعید بە فەرمانی عوسمان ناردنی بۆ شام، بۆ ژێر دەستی مەعاویەو عوسمان لە بارەی ئەمانەوە نوسراوێکی نووسیو بۆ مەعاویە، پێی وت: (ئەهلی کوفە چەند کەسێك دەنێرن بۆ ژێر دەستی تۆ، ئەوانە بۆ فیتنەو گێچەڵ دروستکراون چاودێرییان بکەو دەستەمۆیان بکەو گیریان بدە، ئەگەر زانیت ژیر بوونو ئەفامن داوایان قبوڵ بکە)[1]، ئەوانەی کە بە تەواوی دوور خرایەوە بۆ شام ئەمانەبوون، ئەستەری نەخەعیو جوندوبی ئەزدیو صەعصەعەی صوحانو کومەیلی کوڕی زیادو عومەریبو کوڕی چابی ئوئیبنو ئەلکەوا و بوون[2].

**چوارەم: فیتنەبازەکان دووخرابوونەوە بۆ لای مەعاویە**

کاتێ ئەمانە گەشتنە لای مەعاویە بە خێری هێنانو لە کەنیسەیەك کە پێی دەوترا کەنیسەی مەریەم دااینیشاندنو بە فەرمانی عوسمان چیان لەگەڵ کرابوو لە عێراق ئەویش بۆی دەستەبەر کردنو بەردەوام نانی بەیانیو ئێوارەی لەگەڵ دەخواردن رۆژێ پێی وتن ئێوە گرۆیەکن لە عەرەبو ددانو زمانتان هەیەو لە ئیسلام تێگەشتوونو پێی بەشەرەف بوونو بەسەرگەلانی تردا سەرکەوتوونو پلەو میراتەکەیتان بەرکەوتووە، لەبەری حەساونەتەوە پێم گەشتووە ئێوە رەخنە دەگرن لە هۆزی قورەیشو رقتانە لێیان، ئەگەر قورەیش نەبوایە ئێوەش یەکێك بوون لە کۆیلەو سەرشۆڕشەکان وەکو جارانی قورەیش[3].

ئیمامی عوسمان هەستی کردبوو کە مەعاویە بۆ کێشە زمان پاراوەو خۆشخوانەو لەسەر خۆیەو بە ئارامەو خاوەنی ژیریو رەئی پەسەندەو ئاوەزایەکی وای هەیە دەتوانێت رووبەڕووی فیتنە ببێتەوە هەر بۆیە کاتێ کێشەکان دروست بوونو رایەکانیان ئاشکرا

---

[1] تاریخ الطبري (٥/٣٢٤).

[2] الخلفاء الراشدون، ص(١٣١).

[3] تاریخ الطبري (٥/٣٢٤).

بوو ناردنی بۆ لای مەعاویە بۆ ئەوەی بنەبڕی بکات بە کردەوەش مەعاویە هەرچی توانیو هەرچی زانی سەرفی کرد بۆ قەناعەت پێکردنی ئەم کەسانە، لە سەرەتاوە ڕێزی لێ گرتنو تێکەڵاوی کردنو لە گەڵیاندا دانیشتوو لە نهێنییەکانیان تێگەیشت لە ماوەی ئەو دانیشتنانەدا پێش ئەوەی حوکم بدات بەسەریاندا گرژیو ناهەمواری نێوان خۆیو ئەوانی ڕامالّی تێبینی کرد کە نەعرەتەی خێلگەرییە دەیانجولێنێتو شەهوەتی حوکمو دەسەلاّت گرتنە دەست دەیان وروژێنێت هەمیشە لەم دوو گۆشەوە جیۆزەنی دەکران.

یەکەم: کاریگەریی ئیسلام لە بنیاتنانی عیززەتی عەرەبدا.

دووەم: ڕۆڵی قورەیش لە بلاّوکردنەوەی ئیسلامو هەڵگرتنی ناڕەحەتییەکانی.

مادەم ئیسلام شوێندەستی دیارە لە پێکەوەنانی عەرەبدا پێویستە وریاییو چاودێری ئەوە بکەنو پاشان وێنەی عەرەب لە پێش چاوی خۆتان دابنێنو باش بزانن بە هۆی ئیسلامەوە کەوتن بە باری یەك ئومەتیداو چوونە ژێر ڕکێفی یەك ئیمامەوەو ژیانی بێ سەروبەرو خوێنڕشتنو خێلگەرایەتی بۆگەن کردویان واز لیێهێنا کۆتایی پێهات[1]، پاشان مەعاویە درێژەی بە قسەکانیداو پێی وتن ئیمامەکانتان بۆ ئێوە لەم ڕۆژدا قەڵغانە بۆتان[2] تەقەمەکەن لە قەڵغانی خۆتان، ئیمامەکانی ئەمڕۆتان خۆیان دەگرن گەر زوڵمیشیان لێ بکەنو تەحەمولی ئاتاجەکانتان دەکەنو ژیانتان بۆ فەراهەم دەکەن، وەڵڵاهی ئەگەر واز نەهێنن خودای گەورە بەڵایەکتان بەسەر دێنێت، جەزرەبەتان بدات، پاشان ئێوەش خۆتان ناگرن، ئینجا دەبنە برابەشتان لەو ماڵو سامانەی کە بە هەناسەساردی پەیداتان کردووە لە ژیانی دونیاو پاش مردنیشتان.

پیاوێکی لەو تاقمە وتی: ئەوەی کە وتت لە بارەی قورەیشەوە، قورەیش زۆرینەی عەرەب نییەو لە سەردەمی نەفامیشدا بەهێز نەبوو هەتا لێیان بترسین ئەوەی کە وتت لە بارەی ئیمامەکانمان قەڵغانن ئەگەر قەڵغانەکان کونبوون تیردەگاتە ئێمەش، مەعاویە وتی: ئێستا ئێوەم بۆ دەرکەوت باش دەزانم بێ ئەقڵی ئێوەی فریو داوە، تۆش وتاربێژی

---

[1] معاوية بن أبي سفيان، لمنير الغضبان، (١٠١).

[2] جنة: وقاية.

ئەم تاقمەی، بەڵام ئەقڵت تیا بەدی ناکەم، من پەیامی ئیسلامت بۆ دەنرخێنم‌و ئیسلامت دەخەمەوە یادت، کەچی تۆ باسی سەردەمی نەفامی دەکەیت، من ئامۆژگاریت دەکەم، کەچی تۆ وابیر دەکەیتەوە ئەو قەڵغانەی لەبەرتایە کون کونێن دەبێت ئەوەی ئیمانی درزی تێ بچێت بەرەو بەهەشت ناچێت، خودای گەورە ئەو کەسانە سەرشۆڕکات کاری ئێوە بە چاك‌و پەسەند دەزانێت‌و دەچێتە لای پێشەواکەتان[1].

مەعاویە بەو ئاماژە سەرپێییانە تێگەیشت کە ئەمانە قەناعەت ناهێنن پێویستە راڤەیەکی تێرو تەسەلی واقیعی قورەیشیان بۆ بکات، یەکەمجار وتی: (تێ بگەن هەرچەند گومان نابەم تێ بگەن، قورەیش سەربڵند نەبووە نە لەسەردەمی نەفامی‌و نە لە سەردەمی ئیسلامدا، تەنیا بە رەحمی خوا نەبێت، زۆرینەی عەرەب نییەو لە عەرەبەکانیش بەهێزتر نییە، بەڵام قورەیش رەچەڵەکی لە عەرەبەکان بەرێزترەو رەگەزی پاکوخاوێن ترە، ورپاکردنەوەی لەوان گەورەترەو جوامێری لەوان تەواوترەو لەو کاتەی کە خەڵکی یەکتری دەخوارد لە سەردەمی نەفامی قورەیش بە هۆی ئەو خودایەی کە غیرەتی دا بە هەرکەسێ زەلیل نابێت‌و هەرکەسێکی بەرزکردەوە بە ئاسان ناخرێت، بەرەڤانی دەکرد لە خۆی، ئایا دەزانن هەرچی عەرەب‌و عەجەم‌و رەش‌و سوور هەیە زەمان پێوەی داوە لە شاری خۆیداو بەبێ بەشکراوە بە هۆی وڵاتەکەیەوە تەنیا قورەیش نەبێت، هەرکەسێك فێڵێکی کردبێت لێیان داوی بۆ داخستوون خودای گەورە سەرشۆڕی کردووەو پوچەڵی کردووە، هەتا ئەوکاتەی خودای گەورە ویستی کەسە بەرێزەکان‌و شوێنکەوتەی دینەکەی قوتار کات لە هیچ‌و پوچی دونیاو گەرانەوەی قیامەت بۆ ئەم مەبەستەش بە چاکترین دروستکراوی خۆی رازی بوو کە قورەیشی بوو، پاشان ئەم دەسەڵاتەو ئەم مەملەکەتە لەسەر ئەوان بنیات نراوەو خەلافەت دراوە دەستی ئەوان بۆ کەس شیاوی نییە بۆ ئەوان نەبێت هەر بۆ ئەوان گونجاوە، خودای گەورە پەرژینی کردوون، چونکە ئەوان لەسەر دینی ئەون خودای گەورە لەسەردەمی نەفامیشدا پاراستبوونی لەو مەلیکانەی کە ئێوەی دەچەوساندەوەو کردبوونی بە کۆیلە، قوڕ بەسەر تۆو رەفیقەکانت، خۆزگە جگە لە تۆ کەسێکی ترتان قسەی بکردایە، بەڵام تۆ دەستت

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٢٤).

پێکرد خۆت هەڵقورتێنیت، بەس تۆ ئەی صەعصەعە گوندەکەی تۆ خراپترین ئاوایی عەرەبییەو بۆگەنترین گیای لێ سەوز دەبێت، وا لە قوڵترین دۆڵداو خراپترین گوندە لە شەڕانیدا زۆر عەزیەتدەری دراوسێن‌و هیچ ماقوڵ‌و ئاینێکی تیا نیشتەجێ نەبووە، ئیللا قسەی پێ وتووە جنێوی پێدراوەو هەمیشە جنێوی گەنیوی بەسەرەوە بووەو قەبیحترین عەرەبن لەناو ناتۆردا گەلێکن پڕن لە نەزعەی خێڵگەری[1] ئێوە دراوسێی دەستنوس‌و کردارەکانی فارسن، هەتا ئەوکاتەی بانگەوازی پێغەمبەرتان ﷺ پێگەیشت‌و ئەم بانگەوازە ئاوەژووی کردووە ئێوە خەڵکێکی یاخی‌و کێوی بوون‌و غەریب بوون بەم ژیانەن لە عەممان[2]، بەحرەین ئۆقرەتان نەگرت هەتا خەڵکەکەی کردە هاوبەشی بانگەوازی پێغەمبەر ﷺو ئێوەش بەشداربوون، تۆ خراپترین کەسی هۆزەکەتی هەتا ئەوکاتەی ئیسلام دەریخستی‌و تێکەڵاوی دەوروبەری کردی‌و زاڵی کرد بەسەر ئەو گەلانەی کە کوێخات بوون، ئێستاش ملت ناوەو دەتەوێ لاروخواری بخەیتە دینی خوداوەو ئوممەت بەرەو رسوایی‌وماڵوێرانی ببەیت، قورەیش بەتۆ ناکەوێت‌و زیانیان پێ ناگات‌و هیچ شتێك رێگەی کارەکانیان لێ ناگرێتەوە لەبەشیان کەم ناکاتەوە، شەیتان لە ئێوە بێئاگا نییەو دەزانی ئێوە لە ناو ئوممەتدا شەڕانی‌و نەگبەتن‌و بەهۆی ئێوەوە خەڵکی فریب دەکات، شەیتان پاڵەوانتانەو گەردنگیرتان بووەو، دەزانێت کە ناتوانی ئەو بڕیارە رەد بکاتەوە کە خودای گەورە بڕیاری لەسەر داوەو هیچ کاریکی پێ نادرێتەوە کە خودا ویستی هەبێت لەسەری، ناگەن بە هیچ ئاواتێك بە هۆی شەڕو ئاژاوەوە ئیللا خودای گەورە لەمە خراپترو رسواترتان بەسەر دێنێت)، پاشان هەستاو رۆشت‌و بەجێی هێشتن، دەستیان کرد بە بێنەو بەردەو ناخی ئەوانی بەم خاڵانە هەڵڕشت[3]، ئابەم چەشنە مەعاویە هەرچی لە توانایدا هەبوو لە هزرو رۆشنبیری سیاسەت بۆ قەناعەت پێکردنیان خەرجی کردو بەخشی.

---

[1] النزاع: جمع نزيع وهو الغريب.

[2] الشطير: الغريب.

[3] تاريخ الطبري (٥/٣٢٦).

لەسەرەتاوە وەزعی قورەیشی بۆ باسکردن لە سەردەمی نەفامیو سەردەمی ئیسلامیدا ـ هەروەها لە خێڵو تیرەی ئەم کەسانە کۆڵیوە، کە وەزعیان چۆنبووە لە سەردەمی نەفامیدا کە چەند گیرۆدەبوون بە دەس خراپی کەشو هەواو گژوگیای بۆگەناوییەوە لە رووی سروشتەوە، پاشان رسواو ئەڵقەلەگوێی فارس بوون، لە رووی سیاسییەوە هەتا خودای گەورە بە هۆی ئیسلامەوە بەرپزی کردن غیرەتێك بوو دوای زەلیلیو بەرزییەك بوو دوای دەستەو خواری، هەروەها تیشکی خستە سەر صەعصەعەی وتاربێژی ئەم تاقمە، کە چۆن چۆنی دێرخێزی کردووە، لە وەڵامدانەوەی بانگەوازی ئیسلامداو هۆزەکەی هاتووەتە ناو دینو ئەو یاخی بووە، پاشان گەڕاوەتەوەو هاتووەتە ئامێزی ئیسلامو بۆ جاری دووەم ئیسلام بەرزی کردووەتەوە دوای ئەوەی لاریی کرد، هەروەها مەعاویە پیلانەکانی صەعصەعەی کەشفو بە چ جۆرێ دەیانەوێت فیتنە بخەنەوەو دەیانەوێت دینی خودا لاروخوار بکەن.

بە راستی شەیتان داینەمۆی ئەم فیتنەیە بوو، بزوێنەری ئەم گێچەڵەبوو، بەم شێوەیە مێژووی ئەم ئوممەتە پەیوەستکرابوو بە خوداوە، پاشان بە ئیسلامو عەقیدەوە، ئینجا پۆخڵکاری ئەم کەسانە دەرکەوتو لە دواییدا رسواشی کردن، مەعاویە خشتەکانی پیلانەکانیانی دەرخست، کە پەیوەندی بەسەردەمی نەفامییەوە هەیە[1] و رەگی کۆنی هەیە، لە دواهەمین دانیشتنی مەعاویەو ئەم تاقمەدا مەعاویە هاتە بەردەمیانو بەدوورودرێژی وتوێژی لەگەڵ کردن، پاشان وتی: (ئەی براینە وەڵامی باشم بدەنەوە یان بێدەنگ بنو بیری لێ بکەنەوەو بزانن چی سوودی خۆتانو کەسەکانتانی تێدایەو سودی تیرەکەتانی تێدایەو سوودی گرۆی موسڵمانانی تێدایەو بەدوای ئەو سوودانەدا بگەڕێن، خۆتان بە باشی دەژینو ئەوانی تریش لە پاڵتاندا دەژین)، صەعصەعە وتی: (تۆ شیاوی ئەم دەسەڵاتە نیتو هیچ رێزێکت نییە بەسەرمانەوە هەتا لە سەرپێچیدا بەگوێت بکەین).

مەعاویە وتی: ئەوە نییە من لەسەرەتاوە فەرمانتان پێ دەکەم کە لە خودا بترسنو گوێڕایەڵی بکەنو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەنو دەست بگرن بە گوریسی

---

[1] معاوية بن ابي سفيان، للغضبان، ص(١١١).

خوداوەو دووبەرەکی مەنێنەوە. وتیان: نەخێر، تۆ فەرمان بە تەفرەقەو پێچەوانەی نامەی پێغەمبەر ﷺ دەکەیت! وتی: (من ئێستا فەرمانتان پێ دەکەم لە خودا بترسن‌و گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر ﷺ بن، ئەگەر پێچەوانەی ئەمەم وتووە تەوبە دەکەم‌و پەشیمانم، دەست بگرن بە گرۆی موسڵمانانەوەو تەفرەقە فڕێدەن‌و ڕێزبگرن لە ئیمامەکانتان‌و بە پێی تواناتان هاوکارییان بکەن، لە کاری چاکەداو ئامۆژگارییان بکەن بە نەرمی لەوکارانەی نادروستە).

صەعصەعە وتی: (ئێمە داوا لە تۆ دەکەین دەست لە کارەکەت هەڵبگرە لە نێو موسڵماناندا لە تۆ شیاوتر هەیە)، مەعاویە وتی: کێ هەیە؟ وتیان: ئەو کەسە هەیە کە باوکی لە پێش باوکی تۆوەیە لە ئیسلامداو خۆشی زۆر لە پێشترە لە ئیسلامەتیداهەتا تۆ، مەعاویە وتی: وەڵڵاهی من لە ئیسلامدا پێشینەییم هەیە غەیری منیش کەسانێك هەن لە من لە پێشترن، بەڵام لە سەردەمی مندا کەسێك نەبووە دەستی بشکێت بەسەر ئەوەی کە من کردوومە، لە من بەهێزتر بێت عورمەی کوڕی خەتتابیش ئەم سیفەتەی تیا بەدی کردووم، ئەگەر کەسێکی تر هەبوایە لە من بەهێزو سەلیقەدارتر عومەر نەیدەکردمە سەرپەرشتیار هەوادەت، نەك من هیچ کەسێکی تری نەدەکردە کاربەدەست ئەگەر شیاو نەبوایە، هەروەها هیچ ڕووداوێکم لێدا نەکەوتووە کە پێویست بکات دەست لە کارەکەم هەڵگرم ئەگەر خودای گەورەش بیەوێت دەست هەڵگرم دەپاڕێمەوە لە خودا یەکێك بخاتە جێگەم، لە من باشتر بێت، ئەگەر موسڵمانان‌و ئەمیری ئیمانداران بیانەوێت من دەست هەڵگرم بەدەست خەلیفە نووسراوێکم بۆ بێت دەست هەڵگرم دەست لەکار دەکێشمەوە، جوانە زۆر جوانە خۆکێشانەوەو هاوشێوەکانی ئاواتی شەیتانەو مەرامی ئەوە لەم پێیە بڕوات دەبینین ئەگەر کاروبار بە ئەندێشەو بۆچوونی ئێوە بچێت بەڕێوە کاروباری ئەهلی ئیسلام شەوو ڕۆژێك ناخایەنێت، بەڵام ئەوەی باشە خودای گەورە خۆی بڕیار دەدات‌و بەڕێوەی دەبات‌و کارەکانی جێ جێبەجێ دەبێت، شەیدای چاکە بن‌و چاك بڵێن، وتیان تۆ شایستەی فەرمان ڕەوایی نیت، مەعاویە وتی: بزانن خودای گەورە باڵادەستی‌و تەنگوچەڵەمەی زۆرە، من دەترسم لە سەرەنجامی ئێوە، کە بکەونە شوێن هەنگاوەکانی شەیتان هەتا واتان لێ دێت گوێڕایەڵی کردنی شەیتان‌و سەرپێچیکردنی ڕەحمان بە حەڵاڵ و چاك بزانن، لەم دونیا پڕوپوچەدا بکەونە بەر عەزابی

خودایی لە سەرەتای ئەو کارەی دەستان تێداوەو رسوایی هەتاهەتایی بێ بەسەرتاندا، لە کۆتاییدا هەستا پەلاماریان داو ریش‌و قژی سەریان راکێشا، مەعاویە وتی: بەسە وا مەکەن، ئەمە خاکی کوفە نییە وەڵڵاهی ئەگەر ئەهلی شام بتان بینن، ئاوەها دەکەن بە من‌و منیش ئیمامی ئەوانم ئەوکاتە من ناتوانم قەدەغەیان بکەم دەتان کوژن قبوڵ ناکەن، خودا دەزانێت دەس‌و دەهەنەتان هەمووی لەیەك دەچێت، پاشان هەستا لە ناویان‌و رۆشت، وتی: (وەڵڵاهی ئیتر نایەمە ناوتان بە هیچ جۆرێك تا من ماوم)[1].

ئەمە دواهەمین مەحاوەلەبوو، کە مەعاویەی ئەمیری شام هەموو کۆششی خۆی تێدا سەرف کردو هێمنی‌و رۆشنبیری میشکی خۆی تیا بەکار هێنا بۆ ئەوەی هەڵایان وێرێت لە فیتنەگەری‌و بانگی کردن بۆ لەخواترسان‌و گوێڕایەڵی کردن‌و دەستگرتن بە جەماعەتی موسڵمانانەوە دووربکەونەوە لە تەفرەقە.

ئەوانیش دروشمەکەیان بە دەنگی بەرز دەوتوو دەیان وت مافی گوێڕایەڵیت نییە لەسەرپێچی خودای گەورەدا[2]، بە هێمنییە گەورەکەی‌و سنگە فراوانەکەی چووە ناویان‌و ئامۆژگاریی کردن‌و بیری خستنەوە کە فەرمانی سەرپیچی خودای گەورەیان پێ ناکات‌و بە گوێرەی گومانی خراپی ئەوان تەوبەی کرد لەو تاوانەی کە کردوویەتی گەر وابێت، پاشان دووبارە بانگهێشتی کردن بۆ گوێڕایەڵی خوداو هاتنە ناو گرۆی موسڵمانان‌و دوورکەوتنەوە لە پەرت‌و بڵاوکردنی دروشم‌و بەکێتیی ئوممەت، ئەگەر ئامۆژگارییەکان لەگەڵیانا دەدۆزرێنەوە، دەبوو دڵگیری ئەم هەڵسوکەوتە جوانە بن بەو نەرم‌و نیانییە کار بکەین‌و شەرمەزاریی هێمنی مەعاویە بن، بەڵام ئەوان ئەو جۆرە مامەڵەیان بە لاوازی‌و بێ دەسەڵاتی دەزانی بە تایبەتی کە بە شێوەیەکی نەرم‌و ئەسپایی مامەڵەی لەگەڵ دەکردن‌و بەسەکاماتی ئامۆژگاریی دەکردن، ئالەم سۆنگەوە بواریان دەستکەوت‌و بۆ رەخسا نهێنییەکانی دڵی خۆیان دەر بخەن ئازادانە رای خۆیان بڵێن، وتیان ئێمە فەرمان بەتۆ دەکەین کە دەست لەکاری فەرمانڕەوایی هەڵگرەو لە ناو موسڵماناندا لەتۆ شیاوتر هەیە، مەعاویە کتوپڕ تێگەیشت لە سڕی ناو دڵیان پێی

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٣٠ ـ ٣٣١).

[2] المصدر نفسه (٥/٣٣٠).

خۆشبوو ئەو لایەنە تاریگە بزانێت بۆ ئەوەی بزانێت کێ هەڵیان دەسوڕێنێتو داردەستی کێنو کێ ئەم توانجو غەمزەداڕێژراوانە دەخاتە میشکیان، بەڵام ئەوان ئەو شتانەیان دەشاردەوە، کە حەشاریان دابوو تەنیا ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە پێیان خۆشبوو، کە مەعاویە دەست لەکار بکێشێتەوە، بۆ کەسێکی تر، کە لەو بەڕێزترەو باوکی لە باوکی ئەفزەڵترە، پاشان مەعاویە زیاترو زیاتر خۆی دەگرت، هەرچەند ئەوان شێوازێکی دەم روتانەیان لەگەڵدا پیادە دەکردو فەرمانیان دەکرد مەعاویە دەست لەکار هەڵگرێ.

ئالێرەدا روالەتی دیدی مەعاویە بە جوانی دەخەینە روون بەرامبەر حوکمو ئەمیریەتیو رابەرایەتیو قیادەکردن، مەعاویە بە کورتی جوابی دانەوە لە شەش خاڵدا، کە گرنگو بنەڕەتین:

١ـ دەست پێشخەریو پێشینەیی هەبووە لە ئیسلامداو پارێزەری کەلە بەرەکانی شام بووە، دوای مردنی یەزیدی کوڕی.

٢ـ لەناو موسڵماناندا لەو بەڕێزترو ئەفزەڵترو چاکترو ئەوبەرترو ستەمدیدەتر هەبووە، بەڵام من بەهێزتربووم بە برشتربووم بۆ پاراستنی کە لەبەرە گەورەکانی ئیسلام لە شام لەوەتی مەعاویە بووەتە سەرکاری شام توانیویەتی رێکبخاتو سیاسەتمەداری کاتو لەناخیان تێگەشتووەو چووەتە دڵیانو خۆشیان ویستووە.

٣ـ ئەو ترازووە حەساسەو ئەو پێوانە ورد کێشەی کە والییەکانی پێ دەکێشرا عومەری کوڕی خەتاب بوو، کە بۆ رەزامەندی خودای گەورە گوێی لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەگرت، ئەگەر لە مەعاویەدا هەڵێتو پەڵێتو سەرپێچیو لاوازیو لادانی شك ببردایە لای دەبردو فەسڵی دەکرد، بە درێژایی خەلافەتی عومەر والی بووەو تاقە رۆژێك لانەبراوە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ کردویەتی بە سەرپەرشتیاری هەندێ لە کارەکانیو کردویەتی بە نووسەری بەردەستی خۆیو ئەبوبەکری صدیقیش لە دوای ئەو کردوویەتی بە سەرپەرشتیارو کەس رەخنەی نەبووە لە تواناو لێهاتوویی موعاویە.

٤ـ دەست لەکارکێشانەوە پێویستە بە هۆی ئەو هۆکارانەوە بێت کە پیویستی بە لابردن بکات، ئیتر ئەو فیتنەبازانە ئەو جارچییانە بەڵگەیان چی بوو کە بیخەنە روو بۆ لابردنو دەستهەڵگرتنی مەعاویە.

٥ـ ئەوەی کە بڕیار دەدات ئەمیرەکان لەسەر کار لاچن، یان بمێننەوە ئەم دیعایە چییانە نییەو حەقی ئەمانە نییە، بەڵکو مافی ئەمیری ئیماندارانەو حەقی ئیمامی عوسمانە والی لاببات‌و دامەزرێنێت.

٦ـ ئەمیری ئیمانداران عوسمان هەر ڕۆژێ بڕیاری لابردنی مەعاویە بدات، بڕیارەکەی جێگەی جێبەجێ کردنە، چونکە ئەمیرێکی گوێ بۆگیراوو خەلیفەی موسڵمانانە.

ئابەم شێوەیە کۆتایی بە کۆبوونەوەکان هات، مەخابن زۆر بەداخەوە بە ناسۆری‌و ئازار کۆتایی هات‌و ئاگاداری کردن کە بەڵاو غەزەب‌و خەشمی خودا نزیکەو وریای کردنەوە لە تەڵەکەکانی شەیتان‌و خلیسکانەکانی‌و ترساندنی لە تەفرەقەنانەوە لە دروشمی موسڵمانان‌و سەرپێچی کردنی ئیماندارو ترساندنی لە گوێڕایەڵی کردنی هەوەس‌و فریبەکان‌و ئەوان لە موقابیلدا چییان کرد پەلاماریان داو ریش‌و سەریان ڕاکێشاو ئەویش دەستی فڕێدان‌و ترێزی لێکردن‌و دوورکەوتەوە لێیان‌و قسەیەکی ڕەق‌و پڕ لە هەڕەشەی ئاراستە کردن‌و تێگەیشت کە ئەمانە موستەحیلە مل بدەن بۆ حەق، زۆر پێویست بوو دەنگوباسیان بگەیەنێت بە ئەمیری ئیمانداران‌و ناسنامەیان کەشف بکات‌و مەترسییان ڕابگەیەنێت بۆ ئەوەی خەلیفە ڕایەکی تر دەربڕێت‌و چارەسەرێك بدۆزێتەوە[1].

**مەعاویە نوسراوێکی نووسی بۆ عوسمان لە بارەی فیتنەبازەکانی کوفەوە**

مەعاویە نوسراوێکی نارد بۆ عوسمان وتبووی: (بەناوی خودای گەورەو دلۆڤان، بۆ بەندەی خوا عوسمانی ئەمیری ئیمانداران لە مەعاویەی ئەبی سوفیانەوە، پاش سوپاس‌و ستایشی خودای گەورە، ئەی ئەمیری ئیمانااداران تۆ تاقمێکت ڕەوانە کردووە بۆ لای من، ئەوانە بە زمانی شەیتانەکان قسە دەکەن‌و کۆڵ نادەن لە شەیتانگەری‌و خەڵکیش دێنە لایان‌و وا دەزانن ئەمانە لە ڕوانگەی قورئانەوە قسە دەکەن‌و سەر لە خەڵکی تێکدەدەن‌و هەموو کەسێك تێناگات ئەمانە چ مەرامێکیان هەیەو بە تەمای چین، ئەمانە مەبەستیانە تەفرەقە دەنێنەوە گێچەڵ هەڵدەخزێنن‌و ئیسلامەتی قورسە لەسەریان‌و هەناسەی چنیون‌و شەیتان هێلانەی کردووە لە دڵیانداو کارە شەیتانەکانیانم

---

[1] معاوية أبي سفيان، صحابي كبير وملك مجاهد، ص (١١٤ ـ ١١٧).

دەرك پێ كردووە، زۆر كەسیان سەر لێ شێواوو گومڕا كردووە، لە خەڵكی كوفە، من ئۆقرە ناگرم ئەمانە بهێڵمەوە لە ناو جەرگەی شامدا، چونكە بە جادو خراپەكاری خەڵك دەخەڵەتێنن سا بیان گێڕەوە بۆ شارەكەی خۆیان، چونكە ماڵەكانیان لەو شارەدایە، كە نیفاقی ئەمانەی سەوز كردووە)[1].

## پێنجەم: گێڕانەوەی فیتنەبازەكان بۆ كوفەو پاشان دوورخرانەوە بۆ دوورگە (الجزيرة)

عوسمان نوسراوێكی نووسی بۆ سەعیدی كوڕی عاص لە كوفەو ئەم تاقمەی گەڕاندەوە بۆ لای هەر وازیان نەهێناو زمانە بلێسەیان بوو، كە گەڕانەوە بۆ كوفەو سەعید هەراسانو وەڕەس بوو بە دەستیانەوە، نامەیەكی نارد بۆ عوسمان، عوسمانیش نوسراوێكی نووسی بۆ سەعید، كە بیاننێرێت بۆ لای عەبدولڕەحمانی كوڕی خالیدی وەلید، ئەوكاتە ئەمیری شاری (حمص)[2] بوو، كاتی گەشتنە لای عەبدوڕڕەحمان دەعوەی كردنو بە گوتەی زبرو تیژ گفتوگۆی لەگەڵ كردن، وتی: (ئەی ئامێرەكانی شەیتان، بەخێرنەیەنو باش نەبن، شەیتان بە داماویو ڕەنجەرۆیی لێمان گەڕاوەتەوە، كەچی ئێوە هەر بەردەوامنو بە پلۆسن، كە لە باتڵیدا بمێننەوە، عەبدوڕڕەحمان ڕەنجەڕۆ بێت، ئەگەر تەمێتان نەكات، ئەگەر سەرتان پێ دانەخات ئەی ئەو تاقمەی كە كەس نازانێ ئێوە عەرەبن یان عەجەمن ئەو قسانە نەكەن كە لەلای سەعیدو مەعاویە كردوتانە، وەكو شێوازەكەیشی نەدوێن، من كوڕی خالیدی وەلیدم، من كوڕی ئەو كەسەم كە هەموو سوپا سالارەكان سەرسام بوون پێی، من كوڕی كەمەرشێكنی ئەهلی ریددەم، وەڵڵاهی رسواتان دەكەم.

عەبدولڕەحمان ماوەی مانگێكی تەواو لای خۆی هێشتنیەوە بەو پەڕی توندوی زبریو توڕەیی مامەڵەی لەگەڵ دەكردنو هیچ نەرمییەكی نەنواند لە گەڵیان، بەپێچەوانەی سەعیدو مەعاویە بە نەرمی هەڵسو كەوتیان لەگەڵ كرد، ئەگەر بڕۆشتایە بۆ هەركوێ دەڕۆشتن لەگەڵیا، ئەگەر سوار ببایە ئەوانیش سوار دەبوون، ئەگەر غەزای بكردایە

---

[1] معاوية أبي سفيان، ص(١١٧ ـ ١١٨).

[2] تاريخ الطبري (٣٣١/٥).

غەزایان دەکرد لەگەڵی، لە هیچ بۆنەیەکدا نەیدەهێشت سەر لەگوێز بهێننە دەر، زەلیلی دەکرد، کاتێ دیمانەی بگرتایە لەگەڵ صەعصەعەی سەرکردەیاندا پێی دەوت: (ئەی کوڕی هەڵەچی ئایا دەزانیت هەرکەسێك نەرمو نیانی چاکی نەکات توندوتیژی چاکی دەکات)، هەروەها پێی دەوتن: بۆچی وەڵامم نادەنەوە وەکو چۆن وەڵامی سەعدتان دەدایەوە لە کوفە، وەڵامی مەعاویەتان دەدایەوە لە شام؟! بۆچی لەگەڵ من نائاخافن وەکو چۆن لەگەڵ ئەوان دەئاخاوتن؟ ئوسلوبەکەی عەبدوڕڕەحمانی خالیدی کوڕی وەلید سوودی هەبوو، تاوڕیو تیژیو ڕەقو زبرییەکەی، کەڕولاڵی کردنو بە ئاشکرا تەوبەو پەشیمانییان ڕاگەیاند، وتیان: بە عەبدوڕڕەحمان تەوبە دەکەینو پەشیمان دەبینەوە، قسەی دۆستانەمان لەگەل بکە، خودای گەورە باش قسەت لەگەڵ بکات، بوارمان بدە خودای گەورە بوارتان پێ بدا، ئەم تاقمە لە لای عەبدوڕڕەحمان مانەوە لە جەزیرە، عەبدوڕڕەحمان یەکێ لە گەورەکانیانی نارد، کە ئەشتەری نەخەعی بوو، بۆ لای عوسمان بۆ ئەوەی هەواڵی تەوبەو چاکبوونی خۆیانی بداتێو هەواڵی پاشەکشەیان لە فیتنەبازی بدات بە خەلیفە، عوسمانیش وتی بە ئەشتەر، خۆتو برادەرەکانت کوێتان پێ خۆشە لێی دابنیشن، لەمەولا من لێتان دەبوورم، ئەشتەر وتی: ئێمە لای عەبدوڕڕەحمان حەزدەکەین بمێنینەوەو باسی فەزڵو حەزمی عەبدوڕڕەحمانی کرد، ماوەیەك لە جەزیرە لای عەبدوڕڕەحمان مانەوە، تەوبەو چاکبوونو دامەزراویان ڕاگەیاند[1] و فیتنەبازەکانی کوفەش ماوەیەك بەبێدەنگی مات بوون، ئەمەش لە مانگەکانی ساڵی (٣٣)ی کۆچیدا بوو، دوای ئەوەی سەرانی فیتنەباز دوورخرانەوە بۆ شام، بۆ لای مەعاویەو پاشان بۆ لای عەبدوڕڕەحمانی خالیدی کوڕی وەلید، تاقمی فیتنەبازان گێچەڵ گێڕانی کوفە وایان بە باشزانی کە بێدەنگ بنو بەرژەوەندی وا دەخوازێ تا ماوەیەك کڕ بن[2].

١ـ فیتنەبازەکان لە بەسرە درۆیان هەڵبەست بۆ ئەشجی عەبدول قەیس.

. فیتنەبازەکان لە بەسرە بە سەرۆکایەتی حەکیمی کوڕی جەبلە بوون بە نەیارو دژی خاوەن ڕێزو حورمەتەکانو موئامەرەیان دەکرد لێیان و درۆیان بە دەمەوە دەکرد،

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٢٧).

[2] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٣٤).

تەنانەت بە ڕێزترینو بە تەقواترین کەسی بەسرەش، کە ئەشجەعی عەبدول قەیس بوو ناوی عامری کوری قەیس بوو، دەمڕاستی هۆزەکەی خۆی بوو، کاتی خۆی بە نوێنەری هاتبووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو ئیسلامی فێر کردبوو، بەم فەرموودەیەش وەسفی کردبوو فەرموبووی: (تۆ دوو ڕەوشتت تێدایە خودای گەورەو پێغەمبەر ﷺ خۆشیان دەوێت ئەویش لەسەر خۆیی‌و تاقەتدارییە)[1].

عامری کوڕی قەیس فەرماندەی جیهاد بوو لە شەڕی قادسیەداو شەڕەکانی تردا، لە بەسرە نیشتەجێ بووبوو پشکێکی گەورەی بەرکەوتبوو لە چاکەخوازیو تەقواو نەیارو ناحەزەکانی درۆیان بەدەمەوە هەڵدەبەستو بە شتی پڕو پووچ تۆمەتباریان دەکرد.

عوسمانیش ناردی بۆ لای مەعاویە بۆ شام کاتی مەعاویە وتوێژی لەگەڵ کردو مامەڵەی لەگەڵدا کرد، تێگەیشت ڕاستگۆیەو ئەستۆی پاکەو خەواریجەکان درۆو دەلەسەی بۆ دەتاشن، ئەوکەسەش سەردەستەی ئەم درۆزنانە بوو لەسەر عامری کوڕی قەیس (حمران کوری أبان) حیمرانی کوڕی ئەبان بوو، کە کابرایەکی یاخیو بێدین بوو هەتا ئافرەتێکی مارە کردبوو لە کاتی عیددەدا، کاتێ عوسمان بەم کارەی زانی بوو (بەو هاوسەرییە) هەردوکیانی لەیەك جیا کردەوە داریدا لە حیمرانو سزای تاوانەکەی لێ سەندو دووری خستەوە بۆ بەسرەو لەوێش هەڵتەقی بەسەرکردەی سەبەئییەکاندا عەبدوڵڵای سەبەء و حەکیمی کوڕی جەبلەی چەتەدا[2].

٢ـ عەبدوڵڵای سەبەء ساڵی (٣٤)ی کۆچی دیاری کرد بۆ جموجوڵ کردن.

لە ساڵی (٣٤)ی کۆچی یازدەهەمی خەلافەتی ئیمامی عوسمان عەبدوڵڵای سەبەئی جوولەکە بڕیاری جێبەجێ کردنی پیلانەکانی داو نەخشەی موئامەرەکەی کێشاو لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا کە سەبەئییەکان بوون دەرچوون لە فەرمانی خەلیفەو والییەکانیان تەرتیب کرد، عەبدوڵڵای سەبەئی یەهودی لە هێلانەی موئامەرەکەی لە میسردا بە شەیتانەکانی حزبەکەیەوە لە بەسرەو کوفەو مەدینە ڕێککەوتن لەسەر وردەکارییەکانی

---

[1] رواه مسلم في صحيحه، كتاب الايمان، رقم (٢٥)، وقال النووي من شرح، أما الحلم فهو العقل وأما الاناة فهي التثبيت وترك العجله.

[2] تاريخ الطبري (٥/٣٣٣، ٣٣٤).

کودەتاکەیانو نامەی بۆ نووسینو نامەیان بۆ نووسییەوە، کەینو بەینیان گۆڕیوەو نوێنەریان گەیاندە یەکتری، ئەوەی کە لە سەرەتاوە نامەی ناردو جفرەی لێدا سەبەئییەکانی کوفە بوونو دە پانزە پیاوی ئەندامیان دوورخرابووەوە بۆ شام، پاشان بۆ لای عەبدورڕەحمان لە حیمصو دوای دوورخستنەوەی ئەم سەرپێچیکارانەو ناحەزانە سەرکردەی سەبەئییە کینەبازەکانی کوفە، کە یەزیدی کوڕی قەیس بوو[1]، شەیپوری لێدا ئەو دەمە کوفە چۆڵ بووبوو لە پیاوی ناسراوو ماقوڵو بەڕێز، ساڵیش ٣٤ی کۆچی بوو، ئەم کەڵەپیاوانە روویان نابوو لە جیهادکردن لە پێناو رەزامەندیی خودای گەورەداو هەرچیو پەرچییو گاوانو رەشوکی مابوونەوە، سەبەئییەکانو موتەریفەکان کاریان تێکردبوونو بەبۆچوونە گڵاوەکانی خۆیان ئاخنبوو هەڵیان چاندبوون، دژی والییەکەی عوسمان لە کوفە، کە سەعیدی کوڕی عاصە[2].

٣- بارودۆخی خەڵکی کوفە لە کاتی جموجوڵی فیتنەبازەکاندا.

تەبەری لە بارەی یارودۆخی شاری کوفەوە، لە ساڵی (٣٤)ی کۆچی دەڵێ: سەعید بە سەردانو نوێنەری چوو بۆ لای ئیمامی عوسمانو ساڵ ساڵی یازدەهەمی فەرمانڕەوایەتی عوسمان بوو سەعید بەر لەوەی خۆی بڕواتو لەشار دەرچێت ئەشعەسی کوڕی قەیسی نارد بۆ ئازربیجان، سەعیدی کوری قەیسی نارد بۆ رەیو نوسەیری عەجلی نارد بۆ هەمەدانو سائیبی کوری ئەقرەعی نارد بۆ ئەسفەهان، مالیکی کوڕی حەبیبی نارد بۆ ماهو حەکیمی کوری سەلامەی نارد بۆ موسڵو جەریری کوری عەبدوڵلای نارد بۆ قەرقیسیاو سەلمانی کوری ربیعەی نارد بۆ بابو عوتەیبەی کوڕی نەهاسی ناردە حەلوان، قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی کردە سەرلەشکری شەڕو جیهاد، عەمری کوڕی حورەیسی کردە جێگرەوەی خۆی، بەمشێوەیە کوفە خاڵی بوو لە سەرۆكو کەڵەپیاوو ناسراو، سەرلێشێواوو کەللە ڕەق[3] نەبێت کەسی تیا نەمابووەوە، ئا لەم بارودۆخەدا سەرکردەی سەبەئییەکان لە کوفە (یەزیدی کوڕی قەیس دوای رێککەوتن

---

[1] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٣٥).

[2] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٣٥).

[3] تاريخ الطبري (٣٣٧/٥).

لەگەڵ شەیتانی گەورەیاندا عەبدوڵڵای کوڕی سەبەء لە میسر دەرچوو خۆپیشاندانی کردو فیتنەبازەکانیش ئەوانەی چوبوونە باوەشی جەماعەتەکەی ئیبنو سەبەء کە بە نهێنی دایمەزراندبوو، لەگەڵیان تێهەڵچوونو لە قەیاندا، هەروەها هەرچیوپەرچییەکانیش کەوتنە پێڕیانو چوونە پاڵیان[1].

٤ـ قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی دەستی گرت بەسەر جموجوڵی یەکەمدا.

یەزیدی کوری قەیس لە کوفە دەرچوو بە مەبەستی رووخانی ئیمامی عوسمان، چوو بۆ مزگەوت، لەوێ دانیشتو ئەو سەبەئییانەش لێی کۆبوونەوە لە مزگەوتەکە، کە عەبدوڵڵای سەبەء ئیبنو سەودا نامەی بۆ ناردبوون لە میسرەوە کاتێ ئەم یاخیبووانە کۆبوونەوە لە مزگەوت قەعقاعی تەمیمی کە ئەمیری حەرب بوو پێی زانینو فەرمانی گرتنی دەکردنو یەزیدی کوری قەیسی سەرکردەشیانی گرت، کاتی یەزید زانی قەعقاق زۆر توندو بێدارو شارەزایە بەرامبەریان ئامانجو نەخشەکەی خۆی دەرنەخستو ئیعترافی نەکرد، کە بەتەمای داماڵینی خەلیفەیە لە خەلافەت، ئەوەی دەرخست کە خۆیو جەماعەتەکەی دەیانەوێت سەعیدی کوری عاص والییان لابەنو داوای والییەکی تر بکەنو بەشکو بێت بەدەم داواکەیانەوە، قەعقاعیش لەسەر ئەم ئیعترافەو لەسەر قسەکانی یەزید جەماعەتەکەی بەردا، پاشان وتی بە یەزید بۆ ئەم ئامانجانە لە مزگەوت کۆبوونەوە نەکەیت، کەس لە دەورت کۆنەبێتەوەو لە ماڵەکەی خۆت دانیشەو هەرچیت دەوێت لە خەلیفە داوا بکەو دێت بەدەم داواکانتەوە[2].

٥ـ یەزیدی کوری قەیس نامە دەنووسێ بۆ فیتنەبازەکانی لای عەبدوڕڕەحمانی خالیدی کوری وەلید

یەزیدی کوری قەیس لە ماڵەکەی خۆیدا دادەنیشێتو ناچار دەبێت پیلانەکان بخات بە بارێکی تردا، ئەم کابرا سەبەئییە (یەزیدی کوڕی قەیس) پیاوێك بەکرێ دەگرێو چەندێ پارەو هێسترێکی دەداتێو فەرمانی پێدەکات بە گورجیو بە پەنهانی بچێت بۆ لای ئەو سەبەئییە کوفەییانەی، کە ئیمامی عوسمان دووری خستوونەتەوە بۆ شام، پاشان

---

[1] الخلفاء الراشدون، للخالدي، ص(١٣٦).

[2] تاريخ الطبري (٥/٣٣٧).

بۆ جەزیرەو ئێستا لای عەبدورڕەحمانی خالید ماونەتەوەو تەوبەو پەشیمانییان ڕاگەیاندووە، یەزید لە نوسراوەکەیدا نووسیبووی بۆ برا شەیتانییەکانی: (ئەگەر ئەم نامەیەی من گەشتە دەستان لە دەستی دامەنێن هەتا دەگەنە لای من‌و نامەشمان ناردووە بۆ براکانمان لە میسر، واتە سەبەئییەکانی میسر، ڕێککەوتووین لەگەڵیان کە یاخی ببین‌و کودەتاکە بکەین)، کاتی ئەشتەر نوسراوەکەی یەزیدی خوێندەوە کتوپڕ دەرچوو بەرەو کوفەو برا سەرپێچیکەرەکانیشی خۆیان پێگەیاند، لەپڕێکدا ون بوون، لە عەبدورڕەحمان‌و نەیدەزانی بۆ کوێ چوون، کۆمەڵێکی نارد بە شوێنیاندا، بەڵام سۆراغیان نەبوو، بۆ جاری دووەم یەزید گەشتەوە بە جەماعەتەکەی‌و جەماعەتەکەشی گەشتنەوە بە هەرچی پەرچیی‌و نەفام‌و بێسەروبەرەکان لە کوفەو لە مزگەوت کۆبوونەوە، ئەشتەری نەخەعی لە مزگەوتەکە چووە ناویان‌و دەستی کرد بە خێزەدان‌و وروژاندنیان‌و پاڵی نان بۆ کودەتاو شۆڕشکردن، یەکێ لەو قسانەی کە بۆ وروژاندنیان کردی، وتی: (من لای عوسمانی خەلیفەوە هاتوومەتەوە، سەعیدی والیشتانم لەوێ بینیوە، عوسمان‌و سەعید ڕێککەوتوون‌و بڕیارنداوە موچەو بژێویتان داشکێنن‌و سامانەکانتان کەمکەنەوە بۆ ئەندازەی دووسەد درهەم)، ئەم قسانەی ئەشتەر درۆی خۆی بوو، عوسمان‌و سەعید قسەی وایان نەکردبوو، بەڵکو فیڵی سەبەئییەکان بوو لە بڵاوکردنەوەی درۆو ئیفترا بۆ هەڵچونی خەڵکی، ئەشتەر ئەو قسانەی دەکرد، کە خەڵکەکە بترسێنێت لە زوڵم‌و ناحەقی‌و کاری کردە سە دڵ‌و دەروونی هەرچی‌و پەرچی‌و نەفام‌و گاوانەکان‌و شێتی کردن‌و بوو بە هەراو هوریایەکی گەورە لە مزگەوتداو پیاوە ماقوڵ‌و ژیرو ڕاساڵە لە خوا ترسەکان و پیاوچاکەکان ئامۆژگارییان کردن‌و گفتوگۆیان لەگەڵ کردن وەکو ئەبو موسای ئەشعەری‌و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو قەعقاعی تەمیمی، بەڵام گوێیان نەگرت‌و بە پیریانەوە نەچوون[1]، یەزیدی کوری قەیس دەی شیڕاند لەناو هەرچی پەرچیی‌و گاوانەکاندا لە دەرەوەو ناوەوەی مزگەوتەکی دەیوت: من دەردەچم بۆ ڕێگەکانی مەدینە بۆ ئەوەی ڕێگە بگرم لە سەعید نەیەتەوە ناو کوفە، هەر کەسێ حەزدەکات بێت لەگەڵم تا ڕێگەی لێ ببڕین، با بێت بچین داوای والییەکی تر

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٣٨)، الخلفاء الراشدون للخالدي، ص(١٣٨).

بکەین لە جێگەی ئەو، هەستان بەدەم نەعرەتەکەیەوە سەبەئییەکانو شوانە ناحالییەکان وەڵامیان دایەوە نزیکەی هەزار کەس دەرچوو لەگەڵیدا[1].

٦ـ قەعقاعی تەمیمی قایدی فیتنەبازەکانی کوشت

کاتێ سەبەئیو هەرچی پەرچییەکانو ناحاڵییەکان دەرچوون بە مەرامی فیتنەنانەوەو هەڵگەڕانەوەو یاخیبوون دووبەرەکی روویدا، پیاوە بەرێزو لەسەرخۆو ژیرەکان لە مزگەوت مانەوە جێگرەوەی والیش عەمری کوڕی حورەیس چووە سەر مینبەرەکەو داوای کرد لە موسڵمانەکان کە برایەتیو یەکێتیی بپارێزنو ترساندنی لە تەفرەقەو ناکۆکیو فیتنەگەریو دەرچوون لە فەرمانی خەلیفەو بانگی کردن، کە نەچن بەدەم بانگەوازی ئەم یاخی بوو سەرپیچی کارو سنووربەزێنانەوە[2]، جا قەعقاعی تەمیمی وتی: ئایا لافاو دەگەڕێتەوە لە شیوی خۆی؟ ئادەی فورات بگەڕێنەوە لە ڕێڕەوی خۆی! شتی وا زۆر دوورە نەخێر وەڵلاهی ئەم هەرچیو پەرچییانە دانامرکێنەوە بە شریخەی شمشێر نەبێت، وا خەریکە خێرو خۆشیمان بار دەکات، پاشان ئەمانە ئاواتەخوازی کاری خۆیانن هەرگیز لێی ناگەڕێنەوە ئارام بگرن، عەمریش وتی: ئارام بگرن، گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی[3].

٧ـ فیتنەبازەکان نەیانهێشت سەعیدی کوڕی عاص بێتەوە ناو کوفە

یەزیدی کوری قەیس لەگەڵ ئەشتەری نەخەعی کە هەزار سەربازی رێگری لەگەڵ بوو، چوونەتە سەر ڕێگای مەدینە ـ کوفە، ڕێگەکەش پێی دەوترا (الجرعە)، ئەمانە بە پرچەکییەوە لە جورعە وەستابوونو سەعیدیان لێ دەرکەوت، کە لای عوسمان دەگەڕایەوە، وتیان پێی لە کوێوە هاتوویت بگەڕێرەوە بۆ ئەوێ، ئێمە پێویستمان بە تۆ نییەو نایەڵین بچیتەوە ناو کوفە، هەواڵیان دا بە عوسمان کە ئێمە کەسمان ناوێت ببێتە والیمان لە شوێنی سەعید، سەعیدیش وتی: بۆچی هەزار کەستان هێناوە بۆ ئەم قسەیە؟ یەك کەستان بەس بوو، کە بینێرن بۆ لای خەلیفەو داواکەتان بگەیەنن یان یەك پیاوتان

---

[1] المصدر نفسه.

[2] الخلفاء الراشدون للخالدي، ص(١٣٩).

[3] تاريخ الطبري (٣٣٨/٥).

بهاتایەتە ڕێگەی منو ئەم هەواڵەی پێ بدامایە؟ ئایا هەزار پیاوی ئاقڵ دەردەچێت بۆ ڕووبەڕوونەوەی یەك پیاو؟[1] سەعیدی کوڕی عاص وای بەباشزانی دەستەویەخەیان نەبێتەوەو ئاگری فیتنە تاو نەداتو نەوتی پیا نەکات، بەڵکو هەوڵی کوژانەوەی بدات، یان بەلای کەمەوە ئاگرو بڵێسەی فیتنەکە داو بخات، ئەبو موسای ئەشعەریش ڕای وابوو عەمری حورەیسو قەعقاعی تەمیمی لە کوفە[2] ڕایان وابوو واتە هاوڕای سەعید بوون، سەعید گەڕایەوە بۆ لای عوسمان، هەواڵیتاقمە خەواریجەکانی پێدا، عوسمان وتی: چییان دەوێت؟ ئایا دەست لە گوێڕایەڵی دەکێشنەوە؟ ئایا هەڵدەگەڕێنەوە لە خەلیفەو نا فەرمانی دەکەن؟ ئایا بێگوێیی و لاساری گوێڕایەڵی خەلیفە دەکەن؟ سەعید وتی: نەخێر ئەوەیان دەرخست کە نایانەوێت من والییان بمو والییەکی تریان دەوێت لە شوێنی مندا، وتی: کێیان دەوێت ببێتە والییان؟ سەعید وتی: ئەبو موسای ئەشعەرییان دەوێت. عوسمان وتی: ئەوا ئەبوموسامان کردە والیو جێگرمان کردو دیاریمان کرد، وەڵڵاهی بیانوو بۆ کەس ناهێڵمەوەو نایەڵم کەس بەڵگەی بە دەستەوە بمێنێتو ئارام دەگرم لەبەریان هەرچۆن داوام لێ دەکەن، هەتا ڕاستی مەرامەکانیان بزانم، عوسمان ئەبوموسای دیاری کر بۆ والی کوفە[3]، بەرلەوەی نوسراوی عوسمان بگاتە ئەبو موساو بیکات بە والی هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی کوفە دانیشتبوون، بۆ چارەسەرکردنو زەبتی کاروبارەکانو هێورکردنەوەی هەمووان، بەڵام دەستی نەدا بۆیانو سەری نەگرت، لەبەر ئەوە سەبەئیو داخ لەدڵەکانو کینەبازەکان زاڵبووبوون بەسەر ناحاڵیو هەرچیو پەرچییەو گاوانەکانداو وروژاندنیان، ئاوڕێکیان نەدایەوە گوێ بگرن لە دەنگی ئەقڵو مەنتیق، لە کاتی ئەم یاخیبوونو فیتنەنانەوەیەدا دوو هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی کوفە بوون، ئەو دووانەش حوزەیفەی یەمانیو ئەبو مەسعودی عەقبەی کوڕی عەمری ئەنصاری بەدری بوو، ئەبو مەسعود توڕەبوو لە یاخیبوونو شۆڕشی نەفامەکان.

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٣٨).

[2] الخلفاء الراشدون للخالدي، ص(١٤٠).

[3] تاريخ الطبري (٥/٣٣٩).

له شاردەرچونیان بەرەو رێگای جورعەو لابردنی سەعیدی والییان و سەرپێچی کردنی ئەم هەرچی پەرچیانە، ئەمەیە یەکەم خۆپیشاندان بوو کەچی حوزەیفەی یەمانی دوور بینتر بوو لەگەڵ ئەم رووداوانە بە مەزوعی ترو بیری وردەوە مامەڵەی دەکرد[1]، ئەبو مەسعود وتی بە حوزەیفە لە رێگای (جورعە) بە سەلامەتی ناگەڕێنەوە، بێگومان خەلیفە سوپایەك دەنێرێتە سەریان تەمێیان دەکاتو خوێنی زۆر دەڕژێت، حوزەیفە وەڵامی دایەوەو وتی: وەڵلاهی ئیستا دەگەڕێنەوە بۆ کوفە، نەپێك هەڵپژانو نە شەڕ روونادات‌و تاقە خوێنێك نارژێت هیچ شتێکم لەم فیتنە نەزانیوە هەموویم لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووە لە کاتی ژیانی ئەودا، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەم فیتنەیەی پێداین، کە ئەمڕۆ دەیبینین بەر لەوەی وەفات بکات، پێغەمبەر ﷺ بۆی باسکردین، کە پیاوی وا هەیە بە موسڵمانی رۆژ دەکاتەوە، پاشان کە ئێوارەی بەسەردا هات، هیچ شتێکی ئیسلامیی پێوە نەماوە، پاشان موسڵمانان دەکوژن‌و وەردەگەڕێن لە دین‌و دڵیان دەچەرخێت خودای گەورەش بۆ سبەی ئەوان دەکوژێت، ئەم بەزمانە روو دەدات[2]، حوزەیفەی یەمانی پسپۆڕ بوو لە زانستی فیتنەداو مامەڵەی کرد لەگەڵ فیتنەی سەبەئییەکاندا لە کوفەو شوێنەکانی تر بە پێی ئەو زانین‌و بیستنەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەری گرتبوو، ئەو فەرمودانەی لەبەرکردبوو کە فیتنەکانی ناوزەد دەکرد بە باشی لە حەقیقەتی ئەو کارو کردەوانە تێ دەگەیشت کە بەرپا دەبوو بە دووری نەدەزانی‌و نامۆ نەبوو لە لای‌و بەپێی توانا هەوڵی چاکسازیی دەدا[3].

٨ـ ئەبوموسای ئەشعەری بارودۆخی هێورکردەوەو رێگری کرد لە سەرپێچی کردن‌و لاساریی کردن

ئەبوموسای ئەشعەری هەستا بە هێورکردنەوەی بارودۆخەکەو رێگری کرد لە خەڵکی سەرپیچی بکەن، وتی پییان ئەی خەڵکینە بۆ ئەم جۆرە سەرپێچی‌و موخالەفانە دەرمەچن‌و هەرگیز مەگەڕێنەوە بۆ هەڵگەڕانەوەو خۆپیشاندانی ئەم جۆرە، پابەندی

---

[1] الخلفاء الراشدون، ص(١٤١).

[2] تاريخ الطبري (٣٤٢/٥).

[3] حذيف بن اليمان، ابراهيم العلى، ص (٨٦)، الخلفاء الراشدون للخالدي، ص(١٤١).

جەماعەتی موسڵمانان بن‌و گوێڕایەڵ بن، دەخیلتان بم پەلەپڕوزە مەکەن خۆتان بگرن بە ئارام بن ئێستا ئێوە ئەمیرتان هەیەو خاوەنی سەرگەورەن، وتیان نوێژمان بۆ بکە، وتی: نایکەم، هەتا گوێڕایەڵی‌و ملکەچی بۆ عوسمان دەرنەخەن، وتیان ئەوا ملکەچی‌و گوێڕایەڵی ئیمامی عوسمانین[1]، بەڵام لەم بەڵێنەدا راستیان نەکردو مەرامەکانیان پەردەپۆشکرد، لە خەڵکانی تر، ئەبو موسا هەستاو نوێژی کرد بۆیان، لەو ڕۆژەوەی کە لەلایەن عوسمانەوە هەڵبژێردرا بۆ والیەتی بارودۆخەکە هێور بوویەوە، تا ماوەیەك لە ساڵی (٣٤)ی کۆچی حوزەیفەی یەمانی گەڕایەوە بۆ ئازربیجان‌و باب‌و سەرلەشکری سوپای جیهادی دەکرد لەوێ‌و کارگێڕی والییەکان گەرانەوە بۆ سەر کارەکانیان لە دەڤەری فارس[2].

٩ـ ئیمامی عوسمان نوسراوێکی نووسی بۆ یاخیبووەکانی کوفە

عوسمان نوسراوێکی نووسی بۆ سەرکەشەکانی ئەهلی کوفەو حیکمەتی لابردنی سەعیدی بۆ روونکردنەوە، کە لەسەر خواستی ئەوان کردی‌و ئەبو موسای کردە جێگرەوەی، ئەو نامەیە کۆمەڵێ ڕەهەندو بەڵگەی گرنگی تێدا بوو، ڕووبەڕووبوونەوەی فیتنەشی رونکردەوە، کە عوسمان چۆن بەرهەڵستی فیتنە دەکات‌و هەوڵی داوخستنی گڕی ئاژاوە دەدات هەتا بتوانێت، وێڕای ئەوەی بە زانستێکی یەقینی دەزانێت کە دێتە پێش‌و بەرپا دەبێت‌و ئەم ناتوانێ ڕێگە لە بەرپابوونی بگرێت، ئەمەشی لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگرتووە، عوسمان لە نامەکەیدا وتبووی، پاش سوپاسی خودای گەورە من ئەو کەسەم کردە ئەمیرتان کە خۆتان هەڵتان بژاردوو لێتان خۆش دەبم کە چیتان کرد بە سەعید وەڵڵاهی هەرچی سامانم هەیە رایدەخەم بۆتان‌و ئەیخەمە بەرپێتان، وەڵڵاهی هەرچی سەبرم هەیە سەرفی دەکەم بۆتان‌و بە کوشتنی خۆم چاکتان دەکەم، دەتان سازێنم هەرچیتان پێ خۆشە داوام لێ بکەن، بە مەرجێ گوناهو سەرپێچی خودای گەورە نەبێت، هەر ئێستا پێتان دەبەخشیم، هەر شتێکتان پێ ناخۆش بێت ئەگەر گوناه نەبێت دەستی لێ هەڵدەگرم‌و لێتان دەبورم، هەرچیتان پێ خۆشە بیکەن‌و پێم بڵێن بۆ ئەوەی بیانوو گلەییتان بەسەر منەوە نەبێت).

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٣٥).

[2] الخلفاء الراشدون للخالدي، ص(١٤٣).

بۆ شارەکانی تریش ئەم چەشنە نامەیەی نووسی[1] ڕەزای خودای گەورە لە ئەمیری ئیمانداران چەند چاکسازبووە، چەند سنگی فراوان بووە، لە بەرامبەردا سەبەئیی‌و داخ لەدڵو یاخیبووەکان سنورشکێنەکان چەندێ زوڵمیان لێکردووەو درۆیان بۆ هەڵبەستووەو دەستی هەڵبەستیان بۆ تاشیوە[2].

---

[1] تاريخ الطبري (٣٤٣/٥).

[2] الخلفاء الراشدون للخالدي، ص(١٤٣).

## باسی دووەم: ئیمامی عوسمان بەم سیاسەتە مامەڵەی دەکرد لەگەڵ فیتنەبازەکاندا

لە دووتوێی دەقە مێژووییەکانداو لە ژمارەیەك لە سەرچاوەکاندا ئەوە رۆشن کراوەتەوە کە عوسمان بە چەندین شێواز بەرابەری‌و بەرەنگاری فیتنەکەی کردوە وەکو:

**یەکەم: هەندێ لە هاوەڵان پێیان باشبوو عوسمان لیژنەی پشکنین‌و لێکۆڵینەوە رەوانە بکات بۆ شارەکان**

موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا کاتی ئەو هەموو پڕوپاگەندەیانەی بیست کە عەبدوڵلای سەبەء لە شارەکاندا بڵاوی دەکردەوە، هەژان‌و هاتنە کوڵ‌و چوونە خزمەتی ئەمیری ئیمانداران، ئیمامی عوسمان بەپەلە وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران، ئایا ئەو شتانەت بیستووە لە خەڵکی، کە ئێمە بیستومانە؟ وتی: نەخێر، وەڵڵاهی جگە لە بێوەیی‌و خۆشی هیچی ترم پێ نەگەشتووە، وتیان: ئێمە هاتووین بۆ لای تۆ پێت بڵێین هەردوکیان ئەو هەواڵانەیان بۆ باسکرد کە گوێی ئەوانی جەنجاڵ کردبووە، دەربارەی ئەو ئاژاوەو فیتنەیەی کە لە شارەکاندا شەپۆل دەدات، دەربارەی ئەو هێرشە نەگریسەی کە دەکرێتە سەر والییەکانی لە کونجێکدا، ئەویش وتی: ئێوە برابەشی من‌و ناودارانی ئیماندارانن، راویژێکی باشم بۆ بکەن‌و رێگەچارەیەکم نیشان بدەن، وتیان ئاماژەی ئەوەت بۆ دەکەین کە کۆمەڵێ پیاوی متمانەدار بنێرە بۆ شارەکان‌و سۆراغی دەنگوباس بکەن‌و هەواڵمان بۆ بهێننەوە[1]، ئیمامی عوسمان هەستا بە لێپێچینەوەیەکی قایم‌و مەزن‌و برێ لە هاوەڵانی هەڵبژارد لەو هاوەڵانەی، کە کەس گومانی نەبوو، لە تەقواو راستگۆیی‌و خۆپارێزی‌و ئامۆژگارییان، ئەو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیەی هەڵبژارد کە ئیمامی عومەر کردبووی بە ئەمینداری لێپرسینەوەی والییەکانی‌و کردبووی بە سەرپەرشتیاری والییەکان لە هەرێمەکاندا، هەروەها ئەوئوسامەی کوڕی زەیدەی هەڵبژارد کە خۆشەویستی پێغەمبەرە ﷺ‌و باوکیشی بە هەمان شێوە خۆشەویستی بووە، ئەو ئوسامەیەی ئەمیری ئەو سوپایە بوو، کە پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی کردبوو لە دوا دوایی تەمەنی دونیاییدا کە بکرێتە قایدی ئەو

---

[1] تاريخ الطبري (٣٤٨/٥).

سوپایه، فەرمووی (لەشکری ئوسامە بخەنە ڕێ)، هەروەها ئەو عەمماری یاسری هەڵبژارد، کە لە موسڵمانە پێشینەکانەو تێکۆشەرێکی گەورەیە، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عومەری هەڵبژارد، کە شەرعزان و خۆپارێزو موتەقی بوو، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد بۆ کوفە، ئوسامەی نارد بۆ بەسرە، عەماری نارد بۆ میسر، عەبدوڵڵای کوڕی عومەری نارد بۆ شام، هەریەك لەم کەڵەپیاوانە سەرپەرشتیاری ئەو جەماعەتە بوو کە لەگەڵیان بوون و ناردنی بۆ ئەم شارە گەورانە، هەرهەموویان ڕۆشتن بۆ ئەم کارە گرانە پڕ مەترسییانە، پاشان هەموویان گەڕانەوە جگە لە عەممار، کە دواکەوت لە گەڕانەوەی لە میسر، پاشان گەڕایەوە هەرچییان بیستبوو، بینیبوویان و پرسیاریان کردبوو، گشتیان خستە پێشچاوی ئەمیری ئیمانداران[1]، ئەو باسەی کە هەر یەك لەمانە هێنایەوە لە شارەکان، وتبوویان: (ئەی خەڵکینە ئێمە نکولی هیچ شتێکتان لێ ناکەین، ڕەخنەمان لێتان نییە، بە هەمان شێوە موسڵمانەکانیش هیچ ڕەخنەو گلەییان نەبووە، ئەمیرەکانیان دادگەر بووە لە نێوانیانداو خەمخۆر بووە بۆیان)[2]، بەڵام ئەو ڕیوایەتەی کە گوایە عەمماری کوڕی یاسر عوسمانی بە دڵناسك و عاتفی تۆمەتبار کردووە، سەنەدەکانی ئەم ڕیوایەتانەی کە هەڵگری ئەم تۆمەتانەیە زەعیفن و لە عیللەت خاڵی نین، هەروەها لە دەقەکانیشیدا بزری هەیە[3]، سەرپەرشتیارەکان لە شارەکان گەڕانەوەو ڕوونیان کردەوە، کە هیچ شتێکی وا لە ئارادا نییە، کە خەلیفە والییەکان لە والییەتی لابات و دەستی پێ هەڵگرێ لە کارو خەڵکی بە گشتیی وان لە دادپەروەریی و ڕەحمەت و خێرو سەلامەتی و دڵئارامیداو ئەرخەیانن و ئەمیری ئیماندارانیش لە کێشەکاندا دادگەرەو لە بەخشینەکاندا یەکسانەو ڕێکەو چاوداشتی مافەکانی خودای گەورەو مافەکانی گەلەکەی دەکات و ئەو واتە واتەش بەرپا بووە هەموو گومان و شڵەقاندن و درۆیەو کینەبازو داخ لەدڵەکان بڵاوی دەکەنەوەو وان لە تاریکاییدا، بۆ

[1] عثمان بن عفان الخليفة الشاكر الصابر، ص(٢١٠).

[2] تاريخ الطبري (٣٤٨/٥).

[3] فتنة مقتل عثمان (١٧١/١).

ئەوەی کەس سەرچاوەکەیان نەزانێت، بەڵام ئەم خەلیفە کارزانە بارە چاکسازە مەزنە بەم لێکۆڵینەوەو سۆراغکردنە وازی نەهێنا بەڵکو نوسراوی نووسی بۆ خەڵکی شارەکان[1].

**دووەم: عوسمان نوسراوی نووسی بۆ خەڵکی شارەکان**

لە باتی راگەیاندنی گشتیی بۆ هەر هەموو موسڵمانان پاش سوپاسو ستایشی خودای گەورە نووسیبوی: (من کارگێرەکان بە بریکارو بەڵێندەری خۆم دەگرم، لە هەموو وەرزێکی حەجدا، ئەم ئوممەتە زاڵو سەرکەوتووە لەوەتی بووەتە سەرکاری فەرمان بە چاکەو رێگری لە خراپە، ئوممەت دەرکی بە هەر خراپەیەك کردبێت یان رەخنەی لە هەر کارگێرێکم گرتبێت حەقم پێداوەو وەڵامم داوەتەوە، نە خۆم نە خاوخێزانم هیچ حەقێکمان نەکەوتووەتە سەر لە لایەن گەلو جەماوەر، هەرچیشمان هەیە بەسەریانەوە بۆ خۆیان، خەڵکی مەدینە هەواڵیان پێداوم کەسانێك هەن داشۆراون، کەسانێکی تر هەن لێیان دراوە، ئەی ئەو کەسەی لێت دراوە، یان سوکایەتیت پێ کراوە بە نهێنی، ئەگەر شتی وات پێکراوە لە وەرزی حەجدا خۆت بگەیەنە پێمو حەقی خۆت وەرگرەوە بە کەیفی خۆت، لە من یان لە کارگێرەکەم، یان بیکە بەسەدەقە بۆ خۆت خودای گەورە پاداشتی خێرۆمەندان دەداتەوە)، کاتی خەڵکی شارەکان خوێندیانەوە دەستیان کرد بە گریان و دوعای خێریان کرد بۆ عوسمانو وتیان: ئەم ئوممەتە هەڵژناوە بەشەڕدا[2]، ئایا ئەم ئیمانە مەزنەی ئیمامی عوسمان دونیای دەوێت؟ کە بە عەزمو جەزمەوە گوێ بۆ خەڵکی دەگرێت، لەم عەزمو جەزمەو بەرزترو ئەستور شك دەبەیت کە پیاوێك وتویەتی تەمەنی لە هەشتاو دوو ساڵ زیاتر بووە، ئەو کەڵە پیاوە لە بەهێزیو خێراییەوە ئەمەی وتووە، کە بە دواداچوونو سۆراغی زوڵملێکراوەکانی کردووەو شوێن دۆزی بەشخوراوەکانی کردووە، یان خەڵکی دەوێتو مرۆڤەکانی لا مەبەستە دادوەری و ویژدانێکم نیشان دەن بەرزو بەناوبانگتر بێت لە دادگەریی ئیمامی عوسمان، لەم ویژدانکارییە هەتا مافی شەخسی ئەمیری ئیمانداران دراوە بە جەماوەر تەنیا لەبەر خاتری ئەوەی مافەکانی خودای گەورە نەشکێتو سنوورەکانی پارێزگاری بکرێت.

---

[1] تاريخ الطبري (٣٤٩/١).

[2] المصدر نفسه، تاريخ الطبري (٣٤٩/١).

بەڵێ ئەمە دادگەریی ئیمامی عوسمان بوو، کە لەم بابەتانەدا نەدەوەستا هەڵوەستەی نەدەکرد بە ناردنی ئەمیندارەکان بۆ پشکنینی بارودۆخی خەڵك‌و نووسینی نوسراو بۆ خەڵکی شارەکان وازی نەهێنا، وتی: وەرزی حەجکردن وەرن سکاڵاکانتان بگەیەننە دەستم، گەر چی لەبەردەم کۆماری حاجیانیشدا بێت، عوسمان بەمانەش وازی نەهێنا، بەڵکو کارگێڕەکانی ئاگادارکردەوە، کە خۆیان بچنە ناو خەڵك زوڵمەکانیان بۆ بگەڕێننەوە گەر هەبوو، پاشان عوسمان پرسیاری کرد لە کارگێڕەکان دەربارەی ئەو واتە واتەی کە خەڵکی دەماودەم دەیڵێنەوە ئەوانیش بە بۆچوونێکی جوان‌و توندو قایم راوێژیان بۆ دەکردو رێگەچارەیان نیشان دەدا[1].

**سێیەم: ئیمامی عوسمان راوێژی کرد بە والی شارەکان**

ئیمامی عوسمان بەخێرایی ناردی بە شوێن والیی شارەکانداو بە پەلە بانگی کردن، والییەکانیش عەبدوڵڵای کوڕی عامرو مەعاویەی ئەبوسوفیان‌و عەبدوڵڵای سەعد بوو، لەگەڵ ئەمانیشدا سەعیدی کوری عاص‌و عەمری کوری عاصی هێنایە ناو راوێژکردنەکە، چونکە ئەم داونە والی پێشوون، ئەم راوێژکردنە دانشتنێکی پڕ مەترسی‌و داخراو بوو ئەو مەسەلانەی تێدا تاووتوێ کرا کە بڕیاریان دا پلانی کاری نوێ دابڕێژن‌و بە مسارێکی تر بجولێنەوە لە ژێر رۆشنایی ئەو هەواڵە ناقۆڵایانەی کە گەشتوونەتە شاری مەدینەی پایتەختی وڵاتی ئیسلامیی[2]، ئیمامی عوسمان وتی: (قوڕبەسەرتان ئەم سکاڵاو گازندەیانە چییە؟ ئەم هات‌و هوتە چییە؟ من زۆر دەترسم ئەم قسانە بە راستی دەربچێت لەسەرتان، هەمووشی ماڵە بەسەر منەوەو بەسەر مندا دەشکێتەوە)، ئەوانیش وتیان: وەڵڵاهی راست ناکەن‌و نایسەلمێنن‌و ئەم هاش‌و هوشانە هیچ بنەمایەکیان نییەو لێی بێئاگاین، تاقە کەسێکت دەست ناکەوێت بچێتە ژێر باری ئەم تۆمەتانەو هیچیان تیا بەسەر نییە، هەر پڕوپاگەندەیەو دروست نییە حوکمی پێ بکرێت، عوسمان وتی: ئەی چارەسەرمان چییە؟ سەعید کوڕی عاص وتی: ئەمە فێڵ‌و فرێکەو لە تاریکی‌و پەنهاندا دروست کراوەو بە ناحەق هەڵبەستراوەو هەر لە خۆڕا

---

[1] عثمان بن عفان الخليفة الشاكر الصابر، ص(٢١٢).

[2] معاوية من أبي سفيان، ص(١٢٦).

داویانه به گوێی خەڵداو ئەمانیش گێڕاویانەتەوە بۆ کەسانی ترو لەناو کۆڕو دانیشتنەکانیاندا ڕیساویانە، عوسمان وتی: باشە چۆن تیماری بکەین؟ وتی: ئەم تاقمە بانگبکەو پاشان ئەوانە بکوژە کە یەکەمجار ئەم قسانەیان لێ دەرچووە، عەبدوڵڵای کوڕی سەعد وتی: ئەو سزایانە لە خەڵکی بسەنەرەوە کە کەوتووەتە ئەستۆیان، مادەم مافەکانی خۆیانت پێداون زۆر لەوە باشترە وازیان لێ بێنیتو گوزەشتەیان لێ بکەیت.

مەعاویە وتی: منت کردووە بە والیو بوومەتە والی گەلێك، جگە لە هەواڵی خێرو چاك خراپەت لێ نەبیستوون، ئەو دوو پیاوەش شارەزای هەڵوێستی راستیانن وتی: رات چۆنە واتە (چی بکەین)؟ مەعاویە با بەجوانی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین، وتی: ئەی عەمر تۆ ڕات چییە؟ وتی: من وادەزانم تۆ نەرمی لەگەڵیانو رازیت لێیانو بەشیان زیاد دەکەیتو چاوپۆشییان لێدەکەیت، بە پێچەوانەی رەفتاری عومەر لەگەڵیان دەجولێیتەوە، پێموایە بچیتە سەر ڕێبازی خەلیفەکەی پیشووت لە شوێنی توندیدا توند بیت، لە شوێنی نەرمیدا نەرم بیت، بەپێی پێویست، چونکە توندوتیژی پێویستە بۆ ئەو کەسانەی کە زیانی خەڵك بە گرنگ نازانن، نەرمیش بۆ ئەو کەسانەی، کە بە ئامۆژگاریی ئاکاریان جوان دەبێت، بەڵام تۆ بۆ هەردوولایان نەرمیت ڕاخستووە.

عوسمان هەستاو سوپاسو ستایشی خودای گەورەی کردو وتی: ئەو ئاماژانەی کردتان هەموویم ژنەوتو هەموو کارێکیش دەرگای خۆی هەیە لەوێوە دەچینە ژوورەوە ئەو ناسۆرییەی کە مەترسی هاتنی دەکرا ئەوا بەرپا بووە، ئەم دەرگایە بە نەرمو نیانیو لەخۆبردۆییو بەدوداچوون دادەخرێن تەنیا لەو سنوورانەدا نەبێت کە باسکراوەو کەس بۆی نییە رەخنەی لێ بگرێت، ئەو شتەی بەربەستی ئەم هەرایە بکات نەرمیو هێواشییە، وەڵاهی ئەم دەرگایە تازە لادراوەو کەسێکیش نییە لەمان بەڵگەیەکی راستی پێ بێ خوداش باش دەزانێت ئارامگریی یەکەم بۆ پێخۆشحاڵی نییەو دەرفەتدان نییە، وەڵڵاهی ئاشی فیتنەو ئاژاوە کەوتووەتە گەڕ، خۆشبەختی بۆ عوسمان ئەگەر بمرێتو دەستی تێ رانەدات، رێگری بکات لە خەڵکیو مافەکانی خۆیانیان پێ ببەخشنو چاوپۆشییان لێ بکەن، ئەگەر مافەکانی خودایان پێشێل کردو سونەتیان فەرامۆشکردووە شلگیریان بۆ مەکەنو ماستاویان لەبەر مەکەن[1]، عوسمان پێچەوانەی

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٥١).

عومەری برای بۆ لە ڕێبازی توندوتۆڵیدا، بەڵام لە شوێنکەوتنی سوننەتی هەردوو خەلیفەکەی پیش خۆیدا پێچەوانە نەبووەو ئاشی فیتنە کەوتە گەڕو بە توندوتیژی چارەسەر ناکرێت، چونکە توندوتیژی دەبێتە ئاوی ئەم ئاشەو باشتر کرەی پێ دەکاتو ئەمیری ئیمانداران رازی نەبوو ببێتە هاودەمی ئەم فەرتەنەیە، وەکو دەڵێن (خۆشحاڵی بۆ عوسمان بمرێتو دەستی تێ وەرنەدات)، بە ڕۆشنیو راشکاوی ئیمامی عوسمان مەیلی لەم گەڕەلاوژێیە نەبوو لە سنوورو مافەکانی خودای گەورەدا هیچ شلگیرییو چاوپۆشییەکی تیا نەبوو، بەڵام بۆشتەکانی تر ئاسانکاربوو، چونکە نەرمو نیاینی ئەوبەرترە، لێخۆشبوون بەرێزترە، دەبێت مافەکانی پارێزراوبنو وەکو پێویست جێبەجێ بکرێن[1]، چەندین ریوایەت هاتووە بەسەنەدی لاوازو ونبوو، کە پەیوەندیی نێوان عەمری کوڕی عاصو عوسمان دەشێوێنێتو دەشڵەقێنێت، کۆمەڵێ ریوایەتی تری دزێو دەستیان هەیە لە چڵکن کردنی وێنەی عەمری کوڕی عاصداو پەیوەندیی نێوان عەمری عاصو عوسمان بە پەیوەندییەکی ڕزیو دەگۆڕن کە گوایە عەمر نەخشەی کێشاوە بۆ کوشتنی ئەمیری ئیمانداران، پاشان دەستی داوەتە هەڵپەرستیو بە تەمای ئەوەبوو خوێنی عوسمان برژێت)[2].

ئەم ریوایەتانە لاوازو رەتکراو لای ئەهلی حەدیسو مێژوونووسەکان[3]، وە ریوایەتێکی تر هاتووە بە سەنەدێك، کە خەڵکی لاوازو نەناسراوی تێدایە کە گوایە عەمری کوڕی عاص وتویەتی، ئەی عوسمان لەبەر خاتری بەنی ئومەیە مافی خەڵکت پێشێل کردووە، خزمایەتی دەکەیت تۆ لاتداوەو خەڵکیش لای داوە یان دادپەروەربە یا خۆت بەرکەنارکەو واز بهێنە گەردەمێنیتەوە یەکسانو گشتگیربەو بە چاکی بەرەوپێش برۆ[4].

هەر لە هەمان ریوایەتدا هاتووە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عامر وتویەتی: من وا دەزانم تۆ ئەوە چاغەت هەڵگیرساندوە ئەوەندە پیاوێك ئەسپێیەك کەوتبێتە سەری یان گەنەیەك

---

[1] عمر بن العاص الامير المجاهد للغضبان، ص(٤٤٧).

[2] المصدر نفسه (٤٤٨).

[3] عمر بن العاص، الأمير المجاهد للغضبان.

[4] تاريخ الطبري (٥/٣٤٠).

چوبێتە مووی وڵاخەکەی، تۆ ئەوەندە بایەخ بە خەڵکی دەدەیتو ئەوەندە سەرقاڵی گلەییەکانیانی[1]، عوسمان والییەکانی قەدەغە کرد لەوەی ئاژاوە هەڵگیرسێنەکان سزا بدەن یان زیندانیان بکەن، یان بیانکوژن، بڕیاریدا کە بە چاکیو نەرمی مامەڵەیان لەگەڵ بکەن[2]، داوای کرد لە کارگێڕەکانی کە بگەڕێنەوە سەر کارەکانیانو ڕێککەوتن لەسەر ئەو ڕێنماییانەی کە ئیمامی عوسمان پێی ڕاگەیاندن، کە بە چ شێوازێك ڕووبەڕووی فیتنە ببنەوە ئەو فیتنەیەی کە هەموو چاوەڕوانێك دەیزانی هاتووەو دەبێت هەر بێت[3].

١ـ مەعاویە دوو پێشنیاری کردو عوسمانیش ڕەفزی کردەوە.

پێش ئەوەی مەعاویەی ئەبی سوفیان بچێتەوە بەرەو شام هات بۆ لای ئیمامی عوسمانو وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، لەگەڵ مندا وەرە بۆ شام، بەر لەوەی ڕووداوەکانو بەسەرهاتەکان هێرش بهێننە سەرتو تۆ لە ئۆگەیان نەیەیت، عوسمان وتی: من دراوسێیەتی پێغەمبەر ﷺ بە هیچ شتێك ناگۆڕمەوە، ئەگەر دەزوی گەردنم بقرتێت، مەعاویە وتی: دەی سوپایەکت لە شامەوە بۆ ڕەوانە بکەم لە مەدینە بمێنێتەوەو بەرهەڵستی ئەو مەترسییە چاوەڕوانکراوانە بکەنو بەرگانی لە تۆو خەڵکی شاری مەدینە بکەن، ئیمامی عوسمان وتی: نەخێر گرانیو نانەخۆری ناخەمە سەر دراوسێیەکانی پێغەمبەر ﷺ، کەم خۆراکیان ناکەم لەبەر خاتری سەربازانێك کە بمێننەوە لە ناویان، تەنگیو سەخڵەتی ناخەمە سەر کەسانێك کە کۆچەرییو ئەنسارنو لە مەدینە نیشتەجێبوون مەعاویە پێی وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران وەڵڵاهی تیرۆرت دەکەن، یان لە ناوت دەبەن، عوسمان وتی: خودام بەسەو باشترین پشتیوانمە[4] وەکو بڵێی مەعاویە دەیزانی کە لەودیو ئەم فیتەو پڕوپاگەندانەوە شتێکی پیس هەیەو نەخشەی بۆ ئامانجێکی ترسناك کێشاوە تەنها ئەوەشیان دەوێت بدەن بەسەر خەلیفەو حوکم ڕانییەکەیدا.

---

[1] المصدر نفس.

[2] خلافة عثمان، د. السلمي، ص(٧٧).

[3] الخلفاء الراشدين للخالدي، ص(١٥١).

[4] تاريخ الطبري (٣٥٣/٥).

بەڵام عوسمانی خەلیفەی کارزان رایەکی تری هەبووەو دەیویست بە رێگایەکی تر لەگەڵیان بجولێتەوە هەتا بەڵگەیان بەدەستەوە نەمێنێ لای خودای گەورەو وەڵامی خەڵکیش لەدوو دنیاو دوارۆژدا سەر شۆڕیان بکات ئەم سەبرە گەورەیە تەنها لەو ئیمامە دادپەروەرە گەورەیە دەوەشێتەوە[1].

٢ـ عوسمان ریزی موئامەرەچییەکانی بڕی، دوای ئەوەی کە هاتبوونە ناو شاری مەدینە:

ئەمیری ئیمانداران وریاو بیدار بوو بە گوێرەی نووسینی هەواڵگرەکانی کە لەبارو دۆخ ئاگاداریان دەکردەوە سەبارەت بە موئامەرەچییەکان، عوسمان دوو پیاوی لە موسلمانان کە کاتی خۆی سزا درابوون، لە لایەن خەلیفەوە خستە ناو ریزی یان تۆڕی موئامەرە چییەکان، چونکە ئەمانە لەم دوو پیاوە ئەرخەیان بوون دوو پیاوەکە یەکیان مەخزمیو ئەویتر زوهری بوو، پێی وتن بڕۆن بزانن چییان دەوێتو بە تەمای چین، ئەم دوو پیاوە لە لایەن عوسمانەوە تەمێ کرابوون، بەڵام خۆ گربوون لە ژێر باری راستیدا هیچ کینەیەکیان لە دڵدا نەبوو، بەرامبەر عوسمان، کاتێ موئامەرە چییەکان ئەم دوو پیاوەیان بینی مەرامەکانی خۆیان وتوو نەخشەکەیان باس کرد، دوو پیاوەکە وتیان کێتان لەگەڵدایە لە خەڵکی مەدینە، کە هاودەنگتان بێت، وتیان سێ کەس، وتیان جگە لەمانە، وتیان کەسی تر، وتیان ئێوە دەتانەوێ چۆن بکەن ئەوانیش رەهەندی موئامەرە تێرو پڕەکەو نەخشە دارێژاوەکەیان راڤە کرد بۆ دوو پیاوەکە، وتیان دەمانەوێ هەندێ قسە بکەین لەگەڵ خەلیفەدا دەربارەی ئەو شتانەی کە لە دڵی خەڵکدا چاندومانە، پاشان بگەڕێینەوە بۆ لایان دڵنیایان بکەین کە ئێمە بڕیارمان لەسەر داوەو تاوتوێمان کردووە.

ناگەڕێینەوەو پەشیمان نابینەوە، پاشان ئەچینو وەکو گەلەکۆمە چواردەوری دەگرینو لە خەلیفەیەتی لای دەبەین، ئەگەر بە قسەمان نەکات واتە عوسمان، دەیکوژین، ئەم قسانەیان بیستو گەرانەوە بۆ لای عوسمان، عوسمان پێکەنیو وتی: خودایە ئەمانە سەلامەت بکەی ئەگەر سەلامەتیان نەکەی بەدبەخت دەبن، ناردی بە

[1] عثمان بن عفان الخليفة الشاكر الصابر ص(٢١٤).

شوێن ئەو کوفەیو بەسرەییانەی کە هاتبوونە مەدینە، پاشان بانگەواز کرا، وتیان کۆببنەوە بۆ نوێژ، ئیمامی عوسمان چووە سەر مینبەرو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چواردەوریان گرت، عوسمان سوپاسو ستایشی خودای کردو هەواڵی ئەم تاقمەی دا بە موسڵمانان، کە هاتوونەتە مەدینە، راستی مەرامەکانیانی باس کرد، کە تووشی دڕدۆنی بوون، هەر لە ئێستاوە هەڵگەراونەتەوەو دەیانەوێ عوسمان لە خەلیفەیەتی لابدەن، یان بیکوژن، ئەو دوو پیاوەی کە گفتوگۆیان کرد لەگەڵ ئەم سەبەئییانەدا هەستانو بوون بە شاهیدی هەواڵەکەی عوسمان، هەموو موسڵمانان وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران بیانکوژە، چونکە ئەیانەوێ لە خزمەتی تۆ دەربچن هەڵگەڕێنەوە بە رووتاو دروشمی موسڵمانان لەتو پەت بکەن، عوسمان داواکەی هاوەڵانی رەتکردەوە کوشتنیانی پەسەند نەکرد، چونکە ئەمانە بەناو موسڵمان بوون، ئیمامی عوسمان رازی نەبوو دوایی پێی بڵێن ئیمامی عوسمان ئەو موسڵمانانەی کوشت، کە پێچەوانەی بوون، عوسمان بەم شێوەیە ئەو بۆچوونەی رەد کردەوەو وتی: نایان کوژم، بەڵکو لێیان دەبورمو چاوپۆشییان لێ دەکەم، هەتا بتوانم چاوەڕوانییان دەکەم، هیچ تاقە موسڵمانێ ناکوژم، مەگەر تاوانێکی وای کردبێ پێویست بە کوشتن بکات، یان لەدین وەرگەڕابێو کافر ببێت[1].

### راستکردنەوەی بەڵگە لەسەر یاخیبووەکان

عوسمان بانگی تاقمە سەبەئییەکانی کرد، بۆ ئەوەی هەرچی دوو دڵیو گومانێکیان هەیە، بیخەنە روو، ئەو زیادە رەویانەی بەدییان کردووە بە ئاشکرا بیڵێن، هەر هەڵەیەکیان لە خەلیفە گرتووە ئاشکرای بکەن، ئەمە دانیشتنێکی راشکاوانەو رۆشن بوو لە مزگەوتدا بە دیار چاوی هاوەڵانو موسڵمانانەوە بەسترا، سەبەئییەکان قسەیان کردو ئەو هەڵانەی کە عوسمان کردبووی بە گومانی ئەوان خستیانە روو، عوسمانیش هەستا بە بەیانکردنو روونکردنەوەیانو بەڵگەو دەلیلەکانی خۆی بۆ باسکردن، موسڵمانە بە ویژدانەکان ئەم راشکاوییو لێ پرسینەوەو دەرخستنەیان بیستو ئیمامی عوسمان وەڵامی ئەو رەخنانەی دایەوە کە لێیان دەگرت، پاشان راستی کارەکانی روون

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٥٤، ٣٥٥).

کردەوەو بەرگری کرد لە کارەکانیو پاکێتیی کارەکانی دەرخستو هاوەڵە دانیشتووەکانی ناو مزگەوت شاهیدیان بۆدا[1].

١ـ وتی من لە سەفەردا نوێژم بە چوار رکاتی تەواو کردووە، پێش من پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەر لە سەفەردا چوار رکاتیان نەکردووە، من چوار رکات نوێژم کرد، کاتێ لەمەدینەوە سەفەرم کرد بۆ مەککە، مەککە شارێکە کەسوکارمی تیادایە، ئەو کاتە من نیشتەجێ بووم لەناو کەسوکارمداو خۆم بە موسافیر نەئەزانی، ئایا وانییە، هاوەڵان وتیان بەڵێ بەخودا وایە.

٢ـ وتی: من پاوەنێکم پاراستووەو تەنگم بە موسڵمانان هەڵچنیوە زەویەکی فراوانم تایبەت کردووە بۆ لەوەری وشترەکانم لە پێش منەوە پاوەن هەبووە بۆ وشتری صەدەقەو جیهاد، پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەر پاوەنیان هەبووە، منیش وەکو ئەوان بەڵام من فراوانترم کردووە لەبەر زۆری وشتری صەدەقەو جیهاد، پاشان ئاژەڵی موسڵمانەکانشم مەنع نەکردووە، کە لەم پاوەنە بلەوەڕێن، بۆ ئاژەڵی خۆم پاوەنم نەکردووە، کاتێ من خەلیفە نەبووم لە هەموو موسڵمانان زیاتر وشترو مەڕم هەبووەو هەمویشم کرد بە خێر، ئێستاش ساغییەو راغییە نەبێ ولاغم نییە، تەنیا دوو وشترم هەیە دام ناون بۆ حەج کردن، ئایا وانییە؟ هاوەڵان وتیان بەرێ بەخودا وایە.

٣ـ ئێوە دەڵێن من یەك نوسخە قورئانم هێشتووەتەو ئەو نوسخەکانی ترم سوتاندووە، خەڵکیم لەسەر یەك پەڕاوی قورئان کۆکردووەتەوە، ئایا قورئان فەرمودەی خودا نییە لای خوداوە نەهاتووە، دەبێ مادەم لای یەك کەسەوە هاتووە دەبێ یەك جۆر بێت، هیچم نەکردووە، ئەوە نەبێ موسڵمانانم لەسەر یەك شێوە قورئان کۆکردووەتەوە، رێگەم لێ گرتوون کە ناکۆکیو دووبەرەکی بکەوێتە نێوانیان، لەم کارەشدا چاوم لە کارەکەی ئەبوبەکر کردووە، کە هەستا قورئانی کۆکردەوە، ئایا وانییە، هەموو هاوەڵان وتیان: بەرێ بە خودا.

٤ـ ئێوە دەڵێن من حەکەمی کوڕی ئەبی عاصمم گەڕاندووەتەوە بۆ مەدینە کاتی خۆی پێغەمبەر نەفی کردووە بۆ (تائیف) لە راستیدا حەکەمی کوڕی عاص خەڵکی

---

[1] الخلفاء الراشدون للخالدي، ص (١٥٤، ١٥٥).

مەککەیەو خەڵکی مەدینە نییە، پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە دەری کرد بۆ تائیف، کاتی رازی بوو لێی گەرانیەوە بۆ مەککە، پاشان هەم دیسان دەری کردەوە بۆ تائیف، پێغەمبەر ﷺ خۆی دەری دەکردو دەشی هێنایەوە، ئایا وانییە؟ هاوەڵان وتیان: بەریٚ بەخودا.

٥- ئێوە دەڵێن من تازە پێگەیشتو دەکەم بەکار بەدەست گەنجە تەمەن منداڵەکان دەکەم بە والی، من هیچ پیاوێکم نەکردووە بە والی بەرێزو بارهەڵگرو شیاو نەبێت، لە رێگەیدا نەبیٚ، ئەم کەسانە شایستەی کارەکانیانن، کە پێم داون، خۆشیان پرسیاریان لیٚ بکەن، خەلیفەکانی پێش من لە والییەکانی من کەم تەمەن ترو تازە لاویان دەکرد بە والی، بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ ئوسامەی کوری زەیدی کردە ئەمیر، تەمەنی لە رێی ئەمیرێتیدا نەبوو، لەم گلەییانە خراپتریان وت بە پێغەمبەر ﷺ، ئایا وا نەبوو؟ وتیان: بەریٚ بە خودا، ئەمانە توانج ئەگرنە خەڵك بە بیٚ ئەوەی شرۆڤەی بکەنو لێی ورد ببنەوە.

٦- ئێوە دەڵێن من دەستکەوتم داوە بە عەبدوبدوڵڵای کوری سەعد، من لە پێنجی دەستکەوتم پێداوە، کە (١٠٠) هەزارە لە حەقی ئەو جیهادەی کە ئەفریقای رزگار کرد، بەڵێنم پیٚ دابوو، ئەگەر خودای گەورە لەسەر دەستی تۆ ئەفریقای رزگار کرد پێنج لە سەدی دەستکەوتەکەی خەڵات بیٚ بۆ تۆ پێشم تەبریە کردووە سەرکاری وایان کردووە، وێرای ئەمەش سەربازە موجاهیدەکان پێیان وتم: ئێمە پێمان نارەحەتە پێنج لە پێنجی بدەی بە ئەبی سەرح، هەرچەند ئەوان مافی قبولکردنو رەفز گردنیان نەبوو، من پێنج لە پێنجەکەم لە ئەبی سەرح وەرگرتو دام بە سەربازەکانی، بەم شێوەیە ئەبی سەرح هیچی بەر نەکەوت ئایا وانەبوو؟ هاوەڵان وتیان بەریٚ بەخودا.

٧- ئێوە دەڵێن من کەسوکارەکەم خۆشدەویٚو بەشیان دەدەم، بزانن خۆشەویستی من بۆ خزمەکانم قەد وام لیٚ ناکا مەیلم بچیٚ بۆ زوڵمو ناحەقی کردن بە خەڵکی تر، بەڵکو مافەکانی خۆیانیان دەدەمیٚو تۆڵەشیان بکەوێتە سەر لێیان دەسێنم، ئەو بەشانەش پێیداون لە ماڵی تایبەتی خۆم پێمداون، سامانی هیچ موسڵمانێك نییە، چونکە ماڵی موسڵمانان بۆ کەس رەوا نییەو بە حەڵاڵی نازانم بۆ هیچ کەسێك حەڵاڵ نییە، من خەڵاتی گەورەو بەنرخم داوە بە خزمەکانم لە بڕبڕەی پشتی ماڵی خۆم لە زەمانی پێغەمبەرو

ئەبوبەکرو عومەردا، ئەمڕۆ لە چاو زودا چاوچنۆكو ماڵ خۆشەویستم، هیشتا ڕەزیلی دەکەم، ئەوە بەس نییە ئەدەم بە لای پیرەکانی خزمی خۆمداو تەمەنم لە تەواویدایەو ئەو ماڵەی کە هی خۆمو خێزانمە خزمەکانم هیچ یان بەر ناکەوێ، کەچی مولحیدەکان ئاوا دەڵێن، وەڵلاهی من هیچ سامانو بەخششێکم وەرنەگرتووە لە شارێ لە شارەکانی موسڵمانان ئیللا گەراندومەتەوە بۆ خودی ئەو شارانە هیچ ماڵو سامانێکم نەهێناوە بۆ مەدینە پێنجیەکی دەسکەوت نەبێ، موسڵمانانیش هەستاون بە دابەشکردنیو داویانە بە موستەحەقەکان، وەڵلاهی لەم پێنج یەکە من فلسێکم هەڵنەگرتووە بۆ خۆم هەتاکو ئێستا جگە لە ماڵی خۆم هیچی کەسم نەخواردووەو هیچیشم نەداوە بە خزمەکانم لە ماڵی خۆم نەبێ.

٨ـ ئێوە دەڵێن، من زەویە رزگارکراوەکانم بە خشیوە بە چەند پیاوێکی دیار، ئەم زەوییە رزگارکراوانە کۆچەرییەکانو ئەنسارەکانو موجاهیدەکان بەشدارییان کردووە لە رزگارکردنیدا، کاتی ئەم زەویانەم دابەش کرد بەسەر موجاهیدە رزگارکەرەکاندا هەندێکیان مانەوەو نیشتەجێ بوون تێیدا، هەندێکیشیان گەرانەوە ناو کەسوکاریان لە ناو مەدینەو شوێنەکانی تر، ئەو زەویە بوو بە موڵکیانو هەندێکیان فرۆشتیانو نرخەکەی لەگیرفانی خۆیاندایە.

بەم شێوەیە عوسمان وەڵامی ئەو هەموو گازندانەی دایەوە، کە کردبوویانە هەڵاو هاتووهت بەسەریەوە، روونی کردەوەو رووی راستی گلەییەکانی دەرخست[1]، ئەم بەرگرییە مێژووییە عوسمان کردیە بەرەڤانی بۆ خۆی، هاوەڵان شاهیدییان بۆ دەداو وێنەی دروستی کارەکانی دەخستە بیریانو ئەو رەخنە تاڵو تفتانەی کە سەبەئییەکان پرشوبڵاویان دەکردەوە لە قسەی ناقۆڵاو پڕوپاگەندە خستیە بە باری راستید، سەبە ئییەکان کاریان دەکرد بۆ رەواج پێدانی قسە پووچو بێکەڵکەکانیان، عوسمان باسی ئەو بەڵگانەی کرد کە کردبوویانە رەخنە بەسەریەوە کرۆکی کارەکانی بۆ دەرخستن، کە بە چاورۆشنی کردویەتیو بەڵگەی ئیسلامیی بەدەستەوەیەو هیچی لە خۆڕا نەکردووە،

[1] العواصم من القواصم، ص (٦١ ـ ١١١)، تاريخ الطبري (٣٥٥/٥، ٣٥٦)، الخلفاء الراشدين للخالدي، ص (١٥٨)، الفتنة، أحمد عمر موش، ص (١٠ ـ ١٤).

بەڵام ئەمانە مەرامیان هەبوو کە ڕەگی تێگەیشتنیان نەبوو نەیان دەویست ئەم کارانە بنبەست بکەن، عوسمانیش وەکو پیاوێکی خاکەسارو نیازپاك مشتومڕی لەگەڵ کردن، چونکە دەیزانی نەگبەتی گرتوویەتی قسەی هیچو پوچیان لە دەم دەکەوت بۆ ئەوەی مەرامەکانیان بەر بگرێو دەروونی خەڵکی پڕ بکەن لە بیانوو هەرکەسێکیش ڕوی هەڵماڵیبێ بەڵگە قەناعەتی پێ ناکاو دەلیل ڕێنمایی ناکا، چونکە هەرکەسێ خودا سەری لێ بشێوێنێ کەس ناتوانێ ڕێنمایی بکات[1]، سەرانی فیتنەچییەکان کە لە تەنیشت مینبەرەکەوە بوون قسەو ڕوونکردنەوەکانی عوسمانیان بیست، هەروەها هاوەڵە بەڕێزەکانو موسڵمانە ڕاستەکانیش بیستیانو بە قسەکانی عوسمانو ڕوونکردنەوەکانی باوەڕیان کردو خۆشەویستی عوسمان زیادی کرد لە دڵیان، بەڵام سەبەئییەکان، کە چارچی فیتنەو جیاوازی بوون باوەڕیان نەکردو نەشگەڕانەوە، چونکە ئەوان عەودالی حەق نەبوون حەزیان لە چاکە نەبوو، ئامانجیان ئاژاوە نانەوەبوو چاوو راویان دەکرد لە موسڵمانانو ئیسلام، هاوەڵانو موسڵمانان ئاماژەیان کرد بۆ ئیمامی عوسمان کە سەرانی ئەم سەبەئییە فیتنەچییانە بکوژێت، لە تۆڵەی ئەم هەمووە درۆو ساختەکارییو فیتنەدا، کە دەربڕییان کردووە، ئیمامی عوسمان زۆر پێداگربووە بۆ نەکوشتنیان بۆ ئەوەی موسڵمانان قوتاریان بێ لە شەڕیان، وڵاتی موسڵمانان ئۆقرە بگرێ،و ئەم فیتنەیەی کە هەڵیان خزاندووە پەڕ بگرێ، بەڵام ئیمامی عوسمان رایەکی تری هەبوو، شیکردنەوەیەکی گۆڕانکاری هەبوو پێی وابوو وازیان لێ بێنی نەیان کوژێ، چونکە هەوڵی ئەوەی ئەدا بەرپابوونی ئەم فیتنەگەریە دوا بخرێتو عوسمان لە دژی ئەم سەبەئییانە کە لە میسرو کوفەو بەصرەوە هاتبوونە مەدینە، هیچ لێپێچینەوەیەکی نەکرد، سەرەڕای ئەوەی کە دەیزانی پیلانیان دارشتووەو دژایەتییان برپارداوە وازی لێ هێنانو ڕێگەی بۆ چۆڵ کردن، مەدینە چۆڵ بکەنو بڕۆنەوە شارەکانی خۆیان[2].

---

[1] تاريخ الجدل لمحمد أبو زهرة، ص (٩٨، ٩٩).

[2] الخلفاء الراشدين للخالدي، ص (١٥٨، ١٥٩).

### پێنجەم: وەڵامی هەندێ لە خواستەکانی دانەوە

ئیمامی عوسمان وەڵامی هەندێ لە داواکارییەکانی دانەوە، هەندێ والی لەسەر کار لابردو ئەو والییانەی دەکردە والی کە ئەوان هەڵیان دەبژارد، ئەم شێوازە بەسە بۆ چارەسەرکردنو پیادەکردنی راستیو دادپەروەری ئەگەر کاروبارەکان لە شوێنی سروشتی خۆیاندا بەرێوە بچوونایە بارودۆخەکە وای لێ دەهات، گلەییو گازندەکان بنەبڕ ببوایە بەڵام نەگبەتی پەنهانو کینەی نەفامی دامەنگیریان بوو بۆ بەرپاکردنی فیتنە لە نێوان موسڵماناندا و بڕینی یەکێتیی ئوممەت، هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لە بارەی شەهیدبوونی ئیمامی عوسمان دەبو بهاتایەتە ئاراوە[1].

### شەشەم: بنەماکانی مامەڵەکردن لەگەڵ فیتنەکەدا لای عوسمان

ئەوەی جێگەی هیوابوو لە ڕێنماییەکانی عوسمان بۆ مامەڵەکردن لەگەل ئەم فیتنەیەدا، کە کەوتە سەردەمی ئەو توانی ئەو بنەمایانە هەڵهێنجێ، کەیارمەتی موسڵمانان دەدات بۆ بەرهەڵستیکردنی فیتنەگەری ئەم بنەمایانەش:

١ـ خۆگرتنو چەسپاویی:

عوسمان لیژنەی پشکنینی نارد بۆ هەموو شارەکانو بۆ ئەوەی گوێبیستی خەڵکەکە بن، توانی کۆمەڵی سەبەئییەکان ببڕێو کەینو بەینیان وەرگرێ بچێتە ناویان، لەسەر حەقیقەتی کارەکانیان هەڵوەستە بکاتو پەلە نەکات لە دەرکردنی حوکم بەسەریاندا.

٢ـ پابەندبوون بە ویژادنو دادگەرییەوە:

ئەم بنەمایە لەو نامەدا کە ناردی بۆ شارەکان بە روونی دیارە داوای کرد لەوانەی کە جنێویان پێدراوە یان لێیان دراوە، لە لایەن والییەکانەوە با وەرزی حەج کردن بێنو خەلیفە ببینو داوای حەقی خۆیان بکەن، لە خۆی یان لە کارگێڕەکانی[2].

٣ـ لەسەر خۆیو هێمنی:

ئەم بنەمایە لەو نامەدا، کە ناردی بۆ خەڵکی کوفە بە ڕۆشنی دیارە کە کاتێ ئەوان داوایان کرد سەعیدی کوری عاص لە والێتیی لابات و ئەبو موسای ئەشعەری بخاتە شوێنی، لەم نامەدا هاتووە، عوسمان دەڵێ: وەڵڵاهی ماڵو سامانی خۆمتان بۆ ڕا دەخەم

---

[1] الخلافة عثمان للشملي، ص (٧٨).

[2] تاريخ الطبري (٣٤٩/٥).

هەرچی سەبرم هەیە بۆتان سەرف دەکەم، بە کۆششی خۆم دەتانسازێنم هەر شتێ ئێوە پێتان ناخۆشبێ ئەگەر سەرپێچی خودای تیا نەبێ من لێتان دەبورم، هەر شتی ئێوە بێتان خۆشبێ سەرپێچی خودای تیا نەبێ داوام لێ بکەن ئەتاندەمێ[1].

٤ـ پەرۆشی بۆ ئەو شتانەی کە موسڵمانان کۆدەکاتەوە فڕێدانی ئەو شتانەی کە دوبەرەکی دەنێتەوە:

بۆ ئەم مەبەستە عوسمان خەڵکی کۆکردەوە لەسەر یەك جۆر قورئان، وەکو پێشتر باسمان کرد کاتێ ئەشتەری نەخەعی سێ پێشنیاری خستە بەردەم عوسمان لەمەولا بە دوورودرێژی باسی دەکەین، عوسمان وتی: ئەگەر بمکوژن گوناهێکم نەکردووە پێویست بە کوشتن بکات، وەڵلاهی ئەگەر من بکوژن لە دوای من خۆشەویستیو رێز لە نێوانتاندا نامێنێ، دوای من نوێژی بە جەماعەت ناکەن پێکەوە، پاشان دوای یەك دەنگ نابن بۆ کوشتنی دوژمن[2].

٥ـ خووی گرتبوو بە بێدەنگیو سڵی دەکردەوە لە زۆربێژی:

لە درێژی ژیانی عوسماندا ئەو سیفەتە ئاشکرایە کە کەم دوو بووە، تەنها لەو شتانەدا نەبێ کە بە کەڵکن، وەکو زانستو ئامۆژگارییو تەوجیهاتو ڕەتکردنەوەی تۆمەتی پڕوپووچ، عوسمان کەم قسەی کردووەو زۆر بێدەنگ بووە.

٦ـ راوێژی دەکرد بەزانان و خووا پەرستەکان:

عوسمان راوێژی دەکرد بە هاوەڵە زاناکان، وەکو عەلیو تەلحەو زوبێرو موحەممەدی کوڕی مەلسەم عەبدوڵلای عومەر عەبدوڵلای سەلام (رەزای خوایان لێ بێت)، زانایان سەرقاپی سەلامەتین، لە نەهامەتیو فیتنەی ڕەش و تاریکدا ئەوان دالدەن، چونکە لە هەموو کەس باشتر لەو بارودۆخانە تێدەگەنو دەزانن سەر بەکوێوە دەنێت، هەرکەسێ پەنا ببات بۆ زانایان، چەمکی دروستو دیدی راستو هەڵوێستی شەرعی روونی دەست دەکەوێت[3].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٤٣).

[2] البداية والنهاية (٧/١٨٤).

[3] احداث وأحاديث فتنة الهرج، ص (٧٢٨).

٧ـ فەرمودەكانی پێغەمبەری ﷺ دەكردە ڕێبەر لە بابەتی فیتنەگەریدا:

ڕێبازی عوسمان لە كاتی فیتنەو ڕێچكەكانی لەگەڵ ئەو یاخیبووانەی كە هاتبوونە سەری نە ڕێڕەوی ڕووداوەكانو نە فشاری واقیع هیچیان بەسەردا نەسەپاند، بەڵكو ڕێبازێكی هەڵقولاوی لەپایەی پێغەمبەرایەتییەوە دارِشتو بەو چەشنەی كرد، كە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردبوو ئارام بگرێو بە تەمای پاداشت بێو كوشتار نەنێتەوە هەتا ئەم قەدەرەی خودای گەورە بڕیاری داوە جێبەجێ دەبێ، چونكە ڕێناگیرێ لە بڕیارەكانی خودای گەورە، عوسمان ئەو گفتوگۆو بەڵێنەی دابووی بە پێغەمبەر ﷺ بە درێژایی ڕۆژانی خەلافەتی نەیشكاندو بێ وەفایی نەكرد، هەتا شەهید بوو، بە ناحەقیو نارِەوایی درا بەو خوێنە پاكو بێخەوشەی خۆیەوە[1]، موحیبەدینی خەتیب دەڵێ: سەرجەم ئەو هەواڵانەی كە باسی هەڵوێستی عوسمان دەكەن دەبارەی بەرگری كردن لە خۆی یان تەسلیم بوون بۆ قەدەری خودا ئەمەیە، كە قەڵسو بێتاقەت بووەو بە فیتنەنانەوە ترساوە لە خودا كە خوێنی موسڵمانان بڕێژێ، لە كۆتایی كارەكەدا پێی خۆشبووە هێزێكی پتەوی هەبێو سەركەشەكانی پێ بترسێنێو بەربەستیان بكا لە دەستدرێژی و تاوان، بەڵام چەك بەكار نەهێنێ بۆ گەیشتن بە ئامانج بەر لەوەی كار بگاتە ئەم رادەیە موعاویە پێشنیاری كرد بۆ عوسمان كە هێزێك لە سەربازی شامی بۆ ڕەوانە بكات كە ببنە بارمەتەی بۆچوونەكانیو چەكی دەستی بەڵام قبوڵی نەكرد كە تەنگیو نارِەحەتی بخاتە سەر شاری مەدینە بە هۆی ئەو سەربازانەی كە دێنە ناویان، گومانی نەبوو كەوا هەموو دەستەیە لە برا موسڵمانەكانی ئەوەندە بوێرییان تێدایە، كە پارێزگاری بكەن لە خوێنی یەكەمین كۆچەری كە لە پێناوی دیندا كۆچی كرد، بۆ لای خودای گەورە، كاتی سەركەشو یاخیبووەكان تەنگییان پێ هەڵچنیبوو لێی هاتنە پێشەوە باوەریشی وابوو بەرگری كردن لە خۆی دەبێتە هۆی لافاوی خوێنرِشتنو جەسووری زۆری كرد لەو كەسانەی كە گوێی بۆ دەگرنو بە قسەی دەكەن، كە دەستو چەكیان هەڵگرن لە توزگەكانی توندوتیژی، لەم بارەیەوە هەواڵی زۆرو بێشومار هەیە لە سەرچاوەی دۆستەكانیو دوژمنەكانی، ئەگەر لەو گۆڕەپانەدا هێزێكی ڕێكخراوی بە

---

[1] استشهاد عثمان ووقعه الجمل، ص (١١٦).

هەیبەت دەربکەوتایەو رووبەڕووی ئەم شۆڕشگێڕانە بوەستایەو سنووڕێکیان دابنایە بۆ ئەو نەفامیو ملهوڕیانەیان ئەمانە ئەوکاتە عوسمان دەرباز دەبوو، خۆشحاڵ دەبوو۔ سەرەڕای ئەوەی کە ئەرخەیان بوو کە نامرێت بە شەهیدی نەبێ، بەڵام ئەم هێزەی پێکەوە نەنا، چونکە شەڕخواز نەبوو[1].

---

[1] العواصم من القواصم، ص (١٣٨).

## باسی سێیەم: فیتنەبازەکان دەستیان گرت بەسەر مەدینەدا

### یەکەم: هاتنی فیتنەبازەکان لە شارەکانەوە

هەموو فیتنەبازەکان رێککەوتن لە نێوان خۆیاندا کە هەستن بە هەنگاوێکی عەمەلیو کودەتایەك بۆ هێرش بردنە سەر عوسمان لە مەدینەدا، وای لێ بکەن کە دەست هەڵگرێ لە خەلافەت یان بیکوژن، بڕیاریاندا لە هەرسێ مەکۆکەیانەوە بێن واتە لە میسرو کوفەو بەسرە، لە وەرزی حەجکردندا لەگەڵ حاجییەکاندا بێنو شاری خۆیان بە جێ بهێڵن بە ناوی حەج کردنەوە هەنگاو بنێنو خەڵکی واتێگەیەنن کە بۆ حەج هاتوون، کە گەشتنە گەمارۆی مەدینە حاجییەکان بەجێ بهێڵنو ئەو کاتە مەدینە چۆڵ دەبێتو زۆربەی دەچێ بۆ حەجو سەرقاڵی حەجکردن، ئەو بۆشاییە بقۆزنەوەو گەمارۆی عوسمان بدەن، دەست پێکەکەیان ئەوەیە عوسمان واز بهێنی یان بیکوژن[1]، لە شەشەڵانی ساڵی ٣٥ی کۆچی فیتنەبازەکان چونە سەر بەرزاییەکانی مەدینە[2] و یاخیبووەکانی میسریش بەچوار تیپ هاتن، هەر تیپێکیان ئەمیرێکیان هەبوو ئەم ئەمیرانەش یەك سەرگەروەریان هەبوو کە لە هەموویان شەیتان تر بوو، عەبدوڵڵای سەبەء بوو، ئەمیری ئەم چوار تیپە ئاژاوە چییە عەبدوڕڕەحمانی کوری عەدیی بەلوسی، کە نانەی کوڕی بوشرا ئەمینی، سقودانی کوری حمرانی سکوتی، قەتیرەی کوری فلانی سکونی، ئەمیری گشتی ئەمانەش (خافق کوڕی حەربی عەکی) بوو، ئەم چوار تیپە هەزار پیاوو بوو، هەزار پیاوی یاخی سەرکەشی کوفەش هاتن بە چوار تیپ ئەمیرەکانیشیان ئەمانە بوو: زەیدی کوری سومانی، عەیدی ئەشتەری، ئەخەعی زیادی کوری ئەخری مارسی، عەبدوڵڵای کوری ئەحەم، ئەمیری گشتیی یاخیبووەکانی کوفە عەمری شەلەصەم بوو، هەزار پیاوی یاخیو سەرکەش لە بەسرەوە هاتن بە چوار تیپ، ئەمیری ئەم تیپانەش ئەمانە بوو: حەکیمی کوری جەبلەی عەبدی، وەریعی کوری عەبادی عەبدی، بۆشری کوری شورەیعی قەیسی ئیبنو موحەڕەشی کوڕی عەبدول مەنفین ئەمیری گشتی یاخیبووەکانی بەسرە مەرقوسی کوڕی زەهری سەعدی، عەبدوڵڵای کوری سەبەء لەگەڵ ئەم تاقمانەدا

---

[1] الخلفاء الراشدون للخالدي، ص(١٥٩).

[2] المصدر نفسه.

بەدڵشادیو کامەرانی دەهاتو زۆر خۆشحاڵبوو، کەپ یلانە جوولەکەیی شەیتانییەکەی سەری گرتووە، فیتنەبازەکانی خەڵکی میسر دەیانویست عەلی ببێتە خەلیفە، فیتانەبازەکانی خەڵکی کوەفە دەیانویست زوبێری کوری عەوام ببێتە خەلیفە، فیتنەبازەکانی خەڵکی بەسرەش دەیانویست تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ببێتە خەلیفە[1]، لەم داوا نەگریسەیان ئامانجیان ئەوەبوو نادردی بخەنە نێوان هاوەڵانەوە وەك ئیمامی ئاجوری باسی دەکات دەڵێت: خوای گەورە (عەلی کوڕی ئەبی تالبو تەلحەی کوڕی زوبێری) پاراست لەو تەفرەقەیە، ئەم تاقمانە ئەم کارانەیان بۆ ئەوە دەکرد، کە ئاڵۆزیو ناکۆکی بخەنە نێوان هاوەڵانەوە خودای گەورەش هاوەڵانی پاراست لەم ئاشووبە[2] بەر لەوەی بگەنە شاری (مدینە) هەواڵی هاتنیان گەیشت بە ئیمامی عوسمان، ئەوکاتە لە گوندێکی دەرەوەی مەدینە بوون، کە بیستی هاتوون، وردە وردە بەرەو رووی عوسمان، هاتنو ئەویش پێشوازی لێکردن، ریوایەتەکان ناوی ئەم گوندەیان باس نەکردووە، مدائینی بەرواری هاتنەکەیانیانی دیاری کردووە، کە شەوی چوارەمی مانگی (ژی القعدە) بوو[3]، یەکەمین تاقم میسرییەکان گەیشتن، وتیان بە عوسمان بانگ بکە با قورئانێ بێنن ئەویش قورئانێکی هێنا، وتیان: ئادەی سورەتی حەوتەم بکەرەوە واتە (سورەتی یونس)، دەستی کرد بە خوێندنەوەی هەتا گەشتە ئایەتی ().

وتیان: بەسە ئیتر ئایا دەزانی چەندە لەوەڕگات پاوەند کردووە؟ ئایا خودای گەورە رێگەی پێداوی یان درۆت بەدەم خودای گەورەوە کردووە؟ عوسمان وتی: ئێوە هیچ لەم ئایەتانە نازانن، دەربارەی شتێکی تر دابەزیوە، ئەم پاوەنانە پێش من، عومەر پاوەنی کردووە بۆ وشترە صەدەقەکانی، کاتێك من بوومە خەلیفە وشتری صەدەقە زیادی کرد، منیش ناچاربووم لەوەڕگاکانی زیاد بکەم، جا ئێوە واز لەم ئایەتە بێنن، وتی: ئەوان بەم ئایەتە رەخنەیان لێ دەگرن ئەویش وتی: ئێوە واز لەو ئایەتە بێنن بۆ مەبەستێکی تر دابەزیوە، هیچی ترتان پێ نییە.

---

[1] تاريخ الطبري (٣٥٧/٥).

[2] استشهاد عثمان ووقعه الجميل، خالد الغيث، ص (١٤٨).

[3] فتنة مقتل عثمان، د. محمد الغبان (١٢٧/١).

ئەم جەماعەتە هاتنەوە سەر پەیمانی خۆیانو مەرجێکیان لەسەر دانا، واتە لەسەر عوسمان، ئەویش بەڵێنی لێوەرگرتن کە گۆچانی موسڵمانان نەشکێنو لە جەماعەت جیا نەبنەوە هەتا ئیمامی عوسمان مەرجەکەیان جێبەجێ بکات، پاشان بەرەزامەندی گەڕانەوە[1].

عەلی کوڕی ئەبی تالب لە لایەن ئیمامی عوسمانەوە نێردرا بۆ دانوستان لەگەڵ فیتنە بازەکاندا لە شارەکان.

ئەم تاقمانە لە (زیلمەروە) لایاندا نزیکەی مانگو نیوێك پێش کوشتنی ئیمامی عوسمان، عوسمان عەلیو پیاوێکی تر کە ریوایەتەکان ناویان نەبردووە ناردنی بۆ ناویان، عەلی توشیان هاتو پێی وتن گوێڕایەڵی پەڕاوەکەی خودا دەکەنو هەرچییان لەلا قورس بێت گلەیی دەکەن[2]، لە ریوایەتێکی تردا نوسراوە، ئەوانە (عەلی)یان بەزاند، (عەلی)یش دووجار یان سێجار ئەوانی بەزاند، پاشان وتیان کوڕە مامەکەی پێغەمبەر ﷺ نوێنەری ئەمیری ئیمانداران داوا دەکات قورئان بکەوێتە نێوانمان، ئەوانیش قبوڵیان کرد[3]، لە سەر پێنج شت سوڵحیان کرد، کە هەرچی دوورخراوەتەوە بگەڕێتەوە شاری خۆی، هەرچی بەشخوراوە بەشی بدرێت، بەخشیشو موچە زیاد بکرێ لە دابەشکردندا دادگەر بن، ئەو کەسانە بکەن بە کاربەدەست کە بەهێزو ئەمانەت پارێزن، لەم بارەیەوە نوسراوێکیان نووسیو بڕیاریاندا عەبدوڵڵای کوری عامر بگەڕێتەوە بۆ بەسرە، ئەبو موساش بە والی کوفە بمێنێتەوە[4] بەم چەشنە عوسمان صوڵحی کرد لەگەڵ هەموو نوێنەرەکاندا، بە توندوتۆڵی، پاشان نوێنەرەکان گەڕانەوە بۆ شاری خۆیان[5].

دوای ئەم صوڵحەو گەڕانەوەی خەلکیی شارەکان بە رەزامەندی دەرکەوت، کێ ئەم فیتنەیەی هەڵگیرساندووەو دڵنیابوو، کە پیلانەکەی هەڵوەشاوەتەوەو مەرامە گڵاوەکانی بەدی نایەت، بۆیە هەستان نەخشەیەکی تریان کێشا کە ئەم فیتنەیە گورجو

---

[1] فتنة مقتل عثمان، د. محمد الغبان (١/١٢٨).

[2] تاريخ دمشق ترجمة عثمان، ص (٣٢٨)، تأريخ خليفة، ص (١٦٩، ١٧٠).

[3] فتنة مقتل عثمان (١/١٢٩).

[4] فتنة مقتل عثمان (١/١٢٩).

[5] فتنة مقتل عثمان (١/١٢٩).

گۆڵ بکاتو بیژێنێتەوە، بڕیارندا ئەو صولحەی لە نێوان خەڵکی شارەکاندا کرا بیتەپێنن‌و تێکی بدەن، لەمەودوا بە ڕۆشنی ئەم ڕاستیەمان بۆ دەردەکەوێت.

لە کاتی گەڕانەوەی خەڵکی میسر، کابرایەکیان بینی سواری وشترێك بوو، لێیان نزیك دەبوویەوەو دووردەکەوتەوە وا دەردەکەوت کە ئەو سوارە لەم خەڵکانە دەترسێت کارەکەی ئەوەی دەگەیاند کە وەرن بم گرن، ئەوانیش گرتیان‌و پێیان وت چیت دەوێت؟ وتی: من نوێنەری ئەمیری ئیماندارانم ئەچم بۆ مسر بۆ لای کارگێڕەکەی واتە (ئەمیر)، ئەوان پشکنییان سەیر دەکەن کە نوسراوێکی پێیە بە ناوی عوسمانەوە نوسراوەو مۆری ئەویشی لێ دراوە، کاتێك نوسراوەکەیان خوێندەوە فەرمان کرابوو بۆ کارگێڕەکەی میسر کە ئەم خەڵکانە هەڵواسێ یان بیانکوژێ، یان دەست‌و قاچیان بپەڕێنێت.

خەڵکەکەش گەڕانەوە بۆ مەدینەو چوون بۆ لای عوسمان[1]، عوسمانیش حاشای کرد لەم نوسراوەو نوسراوی من نییە! پێی وتن دوو شت هەیە بۆ ساغ کردنەوەی ئەم نووسینە، یان دوو پیاوی موسڵمان بکەن بە شاهید بەسەرمەوە، یان سوێند دەخۆم بەو خودایەی کە هیچ خوایەکی تر نییە ئەو نەبێت ئەم نوسراوە من نەمنووسیوە، حەزم پێ نەکردووە پێشم نەزانیوە، ئەم نووسراوە لەسەر زمانی پیاوێك نوسراوە نەقشی مسیلەکەی منیشی هەڵکۆڵیوە، بەڵام باوەڕیان پێ نەکرد[2]، ئەم نوسراوەی کە یاخییە سەرکەشەکان گومانیان دەبرد، کە عوسمان نوسیبێتی، مۆری ئەمیری لێ دراوەو داویەتی بە خزمەتکارێکی خۆی کە بیبات بۆ عەبدوڵڵای کوری مەسعود، کە والییە لە میسر، فەرمانی کردووە تیایدا کە ئەم لاڕێیانە ئەم سنورشکێنانە بکوژێت، ئەو نوسراوە تەزویر بوو درۆ بوو بەدەم ئیمامی عوسمانەوە نوسرابوو، بەم خاڵانە ڕۆشنی دەکەینەوە:

١ـ ئەو کەسەی ئەم نوسراوە تەزویرەی پێبوو خۆی پیشانی خەڵکی میسرییەکان دەدا، پاشان دووردەکەوتەوە چەند جارێك ئەم کارەی کرد بۆیە وای دەکرد سەرنجی خەڵکەکە ڕابکێشێ بەرەولای خۆی‌و بیانخاتە گومانەوە، وەکو چۆن بڵێی شتێکی خەتەرناکم پێیە لە بارەی ئێوەوە، چونکە ئەگەر لە عوسمانەوە بیهێنایە، ئەم نامەبەرە

---

[1] تاریخ الطبري (٥/٣٧٩).

[2] فتنة مقتل عثمان (٥/١٣٢)، البداية والنهاية (٧/١٩١).

دەترساو خۆی نیشانی ئەوان نەئەداو دووردەکەوتەوەو بە خێرایی دەچوو بۆ لای والی میسر بۆ ئەوەی فەرمانەکەی پێ بگەیەنێت، ئەویش جێبەجێی بکات.

٢ـ باشە چۆن عێراقییەکان بەم کارەیان زانی کە بەرەو شاری خۆیان دەچوون، روویان کردبووە ولاتی خۆیانو جیابوونەوە لەو میسریانەی کە ئەم نوسراوە دەست هەڵبەستەیان دەسکەوت ماوەیەکی زۆر دوور لە یەك جیابوونەوە عێراقییەکان وان لە خۆرهەلاتو میسرییەکان وان لە خۆرئاوا کە چی هەردوکیان لەیەك کاتدا گەرانەوە بۆ مەدینە، وەکو بڵێی مەوعیدیان هەبووە، ئەمە عەقڵ نایبڕێ ئەوانەی ئەم نوسراوە تەزویرەیان ناردو کەسێکیان بۆ کرێ گرت بە سواری بیباو بەو شێوەیە دەور ببینێ لە بەرچاوی میسرییەکان هەر ئەوانە سوارێکی تریان بەکرێ گرتو ناردیویانە بۆ عێراقییەکان بۆ ئەوەی هەواڵیان بداتێ کە میسرییەکان نوسراوێکی ئیمامی عوسمانیان کەشف کردووە، کە تێیدا داوا دەکات لە رێی دەرچووەکانی میسر بکوژن، عەلی کوری ئەبی تالب ئەم بۆچوونەی کردە بەڵگەو وتی: ئەی خەڵکی کوفەو بەسرە، چۆنتان زانی کە خەڵکی میسر نوسراوێکی وایان پێ گەیشتووە خۆ ئێوە چەند ملەتان بری چۆن گەرانەوە بەرەو رووی ئێمە[1]، بەڵکو ئیمامی عەلی جەختی کردەوە ئەم گەرانەوەیە تەڵەکەیەو لە مەدینە بەسراوە[2].

٣ـ چۆن عوسمان نوسراو ئەنووسێ بۆ عەبدوڵلای کوری سەعد کە خەڵکی میسر بکوژێت، عەبدوڵلای کوڕی سەعد دوای دەرچوونی یاخیبووەکان لە میسر، کە هاتن بەرەو مەدینە نوسراوێکی نووسی بۆ خەلیفەو داوای مۆڵەتی گەڕانەوەی کرد بۆ لای خەلیفەو ئەو کاتە موحەممەدی کوڕی ئەبی حوزەیفە هەیمەنەی هەبوو بەسەر میسرداو بە دڵنیایی عەبدوڵلای کوری سەعد لە میسر دەرچوو بەرەو عەریشو فەلەستین، ئیتر چۆن عوسمان نوسراوی بۆ دەنێرێت کە ئەم خەڵکانە بکوژێت، کە عەبدوڵلا لەوێ نەماوە؟ ئەو نامەشی لەلایە، کە عەبدوڵلا داوای گەڕانەوە دەکات لە میسر.

٤ـ عوسمان نەیهێشت کەسێ یاخیبووەکان بکوژێت، کاتێك گەمارۆیان دابوو، رێگەی نەدا بە هاوەڵان بەرگری لێ بکەن، فەرمانی نەدا ئەم لە هەق دەرچووانە

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٥٩).

[2] المصدر نفسه.

بکوژرێن، بۆ بەرگریکردن لە خودی خۆی، لەمەودوا بەدووروودرێژی باسی دەکەین، ئیتر چۆن نوسراوی وا دەنووسێت لە میسر بیانکوژن لە کاتێکدا ئەوان لە مەدینە گەڕانەوە و پەشیمانی خۆیان ئاشکرا کردووە.

٥ـ حەکیمی کوڕی جەبلەو ئەشتەری نەخەعی دوای ئەوەی یاخیبووەکان دەرچوون لە مەدینە ئەم دوانە مانەوە ئەمە ئاماژەیەکی رۆشنە کە ئەم دوانە بوون ئەم نوسراوە تەزویرەیان هەڵبەست، چونکە کارێکی وایان نەبوو تا لە مەدینە بمێننەوەو دوا بکەون تەنها بۆ ئەم مەرامە مانەوە، چونکە ئەم دوانە بەرژەوەندییان لەو کارەدا بوو[1]، ئیتر بە فەرمانی عەبدوڵلای کوڕی سەبەء بێت، یان خواستی دەروونی پیسی خۆیان بێت.

عوسمان لەم کارەدا هیچ بەرژەوەندییەکی نەبوو تا بیکات، هەروەها مەروانی کوڕی حەکەم هیچ بەرژەوەندیی نەبوو هەتا وا بکات، ئەوانەی مەروان تۆمەتبار دەکەن لەم نوسراوەدا ئەوە بێئاگاییو غەفڵەت دەدەنە پاڵ خەلیفە لە ئەرکەکانیدا، ئەوە دەدەنە پاڵ دیوانی خەلافەت کە کەسانێك کاروباریان بەڕێوەبردووە، لە خۆیانە وە بڕیاریان داوە بە بێ ئەوە خەلیفە بزانێت، بەمشێوەیە مەیدانی ئەم تاوانبارە نەگبەتە سەر هەڵگرتووانە پاساو دەدرێو پاشان ئەگەر مەروان ئەم نوسراوە تەزویرەی ناردبێ ئەوکاتە بە نامەبەرەکەشی دەوت، کە دور بکەوێتەوە لەم مونحەریفانەو لە رێگە خۆی نیشانیان نەدات، بۆ ئەوەی نەیگرن ئەگەر وابێ ئەوکاتە مەروان دەبێتە موئامەرەچییەك دژی ئیمامی عوسمان، کە ئەمەش باوەڕی پێ ناکرێت.

٦ـ ئەم نوسراوە شومە، یەکەم کتاب نییە کە ئەم تاوانبارانە ساختەکاری بکەن، بەڵکو چەند کیتابێکیان تەزویر کردووە بە دەم دایکی ئیماندارانەوە، هەروەها بە دەم ئیمامی عەلی تەلحەو زوبێرەوە، بۆ نموونە، عائیشە تۆمەتبار دەکەن کە گوایە نوسراوی نوسیوە بۆ خەڵکی فەرمانی پێکردوون هەڵگەڕێنەوە لە عوسمانو دووری بخەنەوە، عائیشە دەڵێ نەخێر شتی وام نەوتووە، قەسەم بەو خوایەی کە ئیماندار باوەڕی پێی هەیەو کافر بڕوای پێی نییە، قەڵەمم نەخستۆتە سەر کاغەزو کاغەزیی سپیم رەش نەکردووەتەوە هەتا ئەم دانیشتنەی کە دانیشتووم لێرە[2].

---

[1] عثمان بن عفان الخليفة الشاكر الصابر، ص(٢٧٧).

[2] تحقيق مواقف الصحابة (١/٣٣٤).

ئەعمەش ئەم نوسراوە رۆشن دەكاتەوەو دەڵێ: خەڵكی میسر پێیان وابوو، كە ئەم نوسراوە لەسەر زمانی عوسمان نوسراوە[1] نوێنەرەكان عەلییان تۆمەتبار كرد، كە نوسراوی ناردبووە بە شوێنیاندا كە بێن بۆ مەدینە بۆ لای ئیمامی عوسمان، عەلیش حاشای كردو سوێندی خوارد، وتی: وەڵلاهی هیچ نوسراوێكم بۆ نەنووسیو[2]، هەروەها هەندێ نامەی تریان دایە پاڵ هاوەڵان، كە ئەوان فەرمانیان پێكردوین بێین بۆ مەدینە لەبەر ئەوەی دینی پێغەمبەر ﷺ شێواوەو فەرامۆش كراوە، وای پێهاتووە جیهاد كردن لە مەدینە لە پاسەوانی كردن كە لەبەرەكانی دوژمن چاكترە، لە مەدینە جیهاد بكەین باشترە تا ئەوەی بچین لە شوێنە دوورەكان غەزا بكەین[3]، ئین كەسیر توانجێ دەگرێتە ئەم هەواڵەو دەڵێ: ئەم قسانە درۆیە بە دەم هاوەڵانەوە كراوە، نوسراوی تەزویر بە ناوی ئەوانەوە كراوە، كە گوایە عەلیو تەلحەو زوبێر نوسراویان نوسیوە بۆ خەواریجەكان، كە عوسمان بكوژن، ئەم نوسراوانە هەمووی تەزویرەو خاوەنەكانیان حەشایان لێكردووە، هەروەها لەم نوسراوانیشە بە ناوی عوسمانەوە تەزویر كراوە، نە عوسمان كاری وای كردووەو نە ئاگایشی لێ بووە، واتە چەندین نامەی ساختەكاری نێردراوە بە ناوی ئەم كەڵەپیاوانەوە بۆ جیهادكردن لە مەدینەو كوشتنی ئیمامی عوسمان، كە هیچیان راست نین[4]، ئیبن كەسیر جەخت دەكات لەسەر ئەم قسەیە، وەكو تەبەری ریوایەتی كردووە، كە هاوەڵە گەورەكان حاشایان كردووە لەم نوسراوە ساختانە، وەكو عەلیو عائیشەو زوبێر[5]، ئەو دەستە نەگریسانەی كە ئەم نامە ساختەكارییانەیان تەزویر دەكرد بە دەمی ئەم هاوەڵانەوە بوو بە مایەی هەڵگیرسانی ئاگری ئاشووبو ئاژاوە لەسەرەتاوە بۆ كۆتایی، ئەم هەمووە گەندەڵییە كەڵەكە بووەی لێ كەوتەوە، هەر ئەم نامانە رەواجیان دا بەو قسە پروپوچانەی كە دەخرانە پاڵ ئیمامی عوسمان، وای كردووەو وای وتووە،

---

[1] تأريخ خليفة بن خياط، ص (١٦٩).

[2] تحقيق مواقف الصحابة (٣٣٥/١).

[3] المصدر نفسه.

[4] البداية والنهاية (١٧٥/٧).

[5] تحقيق مواقف الصحابة (٣٣٥/١).

دەیاندا بە گوێی خەڵکداو گەمژەو ناحاڵییەکانیش باوەڕیان دەکرد، پاشان ئەم نامە ساختانە کە بە دەمی عوسمانەوە دەکرا وای کرد عوسمان ببێتە قوربانی‌و بە شەهیدی‌و بە کامەرانی بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار.

تەنیا عوسمان شەهید نەبوو، بە موئامەرەی سەبەئییە جولەکەکان تەنها ئەو ناحەقی پێ نەکرا، ، بەڵکو خودی ئیسلام ناحەقی پێ کرا، پاشان ناحەقی کرا بە مێژوویش کە مێژوویەکی شێواو لە حەق دەرچوویان تۆمار کرد، رۆڵەکانی ئیسلام مێژووە ناشیرینکراوەکەیان دەخوێننەوە کە پڕیەتی لە پەڵەو لەکە ئەوەش بە هەمان شێوە ناهەقییەکی ترە لە لایەن جوولەکەو هەڵقە لەگوێکانی، کە هەوەسبازو تەماعکار دڵ بوغزین بوون، پەنگخواردوو بوون.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە رۆڵەکانی ئیسلام مێژووی راستەقینەی خۆیان بزانن‌و ژیانی پیاوە مەزنەکانیان تێ بگەن، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە نووسەرەکانی ئەم سەردەمە لە خودا بترسن‌و بگەڕێنەوە لە برینداركردنی کەسە بەرێزەکان، پێش هەمووشتێ وردببنەوەو بکۆڵنەوە لە راستیی بۆ ئەوەی نەکەونە ئەو هەڵانەی کە خەڵکانی تر تێیکەوتوون[1].

## دووەم: دەستپێکردنی گەمارۆو رای عوسمان لەسەر نوێژکردن لە پشتسەری ئیمامە فیتنەبازەکانەوە

ریوایەتە دروستەکان روونیان نەکردووەتەوە، چۆن چۆنی گەمارۆکە دەستی پێکردو هاتە کایەوە، لەوانەیە ئەو رووداوانەی کە پێشتر وتمان، بتوانێ تیشکێ بخاتە سەر چۆنیەتی دەستپێکردنی گەمارۆکە، رۆژێکیان عوسمان وتاری دەدا بۆ خەڵکی کابرایەك کە ناوی (ئەعیونی کوری ڤبمیەی کوری ناجیەی تەمیمی) بوو[2]، قسەکانی پێ بڕی‌و وتی بە عوسمان (بالمثل)، ئەو وشەیە لە قەبێکەو یاخیبووەکان لکاندبوویان بە عوسمانەوە، بۆ سوکایەتی پێکردنی، تۆ گۆڕاوی واتە (خراپ بوویت)، عوسمان وتی: ئەمە کێیە وتیان: ئەعیونە، عوسمان وتی: نەخێر کابرا تۆ گۆڕاوی، خەڵکەکە پەلاماری

---

[1] عثمان بن عفان، الخليفة الشاكر الصابر، ص(٢٢٨، ٢٢٩).

[2] أعين بن ضبعية بن ناجية بن غفال التميمي الحنظلي الذرمي.

ئەعیونیاندا پیاوێکی خێڵی لەیس، خەڵکەکەی گەڕاندەوە دواوە، بردیەوە بۆماڵی خۆیان[1]، گەرانەوەی دووەم جاری یاخیبووەکان‌و پێش دابەستنی گەمارۆ، ئیمامی عوسمان دەیتوانی بچێت بۆ نوێژو هەرکەسیش بیویستایە دەچووە لای، پاشان رێگەیان گرت لە ئیمامی عوسمان نەیان هێشت لە ماڵەکەی دەربچێت بۆ نوێژە فەرزەکان[2]، ئەو کاتە یەکێك لەو پیاوانەی کە عوسمانی گەمارۆ دابوو، ئیمامێکی فیتنەباز بوو خۆی کردە پێشنوێژی خەڵك تەنانەت عوبەیدوڵلای کوڕی عەدی کوڕی خەیار پەست بوو، کە نوێژ لە پشتی سەریەوە بکات، چوو پرسیاری کرد لە عوسمان کە ئایا نوێژ بکەم یان نا؟ ئیمامی عوسمانیش وتی: (نوێژ بکە لە پشتیەوە)، پاشان پێی وت: (نوێژ چاکترین ئیشە کە خەڵکی بیکات کە خەڵکی چاکە دەکەن تۆش چاکبە لەگەڵیان، ئەگەر خەڵکی خراپەیان کرد دوورکەوەرەوە لە خراپەیان)[3].

لە هەندێ ریوایەتی لاوازدا هاتووە، کە ئەو کەسەی پێشنوێژی دەکرد غافقی بوو[4]، کە سەرگەورەی یاخیبووەکان بوو، ئەو ریوایەتەی واقدی ریوایەتی کردووە، گوایە عەلی فەرمانی کردووە بە ئەبو ئەیوبی ئەنساری، کە نوێژی خەڵکی بکات، ئەویش لەسەرەتای گەمارۆکەدا بەرنوێژی بۆ کردوون، پاشان عەلی خۆی بەرنوێژی بۆ دەکردن، ئەم ریوایەتە سەنەدەکەی زۆر لاوازە، چونکە ئەگەر ئەبوئەیوب‌و عەلی بەرنوێژییان بکردایە عوبەیدوڵلای کوڕی عەدی بێزارو پەست نەدەبوو کە لە پشت سەریان نوێژ بکات[5].

سێیەم: دانوستان لە نێوان عوسمان‌و گەمارۆییەکاندا.

دوای ئەوەی بە تەواوی گەمارۆیان داو چواردەوری ماڵی عوسمانیان گرت، داوایان لێ کرد یان دەست لە خەلافەت هەڵگرێ، یان کوشتنی خۆی[6]، ئیمامی عوسمان دەستهەڵگرتنی رەتکردەوەو وتی: ئەو کراسە داناکەنم کە خودای گەورە کردویەتییە

---

[1] تأريخ دمشق، ترجمة عثمان، ص(٣٤١، ٣٤٢) اسناده حسن.

[2] البخاري، كتاب الصلاة، رقم (١٩٢).

[3] فتنة مقتل عثمان (١/١٤٥).

[4] تاريخ الطبري (٥/٤٤٤).

[5] فتنة مقتل عثمان (١/١٤٥).

[6] الطبقات لابن سعيد (٣/٦٦)، وتأريخ خليفة بن خياط، ص(١٧١).

بەرمن[1] ئاماژەی کرد بۆ ئەو وەسیەتەی کە پێغمبەر ﷺ پێیکردبوو، هەرچەند هەندێ لە هاوەڵان وایان بەباشدەزانی ئەو پێشنیازە قبوڵ بکاتو دەست لە خەلافەت هەڵگرێ، بۆ ئەوەی خوێن نەڕژێ، بۆ نموونە موغیرەی کوری ئەخنەس، بەڵام عوسمان رەتیکردەوە[2].

١ـ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هانی ئیمامی عوسمانی دەدا، کە تەنازول نەکات لە پلەی خەلافەتی، عەبدوڵڵای عومر لە کاتی گەمارۆکەدا چووە خزمەت عوسمانو پێی وت: (بزانە ئەم سەرکەشانە چییان دەوێت؟)، وتی: دەڵێن دەست لە حوکم بکێشەرەوە، یا نەتکوژین، یان خۆت مەدە بە کوشتن! عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وتی: ئەگەر دەستهەڵگری لە خەلیفەیەتی ئایا هەتا هەتایە لە دونیا دەمێنیتەوە؟ ئیمامی عوسمان وتی: نەخێر، عەبدوڵڵا وتی: ئەگەر دەست هەڵنەگری لە کوشتن زیاتر هیچی تر هەیە، وتی: نەخێر، عەبدوڵڵا وتی: ئایا دەتوانن بتخەنە ناو دۆزەخ، یان بەهەشت؟ وتی: نەخێر، عەبدوڵڵا وتی: من بە باشی نازانم کراسێ لەبەر خۆت داکەنی کە خودا کردوویەتە بەرت، ئەمە ببێتە دابو دەستوور، هەر تاقمێ ناڕازی بێت لە خەلیفەکەی یان لە ئیمامەکەی بێگومان دەیکوژن[3]، رەزای خودا لە عەبدوڵڵای کوری عومەر، چەند دووربین بووە، نەیویستووە، نەیهێشتووە عوسمان سونەتێکی نابەجێ دابهێنێت بۆ خەلیفەکانی پاش خۆی، ئیمامی عوسمان قەت کاری واناکات، ئەگەر عوسمان تەنازولی بکردایە بۆ ئەم خەواریجە سەبەئییانەو وازی لە خەلیفایەتی بهێنایە، بۆ لەمەولا خەلیفەکان دەبوونە تۆپو ئامێر بە دەستی چاوچنۆكو مەرامدارەکانەوە، بەم چەشنە تابلۆی خەلیفەیەتی لەق دەبوو، لای خەڵکی هەیبەتی نەدەما، بەڵام عوسمان سوننەتێکی چاکی داهێنا بۆ خەلیفەکانی پاش خۆی بە راوێژی عەبدوڵڵای عومەرو هاوەڵانی تر، خۆی گرتو چاوەڕوانی پاداشتی کرد لە خەلافەت وازی نەهێناو خوێنی موسڵمانانی نەڕشت[4]، وەڵامی داوای یاخیبووە سەرکەشەکان، کە تاقمێکی کەمی ئوممەت بوون، ئەنجومەنی

---

[1] التمهید، ص(٤٦، ٤٧).

[2] فتنة مقتل عثمان (١٤٧/١).

[3] فضائل الصحابة (٤٧٣/١)، اسناده صحیح.

[4] الخلفاء الراشدون للخالدی، ص(١٧٩).

حەڵو عەقد نەبوونو شەرعزانو پیاوە دیارەکانی ئیسلام نەبوون، کۆمەڵێ شوێنەواری مەترسیداری دەخستە سەر ڕەوتی ئوممەتو هەیبەتی خەلافەتی ئیسلامو پەیوەندیی نێوان خەلیفەو میللەتەکەی لە پێناو لادانی ئەم شوێنەوارە خراپانە خەلیفە ژیانی خۆی دەست لێهەڵگرتو کردی بە باجی گەلەکەی، عوسمان چارەنووسی خۆی دەزانی کە دەیکوژن، خۆیدا بە دەستەوەو ئەمەش بریارێکی قورسە لە سەر دڵو دەروون، بەڵام بەرژەوەندییەکانی ئوممەتی خستە پێش بەرژەوەندییەکانی خۆی، وەکو دەرکەوتووە، کە هێزو لێبڕانو پاڵەوانێتییو دونیا دیدەیی هەبووە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتانەی کە گوایە عوسمان لە لاوازی خۆیدا نەیتوانیوە بەرگریی بکاتو بیان شکێنێ، بە پێچەوانەوە بە ئیزنی خودا دەیتوانی ئەو فیتنەیە رابماڵێت، بەڵام پێی وابوو ئاشوبێکی وای لێ دەکەوێتەوە کە لە بەرژەوەندییەکەی زیاتر بێت، بۆیە پشتی کرد، بەرهەڵستیتی بۆ ئەوەی خراپەیەکی گەورەی لێ بەرپا نەبێت، بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت، کە قەعقاع بە هەڵەدا چووە، کە دەڵێ کوشتنی عوسمان بە ئاژاوەو ڕەشەکوژی وەسف ناکرێت، چونکە کەسێ نەبووە رێی لێبگرێتو بەربەستی بکات[1]، ئەمەش تانەیەکە لە کەسایەتیو دلێری ئیمامی عوسمان، چونکە لە راستیدا خۆی کردە قوربانی لە پێناوی خودادا بە هیوای ئەوەی بەرژەوەندیی ئوممەت بەرهەم بێنێتو کاری بە وەسیەتەکەی پێغەمبەر ﷺ کرد[2].

## ٢ـ گەمارۆچییەکان هەڕەشەی کوشتنیان لە عوسمان کرد

لەو کاتەی کە عوسمان لە ماڵەکەی خۆیدا بو، یاخیبووەکان چواردەوریان گرتبوو، رۆژێکیان هاتە بەردەرگای خانووەکەی گوێی لێبوو گەمارچییەکان هەڕەشەی کوشتنی لێدەکەن، لە دەرگاکە هاتە دەرەوەو چووە ناو ئەو کەسانەی کە هاتبوونە ژووری خانووەکەو لە گەڵێدا بوون ڕەنگی عوسمان دەدرەوشایەوە، وتی: ئەوانە هەڕەشەم لێدەکەن کە ئێستا دەمکوژن، پێیان وت: خودای گەورە بەسە یارمەتیت بدات ئەی ئەمیری ئیمانداران.

---

[1] ذو النورين، عثمان بن عفان، ص(١٢٢).

[2] فتنة مقتل عثمان (١/١٤٩).

عوسمان وتی: بۆچی دەمکوژن؟ بیستومە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: (خوێنی هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نییە بڕژێت لە سێ تاواندا نەبێت، پیاوێك دوای ئیمان کافر بووبێت یان کەسێك دوای هاوسەرگیری زینا بکات، یان کەسێك مرۆڤێك بەبێتاوان بکوژێت)، وەڵڵاهی هەرگیز داوین پیسیم نەکردووە نە لە سەردەمی نەفامیو نە لەسەردەمی ئیسلامیشدا، ئاواتەخوازیش نەبووم ئەم دینە بگۆڕمەوە لەو رۆژەوەی خودا هیدایەتی داوم، هیچ کەسیشم بە ناهەق نەکوشتووە، ئیتر بۆچی دەمکوژن؟![1]، پاشان چووە لای گەمارۆچییەکانو هەوڵیدا هەڵچونیان دامرکێنێتەوەو هێوریان بکاتەوە، لە نافەرمانی ئیمام، ناوەڕۆکی ئەم قسانە بەرپەرچ دانەوەیەك بوو بۆ ئەو رەخنانەی کە لێیان دەگرت، دەرخستنی ئەو راستیانەبوو، کە ئەم یاخیبووانە لێیان ئاڵسکابوو بەشکو خەڵەتاندنەکەیان چارەسەر بکرێتو بگەڕێنەوە سەر رێنماییەکانی ئیسلامەتی داوای لێکردن کە پیاوێکیان بێتە ژوورەوە وتووێژی لەگەڵدا بکات، ئەوانیش گەنجێکیان نارد، کە ناوی صەعصەعەی کوری سوحان بوو، ئیمامی عوسمان داوای لێکرد ئەو گازندانە روون بکاتەوە، کە هەیانە لێی[2].

٣ـ عوسمان بەڵگە راستەکانی دا بەرووی دەلیلە وێڵەکانی صەعصەعەدا.

صەعصەعە وتی: ئێمە لە شاری خۆمانەوە بە ناحەقی دەرکراوین لەبەر ئەوەی وتومانە خودا پەروەردگارمانە، عوسمان وتی: بەڵگەی قورئانم بۆ بهێنەوە، ئەویش ئایەتی (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ) (الحج: ٣٩)، عوسمان وتی: ئەو کارە نەدراوەتە دەست تۆو یارەکانت، بەڵکو بۆ منو هاوەڵەکانی منە، ئەنجا عوسمان ئەو ئایەتەی خوێندەوە، کە صەعصەعە خوێندیەوەو شرۆڤەی کردو روونی کردەوە، کە ئەم دەلیلی صەعصەعەیە نابەجێبەو ئایەتەکەش ئەوەیە (أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ* الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ) (الحج : ٣٩ ـ ٤٠).

[1] المسند (١/٦٣)، وقال أحمد شاكر (٤٥٢) اسناده صحيح.

[2] فتنة مقتل عثمان (١/١٥٠).

عوسمان له هەموو خەڵکی باشتر له ئایەتەکان تێدەگەیشت‌و بە چەمکێکی دروست تەفسیری دەکرد، کە چۆن دابەزیوه بە هۆی چییەوه دابەزیوه، له بارەی کێوه دابەزیوه، بە چ بەڵگەیەکیش لێ دەناخرێتەوه، بۆ ئەوەی بە هەڵە لەمانای قورئان نەگەن بۆی روون کردەوه[1]، صەعصەعە ماناکەی نەدەزانی، بەڵام دەبوو بەڵگە بۆ دژایەتی مەبەستەکانی واتە ئایەتەکە دەشکایەوه بەسەر خۆیدا، چونکە عوسمان هەرکەسێك نەفی کردبێت کاری بەم ئایەتە کردووه، کە له دوای ئەو ئایەتەوه دێت کە صەعصەعە هێنایەوه، چونکە ئەو ئایەتە فەرمان دەکات بەو کەسانەی کە خودای گەورە دەیانکاتە حوکمڕان لەسەر زەویدا کە فەرمان بکەن بە چاکەو رێگری بکەن له خراپە، عوسمانیش خەلیفەیە ئەم کەسانەی بۆیە نەفی کرد، چونکە بەشێکە له فەرمان بەچاکەو رێگریی بە خراپە، وەبووبونە دەستدرێژیکار لەسەر هەندێ له موسڵمانان‌و هەوڵی فیتنە نانەوەیان دەدا[2].

٤ـ عوسمان چاکەکانی خۆی دەخستەوه یادی خەڵکەکە.

دوای ئەوەی عوسمان بەرپەرچی ئەمانەی دایەوه هەندێ له فەزڵە دیارو پلەو پایە پیرۆزەکانی خۆی خستەوه یادی خەڵك کە کاتی خۆی خۆشیان بیستبوویان له پێغەمبەر ﷺ دەیویست زیاتر روونی بکاتەوه، وتی: سوێندتان دەدەم بە خودا کێ شایەتی دەدات کە ئەو رۆژەی چوینە (حەراو) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کێوی حەرِرا هاتە لەرزین‌و پێغەمبەر پێی کێشا بە شاخەکەدا، پاشان فەرمووی: (ئەی حەرِرا هێوربە کەس لەسەر تۆ نەوەستاوه پێغەمبەرو راستگۆو شەهیدێك نەبێ).

واتە ئەوانەی لەسەر تۆن یان پێغەمبەرە ﷺ، یان راستگۆیە، یان شەهیدن ئەوکاتە منیش لەگەڵی بووم، کۆمەڵێ پیاو شایەتییان بۆ داو قسەکەیان سەلماند، پاشان وتی: سوێندتان دەدەم بە خودا کێ له رۆژی پەیمانی رِیزواندا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوو، کە منی نارد بۆ لای موشریکینی خەڵکی مەککە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە دەستی خۆی (ئەمە دەستی عوسمانە ئەمەش دەستی منە)، هەردوو دەستەکەی خستە ناو یەك‌و بەیعەتی بۆ دام، کۆمەڵێ پیاو شایەتییان بۆ داو قسەکەیان سەلماند.

---

[1] فتنة مقتل عثمان (١/١٥١).

[2] المصدر نفسه (١/١٥٢).

پاشان وتی: سوێندتان دەدەم بە خودای گەورە، کێ ئاگای لێبوو، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کێ ئەم مزگەوتەمان بە خانوویەك بۆ فراوان دەکات، خوای گەورە لە بەهەشتدا خانوویەکی دەداتێ)، منیش بە ماڵی خۆم خانوویەکم کڕی‌و مزگەوتەکەم پێ فراوان کرد، چەند پیاوێك شایەتییان داو قسەکەیان سەلماند.

پاشان وتی: سوێندتان دەدەم بە خودا کێ لە ڕۆژی لەشکری تەنگانەدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوو، کە فەرمووی: (هەرکەسێ ئەمڕۆ دەست بدرێتەوە لەم لەشکرە خێری قبوڵە)، منیش نیوەی ئەم لەشکرەم بە سامانی خۆم خستە ڕێ، کۆمەڵێك پیاو قسەکەیان سەلماند.

پاشان وتی: سوێندتان دەدەم بە خودان کێ ئاگای لێبوو کە بیری ڕۆمییەکە ئاوەکەی دەفرۆشرا، من بە سامانی خۆم کڕیم‌و کردم بە خێر بۆ ڕێبواران‌و موسڵمانان؟ چەند پیاوێ شایەتییان بۆ داو قسەکەیان سەلماند[1].

لە ئەبی سەوری فەهییەوە هاتووە، دەڵێت: چوومە لای عوسمان‌و مامەوە لای، لە پاشدا ڕۆشتم نوێنەرەکانی ئەهلی میسریش گەڕانەوە، پاشان چوومە لای عوسمان، پێم وت میسرییەکان گەڕانەوە، عوسمان وتی: چیت بەدی دەکرد لە نێوچاویاندا؟ منیش وتم: شەرم بەدیکرد لە نێوچاویاندا، ئیبن عەدیس بەلوی سەرگەورەیان بوو، ئیبن عەدی چووە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر ﷺ‌و وتاری هەینی خوێندو ڕەخنەی لە عوسمان دەگرت، پاشان نوێژی هەینی کرد بۆیان، ئەم هەواڵانەم گێڕایەوەبۆ عوسمان، ئەویش وتی: وەڵڵاهی ئیبن عەدیس درۆ دەکات، ئەگەر باسی منی نەکردایە باسم نەدەکرد، من چوارەمین کەسم کە موسڵمان بووم پێغەمبەر ﷺ کچەکەی خۆی لێ مارەکردووم، پاش مردنی ئەو کچکەی تری لێ مارە کردووم، هەرگیز زیناو دزیم نەکردووە نە لە نەفامیداو نە لە ئیسلامی، گۆرانیم نەوتووە، عیشقبازیم نەکردووە لەوەتەی موسڵمان بووم، بەو دەستەی کە بەیعەتم دا بە پێغەمبەر ﷺ لە دوای ئەو بەیعەتە ئەو دەستەم نەداوە لە زەکەرم، قورئان لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کۆکرایەوە من کۆم کردەوە، هەموو هەینییەك کۆیلەیەکم کڕیوەو ئازادم کردووە لەوەتەی موسلمان بووم، تەنها ئەم هەینییە

---

[1] المسند (١/٥٩)، وقال أحمد شاكر (٤٢٠)، اسناده صحيح.

نەبێ کە دەستم نەکەوتووە، بەڵام هەینی داهاتوو دوان ئازاد دەکەم[1]، کاتێ عوسمان بۆی دەرکەوت کە یاخیبووەکان سوورن لەسەر کوشتنو ترساندنی لەم کارەوە لە زیانەکانی عوسمان چووە ناویانو پێی وتن، ئەی خەڵکینە مەم کوژن، وەڵڵاهی ئەگەر من بکوژن، قەت پێکەوە کۆنابنەوە بۆ کوشتنی دوژمن، قەد پیەکناگرن بۆ جیهاد کردن، وا لە یەك دوورو دەکەونەوەو جیا دەبنەوە هەریەك بۆ لایەك دەچێ لەم کاتەدا پەنجەکانی دەستی بڵاو کردەوە[2]، لە ریوایەتێکی تردا عوسمان وتوویەتی ئەی خەڵکینە مەم کوژن من والیو برای موسڵمانانی ئێوەم وەڵڵاهی هەتا توانام هەبێ چاکسازیی نەبێ هیچی ترم ناوێ، هەڵە دەکەمو هەقیش جێبەجێ دەکەم، ئەگەر ئێوە من بکوژن، قەت کۆنابنەوە نوێژ بە جەماعەت بکەن وە کۆ نابنە غەزا بکەن، دەستکەوتی غەزایش بەشناکرێ لە نێوانتاندا[3]، دووبارە وتی: (وەڵڵاهی ئەگەر من بکوژن خۆشەویستی لە نێوتاندا نامێنێ، کۆ نابنەوە بۆ لێدانی دوژمن)[4]، ئەم ئاگاداریو ترسەی کە عوسمان وتی پێیان دوای گوشتنەکەی هەمووی بەدی هات، قسەکانی بەراست دەرچوون لەم بارەیەوە حەسەنی بەصری دەڵێ: وەڵڵاهی ئەم تاقمانە ئەگەر نوێژیش بکەن پێکەوە، دڵیان هەر دوورە لەیەکەوە[5].

## چوارەم: هاوەڵان بەرگرییان لە عوسمان دەکردو ئەویش قایل نەدەبوو بەرگری لێ بکەن

عوسمان ناردی بەشوێن هاوەڵاندا بۆ راوێژکردن لە بارەی گەمارۆچییەکانو هەرەشەکانیانەوە، کە دەیانەوێت عوسمان بکوژن، ئەوانیش هەڵوێستیان بەمشێوەیە بوو:

[1] المعرفة والتأريخ (٤٨٨/٢)، خلافة عثمان بن عفان للشلمي، ص(٩١).

[2] الطبقات (٧١/٣)، تأريخ ابن خياط، ص(١٧١) اسناده صحيح.

[3] الطبقات (٦٧/٣، ٦٨)، فتنة مقتل عثمان (١٥٦/١).

[4] تأريخ ابن خياط، ص (١٧١)، فتنة مقتل عثمان (١٥٧/١) اسناده صحيح.

[5] فتنة مقتل عثمان (١٥٧/١).

١ـ عەلی کوڕی ئەبی تالیب

ئیبن عەساکیر لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ئەم قسەیەی تەخریج کردووە کە عەلی جوابی بۆ ئیمامی عوسمان ناردووە وتویەتی: پێنج سەد قەڵغان لەپشتم لەگەڵدایە مۆڵەتم بدە با بەرگریت لێ بکەم، ئەم تاقمانە بشکێنم، چونکە تۆ خراپەیەکت نەکردووە، کە خوێن ڕشتن حەڵاڵ بێت. ئیمامی عوسمان وتی: خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە ، من پێم خۆش نییە تاقە خوێنێ بڕژێ بە هۆی منەوە[1].

٢ـ زوبێری کوڕی عەوام.

لە (ئەبی حەبیب)ەوە هاتووە دەڵێ: زوبێر ناردمی بۆ لای عوسمان، ئەوکاتە گەمارۆ درابوو چوومە لای ڕۆژێکی سایەقە بوو لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، حەسەنی کوڕی عەلیو ئەبوهورەیرەو عەبدوڵلای کوڕی عومەرو عەبدوڵلای کوڕی زوبێری لابوو، وتم: زوبێری کوری عەوام ناردوومی بۆ لای تۆو سەلامت لێ دەکات، دەڵێت: من لەسەر گوێڕایەڵی خۆم هیچ نەگۆڕاومو پەیمانم نەشکاندووە، ئەگەر پێت خۆشە با منیش بێمە ناو خانووەکەو لە لای تۆدا بم، منیش ببم بە یەکێك لەوانەی لەگەڵ تۆدایە، خۆ ئەگەر حەزیش دەکەی دەمێنمەوە، خێڵی عەمری کوڕی عەوف بەڵێنیان پێداوم کە لە بەردەرگای من ڕۆژ بکەنەوە، پاشان ڕۆشتوونو ڕێگەم پێ نەداون، کاتی عوسمان ئەم نامەیەی بیست، وتی: (الله اکبر، الحمدالله)، کە خوای گەورە زوبێری برامی پاراستووەو سەلامی لێ بکەو پێی بڵێ: من پێم خۆشە لەوانەبێت، کە خودای گەورە بە بۆنەی منەوە دەیپارێزێت کاتێ ئەبوهورەیرە ئەم قسەیەی گوێ لێبوو هەستاو وتی: بۆچی هەواڵتان نەدەمێ کە بە گوێی خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە، وتیان: پێمان بڵێ، وتی: من شاهیدم بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (دوایی ئاژاوەو فیتنە دەکەوێتەوە)، ئێمەش وتمان ئەی چارمان چییە ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: (خۆتان بخەنە پاڵ خەلیفەو حزبەکەی)، ئالەو کاتەدا ئاماژەی بۆ عوسمانی کوڕی عەفان کرد، دوای ئەم فەرمودەیە خەڵکەکە هەستان لە دەوری عوسمانو وتیان: ئێمە لە

---

[1] تأريخ دمشق، ص (٤٠٣).

بارودۆخەکە تێگەیشتین ئەی عوسمان، مۆڵەتمان بدە با جیهاد بکەین، ئەویش وتی: ئێوە پەیمانتان داوە گوێڕایەڵی من بن، ئەگەر گوێڕایەڵی منن شەڕ مەکەن[1].

٣ـ موغەیرەی کوری شوعبە

ریوایەت کراوە، کە موغەیرەی کوری شوعبە کاتی گەمارۆکە چووەتە لای عوسمانو وتویەتی: تۆ ئیمامی گشتمانی ئەم بەڵایەش کە دەیبینیت هاتووە بەسەرتا من سێ پێشنیارم هەیە بۆ تۆ، یەکێکیان هەڵبژێرە، با دەرچینو شەڕیان لەگەڵدا بکەین، تۆ هێزو ژمارەیەکی باش سەربازت لەگەڵدایەو تۆ لەسەر حەقی، ئەوان لەسەر باتڵ یان دەرگایەکی تر بکە ئەم خانووەو دەرچووەە لەخانووەکەو سواری وڵاخێك ببەو خۆت بگەیەنە مەککە، ئەوکاتە بە سەلامەتی دەردەچیت، یان خۆت بگەیەنە شام، چونکە ئەمانە شامییان تیا نییەو موعاویەش لەوێیە، ئیمامی عوسمان وتی: من دەرناچم بۆ شەڕو کوشتار، با نەبمە یەکەمین خەلیفەی پێغەمبەر ﷺ بۆ خوێنڕشتن لەناو ئوممەتدا، وە دەرچوونم بۆ مەککە، ئەوان دەستیان پێم ناگات بمکوژن، بەڵام بیستوومە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە فەرمویەتی: (پیاوێکی قورەیشی لە مەککە دەنێژرێت نیوەی عەزابی عالەمی بەسەرەوەیە)، نەوەك ئەوە من بم، چونم بۆ شام، کە موعاویە لەوێیە مەدینە بەجێ ناهیڵم کاتی خۆی کۆچم بۆ کردووەو ئێستاش دراوسێی پێغەمبەرم ﷺ[2].

٤ـ عەبدوڵڵای کوری زوبێر

هاوەڵان زۆر سووربوون لەسەر بەرگریی کردن لە عوسمانو هەندێ کیان چوونە ناوماڵەکەی، بەڵام عوسمان زۆر بە توندی پێی داگرت، لەسەر ئەوەی کە دەست بگرنەوە لە کوشتنو بەرگریی کردن لە میانەی ئەو ئارەزووە راستەقینەی کە هاوەڵان هەیانبوو بۆ بەرگریی کردن لە عوسمان بە کردەوەیش بیسەلمێنن یەکێ لەوانە عەبدوڵڵای کوری زوبێربوو، کە وتی بە ئیمامی عوسمان با بیانکوژین، وەڵڵاهی کوشتنی ئەمانە حەڵاڵە، عوسمان وتی، ناوەڵڵا هەرگیز نایانکوژم، شەڕیان لەگەڵ ناکەم[3]، لە ریوایەتێکی تردا

---

[1] فضائل الصحابة (١/٥١١، ٥١٢)، اسناده صحيح.

[2] البداية والنهاية (٧/٢١١).

[3] طبقات ابن سعد (٣/٧٠)، اسناده صحيح.

عەبدوڵڵای کوری زوبێر وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئێمە کۆمەڵێکی بەرچاورِونین، واین لەم خانووەدا، لەگەڵتاین خودای گەورە لە ئێمە ژمارەی کەمتریشی سەرخستووە، مۆڵەتمان بدە، عوسمان وتی: بیکەن بە خاتری خوا با پیاوێك لەسەر من خوێنی نەرِژێ[1]، پاشان فەرمانی پێکردن کە لە خانووەکەدا بمێنێتەوە، عوسمان وتی: هەرکەسێ گوێرِایەڵی منی لە ئەستۆدایە با گوێرِیەڵی عەبدوڵڵای کورِی زوبێر بکات[2].

٥ـ کەعبی کورِی مالیكو زەیدی کورِی سابیتی ئەنساری

کەعبی کورِی مالیكو زەیدی کورِی سابیت پەرۆشبوون، بۆ سەرخستنی عوسمان، وتیان ئەرێ گرۆی ئەنصارەکان، جارێکی تر خۆتان بکەن بە ئەنساری خوداو وەکو پێغەمبەرتان سەرخست عوسمانیش سەر بخەن، بە جارێ ئەنصارەکان هاتنو لە بەردەگای عوسماندا وەستان، زەیدی کورِی سابیت چووە ژوورەوەو بە عوسمانی وت: ئەنصارەکان لەبەردەگا وەستاون ئەگەر حەزدەکەیت بۆ جاری دووەم دەبینە ئەنصاری خودا[3]، عوسمان شەرِی رەتکردوەو وتی: پێویستم بە هیچ داڵدەیەك نییە[4].

٦ـ حەسەنی کورِی عەلی کوری ئەبی تالیب

حەسەنی کورِی عەلی هاتو وتی: بە عوسمان شمشێرەکەم هەڵکێشاوە، عوسمان وتی: نەخێر پەنا دەگرم بە خودا، کە خوێنی تۆ لەسەر من برِژێت شمشێرەکەت بکە بە کێلانەکەداو بگەرِێوە بۆ لای باوکت[5].

٧ـ عەبدوڵڵای کورِی عومەری خەتتاب

کاتی هاوەڵان بینیان بارودۆخەکە گەیوەو لافاوەکە گەیشتووەتە لوتکە، هەندێکیان برِیاریاندا بەبێ راویژ پێکردن بەرگری لێ بکەنو چوونە ناو خانووەکەو خۆیان ئامادە کرد بۆ شەرِ، عەبدوڵڵای کورِی عومەر لە خانووەکەدابوو، قەڵغانی شەرِی لەبەر کردبوو، شمشێرەکەی هەڵدەجەرِاند بۆ بەرگریی کردن لە عوسمان، بەڵام عوسمان زۆری لێکرد کە لە

---

[1] المصدر نفسه (٣/٧٠)، ساريخ ابن خياط، ص (١٧٣).

[2] المصدر نفسه (٣/٧٠)، اسناده صحيح ابى عبدالله بن الربير..

[3] طبقات ابن سعد (٣/٧٠)، فتنة مقتل عثمان (١٦٢/١).

[4] فتنة مقتل عثمان (١٦٢/١).

[5] فتنة مقتل عثمان (١٦٢/١)، المصنف لأبن أبي شيبة (٢٢٤/١٥).

خانووەکە بێتە دەرەوە نەوەك دەست بکات بە شەڕکردن کاتێك یاخیبووەکان دێن عوسمان دەکوژن، جارێکی تر عەبدوڵڵا خۆی پێچایەوە بۆ شەڕو هەر ڕێگەی نەدا[1].

٨ـ ئەبو هورەیرە

ئەبو هورەیرە چووە خانووەکە بۆ لای عوسمان‌و وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران زۆر باشە با لێیاندەین، عوسمان وتی: ئەی ئەبی هورەیرە بێت خۆشە هەموو خەڵکی لەگەڵ مندا بکوژرێن؟ وتی: نەخێر، وتی: وەڵڵاهی ئەگەر یەك کەس بکوژرێت یان کەسێ بدەین بە کوشتن وەکو ئەوە وایە هەموو مرۆڤەکانت کوشتبێت ئەبوهورەیرە گەڕایەوەو شەڕی نەکرد، لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەبو هورەیرە شمشێرەکەی لە خۆی داوەو عوسمان نەیهێشتووە بەکار بهێنێ[2].

٩ـ سەلێتی کوڕی سەلێت دەڵێ: عوسمان ڕێگەی نەداین شەڕ بکەین، ئەگەر ڕێگەی بدابااین، ئەوەندەمان لێدەدان هەتا دەمانکردن بە شارەکانی خۆیاندا[3].

ئیبن‌و سیرین دەڵێ: (٧٠٠) پیاو لە خانووەکەدا لەگەڵ عوسمان بوون، ئەگەر ڕێگەی بدایە، لێیان دەدان، لە سنووری مەدینە دەیانتاراندن، پیاوەکانیش ئەمانەبوون: (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، حەسەنی کوڕی عەلی، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر)، هەروەها ئیبن‌و سیرین دەڵێ: ئەو ڕۆژەی، کە ئیمامی عوسمان کوژرا، خانووەکەی جمەی دەهات لە پیاوی باش، وەکو عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو حەسەنی کوڕی عەلی، کە شمشێرەکەی لە ملدابوو، بەڵام عوسمان زۆر پێداگری کرد کە شەڕ نەکەن[4].

بەم شێوەیە هیچ‌و پوچی ئەو تۆمەتەمان بۆ دەردەکەوت کە هاوەڵە کۆچەرییی‌و ئەنصارەکانی پێی تاوانبار دەکرێت، کە گوایە نەیانتوانیوە ئیمامی عوسمان سەر بخەن‌و زەبوون بوون، هەرچی ریوایەت هەیە لەم بارەیەوە عیللەتی تێدایەو سەلامەت نییە نە لە ڕووی سەنەدەوەو نە لە ڕووی دەقەوە[5].

---

[1] فتنة مقتل عثمان (١/١٦٣).

[2] تأريخ خليفة ابن خياط، ص (١٦٤).

[3] فتنة مقتل عثمان (١/١٦٥)

[4] تأريخ دمشق لابن عساكر، ترجمة عثمان، ص(٣٩٥).

[5] فتنة مقتل عثمان (١/١٦٦).

١٠ـ هەندێ لە هاوەڵان پێشنیاریان کرد، بۆ نموونە وتیان هاوکاریت دەکەین بڕۆ بۆ مەککە کاتێ هاوەڵان زانییان عوسمان زۆر پێدادەگرێ لەسەر ڕەفزکردنی شەڕ لەگەڵ گەمارۆچییەکاندا دەکات، گەمارۆچییەکانیش سوورن لەسەر کوشتنی، هیچ چارەسەرێ نەما بۆ پاراستنی عوسمان جگە لەوەی هاوکاریی بکەن را بکات لە دەستیانو بچێت بۆ مەککە، ریوایەت کراوە عەبدوڵلای کوڕی زوبێرو موغەیرەی کوڕی شوعبەو ئوسامەی کوڕی زەیدی ئەم پێشنیارەیان بۆ کردووە بە جیا جیا، هەر یەکەشیان بە گەرمیو بە شێوازێك پێشنیاریان کرد، بەڵام عوسمان ڕەفزی هەموو پێشنیارەکانی کرد[1].

**ئەو هۆکارانە چین کە وایان کرد لە عوسمان رێگە نەدات هاوەڵان شەڕ بکەن؟**

لە میانەی ریوایەتەکانی فیتنەگەریی دەرکەوتووە بۆ توێژەرەوەکان کە پێنج هۆکار هەبووە بۆ ڕێگە نەدان بۆ شەڕ کردن:

١ـ کاری بە وەسیەتەکەی پێغەمبەر کردووە، کە کاتی خۆی پەیمانی دابوو بە ئیمامی عوسمان پێی خۆشبوو جێبەجێی بکات، لە رۆژی گەمارۆی ماڵەکەیدا رۆشنی کردەوە، کە بەڵێنێکەو پەیمانیداوە نەیشکێنێو ئارام بگرێ لەسەری[2].

٢ـ وەکو لە قسەیەکیدا هاتوو وتویەتی خۆم ناکەم بە یەکەمین خەلیفەی پێغەمبەر ﷺ بۆ خوێنڕێژی لەناو ئوممەتدا، واتە: پێی ناخۆشبووە یەکەمین خەلیفەی ئوممەت بێ بۆ خوێنڕشتنی موسڵمانان[3].

٣ـ چاك دەیزانی ئەم سەرکەشانە هیچیان ناوی کوشتنی عوسمان نەبێ، بۆیە پێی نارەحەت بوو، موسڵمانان بکاتە پەرژینی خۆی، بەڵکو خۆی کردە پەرژینی موسڵمانان[4].

٤ـ چاك دەیزانی ئەم فیتنەگەرییە کوشتنی ئەوی پێویە، چونکە پێشتر پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدابوو کاتێ مژدەی بەهەشتی پێدا لەسەر ئەو بەڵایەی، کە دێتە ڕێی بەم

---

[1] المصدر نفسه.

[2] فضائل الصحابة (٦٠٥/١)، اسناده الصحيح.

[3] فتنة مقتل عثمان (١٦٧/١)، المسند (٣٦٩/١) أحمد الشاكر.

[4] فتنة مقتل عثمان (٧١/١)، اسناده الرواية فيه ضعيف.

زوانه، که به ئارامگری‌و ناحەقی دەکوژرێ لەم ئاژاوەیەدا هەموو نیشانەکان ئەوەیان دەگەیاند کاتی شەهیدکردنی هاتووە، بە تایبەتی ئەو خەوەی، کە بینی‌و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "بەیانی لای ئێمە بەربانگ دەکەیتەوە"، عوسمان تێگەیشت، کە کاتی شەهیدکردنی نزیك کەوتووەتەوە.

٥- کاری بە راوێژەکەی عەبدوڵڵای کوری سەلام دەکرد، کە پێی وتبوو واز لە شەڕکردن بهێنە، واز لەشەڕ کردن بهێنە، شەڕ نەکردنت بەڵگەیەکی بەهێزە تا شەڕکردن[1]، هەواڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بەدی هاتن، کە ئیمامی عوسمان بەم زوانە دەکوژرێت، چونکە وەکو عەبدوڵڵای کوڕی حەواله[2] ریوایەتی کردووە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (هەرکەسێ لە سێ شت رزگاری ببێ ئەوا لە ئاگری دۆزەخ رزگاری بووە، مردنی من، هاتنی دەجال، کوشتنی ئەو خەلیفە بەئارامەی، کە لەسەر حەق رۆشتووەو حەقانییە)[3]، لەوەی پیشوو کە وتمان دەردەکەوێ عوسمان لە بیرکردنەوەدا هێور بووە، نارەحەتی بەڵاکە بیرو بۆچوونە دروستەکانی هەڵنەوەشاندەوە، بۆچوونە ساغەکانی نەشێواندووەو دەرکی کردووە بەو هۆکارانەی کە هەڵوێستێکی هێمنانە هەڵبژێرێ لە کوشتنی یاخیبووەکاندا بێگومان عوسمان لەو هەڵوێستەیدا لەسەر حەق بووە، چونکە بە فەرموودەی صەحیح هاتووە، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی کردووە بۆ بەرپابوونی ئەو فیتنەیەو شەهیدبوونی عوسمان، ئەو فیتنەیە پێویستەو شاهیدە، کە عوسمان‌و هاوەڵانی لەسەر حەقن[4]، ئیبن تەیمیە دەڵێ: بە فەرمودەی موتەواتەر دەرکەوتووە کە عوسمان زۆر خۆی پاراستووە لە خوێنرشتن، بە ئارامترین کەس بووە لە سەر ئەو شتانەی کە عەزێتیی دەدات، زۆر خۆگربووە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە گەمارۆیان داوەو پەلاماری کوشتنیان داوە، چاکیش دەیزانی کە بڕیاریان داوە بیکوژن، موسڵمانانیش هاتبوون بۆ سەرخستنی‌و راوێژیان پێکرد، کە شەڕیان لەگەڵ بکەن، ئەویش فەرمانی کرد بە خەڵکەکە دەست هەڵگرن لە کوشتن‌و فەرمانی کرد بەوانەی کە گوێرایەڵی دەکەن کەس

---

[1] الطبقات (٧١/٣)، اسناده حسن.

[2] فتنة مقتل عثمان (٧١/١)، اسناده حسن أو صحيح

[3] مسند أحمد (١٠٦/٤).

[4] فتنة مقتل عثمان (١٦٨/١).

نەکوژن پێیان وت بڕۆ بۆ مەککە، وتی: ناچم لە مەککە بمنێژن، با لەوێ نەنێژرێم، وتیان بڕۆ بۆ شام، وتی: ئەو شوێنەش کۆچم بۆ کردووە لێی جیا نابمەوە، وتیان دەی شەڕ بکەین لەگەڵیان؟ وتی: خۆم ناکەم بە یەکەمین خەلیفەی پێغەمبەر ﷺ کە شمشێر هەڵکێشم لە ئوممەتەکەی، عوسمان سەبری گرت هەتا کوژرا، ئەمە گەورەترین ڕێزە بۆ ئیمامی لە لای موسڵمانان کە خوێنی خۆی ڕشتو خوێنی موسڵمانانی نەڕشت[1].

## پێنجەم: هەڵوێستی دایکانی ئیمانداران و هەندێك لە هاوەڵان

١ـ حەبیبەی کچی ئەبوسوفیان

هەڵوێستی دایکی ئیمانداران ئوم حەبیبە یەکێك لە هەڵوێستە زۆر ترسناکەکان لەم ڕووداوەدا، مەترسی ئەم هەڵوێستە لەوەدابوو خەریکبوو دەست بکات بەشەڕکردن، کاتێك بینی عوسمان گەمارۆ دراوەو نایەڵن ئاو بخواتەوە، عوسمان بانگی دوو کوڕەکەی عەمری کوڕی حەزمی ئەنساری کرد، کە هاوسێی بوون، بچن بە عەلی بڵێن کە ئەم یاخیبووانە ئاویان لێ گرتووەتەوە، ئەگەر بۆتان دەکرێ هەندێ ئاوم بۆ بهێنن، چوونە لای تەلحەو زوبێرو عائیشەو خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، یەکەمین کەسێ کە چوو بەدەم عوسمانەوە عەلیو ئوم حەبیبە بوو[2].

ئوم حەبیبە زۆر گرنگی دەدا بە عوسمان، وەکو ئیبن عەساکیر دەڵێت: ئەم گرنگی پێدانەش شتێکی سروشتییە، چونکە هەردووکیان لە پێشدا ئەمەوین، ئوم حەبیبە هاتو کێشای بەناو چاوی هێزەکەیدا، ئوم حەبیبە وتی: وەصیەتی بنەماڵەی ئەمەوی وا لەلای ئەم پیاوە، واتە عوسمان، حەزدەکەم ببینمو پرسیاری لێ بکەم، بۆ ئەوەی ماڵی هەتیوو بێوەژنەکان تیا نەچێ، وتیان درۆ دەکەیت، پەتی هێسترەکەیان بە شمشێر بڕیو پەلاماریان دا، هێسترەکە یاخی بوو بە ئوم حەبیبەوە، خەڵکی بینینانو ولاغەکەیان هێور کردەوە، هاتەوەو خەریك بوو بیکات بە شەڕ لەگەڵ یاخیبووەکاندا لەوێ خەڵکەکە ئوم حەبیبەیان بردەوە بۆ ماڵی خۆی[3].

---

[1] منهاج السنة (٢٠٢، ٢٠٣).

[2] دور المرأة السياسي، أسماء محمد، ص(٣٤٠)

[3] تاريخ الطبري (٤٠١/٥)، نقلا عن دور المرأ السياسي، ص(٤٣٠).

دەركەوتووە، كە ئوم حەبيبەفەرمانى كردووە بە ئيبن جەراحى خزمەتكارى كە لە عوسمان دوور نەكەويتەوە، ئەو كاتەى عوسمان كوژرا، ئيبن جەراح لەوێ بوو[1].

٢ـ صەفيەى خێزانى پێغەمبەر ﷺ

صەفيەى خێزانى پێغەمبەر هەمان كارى ئوم حەبيبەى بەڕێزى كرد، لە كەنانەوە ريوايەت كراوە، دەڵێ: من جڵەوگيرى ولاغەكەى صەفيە بووم، دەچوو بەرگرى لە عوسمان بكات، ئەشتەرى نەخەعى پێيگەيشت[2] كێشاى بە چاوى هێسترەكەيدا، هەتا سڵەمييەوە، صەفيە وتى: وازم لێ بهێنە با ئەمە بێزارم نەكات، واتە: سەرشۆڕم نەكات، پاشان دارێكى دانا لە ماڵى خۆيانەوە بۆ ماڵى عوسمان بۆ ئەوەى بەسەر ئەو دارەوە ئاوو خواردن بگەيەنێتە عوسمان[3].

٣ـ عائيشەى دايكى ئيمانداران ئەو بەسەرهاتەى كە بەسەر ئوموو حەبيبەدا هات خەڵكى بەڕووداوێكى ناهەمواريان زانى بۆيە عائيشە لە مەدينە دەرچوو بە دڵى پڕ لەقينەوە دژ بە ياخيبووەكان هات بۆ لاى مەروانى كوڕى حەكەمو مەروان وتى: ئەى دايكى ئيمانداران ئەگەر لە مەدينە بمێنيتەوەو چاودێرى عوسمان بكەى لە دەرچوونت باشترە لە مەدينە، عائيشە وتى: ئەتەوێ ئەو كارەم بەسەربێ كە بەسەر ئومو حەبيبە هات، كەسيش نييە بەرگريم لێ بكاو بم پارێزێ نەخێر نامێنمەوە، وەڵڵاهى خۆيشم عەيبدار ناكەم، ناشزانم كارو ڕاهاتى ئەم ياخيبووانە بۆ كوێ دەچێ[4]، عائيشە پێى وابوو دەرچوونى لە مەدينە دەبێتە قەڵغانێ لە دەم شڕى ئەم تاقمانە وەكو لەو ريوايەتەى دوايدا بۆمان دەردەكەوێت دايكى ئيمانداران خۆى پێچايەوە بۆ حەجكردنو هەڵهات لە دەست ئەم فيتنەيە دەرچوونى دايكى ئيمانداران تەنيا بۆ خۆپارێزى نەبوو، لەپرشى فيتنەو ئاشفتەكانى وە راكردنو سەرهەڵگرتن نەبوو، بەڵكو هەوڵێ بوو لە لايەن دايكى ئيماندارانەوە بۆ قوتاربوونى عوسمان لە دەستى ئەم خەڵكە سەرلێشواوانە، چونكە ئەوانەى كە موحەممەدى كوڕى ئەبوبەكريان تێدابوو كە براى عائيشە خاتوونە، عائيشە

---

[1] تاريخ المدينة (٢/٢٩٨).

[2] دور المرأة السياسي، ص(٤٣٠).

[3] سير اعلام النبلاء (٢/٢٣٧).

[4] تاريخ الطبري (٥/٤٠١).

هەولێدا کە موحەممەدی برای لەگەڵ خۆیدا ببا بۆ حەج بەڵام بە قسەی نەکرد ئەم هەوڵە کە عائیشە دای کە براکەی لەگەڵیدا بچێ ئەویش رازی نەبوو بچێت جێگای وردبوونەوەو تێڕامانە هەتا هەنزەلەی نووسەر ڕەفز کردنەکەی (موحەممەد) دایچڵەکاندو کەس شوێنی دایکی ئیمانداران نەکەوت بەراوردێکی کرد لە نێوان رەفزکردنو شوێنکەوتندا، وتی: ئەی موحەممەد دایکی ئیمانداران بانگت دەکات کەچی ناچی لەگەڵیدا، بەڵام گورگەکانی عەرەب[1] بانگت ئەکەن بۆ شتێك کە حەڵاڵ نییە دویان دەکەویت، موحەممەد گوێی نەدایە، پاشان خاتوو عائیشە وتی: وەڵڵاهی ئەگەر بتوانیایە هەڵسوکەوتیان قەدەغە کەم بە دڵنیاییەوە دەمکرد[2]، ئەم قسەیەی دوای ئەو هەوڵەبوو، کە لەگەڵ براکەیدا ئەنجامیدا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عائیشە هەولێداوە بۆ تارنانی سەرکەشەکان لە عوسمان، کاتێ بیری کردەوە کە بچێ بۆ حەج کردن بۆ مەککە بۆ وروژاندنی رای جەماوەر بوو، وەکو ئیمامی ئیبنولعەرەبی جەخت دەکاتو دەڵێ: دیارنەمانی دایکی ئیماندارانو کۆمەڵێ لە هاوەڵان کە شاریان بەجێهێشت بۆ کەرتکردنی ئەو ئاژاوەیەبوو کە کەوتبووە ناو خەڵك بەو هیوایەی خەڵکی بەشکو بگەڕێنەوە بۆ لای دایکانی ئیماندارانو ڕێزی پێغەمبەر ﷺ بپارێزن[3]، بەشکو گوێبدەنە قسەکانیانو کە بەدرێژایی ژیانیان لە هەموو ئاسۆکاندا بڵاویان دەکردەوە[4]، واتە دەرچوونی ئەم جەماعەتە جۆرێکبوو لە بڵاوەپێکردنی ئەو حەشاماتە، ئەم جەماعەتە لای خەڵك بەڕێزبوونو پابەندی فتواو بۆچوونەکانیان بوون، رەزای خوا لە دایکانی ئیمانداران پشینیان نەدەکرد، کە کار بگاتە ئەوەی ئەم تاقمانە دەستیان بچێتە خوێنی خەلیفە[5].

٤ـ هەڵوێستی ئافرەتە صەحابییەکانی تر

١ـ ئەسمای کچی عومەیس هەمان ئەو هەوڵەیدا کە عائیشەی دایکی ئیمانداران هەولی بۆ دا، ناردی بە شوێن هەردوو کوڕەکەیدا، موحەممەدی کوڕی ئەبو موحەممەدی

---

[1] تاريخ الطبري (٤٠١/٥).

[2] تاريخ الطبري (٤٠١/٥).

[3] العواصم من القواصم، ص(١٥٦).

[4] دور المرأة السياسي، ص(٣٤٢).

[5] المصدر نفسه ص(٣٤٣).

کوڕی جەعفەر، وتی: مۆم خۆی ئەسوتێنێو ڕۆشنایی دەدات بە خەڵکی، خۆتان گوناحبار مەکەن بۆ کارێك کە ئێوەی بۆ کل کراوە، لە دژی کەسێ کە هیچ خراپەیەکی بۆتان نییە، ئەو ئیشەی ئەمڕۆ هەوڵی بۆ دەدەن سبەینێ کەسێ تێر دەبێ، لە خودا بترسن با ئیشەکەی ئەمڕۆتان نەبێتە داخو حەسرەت بەسەرتانەوە هەر دووکیان بە تینو تاو ڕۆشتنو بە تووڕەییەوە وتیان ئێمە لە بیرمان ناچێت کە عوسمان چی پێکردین، ئەویش وتی: چی پێکردوون؟ ئێوەی لە گوناح گەڕاندووەتەوەی بۆ لای خودا[1]، دەڵێن ئەم گفتوگۆیە لە نێوان لەیلای کچی ئەسماو دووبراکەیدا روویدا[2]، لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێت کاتێك خەڵکی شارەکان هات دووبارە گەڕانەوە بۆ مەدینە، پاشان عوسمان گفتوگۆی لەگەڵدا کردونو دیمانەیان بەستو بەڵگەی دا بە ڕوویاندا ئەو تاقمانە بە ئاشکرا گەڕانەوە بۆ شاری خۆیان، پاشان زۆری پێنەچوو گەڕانەوە بە دەعوایەك کە عوسمان نامەی ناردووە بۆ کوشتنی خەڵکانێك یەکێ لەو خەڵکانە بە پێی دەعواکەی ئەوان موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرە[3]، لەوانەیە ئەو قسەیەی کە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر کردی ئاماژەی پێکرد لە قسەکانیدا وتی: لەبیرمان ناچێت عوسمان چی پێکردین، بەڵام عوسمان حاشای کرد لەو نامەیەو نەیدایە پاڵ خۆی، وتی: یان دوو شاهید بهێنن کە هی منە یان سوێندیان بۆ دەخۆم کە من نەم نووسیوەو فەرمانیشم پێنەکردووە، کابرایەك نووسیویەتیو لاسایی خەتی عوسمانی کردووەتەوەو لەسەر مستیلەکەی نەقشی منی لێ هەڵکۆڵیوە[4]، ئەسما هاتوو ئاگاداربوو، کە تۆڕێکی پەنهانی داخراوە بۆ شڵەژاندنی بارودۆخی موسڵمانان و دەیانەوێت عوسمان لە خەلافەت دارنن، بەم چەشنە هەڵوێستی ئەسما بەرامبەر هەردوو کوڕەکەی ڕۆشنبوو، ئەم موئامەرەیە، کە بەم شێوەیە دارێژراوە کاریان نەکردە سەر پایەی دایکایەتییەکەی سۆزی بۆ کوڕەکانی دەربڕێ ئەوەی لێدەردەکەوت لەم هەڵوێستە ڕۆشنەدا دەیویست

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٢٠٢).

[2] المصدر نفسه

[3] دور المرأة السياسي، ص(٣٤٣).

[4] العواصم من القواصم، (ص١٢٠).

حەق بەجێ بگات‌و ناحەق لابربێت ئەم هەڵوێستە گاڵتەی پێناکرێ‌و گومانیشی لێناکرێ ئەمە بە بناغەیەکی پرشنگدار دەژمێردرێ بۆ دادویستی ئەم هاوەڵە بەڕێزانە[1].

٢ـ صەعبەی کچی حەزرەمی

کاتێك گەمارۆکەی سەر عوسمان قایم کرا صەعبەی کچی حەزرەمی داوای کرد لە تەلحەی کوڕی خۆی کە قسە بکات لەگەڵ عوسماندا کە وازبهێنێت لە پێداگری نەفسی سەلامەت دەبێت ئەگەر هاوەڵان بەرگری لێبکەن، سەر دەکەون بەسەر یاخیبووەکانی شارەکاندا.

صەعبەی کچی خەزرەمی رۆشت‌و وتی: بە تەلحەی کوڕی کەمار کە لەسەر عوسمان توندکراوە، ئەگەر بچویتایە قسەت لەگەڵدا بکردایە بۆ ئەوەی لە رایەکەی واز بهێنێت[2] لەم ریوایەتەوە دەردەکەوێت صەعبە دڵسۆزو دڵهاوەری عوسمان بووە، هەروەها دەرکەوتووە ئوم عەبدوڵلای کچی رافیع گرنگی بەم رووداوە داوەو موتابەعەی رووداوەکانی ئەم فیتنەیەکی کردووە[3]، ئەم ئوم عەبدوڵلایە بوو کە ئەم رووداوانەی لە صەعبەی کچی حەزرەمییەوە ریوایەت کردووە[4].

ئەمانە بە گشتیی هەڵوێستی ئافرەتە موسڵمانەکان بوو کە هەڵوێستێکی ڕاست‌و دروست بو، سەرەڕای ئەو هەموو لێڵییەی کە پێوەی نووسرابوو بە توانابوون کە بە دیدێکی ساغ بڕوانە مەسەلەکەو ، بەهەرحاڵ ئەمە هەڵوێستی هاوەڵان بوو (خوایان لێ رازی بێت)[5].

**شەشەم: ئەم ساڵ کێ حەج دەکات بۆ خەڵکیی؟**

**ئایا عوسمان داوای کرد لە والییەکان سەری بخەن؟**

١ـ ئەم ساڵ کێ حەج دەکات بۆ موسڵمانان؟ (٣٥)ی کۆچی.

---

[1] دور المرأة السياسي، ص(٣٤٤).

[2] المصدر نفسه (٣٤٥).

[3] المصدر نفسه.

[4] المصدر نفسه.

[5] المصدر نفسه (٣٤٥، ٣٤٦).

عوسمان بانگی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسی کردو حەج کردنی ئەم ساڵی پێ سپارد، عەبدوڵڵای کوڕی عەباسیش وتی: وازم لێ بهێنە، با لەگەڵ تۆ بمێنەوەو لە شانی تۆدا بم، ئەی ئەمیری ئیمانداران، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەمانە، وەڵڵاهی جیهادکردنی ئەم خەوارجانە لە حەج کردن باشترە لە لای من، عوسمان پێی وت: من داوات لێدەکەم حەج بکەیت بۆ موسڵمانان، عەبدوڵڵا هیچی بەدەستەوە نەما گوێڕایەڵی کردنی خەلیفە نەبێت، عوسمان نوسراوێکی نووسی دای بە عەبدوڵڵا بۆ ئەوەی لە کاتی حەجدا بیخوێنێتەوە بۆ موسڵمانان، لەو نوسراوەدا چیرۆکی خۆی لەگەڵ خەواریجەکاندا ڕۆشن کردبووەوە، هەڵوێستی خۆیو داواکانی ئەوانی تێدا نووسیبوو[1]، ئەمە دەقی وتارەکەی عوسمانە، کە لە وەرزی حەجکردندا ساڵی (٣٥)ی کۆچی خوێندرایەوە بۆ موسڵمانان: (بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان، لە بەندەی خوداوە، عوسمانی ئەمیری ئیمانداران بۆ موسڵمانانو ئیمانداران، السلام علیکم، من سوپاسی ئەو خودایە دەکەم کە هیچ پەرستراوێکی دی نییە ئەو نەبێت، پاشان من ئەو خودایە دەخەمەوە یادتان کە نیعمەتی بەسەردا ڕشتوونو فێری ئیسلامیی کردوون، ڕێنمایی کردوون لە گومڕاییو لە کافرێتیی دەریهێناون، ئەو هەمووە بەڵگانەی داوەتە دەستتانو ڕۆزی بۆ فراوان کردوون، سەری خستوون بە سەر دوژمنداو نیعمەتەکانی خۆی ڕشتووە بە سەرتاندا، خودای گەورە فەرمایشتەکانیشی حەقە کۆمەڵێ ئایەتی زۆری تێدا نوسیبوو، پاشان نوسیبووی خودای گەورە بە ملکەچیو گوێڕایەڵیو کۆمەڵپارێزی لێتان ڕازی دەبێت، دەتانپارێزم لە گوناحو دووبەرەکیو ناکۆکیو ئاگاداری کردوون کە میللەتانی پێش ئێوە چییان کردووە بۆی باس کردوون بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە بەسەرتانەوە، ئەگەر سەرپێچی خودا بکەن، پێتان دەڵێم ئامۆژگارییەکانی خودا وەربگرنو خۆتان بپارێزن لە سزاکانی هیچ ئومەتێك نییە تیاچوبێت هەتا جیاییو ناکۆکی تێ نەکەوتبێ، واتە هەتا سەرۆکیان هەبێو کۆیان بکاتەوە ناکۆکییان تێ ناکەوێت هەرکاتێ سەرۆکی خۆیان لەناودا ئیتر کۆنابنەوە بە کۆمەڵ نوێژ بکەنو دوژمنەکانیان زاڵ دەبێت بەسەریانداو ماڵو ناموسی یەکتری بە

[1] الخلفاء الراشدين للخالدي، (ص١٦٧، ١٦٨).

حەڵاڵ دەزانن‌و هەموو کاتێکیش ئەم کارانە بکەن، خوای گەورەش دینەکەیان سەقامگیر ناکات‌و نابنە هیچ، خودای گەورە دەفەرمووێت: (إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعاً لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ) (الأنعام: ١٥٩)، من ئەو وەسیەتەتان پێ دەکەم کە خودای گەورە وەسیەتی پێ کردووەو ترسی عەزابەکانی داوە شوعەیب فەرمووی بە گەلەکەی (وَيَا قَوْمِ لاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ* اسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ) (هود: ٨٩ - ٩٠)، لەدوای ئەمە خەڵکانێك لەوانەی کە لەم باسەدا خۆیان وانیشانداوە، کە بانگەشە بۆ کتێبی خوداو هەق دەکەن‌و دونیاو گرفتەکانی دونیایان مەبەست نیە، کاتێك هەق خرایە بەردەستیان، خەڵکان لەمبارەیەوە بوونە چەند بەشێك، هەندێکیان هەقیان وەرگرت‌و پارێزگارییان لێکرد، کاتێك پێیاندرا، هەندێکی تر پشتیان تێکردو دەستبەرداری بوون، ئەم خەڵکانە پێیان وایە تەمەنم بەلایانەوە درێژەو فەرمانڕەواییم خاو بووەو لەکاری قەدەرا بەپەلەبوون، وایان بۆ نووسیبوون کە ئەوان بەوەی کە پێمدابوون، گەڕانەوە وانازانم کە وازم لەهیچ لەو پەیمانانە هێنابێت کە پێم دابوون. گوایە ئەوان داوای جێبەجێکردنی سزای خودایی دەکەن وتم: جێبەجێی بکەن، بەسەر ئەو کەسەی کە ئەزانن سنوری خۆی بەزاندووە، بەرامبەر کەسێك جێبەجێی بکەن کە ستەمی لێکردوون. نزیك بێت یان دوور، ناسراوبێت یان نەناسراو. وتیان قورئان بابخوێنرێت وتم کێ دەیخوێنێت با بیخوێنێت، زیادەڕەوی تێدا نەکات‌و لەفەرموودەکانی خودا دەرنەچێت. وتیان بەشی کەم کەسێك دەدرێت‌و پارە دەخرێتە بەردەستی کەسانێك تا ئیشی باشی پێ بکرێت، منیش وتم دەستدرێژی ناکرێتە سەر پێنج یەك‌و خێرو سەدەقە. کەسی بەتواناو دەست پاك دەکرێتە فەرمانڕەوا، هەر شتێك بەستەم براوە دەدرێتەوە بەخاوەنەکانیان، من بەمە رازی بووم‌و دانم بەخۆمدا گرت، من‌و ئەو هاوەڵانەشم کە باسیان لەوکارە کردووە، پەلەبوون لەکاری قەدەرداو رێگەی نوێژیان لێ قەدەغەکردم‌و رێگەی نوێژیان لێ گرتم، لەمەدینە بەناهەق دەستیان گرت بەسەر هەموو شتێك کە توانیان، ئەم نووسراوەم بۆ نووسین‌و ئەوان سەرپشکیان کردم لەسەر یەکێك لەم سێ رێگایە، یان ئەمبەستنەوە

لەبری هەموو پیاوێك كە بەهەڵە یان لەسەر هەق سزام دابێت، هیچی لێ كەم ناكەن، یان دەست هەڵگرمو یەكێكی تر بكەنە فرمانڕەوا یان دەنێرن بەشوێن ئەوانەی كە ئەڵقە لەگوێی ئەوانەن، لەسەربازەكانو لەخەڵكی مەدینەبۆ ئەوەی خۆیان بێبەری بكەن لەگوێڕایەڵی ئەو فەرماندارەی كە پابەندبوونی فەرزە، پێم وتن بۆ خۆ بەستنەوەم، لەپێش من خەلیفەی تر بووە بەهەڵە یان بەڕاست سزای تاوانباری داوە، هیچیان لێ نەسەنراوەتەوە. زانیم كە خۆمیان دەوێت كە دەست هەڵگرم لەحوكمڕانی، ئەگەر كۆتو پێون بكەنە دەستو پێم پێم خۆشترە لەوەی كە دەست هەڵگرم لەخەلافەتو دەرچم لەفرمانی خودا. ئەوەی كە دەڵێن دەنێرین بەدوای سەربازو خەڵكی مەدینەدا بێبەری دەبن لەگوێڕایەڵی لەو كاتەدا من بەرپرسیارنیم، لەمەوپێش زۆرم لێنەكردوون بۆ گوێڕایەڵیو فرمان بەرداری بەڵام خۆیان بەویستی خۆیان هاتوون، ڕەزامەندی خوداو چاكەیان مەبەست بووە، هەركەس لەئێوە دونیای مەبەستە هیچی لێ دەست ناكەوێت، ئەو بڕە نەبێت كەخودا بۆی نووسیوە، هەركەسێك كەتەنها مەبەستی خوداو ڕۆژی دوایی بێتو عەودالی چاكبوونی ئوممەتو شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺو شوێنكەوتەی دوو خەلیفەكەی دوای ئەوبێت ئەوا خودا پاداشتی دەداتەوە، پاداشتی ئێوە بەدەست من نییە، ئەگەر هەموو دونیاتان بدەمێ ناگاتە بەهای دینەكەتانو بەكەڵكتان نایەت لەخودا بترسنو حساب بۆ سزاكەی بكەن، هەركەس لەئێوە پەیمان شكێنی دەكات، من ڕازی نیم خوداش ڕازی نییە بەپەیمان شكێنی، بۆ ئەوەی كە هەڵبژاردنیان دایەوە دەست خۆم، هەمووی ئاژاوەو پیلانە، من خاوەنی خۆمو شوێنكەوتەكانم، سەیری كاری خوداو گۆڕانی نیعمەتەكانی ئەوم كرد، ڕقم لەكاری خراپو ناكۆكیو خوێنڕشتن بووە، من سوێندتان ئەدەم بەخودا لەڕێگای ئیسلامەوە حەقم لێ وەرگرنو حەقەكانی خۆشم بدەنەوە، واز لەستەم بێنن بۆ ستەمكاران، دادپەروەربن لەنێوانماندا بەو شێوەیەی كە خودا فرمانی پێكردووە، سوێندتان ئەدەم بەو خودایەی كە پەیمانو سەرخستنی یەكتری لەسەرتان فەرزكردووە، خودای گەورە فەرموویەتی "ولاتقربوا مال اليتيم ألا بالتي هي أحسن حتى يبلغ اشده وأوفوا بالعهد أن العهد كان مسؤولا"، ئەمە بەهانەیە با لەبیرتان بێت، من پاكانە بۆ خۆم ناكەم .......

ئەگەر سزای خەڵکانێکم دابێت، تەنها چاکەم مەبەست بووە، من هەمیشە پەشیمانم‌و دەگەڕێمەوە بۆلای خودا لەکارێك کە نافرمانی بێت، داوای لێخۆشبوون دەکەم، خودا لێخۆشبووەو بەزەییەو بەزەیی خودا هەموو شتێك دەگرێتەوە.

نائومێد مەبن لەرەحمەتی خودا، ئەوەندەی نائومێد ببێت ئەندامێك لەگرۆی ستەمکاران، خودا پەشیمانی لەبەندەکانی قبووڵ دەکات‌و لەخراپەکانیان دەبووریت‌و دەشزانێت ئێوە چی دەکەن "من لەخودا دەپاڕێمەوە لەمنیش‌و لەئێوەش خۆش ببێت‌و دڵی ئەم ئوممەتە یەکبخات لەسەر خێرو چاکەو خراپی‌و نالەبارمان لا قێزەون بکات، ئیتر بەخوداتان دەسپێرم‌و رەحمەت‌و بەرەکەتی خودا برژێت بەسەرتاندا ئەی موسوڵمانان‌و ئیمانداران)، ئیبن‌و عەباس دەڵێت "رۆژێك بەر لە تەروییەکردن بۆم خوێندەوە"[1].

٢ـ ئایا عوسمان داوای کرد لەوالییەکان سەری بخەن‌و پشتیوانی لیٚ بکەن؟

عومەری کوڕی سەیف لە ریوایەتێکدا کە تەبەری هێناویەتی گومانی وایە، کە عوسمان لە کاتی گەمارۆکەدا نامەی ناردووە بۆ والییەکانی لە شارەکانەوە بێنە هاوکاری، مەعاویەش حەبیبی کوڕی مەسلەمەی نەهری بە سوپایەکەوە نارد بۆ سەرخستنی عوسمان، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی سەعیدیش لە میصرەوە هەمان کاری کرد، مەعاویەی کوڕی حودەیج بە سەرلەشکری قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی کۆمەڵێ خەڵکی ئەهلی کوفەی نارد[2]، ئەم گومانە لەگەڵ رێبازی عوسماندا یەکناگرێتەوە، لە بەرەنگاری فیتنەدا لە لایەك عوسمان عەوداڵی سەلامەتی‌و خوێن نەڕشتن بێت، لە لایەکی تر بنێرێ بە دوای لەشکردا، هەروەها ئەم گومانە لەگەڵ ئەو یەقینەدا رێك ناکەوێ، کە عوسمان دڵنیابوو کە دەیکوژن، یەکناگرێتەوە، لەگەڵ ئەو کارەی کە عوسمان هەموو داکۆکیکارەکانی گەڕاندەوەو نەیهێشت صەحابە گەورەکان‌و کوڕەکانیان بەرەڤانی لیٚ بکەن، تەنانەت رێگەی نەدا بە کۆیلەو خزمەتکارەکانیش زۆر بە توندی نەهی شەڕو کوشتاری لیٚ کردن، بەڵکو ئەو کۆیلانەی ئازاد کرد، کە دەستی خۆی پاراست لە شەڕو کوشتاری نەکردن، بە هیچ شێوەیەك شەڕی نەخواست وەکو باسمان

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٤٢٥).

[2] تاريخ الطبري (٥/٣٧٩ ـ ٣٨٠).

کرد، ئەوەی کە تێبینی دەکرێ ئەوەیە وەکو چۆن کۆمەڵێ لە هاوەڵان دەست پێشخەرییان کرد بۆ بەرگری کردن لە عوسمان بە بێ ئەوەی عوسمان داوایان لێ بکات، هەوڵی زۆریشی دا کە بیان نێرێتەوەو دەستیان کۆتا بکا لێی بە هەمان شیوە کۆمەڵێکی چڕو پڕ لە سەربازانی موسڵمانان لە شارەکانەوە دەست پێشخەرییان کرد بۆ بەرگری کردن لەم خەلیفە مەزلومە، بە ڕاو بۆچوونی نوێیان‌و تەوجیهاتی ئەمیرەکانیان ئەوە ڕاست نییە کەوا گومان ببەین پیاوێکی وەکو مەعاویە لەبەر خزمایەتییەکەی لەگەڵ عوسماندا هاتووەو پەلاماری داوە خۆ ئەگەر بیویستایە سەرباز بنێرێتە سەریان تەفرو تونای دەکردن، ناگونجێ ئەو گریمانە دابنێین کە خەڵکانێك لە میسرەوە بە سەرۆکایەتی مەعاویەی کوڕی حودەیج‌و مەسلەمەی کوڕی مەنامە هاتوون بۆ سەرخستنی عوسمان یان قارەمانەکانی تر هاتبێت، دەسەتەوسان وەستابن‌و خۆیان مات دابێت هەتا خەلیفە دەکوژرێت‌و پاشان خۆیان تاوداوە بۆ تۆڵەسەندنەوەو گەردنی خۆیان داوەتە بەر شمشێر لە پێناوی عوسماندا، بەڵکو دەبێ وا دابنێین، کە کۆمەڵێ سەرباز لە شارەکانەوە بە کردەوە هەنگاویان ناوە بەرەو مەدینە بۆ فریاکەوتنی خەلیفە بەبێ ئەوەی خەلیفە داوایان لێبکات شتی وا دەبێت؟[1].

٣ـ دواهەمین وتارێ کە عوسمان فەرمووی

دواهەمین دیداری گشتیی عوسمان لەگەڵ موسڵماناندا دوای چەند ڕۆژێ لە گەمارۆ بانگی خەڵکی کردو هەرهەموویان کۆبوونەوە شەڕەنگێزەکان‌و سەبەئیەکان‌و موسڵمانە نیشتەجێکانی خەڵکی مەدینە لە پشتی هەموو خەڵکەوەو عەلی‌و تەلحەو زوبێر دانیشتبوون لەبەردەمی عوسماندا بوون عوسمان پێی وتن: خودای گەورە بۆیە دونیای داوە بە ئێوە تا قیامەتی پێ بەدەست بهێنن دونیای بۆ ئەوە نەداوە پێتان باوەشی پیا بکەن دنیا دەڕواو پێچ دەکاتەوە قیامەت دەمێنێتەوەو دونیا ون بووە با توشی بەڵاتان نەکات لە قیامەتی هەمیشەیی سەرقاڵتان نەکات، گرنگی بدەن بەو دونیایەی کە سەرتاسەرییە لە چاو ئەو دونیایەی کە سەرسەرییە، دونیا دەبڕێتەوە چارەنووسمان گەڕانەوەیە بۆ لای خودا، لە خوا بترسن لە خودا ترسان قەڵغان‌و پەرژینە بۆ سزاو مۆتەکەکانی، پابەندی

---

[1] الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين، ص (٢٧٨ ـ ٢٧٩).

کۆمەڵێ موسڵمانان بدن خۆتان بەش بەش‌و حزب حزب مەکەن خودای گەورە دەفەرموێ: (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (آل عمران: ١٠٣).

پاشان وتی بە موسڵمانان ئەی خەڵکی مەدینە من دەتانسپێرم بە خودا وەلێی دەپارێمەوە دوای من کەسێکی چاك بکاتە خەلیفەتان، وەڵڵاهی من لەمڕۆ بە دواوە هیچ کەسێك نایەتە لای من هەتا ئەو بڕیارەی خودای گەورە جێبەجێ ئەبی لەسەرم کە بڕیاریداوە، واتە ئیتر من لە دونیا دەردەچم، ئەم خەواریجانە لەودیو دەرگاکەی خۆمەوە بەجێ دەهێڵم هیچیان پێنابەخشم، کە دوای ببنە ملهوڕ بەسەرتانەوە نە کاروباری دونیاو نە دینتان نادەمە دەسیان هەتا خودای گەورە رازی نەبێو پێی خۆش نەبێ، خۆی ئەم بەرنامەیەی دارشتووە، فەرمانی کرد بە بە خەڵکی مەدینە بگەڕێنەوەو سوێندی لێ خواردن کە بچنەوە، هەموویان گەڕانەوەو موحەممەدو ئیبنو زوبێر هاووێنەکانیان پێش بە فەرمانی باوکیان لەبەردەگاکەی عوسمان دانیشتین خەڵکانێکی زۆر هاتەوە بۆ لای ئەم سیانەو لەگەڵ عوسماندا مانەوە لە خانووەکەدا هەتا ئاکامی عوسمان هات[1].

**حەوتەم: شەهیدبوونی ئیمامی عوسمان**

سەرەڕای جموجوڵی سەربازیی شارەکان بۆ فریادڕەسی عوسمان، رۆژانی حەج کردن بە خێرایی تەواو بوو، کۆمەڵێ لە حاجییەکان وایان بەباشزانی بە پەلە بڕوزێ بگەڕێنەوە بۆ مەدینە فریای عوسمان بکەون، بە تایبەت عەبدوڵڵای کوڕی عەباس‌و عائیشەیان لەگەڵدا بوو، کە بەرگری کاربوون لە عوسمان هەواڵ گەشت بە یاخیبووەکان کە حاجییەکان گەڕاونەتەوە دەیانەوێت عوسمان سەر بخەن، کاتێ ئەم هەواڵەیان پێ گەشت وێڕای ئەوەی کەبیستبوویان خەڵکی شارەکان هەڵمەتیان هێناوە بۆ پشتیوانی عوسمان شەیتان کاری یاخیبووەکانی جوان کردو وتیان لەم واقیعە دەرناچین بە کوشتنی ئەم پیاوە نەبێت، ئەم پیاوە بکوژین ئێمەیان لەبیر دەچێت سەرقاڵی ئەوە دەبن[2].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٣٩٩).

[2] تاريخ الطبري (٥/٤٠٢).

١- له دواهه‌مین رۆژی گه‌مارۆکه‌دا خه‌ونێکی بینی

له رۆژانی کۆتایی گه‌مارۆکه‌دا له‌و رۆژه‌ی که‌وا تێیدا بکوژرێت عوسمان خه‌وتبوو به‌خه‌به‌ر هات گوێی لێبوو خه‌ڵکی باسی کوشتنی ده‌که‌ن له لایه‌ن ئه‌م تاقمانه‌وه[1]، پاشان وتی: له خه‌ومدا پێغه‌مبه‌رم ﷺ بینی له‌گه‌ڵ ئه‌بوبه‌کرو عومه‌ردا، پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: "ئه‌ی عوسمان له لای ئێمه به‌ربانگ بکه‌ره‌وه"، ئه‌و به‌یانییه‌ی له خه‌و هه‌ستا به رۆژوو بووه له‌و رۆژه‌دا کوژراو ئێواره لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌ربانگی کرده‌وه[2].

٢- شێوازی کوشتنه‌که‌ی

یاخیبووه سه‌رکه‌شه‌کان هێرشیان برده ناو خانووه‌که‌و حه‌سه‌نی کوڕی عه‌لی‌و عه‌بدوڵلای کوری زوبێرو موحه‌ممه‌دی کوری ته‌لحه‌و مه‌روانی کوڕی حه‌که‌م‌و سه‌عیدی کوری عاص‌و هه‌ندێ له کوڕانی هاوه‌ڵان ده‌سته‌ویه‌خه‌یان بوونه‌وه شه‌ڕ داکه‌وت له نێوانیاندا، عوسمان هاواری کرد ده‌ستی کرد به (الله الله)، وتی ئێوه ده‌ست کۆتا بکه‌ن له سه‌رخستنی من، به‌ڵام ئه‌وان ده‌ستیان کۆتا نه‌کردو خزمه‌تکاره‌کانی عوسمان چوونه ژووره‌وه بۆ سه‌رخستنی، عوسمان فه‌رمانی پێکردن که هیچ نه‌که‌ن به‌ڵکو وتی: هه‌رکه‌سێ ده‌ست کۆتا بکات له شه‌ڕ با ئازاد بێ[3] و له کۆیله‌یه‌تی ده‌ربچێ، عوسمان به ئاشکراو پێگری‌ه‌و بنه‌بڕی سوربوو له‌سه‌ر ئه‌و رایه‌ی که ده‌ست‌و چه‌کی خۆی کۆتا بکاو ئه‌و که‌سانه‌ش که ملکه‌چی گوێڕایه‌ڵی خه‌لیفه‌یان له ئه‌ستۆدایه با شه‌ڕ نه‌که‌ن‌و واز بهێنن بێگومان گوێڕایه‌ڵی خه‌لیفه‌ش واجبه[4]، ئه‌م رایه‌ی عوسمان به هیچ شتێ پێناگرێت به ئه‌وه نه‌بێ که عوسمان دڵنیابوو که شه‌هید ده‌کرێت، وه‌کو پێغه‌مبه‌ر ﷺ شاهیدی بۆ دابوو، ده‌یویست له‌م‌و ئه‌و خوێن نه‌رژێ نه‌بێته مایه‌ی فیتنه‌و ئاژاوه له نێوان موسڵماناندا[5] موغه‌یره‌ی کوڕی ئه‌خنه‌س یه‌کێ بوو له‌وانه‌ی که حه‌جی کردو به

[1] الطبقات لابن سعد (٣/٧٥)، فتنة مقتل عثمان (١/١٧٢).

[2] الطبقات (٣/٧٥)، فتنة مقتل عثمان (١/١٧٥).

[3] الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين، ص(٢٨٢)، البداية والنهاية (٧/١٩٠).

[4] العواصم من القواصم، (ص١٣٣).

[5] الدولة الاسلامية في عصر الخلفاء الراشدين، ص(٢٨٣).

چەند کەسێکەوە گەڕایەوە بۆ فریاکەوتنی عوسمان، بەر لەوەی عوسمان بکوژرێ چووە لای بۆ ئەوەی حیمایەتی بکات، وتی ئەی عوسمان ئێمە بیانوومان چییە بەلای خودای گەورەوە سەرەڕای ئەوەی توانامان هەیە تۆ بە جێ بهێڵین بۆ دوریان نەخەینەوە هەتا دەمرین یاخیبووەکان ئاگریان نا بە دەرگاو سەقفی خانووەکەوە، ئەوانەی کە لە خانووەکەدا بوون هەڵچوون، عوسمانیش دەستیکرد بە نوێژکردن بۆ ئەوەی ڕێگەی شەڕیان لێ بگرێت، موغەیرەی کوڕی ئەخنەس‌و حەسەنی کوڕی عەلی‌و موحەممەدی کوڕی تەلحەو سەعیدی کوڕی عاس‌و مەروانی کوڕی حەکەم‌و ئەبوهورەیرە بە باشترین بەلآ تاقیکرانەوەو دەستیان کرد بە شەڕکردن، عوسمان تکای لێکردن بگەڕێنەوەو شەڕ نەکەن، پاشان عوسمان چووەوە بۆ نوێژکردن دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (کهف) بە باشی قورئانەکەی دەخوێند دەنگە دەنگ بێزاری نەکرد، هەر بەردەوام بوو، نە هەڵەی دەکرد نە پچڕ پچڕی دەکرد، هەتا گەشتە کۆتایی سورەتەکە بەر لەوەی دەستیان پێبیگات، پاشان دانیشت‌و دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (ال عمران) ئەو ڕۆژە چوار گەنجی قورەیشی پێکران کە موحەممەدی کوڕی عەلی‌و عەبدوڵڵای زوبێرو موحەممەدی کوڕی تەلحەو مەروانی کوڕی حەکەم بوون[1]، موغەیرەی کوڕی ئەخنەس‌و نەیاری کوڕی عەبدوڵڵای ئەسلەمی‌و زیادی فەهری کوژران[2]، عوسمان توانی قەناعەت بکا بە بەرگریکارەکان، ناچاریان بکا لە ماڵەکەی دەرچن، تەنیا عوسمان‌و گەمارۆچییەکان مانەوە جگە لە عوسمان‌و خێزانەکەی لە خانووەکە ئەمانەوەو هیچ بەرگریکارێ نەماو خەڵکە جەنجاڵەکە بڵاویان کرد، عوسمان دەرگای ماڵەکەی خۆی لادا[3]، دوای ئەوەی بەرگری کارەکانی دەرکرد، قورئانەکەی کردەوەو لە باوەشیا دەستی کرد بە قورئان خوێندن‌و ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بوو پیاوێ لە گەمارۆچییەکان کە ریوایەتەکان ناویان نەهێناوە چووە ژورەوە بۆ لای کاتێ عوسمان کابرای بینی پێی وت با ئەم قورئانە لە نێوان من‌و تۆدابێ[4]، پیاوەکە هاتە دەرەوەو وازی لێ هێنا، زۆری پێ نەچوو یەکێکیان چووە

---

[1] فتنة مقتل عثمان (١٦٩/١)، تاريخ الطبري (٤٠٤/٥)، رواه صحيحه.

[2] الخلفاء الراشدين للخالدي، ص(١٨٤، ١٨٥)، البداية والنهاية (١٩٦/٧).

[3] فتنة مقتل عثمان (١٨٨/١)

[4] تاريخ الطبري (٤٠٥/٥، ٤٠٦).

ژوورەوە پیاوێ بوو لە خێڵی سدوس پێیان دەوت مەرگی رەش، بەرلەوەی بە شمشێر بدات لە عوسمان دەستی نایە بینیو دەی خنکاند، مەرگی رەش دەڵێ، وەڵڵاهی هیچ شتێکم نەدیوە لە خنکاندنی عوسمان ئاسانتر بێ کاتی دەم خنکاند دەمبینی گیانی وەك چرۆیەك شین بێت، دەردەچوو گیانەکە لە جەستەدا هەر مابوو ئەم سەرەوسەری دەکرد[1].

پاشان بە شمشێر کەوتە سەر عوسمان عوسمانیش بە دەست خۆی دەپاراست، دەستی قرتاند لەو کاتەدا عوسمان وتی: وەڵڵاهی ئەو دەستەم کە قرتاندت یەکەمین دەستە کە قورئانی پێ نوسرا[2]، چونکە عوسمان یەکێ بوو لەوانەی کە وا وەحی دەنووسییەوە، یەکەمین کەسە کە قورئانی نووسیوەتەوە بە ئیملاکردن، پێغەمبەر ﷺ ئەو کاتەی عوسمان کوژرا قورئانەکەی لەبەردەستدا بوو خوێنی دەستەبڕاوەکەی کەوتە سەر ئەو قورئانەی کە لەبەردەمیدا بوو دەیخوێند، وە خوێنەکە کەوتە سەر ئەو فەرمودەیەی کە خودای گەورە دەفەرموێت: (فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)[3]، لە ریوایەتێکدا هاتووە یەکەمین پیاوی کە دای لە عوسمان پیاوێکە پێی دەڵێن، رۆمانی یەمانی بە گۆڤان لێیداوە، کاتێ چوونە ژوورەوە بۆ کوشتنی ئەم سرودەی دەوت:

اری الموت لايبقى عزيزا ولم يدع — لعاد ملاذا في البلاد ومرتقى

يبيت أهل الحض والحصن فعلق — وياتي الجبال في شمارينحها العلى[4]

کاتی حاتەیان دابوو نائیلەی کچی فەرافیصەی خێزانی وتی: یان بیکوژن یان وازی لێ بهێنن، وەڵڵاهی جاری وا هەبووە یەك رکات شەونوێژی کردووە هەموو قورئانی تیا خوێندووە[5]، بەم چەشنە نائیلە بەرگری دەکرد لە ئیمامی عوسمانی مێردیو خۆی دەدا بەسەریداو شمشێرێکی گرتبوو بە دەستەوە سەودانی کوڕی حمران پەلاماری نائیلەی داو پەنجەکانی قرتاندو رایکردو دەستی کرد بە جنێودانو تەشەردان لە نائیلە[6]، یەکێك لە

---

[1] تاريخ ابن حياط، ص(١٧٤، ١٧٥)، اسناده صحيح و حسن.

[2] تاريخ الطبري (٣٩٨/٥).

[3] تاريخ الطبري (٣٩٨/٥)، الخبر له طرق عدد بمجموعها برتقي الى درجة حن لغيره..

[4] فتنة مقتل عثمان (١٩١/١)، البداية والنهاية (١٩٢/٧).

[5] الطبقات (٧٦/٣)، فتنة مقتل عثمان (١٩١/١).

[6] تاريخ الطبري (٤٠٦/٥، ٤٠٧).

خزمەتكارەكانی عوسمان ئەم حاڵەتەی بینی وە كوشتنی عوسمان هەژاندی كە پێیان دەوت (نەجیح) ئەم نەجیحە هێرشی بردە سەر سەودانی كوڕی حیمران‌و كوشتی، كاتی قەتیرەی كوڕی فەلانی سكونی بینی نەجیح سەودانی كوشت هێرشی بردە سەر نەجیح‌و كوشتی خزمەتكارێكی تری عوسمان كە ناوی صەبیح بوو قەتیرەی كوشت لەو خانووەدا چواركەس كوژران، دوانیان شەهیدو دوانەكەی تریان تاوانبار بوون، دوو شەهیدەكە ئیمامی عوسمان و نەجیحی خزمەتكاری بوو، دوو تاوانبارەكەش سەودان‌و قەتیرەی سكونی بوون، كاتێك كوشتنی ئیمامی عوسمان تەواو بوو جاڕچییەكی تاقمە سەبەئییەكان هاواری كردو وتی: ناكرێ خوێنڕشتنی پیاوێ حەڵاڵ بێت‌و سامان‌و ماڵەكەی حەرام بێت، ئایا نازانن ماڵەكەشی حەڵاڵە دەستیان كرد بە فەرهود كردنی ماڵەكەشی، گەمژەو ناحاڵییە سەبەئییەكان لەو خانووەدا دەستیان كرد بە كاولكاری‌و تاڵان‌و بڕۆ هەرچی تێدا بوو ماشییانەوە هەتا پۆشاكی بەری خێزانەكانیشیان تاڵان دەكرد، یەكێك لە سەبەئییەكان كە پێی دەوترێت كەلسومی تجیبی پەلاماری نائیلەی خێزانی عوسمانی داو كەواكەی بەری برد، پاشان سیخوڕمەی لێدەداو جوێنی پێ دەدا، پێی دەوت دایكت لە عەجیزەیە تۆی بە پاكی نەهێناوە، كە صەبیحی خزمەتكاری ئیمامی عوسمان ئەم حاڵەتەی بینی‌و بیستی كە ئەم قسە ناشیرین‌و ناقۆڵانەیە دەوترێت بە نائیلە بە شمشێر هەڵی كوتایە سەر كەلسوم‌و كوشتی[1]، یەكێك لە سەبەئییەكان سەبیحی كوشت، دوای ئەوەی سەبەئییەكان ماڵی عوسمانیان چەپاو كرد جاڕیانداو وتیان خێرا بڕۆن بەیتولمال تاڵان بكەن، دەخیلتان بم ئەوەڵ پێش ئێوەی كەسێكی تر بچێ هەر چی تێدایە بیهێنن پاسەوانەكانی بەیتولمال ئەم جاڕەیان بیستن بەیتولمال هیچی تێدا نەبوو دوو هۆڕ خواردن نەبێت، وتیان: خۆتان بدەنە لا ئەم تاقمانە دنیاویست، واتە (سەبەئییەكان) بەیتولمالیان شكاندو دەستیان كرد بە تاڵانكردنی[2] خەوی سەبەئییە خەواریجەكان بە دیهات‌و ئەمیری ئیماندارانیان كوشت‌و زۆرێك لە ئەڵقە لە گوێكانیان كە هەرچی پەرچی‌و ناحاڵییەكان پێكهاتبوون، دوای كوشتنی عوسمان هەڵوەستەیان

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٤٠٧).

[2] المصدر نفسه (٥/٤٠٧).

کردو بیریان کردەوە کە هیچ گومانی تێدا نییە کاری ئەمانە تەواو بووەو هەر بۆ کوشتنی عوسمان بووە، شەیتانە سەبەئییەکان بێئاگایان کردوون‌و بە هەڵەداچوون، بەکاریان هێناون بۆ ئاژاوەنانەوە لە دژی عوسمان بۆ ئەوەی بیکوژن یان دەمدرێژی بکەنە سەری‌و ڕەوتی بشێوێنن، کەوتە بەردەستی ئەم هەرچی‌و پەرچیانەو کەوتنە ئەو پەشیمانییەی کە بەسەر بەنی ئیسرائیلدا هات کاتێك کە دەستیان کرد بە گوێرەکە پەرستی لە دوایدا هەندێکیان پەشیمان بوونەوە[1]، هەموو پیاوە راساڵەکانی مەدینە بۆ کوشتنی خەلیفەکەیان دڵتەنگ بوون، دەستیان کرد بە خوێندنی زیکری موحیبەت‌و گریان بەڵام تازە چی بکەن! سوپای خەواریجە سەبەئییەکانی مەدینەیان داگیر کرد، بەهەر چوارلادا وێرانیان کرد خەڵکەکەیان قەتیس کردو نەیانهێشت هیچ شتێك بکەن، حاکمی فیعلی مەدینە ئەمیری خەواریجەکان بوو، کە خەڵکی میصرەو ناوی غافقی کوڕی حەرجی عەکیە، شەیتانە پیلان گێڕەکەشیان لەگەڵدا بوو، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئە، زۆر شادومان‌و کامەران بوو، کە گەشتووەتە ئامانج‌و مەرامە جولەکەییە شەیتانییەکانی.

هاوەڵە گەورەکان بەم شێوەیەم هەڵوێستیان نواند بۆ شەهیدبوونی ئیمامی عوسمان[2]

١ـ زوبێری کوڕی عەوام کاتێ بیستی ئیمامی عوسمان شەهید کراوە وتی: ڕەحمەتی خودا لە عوسمان‌و دەستی کرد بە ویردی موسیبەت خوێندن، پێیان وت: تاقمەکان پەشیمانن، وتی: ئیشی خۆیان بوو پشتیان کردە یەکیش وەکو ئەوانەیان لێ هاتووە کە خودای گەورە دەفەرموێت: (وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ) (سبأ: ٥٤).

٢ـ تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا کاتێ بیستی ئیمامی عوسمان شەهید کراوە، وتی: ڕەحمەتی خودا لە عوسمان دەستی کرد بە خوێندنی زیکری موسیبەت، پێیان وت ئەو تاقمانە پەشیمانن وتی: ڕووڕەش بن لەناوبچن ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ* (فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَا إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ) (يس: ٤٩ ـ ٥٠).

---

[1] البداية والنهاية (٧/١٩٧، ١٩٨).

[2] الخلفاء الراشدون للخالدي، (١٩٠)، البداية والنهاية (٧/١٩٧).

٣ـ عەلی کوڕی ئەبی تالیب کاتی بیستی ئیمامی عوسمان شەهید کراوە، وتی: ڕەحمەتی خوا لە عوسمانو دەستی کرد بە خوێندنی زیکری موسیبەت، ئەم ئایەتەی خوێند: (كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ* فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدَيْنِ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ) (الحشر: ١٦ ـ ١٧).

٤ـ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص کاتی ئەم هەواڵەی بیست وتی: ڕەحمەتی خودا لە عوسمان، دەستی کرد بە خوێندنی ئەم ئایەتە: (قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً* الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً* أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً* ذَٰلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُواً) (الكهف: ١٠٣ ـ ١٠٦).

پاشان سەعد وتی: ئەی خودایە بیانگریت سەرشۆڕیان کەیت، پەنجەی پەشیمانییان پێ بگەزی[١]، خودای گەورە پاڕانەوەکەی سەعدی قبوڵ کرد، چونکە دوعا گۆیبوو، ئەو کەسانەی بەشداریی کوشتنی عوسمانیان کرد وەکو عەبدوڵڵای سەبەئیو غافقیو ئەشتەرو حەکیمی جەبلەو کەنانەی تجیبی لەوەو دوا کوژران[٢].

## هەشتەم: مێژووی کوشتنەکەی تەمەنی شەهیدبوونیو تەرمەکەییو نوێژ لەسەرکردنو ناشتنی

### ١ـ مێژووی کوشتنەکەی

دیاری کردنی ئەو ساڵەی کە تێیدا کوژرا، کۆ دەنگییەکی لەسەر هەیە لە لایەن مێژوونووسانەوە جیاوازییان نییە، کە ساڵی (٣٥)ی کۆچی شەهید کراوە، تەنیا لە ریوایەتێکی موصعەبی کوری عەبدوڵڵادا هاتووە کە لە ساڵی (٣٦) شەهید کراوە[٣]، ئەمەش قسەیەکی ناوازەیەو پێچەوانەی ئیجماعە، ڕای یەکەم کە ساڵی (٣٥)یان دیاری کردووە ڕای کۆمەڵێك زانایە، وەکو عەبدوڵڵای کوری عەمری کوڕی عوسمانو عامری

---

[١] تاريخ الطبري (٤٠٧/٥، ٤٠٨)، البداية والنهاية (١٨٩/٧).

[٢] الخلفاء الراشدون للخالدى، ص(١٩٢).

[٣] تاريخ الطبري (٤٣٥/٥، ٤٣٦).

کوڕی شەرحبیل‌و شەعبی‌و نافیعی مەولای ئیبنو عومەرو مەخرەمەی کوڕی سولەیمان‌و زۆرێکی تریش[1]، مێژوونووسەکان جیاوازییان نییە لەو مانگەی کە تیایدا کوژراوە، کە مانگی (ذوالحجه)یە، بەڵام جیاوازییان هەیە لە ڕۆژو سەعاتەکەیدا، بە ڕای زۆرێك لە زانایان ئەم شەهیدبوونەیان بە ڕۆژی ۱۸/۱۲/۳۵ی کۆچی پارسەنگ داوەتەوەو جەختیان کردووە[2]، بەڵام دیاری کردنی ئەو ڕۆژەی کە تێیدا کوژراوە، واتە چەند شەممە بوو لە ڕۆژانی هەفتە سێ بۆچوون هاتووە، جمهوریش لە هەموو قسەکاندا ئەم قسەیەیان پارسەنگ داوەتەوە، کە ڕۆژی هەینی بووە، بە قسەی جمهور[3]، قسەیەکی بەهێزیش نییە بەرپەرچی بداتەوە کاتی کوشتنەکەشی بەبەیانی ڕۆژی هەینی بوو، کە جمهور دەڵێن تاقی بەیانی بووەو قسەیەکی بەهێزیش نییە بەرپەرچی بداتەوە[4].

۲ـ تەمەنی شەهیدبوونی

ریوایەتەکان جیاوازییان هەیە لە سالی شەهیدبوونی ئیمامی عوسماندا، هەر لە کۆنەوە ئەم راو جیاوازییە هەیە لەسەری تەنانەت تەبەری دەڵێت: پێشینان جیاوازییان هەیە لە ئەندازەی تەمەنی عوسماندا[5]، بەڵام وای بۆ دەچێت کە عوسمان لە تەمەنی (۸۲) ساڵیدا شەهید کرابێت، ئەم قسەیە ڕای جمهورە، ئەم قسەیە دەسەلمێت لەسەر چەند هۆکارێك.

أ ـ لە ئەنجامی بەراوردی نێوان ساڵی لەدایکبوون‌و ساڵی شەهیدبوونی، ڕاستی ئەم قسەیەمان بۆ دەردەکەوێت، کە تەمەنی (۸۲) ساڵ بووە، شەهید کراوە، چونکە لە ساڵی شەشەمی دوای ساڵی (فیل) لەدایك بووە، لە ساڵی (۳۵)ی کۆچی شەهید کراوە، ئەگەر ساڵی لەدایکبوونی دەربکەین لە ساڵی شەهیدبوونی بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە لە تەمەنی چەند ساڵێدا شەهید کراوە.

[1] فتنة مقتل عثمان (۱/۱۹۳، ۱۹٤).

[2] تاريخ الطبري (٤٣٥/٥).

[3] المصدر نفسه (٤٣٦/٥).

[4] تاريخ الطبري (٤٣٧/٥).

[5] تاريخ الطبري (٤٣٧/٥).

ب ـ رای جمهوری زانایان وایە، کە لە تەمەنی (٨٢)ساڵیدا شەهید کراوە، لەم وتەیە بەهێزترمان نییە[1].

**٣ـ تەرمەکەیو نوێژکردن لەسەریو ناشتنی**

کۆمەڵێك لە هاوەڵان هەر لەو ڕۆژەی کە شەهید کرا هەستان بە شۆردنو کفنکردنی، وە خستیانە سەر دارمەیتو بردیان بۆ گۆڕستان، ئەو هاوەڵانەش ئەمانە بوون: (حەکیمی کوڕی حیزام، حوەیتەبی کوڕی عەبدولعەزا، ئەبو جەمعی کوڕی حوزەیفە، نەیاری کوڕی مەکرەمی ئەسلەمی، جوبەیری کوڕی مەتەعیم، زوبەیری کوڕی عەوام، عەلی کوڕی ئەبی تالیب)، کۆمەڵێ لە هاوەڵانی تر، خێزانەکانی وەك (نائیلەو ئومو بنین کچی عوتبە) کە خێزانی بوون، دەڵێن جوبەیری کوڕی مەتەعیم نوێژی لەسەر کرد دەڵێت: (زوبێری کوڕی عەوام) نوێژی لەسەر کرد دەشڵێن (حەکیمی کوڕی حیزام) بوو، دەڵێن: (مەروانی کوڕی حەکەم) بوو، دەڵێن: میسوری کوڕی مەخزومی بوو[2]، بەڵام ئەوەی کە لای من بەهێزە ئەوەیە کە (زوبێری کوڕی عەوام) نوێژی لەسەر کردووە، چونکە ئیمامی ئەحمەد لە (مسند)ەکەیدا ریوایەتی کردووە، ئەم ریوایەتە ڕوونی دەکاتەوە، کە زوبێری کوری عەوام، نوێژی لەسەر کردووەو دایشی هێڵاوە بۆ ناو گۆڕەکەی، چونکە وەسێتی پێ کرابوو[3]، بەشەو ناشتیان وەکو (ئیبن سەعدو زەهەبی) ریوایەتیان کردووەو جەخت دەکەنەوە کە عوسمان لە نێوان مەغریبو عیشادا نێژراوە (ڕەزای خوای لێبێت)[4]، بەڵام ئەو قسانەی کە تەبەرانی لە ڕێگەی (عەبدولمەلیکی کوڕی ماجشون)ەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: بیستومە لە ئیمامی مالیك وتویەتی عوسمان کوژراو فڕێدرایە سەر سەرکەوانی خێڵی فلان هەتا سێ ڕۆژ[5]، ئەم ریوایەتە زەعیفەو دەقەکەشی پوچەڵە سەنەدەکەی دوو عیللەتی تێدایە.

---

[1] فتنة مقتل عثمان (١/٢٠٤).

[2] البداية والنهاية (٧/١٩٩).

[3] الموسوعة الحديثية مسند الامام أحمد (١/٥٥٥)، رجال الاسناد ثقات الا انه منقطع.

[4] الطبقات (٣/٧٨)، تاريخ الاسلام (عهد الخلفاء)، ص(٤٨١).

[5] المعجم الكبير (١/٧٨)، استشهاد عثمان، ص(١٩٤).

أ ـ عەبدولمەلیکی کوڕی ماجشون کابرایەکی زەعیفە لە ریوایەتداو هەرچی شتی خراپە داویەتی پاڵ ئیمامی (مالیك).

ب ـ ئەم ریوایەتە (مرسلە)، چونکە ئیمامی (مالیك) لە کاتی کوشتنی عوسماندا لەوێ نەبووە، وە لە ساڵی (٩٣)ی کۆچی لەدایکبووە[1]، هەروەها دەقی ئەم ریوایەتە پوچەڵە (ابن حزم) دەڵێت: هەرکەسێ بڵێ ئیمامی عوسمان فڕێدراوەتە سەر زبڵدان ماوەی سێ رۆژ ئەمە، درۆیەکی شاخدارەو دەست هەڵبەستێکی داتاشراوەو لەو کەسانە دەوەشێتەوە کە شەرم نییە لەناو چاوانیاندا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە، کە لاشەی کوژراوەکانی قورەیشییە کافرەکان لە رۆژی بەدردا فڕێ بدەنە ناو چاڵاوەکانی بەدرو خۆڵی دا بەسەریاندا کە ئەمانە (کوژراوەکان) خراپترین دروستکراوی خودابوون، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە چاڵ هەڵبکەنن بۆ کوژاروەکانی جولەکەکانی (قورەیزە) کە خراپترین میراتگری سەرزەوین، ناشتنی، کەواتە شاردنەوەی کافرو ئیماندار فەرزە لەسەر موسڵمانان، ئیتر چۆن رەوایە بۆ کەسێ، کە شەرمی لەناو چاودا بێ بڵێت: (عەلیو هاوەڵانی شاری مەدینە) پیاوێکی مردویان فڕێدابێتە سەر زبڵدانێك ماوەی (٣) رۆژ، نەیان شاردۆتەوە ئەگەر کەسێ شەرمی لەناوچاودا بێ تۆمەتی وا ناخاتە پاڵ موسڵمانان، کە عوسمان فڕێدرابێو سوکایەتی بە لاشەکەی کرابێ[2]، ناچێتە عەقلی هیچ مرۆڤێکی چاکەوە ئەگەر نەفام نەبێت، کە هاوەڵان ئیمامەکەی خۆیان فڕێدابێ، هەرچەند یاخیبووە سەرکەشەکان هاتبوون بۆ گەمارۆو کوشتنی، هاوەڵان وەکو خوای گەورە باسیان دەکات بۆ رەزای خودا نەترساون لە لۆمەی لۆمەکەران، ئەم ریوایەتە شێواوو ناشیرینانە کە مێژوویان پیس کردووە چڵكو چەپەڵی (رافزییەکان)ە[3].

**٤ـ موحەممەد کوڕی ئەبوبەکری صدیق ئەستۆی پاکە لە خوێنی عوسمان**

بکوژی ئیمامی عوسمان پیاوێکی میسری بوو، بەڵام ریوایەتەکان بە رۆشنی ناویان نەهێناوە، بەڵام ئەو ئاشکرایە کە تیرەی (سروسی)یەو پێیان وتووە (جبلە) واتە (زۆر

---

[1] التهذيب، ابن حجر (٦/٤٠٨).

[2] الفصل (٤/٢٣٩ ـ ٢٤٠).

[3] عقيدة أهل السنة (٣/١٠٩١).

پێست ڕەش) لەبەر ڕەش پێستی پێی وتراوە (جبلە) هەروەها پێشیان وتووە (مەرگی ڕەش).

موحیبەدینیخەتیب پێی وایە کە بکوژی عوسمان عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئە، بەم چەشنە دەڵێ: ئەوە سەلماوە کە (عەبدوڵڵای کوڕی سبأ) لە هەموویان حەسوود تر بووە کە لەو دیوە پەردەوە ئیشی کردووە، واتە: لە هەموویان سەرسەختتر بووە، بەژێر کەپنەکی، لەوانەیە مەرگی ڕەش ناوێکی خوازراو بێت هێما بێت بۆ (عبدالله کوڕی سبأ) بۆ ئەوەی بتوانێ بگاتە دەست کیسەکانی بۆ ڕوخانی خەلافەتی ئیسلام[1] و شایەتی دەدات کە (عبدالله سبأ) ڕەش پێست بووە بە ڕیوایەتی صەحیح هاتووە، کە ئیمامی عەلی (عبدالله سبأ)ی بە پیسو نەگریسو ڕەش پێیست وەسف کردووە، لە قسەیەکیدا دەڵێ: (ڕەش پێستەکە)[2]، بەڵام ئەوە کە پەیوەندیی بەو تۆمەتانەوە هەیە، کە دەکرێت بۆ (موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر) کە عوسمانی کوشتووە، بە مەشاقیص واتە گۆچانەکە، ئەوە باتڵە، چەندین ڕیوایەتی لاواز لەم بارەیەوە هاتووە دەقەکانیشی شازە، چونکە پێچەوانەی ئەو ڕیوایەتە صەحیحانەیە کە ڕۆشنیان کردۆتەوە، کە بکوژی عوسمان پیاوێکی میسری بوو[3].

دکتۆر یەحیا ئەلیەحیا، چەند هۆکارێکی باس کردووە، کە هەمووی ئەستۆ پاکی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکرو دەسەلمێنێت، لە خوێنی عوسمان.

١ـ عائیشە ڕۆشت بۆ بەسرە، بۆ سەندنی خوێنی عوسمان، ئەگەر براکەی خۆی کوشتبێتی ئەوەندە دڵگران نەدەبوو بۆ کوشتنی عوسمانو خۆشحاڵدەبوو، درێژەی ئەم باسە لە ژیانی ئیمامی عەلیدا باس دەکەین.

٢ـ ئیمامی عەلی نەفرەتی کردووە لە بکوژانی عوسمان، تەبەڕای کردووە لێیانو بڕیاری داوە نزیکیان نەبێتەوەو هیچ کارێکیان پێ نەسپێرێ، بەڵام موحەممەدیکوڕی ئەبوبەکری کردە والی میسرو ئەگەر لە بکوژان بوایە نەیدەکردە والی.

---

[1] العواصم من القواصم، نقلا من فتنة عثمان (١/٢٠٧).

[2] لسان الميزان (٣/٢٩٠).

[3] فتنة مقتل عثمان (٣/٢٩٠).

٣ـ ئیبنو عەصاکیر بە سەنەدەکانی خۆی لە موحەممەدی کوڕی تەلحەی کوڕی مەسرەفەوە هێناویەتی دەڵێت: بیستم لە کنانەی خزمەتکاری سەفیەی کچی حویەی وتی: کاتێ ئیمامی عوسمان کوژرا من کوڕێکی چواردەساڵ بووم، وتم ئایا موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر هیچ جۆرێ دەستی هەبووە لە خوێنی ئیمامی عوسماندا؟ وتی: پەنا دەگرم بە خودا شتی وا نەبووە، موحەممەد چووە لای عوسمان ، عوسمان وتی: ئەی برازاکەم تۆ سەحابە نیت موحەممەدیش هاتە دەرەوەو بە هیچ شێوەیەك دەستی لە خوێنی عوسماندا نەبوو[١] ئەو کەسانەی کەشاهیدیان داوە بۆ ئەم باسەی موحەممەد بەشداریی کردووە ئەوەیە، کە خەلیفەی کوری خەیات، تەبەری بە سەنەدی پیاوە سیقەدارەکمانی لە حەسەنی بەصرییەوە ئەم ریوایەتەیان هێناوە، کە موحەمەدی کوڕی ئەبوبەکر یەکێ بووە لەوانەی لە ڕۆژی گەمارۆی خانووەکەدا لەوێ بووە[٢]، ریشی عوسمانی گرتووە، عوسمانیش وتی: شتێکت گرتووە یاخود بە شێوەیەك دەجولێیتەوە باوکت قەد وا نەدەجولایەوە، موحەممەدیش هاتە دەرو وازی لێ هێنا[٣]، بەم شێوەیە بۆمان روون دەبێتەوە کە موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری سدیق ئەستۆی پاکە لە خوێنی عوسمان، وەکو چۆن گورگەکە ئەستۆی پاکە لە خوێنی یوسف، دەرکەوتووە هۆکاری ئەم تۆمەتەی کە خراوەتە ئەستۆی موحەممەد ئەوەیە بەر لە کوشتنی عوسمان چووەتە سەری[٤]، ئیبن کەسیر باسی کردووە، کە کاتی عوسمان قسەی لەگەڵدا کرد، موحەممەد شەرمی کردو گەڕایەوەو پەشیمان بوویەوە دەموچاوی خۆی داپۆشی‌و لە ماڵەوە خۆی قەتیس کردو خۆی نەخستە ریزی گەمارۆچییەکان[٥].

---

[١] مرويات أبي مخنف في تأريخ الطبري (ص٢٤٣).

[٢] مرويات أبي مخنف في تأريخ الطبري (ص٢٤٤)، تهذيب الكمال (٩٦/٦)..

[٣] المصدر نفسه (ص٢٤٤).

[٤] فتنة مقتل عثمان (٢٠٩/١).

[٥] البداية والنهاية (١٩٣/٧).

## باسی چوارەم: هەڵوێستی هاوەڵان دەربارەی کوشتنی عوسمان

لە هەندێ پەڕاوە مێژوویەکان هەڵوێستی هاوەڵانیان شێواندووەو ناشیرین کردووە، لەمەڕ فیتنەی کوشتنی عوسمان، ئەمەش بە هۆی ئەو ریوایەتە رافزیانەوە بووە، کە زۆربەی مێژوونووسان پشتیان پێ بەستووە، کەوتوونەتە شوێن رووداوەکانی فیتنەگەرییەوە کە لە پەڕاوی مێژووی ئیمامی تەبەری‌و پەڕاوە مێژووییەکانی تر، کە لە میانەی ریوایەتەکانی ئەبی میخنەق‌و واقیدی‌و ئیبن‌و ئەعصەم‌و هەواڵگێڕەکانی ترەوە وەگیراون کاتی دەیان خوێنییەوە وا هەست دەکەیت کە هاوەڵان بوون ئەم موئامەرەیان جوڵاندووەو فیتنەیان هەڵگیرساندووە، ئەبو میخنەق مەیلی بەلای شیعەگەرییەوە بووەو خۆی نەپاراستووە لە لەکەدار کردنی عوسمان، چونکە بەلای ئەوەوە خەلیفەیەك بووە هەڵەو پەڵەی زۆربووەو شایەنی ئەوەبوو وای بەسەر بێت، تەلحە لە ریوایەتەکانیدا وەکو یەکێ لە شەڕفرۆشەکان بە ئیمامی عوسمان‌و لایەنگری دژەکانی دەردەخات، تەلحە بە دوژمنی عوسمان دادەنێت ریوایەتەکانی واقیدی جیاوازی نییە.

لە ریوایەتەکانی ئەبی میحنەق، عەمری کوڕی عاص هاتووەتە مەدینەو دەستی کردووە بە توانج گرتنە ئیمامی عوسمان لە ریوایەتی واقیدیی ئەبی میخنەقدا، ریوایەتی رافزییکان زۆرن کە هاوەڵان تۆمەتبار دەکەن بەوەی گوایە موئامەرەیان کردووە دژی ئیمامی عوسمان، هاوەڵان فیتنەکەیان دەجوڵاندەوەو خەڵکییان دنە دەدا، ئەم قسانە هەمووی درۆیەو دەست هەڵبەستە[1]، بەڵکو پێچەوانەی ئەم ریوایەتە رافزی‌و زەعیف‌و داتاشراوانە راوییەکانی فەرموودە ریوایەتە صەحیحەکانیان بۆ پاراستوین لە ریوایەتە صەحیحەکاندا هاتووە، کە هاوەڵان پشتیوانی موسڵمانان بوون، عوسمانیان سەریان خستووەو پاسیان کردووەو ئەستۆیان پاکە لە کوشتنی، لە دوای کوشتنی خوێنەکەیان وویستووەن بەم چەشنە هاوەڵان بچووکترین هاوبەشییان نەبووە لە هەڵگیرساندنی فیتنەو جوڵاندنیدا[2]، هاوەڵان هەر هەموویان ئەستۆیان پاکە لە خوێنی عوسمان هەرکەسێ پێچەوانەی ئەم بۆچوونە بیر بکاتەوە قسەکانی پڕوپوچەو ناتوانی بچووکترین بەڵگە بهێنێ، کە بگاتە پلەی راستی بۆ پشتگیری قسەکانی.

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة (٢/١٤ ـ ١٨).

[2] تحقيق مواقف الصحابة (٢/ ١٨).

بەم شێوەیە خەلیفە لە کتێبە مێژووییەکەیدا لە (عەبدول ئەعلای کوڕی هەیسەم)ەوە ئەویش لە باوکیەوە دەڵێ: وتم بە عوسمان ئایا بکوژانی عوسمان یەکێ لە کۆچەریان یان ئەنسارەکانی تێدا بووە؟ وتی: نەخێر هیچ کامیانی تێدا نەبووە، بکوژەکان هەموویان کەللە رەق بوون، لە خەڵکی شارەکان.

ئیمامی نەوەوی دەڵێ: هیچ سەحابەیەك بەشداریی کوشتنی ئیمامی عوسمانی نەکرد، بەڵکو خەڵکی ناحاڵیو هەرچی پەرچیو سەرسەرییەکان کوشتیان، کە ئایخو بێ سەروبەری ئەملاو ئەولا بوون، بەرنامەیان داڕشت لە شارەکانەوە لە میرەوە هاتنو صەحابەکانی خەڵکی مەدینەش بۆیان نەڕەخسا راویان بنێن گەمارۆی عوسمانیانداو کوشتیان[1]، زوبێری کوڕی عەوام بکوژەکان بە هەرچی پەرچی شارەکان وەسف دەکات، عائیشە خاتوون بە کەللە پوتی تایفەکان وەسفیان دەکات[2] و ئیبنو تەیمیە بە خەواریجو گومڕاو کاولکارو دەستدرێژیکەرو سەرکەش وەسفیان دەکات[3]، ئیمامی زەهەبی بە سەرانی شەڕەنگێزو کەللە ڕەق وەسفیان دەکات[4].

ئیبنو عیماد کە لە کتێبی شەڕەنگێزەکاندا دەڵێت: ئەمانە خوێڕیو ناو بەرمەزەکانی خێڵەکان بوون[5] هەڵسوکەتی ئەم تاقمە تا ناحاڵی هەرچیو و پەرچییانە شاهیدی یان سەلمێنەری ئەم وەسفەیە کە لە کاتی گەمارۆکەدا دەیانکردو عوسمانی خەلیفەیان بە دوژمنکاری کوشتو ئاوو خواردنیان لێ مەنع کرد، ئەو عوسمانەی کەوا هەرچی ماڵی خۆی هەبوو سەرفی دەکرد بۆ ئەوەی تینوەکان تێرئاو بن، بەخۆڕای[6]، ئەو عوسمانەی کەوا سامانێکی زۆری بەخشی کاتی کە خەڵکی ئازاری برسێتی زۆری بۆ هێناوی ئەو عوسمانە هەمیشە بەخشندە بووە تایبەت کاتێ خەڵکی بکەوتنایە تەنگیو ناڕەحەتی[7] هەتا ئیمامی عەلی وەسفی ئەم حاڵە دەکاتو سەرزەنشتی

---

[1] الشهيد الدار عثمان بن عفان، أحمد الخروف، (ص١٤٨).

[2] شرح النووي على صحيح مسلم (١٤٨/٥)، كتاب فضائل الصحابة.

[3] منهاج السنة (١٨٩/٣ ـ ٢٠٦).

[4] دول الاسلام الذهبي (١٢/١).

[5] تحقيق مواقف الصحابة (٤٨١/١)، سذارت (٤٠/١).

[6] المصدر نفسه (٤٨٢/١).، بخاري، كتاب مناقب عثمان (٢٠٢/٤).

[7] التمهيد والبيان، (ص٢٤٢).

گەمارۆچییەکان دەکات، بەم قسەیە، دەڵێت: (ئەی خەڵکینە ئەو کارەی ئێوە دەیکەن نە لە کاری کافر دەچێ نە لە کاری موسڵمان، ڕێگای ئاوو نانخواردنی لێ مەگرن، ڕۆم و فارسەکان ئەسیر دەگرن و نان و ئاویشی دەدەنێ)[1]، هەواڵە ڕاستەکان و ڕا پەسەندەکان و ڕۆداوەکانی مێژوو جەخت لە ئەستۆ پاکی هاوەڵان دەکەنەوە کە نەهاندەربوون نە بەشداریشیان هەبووە لە فیتنەی کوشتنی ئیمامی عوسماندا[2]، ئێستا کۆمەڵێ قسەی هاوەڵان دەهێنینەوە کە ئەستۆیان پاکە لە خوێنی عوسمان.

**یەکەم: ئالوبەیت ستایشی عوسمان دەکەن و ئەستۆ پاکی خۆیان دەردەخەن لە خوێنەکەی**

**١ـ هەڵوێستی خاتو عائیشەی دایکی ئیمانداران**

أ ـ لە فاتمەی کچی عەبدوڕڕەحمانەوە ئەویش لە دایکییەوە، کە پرسیاری کردووە لە عائیشەو ناردووە بۆ لای وتویەتی یەکێ لە کوڕەکانت سەلامت لێدەکاو دەربارەی عوسمان پرسیارت لێدەکات کە خەڵکی زۆر شت دەڵێن لە بارەیەوە عائیشە وتی: نەفرەتی خودا لەوەی نەفرەت دەکا لە ئیمامی عوسمان، وەڵلاهی عوسمان لە لای پێغەمبەر ﷺ دانیشووە، جارێك پێغەمبەریش ﷺ پێی نابوو بە منەوە جبرەئیل قورئانی بۆ هێنا ئەویش فەرمووی ئادەی ئیمامی عوسمان بینوسە، هیچ کەسێ ناگاتە ئەو پایەیەی وەحی بنوسێتەوە، ئەگەر لەلای خوداو پێغەمبەرەکەی بەڕێز نەبێت[3].

ب ـ لە (مسروق)ەوە هاتووە کە عائیشە وتویەتی ئەو کاتەی، کە عوسمان کوژرا، یاخیبووەکان عوسمانیان بە کوژراوی جێ هێشت، ئیمامی عوسمان وەکو قوماشێکی خاوێنی بێلەکە وابوو، پاشان لێی نزی بوونەوەو وەکو بەرخ سەرتان بڕی، مەسروقیش وتی: ئەمە کاری تۆبوو، تۆ نامەت نووسی بۆ خەڵکی فەرمانت پێ کردن هەڵگەڕێنەوە لە عوسمان، عائیشە وتی: نەخێر، سوێند بەو خودایەی، کە ئیماندار باوەڕی پێی هەیەو کافریش باوەڕی پێ نییە، من هیچ نامەیەکم بۆ نەنووسیوە، ڕەشم نەخستۆتە سەر سپی هەتا ئەم دانیشتنەی کە دانیشتووم لێرە[4].

---

[1] تاريخ الطبري (٥/ ٤٠٠).

[2] تحقيق موافق الصحابة (١٨/٢).

[3] تحقيق موافق الصحابة (٣٧٨/١)، المسند (٦/ ٢٥٠ ـ ٢٦١)، البداية والنهاية (٢١٩/٧).

[4] فتنة مقتل عثمان (٣٩١/١)، تاريخ الخليفة، (ص١٧٦)، اسناده الصحيح الى عائيشة.

پێشتر باسمان کرد کە سەبەئییەکان نامەیان دەنووسی بۆ خەڵکی شارەکان بە درۆ هەڵبەستو بە ناوی خاتوو عائیشەوە.

ج ـ کاتێ عائیشە لە مەککەوە دەگەڕایەوە بۆ مەدینەو مەرگی ئیمامی عوسمانی بیست گەڕایەوە بۆ مەککەو چووە ناو مزگەوتی حەرامو ویستی لەوێ بمێنێتەوەو خۆی حەشار بدات لەو فیتنەیەی خەڵکی کۆبوونەوە لە لای، عائیشە وتی: خەڵکینە هەرچیو پەرچی شارەکانو خەڵکی دیجلەو فوراتو کۆیلەکانی مەدینە دەستیان کردووە بە یەکدا (ان عاب الغوغاء على هذا المقتول بالامس الارب و استعمال من حدثت سنه وقد استعمل اسنانهم قبله و مواضع من الحمى حما هالهم وهي امور قد سبق بها لا يصلح غيرها فتابعهم ونزع لهم عنها استصلاحا لهم فلما لم يجدوا حجة ولا غدرا اخلجوا وبادروا بالعدوان وبنا فعلهم عن قولهم) خوێنێکی حەرامیان رشتووەو شارێکی حەرامکراویان حەڵاڵ کردووەو سامانو ماڵەکەیان بە حەرامی بردووەو مانگێکی حەرامیان حەڵاڵ کردووە، وەڵڵاهی پەنجەیەکی ئیمامی عوسمان لە پراوپڕی ئەم جۆرە کەسانە باشترە رزگاربوونی ئێوە لەوەدایە بچن لە دەوری عوسمان کۆببنەوە هەتا ئەو بکوژانە راونێن، کە لە کۆمەیان پەرتەوازە بکەن، ئەو گلەییانەی کردوویانەتە دەستی پێنج بۆ ئیمامی عوسمان ئەگەر گوناهبێت ئەوە عوسمان پاك بووەتەوە، وەکو ئاسنێك لە ژەنگ پاك بێتەوە یاخود وەکو پۆشاکێك لە چڵك پاك بێتەوە وەکو جلوبەرگێ بشۆرێت بە پاکی، عوسمان ئاوەها شۆراوە بە زوڵمی ئەوانە خاوێن تر بووەتەوە[1].

بە پێچەوانەی ئەو قسە بێگەردەوە کەئێمە تێی گەیشتووین لە ریوایەتە متمانەدارەکانی پێشوو لە بارەی پەیوەندیی نێوان عائیشەی دایکی ئیمانداران‌و عوسمانەوە لای تەبەریو غەیری ئەویش هەندێ ریوایەتی تر ماوە کە پەیوەندیی نێوان عائیشەو عوسمانبە وێنەیەکی ناتەواوو شێواو وێنا دەکات بە تەواوی پێچەوانەی ئەو وێنەیە کە ئێمە پێی گەیشتووین، چونکە ئەو رۆڵە جوانە پرشنگدارە هەستیارە دەشێوێنێت کە عائیشە پێی هەستاوەو بەرەنگاری لە حەرامکراوەکان کردوەو بەرگری لە عوسمان کردووەو لە گەمەو تەڵەکەی سەبەئییەکان تێ گەشتبوو[2]، ئەو ریوایەتانەی

---

[1] تاريخ الطبري (٥/٤٧٣، ٤٧٤).

[2] دور المرأة السياسي في عهد النبي والخلفاء الراشدين (ص٣٥٢).

کە لە کتێبی (العقد الفريد) (الأغاني) مێژوو یەعقوبیو مێژوو مەسعودیو ئەنصابی ئەشرافەکاندا هاتووە لە چاوو ئەو بەڵگانەی کە من سۆراغم کردووە لە بارەی رۆڵی سیاسی خاتوو عائیشەوە دەربارەی ژیانی عوسمان هەموو ئەو ریوایەتانە سەر بۆ ئەوە دەکێشن کە هەڵوێستی سیاسیی خاتوو عائیشە لەکەدار دەکەنو ئیدانەی دەکەن، ئەم ریوایەتانە هەژمار ناکرێت، چونکە پێچەوانەی ریوایەتە راستەکانن، لەسەر ریوایەتی بودەڵە بەدەست هێنراون، زۆربەیان ریوایەتی بێ خاوەنن، سەنەدیان نییە، یان سەنەدەکانیان لەکەدارو برینداره ناکرێنە بەڵگەو دەلیل کەسەکانی بەڕاوی هەژمار ناکرێن وێڕای ئەوەی دەقەکانیان وێرانە ئەگەر نەخرێنە پاڵ ریوایەتەکانی ترو ئەمانە ناخرێتە جوملەی ریوایەتە زۆر راستەکانو لە نزیك ریوایەتە حەقەکانەوە دانانرێت[1].

ئەسما موحەممەد ئەحمەد هەستاوە بە لێکۆلینەوەیەکی زیاتر بۆ ئەو سەنەدو دەقانەی کە ریوایەتی رۆڵی سیاسی خاتوو عائیشە دەکەن لە مەڕ رووداوەکانی فیتنەکەوە رەخنەی گرتووە لەو ریوایەتانەی کە دەڵێن ناکۆکی سیاسیی لە نێوان عائیشەو عوسماندا هەبووە، وەك لای تەبەریو خەڵکی تر هاتووە درۆو وێڵی ئەم ریوایەتانەی رۆشن کردۆتەوە، پاشان دەڵێ: باشترین ئیش ئەوەیە کەواز بێنینو پشت بکەینە باسکردنی هەموو ئەو ریوایەتانە کە ناکۆکیو دووبەرەکی دەگەیەنن لە نێوان عائیشەو عوسماندا، چونکە لە رێگەیەکی باوەڕپێکراوەوە نەهاتوون، بەڵکو لە رێگەی ئەو کەسانەوە پێمان گەشتووە کە راوییەکانیان بە شیعەو درۆزنو رافزی وەسف دەکرێن بەلام ئێمە خستمانە روو لەبەر ئەوەی زۆر بلاوەی کردووە لە زۆربەی لێکۆلینەوەکانی ئەم سەردەمەداو بەڵگەشمان بۆ لەکارخستنی ئەم ریوایەتانە وەکو بۆمان روون بۆتەوە هەیە، ئەم هەواڵانە داتاشراوو هەڵبەستراون، کە ئەصڵەن بوونی نییە لە نێوان عوسمانو عائیشەو سەرجەم هاوەڵاندا[2] هیچ نەیاریو ناکۆکییەك بوونی هەبوبێ، ئەگەر بە دروستی مێژوو بخوێنینەوە ئەگەر راست بێ عائیشە لەگەڵ یاخیبووەکان رێککەوتبێتو خەڵکی هاندابێ لە عوسمان، ئەوەش فام دەکرێت، کە عائیشە جۆرێ پەیوەندی ژێربەژێری هەبووبێ لەگەڵ یاخیبووەکان، بەلام شتی وا راست نییە، ئەگەر شتی لەم ریوایەتانە

---

[1] دور المرأة السياسي (ص٣٧٠).

[2] المصدر نفسه.

راست بێ کە وەصفی هەڵوێستی خاتوو عائیشە دەکەن، لە کوشتنی عوسماندا بە پێی ئەم ریوایەتانە عائیشە دادگەری پێوە نەماوەو ئەو هاوەڵانەش کە بەشدارییان کردووە لە گەڵیا بێویژدانو دوور لە عەدالەتن، ئەو ریوایەتانەش قبوڵ ناکرێت، چونکە پێچەوانەی ئەو هەواڵە راستو دروستەیە کە خودای گەورەو پێغەمبەر ﷺ فەرمویانە لە بارەی عەدالەتی هاوەڵانەوە ئەم شاهیدیە بەسە بۆ توانەوەی ئەم ریوایەتانە، بەڵام ئێمە رووبەڕووی ئەم ریوایەتانە دەوستین، چونکە دڵنیاین لە کارکەوتوون سەرەڕای ئەوەی بەڵگەمان زۆرە، کە پشتگیرییان لێ دەکەن، بە تایبەت لە عائیشە ئەگەر بەڵگە دینیو زانستیو مێژووییەکان لەیەك سەکۆدا کۆبکەینەوە هەندێکیان دەبنە پشتیوانی ئەوانی تریان بۆ ئەستۆ پاکی عائیشەو هاوەڵان[1].

## ٢ـ عەلی کوڕی ئەبی تالیب

عەلیو ئالوبەیت رێزیان گرتووە لە ( ئیمامی عوسمان)و دانیان ناوە بە مافەکانیدا بە حەقیان زانیوە، عەلی ئەم کارانەی کردووە:

أ ـ یەکەمین کەسێ، کە بەیعەتی دا بە عوسمان دوای عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف، عەلی کوڕی ئەبوتالیب بوو[2]، لە قەیسی کوری عوبادە، هاتووە دەڵێن: بیستم لە عەلی باسی ئیمامی عوسمانی دەکرد، وتی: عوسمان ئەو پیاوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (چۆن شەرم نەکەم لە کەسێك کە فریشتەکان شەرمی لێدەکەن)[3].

ب ـ عەلی شایەتی بە هەشتیداوە بە عوسمان لە (نیزالەی کوڕی سەبرە)وە هاتووە دەڵێت: پرسیارم کرد لە عەلی دەربارەی عوسمان، وتی: پیاوێکە لە ناو فریشتە بەرزەکان بە (ذالنورین) ناوی دەبەنو پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی بە مێردی دوو کچی خۆی، زەمانەتی پێداوە کە خانوویەکی هەیە لە بەهەشتدا[4].

---

[1] دور المسدأة السياسي، (ص٣١٧).

[2] البخاري، كتاب فضائل الصحابة، رقم (٣٧٠٠).

[3] مسلم، كتاب فضائل الصحابة، رقم (٢٤٠١).

[4] العقيدة في أهل البيت بين ادفر أهل والتفريط، (ص٢٢٧)، المختصر من كتاب الموافقه بين أهل البيت والصحابة للذمشرى مخطوط بمكتبة المخطوطات بالجامع الاسلامية وقد طبع هذا الكتاب عن صديق دار الحديث.

ج ـ عوسمان گوێ بۆ گیراو بووەو ئیعتراف بە ئیمامەتو خەلافەتی کراوە، لە هیچ کارێکداسەرپێچی نەکراوە ئیبن ئەبی شەیبە لە موسنەدەکەی لە ئەبی حەنەفییەوە ئەویش لە (عەلی)ەوە ریوایەتی کردووە، عەلی وتوویەتی ئەگەر عوسمان بم نێرێ بۆ (صرار)کردن گوێی بۆ دەگرمو بە قسەی دەکەم[1]، (صرار) بریتییە لەو پەتەی کە دەمی بەچکە وشتری پێ دەبەسترێت، بۆ ئەوەی دایکەکەی نەمژێت، واتە: (لەغاوکردن) یاخود بۆ هەڵبەستنی گوانی وشترەکان لە بێچووەکانیان[2]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مەودای گوێڕایەڵیو شوێنکەوتەیی عەلی بۆ عوسمان)[3].

د ـ کاتێك عوسمان خەڵکی کۆکردەوە لەسەر خوێندنەوەی یەکجۆر قورئان، دوای راوێژ بە هاوەڵانو ئیجماع بەستنیان، عەلی وتی: ئەگەر منیش ئەو حوکمەم بەدەست بوایە کە عوسمان هەیەتی هەر ئەو کارەم دەکرد، کە ئەو کردوویەتی[4].

هـ ـ عەلی ئینکاری کوشتنی عوسمانی کردووەو دووری گرتووە لە خوێنەکەی، لە وتارەکانو شوێنەکانی تردا سوێندی خواردووە، کە من نەم کوشتووەو فەرمانم بە کوشتنی نەکردووە، حەزم پێ نەکردووە رازی نەبووم، ئەم وتانەی ئیمامی عەلی بە چەند رێگەیەکی گومان بڕ سەلماون[5] بە پێچەوانەی ئەو گومانو گۆترەکارییەی کە (رافزییەکان) دەیڕێسن، گوایە عەلی رازی بووە بە کوشتنی عوسمان[6]، حاکم دوای باسکردنی ئەو هەواڵانەی کە هاتوون لەمەڕ کوشتنی عوسمان، دەڵێت: ئەو قسەیەی کە بیدعەچییەکان گاڵەی بۆ دەکەن، کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب یارمەتی بکوژانی عوسمانی داوە، دۆریەو دەست هەڵبەستە، چونکە چەندین هەواڵی یەك لەدوا یەك هاتوون پێچەوانەی ئەم قەسەیەن[7].

---

[1] السنة للخلال (٣٥٢/١)، رقم (٤١٦)، اسناده صحيح.

[2] لسان العرب (٤٥١/٤).

[3] العقيدة في أهل البيت بين الافراط والتفريط (ص٢٢٧).

[4] السنن للبيهقي (٤٢/٢).

[5] البداية والنهاية (٢٠٢/٧).

[6] العقيدة في أهل البيت الافراط والتفريط (ص٢٢٩)، حق اليقين العبدالله (ص١٨٩).

[7] المستدرك (١٠٣/٣).

ئیبن تەیمیە دەڵێت: (ئەم شتانە هەمووی درۆیە بۆ عەلی، هەڵبەستراوە، عەلی بەشداریی نەکردووە لە خوێنی عوسماندا، دەستی نەبووە تیایداو فەرمانی نەکردووەو رازی نەبووە)، ریوایەت کراوە کە عەلی راستگۆو ئەستۆ پاکە لەم کارە، بە پاکی ماوەتەوە[1]، عەلی خۆی دەڵێت: ئەی خودایە من دوورە پەرێزم لە خوێنی ئیمامی عوسمان[2] حاکم بە سەنەدەکانی خۆی لە قەیسی کوری عیبادەوە ریوایەتی کردووە دەڵێت: لە رۆژی جەمەل بیستم لە عەلی دەیوت: خوایە من پەنا دەگرم لە خوێنی عوسمانو لێی دوورم)، ئەقڵم لە رۆژی کوشتنی عوسماندا جام بوو بوو، خەڵکی هاتبوون بەیعەت بە من بدەن دوای عوسمان، منیش سەرزەنشتی نەفسی خۆمم کردو وتم: وەڵلاهی من شەرم دەکەم لەخودا بەیعەت وەربگرم لە خەڵکانی پیاوێکیان کوشتووە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە فەرمویەتی: (من چۆن شەرم نەکەم لە کەسێ کە فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن).

من شەرم دەکەم لە خودای گەورە بەیعەت وەرگرمو عوسمانیش کەوتووەو کوژراوەو نەنێژراوە پاش ئەوەی کە عوسمان نێژرا خەڵکی داوای بەیعەتیان لێ کردم، وتم ئەی خودایە من زۆر گیانم دادەگیرێ بۆ ئەوکارەی دەیخەنە ئەستۆم، پاشان ئاسودەیم بۆ هاتوو بەیعەتم وەرگرت کاتێ وتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران دڵم تەوسمی دەکرد موچورکە بە گیانمدا دەهات وتم ئەی خودایە سەلامو وەفایی من بگەیەنە بە عوسمان هەتا رازی دەبێت[3]، (ئیمامی ئەحمەد) بە سەنەدەکانی خۆی لە (موحەممەدی ئەبی حەنەفی)یەو ریوایەتی کردووەو وتویەتی: (هەواڵ گەیشت بە عەلی کە عائیشە لەمەڕ بەد (شوێنکە لە بەصرە) نەفرەت لە بکوژانی عوسمان دەکات)، دەڵێت: (عەلی هەردوو دەستی بەرز کردەوە بۆ سەرووی دەموچاویو وتی: منیش نەفرەت لە بکوژانی عوسمان دەکەم خودای گەورە لە دەشتو چیا نەعلەتیان لێ بکات دووجار یان سێ جار[4] ئەمەی وتووە (ابن

[1] منهاج السنة (٤/٤٠٦).

[2] العقيدة في أهل البيت، (ص٢٣٠)، اسناده حسن.

[3] المستدرك (٣/٩٥)، حديث صحيح على شرط الشغين ولم يخرجاه ووافقه الذهبي.

[4] فضائل الصحابة (١/٥٥٥)، رقم (٧٣٣)، اناده صحيح.

سعید) بە سەنەدی خۆی لە (ابن عباس)ەوە ریوایەتی کردووە، کە عەلی وتوویەتی وەڵڵاهی من عوسمانم نەکوشتووەو فەرمانم بە کوشتنی نەکردووە، بەڵام ڕێگریو قەدەغەم کردووە، وەڵڵاهی عوسمانم نەکوشتووەو فەرمانم بە کوشتنی نەکردووە بەڵکو من هۆشم لەدەستدا سێ جار ئەمەی وت[1]، دیسان ئیبن سەعید هێناویەتی، کە عەلی دەڵێت: (هەرکەسێ دووربگرێ لە دینی عوسمان ئەوە لە ئیمان خۆی دوور گرتووە وەڵڵاهی هاوکاری کەسم نەکردووە بۆ کوشتنی فەرمانیشم نەکردووەو رازیش نەبووم)[2].

و ـ عەلی لە بارەی عوسمانەوە دەڵێت: لە هەمووومان زیاتر شیرازەی خزمایەتی گەیاندووەو لە هەمووومان زیاتر لە پەروەردگاری جیهان ترساوە[3].

ز ـ لە (ئەبی عون)ەوە هاتووە دەڵێت: بیستومە لە موحەممەدی کوڕی حانەبەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە عەلی دەربارەی عوسمان، وتی: (عوسمان یەکێکە لەوانەی کە ئیمانی هێناو لە خوا دەترسا، پاشان ئیمانی هێنایەوەو لە خوا دەترسا، واتە بەر ئەو ئایەتە دەکەوێت، کە دووجار ئیمانو تەقوای تیا هاتووە[4].

هـ ـ لە (عمیری کوری سەعد)ەوە هاتووە، دەڵێ: ئێمە لەگەڵ عەلی دا بووین، لە کەناری فورات کە شتییەك دای بەلاماندا لێوارەکانی بەرز بوو، عەلی وتی: سوێند بەو خوایەی کەشتی خستووەتە ناو دەریاکان من عوسمانم نەکوشتووەو دەستم لە کوشتنیدا نەبووە)[5].

گ ـ (ئیمامی ئەحمەد) لە موسندەکەیدا لە (موحەممەدی کوری حاتەب)ەوە ریوایەتی کردووە دەڵێ: بیستم لە عەلی دەیوت: (إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى أُوْلَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ) (الأنبياء: ١٠١)، یەکێ لەو کەسانە عوسمانە، عەلی وتی: لە ڕۆژی کوشتنی عوسماندا تەواو دڵگران بووم (حافظي ابن كثير)[6].

---

[1] الطبقات (٨٢/٣)، البداية والنهاية (٢٠٢/٧).

[2] رياض النضرة، (ص٥٤٣).

[3] صفة الصفوة، (ص٣٠٦/١).

[4] فضائل الصحابة (٥٨٠/١)، اسناده صحيح.

[5] فضائل الصحابة (٥٥٩/١ ـ ٥٦٠)، اسناده لغيره، رقم (٣٧٩).

[6] المنظم في التأريخ الملوك والامم (٦١/٥).



هەموو ئەو ڕێگایانەی کۆکردووەتەوە کە لە بارەی هەڵوێستی عەلی-یەوە هاتوون کە عەلی ئەستۆی پاکە لە خوێنی عوسمان، عەلی لە وتارەکانیدا سوێندی خواردووە کە ئەو عوسمانی نەکوشتووەو ڕازیش نەبووە بە کوشتنی لە چەند ڕێگەیەکەوە، کە گومان بڕن لای زۆربەی ئیمامەکانی فەرمووده، ئەم قسەیەی ئیمامی عەلی سەلماوە[1].

**٣ـ عەبدوڵلای کوڕی عەباس**

ئیمامی ئەحمەد بە سەنەدەکانی لە ئیبنو عەباسەوە ریوایەتی کردووە، کە وتویەتی ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە لەسەر کوشتنی عوسمان هەموویان بەردەباران دەکرێن، وەکو بەردەبارانەکەی قەومی (لوط)[2]، واتە ئەوەندە بەڕێزە، دیسانەوە لە وەسفی عوسمانو زەمی ڕەخنەگرەکانیدا دەڵێت: (ڕەحمەتی خودا لە باوکی عەمرو واتە عوسمان بەڕێزترین نەوەیەو ئەفزەڵترین قورئان خوێنە پارشێوان لە عیبادەت دەکۆشاو فرمێسکی زۆری دەڕشت لە باسی ئاگردا، لە کاتی بەخشیندا مەردانە دەردەپەڕیو لە پێش پیشاندابوو بۆبەخشندەیی، خۆشەویستو پاکو بەئەمەك بوو، خاوەنی لەشکری تەنگانە بوو زاوای پێغەمبەر ﷺ بوو خودای گەورە هەتا ڕۆژی قیامەت نەفرەتی کردووە لەو کەسانەی کە نەفرەتی لێدەکەن، بەو نەفرەتی نەفرەتکاران تۆڵەی داوە)[3].

**٤ـ زەیدی کوڕی عەلی**

ئیبنو عەساکیر بە سەنەدەکانی لە (السدی)یەوە ریوایەتی کردووە دەڵێت: چوومە لای زەید لە کۆڵانێکی قەرەباڵغدا بوو لەگەڕەکەکانی کوفە پێم وت ئێوەی گەورەی ئێمە ئێوەی فەرمانداری ئیمە، دەربارەی ئەبوبەکرو عومەر چی دەڵێت؟ وتی: هەردووکیانمان خۆش دەوێتو خەلیفەمانن، هەروەها دەیوت دورەپەرێزی لە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان ئەوە دوورەپەرێزە لە عەلی دووره پەرێزیش لە عەلی دووره پەرێزییە لە ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان[4].

---

[1] البداية والنهاية (١٩٣/٧).

[2] فضائل الصحابة (٥٦٣/١)، رقم ٧٤٦.

[3] العقيدة في أهل البيت، (ص٢٣٤)، مروج.

[4] العقيدة في أهل البيت، (ص٣٣٥)، تهذيب تأريخ دمشق (١٢/٦).

**٥ـ عەلی کوڕی حوسەین**

ئەوە سابتە کە عەلی کوڕی حوسەین بەرائەتی دەربڕیوە، لە قسەی رافزییەکان دەربارەی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان، ئەبو نوعەیم بە سەنەدەکانی لە موحەممەدی کوڕی عەلی ئەویش لە باوکییەوە لە عەلی حوسەینەوە ریوایەتی کردووە، کە موحەممەد وتویەتی گرۆیەکی خەڵکی عێراقی دانیشتبوون باسی ئەبوبەکرو عومەریان دەکردو لێیان دەخوێندن، پاشان هاتنە سەر عوسمان لێیان دەخوێند، ئەویش وتی: راستم پێ بڵێن ئێوە لە کۆچەرییە یەکەمینەکانن (الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ)، وتیان نەخێر، وتی: ئێوە لەو ئەنسارانەن کە (تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ)، وتیان نەخێر، وتی: ئێوە خۆتان شایەتیتان داو دانتان پیا نا، کە ئێوە نە لە مانەن، نە لەوانەن منیش شایەتم ئێوە لە دەستەی سێیەمیش نین، کە خودای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلّاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (الحشر: ١٠)، هەستن لە لای من خودای گەورە دوا بڕاوتان کاتو دەورتان قەرەباڵغ نەکات، ئێوە گاڵتە بە ئیسلام دەکەنو ئەهلی ئیسلام نین[1].

**دووەم: هەڵوێستی عەممار کوری یاسر**

لە ریوایەتە مێژوییەکاندا هاتووە، لە ناواخنیدا لاوازو بەهێزی هەڵگرتووە باسی ناکۆکی نێوان عەمارو عوسمان دەکات، هەندێ لەو ریوایەتانە بە سەنەدەکانو ڕیشمەکراون هەندێکی تریان نەریشمەو نە جلەویان نییە، هیچ کەسێکیان بەتێرو تەسەلی شیکارو توێژینەوەیان نەکردووە لەسەری هەر چنیویانەتەوە، نمایشکردنی ئەو جۆرە بابەتانەی کە ڕێزو حومەتی پاکترین دروستکراوی خوداو خۆشەویسترین کەس بە لای پێغەمبەرەوە ﷺ لەکەدارو ناشیرین دەکات، نابێت بایەخ بخەینە سەریو گوێ بە ریوایەتیو وەها بدەین، کە دەکەوێتە وێزەو شانو شکۆی هاوەڵان بە کەیفی خۆیو بەبێ

---

[1] العقيدة في أهل البيت (ص٢٣٦)، البداية والنهاية (١٢/٩).

ریشمەو جڵەو ملدەنێت[1]، ئەو تۆمەتەناڵەبارانەی کە ریوایەتە زەعیفەکان ڕەوانەی کردووە.

### ١ـ لێدانی عەمماری کوڕی یاسر

ئەو ریوایەتانەی کە گوزارشت لەو دەنگوباسە دەکەن کە گوایە عوسمان داویەتی لە عەممار باسی ئەم لێدانە لەم ریوایەتانەدا زۆر بەدورودرێژی باس کراوەو بە بابەتێکی ناوزەد لێی دواون ئەوانەی کە هۆندویانەتەوە هونەرمەندانە باسی ئەو شێوازانەیان کردووە یان باسی ئەو ئامرازانەیان کردووە کە عوسمان بە کاری هێناوە بۆ لێدانی عەممار دەرئەنجامی ئەم باسە وێڕای ئەوەی سەنەدەکانی وێرانە نکولییەکی توندو تۆڵێش ئاراستەی دەقەکانی دەکرێت[2]، ئەبوبەکری کوڕی ئەلعەرەبی، لە کتێبی (عەواصم)دا سەرەڕای ئەووەی دەست دەنێت بەو تۆمەتەی کە دراوەتە پاڵ عوسمان پاساوی دەدات لەو ناهەقیانەی دراوەتە پاڵی دەڵێت، لێدانی عوسمان بۆ ئیبن مەسعود دوو بەش بڕیتی قسەیەکی درۆیە، لێدانیشی بۆ عەممار هەڵبەشتراوێکی درۆیە ئەگەر عوسمان ریخۆڵەی عەمماری بپچڕایە هەرگیز نەدەژیا، زانایان بە چەند روویەك پەڵپیان هێناوەتەوە کە نابێ مەشغوڵ بین، بەم جۆرە ریوایەتانە، چونکە لەسەر باتڵ بنیاد نراوە، حەقیش لەسەر باتل بنیات نانرێ‌و ئێمەش نابێ سەردەمەکان بە ڕەوتی نەفامەکان بەرێ بکەین، جگە لە درۆو هەڵبەستراو ئەم ریوایەتانە هیچی تر نین[3]، ڕەوشتی عوسمان لە نەریت‌و ئیمان‌و شەرم‌و دڵ ناسکی‌و سروشتی تەنگی‌و پلەبەرزی پێشینەی لە ئیسلامدا زۆر لەوە بەرزترە خۆیدابەزێنێ بۆ ئاستێ کە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکا لەگەڵ پیاوێکی بەرزی شکۆداری هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ، عوسمان ڕێزو پێشینەی عەمماری زانیوە هەرچەند رای جیاواز هەبووبێ لە نێوانیاندا، ئایا عوسمان کە رازی بێ خەڵکی بیکوژن‌و نەهێڵێ کەس شەڕی لەسەر بکات، بە خۆگری‌و بە چاوەڕوانی پاداشت،بە مردن رازی بێت بۆ ئەوەی خوێنی موسڵمانان نەڕژێت‌و لە فیتنەی ناگەهان بپارێزرێت، ئایا چۆن ڕێگە بە خۆی

---

[1] الجامع الأحكام القران (١٨/٣١، ٣٢).

[2] المصدر نفسه.

[3] العواصم من القواصم، (ص٨٢ ـ ٨٤).

دەدات کاری وا بکات لەگەڵ عەممار، ئەو ریوایەتە ساختەکارییانەی گوایە عوسمان فەرمانی کردووە بە بەردەستەکانی ئەوەندە بدەن لە عەممار هەتا دەبورێتەوە، پاشان عوسمان هەستاوە لەو حاڵەتەدا داویەتی لەناو سکیو ریخۆڵەی بریوە، ئایا ئاکاری عوسمانو شەرمەکەی رێگەی دەدات کە بەناوی سەردەمی نەفامی بانگی عەممار بکاتو عەممار عەیبدار بکا بە سومەیەی دایکیو تانەی لێبدات،کە سومەیە یەکێکە لە پێشینە بەرێزەکان، عوسمان چاك دەزانێت شەرەفە بۆ عەممار کە بدرێتە پاڵ دایکیو بەدایکییەوە ناو بنرێت، چونکە دایکی یەکەمین ژنە شەهید بووبێ لە ئیسلامدا، نەخێر هەرگیز وانییە هەواڵە راستو باوەڕ پێکراوەکان شتی وای تیا نییە، کە عوسمان دابەزیبێ بۆ شێوازێکی ئەوەندە نزمو خوار لە تەمێ کردنو سەرزەنشتکردن دا لەسەروی ئەمانەوە رەوشتو سروشتو رەوتی عوسمان زۆر دوورە لەم شێوە مامەڵەیە، گومانی تیا نییە خستنە رووی نموونەی ئەم ریوایەتە دەست هەڵبەستانەی کە باسمان کرد لە هەڵوێستو رەوشی ئەو ئیمامە هەڵکەوتوانە، دەبێت دەست بەو ریوایەتەوە بگرین، کە شایستەو بایەخدارە بە پێودانگی ئەو سەردەمەو پێوەرێکی شیاو کە ئیمامەکانی تیا ژیاوە، چونکە ترازووی رێکو راست لە رەخنەگرتن بۆ دەرخستنی پۆخڵەواتی درۆزنەکانو بوختانچییەکانو لەخۆڕا دانەرەکان باشترین تەرازووە.(١)

**٢ـ تۆمەتبارکردنی عەممار کە دەستی هەبووە لە فیتنەکەداو ئاژاوەی بەرپا کردووە دژی عوسمان**

مێژوونووسەکان هەندێ درۆو دەلەسەیان داوەتە پاڵ عەمارو بە گوێرەی هەندێ ریوایەت کە هیچ کامیان راستی سەنەدەکانیان سەلامەت نییە لە توانجو رەخنەو دەقەکانیشیان بە دروستی راست نابێتەوە، ئەم تۆمەتەی کە دەدرێتە پاڵ عەممار بە چەند شێوەیەك باسکراوە، کە دەستی هەبوو لە جولاندنی کاری فیتنەکەدا خەڵکی هانداوە لە عوسمان لە نێوان یاخیبووەکاندا، ئەم سەرو سەری کردووە، ئەم کارانەشی کە دەخرێتە سەر لەوێوە سەرچاوەی گرتووە، کاتی ئیمامی عوسمان عەمماری نارد بۆ میسر بۆ ئەوەی لە نزیکەوە حاڵی ببێ لەو گلەیو گازندانەی کە بەرگوێی کەوتووە لە لایەن یاخیبووە

---

[١] الخليفة المفترى عثمان بن عفان، (ص١٤ ـ ٤١)، عمار بن ياسر (ص١٣٧).

سەرکەشەکانەوە لەو کاتەدا سەبەئییەکان توانیویانە عەممار ڕێك بکەن‌و بیخەنە ژێر کاریگەرییەوە، ئەم هەواڵە کە تەبەری ڕیوایەتی دەکات[1]، شوعەیبی کوری ئیبراهیمی تەمیمی کوفی تێیدایە، کە لە کتێبی عەمری کوڕی سەیفەوە ڕیوایەتی کردووە، ئەم کەسە جەهالەتی هەیە ڕاوی لە بارەیەوە دەڵێت: شوعەیب کابرایەکی نەناسراوە، قسەو هەواڵی زۆرەو هەندێ لارو وێری هەیە.

کۆمەڵێ ناحەقی‌و گلەیی هەیە لەسەر پێشینانی ئیسلام[2]، ئەم ڕیوایەتە عومەری‌ە کوڕی شوعبە لە کتێبی مێژووی مەدینەدا ڕیوایەتی کردووە، بەڵام لە سەنەدەکانیدا عەلی کوری عاصم هەیە کە ئبولحەدیسی لە بارەیەوە دەڵێت: عەلی کوڕی عاصم هەڵەی زۆرە ئەگەر قسەت پێ دووبارە بکردایەتەوە نەیدەتوانی بیگێڕێتەوە لە بارەی زانستی موحەدیسیشەوە عەلی کوڕی عاصم ناسراوە، کە گێڕەرەوەکان مونکەرن[3]، یەحیای کوڕی مەعیش دەڵێت: عەلی کوڕی عاصم هیچ نییە یان هیچی پێ نییە[4]، (مودە) دەڵێت: درۆزنەو هیچی تیا بەسەر نییە[5]، (نەسائی) دەڵێت: حەدیسی لێ وەرناگیرێت[6]، (بوخاری) دەڵێت: پیاوێکی بەقوەت نییە قسەی زۆری لەسەرە[7]، هەرچەندە بە قسەی نەرمونیان هەڵسەنگێنراوە، (ئیبن حەجەر) لە باریەوە دەڵێت ڕاستگۆیە هەڵە دەکات‌ودەشپێکێت، بە شیعە ناودەبرێت[8]، ئەمە وەزعی سەنەدی ئەم ڕیوایەتەیە، کەواتە با لێی دڵنیابین‌و چاك بزانین کە عەممار دەستی نەبووە لەم فیتنەیەدا، تەنانەت کە عەممار بە هاوەڵێکی خۆ پارێز ناسراوەو زۆر چاوەڕوان نەکراوە، کە خۆی بهاوێتە بارودۆخی لەو جۆرە، چونکە هیچ کەس نەچووە ناو ئەو تاقمانەوە مەگەر

---

[1] تاريخ الطبري (٣٤٨/٥).

[2] استهشهاد عثمان ووقعه الجمل (ص٣٠).

[3] سير اعلام النبلاء (٢٥٣/٩).

[4] سير اعلام النبلاء (٢٥٥/٩).

[5] سير اعلام النبلاء (٢٥٧/٩).

[6] المصدر نفسه.

[7] المصدر نفسه ().

[8] تقريب التهذيب، (ص٤٠٣).

سەبەئی‌و جوولەکەو داخ لەدڵ بوایە، پەنا دەگرم بەخوا کە هاوەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خۆی کەیاندبێتە ئاستێك کە فیتنەگەری‌و تەمو مژی تێدا بێت.

(خالید العیش) دەڵێت: ئەم هەواڵە پێچەوانەی دادگەری هاوەڵانە، چونکە بە دڵنیایی هاوەڵان ئەوەندە دادخوازن هەواڵی وا نایانگرێتەوە سەرەڕای ئەوەی ئەم هەواڵە لە ڕێگەیەکی راستەوە نەهاتووە[1]، ئەو ریوایەتە بوودەڵانەی کە لەم بارەیەوە هاتوون‌و ئەو کارانەی دراوەتە پاڵ سەعیدی کوڕی موسەیەب لەو ریوایەتانەدا سەرجەم هاوەڵان تۆڵەو گلەییان هەبووە لە عوسمان، چووەنەتە پاڵ ئەوانەی کە گازندەیان هەبووەو هوتەرەیان کرۆدتە سەری بەتایبەتی ئەبوزەڕو ئیبن‌و مەسعودو عەمماری کوڕی یاسر[2]، نەگبەتی ئەم ریوایەتە لەوەدایە کە تەدلیسی تێدایە، کە تەدلیسەکەش لەو جۆرە نییە کە چاوی لێ بپۆشێ‌و قەناعەتی پێ بکرێت، چونکە راوییەکی تێکەوتووە، کە بەدرۆزن‌و دەست هەڵبەست ناسراوە، ئەویش ئیسماعیلی کوری یەحیای کوڕی عوبەیدوڵڵایە، لەبەر ئەوە هەموو زانایانی موحەدیسیش ئەم ریوایەتەیان زەعیف کردووەو بودەڵەیی ئەم ریوایەتەیان دەرخستووە، کاتێ باسی کەسێتی موحەممەدی کوڕی عیسای کوری سەمیع دەکەن کە ئەم هەواڵەی (ابن ابي ذئب)ەوە هێناوە ئیمامی بوخاری لە بارەی ئیبن سەمیعەوە دەڵێت: ئیبن سەمیع ئەم قسەیەی لە ئیبن‌و ئەبی (ذئب) نەبیستووە، واتە ئەو قسەیەی کە زوهری دەیکات لە بارەی کوشتنی عوسمانەوە، ئیبن‌و حیبان دەڵێت: ئیبن سەمیع ریوایەتەکانی لە ئبن‌و ئەبی (ذئب)ەوە نەبیستووە، بەڵکو ئیسماعیلی کوڕی یەحیاوە بیستوویەتی لێی تێکچووە، کە دەڵێت: لە (ابن ذئب)ەوە بیستوومە، حاکم دەڵێت: ئیبت سەمیع لە ئیبن‌و ئەبی (ذئب)ەوە قسەیەکی لارو وێری (منكر) ریوایەت کردووە ئەمیش قسەوباسی کوشتنی عوسمانە حاکم لە کتێبەکەیدا دەڵێت: ئیسماعیلی کوڕی یەحیای لە کتێبەکەی ئیبن‌و ئەبی (ذئب)دا ڕاوییەکی لە کارکەوتووە، چونکە ئیسماعیل قسەکانی دەمین[3]، دکتۆر یوسف ئەلعش دەڵێت: ئەو ریوایەتەی دراوەتە پاڵ

---

[1] استشهاد عثمان روقعة الجمل، (ص٨٦).

[2] تاريخ دمشق (٤١٥/٣٩)، عمار بن ياسر، (ص١٤٤).

[3] تحقيق مواقف الصحابة (١٦/٢ ـ ١٨)، التأريخ الكبير للبخاري (٢٠٣/١)، التهذيب (٣٩١/٩)، تهذيب تهذيب (٣٩٢/٩).

سەعیدی کوڕی موسەیەب واجبە دوور کەوینەوە لێی، چونکە دوای گەڕان‌و پشکنین دەرکەوت کە هەڵبەستراوە، حاکمی نەیسابووری بە دەق هێناویەتی کە یەکێ لە پیاوانی سەبەئی ئەم ریوایەتەی هێناوە، کە متمانەی پێ ناکرێ‌و لە کارکەوتووە، چونکە پیاوێکی خەیاڵاوییە دەقەکەیش لارو وێرە (منکر)ە، چونکە لە راستیدا ئەو رێزو حورمەتە دەرناکەوێ کە سەعیدی کوڕی موسەیەب هەیبووە، بۆ هاوەڵان، لە ریوایەتی لەم شێوەدا لە قسە هیچەکانی تردا نەبێت[1].

### ٣ـ ئەستۆپاکی عەممار لە خوێنی عوسمان

ئەوەی کە ریوایەت کراوە لەم بارەیەوە تۆمەتبارکردنی مەسروقی ئەبی موسایە دەربارەی عەممار بەم پێیە عەممار لەگەڵ حەسەندا هاتووە بۆ راپەڕاندنی خەڵکی کوفە، ئەم ریوایەتە سەنەدەکانی لاوازە، چونکە شیعەیەکی نەناسراوو سەیفی عیللەتباری تێدایە، هەروەها ئەو ریوایەتەی لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە شتی وەهای باس نەکردووە، ئەو زیادەی پێوە نراوە بۆ وەرگرتن ناشێت بە تایبەتی ئەگەر توانج بگرێتە هاوەڵێکی وەکو عەمماری کوڕی یاسر کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (عەممار پەنادراوە لە شەیتان[2] و ئیمان لیپان لیپی دڵی بووە)[3]، زانایان هیچوپوچی ئەو تۆمەتانەیان روون کردۆتەوە کە لکاوە بە کۆمەڵێ لە هاوەڵە بەرێزەکان‌و بە تایبەت عەممارو هاوشێوەکانی ئیبن‌و کەسیر دەڵێت ئەو قسانەی کە خەڵکی باسی دەکەن وانییە، گوایە هەندێ لە هاوەڵان عوسمانیان تەسلیم کردووەو رازی بوون بە کوشتنی ئەم قسانە راست نییەو تاقە هاوەڵێك وای نەکردووە، بەڵکو هەر هەموویان ناڕەحەت‌و بێتاقەت بوون، بە کوشتنی‌و لەعنەتیان کردووە لە بکوژانی[4]، هەروەها (.. أبوبکری کوڕی العربی) دەڵێت: ئەمە گوماناویترین ریوایەتە لەم باسەدا، کە هاوەڵان دەستیان هەبووبێ یان رازی بوون بە کوشتنی، هیچ هاوەڵێ کفەی لێ نەکردوو خۆی تاو نەداوە بۆ شوێنەکەی

---

[1] الدولة الاموایة (٣٩).

[2] البخاري، رقم (٣٧٤٣).

[3] عمار بن یاسر، (ص١٤٧).

[4] البدایة والنهایة (٢٠٧/٧).

ئەگەر بیانویستایە سەری بخەن چوار هەزار کەسی نامۆو ناحاڵی دەستیان نەدەگرت بەسەر بیست هەزار خەڵکی شاری مەدینەدا، بەڵام بە دەستی خۆی خۆی خستە ئەو تەنگوچەڵەمەیەو بۆ سەلامەتی خوێنی موسڵمانان[1]، هەروەها دەڵێت: هەرچی نەفامو ئاژاوەگێڕە دەستەمۆ کراون، کە بڵێین کە هەرچی هاوەڵی بەڕێزە نەیارو گێرەشێوێنی ئیمامی عوسمان بووەو رازی بوون بەو ناڕەحەتییە هاتووە بەسەریداو کتێبی زمان تەڕو پڕ لە نموونەیان هۆنیوەتەوە، کە گوایە بە ئاشکراو بانگەوەڕێ نووسیویانە لەسەر ئیمامی عوسمان، هەموو ئەم کتێبو قسانە چنراوو تاشراون بۆ ئەوەی دڵی موسڵمانان گەردین بێت، لەسەرپێشینانی رابردوو خولەفای راشیدین، ئەوەی، کە راستو دروست بێت لەم بارەیەوە، ئیمامی عوسمان مەزڵوم بووەو بە بێ بیانوو زوڵمی لێ کراوەو هەموو هاوەڵان بە گشتیی ئەستۆیان پاکە لە خوێنی ئیمامی عوسمان، چونکە ئەوان لە ژێر ویستی عوسماندا بوونو تەسلیمی ئەو رایە نەبوون کە ئیمامی عوسمان وتی: نەفسی خۆم تەسلیم دەکەم[2].

**سێیەم: ئەستۆپاکی عەمری کوڕی عاص لە خوێنی عوسماندا**

کاتێ گەمارۆی عوسمان درا، عەمری کوڕی عاص لە مەدینە دەرچوو بەرەو وڵاتی شام، وتی: وەڵڵاهی ئەی خەڵکی مەدینە هەرکەسێ لێرە بمێنێتەوەو کوشتنی ئەم پیاوە ببیستێ خوای گەورە سەرشۆڕی دەکات، هەرکەسێ ناتوانێ سەری بخا با ڕا بکات بڕوا، عەمر خۆی رۆشتوو عەبدوڵڵای و موحەممەدی کوڕی لەگەڵیا چوون[3]، دوای ئەوان حەسانی کوڕی سابتیش چوو، خەڵکانی تریش چوون، کاتێ هەواڵی کوشتنی عومانی بیست، خەڵکیش بەیعەتیان داوە بە عەلی، عەمر وتی: من باوکی عەبدوڵڵامو هەرکەسێ نوکە برینێکی خستبێت لە عوسمان ئەوە دڵی منی هەڵکەندووە، رەحمەتی خودا لە عوسمان و لێی رازی بێت، لێی خۆش بێت، سەلامەی کوڕی زنباغی جوزامی دەڵێت: ئەی گرۆی عەرەب، عوسمان لە نێوان ئێوەو عەرەبەکاندا دەرگایەك بوون ئەو

---

[1] الغواصم من القواصم، (١٢٩).

[2] العواصم من القولصم (ص١٣٢).

[3] تاریخ الطبري، نقلا عن عمر بن العاص للغضبان (ص٤٦٤).

دەرگایە شکاوە، دەرگایەکی تر بهێننە شوێنی، عەمریش وتی: ئێمە ئەو مەبەستەمان دەوێ ئەو دەرگایە ساز نابێت هەتا راستی لە درزی ساجەکەیدا دەرنەکەوێتو هەموو خەڵکی لەدادگەریدا یەکسان نەبن، پاشان ئەم شیعرەی وت:.

| فيا لهف نفسي على مالك | وهل يصرف مالك حفظ للقدر |
| --- | --- |
| انزع من الحر اودي بهم | فاعذرهك ام بقومي سكر |

پاشان بەسوار رۆشتی بەدەم گریانەوە دەیوت: ئەی هاوار سەرخۆشی لەشەرمو دینداریی دەکەم خاوەنیان چۆن بەمش یۆەیە بوو هەتا چووە شاری دیمەشق[1].

ئەم وێنە راستەقینەیەی کە لە عەمری کوڕی عاصەوە وەرگیراوە لەگەڵ کەسایەتیو رێبازی ژیانو نزیکیەکەی لەگەڵ عوسماندا هاوشانە، بەڵام ئەو وێنەیەی، کە شێواوو ئاڵۆزکاوە لە بارەی عەمرەوە وێنەی پیاوێکی هەلپەرستو تماعکارو دنیا ویستە، ریوایەتێکی زەعیفو تەرك کراوە ریوایەتی واقیدییە لە موسای کوری یەعقوبەوە[2]، برێ لە نووسەرو مێژووزانەکان کەوتوونە ژێر کاریگەری ریوایەتە زەعیفو نەخۆشەکان، قەناعەتیان کردووە بەوەی کە عەمر نەیارو بەشخۆر بووە، وەکو ئەو ریوایەتانەی کە مەحمودی شیت خەتاب[3] و عەبدولخالق سەید ئەبو رابییە[4] و عەباس مەحمود ئەلعەقاد نووسیویانە، ئەو عەقادەی کە فیزی کردووە بڕوانیتە سەنەدەکانو گاڵتەی بە خوێنەرەکانی کردووە، موعاویەو عەمری وا نیشانداوە کە دوو پیاوی هەلپەرستو بەرژەوەندچی بوون، ئەگەر هەموو رەخنەگرە مێژوویەکان کۆببنەوە لەسەر پوچەڵی ئەم ریوایەتانەی کە لێیەوە وەریگرتووەو باسی تیا کردووە ئەو کاتە دەردەکەوێت کە (العقاد) هیچی بەدەستەوە نامێنی، چونکە تەنها باسی ریوایەتە زەعیفو بێ سەروبەرەکان دەکات، کە ناکرێنە بەڵگە، رەخنەگرە مێژووییەکان ئەگەر بکۆڵنەوە لە راستی ئەو گفتوگۆیانەو راستی وشەکانی بەیەك دەنگ کۆببنەوە لەسەر

---

[1] تاريخ الطبري، نقلا عن عمر بن العاص للغضبان (ص٤٨١).

[2] عمر بن العاص للغضبان (ص٤٨١).

[3] سفراء النبي، محمود شيت خطيبي، (٨٠٥).

[4] عمرو بن العاص، عبدالخالق سيد أبو رابية، (ص٣١٦).

هەڵوەشاندنەوەی بۆیان دەرئەکەوێت پەیوەندیی نێوان ئەو دووپیاوە واتە عەمرو موعاویە پەیوەندییەکی هاوکاریو لەخۆ بردوویی بووە بۆ والییەتیو فەرمانڕەواییی، وە گرێی نێوانیان لەسەر ئەوپشکە بووە کە بەر هەردووکیان کەوتووە، ئەگەر تەباو هاوکاریی یەك نەبونایە هەرگیز ڕێکنەدەکەوتن[1]، کەسایەتی عەمری کوڕی عاص بە ڕاستی ئەوەیە، کە پیاوێکی مەبدەئی بووە، کاتێ دەرفەتی نەبووە عوسمان سەرخات مەدینەی بەجێ هێشتووەو بە گریانێکی کۆتەڵی بۆی گریاوە، کاتێ عوسمان کوژرا، عەمر نزیکترین هاوڕێو هاودەمو ڕاوێژکاری عوسمان بوو، لە سەردەمی عوسمان دەهاتە ناو ڕاوێژکردنەوە بەبێ ئەوەی والی بێت، پاشان چوو بۆ لای موعایەو بۆ ئەوەی هەرەوەزی یەکتر بن، بۆ شەڕکردن لەگەڵ بکوژانی عوسماندا، تۆڵەی ئەم خەلیفە شەهیدە بسێنن[2] بۆ کوشتنی ئیمامی عوسمان هەرچی توڕەیی و قینی هەبوو ڕژاندی لە دژی ئەو تاوانبارە خوێنڕێژانە، ناچار بوو جگە لە مەدینە شوێنێکی تر هەڵبژێرێ بۆ تۆڵەسەندنەوە لەو یاخیانەی کە وێرایان بێنە شاری پێغەمبەر ﷺو بەدیار چاوی خەڵکەوە خەلیفەکەی شەهید کەن، کەی کارێکی نامۆیە ئەگەر عەمر ڕقی هەڵسێ بۆ خاتری عوسمان لێرەدا کەسانێك لەم بابەتە وا گومان دەبەن کە عەمر دڵ گران نابێ بۆ ئیمامی عوسمان ئەم جۆرە کەسانە لە سەر ئەو ریوایەتە درۆزنانە گۆش کراون، کە بۆچوونیان وایە کە عەمر لە غەمو پەژارەی دەسەڵاتو حکومدا بووە[3].

**٤ـ هەندێ لە قسەی هاوەڵان دەربارەی فیتنەکە:**

**١ـ ئەنەسی کوڕی مالیك**

وترا بە ئەنەسی کوڕی مالیك خۆشەویستی عەلیو عوسمان لە دڵێکا کۆنابێتەو، ئەنەس وتی: درۆ ئەکەن، ئێمە خۆشەویستی هەردوکیانمان کۆکردۆتەوە لە دڵماندا[4].

**٢ـ حوزەیفەی کوڕی یەمانی**

---

[1] عمرو بن العاص للعقاد، (ص٣٣١، ٣٣٢).

[2] عمرو بن العاص للغضبان، (ص٤٨٩ ـ ، ٤٩٠).

[3] المصدر نفسه (ص٤٩٢).

[4] تحقيق مواقف الصحابة (٢/٢٥)، التهذيب ابن حجر (١٤١/٧).

له خالیدی کوری ڕەبیعەوە هاتووە، دەڵێ بیستمان حوزەیفە تووشی ئازار بووە، ئەبو مەسعودی ئەنصاری لەگەڵ چەند کەسێکدا چوون بۆ مەدائین بۆ سەردانی، دەڵێ لەوێ باسی کوشتنی عوسمان کرا، حوزەیفە وتی: ئەی خودایە من لەوێ نەبووم، منیش نەمکوشتووە، وە ڕازیش نیم بە کوشتنی[1]، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە ئیبن‌و سیرینەوە ئەویش لە حوزەیفەوە هێناویەتی وتویەتی کاتێ هەواڵی کوشتنی عوسمانی پێگەیشت، وتی: ئەی خودایە تۆ ئەزانی من دەستم نییە لە خوێنی عوسماندا گەردنم پاکە لێی، ئەگەر ئەوانەی کوشتوویانە خۆیان بە حەق دەزانن من هەر لێیان بەریم، ئەگەر بە هەڵەیش کوشتوویانە خۆت باشدەزانی من ئەستۆم پاکە لە خوێنەکەی، لەمەولا عەرەب دەزانن بۆیان دەردەکەوێت ئەگەر کوشتنی حەق بێ لە کوشتنەکەی شیر دەدۆشین ئەگەر بەناحەقی‌و هەڵە کوشتبێتیان ئەوە لە کوشتنەکەی خوێن دەدۆشین، دوای کوشتنی عوسمان عەرەبەکان خوێنیان دەدۆشی، شمشێرو کوشتن‌و بڕین دابڕا بەسەریاندا[2]، (ئیبن عەساکیر) لە چۆندوبی کوڕی عەبدوڵڵاوە ریوایەتی کردووە کە سەحابەیەك گەشت بە حوزەیفەو باسی کوشتنی ئیمامی عوسمانی کرد، حوزەیفە وتی: ئەوانە بە زوڵم کوشتیان، منیش وتم: عوسمان ئێستا لە کوێیە؟ وتی: لە بەهەشتە، وتم: ئەی بکوژەکانی لە کوێن؟ وتی: لەناو ئاگری دۆزەخدا[3].

٣ـ ئوم سولەیمی ئەنصاریی

ئوم سولەیمی ئەنصاری دەڵێن: کاتێ بیستی عوسمان کوژراوە، وتی: ئێمە دوای ئەو دەبێ خوێن بنۆشین.

٤ـ ئەبو هورەیرە[4]

ئەبی قریتم دەڵێت: لە ڕۆژی کوشتنی عوسماندا ئەبو هورەیرەم بینی دەستی بە پەلکەکانیەوە بوو، دەی وت: وەڵڵاهی عوسمان بەناحەقی کوژرا[1].

---

[1] المصدر نفسه (٢/٢٧).

[2] تحقيق موافق الصحابة (٢/٢٨)، تأريخ دمشق (٣٨٨).

[3] تحقيق موافق الصحابة (٢/٢٨)، تأريخ دمشق (٣٨٨).

[4] البداية والنهاية (٧/١٩٥).

٥ـ ئەبی بەکر

ئیبنو کەسیر لە (البداية والنهاية) لە ئەبی بەکرەوە ریوایەتی کردووە وتویەتی، ئەگەر لە ئاسمان بمخەنە خوارەوە بۆسەر زەوی لەوە پێم باشترە بەشداریی بکەم لە کوشتنی عوسماندا[٢].

٦ـ ئەبو موسای ئەشعەری

لە ئەبی عوسمانی نەهدیەوە هاتووە، ئەبو موسای ئەشعەری وتویەتی ئەگەر کوشتنی عوسمان لەسەر حەق‌و هیدایەت بێت ئەوە لەمەولا شیر دەدۆشین، خۆ ئەگەر لەسەر ناحەقی‌و گومڕایی بێت لەمەولا خوێن دەدۆشین[٣].

٧ـ سومورەت بن جندب

ئیبنو عەساکیر بە سەنەدەکانی لە سومورەی کوڕی جوندویەوە ریوایەتی کردوو، وتویەتی ئیسلام لەناو قەلایەکی پۆلاییندا بوو، ئەوانە بە کوشتنی عوسمان کونیان کردە ئیسلام، ئەوانە درزێکی وایان تێکرد ئیتر ناتوانن هەتا رۆژی قیامەت ئەو کونە بگرن، یان پڕیکەنەوە خەلکی مەدینە خەلافەتیان تێدا بوو، بەلام ئەوانە دەریان کردوو ئیتر ناگەڕێتەوە ناویان[٤].

٨ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص

ئەبو نوعیم لە کتێبی ناسینی هاوەڵاندا بەسەنەد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە هێناویەتی کە وتویەتی عوسمانی کوڕی عەفان بە مەزلومی کوژرا، دوو ئەوەندەی ئێمە پاداشتی هەیە[٥].

٩ـ عەبدوڵڵای کوڕی سەلام

---

[١] تحقيق موافق الصحابة (٢/٣١)، تأريخ دمشق (٤٩٣).

[٢] المصدر نفسه.

[٣] تأريخ المدينة (٤/١٢٤).

[٤] تحقيق موافق الصحابة (٢/٣١)، تأريخ دمشق (٤٩٣).

[٥] معرفة الصحابة (١/٢٤٥)، المعجم الكبير (١/٤٦).

عەبدوللا وتویەتی عوسمان مەکوژن، ئەگەر بیکوژن ئیتر هەرگیز پێکەوە جەنگ ناکەن[1]، لە ریوایەتێکی تردا وتویەتی وەللاهی ئەگەر کەلەشاخێ خوێن لە عوسمان برێژن زیاترو زیاتر لەخودا دوور ئەکەونەوە[2].

١٠ـ حەسەنی کوڕی عەلی

لە تەلقی کوری خەشافەوە هاتووە دەلێت: چوین بۆ مەدینەو قورتی کوڕی خەیشەمان لەگەلدا بوو، گەشتینە حەسەنی کوڕی عەلی، قورت وتی بە حەسەن، ئیمامی عوسمان چۆن کوژرا، حەسەن وتی: بە زولم کوژرا[3].

١١ـ سەلەمی کوڕی ئەکوەع

لە یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەیدەوە هاتووە، دەلێ: کاتێ عوسمان کوژرا سەلەمەی کوڕی ئەکوەع کە بەدرییە لە مەدینە دەرچوو بەرەو رەبزە، هەر لەوێ مایەوە هەتا ماوەیەکی کەم پێش مردنی[4].

١٢ـ عەبدوللای کوڕی عومەر

لە ئەبی حازمەوە هاتووە دەلێ: من لای عەبدوللای کوڕی عومەر بووم، باسی عوسمان کرا، باسی رێزو پلەو پایەو نزیکی عوسمانی کرد، ئەوەندە باسی کردو رۆشت لە سەری هەتا لە شووشە پاکتر بوویەوە، پاشان باسی عەلی کرد، باسی رێزو نزیکی‌و پێشینەیی ئەوەندە کرد هەتا لە شووشە پاکتر بوویەوە، پاشان وتی: هەرکەسێ ویستی باسی ئەم دوانە بکات، با بەم شێوەیە باسیان بکات، یان وازیان لێ بێنێت[5]، عەبدوللای کوڕی عومەر دەلێ: کەس قسە نەلێ بە عوسمان، چونکە پێشەواو پیاوماقولی ئێمە بووە[6].

---

[1] تحقيق موافق الصحابة (٣٤/٢)، فضائل الصحابة اسناده صحيح.

[2] الطبقات (٨١/٣).

[3] تاريخ المدينة (١٤٥/٤).

[4] تاريخ المدينة (١٤٢/٤).

[5] تحقيق موافق الصحابة (٣٧٩/١).

[6] تحقيق موافق الصحابة (٣٧٩/١)، فضائل الصحابة اناده صحيح.

## پێنجەم: شوێنەواری کوشتنی عوسمان لە ڕوودانی ئاژاوەکانی تردا

فیتنەی کوشتنی عوسمان بوو بە هۆکارێ بۆ داکەوتنی کۆمەڵێ ئاژاوەی تر بوو بە سەرەتایەك بۆ ڕوودانی فیتنەکانی دوای خۆی، چونکە دڵی خەڵك گۆڕاو درۆ بڵاوەی کردوو هێڵێکی ئاسۆیی بەدیار کەوت، بۆ لادانو خۆ دزینەوە لە عەقیدەو شەریعەتی ئیسلام[1]، کوشتنی عوسمان گەورەترین هۆکارێك بوو بۆ بەرپابوونی فیتنە لە نێوان خەڵکیدا هەر بەو بۆنەیەوە ئوممەت هەتاکو ئەمڕۆ تەفرەقەی تێکەوتووە[2]، دڵەکان لێك ترازانو ناڕەحەتییەکان گەورەتر بوونو خەڵکی خراپەکارو خوێڕی دەرکەوتنو بەڕێزو قوربدارەکان زەلیل بوون، ئەو کەسانەی کە بەربە کرابوون شانیان کرد بە ئاژاوەداو ئەوانەی کە فەرمانبەری چاکەو ئاشتی بوون پەکیان خرا، پاشان بەیعەت درا بە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کە لە هەموو خەڵکی شایەنتر بوو بۆ خەلیفەیەتیو لە زیندووەکان بە ڕێزتربوو، بەڵام دڵەکان ترازابوون، ئاگری فیتنە خۆش کرابوو، نەدروشمیان یەکی دەگرت نە جەماعەتیشیان ڕێك دەکەوت نە بۆ خەلیفەو نە بۆ پیاوە باشەکان، ئەو خێرو خۆشییە بەدەست نەئەهات کە چەند گرتوویەك دەیانویست، چونکە ناو ئاژوەگێڕیو فیتنە داکەوت[3]، وردە وردە فتوحات لاواز بوو لە میانەی ساڵە کۆتاییەکانی خەلافەتی عوسمانەوە دەستی پێکرد، کاتێ فیتنەو ئاژاوە دەستی پێکرد دای لە شارەکانی ئیسلامو چەقی خەلافەت، پاشان لە کاتی کوشتنی عوسمان فتوحات ڕاگیراو قەتیس کرا، بەڵکو لە هەندێ شوێنەوە پاشەکشە دەکران هەتا سەرەتای سەردەمی مەعاویەی بەم چەشنە بارودۆخی موسڵمانان سەقامگیر نەبوو، پاشان فتوحات بەخۆرهەلاتو خۆرئاواو باکووردا دەستی پێکردو ڕەها بوو[4].

---

[1] المصدر نفسه (ص٥٩٠).

[2] مجموع فتاوی (١٦٢/٢٥).

[3] مجموع فتاوی (١٦٣/٢٥).

[4] احداث وأحاديث فتنة احرج (ص٥١٩).

**شەشەم: زوڵمکردن و دەستدرێژی کردن سەر خەڵکان دەبێتە هۆی هیلاکیی لە دونیاو قیامەتدا**

زوڵم و دەستدرێژی کردنە سەر خەڵکان بە ناحەقیو تاوان هۆکارێکە بۆ بەهیلاکچوونی دونیاو قیامەت هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ: (وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِداً) (الكهف: ٥٩). ئەگەر بەدواداچوونێك بکەین بۆ حاڵو بارودۆخی ئەو کەسانەی هەڵگەرانەوە لە عوسمانو دەستدرێژییان کردە سەریو زوڵمیان کرد بۆمان دەردەکەوێت خودای گەورە مۆڵەتی نەداون، بەڵکو زەبونو سەرشۆڕی کردنو تۆڵەی لێ کردنەوە، تاقە کەسێکیان قوتار نەبوو[1]، خەلیفەی کوڕی خەیات لە مێژووەکەیدا بەسەنەدی صەحیح ریوایەتی کردووە، هەتا گەشتووەتە عیمرانی کوری ئەلحودەیر، وتی: عەبدوڵڵای کوڕی شەفیق بۆی باسکردم کە یەکەمین دڵۆپی خوێنی عوسمانم نەبینیوە، چون قورئانەکەیان بۆ هێنام سەیرەکەم دڵۆپە خوێنەکە تکاوەتە سەر (فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ) لەسەر قورئانەکە بوو لێم نەکردەوە هەڵم نەکەند.

لە مێژووی ئیبنو عەساکیردا هاتووە لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە وتویەتی، من تەوافی کەعبەم دەکرد پیاوێکم بینی دەیوت ئەی خودا لێم خۆش ببە بەڵام گومان نابەم لێم خۆش ببی، منیش وتم: ئەی بەندەی خودا ئەم بپاڕانەوەی تۆ دەکەیت لە کەسم نەبیستووە! وتی: من بەڵێنم دا بە خودای گەورە ئەگەر بتوانم زللەیەك بکێشم بە روخساری عوسماندا، کاتێ کوژراو لەسەر بەرەی ماڵەکەی کەوتبوو، خەڵکی هاتن پۆل پۆل نوێژی لەسەر بکەن، منیش وەکو ئەوەی نوێژی لەسەر بکەم چوومە ژوورەو سەیرەکەم بە تەنیایە پەردەکەم لەسەر روخساری بەرز کردەوەو کێشام بەدەمو چاویدا کتوپڕ دەستی راستم وشك بوو، موحەممەدی کوڕی سبیش دەڵێ دەستی ئەو کابرایەم بینی وەك دار رەقو وشك بوو[2]، ئەگەر بۆ نیشانەی زوڵمی ئەم کینەبازانە ئەوەندە بەسە موسڵمانان شمشێریان لێ هەڵکشاون، هەتا رۆژی قیامەت قەلو پاچیان دەکەن، ئەو

---

[1] تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة (٤٨٣/١).

[2] سير شهداء دروس وعبر للسحيبارني، (ص٦٧)، تاريخ دمشق ص(٤٥٨)، تحقيق مواقف الصحابة (٤٥٨/١).

کەسانەش کەوا لە بازنەی ئەوا دەخولێنەوە قاسمی کوڕی موحەممەد دەڵێ: عەلی دای بەلای دوو پیاودا لە مەدینە، دوای کوشتنی عوسمانو پیش بەیعەتدان بە خۆی، هەردووکیان دەیان وت: پیاوە سپیو سادەکە کوژرا، وەڵڵاهی لەناو ئیسلامو عەرەبدا جێگەی چۆڵە، وەڵڵاهی کەسی بەرێز شالاوی بۆ نەبردوە، عەلی وتی: چیتان وت؟ بۆیان دووبارە کردەوە، ئەویش وتی: وەڵڵاهی پیاو دوای پیاو پۆل دوای پۆل ئێمەش ئاوا دەچین هەتا عەبباسی کوڕی مەریەم دەردەکەوێت[1].

حەوتەم: دڵگرانی موسڵمانان بۆ کوشتنی عوسمانو ئەو شیعرانەی کە دەیلاوێننەوە.

ئەم ناڕەحەتیو موسیبەتە زۆر بە سەختی کەوتە سەر دەروونی موسڵمانان، فرمێسکیان هەڵڕشتو روومەتیان بە ئەشك ئاودا، وە زمانیان هەساندا بۆ لاوانەوەی ئیمامی عوسمانو بەزەی پیا هاتنەوەی حەسانی کوڕی سابت، ئیمامی عوسمان دەلاوێنێتەوە دڵگران دەبێ بۆ کوشتنیو بکوژەکانی دادەشۆرێو سەرکۆنەیان دەکات، بۆ ئەو تاوانەی لە دەستیان کەوتەوە[2].

حەسان

| | |
|---|---|
| اتركام غز والدورب وراءكم | وغز وتمونا عند قبر محمد |
| فلبئس هدى المسلمين هيتم | ولبئس امر الفاجر المتعمد |
| ان تقدموا بجعل قرى اسرواتكم | حول المدينة كل لبن مذوذ |
| او قد بروا فلبئس قاسا فرتم | ولمثل امر اميركم لم يرشد |
| وكأن اصحاب النبي عشبة | بدن تذبح عند باب المسجد |
| ابكى ابا عمر لنحسن بلائه | امسى مقبما في بقيع الغرقد |

حەسان

| | |
|---|---|
| ماذا اردتم من اخي الدين باركت | يدالله في ذلك الا ديم المقدد |
| قتلتم ولى الله في جوف داره | وجئتم بأمر جائر غير مهتد |
| مهلا رعيتم ذمة الله بينكم | واوفيتم بالعهد عند محمد |
| الم يك منكم ذا بلاء ومصدق | وأوفاكم عهدا لدى كل مشهد |

[1] تحقيق موافق الصحابة (١/٤٥٨)، التمهيد والبيان (ص٢٣٣).

[2] سير شهداء دروس وعبر للسحيبارني، (ص٦٢)

فلا ظفرت ايمان قوم تبايعوا على قتل عثمان الرشيد المدد

حەسان

من سره الموت صرفا لافراج فيه فليأت فادة في دار عثمان

مستشعرى حلق الماذى قد شفعت قبل المغاطم بيض زان ابدانا

صبرا فدى لكم امي وما ولدت وبالامير ويا لاخوان اخوانا

اني لمنهم وان غابو وان شهدوا ما دمت حيا وما سميت حسانا

لتمعن وشيكا في ديارهم الله اكبر يا ثارات عثمانا

حەسان

ان تمس دالر ابن اروى منه خاوية باب صريع وباب محرق خرب

فقد يصادق باغني الخبر حاجته فيها ويهوى اليها الذكر والحسبى

يا ايها الناس ابدوا اذات انفسكم لا يستوى الصدق عندالله والكذب

قوموا بحق مليك الناس تعترفوا بعزة عضب من خلفها عصب

فيهم حبيب شها بالموت يقدمهم مستلئما قد بدا في وجهة الغضب

كعبى كوڕى ماليك

ويح لامر قد اتاني رائع هد الجبال فانغضت برجوف

قتل الامام له النجوم خواضع والشمس بازعة له نكسوف

يالهف نفسي اذ تولوا عدوة بالنعش فوق عواتف وكتوف

ولوا ودلوا في الضريح اخاهم ماذا اجن ضريحة المسقوف

من نائل او سودو وحمالة سبقت له في الناس او معروف

كم من يتيم كان يجبر عظمه امسى بمنزلة الضياع يطوف

فرجتها عنه يرحمك بعدما كادت وايقن بعدها يمئوف يحتوف

فازال يقبلهم ويرأب خلمهم حتى سمعت برنة التلهيف

امسى مقيما بالنقنح واصبحوا متفرقين قد اجمعوا بحفوف

النار موعدم بقتل امامهم عثمان صهر في البلاد عفيف

جمع الجمالة بعد حلم راجع والخير فيه مبين معروف

يا كعب لا تنفك تبكى هالكا مادمت حيا في البلاد تطوف

کەعبى كوڕى ماليك

فكيف يديه ثم اغلب بغافل وايقن ان الله ليس بغافل
وقال لاهل الدار تقتلوهم عفا الله كل امرء لم بقاتل
فكيف رايت الله حب عليهم العداوة والبغضاء بعد التواصل
وكيف رأيت الخير دبر بعده عن الناس ادبار النعام الجوافل

راعي الابل النميری في ذلك

عشية يدخلون بغير اذن على متوكل او في وطابا
خليل محمد وزير خدق ورابع خير من وطئ الترابا

به کورتی‌و به پوختی

١ـ ئیمامی عوسمان له سه‌رده‌می نه‌فامییدا له ناو تیره‌که‌ی خۆیدا به‌ڕێزترین که‌س بووه‌و ناوبانگێکی مه‌زن‌و ده‌وڵه‌مه‌ندی هه‌بووه، زۆر شه‌رمن‌و قسه شیرین بووه، هۆزه‌که‌ی زۆر خۆشیان ویستووه‌و به نتمی سه‌یریان کردووه، له سه‌رده‌می نه‌فامیه‌تیدا کڕنووشی بۆ بت نه‌بردووه‌و له داوێن پیسی نزیك نه‌بووه‌ته‌وه، به هیچ شێوه‌یه ئاره‌قی نه‌خواردووه.

٢ـ ئیمامی عوسمان ته‌مه‌نی گه‌شته (٣٤) ساڵان ئه‌بوبه‌کری صدیق بانگهێشتی کرد بۆ ئیسلام ڕکی‌و سالاریی تیا نه‌کرد، به‌ڵکو به کتوپڕی چوو به پیرییه‌وه‌و کێبڕکێی ده‌کرد بوو به پێشینه یه‌که‌مینه‌کان.

٣ـ موسڵمانان زۆر شادومان بوون به موسوڵمان بوونی عوسمان وه‌گرێی خۆشه‌ویستی‌و برایه‌تییان له‌گه‌ڵدا به‌ست‌و خودای گه‌وره به کچی پێغه‌مبه‌ر ﷺ که‌بوو به هاوسه‌ری ڕێزی لێ گرت.

٤ـ سوننه‌تی ناڕه‌حه‌تی تاقیکردنه‌وه به‌ناو هه‌موو گه‌ل‌و جه‌ماعه‌ت‌و میلله‌ت‌و ولاّتێکدا ته‌نانه‌ت به ژیانی تاکه‌که‌سیشدا گوزه‌ری کردووه، ئه‌م سوننه‌ته به ژیانی هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌کانیشدا تێپه‌ڕیوه، تووشی ناڕه‌حه‌تی وه‌ها بوون چیا سه‌رکه‌شه‌کان پێیان هه‌ڵنا‌گیرێ.

ماڵ‌و خوێنی خۆیان به‌خشی له ڕێگای خودادا، ماندوو بوون‌و زه‌حمه‌تی زۆریان چه‌شت، موسڵمانه به‌رزو ناوداره‌کانیش له‌م ناڕه‌حه‌تیانه بێبه‌ش نه‌بوون، بۆ نموونه عوسمان ئازاری چه‌شت‌و له‌سه‌ر ئیسلامه‌تی ئه‌شکه‌نجه درا به ده‌ستی مامه‌که‌ی که ناوی حه‌که‌می کوڕی ئه‌بی عاصه.

٥ـ لەو ڕۆژەوەی عوسمان موسڵمان بوو، پەیوەست بوو بە پێغەمبەرەوە ﷺ، لێی جیا نەبوویەوە بۆ کۆچکردنو ئەو کارە گرنگانە نەبوایە، کە پێغەمبەر ﷺ دەینارد.

کەسێ نەبوو ئاتاجی دەوڵەمەندییەکەی نەبێت، ژیانی لە هۆگری پێغەمبەردا ﷺ وەکو ژیانی خەلیفە راشیدینەکان وابوو، وەکو بڵێی کەسێکی تایبەتی پێغەمبەرەو ﷺ هاوشانی خەلیفەکانەو پاڵێوراوێکە بۆ دوو خەلیفەکەی پێش خۆی.

٦ـ عوسمان شیرازەیەکی قایمی بەستبوو، لەگەڵ بانگەوازی گەورەی ئیسلامداو هیچ هەواڵێکی پێغەمبەرایەتی تایبەتیو گشتیی لە کیس نەداوە، لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ هیچ قسەو هەواڵێکی خەلیفەکانی لە کیس نەداوە، لە ژیانی دوو خەلیفە گەورەکەدا بە زمانی ئەمڕۆ هیچ شتێك لە کارەکانی بنیاتنانی دەوڵەتی ئیسلامی لە دەست نەداوە.

٧ـ ئەو ڕێبازە پەروەردەیەیی کە عوسمانو هاوەڵە بەڕێزەکانی لەسەر پەروەردە کرا، قورئانی پیرۆز بوو، کە لە لایەن پەروەردگاری جیهانەوە دابەزیوە.

٨ـ ئەو فاکتەرە بەهێزەی کە کاریگەری هەبوو لەسەر کەسایەتی عوسمانو دەرگا کردنەوەی بەهرەکانیو تەقاندنەوەی وزەکانی خاوێنکردنی دەروونی هاوڕێیەتی پێغەمبەر ﷺ شاگردی قوتابخانەی پێغەمبەرایەتی بوو، چونکە عوسمان دوای موسڵمانبوونی لە مەککە هۆگری پێغەمبەر ﷺ بوو، هەر وەکو لە مەدینە دوای کۆچکردن هۆگری بوو، عوسمان دەروونی خۆی ڕێکخستبوو، زۆر سووربوو لەسەر شاگردێتیی لە بازنەی قوتابخانەی پێغەمبەرایەتیدا لە گشت لقەکانی زانستو زانیاریدا لەسەر دەستی مامۆستای مرۆڤایەتیو ڕێنماییەکانی ئەو مامۆستایەی کە پەروەردگار بە باشترین ئەدەب ناوی هێنابوو.

٩ـ عوسمان لەو کەسانە نەبوو، کە لە شەڕی بەدر دوابکەوێت، لەبەر تەمەڵی سستی یان لەبەر ترسو بیم وەکو هەوەسبازەکان تانەی لیّ دەدەنو دەڵێن لەبەدر دواکەوتووە، ئیمامی عوسمان نەیویستووە سەرپێچی بکات، ئەوە ڕێزو شکۆیەی کە ئەهلی بەدر دەستیان کەوت لە شەڕی بەدردا، لەبەر گوێڕایەڵی شوێن کەوتنی پێغەمبەر ﷺ بوو، عوسمانیش یەکێ بوو لەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا دەرچوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ گەڕاندییەوە بۆ ئەوەی بەدیار کچەکەیەوە بێت، لەبەر ئەوەی بۆ گوێڕایەڵی پێغەمبەر

ﷺ گەڕایەوە بە جێمان پێغەمبەر ﷺ لە دەستکەوتی غەنیمەو پاداشتی شەڕ بەشی عوسمانی جیا کردەوە، واتە عوسمان شەڕێکی دەسکەوتوو پاداشتت‌و ڕێزی ئەهلی بەدر بوو، چونکە گوێڕایەڵی پێغەمبەری ﷺ کردو ملی بۆ کەچ کرد.

١٠- لە حودەیبییەدا وەکو تەبەری باسی کردووە، بە چەند کارێکی تایبەت عوسمان ڕێزی لێنرا، یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ دەستی خۆی دانا لە جێگەی دەستی عوسمان، کاتی هاوەڵان بەیعەتیان پێداو عوسمان لەوێ نەبوو.

تایبەتمەندییەکی تر ئەوەبوو نامەی پێغەمبەری ﷺ گەیاندە موسڵمانە دەستبەسەرەکانی مەککە، هەروەها پێغەمبەر شایەتی دا کە عوسمان لە خۆیەوە تەوافی کەعبە ناکا، هەرواش بوو بەبێ پێغەمبەر ﷺ تەوافی نەکرد.

١١- پێغەمبەر ﷺ تکای عوسمانی وەرگرت، کە کردی بۆ عەبدوڵلای کوڕی ئەبی شرح لە فەتحی مەککەدا.

١٢- ژیانی کۆمەڵایەتی عوسمان لە مەدینەدا ئەوەبوو دوای مردنی روقیەی کچی پێغەمبەر ﷺ، ئوم کەلسومی کچی پێغەمبەری ﷺ لێ مارەکرا، عەبدوڵلای کوڕی عوسمان مردو پاشان ئوم کەلسومیش مرد.

١٣- بەشدارییە ئابورییەکانی لە بنیاتنانی دەوڵەتدا ئەوەبوو، بیری ڕۆمییەی بە بیست هەزار درهەم کڕی‌و کردی بەو خێر بۆ هەژارو دەوڵەمەندو ڕێبوار، مزگەوتی پێغمبەری ﷺ فراوان کردو سامانێکی زۆری بەخشی بە لەشکری تەنگانە.

١٤- ژمارەیەك فەرموودەی زۆر هاتووە لە مەڕ ڕێزی ئیمامی عوسمان، هەندێکیان لە بارەی ڕێزی ئیمامی عوسمانەوە بە تەنیا هاتووە، هەندێکیشیان لە بارەی ئیمامی عوسمان‌و هاوەڵانی ترەوە هاتووە، پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەو ئاژاوەیەی پێدابوو کە تێیدا دەکوژرێت بەمەزڵومیی.

١٥- عوسمان یەکێك بوو لەو هاوەڵانەی کە ئەهلی شورا بووەو یەکێك لەوانەی کە لە بابەتە هەرە گرنگەکاندا لە سەردەمی ئەبوبەکردا رایەکانی وەرگیراوە، دووهەمین کەسبووە لە بەها داریدا لای ئەبوبەکرو عومەری کوڕی خەتاب ڕۆڵی گەرم‌و گورو توندوتۆڵی دیوە، لەهەمان کاتدا عوسمانیش نەرمونیانیی‌و سوك‌و سۆڵی بووە، عوسمان ئەمینداریی گشتیی‌و بڕبڕەی ئەستورو نووسەری مەزنیی بووە.

١٦ـ عوسمان مەکانەتی هەبووە لە لای عومەر، ئەگەر پرسیار بکرایە لە عومەر لەمەڕ شتێك دەیناردن بۆ لای عوسمانو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف، ئەوکاتە بە عوسمانیان وتووە پاشکۆ، پاکشۆ لە زمانی عەرەبی ئەو کەسەیە کە لە دوای پیاوێکەوە دانیشتووە، عەرەبەکان بەوکەسانە دەڵێن پاشکۆ، کە دەیانەوێت ببێتە سەرۆك، ئەگەر عومەرو عوسمان نەیانتوانیبایە کارێك بکەن، بە عەباسی مامی پێغەمبەرەوە خۆیان دەکردە سیان.

١٧ـ چاکترین ئیشەکانی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ئەوە بوو خۆی داڕنی لە کاری خەلیفە دیاتری کردن لە کاتی راوێژ بەستنەکەداو هەڵبژاردنی دایە دەستی ئوممەتو ئاماژەی ئەهلی حەلو عەقد لەم پێناوەدا مەردانە راپەڕیو دەنگی ئوممەتی لەسەر عوسمان کۆکردەوە.

١٨ـ لەمبارەیەوە پۆخڵەواتی شیعەو درۆدەلەسەی رافزییەکان مێژووی ئیسلامیان لە چیرۆکی راوێژکردنو حوکمڕان کردنی عوسمانیان چڵکن کردووەو رۆژهەڵاتناسەکان قۆستبوویانەوەو پرشو بڵاویان کردووەو زۆربەی مێژوونووسو بیرمەندە هاوچەرخەکان پێی کاریگەر بوون، لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنیان نەکردووە بۆ سەنەدو دەقی ئەم ریوایەتانە لە نێو موسڵماناندا بڵاویان کردووەتەوە.

١٩ـ چەندین بەڵگەی زۆرو زەوەند هاتووە ئاماژە دەکات بۆ شایستەیی ئیمامی عوسمان بۆ خەلیفەیەتی هیچ مشتومڕێك نییە لە لای ئەوانەی دەستیان گرتووە بە قورئانو سوننەتەوە لەم رەوشەدان هەموو هاوەڵان ئەوانەش کە شوێنکەوتەی هاوەڵانن لە ئەهلی سوننەتو جەماعەت ئیجماعیان هەیە لەسەر عوسمان کە شیاوترین کەسبووە بۆ خەلافەتی پێغەمبەر ﷺ دوای عومەری کوڕی خەتاب.

٢٠ـ کاتێ پەیمانی خەلافەت درا بە عوسمان هەستا لە ناو خەڵکدا وتارێکی داو رێبازە سیاسییەکەی خۆی راگەیاند بە رۆشنی کە پابەند دەبێت بە قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺو ئاکاری دوو خەلیفەکەی پێش خۆی، هەروەها لە وتارەکەیدا ئاماژەی کرد کە رابەرایەتی خەڵکی دەکات بە دانایيو هێمنی لەو شتانەدا نەبێ کەوا (داری حەددی) تێدایە، پاشان بە ئاگای هێنانەوە کە باوەش نەکەن بە دونیاداو بە پوشو

پەلاشەکەی گیرۆدە نەبن، بۆ ئەوەی پارێزراوبوون لە ئیرەیی بردنو رقەبەرایەتیو مونافەسەکردن، چونکە ئوممەت دەبات بەرەو دوبەرەیکیو ناکۆکی.

٢١ـ کەسایەتی عوسمان کەسایەتییەکی قیادیی بوو هەموو سیفەتەکانی رابەرێکی خواناسی تێدابوو، لە رووی زانستو فێرکردنو بەتواناییو لەسەرخۆییو دڵفراوانیو چاوسێرنیو نەرمیو لێبوردەییو خاکەساریو شەرمنیو داوێت پاکیو بەخشندەییو بوێریو ئارامگریو دادوەریو خواپەرستیو لەخودا ترسانو گریانو لێپێچینەوەی دەرونو قنیاتو سوپاسگوزاریو لێبڕاویو سۆراغ کردنی رەوشتی خەڵكو دیاریکردنی پسپۆڕیو سوودوەرگرتن لە خەڵکی شایستەو لێهاتوو.

٢٢ـ شارەزایی ئاکاری خەلیفە راشیدینەکان بووەو هەوڵیداوە لاساییان بکاتەوە هەنگاوێکی دروستی هەڵگرتبوو بۆ جێبەجێکردنی ئاکارو رابەرە خوداناسەکان ئەو رابەرانەی کە دەتوانن گەل ببەن بەرەو ئامانجە وێنەکراوەکانیان بە هەنگاوی چەسپاو.

٢٣ـ عوسمان لە رووی سیاسەتی داراییەوە لەسەر ئەم بنەڕەتانە دەچوو، ساسەتی گشتیی دارایی ئیسلامیی جێبەجێ دەکرد، کاری باجگرو کاربەدەستی تێکەڵاو نەدەکرد هەر ئابوونەیە بکەوتایە سەر موسڵمانان وەری دەگرت بۆ بەیتولمال، هەر چیەکیش پێیان بشایە پێی دەداو ستەمی لەکەس نەدەکرد پۆلیسەکانی زەکاتو سەرانەی راهێنابوو لەسەر ئەمانەتپارێزیو وەفا.

٢٤ـ لەسەردەمی عوسماندا خەرجکردنەکان بەم پێودانگەبوو:

خەرجکردنی موچەی والییەکان وە موچەی سەربازەکان پاشان گەلەکەشی بەدەریارییەکان گۆڕینی کەنارێك لە (شوعیبەوە) بۆ (جددە) هەڵکەندنی بیرەکان خەرج کردن، بۆ بانگوێژەکان، هەروەها کاروبارەکانی تریش.

٢٥ـ لە لایەن هەرچیو پەرچیو خەواریجەکانەوە عوسمان بەوە تۆمەتبار کرا کە بەیتولمال سەرف دەکاتو دەیبەخشێت بە خزمەکانی خۆی، سەنەدی ئەم تۆمەتە هەڵمەتێکی پڕوپانگەندەو پالاّوتنبوو، کە (سەبەئییەکان) گازەرەیان دەکێشا بۆیو شیعە رافزییەکان هەتا ئەمرۆ دەیهەجونەوە، دزەی کە دەناو کتێبە مێژووییەکانو مێژوو نووسو بیرمەندەکان وەکو هەواڵێکی راست مامەڵەیان لەگەڵ کرد، بەڵام ئەم هەواڵانە نەسەلماوەو باتڵە.

٢٦ـ سەردەمی عوسمان بە درێژەپێدەری سەردەمی ڕاشیدین گوزارشت دەکرێت، چونکە زۆر بایەخی داوە بە سەردەمی پێغەمبەرایەتیو زنجیرەیەك بووە لەو سەردەمەو هاودەمی سەردەمی ڕاشیدین بووە، بەتایبەت لە ڕوی دادو قەزاوە، چونکە درێژەپێدەری دادوەری سەردەمی پێغەمبەرایەتی بووە، وێڕای ئەوەی پارێزکارییەکی تێرو تەسەلی کردووە لە گشت ئەو بەندانەی کە سابتە بە هەموو ڕەهەندو چەمکێکەوە دەقاودەق جێبەجێ کردووە.

٢٧ـ نەخشەی عوسمان لە فتوحاتدا بەعەزمو جەزم ناوزەند دەرکێت، واتە لێبڕانو دەرپەڕینی پێوە دیارە، لەم کارانەدا بەرجەستە دەبێ سەری دانەواند بە یاخیبووەکانی فارسو ڕۆمو دەسەڵاتی ئیسلامیی بردە ئەو وڵاتانە درێژەیدا بە جیهادو فتوحات لەو دیو ئەم وڵاتانەوە بۆ ئەوەی کۆمەکییان لێ ببڕێت، بنکەی چەسپاوی تیا دامەزراند بۆ ئەوەی موسڵمانان بەرگری لە شارەکانی ئیسلام بکەنو هێزێکی سەربازی دەریایی پێکەوە نا، چونکە سوپای ئیسلام پێویستی بوو.

٢٨ـ بنکە سەربازییەکانی ئیسلام، کە لە بەرەکاتی لە سەردەمی عوسماندا کەوتبوو پێتەختی شارە مەزنەکان مەعەسکەری عێراق لە کوفەو بەصرەبوو، مەعەسکەری شام لە دیمەشق بوو دوای ئەوەی کە شام هەموی یەك لابوویەوە بۆ مەعاویەو بەس ئەبو سوفیان ، مەعەسکەری میسر لە (فسطاط) بوو، ئەم مەعەسکەرانە هەڵدەستان بە پارێزگاریی وڵاتی ئیسلامو درێژەدان بە فتوحاتو بڵاوکردنەوەی ئیسلام.

٢٩ـ بەناوبانگترین ڕابەرەکانی فتوحات لە سەردەمی عوسماندا ئەحنەفی کوڕی قەیسو سولەیمانی کوڕی ڕەبیعەو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ڕەبیعە، حەبیبی کوڕی مەسلەمە بوون.

٣٠ـ شەڕی (ذات صواري) وێنەیەك بوو لە سەرکەوتنی بیروباوەڕەی ڕاستو قایم بەسەر فیترەی سەربازیو ژمارەی چەكو سەربازدا، چونکە ڕۆمەکان هەر لە کۆنەوە شارەزایی دەریار بوو، بە چەندین ئەزموونی دژواردا لە شەڕی دەریایدا تێپەڕیبوون، کەچی موسڵمانان تازە بەتازە چوبوونە دەریاو شەڕی دەرییاییان دەکرد.

٣١ـ گرنگترین پەندو وانەو سوود لە فتوحاتی عوسماندا ئەوەبوو بەڵێنەکانی خودای گەورە لەسەرکەوتنو جێگەخۆشکردن بۆ ئیمانداران بەدی هات، لە هونەری جەنگو

سیاسەتدا پەرەیان سەندو چوونە ناو دەریاو زانیارییان لەسەر دوژمن کۆکردەوە، پەرۆشبوون بۆ یەکدەنگی بۆ رووبەڕوونەوەی دوژمن.

٣٢ـ لە ژێرۆکی کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی عوسمان پانتایی چەمکی هاوەڵان بۆ ئەو ئایەتانەی کە رێگری لە ناکۆکی دەکات دەرکەوت چۆن خودای گەورە رێگری دەکات لە ناکۆکی بەو شێوەیە خۆیان پاراست قوڵایی تێگەیشتیان بۆ ئەم ئایەتانە وای کرد لە حوزەیفە کاتێ بیستی سەروبەندی ناکۆکی لە خوێندنەوەی قورئاندا دەرکەوتووە کوتوپڕ چو بۆ (مەدینە)و هەواڵی دا بە عوسمان کە شتێکی وای بینیوەو بیستوویەتی لە ماوەیەکی کەمدا عوسمان کارەکەی یەك لایی کردەوەو دەرگای ناکۆکی داخست.

٣٣ـ دەستگرتن بەو هۆکارانەی کە موسڵمانان یەك وەفاتو رێزیان پێکەوە دەبەستێت گەورەترین جیهادە ئەم هەنگاوە گرنگە بۆ روسورکردنی موسڵمانانو بەڕێوەبردنی وڵاتیانو دامەزراندنی دینی پەروەردگاریان ئەمە تێگەیشتنی خەلیفە راشیدینەکان بوو لە زەریفترین وێنەدا ڕەنگی دایەوە کاتێ عوسمان ئوممەتی لەسەر یەك جۆر قورئان کۆکردەوە.

٣٤ـ هەرێمەکانی وڵاتی ئیسلامی لە سەردەمی عوسماندا، ئەمانە بوون: (مەککە، مەدینە، بەحرەین، یەمامە، یەمەن، حەزرەمەوت، شام، ئەمینیە، میسر، بەصرە، کوفە).

٣٥ـ عوسمان چەندین ئامرازی جۆربەجۆری گرتبووە بەر چاودێری کارگێڕو کرێکارەکانیو بە ئاگابووە بەسەر هەواڵەوکانیاندا بەمشێوەیە لە وەرزی حەجکردندا ئامادە دەبوو، پرسیاری دەکرد لەوانەی کە لە شارو ویلایەتەکانوە دەهاتنن لیژنەی پشکنینی دەنارد بۆ ویلایەتەکانو والییەکانی بانگ دەکردو پرسیاری لێ دەکردنو شێوازی تری بەکار دەهێنا.

٣٦ـ مافەکانی والییەکان لە سەردەمی راشیدینەکاندا ئەمانەبوو، گوێ بۆ گیراوبن لەسەر پێچی خودادا نەبێتو ئامۆژگاریی بکرێن بە باشیو هەواڵی راستو دروستیان پێ بگەبەنرێت، پاش لەکارلابردنیان رێزیان لێ بگرێت، موچەو دەرماڵەیان پێ بدرێت.

٣٧ـ ئەرکی والییەکانی سەردەمی راشیدین ئەمانەبوو کارو باری دینداریی پیادە بکەنو ئاسایشی خەڵکی دەستەبەر بکەنو لە رێگای خودادا غەزا بکەنو ئەوپەڕی

هەوڵ بدەن بۆ دابینکردنی بژێوی خەڵك‌و فەرمانبەرەو کارزانەکان دا مەزرێنن‌و چاوداشتی ئەهلی زیمە بکەن‌و راوێژ بە کەسایەتی خاوەن بۆچون بکەن‌و ئاوڕ بدەنەوە لە ئاوەدانی ویلایەتەکان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە چاودێریی بارودۆخی دانیشتوانی ویلایەتیان بکەن.

٣٨ـ عوسمان خەلیفەیەکی راشیدیەو چاوی لێ دەکرێت، کردەوەکانی دەستورێکی مێژوویی بەرجەستە دەکات، بۆ ئوممەت هەروەك چۆن عومەر پێشەنگ بوو دوای خۆی، چونکە نزیکە لە پێشینەکانی بە هەمان شێوە عوسمانیش پێشەنگ بوو دوای خۆی، چونکە ئەمیش نزیکە لە نزیکەکان وێڕای ئەوەی لێهاتوو شایستەبووە لە بەڕێوەبردندا ئەو شتانەی کە کرابووە گلەیی لەسەر عوسمان هەموویان لە بازنەی (موباح) دەرناچن،

٣٩ـ ئەو والییانەی کە عوسمان کردنی بە والی‌و خزمی خۆی بوون، تواناو لێهاتوویی‌و شایستەییان بە بەرچاوەوە بوو، لە بەڕێوەبردنی کاروباری ویلایەتەکانیانداو خودای گەورە زۆربەی شارەکانی لەسەر دەمی ئەوان رزگارکگردو رەوتێکی دادپەروەرانەیان هەبوو لە ناو جەماوەرەکاندا، هەیانبوو لە سەردەمی ئەبوبەکرو عومەریشدا کاری والییەتی پێ سپێردرابوو.

٤٠ـ هەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆ ئەو رووداوو مێژووییانەی کە لە سەرچاوەیەکی راست‌و راستەقینەوە هاتووە، بە دواداچوون بکات بۆ ژیاننامەی ئەو پیاوانەی کە عوسمان پشتی پێ ەبەستوون تەنیا لە جیهاددا شوێنەواری جوانیان تۆمار کردووە لە مێژووی ئیسلامدا، بەڵکو لەبەر جوانی بەڕێوەبردنیان کە گەورەترین دەرئەنجامی هەبووە لە ناوجەرگەی ئوممەتداو بەختەوەری کردوون ئەوکاتە ناتوانێت خۆی بگرێت لەسەرسامی‌و شانازی دەربڕین لە هەرکوێی مێژووی ئیسلامەوە ئەم رۆڵانە بخوێننەوە.

٤١ـ عوسمان سەلامەت نەبووە لە زۆربەی توێژەرەوان لە پەڕاوە بێ ویژدان‌و بێ سۆراغەکانیانداو سەردەمەکەشیان لەکەدار کردووە، زۆربەی زۆریان هەڵخزاونەتە ناو ریوایەتە زەعیفەکان‌و رافزییەکان حوکمی باتڵیان لەسەر بنیات ناوەو زوڵمیان کردووە لە حەقی عوسمان، وەکو تەها حسین لە کتێبی (الفتنة الكبرى) رازی عەبدولڕەحیم لە کتێبی (النظم الاسلامي) موحەممەد ئەلریس لە کتێبی (النظريات الكبرى) عەلی حسین

(الخربوطلی) له کتێبی (الاسلام والخلافة)، ئەبی ئەعلای مەودودی له کتێبی (الملك والخلافة)، سەید قوتب له کیتبی (العدالة الاجتماعیة) غەیری ئەمانەش.

عوسمان به حەقیقەت ئەو خەلیفه مەزلومەیه که دوژمنه ئەوەڵەکانی درۆو دەلەسەیان بۆ هەڵبەسێو ئاخرەکانیشی بێ ویژدانییان کرد بەرامبەری.

٤٢ـ مێژووه راستەقینه دەڵێن عوسمان ئەبو زەڕی نەفی نەکردووه، بەڵکو ئەبو زەڕ داوای مۆڵەتی کرد، بەڵام دوژمنانی عوسمان کردویانه به گاڵەو گازنده، که عوسمان نەفی کردووه.

٤٣ـ ئەبو زەڕ نه له دوور نه له نزیك کاریگەر نەبووه به ڕایەکانی عەبدوڵڵای سەبەئی جوولەکەو له (الربذة) مایەوه هەتا مرد. وه به هیچ شێوەیەك بەشداریی ئەو فیتنەیەی نەکرد کەوتەوه.

٤٤ـ هۆکاری فیتنەی کوشتنی عوسمان ئەم فاکتەرانه بوون، خۆشگوزەرانیو شوێنەوارەکانی لەناو کۆمەڵگەدان گۆڕانی روشتی کۆمەڵگا له سەردەمی عوسماندا، هاتنی عوسمان لەدوای عومەر، دەرچوونی هاوەڵه مەزنەکان له مەدینه، دەمارگیری نەفامی، وەستانی فتوحات، خۆپارێزی عەوامانەو نەفامانه، تەماعی چاوچنۆکان، موئامەرەی داخلەدڵەکان، پیلانی پتەو بۆ وروژاندنی گلەییەکانی دژی عوسمان، بەکارهێنانی ئەو ئامرازو هۆکارانەی که خزمەت به هەڵچوونی خەڵك دەکاتو رۆڵی عەبدوڵڵای سەبەئی له فیتنەکەدا.

٤٥ـ سەرەتای هەڵگیرسانی فیتنەکه له کوفەوه بوو، به تەواوی فیتنەبازەکان دوورخرانەوه بۆ شام، پاشان خرانه لای عەبدولڕەحمانی کوڕی خالیدی وەلید له جەزیەر، پاشان به بەرنامەی یەزیدی کوری قەیس گەڕانەوه بۆ کوفه که تووشی بووی وەرنەوه بۆ کوفه.

٤٦ـ سیاسەتی عوسمان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ فیتنەکەدا لەسەر هێمنیو دادگەریو نەرمو نیانییو لەسەرخۆیی دەچوو کۆمەڵێ ئامرازی گرته بەر بۆ رووبەڕووبوونەوەی وەکو ناردنی لیژنەی پشکنینو سۆراغ کردنو نوسراوێکی گشتگیری نارد بۆ خەڵکی شارەکان له باتی راگەیاندنی گشتیی بۆ هەموو موسڵمانانو عوسمان راویژی کرد به والی شارەکانو بیانووی یاخیبووەکانی بڕیو وەڵامی داواکارییەکانی داناوه.

٤٧ـ ئەگەر وردینەوە لە ڕێنماییەکانی عوسمان لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو فیتنەیەی کە داکەوت لە سەردەمیدا دەکرێت هەندێ بنەما هەڵهێنجین بۆ ئەوەی موسڵمانان بەرەنگاریی فیتنەی پێ بکەن ئەو بنەمایانەش وەکو جێگە بەخۆگرتن‌و پابەندبوون بە دادو ویژدانەوە، لەسەرخۆیی‌و هێوری، سوربوون لەسەر ئەو شتانەی کە سوودی جەماوەری تێدایەو فڕێدانی زیانەکانیان خۆگرتن بەبێ دەنگی‌و سڵەمینەوە لە زۆر بێژی‌و راوێژکردن بە زانا خوداناسەکانن ڕێنمایی وەرگرتن لە فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ لە فیتنەدا.

٤٨ـ دەرکەوتووە بۆ لێکۆڵەرەوان کە کۆمەڵێ هۆکار هەبوو وای کردووە لە عوسمان نەهێڵێت هاوەڵان شەڕ بکەن وەکو ئەوەی کاری بە وەسیەتەکەی پێغەمبەر ﷺ کردووە، کە ڕۆژی گەمارۆی ماڵەکەی شادومان بوو، چونکە بەڵێنێك بوو پەیمانی دابوو خۆی رابگرێت لەسەری‌و ئارامگربێت، وەپێی ناخۆشبوو ببێتە یەکەمین خەلیفەی خوێنڕێژی ئوممەت لە خەلیفەکانی پێغەمبەر ﷺ، چاك دەیزانی سەرکەشەکان هیچیان ناوێت کوشتنی ئەو نەبێت، بۆیە پێی ناخۆشبوو موسڵمانان بکاتە پەرژینی خۆی.

پێی خۆشبوو خۆی بکاتە پەرژینی ئەوان، چاك دەیزانی ئەم فیتنە کوشتنی خۆی پێوەیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدابوو لەو کاتەی مژدەی بەهەشتی پێدا، کە تووشی بەلایەك دەبێت‌و بە ئارامگری‌و لەسەرحەق بەخشی بەم زوانە لە فیتنەدا دەکوژرێت، کاری بە ڕاوێژەکەی عەبدوڵڵای سەلام دەکرد، کە پێی وت دەست مەوەشێنە دەست مەوەشێنە ئەم بەڵگەیە بەهێزترە تا شەڕکردن.

٤٩ـ بکوژی عوسمان پیاوێکی میسری بوو، ریوایەتەکان بە ڕاشکاوی ناویان نەهێناوە، بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بەو تۆمەتەوە هەیە کە دەکرێت بۆ موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکر گوایە بە گۆچان کوشتویەتی قسەیەکی پڕوپوچەو ریوایەتەکانی زەعیفن، هەوەها دەقەکانیشی شارەزاو پێچەوانەی ئەو ریوایەتانەیە کە دەڵێن بکوژی عوسمان پیاوێکی میسری بووە.

٥٠ـ هاوەڵان هەرهەموویان ئەستۆیان پاکە لە خوێنی عوسمان هەواڵە راستەکان‌و ڕووداوەکانی مێژوو جەخت دەکەنەوە کە هاوەڵان ئەستۆیان پاکە لە خوێنی عوسمان‌و

هاندانی خەڵك لێی، یان بەشداریی كردن لەو فیتنەیەدا دژی عوسمان چەندین ریوایەتی صەحیحمان لەلایە.

٥١ـ عوسمان بێداربوو موئامەرەو ئامانجەكانی غافڵگیریان نەكرد، بەڵكو توانی رێزی یاخیبووەكان ببڕێت‌و پیلانەكانیان بە تەواوی دەربخات بە دلێرییەكی سەركەوتوو رووبەرووی رووداوەكان بوویەوە، بەڵام پێی نارەحەت بوو ببێتە یەكەمین كەسێك كە شمشێر لە موسڵمانان هەڵكێشێت، واتە براكوژی بكات، بۆیە گیانی خۆی كردە قوربانی خوێنی ئوممەت ئەمە سەرلوتكەی قوربانیدان‌و لەخۆبردنە.

٥٢ـ فیتنەی كوشتنی عوسمان بوو بە هۆكاری فیتنەگەلێ بوو بە سەرەتای فیتنەكانی ترو دڵی خەڵكی گۆڕاو ترازاو درۆكردن ئاشكرا بوو، هێڵێكی لاڕێیی دروست بوو بۆ لادان لە عەقیدەو شەریعەتی ئیسلام.

٥٣ـ زوڵم‌و دەستدرێژی كردن بە ناهەقی بۆ سەر خەڵكان دەبێتە هۆكاری لەناوچوون‌و هیلاكبوون لە دونیاو قیامەتدا، وەكو خوای گەورە دەفەرموێت:(وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِداً) (الكهف: ٥٩).

ئەگەر سۆراغی دەستدرێژیكەرانی سەر عوسمان بكەین، بۆمان دەردەكەوێت كە خودای گەورە مۆڵەتی نەداوە، بەڵكو سەرشۆڕو زەبوونی كردوون‌و تۆڵەی لێ كر دوونەتەوەو كەسیان قوتار نەبووە.

٥٤ـ ئەو موسیبەتەی كەوتە سەر موسڵمانان هۆش‌و بیری جام كردن‌و غەمی گەورە كردن‌و فرمێسكیان باراندو زمانیان ساودا بۆ لاواندنەوەی عوسمان‌و بەزەیی نواندن، حەسانی كوڕی سابت ئەمیری ئیماندارانی لاواندەوەو ناسزایی دەربڕی بۆ بكوژانی‌و بكوژانی داشۆری بە سرودە غەمناكە گریاناوییەكانی مێژووی بۆ پاراستوین‌و نە شەوان‌و نە درێژایی رۆژگارو نە شورەی سەدەكان نەیانتوانیوە لەناویان دەن.

٥٥ـ لە پاش ئەمانە خودای گەورە بۆمی ئاسان كرد، كە بتوانم ئەم كتێبە كۆبكەمەوەو رێكی بخەم‌و شیكاری بكەم‌و لەم بەشانەدا پۆلێنی بكەم.

ئەم كتێبە كە ناوی (عوسمانی كوڕی عەفان‌و كەسایەتی‌و سەردەمەكەیەتی) هەرچی پاداشتی تێدایە فەزلێكی رۆشنی خودای گەورەیە بەسەر منەوە، سوپاس منەت هەر بۆ ئەوە، هەر هەڵەیەكیشی تێدایە داوای لێبوردن‌و لێخۆشبوون لە خودا دەكەم‌و خوداو

پێغەمبەرەکەی ﷺ لێی بەرین، هەڵەی منە، ئەوەندە بەسە بۆمن کە پەرۆشیم دەربڕیوە بۆ رۆشنکردنەوەو بەڵگەهێنانەوەو بۆ بەیانکردنی حەقیقەتەکانی ئەو خەلیفە راشیدەی کە عوسمانی کوڕی عەفانە، لە خودا دەپاڕێمەوە ئەم کتێبە سوود بگەیەنێت بە موسڵمانانو خوێنەرانی لە کاتی خوێندنەوەی بێبەشم نەکەن لە دوعای خێر، چونکە پاڕانەوەی برا بۆ برا بەبێ ئاگاداری ئەو قبوڵە، ئەم کتێبە بەم فەرمایشتەی خودای گەورە تەواو دەکەم (وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (الحشر: ١٠).

شاعیر دەڵێت:

ان تجد عيبا فسد الخللاجل من لاعيب فيه وعلا

شاعیرێکی تر دەڵێت:

اطلب العلم ولا تكسل فما ابعد الخير على أهل الكسل

احتفل للفقه في الدين ولا تشغل عنه بمال وحول

واهجر النوم وحصله فمن يعرف المطلوب يحقر مابذل

لا تقل قد ذهبت اربابه كل من سار على الدرب وصل

## پێناسەی هەندێ لەو ناوچانەی کە لەم توێژینەوەیەدا هاتووە:

١ـ طبرستان: ناوچەیەکە دەکەوێتە باشووری دەریای قەزوین‌و پایتەختەکەی شاری هەمەدانە، ناوەکەشی لە وشەی (طبر) کە مانای تەور دەدات بە فارسی، لەگەڵ (زنان) کە مالانای ژنان دەدات واتە (تەور ژنان).

٢ـ ئازربیجان: بنەڕەتی وشەکە (اتروباتن) بووە، واتە: زەوی ئاگرین، دەکەوێتە ناوچەی خۆرئاوای دەریاری قەزوین، پایتەختەکەی شاری ئەردەبیلە.

٣ـ ئەرمینیا: دەڤەرێکی فراوانە دەکەوێتە خۆرهەلاّتی ئاسیای بچووك لە باشووری دەریاری رەش، ناوەکەشی لە ناوی ئەمنەکانەوە هاتووە، کە هۆزە هیندۆ ئەرورووپییەکانن لە سەرەتای سەدەی چواری زایینییەوە، ملیان چو بە گاوریەتیدا دوای ئەوە گۆڕان بەرەو رێبازی مەنوفیسنی، واتە: یارانی یەك سروشتی، بۆ مە سیح، دانیشتوانەکەی بەربەستی فتوحاتی ئیسلامیان کرد لە شارەکەیان‌و لە سەردیانەتی گاوری مانەوە.

٤ـ گخارستان: هەرێمە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای ولاّتی ئەودیو رووبار، پایتەختەکەی بەڵخە زۆربەی زەوییەکانی ئێستا دەکەوێتە ئەفغانستان، گەورەترین مەرکەزی ئێستای لە قنزرو خوستە.

٥ـ خۆراسان: واتە رۆژهەلاّتی خۆر، دەکەوێت رۆژهەلاّتی بەرزاییەکانی ئێران، پایتەختەکەی مروە.

٦ـ سجستان: ناوچەیەکە دەکەوێتە باشووری هەرێمی خۆراسان، پایتەختەکەی بستە ناوەکەشی لەوەوە هاتووە، کە گەلێك تێیدا نیشتەجێ بوون ناویان (الاکیتین) بووە، بەلاّم مانای وشەکە واتە: زەوی سەگەل، چونکە سك سبح لە زمانی فارسیدا واتە (سەگ)، ستان، واتە: ناوچە ئێستای پێی دەورتێ (سیستان).

٧ـ بلاد ما وراء النهر: ئەو زەویانە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە نێوان رووبای سەیجون‌و حەیجون، شارەکانی ئەمانەن، بوخارا، سەمەرد قەند، تەشقەند، ئێستا دەکەوێتە کۆماری تورکمانستان‌و ئۆزبەکستان‌و تاجیکیستان.

٨ـ جرجان: هەرێمێکە دەکەوێتە رۆژهەلاّتی دەریای قەزوین، ناوەکەی پێشتر پێی دەوترا هەرێمی باکتریاو، زەردەشت بانگەوازی تیا بلاّوکردووەتەوە.

٩ـ خۆزستان: هەرێمێکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی بەرزاییەکانی ئێران‌و کەناری عێراقی عەرەبی، یەکێ لە بەرزییەکانی ئەهوازە، پێشی دەورتێ عەرەبستان، موحەممەد ڕەزای شای پەهلەوی لە ساڵی ١٩٢٥ دەستی گرت بەسەریدا دوای ئەوەی شێخ (خزعل الكعبي) عەرەبی حاکمی بوو، دەستگیر کرا، بەناوبانگە بۆ نەوت.

## ناوەڕۆك

# بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەکەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |

| | | |
|---|---|---|
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن و: عوسمان عەلی قادر |

| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبـــــــدوڕڕەحمان نەجمەدین |
|---|---|---|
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵلا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەلامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت<br>"بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا<br>"بێدار" |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەلاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەلات | فەرهاد شاکەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |

| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
|---|---|---|
| ٣٠ | فەرمودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |

